ئاره‌ش ره‌ئیسینه‌ژاد





# شای ئێران؟



# کوردی عێراق و شیعه‌ی لوبنان

# ١٩٥٨-١٩٧٩

له ئینگلیزییه‌وه:

**شه‌فیقی حاجی خدر**

ناوی کتێب: **شای ئێران؛ کوردی عێراق و شیعەی لوبنان**
بابەت: **مێژوو**
نووسەر: **ئارەش ڕەئیسینەژاد**
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: **شەفیقی حاجی خدر**
**پیتچن: وەرگێڕ**
**هەڵەچن: دەستەیەک**
**نەخشەسازیی ناوەوە و بەرگ: خەلیل هیدایەت مام شێخ**
**چاپخانە: ڕۆژهەڵات- هەولێر**
نرخ: **(١٣٠٠٠) دینار**
**تیراژ: (٢٠٠٠) دانە**
تۆرەی چاپ و ساڵ: **چاپی یەکەم/ ٢٠٢٢**

لە بەڕێوبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٥٧٨)ی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە.



**لە بڵاوکراوەکانی چاپخانەی رۆژهەڵات-هەولێر**

# ناواخن

# پێشباری وەرگێڕ

لەو کتێبانەی کاک **چالاک محەمەد** بەدیاری بۆ ناردم، ئەم کتێبەی بەردەست بوو، ئەوکات بە شێوەی پی دی ئێف بۆی ناردم و تێبینی ئەوەشی لەگەڵ بوو، "کاک شەفیق پێدەچێ ئەم کتێبە بۆ ئێمە گرنگ بێ!"

"بەڵێ، زۆریش گرنگە!"

ئەم کتێبە تێزی دکتۆرای **ئارەش رەئیسینەژادە**، لە ٢٠١٧ و لە زانکۆی کالیفۆرنا بڕوانامەی لە پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکان وەرگرتووە، لەپاش ساڵێک تێزەکەی بە کەمێ دەستکارییەوە کردۆتە کتێب و هەر لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بڵاوی کردۆتەوە.

دکتۆر ئارەش مامۆستای پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانە لە کۆلێژی مافەکان و زانستی سیاسی لە زانکۆی تاران. بەدەر لەم کتێبە، کتێبی (**ڕێگای ئاوریشم لە ئێران**) لە ساڵی ٢٠٢١ چاککردووە، ئەو پێشتر ماستەرێک لە زانستی سیاسە و بەکالۆریۆسیشی لە ئەندازیاریی کیمیاوی نەوتدا هەیە.

زۆر بەکورتی دەکرێ ئەوە بڵێم، ئەم کتێبەیان لەگەڵ کتێبی "**ئەرێ کورد بوونە بەردەبازی؟!**"ی **براین ڕۆبەرت گیبسن**دا جمکن، چونکە هەردووکیان لە بنەڕەتدا نامەی دکتۆران و لە ئەمریکا چاپکراون و تا ڕاددەیەک هەمان مەودا زەمەنییەکەیش لەخۆدەگرن، ئەوەندە هەیە بەردەباز لە ١٩٥٨ تا ١٩٧٥ی لەخۆگرتبوو، ئەم کتێبەیان بە شێوەیەکی تێرتر تا ١٩٧٩ دەڕوا. هەردووکیشیان پشتبەستوون بە بەڵگەنامەی دەزگای هەواڵگری بێگانە، یەکەمیان زیاتر بەڵگەنامەی سی ئای ئەی، ئەمەشیان بەڵگەنامەی ساواک.

خۆ ئەگەر لەسەر ئاوەڵناوی ئەوەش کۆک نەبین کە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ کودەتا بێ یان شۆڕش، بەڵام وەک شتێکی حاشاهەڵنەگر لەسەر ئەوە کۆکین ئەم مێژووە، لە دوای خۆیدا مێژووی دروست کرد، ڕوداوێکی ئاوس بە

ڕووداوگەلی دواتر، هەمووشـــیان لە قۆناغێکی هەســـتیار و بۆ گەلەکەمان چارەنووسـساز بوون. دەکرێ لەم قۆناغە مێژووییەدا سـەرەداوی ئەم ناوانە: **١٤ی تەمووز، عەبدولکەریم قاســـم، مەلا مســـتەفا بارزانی، پارتی دیموکراتی کوردســـتان، ئیبراهیم ئەحمەد، جەلال تاڵەبانی، براکوژی، شـۆڕشـی ئەیلوول، عەبدولســـەلام** و **عەبدولڕەحمان عـارف، نەبەردی هەندرێن، بەعس** و بە هەردوو سەرۆکەکانیانیەوە **بەکر و سەدام، محەمەد ڕەزا شا، ساواک، مۆساد، ســـی ئای ئەی، هینری کیســـنجەر، مەلیک حوســـێن، جەزائیر** و ڕێککەوتننامە شـــوومەکەی، **بومدیەن، ئەنور ســـادات، هێلی تالوک**، یەکاوی عەرەب/ شـــط العرب(ئەروەنـد ڕود)، گەمەی دەزگـا هەواڵگرییەکـان، **هەرەس، ئـاوارەیی**، گەڕانەوە....هتد هەموو ئەمانە لە ماوەی ١٩٥٨ تا ١٩٧٩دا چەمک و پێناســـەی یەکلاکەرەوەن و مۆرێکیش بوون، کە دواجار بەدبەختانە لە هەنیەی گەلەکەمان درا و شـــوێنەوارەکەی هێشـــتا زەقوزۆپ هەر ماوە... ئینجا دەکرێ بڵێین: ئایا ناوەڕۆکی ئەم ڕووداوە تاوان و کارەســـاتبارانە دووبارەی زەمین و زەمانی پێش خۆیان بوون؟ بە شـــێوەیەک لە شـــێوەکان لە دوای خۆیان قەوماون و دەقەومێنەوە؟

با وەڵام بۆ خوێنەری تاسەمەند بێ.

دیارە ئەم قۆناغە زۆری لەســـەر نووســـراوە، ئەوســـا چ بە لالێکردنەوەی نووسـینەوەی مێژوویی بێ یان لە دووتوێی بیرەوەریی تێکۆشـەر و کەسـانی کـارای ســـەردەمی خۆی بی، بەڵام تۆ بڵێی ڕووە نـادیـارە هەواڵگرییەکە ڕونکرابیتەوە؟ ئەم کتێبە ئەوەمان بۆ دەکا.

ئەم کتێبە دوو تەورەییە، لە هەر قۆنـاغێکدا دوو ســـەرباس چەقی بازنەن، لایەکیـان کورد و عێراق و گەمەی بەرژەوەنـدی دەوڵەتـانی هەرێمی و نێودەوڵەتی، لاباســـەکەی دیکە لوبنان و هیلالە شـــیعییەکە. لەوێشۆ شـــیعە و ئیمامە سـەرهەڵداوە کاریزماکەی ( **سـەید موسا سـەدر**) چەقی بازنەیە. پێموایە لەم بارەیەوە ئەم کتێبە هەر هیچ نەبێ بۆ کتێبخانەی کوردی، دەستپێشخەرە. ئەوەی لەم لاتەوەرەیەدا دەخوێندریتەوە و بۆ منیش وەک خوێنەرێک مـایەی

کارانگازی بوو ئەوەیە، ئەم **موسا سەدرە** بە چارەنووسە نادیارەکەشییەوە، بە ماوەیەکی کەم، لە یەک دەیە یان کەمێک زیاتر، کەمینەیەکی شیعی پەراوێزخراوی بەشخواری و چەپۆکبەسەری چەوساوەی دەستی سوننە و مارۆنی عەرەب لە لوبنان، دەکاتە توخمێکی پێکهێنەری کارای دەستڕۆیشتوو، دەیگەیەنێتە ئاستی ئەوەی ئیدی لوبنان دەبێتە سێکوچکە، لەپاڵ سوننە و مارۆنییەکان، شیعە دەبێتە کوچکەی سێیەم و ئیدی عورفە سیاسی و دەستوورییەکە وەها دەگۆڕێ، هەمیشە سەرۆکایەتی پەرلەمان بکەوێتە دەست ئەوان. لە وەڵامی ئەو پرسەش ئاخۆ ئەم کارە مەزنە چۆن کرا؟ ئەوا کتێبەکە ڕوونی دەکاتەوە. ئایا بۆ پرسی سەرکردایەتی دەبێتە پەند؟ ئەمەشیان وەڵامەکەی با هەر لای خوێنەر بێ.

کاتێ بۆ یەکەم جار ئەم کتێبەم خوێندەوە، لەگەڵ هەر دێڕێکدا بە من نەبوو قەڵەمدارەکەی دەستم، هێڵی بەژێردا دەهێنا، لە پەراوێزی کتێبەکەشدا هەر نیشانەی پرس و سەرسوڕمانیم دەکێشا. بە ڕێڕۆیشتنیش لەگەڵ بەند و ناوونیشان و ناوەڕۆکی بەشەکانی دیکەیدا، پێبەپێی سەرسامیم، حەسرەت و داخی زۆریشم هەڵدەڕشت. ئاخر بە داخ و پەرۆشییەوە بە دوای ئەم پرسیارانەدا دەگەڕام کە "چۆن" و "بۆچی" وەها بوون؟ ئەم دوو ئامرازنەی پرسیش پێ بەپێی بەندەکان ئاڵوگۆڕ دەبوون، یەکەمیان دەبووە دووەم و بە پێچەوانەشەوە. لە کۆتاییشدا نیشانەی پرسی تاکەی دەهاتەسەر، ئاخر تاکەی؟! جا نازانم هەمان حاڵەتەش بەسەر خوێنەری خۆشەویستدا دێ یان نا.

دوای خوێندنەوە و پرسوڕا لەگەڵ هاوڕێکانم، ئەوانەی پەرۆشی وەرگێرانەکانمن، ڕاوێژم پێکردن، گوتیان مادام وایە ناوی خوای لێبێنە... هەر وەهاشم کرد... لە ڕێگەی **ئاقا هوماوە** پەیوەندیم بە نووسەرەوە کرد و قایلنامەم لێوەرگرت، ئەو گوتی زۆر باشە وا کتێبەکە دەشکرێتە فارسی... کاتێک وەهای گوت، لەسەر وەرگێرانەکە سوورتر بووم، پێمباشتر بوو ڕاستەوخۆ بکرێتە کوردی نەوەک دواتر لە فارسییەوە وەریبگرینەوە.

من وەک وەرگێڕ، لێبڕاوانەوە ئەوە دەڵێم بە هیچ شـــێوەیەک لە نـاوەڕۆکی کتێبەکە بەرپرسیار نیم. سەرەتا ویستم هەر بەتەنیا بەو دێڕە وازبهێنم و هیچ پەراوێزێکیش نەنووســم، دواتر کاتێ ئەوانەی دەســتنووســەکەیان خوێندەوە، پێیان وابوو باشـــترە هەر هیچ نەبێ لە هەندێ شـــوێندا پەراوێزی بۆ بکرێ، چونکە لەوانەیە نووســەر ســەرچێخ چووبێ یان زانیاری هەڵەی لەبەردەســتدا بێ و بەکاری هێنابێ. بەڵێ هەرواشی لێ لێهات.

مامۆســتای کتێبناس، **مومتاز حەیدەری** کاتێ بە تاســەوە دەســتنووســەکەی خوێندەوە، بانگی کردم، وێڕای ئاماژە نووســراوەکانی، زیاتر لە دوو ســەعات بەیەکەوە دانیشتن و شوێنە وروژێنەر و هەستیارەکانی کتێبەکەی نیشان دام، کە لە کوێ هەقە پەراوێزی بۆ بکرێ، نەوەک هەر ئەوەنـدە بەڵکو کۆمەڵێ بڕگەش تۆخ بکرێن. منیش بە گوێی مامۆستام کرد.

ئەوەی ڕاســـتی بێ، ئەم کتێبە پەراوێزی زیاتری دەویســـت، بەڵام من هەر ئەوەندەم بەباش زانی، دواتر خوێنەر یان هەر لێکۆڵەرەوەیەکی دیکە دەکرێ ئەم کارە فراژی بکا.

لە کۆتایی کتێبەکەشدا دەقی ئەو بیست لاپەڕەی کاتی خۆی **هینری کیسنجەر** وەک پاکانەنامەیەک لەبارەی کارەساتی هەرەسی شۆڕشی ئەیلول نووسی و لەژێر ناوی تراژیدیای کورد لە کتێبە قەبەکەی خۆی (ســاڵانی نۆژەنبوونەوە) لە ١٩٩٩دا بڵاویکردەوە، کردمە پـاشـــکۆی ئەم کتێبە، تـا خوێنەران وەک بەڵگەنامەیەک لەبەردەســتیاندا بێ، چونکە نووســـەر لەم کتێبەدا نموونەی پێ هێناوەتەوە.

ئینجا وەک دابێک، وەک هەر وەرگێڕانێکی دیکەم، هەر بەتەنیا خۆم بە ماخۆی وەرگێڕانەکە نـازانم، بەڵکو هەموو ئەوانەی خۆبەخش و پەرۆشـــانە لەگەڵم ماندووبوون و ئەو ئەرکەیان کێشـا بەســەر دەســتنووســەکەمدا چونەوەتەوە. بۆیە جێگەی ڕێز و دەستخۆشی و سوپاسن.

لەپێشـــدا خۆشـــبەختم دەســـتنووســـی یەکەمم بە بەرچاو و فلتەری دوو لە هەڵگرانی بڕوانـامەی دکتۆرای مێژوو، هەریەک لە د. **ئەحمەد ئەمین** و د. **ئەحمەد باوەڕدا** تێپەڕی. هەر بەڕاســـتی لە دەســـتنیشـــانکردنی هەڵەوپەڵە بەرابیەکانی تایپ و ڕێنووس، هەروەها لە بەراوردکردنی مێژووی ڕووداوەکان بە بەڵگەنامەکانی دیکە یارمەتیان دام، **د ئەحمەد ئەمین** هەندێ تێبینیشـــی ســـەبارەت بە چەند پەراوێزێک و مێژووی دەقاودەقی ڕووداوەکان بۆ نووسیوم.

پاشـان **شـێخ شـەماڵ گەزنەی**یش هەندێ هەڵەی زەقی پیت پەڕین و هەڵەی تایپی بۆ لێگرتم و لەگەڵ خوێندنەوەی هەر بەندێکیشـدا دنەدەرێکی سـەرەکیم بوو.

ئەوسا بێمە سەر مامۆتکی وەرگێڕانەکانم **لوقمان شلانی**. دوای ئەوان جارێکی دیکە بەســـەریداچووە، ئەوەی لەبەردەســـتی ئەوان پەڕیبوو، وەک هێڵێنگێک گرتنیەوە و بە ڕاوێژیش لەگەڵ **حەیدەر حاجی خدر**دا بەســـەر ڕێنووســـی هەندێ دەستەواژە و ڕستەدا چووینەوە.

لە کۆتاییشـدا وەک دەڵێن میسـکی خیتام مامۆسـتا **مومتاز حەیدەری** بوو. لە ڕووی ناوەڕۆکی کتێبەکە و بەتایبەتیش ســـەبارەت بەپرســـی گۆرانکارییە گەورەکەی ١٤ تەمووزی ١٩٥٨ و **عەبدولکەریم قاســـم** و حزبی شـــیوعی و پاشـان شـۆرشـی ئەیلول، کاتێ داوام لێکرد بەسـەر وەرگێڕانەکەمدا بچێتەوە دەسـتی بە ڕوویەوە نەنام. ئەوە بۆ هەفتەیەک دەسـتی لە پرۆژە مەزنەکەی خۆی هەڵگرت و پێوەیە خەریک بوو، ئیدی ســـەرنج و تێبینییەکانی بۆ من بەرچاوڕوونییەکی گەورە بوون.

لە کۆتاییشـــدا کنێر جەمیلی هاوژینم و کاکەڕای کوڕیشـــم لە ماندووبوونەکە بێبەش نەکردن، چ بە دەرفەت ڕەخســـاندن، هەروەهـا چ بە پرســـیار و ڕوونکردنەوەی هەندێ دەستەواژی ئینگلیزی لە کاکەڕا...

هەرچۆنێک بێ، وەرگێڕانەکە ئێستا لەبەردەستی خوێنەردایە، بەهیوای ئەوەی ئەمەشـــیان لەپاڵ بەردەباز و وەرگێڕانەکانی دیکەدا مایەی خوێندنەوە و تێڕامان بێ.

**ش.ح.خ**

**دانهاخ/لاهای**

**٢ ی حوزەیرانی ٢٠٢٢**

***لەسەر ئێمە پێویستە لە ڕۆژهەڵاتی کەناراوی دەریای سپیی ناوەڕاستدا بجەنگین و بەر بە هەڕەشەکان بگرین، تا ڕێگربین لەوەی خوێن لەسەر خاکی ئێران برژێ.***"[١] ئەم وتەیە هی کۆلۆنێل موجتەبا پاشایی، سەرۆکی دەزگای هەواڵگری و ئاسایشی نەتەوەیی ئێران (ساواک) بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا، بەڵکو شەپۆلی ئەو پان عەرەبایەتییەی دوای کودەتاکەی[٢] ١٩٥٨ عێراق، کز بکا. ئەمەش لە باشووری لوبناندا سەرەتای ستراتیژی پلانی سەوز بوو. پلانە سەوزەکەی ئێران ڕاچاندنی ڕایەڵەی پەیوەندی بوو لەگەڵ کۆمەڵگە شیعەکەی نیشتەجێی باشووری لوبنان. بە کۆچکردنی سەید موسا سەدری کاریزمای لەدایکبووی ئێران بۆ لوبنان، پەیوەندییەکانی ئێران لەگەڵ شیعەی لوبنان ڕەوتێکی نوێی وەرگرت.

هەروەها لە سەرێکی دیکەشەوە، ئێرانی پەهلەوی لە دژی عێراق پشتی کوردی ئەو وڵاتەی گرت. کودەتاکەی عێراق لە ١٩٥٨دا دەسەڵاتی بنەماڵە پاشاییەکەی هەواداری خۆرئاوای لەسەر تەخت وەرگێڕا، کۆمارێکی عەرەبپەروەرانەی لایەنداری مۆسکۆی لەسەر سنووری ڕۆژئاوای ئێراندا چەقاند. ئیدی لەم بەرڕەوتەدا[٣]، شا فەرمانی بە ساواک کرد، پەیوەندییەکی

---

[١] بۆ زیاتر تاوتوێکردنی پلانی سەوز، بڕوانە:
Letter from Isa Pejman, reprinted in Alamuti, Mostafa, Iran dar Asr-i Pahlavi [Iran in the Pahlavi Era] Vol.II, Jang-i Qodrat dar Iran[Power Struggle in Iran] (London, 1992) pp. 521–3.

[٢] لەبارەی ئەم وەرچەرخانە مێژووییە سیاسییەی سەر گۆڕەپانی حوکمڕانی عێراق دابەشبوونێکی قووڵ لەبارەی وێناکردنی ڕووداوەکە هەیە بەوەی ئاخۆ شۆڕش بووە یان کودەتا. نووسەر بە کودەتای ناوبردووە، کەچی دواتر لە ڕووداوی دیکە، کە هەر بەڕاستی کودەتا بووە، ئەو بە شۆڕشی ناوبردووە. هەڵبەتە لێرەدا من وەک وەرگێڕ دەستەواژەکانم بە دەستپاکییەوە گواستوونەتەوە. لێ ئەوەندە هەیە بڵێم، زۆر جار لە وەرگێڕانەکانمدا، بەتایبەتی سیاسییە و مێژووییەکان تووشی گرفتی لێگرتنی وشە و دەستەواژەکانی شۆڕش، کودەتا، سەربزێوی، هەرا، هەڵگەڕانەوە و و یاخیبوون... بوومەتەوە. بەگوێرەی پەیپێبردنم لە شوێنی خۆی و لە پەراوێزدا، بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەر ئاماژەم بۆ کردوون. وەرگێڕ.

[٣] بەرڕەوت: بەردەق، کۆنتێکست، سیاق. وەرگێڕ

ســــتراتیژی لەگەڵ کوردی بـاکووری عێراق ببەســـتێ. لەوێش بە سەرکردایەتیی مەلا مستەفا بارزانی، پێشمەرگەی[4] کورد دەستوپێی سوپای عێراقیان بەست، بەمە ڕووی گەف و هەڕەشەکانی بەغدایان لە پارێزگاکانی ڕۆژئاوای ئێران و کەنداوی فارســـی گۆڕی. بە پێچەوانەی ڕایە گشـــتییە باوەکە ســـەبارەت بە ســـیاســـەتی دەرەکی شـــاوە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکـا لە مـاوەی ســـاڵانی نێوان ١٩٦١ تـا ١٩٧٢دا و لەخۆوە لەگەڵ ســتراتیژی ئێران بە ئاراســتەی کوردەکانەوە نەبوو. وێڕای ئەو پەیوەندییە دۆستانەی لەگەڵ شـادا، کەچی کۆشکی سپی هەمان هەڵسەنگاندنی لەمەڕ هەڕەشـــەکانی بەرەو ڕووی عێراقەوە نەبوو. ئەمە تەنیا لەو کاتە هاتە ئارا، ئەویش دوای کۆبوونەوەی لووتکە لە ســـاڵی ١٩٧٢ لە نێوان ســـەرۆک ڕیچارد نیکســـن لەگەڵ شـــای ئێران، ئیدی لەوکاتەوە ســـەرۆکی ئەمریکا فەرمانی بە ئاژانسی هەواڵگریی مەڵبەندیی ئەمریکا (سی ئای ئەی) کرد، کە بە شـێوەیەکی ژێربەژێرانە لەگەڵ کوردســتانی عێراقدا هاوکاریی ســاواک بکەن.

ســتراتیژی پەیوەندییەکانی ئێران لەگەڵ کوردی عێراق و شــیعەی لوبناندا سەری کێشا بۆ ستراتیژییەک بە ئاراستەی قەوارە نادەوڵەتییەکان[5] (non-state entities) لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا. ئەمەش دەســتپێکی "ســیاســەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانە"ی ئێران بوو، سیاسەتێکی دەقاودەقی دەرەکییانە، کە مەبەســت لێی ڕاچاندنی تەونی پەیوەندی بوو لەگەڵ گرووپی ســیاســی و

---

[4] نووســەر وشــەی گەریلای بەکارهێناوە، شــتێکی حاشــاهەڵنەگریشــە لەگەڵ کۆماری کوردســتان لە مهابادەوە، ناوی ئەو توێژە چەکدارە وڵاتپارێزەی کورد بووەتە پێشـــمەرگە، منیش بەرچاوڕوونی وەهام کرد. وەرگێڕ

[5] لێرەوە بەدوا ئەم دەســتەواژەیە زۆر دووبارە دەبێتەوە، لەنێوان قەوارەی نادەوڵەتی و نادەوڵەتییانە دووەمینیام پێ لەبارتر بوو، کە مەبەست لێی ئەو (کەمینە) گرووپە نەتەوەیی و دینی و مەزهەبییانەن، کە لە نێو بۆتەی دەوڵەتێک دان و لە نەتەوە و دین و مەزهەبی سەردەستە و زاڵ جیاوازن. نموونەی هەرە زەقیش نەتەوەی کورد لەبۆتەی ســنووری ســیاســیانەی هەر چوار دەوڵەتەکە و شــیعە لە لوبنان. وەرگێڕ

چەکدار و بزووتنەوەکان. سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانە نیشانەیە بۆ پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کاراکتەرە سیاسی-سەربازییە نادەوڵەتییەکان. ئەم سیاسەتە پەیوەستە بەوەی چۆن دەوڵەت پەیوەندییەکانی لەگەڵ کاراکتەرە نادەوڵەتییەکان دروست دەکا و ڕێکی دەخا، ئەمەش لە ڕێی میکانیزمێکی پشتەوەی سیاسەتی دەرەکی. وێڕای باری ئێرانی شۆڕش، سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانە لە لایەن یەکێتیی سۆڤیەتەوە و بە مەبەستی پشتگیریی حیزبە کۆمۆنیستەکان، جووڵانەوە چەپگەراکان و چەکدارە ئازادیخوازەکان لە ماوەی جەنگی ساردا پەیڕەوی لێکرا. وڵاتەکانی دیکەش، وەک چین و کوبا و لەوانەش گرنگتر، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەر هەمان سیاسەتدا ڕۆیشتوون.

نزیکەی نیو سەدەش دوای ئەوە، سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران، ئەوەندە بەرفرەوان بوو، ئاستی پێشینەی خۆی تێپەڕاند. بە درەنگانێکی ساڵی ٢٠٠٤دا، عەبدوڵڵای پاشای ئوردن برەوی بە گوتەیەکی دژبەریەک دا، کە تا ئێستا بەسەر دڵی جیۆپۆلیتیکی ڕۆژهەڵاتی ناویندا زاڵە: هیلالی (نیوەداسی- هەیڤی) شیعە. "خۆ ئەگەر حزب یان سیاسییە لایەنگرەکانی ئێران جڵەوی حکومەتی نوێی عێراق بگرنەدەست، ئەوا هیلالێکی نوێی زاڵی بزووتنەوەی شیعەگەرێتی لە ئێرانەوە بەرەو عێراق و سوریا و لوبنان دەکشێ و دەکرێ هاوسەنگییە نەریتە باوەکەی هێز لەنێوان هەردوو ئاینزا سەرەکییەکەی ئیسلام لاسەنگ بکا و دارِسانێکی نوێی بۆ بەرژەوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بهێنێتە گۆڕێ." لە چاوی سەرکردە عەرەبە سوننەکاندا، هیلالی شیعی شەقڵی خۆی لە زرێبەندی ستراتیژی پەیوەندی نێوان ئێران و قەوارە شیعییە نادەوڵەتییەکان وەرگرتووە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم ڕوانینە بۆ ناسینەوەی ڕەگوڕیشەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بەر لە شۆڕشی ئێران شکستی هێنابوو. ڕاستییەکەی ئەوەیە، سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە ناوەڕاستی جەنگی ساردا سەری هەڵداوە.

بەر لە شــۆڕشــی ئێران، پشــتیوانی ئێران بۆ قەوارە نادەوڵەتییەکان، هەر بەتەنیا لە دەوری کوردی عێراق و شـیعەی لوبناندا نەدەسـووڕایەوە. شـا کاتی خۆی پشتی هێزی موتەوەکلییە دڵسۆزەکانی خۆی دەگرت، ئەمەش لە دژی ئەو هێزانە بوو، کە ســـۆڤیەت پشـــتیوانی لێدەکردن، واتە کۆمارە لایەنگرەکەی ناسـریییەکان لە باکووری یەمەن لە شـەسـتەکانی سـەدەی ڕابردوودا. شا لە دوا مانگەکانی قەڵەمڕەوییتییەکەی خۆیدا، پشتی موجاهیدە ئەفغانییەکانی لە دژی کۆمۆنیســـتەکانی کابول و ســـوپای ســـوور لە ئەفغانسـتان گرت. شـا لە ڕوی دارایی و لۆجسـتییەوە پشـتی یونیتا (یەکێتی نیشـتمانی بۆ سـەربەخۆیی تەواوی ئەنگۆلا UNITA)ی دوورەدەسـتیشـی دەگرت، کە لە لایەن خۆر ئاواوە پشـــتیوانی لێدەکرا، ئەمەش لە بەرانبەر بزووتنەوەی میللی بۆ ڕزگـاریی ئەنگۆلا MPLA بوو، ئەمیش لە لایەن یەکێتیی سـۆڤیەتەوە پشـتگیریی لێدەکرا.[٦] سـەرەڕای بایەخی بەرچاوی ئەو دوو لایەنە، هیچ کام لەمانەی سەروو وەک کوردی عێراق و شیعەی لوبنان ڕۆڵێکی سەرەکییان لە سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتیانەی ئێراندا نەگێڕا. لە بەراییەوە پەیوەندی لەگەڵ کوردی عێراق و شیعەی لوبناندا هێشتاش هەر بەرچاوە. لە شـۆڕشـی ئیسـلامییەوە، ئێران لایەنگیری هەردوو کاراکتەرە نادەوڵەتییەکەی دژی هێزەکانی ئیسرائیل و بەعسی عێراقەوە کرد.

خاڵی دووەم ئەوەیە، کە هەم کوردی عێراق و هەم شیعەی ئێران لە ڕووی جوگرافیـا و کەلتورەوە لە ئێران نزیکن. هەر لە ســـەرەتـای ســـەدەی شـازدەهەمەوە، ئیسـلامی شـیعە لە ئێراندا دینی هەرە زاڵ بووە. کوردیش گرووپە ڕەگەزێکی ئێرانین، کە زمـان و کەلتووریـان لەگەڵ ئەو خەڵکە هـاوچەرخەی ئێســـتـا لە ئێران دەژین زۆر لەیەک نزیکترە لەوەی لەگەڵ تورک و عەرەب. خاڵی سێیەمیش ئەوەیە، هەردوولایان، چ کوردی عێراق و

---

[٦] شەڕی ناوخۆیی ئەنگۆلا (١٩٧٥-٢٠٠٢) ئەو جەنگە بوو کە لە نێوان هەردوو گرووپە چەکدارییەکەی پێشتری مپلا و یونیتا ڕوویدا.

چ شـیعەی لوبنان باندۆریان[٧] بەسـەر کۆمەڵگەی ئێرانی و سـیاسـەتی ناوخۆییانەوە هەبووە. هەرچەندە کوردی عێراق لە لایەن شـا و ڕژێمی ئیسـلامی ئێرانەوە پشـتیان گیراوە، لێ کاریگەریی جوداخوازیی[٨] کورد لە عێراق پەرپوەتەوە کوردسـتانی ئێرانیش. لە سـەردەمی پێش شـۆڕشـی ئێراندا، چەندین شـۆڕشـگێڕی ئێرانی لە بنکە چەکدارییەکانی خواروی لوبنان مەشـقیان پێکراوە. لە سـەرووی هەمووشـیانەوە، ئەو ڕایەڵە پەیوەندییە دینییەی نێوان سـەدر لەگەڵ مەرجەعی شـیعەدا هەیبوو بە ئایەتوڵڵا خومەینیشـەوە، کە باندۆرێکی هەرەزۆری لەسـەر بزواندنی شۆڕش لە ١٩٧٩دا هەبوو.

پەیوەندییەکانی ئێران لەگەڵ لایەنی چەکداری-سـیاسـی قەوارە نادەوڵەتییەکان لە ڕۆژهەلاتی ناویندا بۆ ماوەی چوار دەیە، ناوجەرگەی ئاسـایشـی نێونەتەوەیی و هەرێمی بوو. لە کاتێکدا پاڵپشـتی کۆماری ئیسـلامی بۆ قەوارە نادەوڵەتییەکان لە ڕۆژهەلاتی ناویدا، وەک حیزبوڵڵا، وای کرد دەوڵەتەکە وەک "پاڵپشتێکی تیرۆریزم" بناسێنێ، کەچی پشتگیریی شـای ئێران بۆ کوردی عێراق و شـیعەی لوبنان هەرگیز ئەو شـەقڵەی بەخۆوە نەبینی بەوەی هەرەشـەیەکی بەرچاو بێ بۆ سـەر ئاشـتی و ئاسـایشـی نێودەوڵەتی. سـەرباری ئەمەش، بەرفرەوانی و قووڵی ئەو پەیوەندییە، پێ بە پێی هەڵکەوتەی جیۆسـتراتیژی ئێران و پەیوەندییە مێملیانەکەی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لەماوەی ئەو سـێ دەیەی ڕابردوو، ئەدەبیاتێکی سەبارەت بە سیاسەتی دەرەکی ئێران لەگەڵ

---

[٧] باندۆر: کاریگەری، تەئسیر. وەرگێڕ

[٨] خوێنەری تاسەمەند لە دوتوویێ ئەم کتێبەدا زۆر جار تووشی هەندێ وشە و دەەستەواژە و چەمک دێت کە پێویسـت بە ڕوونکردنەوە ناکا و لەگەڵ ڕەوتی خەبات و ئامانجی نەتەوەیی ئەو ناگونجێ، بەلام من وەک وەرگێڕ ناچار بووم لەبەر دەسـتپاکیی پیشـەکە وەک خۆیان وەربگێڕم، دەنا خەباتی کورد لە هیچ پارچەیەکدا جوداخوازیی نەبووە و نییە بەڵکو مافی ئازادبوونە، ئەم دەستەواژانە لەگەڵ چەمکی قانوونیانەی سەروەریتی دەولەتدا وەک دەستەواژەی سیاسییانەی جێگەی خۆیان گرتووە. وەرگێڕ.

خۆیدا هێنایەپێشــەوە. بە جۆرێک زۆر لەســەر ئەو پرســە نووســرا، کەچی کەلێنێکی گەورە ســـەبارەت بە شـــیکردنەوە و ڕاڤەکردنی پەیوەندییەکانی دەوڵەتەکە لەگەڵ قەوارە نـادەوڵەتییەکـان بەجێمـابوو. وێڕای کـاریگەریی گەورەی لەســـەر ڕێکخســـتنی هێز و دەســـەڵات لە هەرێمەکە و لەســـەر ئاسـایشــی نەتەوەیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، کەچی بەشـێکی ئەو پەیوەندییانە بۆ خەڵکی ڕۆژئاوایی نەناســـراو بوون. ئەوەی ڕاســـتی بێ، هەســتیاری و ئاڵۆزی ئەم پرســە، هەروەک کورتهێنی لە دەســتگەیشــتن بە ژێدەری ئێرانی و کاربەدەستاکانیان، وای کرد زۆر لە شارەزایان خۆیان لە کۆشش و تەقەللای تایبەت لەم بوارەدا بدزنەوە.

ئەدەبیـاتی هەنووکە لەبـارەی پەیوەنـدییەکـانی ئێران بە کـاراکتەرەکـانی نـادەوڵەتی دەکرێ بەســـەر چوار جۆردا دابەش بکرێن. جۆری یەکەمیـان کتومت تیشک دەخاتە سەر گرووپە سیاسی-چەکدارە هەرێمییەکان و تەنیا ناڕاســـتەوخۆ و ڕاگوزەریانە پەیوەندییان لەگەڵ ئێراندا هەیە. مەبەســـتی ســـەرەکی پەردەهەڵدانەوەیە لەســـەر ســـندووقی ڕەشــی بەرڕەوتی لایەنی کۆمەڵایەتی-سیاسی، کێشەی ناوەخۆ لەسەر دەسەڵات، پێواژۆی بڕیاردان و تەداروکی دامەزراوەیی هەر یەکێک لەو قەوارە نـادەوڵەتییـانە.[٩] جۆری دووەمیان ئەدەبیاتی ســیاســەتی دەرەکیی ئێران بە گشــتی دەگرێتەوە و بەتـایبەتیش پەیوەنـدییەکـانی ئێران بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکـاوە.[١٠]

---

[9] "Hezbollah: The Story of the Party of God, From Revolution to Institutionalization" by Eitan Azani; "Hezbollah" by Naim Qassem; "Hezbullah's Documents: From the 1985, open letter to the 2009 Manifesto" by Joseph Alagha; "Hezbollah: The Global Footprint of Lebanon's Party of God" by Matthew Levitt; "Hamas" by Beverley Milton- Edwards and Stephen Farrell, and "The Brotherhood: America's Next Great Enemy" by Erick Stakelbeck

[10] "After Khomeini" by Anoushirvan Ehteshami; "Reading in Iran Foreign Policy After September 11" by Abbas Maleki and Kaveh Afrasiabi; "Iran in World Politics: The Question of the Islamic Republic" by Arshin Adib- Moghaddam; "Reflections on Iran's Foreign Policy" and "Ideology and Pragmatism in Iran's Foreign Policy" both by Rouhollah Ramazani; "The Treacherous Alliance" by

هەرچەندە ئەو ئەدەبیاتە دیاریکراوە بە کەم سەیری سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانی دەکرد، ئەمەش بەهۆی بۆ دواوەگەڕانەوەی پەیوەندییەکانی وڵاتەکە بە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە هۆی کودەتاکەی ١٩٥٣ و هەروەها بە هۆی ئاژاوەی شۆڕشی ئێران لە ١٩٧٩دا. ئەو "پەیوەندییە تایبەتییە"ی ئێران- ئەمریکا بە ڕێچکەی ڕاستەوخۆی وەرچەرخان لە کودەتاوە بۆ شۆڕش دادەنێن، ئیدی بەم شێوەیە ئەو گێڕانەوە پێلێهەڵبڕە سادەیە ڕووداوەکانی قۆناغی نێوان ئەو دوو جووڵانەوەیە پشتگوێ دەخا. هەرچی جۆری سێهەمیشە سەیری ڕایەڵەی تیرۆریستی دەکا، وەهای دادەنێ پەیوەستی ئێران بەو گرووپانە زۆر مایەی بەدگومانییە. وتاری لەبلەبانانەی سەرزەنشتکردن چاوی ئەمانەی نابینا کردووە، ئاخر ئەم کتێبە ئاراستەکراوانە پەیوەندییەکانی ئێرانی وەها نەخشاندووە، کە سەرچاوەیەکی ناسەقامگیرییە لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا.[١١] دواهەمین جۆری لێکدانەوەکەشیان تیشکۆی هزری دەخاتە سەر شیعەگەرایەتی و جڤاتە شیعییەکان هەروەک چۆن سەیری چڤاتە کوردییەکان دەکا. ئەم کتێبەش بەوە دەناسرێتەوە کە بە نیگایەکی بەرفرەوانتر دەڕوانێتە مێژووی شیعە و کورد.[١٢] بە هەمان شێوەش،

---

Trita Parsi; "The Eagle and Lion" by James Bill; "The Great Satan vs. the Mad Mullahs" by William Beeman; "The Political History of Modern Iran: From Tribalism to Theocracy" by Mehran Kamrava, and "The Persian Puzzle" by Kenneth Pollack.

[11] "Jihad Ultimatum" by J. D. Randall; "The Axis of the Evil: The Axis of the Evil: Iran, Hizballah, and the Palestinian Terror, Routledge" by Shaul Shay, and "Iran, Hezbollah, Hamas, and Global Jihadi: A New Conflict Paradigm for the West" by Dore Gold and Daniel Diker.

[12] "The Shia Revival: How Conflicts within Islam Will Shape the Future" by Vali Nasr; "The Shi'a Worlds and Iran" edited by Sabrina Marvin; "Shiism and Politics in the Middle East" by Laurence Louer; "A Modern History of the Kurds" by David McDowall, "Invisible Nation: How the Kurds' Quest for Statehood Is Shaping Iraq and the Middle East" by Quil Lawrence; "The Kurds: A People in Search of Their Homeland" by Kevin Mckiernan; "No Friends But the Mountains: The Tragic History of the Kurds" by John Bulloch.

پەیوەندییەکان لەگەڵ ئێراندا لەچاو ئەو جۆرە لێکدانەوەیەدا بابەتێکی لاوەکییە.

سەرهێڵە سەرەکییە دەستنووسەکان، سیاسەتی دەرەکی ئێرانیان بەر لە شۆڕش و لە دوا وتەیاندا، (شا)یان وەک "بووکەڵەی ولاتە یەکگرتووەکان" دانابوو، ئەو شایەی سیاسەتی دەرەکی بە شێوەیەکی بەرفرەوان لەسەر هێڵی کۆشکی سپی بوو. کەچی بە پێچەوانەوە، دەستنووسەکانی ئەدەبیاتی ڕیڤیژیونست[12] لەم دواییانەدا (شا)یان وەک سەرکردەیەکی مجێزبەرز نیشان دەدا، کە ناسەرکەوتووانە هەوڵیداوە هەرچی زیاترە سیاسەتی سەربەخۆ لە هەرێمەکە و ئەودیوی هەرێمەکە پیادە بکا. بە پێچەوانەی هەردوو تەوژمە سەرەکییەکە و ڕوانینی ڕیڤیژیونستەکان سەبارەت بە سیاسەتی دەرەکی شا، ئەم کتێبەی بەردەست ئەوە نیشان دەدا، چۆن ئێرانی پەهلەوی سیاسەتێکی نادەوڵەتییانەی کارای بۆ بەرزەفتکردنی هەڕەشەکانی نێودەوڵەتی و هەرێمی و ناوخۆیی لەخۆگرتبوو. هەروەها ئەوەش نیشان دەدا، چۆن شا بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە ڕووبەڕووی بەرژەوەندییەکانی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە هەرێمەکە بووەوە و چۆن توانی گەمەی سیاسەتی دەرەکی نادەوڵەتی بەڕێوە ببا. بە کورتی، ئەم کتێبەی بەردەست قۆناغی دوای ڕیڤیژیۆنیستیە.

لەم گۆشەنیگایەوە، ئەم کارەی بەردەست تیشکی نوێ دەخاتە سەر چۆنیەتی سەرهەڵدان و وەرچەرخانی پەیوەندییەکانی ئێران لە سەردەمی شادا لەگەڵ قەوارە نادەوڵەتییەکان لە عێراق و لوبناندا. مەبەستی ئەم کتێبە ئەوە نییە ڕووپۆشی لایە جیاوازەکانی سیاسەتی دەرەکی ئێران لەژێر ڕکێفی شادا بکا؛ بەڵکو سەربردەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانە

[12] ڕیڤیژیۆنیست: لەنێو ڕەوتی مارکسیزمدا بەو کەسانە دەگوترا، کە لەڕێی خەباتی مەدەنی و پەرلەمانتاری نەوەک شۆرش داوای سۆشیالیزمیان دەکرد. ئێدوارد نێرنستاین (١٨١٥-١٩٣٢) بەدامەزرێنەری ئەم ڕەوتە دادەنرێ. لە فەرهەنگی سیاسیشدا بەو کەسانە دەگوترێ کە داوای پێداچوونەوە و هەموارکردنەوەی سیاسەتی باو دەکەن. وەرگێڕ.

دەگێڕێتەوە، بەوەی تیشـــکی خســـتۆتە ســـەر هەڕەشـــە و دەرفەتگەلی جیۆســـیاســـی و جیۆکەلتورییەکان لە ماوەی نێوان ١٩٥٨ تا ١٩٧٩دا. هەروەها بەدوای ئەوەدا دەچێ، چۆن دامودەزگا ناوخۆییەکان پاڵیان بە ڕژێمی پەهلەویەوە ناوە تا سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتی بگرێتەبەر.

ئەم کتێبە بە فرەڕێگەیی خۆی بەشداری ئەدەبیاتەکە دەکا. لە سەرەتاوە، بە دوای شەپۆلی ئەو بەرزاو و نیشتاوی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێراندا دەچێ لە ژێر قەڵەمڕەویتی شادا. بە پلەی سەرەکی تیشکۆی دەخاتە ســـەر پەیوەنـدییەکـانی دەوڵەت، پەیوەنـدییەکـانی ئێران بە کـاراکتەرە نادەوڵەتییەکان، واتە کوردی عێراق و شـــیعەی لوبنان. بە پلەی دووەمیش، دادەڕسێتە ئەو ڕوانینە بڵاو و باوەی گوایە هاوپەیمانانی نادەوڵەتیی ئێران تەنیا لە دوای شـــۆڕشـــی ئیســـلامی لە ١٩٧٩دا بوونەتە هاوپەیمان، ئەم داڕسـانە و ئاڵنگارییەشـی بە ڕوونکردنەوەی شـەقڵی سـیاسـەتی دەرەکی ناودەوڵەتییانەی شـــای ئێران دەخاتە ڕوو. بە پلەی ســـێیەمیش، ئەم کتێبە نموونەیەکی دیکە نیشـان دەدا بەوەی چۆن ئاراسـتەی شـەڕی سـارد و سـیاسـەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین لە لایەن یەکێک لە زلهێزکانەوە شـەقڵی خۆی وەرگرت، کە لە جیهانی ســـێیەمدا هاوپەیمانیان بوو، ئەویش ئێران بوو. شـا، وەک سـەرکردەیەکی ڕۆژهەڵاتی ناوین، لە ڕێی گەمەکانی لەگەڵ زلهێزەکاندا بە شێوەیەکی چالاکانە هەڕەشەکانی جڵەوکرد. بە شیکارییەکی وردەکارانە ســـیاســـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران، ئەم کتێبە ئەوە دەخـاتە ڕوو، کە ئێران و وڵاتە یەککگرتووەکـانی ئەمریکـا، گرژییەکی ســەرنجڕاکێشـانەیان لەبارەی شـەڕی کورد لە نێوان سـاڵەکانی ١٩٦١ تا ١٩٧٢دا هەبوو. کتێبەکە تێگەیشـــتنی ئێمە لەبارەی پەیوەندییەکانی ئێران- ئەمریکا و کاردانەوەی پرسی پەیوەندیی ئێران- ئەمریکا و گەیشتنە لووتکە لە شـەسـتەکان و هەفتاکاندا نیشـان دەدا. بە پلەی چوارەمیش، کتێبەکە بەگشتی لەسەر پرسی بەرچاوی چەکداریی-سیاسیی قەوارەی نادەوڵەتی لە جیهان و بەتایبەتیش لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا ڕژدە. پەڕشـوبڵاوبوونەوەی

ئەو قەوارانە لە ڕۆژهەلاتی ناویندا دارِســـانێک بوو بۆ ئەوپەڕی هەڕمێنی ڕیالیزمی گریمانەیی و داشـــۆرینێکیش بوو بۆ ســـیاســـەتی نێودەوڵەتی دەوڵەتی نـاوەنـد و داوای عورفییـانەی نەتەوە دەوڵەتی ویســـتفـالیـان[١٤] ســـەبارەت بە ســـەروەری. هەر لە بزووتنەوە کۆمەلایەتی و گەریلاکانانەوە بگرە تـا کـاراکتەرە نیمچەدەوڵەتییەکـان، کەوا کـاراکتەرە نـادەوڵەتییەکـان لەناوەوە و دەرەوەی سیستمی نێودەوڵەتییدا لەکاروباردا بوونە. ئیدی لەم گۆشـەنیگایەوە، ئەم کتێبە هەنگاوێکە بەرەو باشـتر تێگەیشـتن لە پەیوەندی دەوڵەتـان بە قەوارە نـادەوڵەتییەکـان. بە پلەی پێنجەمیش، ئەم کتێبە ئاڵنگارییەکە بۆ ئەو ڕوانینە زاڵەی پێواژۆی بڕیارِدارشـــتنی ســـیاســـەتی دەرەکی ئێران. ئاخر ڕوانینی زاڵ، سیاسـەتی دەرەکی ئێرانی بە سیاسـەتی دەرەکی شـــا وێناکردووە. بە پێچەوانەوە، ئەم کتێبە نیشـــانی دەدا، کەوا دەزگاکانی دیکە، نەخاســـمە ســـاواک ڕۆڵێکی دەروازەییانەی لە پرۆژەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێراندا گێڕاوە. بە پلەی شەشەمیش، ئەم کتێبە پرۆژەی ســـیاســـەتی دەرەکیی نـادەوڵەتییـانەی ئێران لە ڕێی ســەرەداوەکانی هەڕەشــە و دەرفەتگەلی جیۆسـیاسـی/جیۆکەلتوری نەوەک ئایدیۆلۆژی لە هەرێمەکەدا هەڵدەســـەنگێنێ. بە پلەی حەوتەمیش، کتێبەکە نەوەک بەتەنیا تیشـک دەخاتە سـەر لایەنی سـیاسـی، بەڵکو تیشـک دەخاتە ســـەر لێکۆڵینەوەی فرەئاســـت و ئاراســـتە، بوارە جیاوازەکانی زانســـتی کۆمەلایەتیشـــی لەبەرچاو گرتووە. لەپاڵ ســـیاســـەتدا بۆ لێکۆڵینەوە لایەنی بەرچاوی کەلتوری و دینیش دەخـاتە ڕوو، کە چۆن پەیوەندییەکـان لەگەڵ ئێراندا باندۆری خۆیان لەســـەر پاڵپشـــتی جڤاتەکانی قەوارە نادەوڵەتییەکان داناوە. لە کۆتاییشـدا، ئەم کتێبە مێژووناسـییە. دیاگرامی تیۆری گێڕانەوەی

[١٤] ســـەروەری یان ســـەرداریتی ویســـتفالیان مەبەســـت بنەمای قانونی نێودەوڵەتی بازنەی ســـەروەری دەوڵەتە، کە لە بڕوانامەی نەتەوە یەککگرتووەکانیشـدا هاتووە، بەوەی دەوڵەت ســـەروەری خۆی هەیە و کاروبارەکانی نێوخۆی ولاتەکە تەنیا بە خۆیەوە بەندە و بۆ هیچ دەوڵەتێکی دەرەکی نییە دەســـت بخاتە نێو کاروبارەکانییەوە. ئەم بنەمایەش بۆ پەیماننامەی ئاشـــتی ویســـتفالیا بۆ ســـاڵی ١٦٤٨ دەگەڕێتەوە ،کە کۆتایی بە جەنگی سی ساڵەدا هێنا. وەرگێڕ

چیرۆکێکە، چیرۆکی مێژووی سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لەبنڕکێفی حوکمڕانی شادا.

کتێبەکە مرخخۆشکردنە لەوەی سیاسەتی دەرەکی نادەوڵەتی ئێران لە ڕێی دەستەواژەی چاوتێبڕینی دەسەڵاتخوازانەی سەرکردەکانی ئێران دەربخا. هەروەها دەکرێ ببێتە مایەی ڕوونکردنەوەی هەندێ شـەقڵ و دارشـتەی ڕەگەزی و دینی. پشـتگیریی ئێران بۆ کورد لە دژی عێراقدا دەکرێ لەپاڵ کێبڕکێی نێوان ئێرانییەکان و عەرەب بە ئاراسـتەیەکی دیکە دابنرێ. وەک گرووپێکی ڕەگەزیی بنگەیی خەڵکی ئێران، ئەوا کورد پەیوەسـتییەکی کەلتوری و زمانەوانیان بە شارستانی ئێرانەوە هەیە. پشتگیری ئێرانیش بۆ شـیعە لە باشـووری لوبنانـدا دەکرێ وەک نموونەیەکی ئەو گرژییە بەردرێژەی نێوان جیاوازیی شـیعە و سـوننە لە ئیسـلامدا لێکبدرێتەوە. بە حوکمی باڵکێشـی شـیعە بەسـەر دانیشـتواندا، ئێران بووەتە چەقی بازنەی شـیعە لەنێو جیهانی ئیسـلامدا. دەکرێ مرۆڤ ئەو ئەرخاینبوونەش بدا بەوەی کێبڕکێی بەغدا- تاران و قاهیرە-تاران لەسـەر زاڵبوونی هەژموون بەسـەر هەرێمەکەدا وای لە ئێران کرد پشـتی کوردی عێراق و شـیعەی لوبنان بگرێ. لەوکاتەوە هەریەکە لە ئێران و عێراق خاوەن سـەرچاوەی کێڵگەی نەوتن و بەدوای ئەوەدا گەڕاون بۆ بەرژەوەندی خۆیـان بـاندۆر بخەنە سەر سیاسەتی نەوت و ئیدی کێبڕکێی ئابووری- وزەش دەکرێ بە دوا سـەرچاوەی سـیاسـەتی دەرەکی نادەوڵەتی ئێران دابنرێ. لەوکاتەی ئێرانی پەهلەوی لەسەردەمی جەنگی سارددا سەرەکیترین هاوپەیمانی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بوو، کەچی عێراق بەگشتی ڕووبەری خۆڵەمێشیی نێوان لایەنداریێتی بلۆکی سۆڤیەتی و بێلایەنی خۆی لەجرتوفرتدا بوو. هەر بۆیە لێککێشـانەوەی کۆتاییهاتنی جەنگی سـارد لە هەرێمەکە دەکرێ دوا هێزی دنەدەری سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بووبێ.

لە دووتوێی لێکدانەوەیەکی قووڵدا ئەوە دەردەکەوێ، چەندین هۆکار لەو بـارەیەوە لە ئـارادا بووبێ نەوەک بە تەنیـا تـاکەهۆکـار، هەموو ئەمـانەش

باندۆریان لەسـەر دارشـتنی شـەقڵی سیاسـەتی دەرەکەی نادەوڵەتییانەی ئێرانەوە هەبووە. ئیـدی هەروەک دەوڵەتەکـانی دیکەی هەرێمەکە، ئێرانی پەهلەوی ڕووبەڕووی "هەڕەشـە" و "دەرفەتگەلی" سـەرەکی بووەتەوە، کە لێکەوتەی لێبڕاوانەی بەسـەر سیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانەوە هەبووە. ئەم جۆرە سـیسـتمە تێکچڕژاوەش، دەرفەتی گەف و هەڕەشـە کارلێککەربوو لەسـەر سـێ "ئاسـت"ی نێودەوڵەتی و هەرێمی و ناوخۆیی. کاروباری دامەزراوەیی ناوخۆیی ئێران لەبن جڵەوی حوکمڕانی شادا خۆی بووە خاڵێکی ئاڵۆزکاوی دیکەی سەرباری بۆ سیستمی دەرفەتگەلی گەف و هەڕەشـەکان. ئیدی لەم گۆشـەنیگایەوە، چوارچێوەی تیۆری هەنووکە هەردوو لایەنی جیۆسیاسی و گێڕانەوەی دامەزراوەیی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران دەردەخا.

دەزگا و دامەزراوە ناوخۆییەکانی ئێران باری ئاڵۆزکاوی بەردەوامبوون و گۆڕینی سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانیان تۆختر کردبووەوە. دامودەزگاکان هاوتای ناسـراوی دەسـەڵات و پیادەکردنی بوون. هەر دامودەزگایەک پێواژۆی فەرمی و نافەرمی و ڕۆتین و ڕێسـا و پەیڕەوی ناوخۆی لەنێو بونیادی ڕێکخراویی سـیاسـەتدا هەبوو، کە دەبووە مایەی گۆڕانکاریی سـیاسـییانە.[15] تەوژمی دامودەزگای نوێ جەخت لەسـەر ڕۆڵی دەروازەییانەی دامودەزگاکان لە گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی-سـیاسـییانە دەکاتەوە. ئەم لێکۆڵینەوەی بەردەسـت ئەو ڕەوتە مێژوویەی دامودەزگای نوێی بەکاردەهێنێ، بەوەی تیشـک دەخاتە سـەر کارلێککەری نێوان دامەزراوەکان لە جومگەیەکی دیاریکراوی بەیەکەوەبەستنەوەی مێژووییدا. هەر بۆیەشـە، گۆڕانکاریی سـەرەکی لە پرۆژەی سـیاسـەتی دەرەکیی نـادەوڵەتییـانەی ئێران لەنێو هەنـاوی تەداروکی دامەزراویی لە قۆنـاغە جیاجیاکانی مێژووییدا ڕوویداوە.

---

[15] Hall, Peter and Rosemary C. R. T Taylor, Political Science and the Three New Institutionalism. (1996), XLIV, p. 938.

جیۆپۆلیتیک، هەڵسوکەوت لەگەڵ پەیوەندییەکانی نێوان جوگرافیا، هێز و سیستمی جیهانیدا دەکا، جەخت لەسەر ڕۆڵی کۆتوپێوەندی جوگرافیا و دەرفەتەکان لە ڕەفتاری سیاسییدا دەکاتەوە. دەستەیەک لە گەف و دەرفەتی دیاریکراو، ئێرانی پەهلەوی هێنایە سەر ئەو ڕایە، ڕایەڵەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ باکووری میزۆپۆتامیا و کەناری ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست ڕابکێشێ. ئەم دەستە گەف و دەرفەتانە لایەنی سیاسی، کەلتووری و ئابووریان هەبوو. هەر لەم گۆشەنیگایەوە، تیۆری (موحیەدین میسباحی) چوارچێوەیەکی مەحکەمی بە پەرەسەندن و میکانیزمی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بەخشی. ئەم چوارچێوەیە نواڕینێکی "سێکوچکەیی" بەخشییە سیستمی نێودەوڵەتی، کە سێ تای کارلێککەر بوون هەرچەندە لە داڕشتەشدا لەیەک جیاواز بوون، ئەوانیش چەکداری بە تۆپزی، کۆمەڵایەتییەکی پێوانەیی و باری ئابووری."[16] لەپاڵ هۆکارە جوگرافییەکان، هەر دەوڵەتێک تووشی باندۆری هاوڕێکی کارلێککەری هەرسێ ڕەهەندی هێزی زاڵ دەبێتەوە. ئیدی هەر لەو گۆشەنیگاوە، جەنگی سارد لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا بە ڕوونی، بەڵام بە لەیەکجیاوازی هەرسێ هۆکاری کارلێککەری تێدا سەرهەڵدا، ئەوانیش هەژموونی زاڵی ڕەهەندەکانی جیۆپۆلیتیک، جیۆکەلتوور و جیۆئابووری بوون. لە هەمان کاتیشدا ڕۆژهەڵاتی ناوین بەهۆی دابەشبوونێکی بەرایی دینی-کەلتووری-ڕەگەزی لەیەکترازا بوو. هەروەها بەوەش ناسرایەوە کە خاوەنی بیچمی دیار و جیاوازی ئایدیۆلۆژیی بووە مایەی هێزی کاریگەر لە هەرێمەکەدا. ئاخر ئەو قەبارە بێژمارەی کێڵگەکانی نەوت، کێشمەکێش لەسەر نرخی نەوت و هێڵی لوولەکێشی نەوت، هەموو ئەمانە شەقڵی بە هێزی جیۆئابووری دا و قیتی کردنەوە. لە کۆتاییشدا، هەڵکەوتەی جیۆستراتیژی ڕۆژهەڵاتی ناوین و نزیکی لە یەکێ لە زلهێزەکان، هەبوونی ململانێی نێوەخۆ و هێزی ڕکابەر و

[16] Mesbahi, Mohiaddin, Free and Confined: Iran and the International System. (Spring 2011). Iranian Review of Foreign Affairs, 5 (2): 9–34.

مێمڵ لەنێو دەوڵەتەکانی هەرێمەکەدا وای کرد هێزی سەرەکی جیۆسیاسی لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا بێنەکایە.

لە هەمان کاتیشدا، سێ ڕەهەندی زاڵی جیۆسیاسی، جیۆکەلتووری و جیۆئابووری لە سێ ئاستی نێودەوڵەتی و هەرێمی و نێوخۆیی بەرجەستە بوون. وەک نموونەیەکی تەواوعەیاری ئەم ململانییەش لە سەردەمی جەنگی ساردا، ڕۆژهەڵاتی ناوین لەسەر ئاستی هەرێمی و ناوەخۆییدا چەند ئاستێکی لە بارودۆخی ئاسیاش هەبوو. نائاسایشبوونی حوکمڕانی دەستەبژێری نێوخۆ ڕۆڵێکی بەرچاوی لە شەقڵپێدانی بزواندنی ئاسایش و نائاسایشی هەرێمەکەدا گێڕا.[17] لە دەرچەی ڕێککەوتننامەی سایکس-پیکۆی ١٩١٦شدا، وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین (بەدەر لە ئێران)، ڕژێمی نائاسایشی دوای کۆلۆنیالی بوون،[18] لەباری ناسنامەی خۆزایی دەوڵەتبوون و ناسنامەی ڕژێمبوون کورتهێن بوون. کورتهێنی دەوڵەتێکی بەهێز لە هەرێمەکەدا پەرپەوە بۆ سیاسەتەکانی ئاسایشپارێزی هەرێمەکە و بە هۆیەوە لەو کاتەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ڕووخا شتگەلی دیکە هاتەمەیدان. ئیدی لە لایەن چەندین ئەجیندای ئایدیۆلۆژی ڕکابەر، دابەشبوونێکی لەمێژینەی دینی و ڕەگەزی، ڕکابەری سیاسییانە لەسەر نەوت، کێشەی سنوور و ڕەوشی هێز هەڵدەسوورا. هەروەها ڕۆژهەڵاتی ناوین بووبووە مەیدانی باندۆری بەهێز و بەردەوامی ڕکابەری نێودەوڵەتی جەنگی سارد. بەر لەوەش، سیستمی دەوڵەتانی هەرێمەکە لە لایەن ڕێککەوتننامەکانی بریتانیا و فەرەنسا داڕێژرابوون. دوای دووەمین جەنگی جیهانیش، هەرزوو ڕۆژهەڵاتی ناوین دوای ئەورووپا و ئاسیا بووە مەیدانی سێیەمی جەنگ لە سەردەمی شەڕی سارددا. بە قورسی و شێوازی توند و

---

[17] Buzan, Barry and Ole Waver. Regions and Powers: The Structure of International Security. (Cambridge University Press, 4 Dec 2003). p. 187.

[18] بۆ زانیاریی زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە کتێبی هێلێک بە نێو لمدا، جێمس بار، جەمال عیرفان ، سلێمانی ٢٠٢٢. وەرگێڕ.

گرژ "یاری و نەیاری" تێیدا نمایشـــکرا،"[19] بە نەیاریتی ئێرانی –عەرەب و مێملایەتی شـــیعە و ســـوننە، ئیدی دینامیکییەتی هەرێمی ئەوەندە بەهێز و درێژخایەن بوو هیچ کامێک لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتیی سۆڤیەتیش کۆنترۆڵی تەواویان بەسەر هەرێمەکەدا پێنەکرا.

لە لێکەوتەدا، ئەم چوارچێوە تیۆرییە نیشـــــانـدەری جومگە مێژوویە چـارەنووســـــســـــازەکـان، هێز (نـاوەکی/دەرەکی) و کـاراکتەرەکـان (بڕیـادارپێژەران/دەســـــتەی گوڵبژێر/دامودەزگـاکـان) ئەوانەی ڕۆڵێکی چارەنووسـسـازانەیان لە ڕەوتی سیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران گێڕاوە. هەروەها نیشـــاندەری ئەوەیە کە ڕەگوڕیشـــە و کاریگەرییەکانی سیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران دەکرا بۆ هەر سێ "ڕەهەند"ەکانی جیۆپۆلیتیـک، جیۆکەلتوری و جیۆئـابووری بگەڕێنـدرێتەوە و لە هەمـان کاتیشدا لەسەر سێ "ئاست"ی نێودەوڵەتی و هەرێمی و نێوخۆییش.

ئەم کتێبەی بەردەســت"ڕاڤەکردنێکی مێژوویانەی" بۆ ســیاســەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران گرتووەتەبەر. من سێ جۆر سەرچاوەم بەکارهێناون. جۆری هەرە گرنگی زانیـارییەکـان ئەو بەڵگەنـامە تـایبەت و نهێنییـانەن کە لەنێو ئەرشـــیفی هەریەک لە ولاتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا و ئێران کۆکراونەتەوە.

هەرچی دیوی ئێرانی چیرۆکەکەیە، کتێبەکە بە قورســی لەســەر بەڵگەنامە ســـەرەکییەکانی بەردەســـتی وەزارەتی کاروباری دەرەکی و ســـاواک، هەروەها ئەو بەڵگانەی *مرکزی ئاموزش و پژوهشـــی بین المللی وەزارەتی ئموری خارجی و سازمانی ئەسناد و کتابخانەی میلی جمهوری* ئیسـلامی ڕۆنراوە. ســـەرباری ئەوەش، ئەم کتێبە پشـــتی بەســـتووە بە بەڵگەنامەی بڵاوکراوەی حکوومەت بە ئیمام موســا ســەدر بە ڕیوایەت و ئیســنادی ساواک (موسـا سـەدر بە گوێرەی بەڵگەنامەکانی ساواک بەرگی ٣)، حزبی

---

[19] Ibid. p. 40.

دیموکراتی کوردســــتانی عێراق بە ڕیوایەتی ســــاواک و ڕەوابتی ئێران و عێراق بە ڕیوایەتی ســـاواک. بەدەر لەو بەڵگەنامانەی فارســـی، بیۆگرافیای دیـداریکـان ئەوەی لە لایەن زانکۆی هـارڤـاردەوە بۆ پڕۆژەی مێژووی زارەکی ئێران و فاوەندیشـنی خوێندکارە ئێرانییەکان بەســەرچاوە گیراوە، کە زانیارییەکی بەرچاوی سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی گەف و هەڕەشەکانی شـا و پێواژۆکانی دارشـتنی بڕیارەکانی ئەوکاتی تێدایە. لەپاڵ ئەمانەشـدا، چەندین ســەرچاوەی فارســی دی کە ڕامانی شــای لەبارەی ســیاســەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانی تێدایە. ئەمانەش بە یاداشتەکانی ئەسەدوللا ئەعلەمی نزیکترین ڕاوێژکار لە شــا، ســەرۆوەزیری پێشــوتر و وەزیری دەرباری پاشـایەتی تێدایە، کە تیشـک دەخاتە سـەر دەسـەڵاتی ڕۆژبەڕۆژی شـا، کە چۆن فەرمانڕەوایی وڵاتی کردووە؛ هەروەها کۆلۆنێل عیسـا پژمانی ســەرۆکی هۆبەی کوردســتان لە نێو ســاواکدا، لەگەڵ مەنسـور قەدەری بەڕێوبەری گشــتی و باڵوێزی ئێران لە بەیروت. ســەرچاوە گرنگەکانی دیکەش بریتین لە یادەوری شـۆڕشــگێڕانی ئێران بە ســادق تەباتەبائی، برازای سـەید موسـا سـەدر و یەکەمین جێگری سـەرۆوەزیران لە دوای شۆڕشی ئیسلامی ئێران.

لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش، بەڵگەنامەکانم لە ئەرشیفی نەتەوەیی لە کۆلیج پارک، میریلاند کۆکردوونەتەوە. بەڵگەنامەکانی کتێبخانەی سـەرۆک ڕیچارد نیکسـن[٢٠] و کتێبخانەی ســەرۆک جیرالد فۆرد[٢١]م لە ڕێی ئۆنلاین وێبســایت بەکارهێناوە. ئەم کتێبە لە بەڵگەنامە بڵاوکراوەکانی حکوومەت ســوودمەند بووە، بە بەڵگەنامەی مێژووی پەیوەندییەکانی دەرەکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (FRUS)، ســی ئای ئەی: ڕاپۆرتی پایک، نامە ئاشـکراکراوەکانی ســەرۆکەکان: دوایت ئایزنهاوەر ١٩٥٣ و گیرالد فۆرد ١٩٧٦-١٩٧٧، پڕۆژەی مێژووی نەتەوەیی جەنگی ســارد (CWIHP) لە

[20] Available at https://www.nixonlibrary.gov

[21] Available at https://www.fordlibrarymuseum.gov/collections-digital.aspx.

سـەنتەری ویدرۆ ویلسـن بۆ توێژەران، ئەرشـیفی دەوڵەتی ئیسـرائیل بە ئۆنلاین و دەستەیەکی تایبەتی بەڵگەنامە کۆکراوەکان: ژیان لە هەواڵگرییدا- کۆبەرهەمی ریچـارد هێلمز (CIA-Helms). هەروەهـا بەڵگەنـامەکـانی ئەرشـیفی ئاسـایشـی نەتەوەییم لە زانکۆی جۆرج واشـنتن،[22] تۆمارنامەی ئامرازی لێکۆڵینەوەکانی سـی ئای ئەی (CREST) لە ئەرشـیفی نەتەوەیی لە کۆلیژە پارک، FOIA (بڕوانامەی ئازادی زانیاریی) ژووری خوێندنەوەی ئەلکترۆنی،[23] هەروەها کۆبەرهەمی مێژووی نووسینگەی سی ئای ئەی.[24]

هەروەها بە قووڵبینییەوە دیدارم لەگەڵ چەندین کەسدا کردووە، کە ڕۆڵێکی دەروازەییان بە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆ لە سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێراندا گێڕاوە. لەنێو ئەو کەسـە سـەرەکییانەشـدا ئیبراهیم یەزدی، دووەمین وەزیری کـاروبـاری دەرەوەی ئێران دوای شـۆڕشـی ئیسـلامی، هەروەها سـەید عەلی ئەکبەر موحتەشـەمپوور کە لە هەشتاکاندا وەزیری پێشووی ناوەخۆی ئێران بوو. هەردووکیان، چ یەزدی و چ موحەشەمپوور لەنێو شۆشگێڕە دەستڕۆیشتووەکاندا بوون، ئەوانەی دەستیان لە سـیاسـەتی باشـووری لوبناندا هەبوو. هەروەها دیدارم لەگەڵ سـەید حوسـێن ناسـری فەیلەسـوفی بەناوبانگی ئیسـلامی سـازاداوە. سـەید حوسـێن ناسـری وەک سـەرۆکی ئەکادیمیای پاشـایەتی ئێران بۆ فەلسـەفە، پەیوەنـدییەکی دۆسـتـانەی نزیکی لەگەڵ هەریەک لە سـەدر و دیوانی پـاشـایەتیـدا هەبوو. ئەو دیـدارە زارەکییـانە بۆ ڕاسـتکردنەوەی ئەو دژبەرییـانەی لە مـادە نووسـراوەکـانـدا هەبوون، بەکەڵـک بوون. لەگەڵ ئەوەشـدا، بۆ ڕاسـتگۆیەتی دیـدار لەگەڵکراوەکـانـدا، ئەوا بە بـاشـی بەدواداچوونیان بۆ کراوە. ئەو دیدارانەی لەگەڵ کاربەدەسـتە ئێرانییەکان سـازمدابوون، بە شـێوەیەکی تایبەتی پەردەیان لەسـەر وردەکاری وەها

[22] Also available at http://nsarchive.gwu.edu.

[23] Available at http://www.foia.cia.gov.

[24] Available at https://www.cia.gov/offices-of-cia/intelligence-analysis/history

هەڵدایەوە، تا ئێستاش بەدەگمەن ڕاشکاوانە لە ئێراندا قسەوباسی لەسەر کراوە. زۆر لەو کەسانە هەرگیز پێشتر ئاشکرا و ڕووبەڕوو نەبووبوون.

کتێبەکە سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە نێوان ساڵی کودەتاکەی عێراق و ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی لە ١٩٥٨ تا ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی پەهلەوی لە ئێران لە ١٩٧٩دا تاوتوێ دەکا. لە پێناو لێکدانەوەی پەرەسەندنەکان و دینامیکی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لەبن جڵەوی حوکمڕانی شادا، ڕۆنانێکی کرۆنۆلۆژیانەی لەبەرچاوگرتووە. ئەمەش لە هەشت بەندی لەیەک جودادا چارەسەرکراوە. بەندی ٢ بە دوای هێزە پاڵنەرەکانی پەرەسەندنی پەیوەندییەکانی ئێراندا دەچێ لەگەڵ کوردی عێراق و شیعەی لوبناندا. ئەمەشیان سێ لق لەخۆ دەگرێ. لقی یەکەم ئەو گەف و هەڕشانەی جیۆپۆلیتیک و جیۆکەلتوری هەڵدەسەنگێنێ کە دنەی شای ئێرانی دا پەیوەندی لەگەڵ قەوارە نادەوڵەتییەکانی عێراق و لوبناندا ببەستێ. لقی دووهەمیش بەدوای ئەو دەرفەتگەلە هەرێمی و نێودەوڵەتییانەدا دەڕوا، کە قەناعەتی بە شا کرد ئێران لە سیاسەتی دەرەکی نادەوڵەتییەوە بگلێنێ. هەرچی لقی سێیەمیشە، ڕۆڵی کوشندانەی ئەو دامودەزگایانە نیشان دەدا، کە لە پەرەسەندن و بزواندنی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێراندا ڕۆڵیان گێڕاوە. باقی بەندەکانی دیکەی کتێبەکە، هەر لە بەندی سێیەمەوە تا هەشتەم، جێپێی مێژوویانەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە قۆناغە جیاوازەکاندا هەڵدەگرێتەوە، لەهەر بەندێکیشدا دوو لقی لەخۆگرتووە: یەکیان بۆ پەیوەندییەکانی ئێران لەگەڵ کوردی عێراق و ئەوەی دیکەشیان بۆ پەیوەندییەکان لەگەڵ شیعەی لوبناندا تەرخانە. بەندی سێیەم بە پاشخانی مێژوویی پەیوەندییەکانی ئێران بە کوردی عێراق و شیعەی لوبنان بەر لە کودەتای ١٩٥٨ی عێراق. بەندی چوارەم وردەکاری ئەوە دەخاتە ڕوو، چۆن ئێران ڕایەڵەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ کوردی عێراق و شیعەی لوبنان لەماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩٥٨ تا ١٩٦٣دا ڕاچاند. بەندی پێنجەمیش بە چڕی تیشک دەخاتە سەر پشتگیرییە

زەبەلاحەکەی ئێران بۆ کورد لە شەڕی دژ بە ڕژێمی پان عەرەبیزمی بەغدا هەروەک چۆن پشتی شیعەشی گرت، هەرچەندە بە شێوەیەکی نابەرچاوتر بوو، بۆ دارِسانە سەر ناسریزم لە ڕۆژهەلات لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٣ تا ١٩٦٨. بەندی شەشەمیش وردەکاری ئاراستەکەی دیکەی شایە، کاتێک هەندێ لە پشتگیری هاوپەیمانە نادەوڵەتییەکانی لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٨ و ١٩٧٣دا پاشەکشەی کرد. بەندی حەوتەمیش ئەوە نیشان دەدا، چۆن تاران لێبڕاوانە بڕیاری توندکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ کوردی عێراق و شیعەی لوبنان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٣ و ١٩٧٧دا دا. لە کۆتاییشدا و دوا بەند پەیوەندی هەوڵە سەرنەکەوتووەکانە بۆ سەرلەنوێ گرێدانەوەی پەیوەندییەکان شیدەکاتەوە. ئەنجامی ئەم کتێبە هەڵوێزینی کۆتا پەیوەندییەکانی ئێرانە بە کوردی عێراق و شیعەی لوبنان، ئاماژە بە "هێزە شارستانی و جوگرافیاکان" دەکا بەوەی لە پشت سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانەوە بوون. بەندەکانی نێو ئەم کتێبە بە شێوەیەکی سیستماتیکی میتۆدی دارێژراون و ڕاستەوخۆ و لە دەستی یەکەمەوە بەدوای مێژووی پەیوەندییەکانی ئێراندا بە کوردی عێراق و شیعەی لوبناندا لە سەردەمی بەر لە شۆڕشی ئێراندا چووە.

# بیبلیۆگرافیا

## کۆمەڵەی ئەرشیفکراو ئێران

Markaz-e Amouzesh va Pajooheshhay-e Beynolmelali-e Vezarat-e Omour-e
Kharejeh [Center of International Research and Education of the Ministry of
Foreign Affairs]
Markaz-e Asnad-Enghelab-e Eslami [Islamic Revolution Document Center]
Sazman-e asnad va Ketabkhane Melli-e Jomouhori Eslami [National
کتێبخانە و ئەرشیفی کۆماری ئیسلامی ئێران دۆکیۆمێنتە چاپکراوەکانی حکوومەت
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Aval, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr According to SAVAK Documents, Vol I, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Dovom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr According to SAVAK Documents, Vol II, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Sevom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr According to SAVAK Documents, Vol III, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Hezb-e Democrat-e Kurdestan-e Araq be Ravayet-e SAVAK [Iraqi Kurdistan
Democratic Party According to SAVAK]
Ravabet-e Iran va Araq be Ravayat-e SAVAK [Iran-Iraq Relations According to
SAVAK]
United States of America
US National Archives and Records Administration (NARAI), College

Park,
Maryland
Central Intelligence Agency Records Search Tool (Crest)
General Records of the Department of State, Record Group 59 (RG59)
Central Foreign Policy Files (CFP), 1967–69
A. REISINEZHAD
13
Central Foreign Policy Files (CFP), 1973–76, Access to Archival Databases
(AAD). Available at: http://aad.archives.gov/aad/
Records Relating to Iran, 1965–1975, LOT 77D400
Library of Congress
Papers of Archibald B. Roosevelt, Jr.
Richard M. Nixon Presidential Library (RMNL), Yorba Linda, California.
Available at: https://www.nixonlibrary.gov/
Gerald R. Ford Presidential Library (GRFL), Ann Arbor, Michigan.
ئەمانەش ئەمانەش لێرەوە بەردەستن:
https://www.fordlibrarymuseum.gov/collections-digital.aspx
Published Government Documents
United States Congress, House Select Committee on Intelligence, CIA: The Pike
Report. With an Introduction by Philip Agee, (Nottingham, England: Spokesman Books, 1977).
Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives),
Volume XVII, February 1970 Iraq.
Congressional Record
Foreign Relations of the United States (FRUS) (Washington, DC: US Government
Printing Office)
1946
VII: The Near East and Africa (1969)
1949
VI: The Near East, South Asia, and Africa (1977)

1952–1954
X: Iran, 1952–1954
1958–1960
XII: Near East Region; Iraq; Iran; Arabian Peninsula (1992)
1961–1963
XVII: Near East, 1961–1962 (1994)
XVIII: Near East, 1962–1963 (1995)
1964–1968
XXI: Near East Region; Arabian Peninsula (2000)
XXII: Iran (1999)
1969–1976
I: Foundations of Foreign Policy, 1969–1972 (2003)
XI: South Asia Crisis, 1971 (2005)
XXIV: Middle East Region and Arabian Peninsula, 1969–1972
XXVII: Iran; Iraq, 1973–1976 (2012)
XXXVIII: Foundations of Foreign Policy, 1973–1976 (2012)
INTRODUCTION
14
E-3: Documents on Global Issues, 1973–1976 (2000)
E-4: Documents on Iran and Iraq, 1969–1972 (2006)
Public Papers of the Presidents: Dwight D. Eisenhower, 1953.
Washington, DC:
US Government Printing Office, 1960.
Public Papers of the Presidents: Gerald R. Ford, 1976–77, Book III.
Washington,
DC: US Government Printing Office, 1979.
Online Document Collections
Cold War International History Project (CWIHP), Woodrow Wilson
International
Center for Scholars, Washington, DC
"New Evidence on the Iran Crisis 1945–46: From the Baku Archives,"
Cold War
International History Project Bulletin 12/13 (2001):309–314. Available at:
http://www.wilsoncenter.org/publication/bulletin-no-1213-fallwinter-2001

Yegorova, Natalia I., The “Iran Crisis” of 1945–46: A View from the Russian
Archives, Working Paper 15. Washington, DC: CWIHP, 1996. Available at:
http://www.wilsoncenter.org/publication/the-iran-crisis-1945-46-view-therussian-archives
National Security Archive, George Washington University (NSA-GWU), Washington, DC
Digital National Security Archive (DNSA). Available at: http://nsarchive.chadwyck.com/
Electronic Briefing Book (EBB) 265. Available at: http://www2.gwu.edu/~nsarchiv/NSAEBB265/
Henry Kissinger Telephone Transcript (State-Kissinger), U.S. Department of State
Electronic Reading Room. Available at: http://foia.state.gov/Search/Collections.aspx
Israel State Archives, On-Line Collection: Prime Minister Golda Meir and the
Shah of Iran in 1972. Available at: http://www.archive.gov.il/ArchiveGov/pirsumyginzach/TeudaBareshet/GoldShah/
Special Collection: A Life in Intelligence—The Richard Helms
Collections (CIAHelms), US Central Intelligence Agency Electronic
Reading Room. Available at:
http://www.foia.cia.gov/collection/life-intelligence-richard-helms-collection
Author's Interviews
Ali Akbar Mohtashampour
Seyyed Hossein Nasr
Ebrahim Yazdi
A. REISINEZHAD
15
Published Interviews
Foundation for Iranian Studies Oral History Collection (FISOHC)
General Mansur Qadar

Harvard Iranian Oral History Project (HIOHP)
Colonel Isa Pejman
Books
Adib-Moghaddam, Arshin, Iran in World Politics: The Question of the Islamic
Republic (Oxford University Press, November 9, 2010).
Alagha, Joseph, Hezbullah's Documents: From the 1985, Open Letter to the 2009
Manifesto (Amsterdam University Press, April 15, 2011).
Alam, Assadollah, Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi
Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. I: 1347–1348/1968–1969 (Bethesda, MD: Iranbook, 1993).
Alam, Assadollah, Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi
Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995).
Alam, Assadollah, Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi
Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973
(Bethesda, MD: Iranbook, 1995).
Alam, Assadollah, Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi
Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974
(Bethesda, MD: Iranbook, 2000).
Alam, Assadollah, Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi
Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. V: 1954/1975
(Bethesda, MD: Iranbook, 2003).
Alam, Assadollah, Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi

Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. VI:
1355–1356/1976–1977 (Bethesda, MD: Iranbook, 2007).
Alam, Assadollah, Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi
Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. VII:
1346–1347/1967–1968 (Bethesda, MD: Iranbook, 2014).
Azani, Eitan, Hezbollah: The Story of the Party of God, from Revolution to
Institutionalization (Palgrave Macmillan, 2009).
Beeman, William, The Great Satan vs. the Mad Mullahs (University of Chicago
Press, April 15, 2008).
Bill, James, The Eagle and Lion (Yale University Press, Reprint edition, September
10, 1989).



Bulloch, John, No Friends but the Mountains: The Tragic History of the Kurds
(Oxford University Press, January 7, 1993).
Buzan, Barry and Ole Waver, Regions and Powers: The Structure of International
Security (Cambridge University Press, December 4, 2003).
Chaliand, Gerard, A People Without a Country: The Kurds and Kurdistan (Interlink
Pub Group Inc, 1993).
Gold, Dore and Daniel Diker, Iran, Hezbollah, Hamas, and Global Jihadi: A New
Conflict Paradigm for the West (Jerusalem Center for Public Affairs, January 18,
2007).
Ehteshami, Anoushirvan, After Khomeini: The Iranian Second Republic

(Routledge, March 10, 1995).
Hall, Peter and Rosemary C. R. T Taylor, Political Science and the Three New
Institutionalism. (1996). Political Studies, 44: 936–957.
Kamrava, Mehran, Political History of Modern Iran: From Tribalism to Theocracy
(Praeger, December 10, 1992).
Lawrence, Quil, Invisible Nation: How the Kurds' Quest for Statehood Is Shaping
Iraq and the Middle East (Walker Books, July 7, 2009).
Levitt, Matthew, Hezbollah: The Global Footprint of Lebanon's Party of God
(Georgetown University Press, April 9, 2015).
Louer, Laurence, Shiism and Politics in the Middle East (Columbia University
Press, October 30, 2012).
Maleki, Abbas and Kaveh Afrasiabi, Reading in Iran Foreign Policy After September
11 (BookSurge Publishing, October 23, 2008).
Marvin, Sabrina, The Shi'a Worlds and Iran (Saqi Books, June 21, 2011).
McDowall, David, A Modern History of the Kurds (London: I.B. Tauris, 2007 ed).
Mckiernan, Kevin, The Kurds: A People in Search of Their Homeland (St. Martin's
Press, 2006).
Mesbahi, Mohiaddin, Free and Confined: Iran and the International System.
(Spring 2011). Iranian Review of Foreign Affairs, 5 (2): 9–34.
Milton-Edwards, Beverley and Stephen Farrell, Hamas (Polity, April 26, 2010).
Nasr, Vali, The Shia Revival: How Conflicts Within Islam Will Shape the Future
(W. W. Norton & Company, April 17, 2007).
Norton, Augustus R, Hezbollah: A Short History (Princeton University

Press,
2007).
Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the U.S.
(Yale University Press, 2007).
Pollack, Kenneth, The Persian Puzzle (Random House Trade Paperbacks, August
9, 2005).
Qassem, Naim, Hezbollah (Saqi Books, April 1, 2010).
Rajaiee, Farhang, The Iran-Iraq War: The Politics of Aggression (University Press of
Florida, April 20, 1993).
A. REISINEZHAD
17
Ramazani, Rouhollah, Reflections on Iran's Foreign Policy. (Spring 2010).
Iranian Review of Foreign Affairs, 1 (1).
Ramazani, Rouhollah K, Ideology and Pragmatism in Iran's Foreign Policy. (Fall
2004). The Middle East Journal, 58 (4).
Shay, Shaul, The Axis of the Evil: Iran, Hizballah, and the Palestinian Terror
(Routledge, January 31, 2005).
Stakelbeck, Erick, The Brotherhood: America's Next Great Enemy (Regnery
Publishing, July 15, 2013).
Randal, Jonathan, After Such Knowledge, What Forgiveness? My Encounters with
Kurdistan (London: Westview Press, 1999).

پەرەسەندن و ڕەوتی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لەژێر ڕکێفی حوکمڕانیی شادا، بە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕێی کۆمەڵێک لە گەف و دەرفەتی جیۆسیاسی و جیۆکەلتووری نێودەوڵەتی و هەرێمی و نێوخۆی شەقڵی خۆی وەرگرتبوو. ستراتیژی پەیوەندییەکانی ئێرانی پەهلەوی بە هەریەک لە کوردی عێراق و شیعەی لوبنان بۆ بەرزەفتکردنی دوژمنانی ئێران، دارێژرابوو. لە هەمان کاتیشدا، دەرفەتگەل ڕێگەی بۆ دارشتنی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران خۆشکرد. لەوەش پتر، کۆمەڵێک تەداروکی دامودەزگای نێو ئێرانی پەهلەوی بەرپرسیار بوو لە شەقڵپێدانی جموجۆڵی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران.

ئەم بەندە لە سێ بەش پێک دێ. بەشی یەکەم تیشک دەخاتە سەر گەف و هەڕەشەکانی نێودەوڵەتی و هەرێمی و نێوخۆیی –بە هەردوو گەف و هەڕەشەی جیۆسیاسی و جیۆکەلتورییەوە- قەناعەتی بە ئێران هێنا سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانە لە کوردستان و باشووری لوبناندا بەرجەستە بکا. بەشی دووەمیش سەرەداوە دیاریکراوەکانی دەرفەتگەلی هەرێمی و نێودەوڵەتی نیشان دەدا، کە زەمینەیەکی بەپیتی بۆ ئێران ڕەخساند تا شەقڵی پەیوەندی ستراتیژییانە لە کوردستانی عێراق و باشووری لوبناندا وەربگرێ. هەرچی بەشی سێیەمیشە جەخت دەکاتە سەر دەزگا سەرەکییە سیاسییەکان لەنێو ئێرانی پەهلەوییدا کە بەرپرسیار بوون لە ڕاکێشانی تۆڕی پەیوەندی لەگەڵ کوردی عێراق و شیعەی لوبناندا. کارلێککەری سیستماتیکیانەی ئەم سێ بەشە فاکتەری ئاڵۆز و دنەدەری دارشتەی شەقڵی سیاسەتی دەرەکی نادەوڵەتیانەی ئێرانن.

### ١- هەڕەشەکان

شا لە وتەیەکیدا بۆ ژنانی ئێران گوتی: "بەڵێ، ئەو ئازادییە مەزنە سەرلەنوێ هاوپەیمانییە ناپیرۆزەکەی سوور و ڕەشی لە ئێران و دەرەوەدا بووژاندەوە. لێ ئێمە درێژە بە سیاسەتەکەمان دەدەین، چونکە ئەو

دینگانەی ئەم وڵاتەیان ڕاگرتووە، لەلایەن شــۆڕشــی گەل- شــا و پارتی ڕستاخیز، ئەم نەتەوەیە ڕۆنراوە، ئەم دینگانەش بەهێزن و بە دواهەناسەی ئەم هاوپەیمانە ناپیرۆزە لە گیانەڵادایە زەرەرمەند نابێ. ئەم کاروانە هەرگیز ناوەستێ. دەی با سەگ بوەڕێ؛ خۆ مانگ هەر شەوق دەداتەوە."[25]

لە کانوونی دووەمی ١٩٧١یشــدا شــا بە ئەســەدوڵڵا ئەعلەمی گوت: "**من دەزانم پارەیەکی زۆر لە ســوپا خەرج دەکەم، بەڵام پێویســتە چی بکەم؟ گەلۆ ئەوە قبووڵ دەکرێ لە عێراقەوە تێمان بسرەوێنرێ؟**"[26]

گەفەکان لەبارەی مانەوە و ئاسایشی دەوڵەتەوە بوون. داڕشتە و پێواژۆی گەفەکان چەقی بازنەی ئاســایشــی نەتەوەیین. هەر کاتێک پرســێک وەک هەڕەشەیەکی کوشندە لەسەر دەوڵەتێک دابنرێ، ئەوا بۆی هەیە هەرچی لە دەســتی بێ بۆ ڕێپێگری و چــارەســەکردنی بگرێتەبەر.[27] بە حوکمی هەڵکەوتەی جیۆســتراتیژ، لە مێژووشــدا ئێران بــابەتێکی هەڕەشــە نێوخۆییەکان بووە. شــێوازە حوکمڕانییە پاوانخوازییەکەی شــا، دەوڵەتە نەوتــدارەکەی ئێران و ئێرانی کۆمەڵگەی فرەڕەگەز-دیین و زمــانیش بە شــێوەیەکی ســروشــتی مایەی گەفە نێوخۆییەکان بووە. لە ســەرووی هەمووشیانەوە، جەنگی سارد و دراوسێبوونی لەگەڵ یەکێ لە زلهێزەکان، هەر واش بوو یەکێتیی سۆڤیەت، ئاستێکی نێودەوڵەتیی گەفوهەڕەشەی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی ئێرانی پەهلەویی سەربار کرد. ئەم هەڕەشانە بە هەژموونێکی ســێ لایەنی جیۆســیاســی و جیۆکەلتوری و جیۆئابووری

---

[25] پارتی ڕستاخیز لە لایەن شا و لە ساڵی ١٩٧٥دا دامەزراوە.
Kongereh-ye Bozorg-e Zanan-e Iran [The Grand Congress of Iranian Women] (Tehran: Women's Organization of Iran, 2536 [1978]), 3–5.

[26] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995), p. 148.

[27] Buzan, Barry, Ole Wæver and Jaap deWilde. Security: A New Framework for Analysis, (Boulder: Lynne Rienner, 1998). p. 36.

کارلێککەر بوون، وایانکرد یەکانگیریی خاکی ئێران و ناسنامە و ئابوورییەکەی بخەنە مەترسییەوە.

هەڕەشەکانی جیۆپۆلیتیک چ بە هۆی جوگرافییەوە سەریان هەڵدابێ و بەهێز بووبن، ئەوا هەڕەشەی سەربازیین و مانەوەی دەوڵەت و دارشتەکەی دەخەنە بەرمەترسی. خۆی ئەمانە هەڕەشەی نەریتیانەن کە فشار دەخەنە سەر ئاسایشی دەوڵەتەوە. دەوڵەتیش مەیدانی سەرەکی ڕەهەندی جیۆپۆلیتیک بوو، کە بە شێوەیەکی نەریتیانە ڕووبەڕووی دەوڵەت بووەتەوە. ئەمەش چ بە هۆی جوگرافیانەوە سەری هەڵدابی یان چڕتربووبێتەوە، ئەوا گەفە جیۆکەلتورییەکانیش گەفی ئایدۆلۆژی-کەلتوری ڕێسائاسان، کە ناسنامەی دەوڵەت دەخەنە بن هەڕەشەی خۆیانەوە. ئاماژەی هەرەسەرەکی بابەتەکەش لەم مەیدانەدا نەتەوە و ناسنامە و بەراددەیەکیش ئایدۆلۆژیای زاڵ و کەلتور و بەهاکانییەتی. هەرچی هەڕەشەکانی جیۆئابوورین گەف و هەڕەشەی ئابوورین، کە بە هۆکاری جوگرافیاییەوە سەرهەڵدەدەن یان تیژتر دەبن. سەرچاوە بەربەرینەکەی ئێران بۆ نەوت لە خوزستانی پارێزگای باشوورەوەیە، هەروەک چۆن ئەو فرەنەوتەی دەکەوێتە سەر بەشی باشووری کەناراوی کەنداوی فارسەوە، بووەتە ئامانجی ئەم جۆرە گەف و هەڕەشانە. وێڕای ئەو بایەخەی بۆ سیاسەتی دەرەکی هەیە، سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە بن ڕکێفی حوکمڕانی شادا، بە گەفە جیۆئابوورییەکان کارانگاز نەبوو.[28] هەر بەڕاستیش، لەوێدا گەفی جیۆسیاسی و جیۆکەلتوری هەبوون و بوونە

[28] نەوتی ڕۆژهەلاتی ناوین دنەدەرێکی بەهێزی سیاسەتی هەردوو زلهێزەکان بووە. ئێران دەروازەیەکی زێڕین بووە بۆ سەرچاوەی لەبنەهاتووی نەوتی ڕۆژهەلاتی ناوین، کە دەکرا ڕۆڵێکی چارەنووسسازانە لە شەڕ لە دژی یەکێتیی سۆڤیەتەوە بگێڕێ. بۆ سیاسەتدارێژەرانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەدەستدانی سەرچاوەی نەوتی بەغدا و ڕیاز دەکرا ببێتە مایەی هەڵگیرسانی جەنگی نەوت لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت و پێچەوانەکەشی هەر ڕاست بوو. وێڕای کێشمەکێش لەسەر نرخی نەوت، ترس لە مجێزبەرزیی سەددام حوسێن، شای ئێرانی هاندا گەفی سەرهەڵداو لە لایەن عێراقەوە بە پشتگرتنی پێشمەرگەکانی بارزانی بەرزەفت بکا.

ـایەی شەقڵپێدانی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران. ئەم گەفانەش ـریتی بوون لە هەڕەشەی سوور، هەڕەشەی عەرەب، هەڕەشەی کورد، هەرەشی ڕەش و هەڕەشەی فەڵەستینییەکان.

**هەڕەشەی سوور**

هەر لە ڕۆژگاری داگیرکردنی پترۆسی مەزنەوە لە ١٧٢٢-١٧٢٣ بۆ ـکووری ئێران، هەڕەشەی ڕوس بە شێوەیەکی هەمیشەیی بۆ پاشاکانی ێران مایەی هەڵسەنگاندنی مەترسی بووە. پەیمانامەی گوڵستانی ٢٤ی ۆکتوبەری ١٨١٣ و تورکمانچای لە ١٠ی فێبرایری ١٨٢٨، ئێرانی قاجاری ـچارکرد بۆ ڕوسیا واز لەو بەشە خاکە مێژووییەنەی باشووری قەوقاز ـهێنی.[٢٩] ئەم پەیمانە سەربەخۆیی تەواوی ئێرانی سنووردار کرد و ولاتەکەی کردە بەرەی شەڕی سەرەکی کێبڕکێ ڕوسیا-بریتانیا لە ئاسیادا. بەو یادەوەرییە مێژووییە لە زەیندا، ئێرانییەکان بە کردەنیازی جیۆپۆلیتیکی هەرەشە سوورەکە، فراوانخوازیتی ڕوسیایان پێ هەڕەشەیەکی دژوار بوو ـەسەر یەکانگیری خاکی ئێران و سەربەخۆبوونەکەی. ئەم هەڕەشە ـێژوویەی ڕوس لەگەڵ دامەزراندنی ئیمراتۆریەتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی چرتر بووەوە، ئیدی کۆمۆنیزم بووە هەڕەشەیەکی کەلتوری گەورە بۆ ـەر ئێران. بە هۆی جەنگی ساردیشەوە، هەڕەشە سوورەکە بە شێوەیەکی هیمادار لە هەردوو ڕەهەندی جیۆپۆلیتیکی و جیۆکەلتوری کاری خۆی کرد و مانەوە و سەلامەتی دەوڵەت و ڕژێمەکەی ئێرانی خستە ژێر مەترسییەوە.

ـوای شکستی دامودەزگای سەربازیی نازی لە دووەمین جەنگی جیهانییدا، هەلمەتی فرەوانخوازانەی ڕوس لەگەڵ جەنگی ساردا و لە کێبڕکێی ولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکادا زیاتر کڵپەی سەند و گەیشتە ئەوەی لە هەرەشەیەکی هەرێمییەوە بپەڕێتەوە بۆ هەڕەشەیەکی نێودەوڵەتی.

---

[٢٩] ئەو خاکەی دەکەوێتە باکووری ڕوباری ئاراس لە ڕۆژگاری ئێستاماندا کۆماری ئازربایجان، ـاغستان، ئەرمینیا و جورجیا پێکدەهێنێ.

کۆمۆنیزمیش لە سەرهەڵدانی لەگەڵ یەکەمین جەنگی جیهانی و تیرتربوونی لەگەڵ سەرکەوتنەکەی لە جەنگی دووەم دا، بووە وتارێکی زاڵی هێزی دژەحکوومەت لە جیهانی سێیەمدا. لە گۆشەنیگای (شا)شەوە، کۆمۆنیزم داردەستی ئایدیۆلۆژیانەی مۆسکۆ بوو بۆ گەیشتن بە ئامانجە لەمێژینە بەردرێژەکەی تا بگاتە ئاوە گەرمەکانی کەنداوی فارسی. لە لێکەوتەشدا، ئێران ڕاستەوخۆ بە ئاستە نێودەوڵەتییەکە پەیوەست بوو، ئەمەش لەچاوی نزیکییە جیۆگرافییەکەی لە ڕوسیا و هەروەها بەهۆی کۆتایی دووەمین جەنگی جیهانەوە بوو.

لە ڕوانگەی شاوە، هەڕەشە سوورەکە وەنەبێ هەر لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لە جووڵەدا بووبێ، بەڵکو هەڕەشەکانی هەرێمی بۆ سەر ئێران چەند قات زیاتر کردبوو. بە پلەی یەکەم، ئەو وای دانابوو ڕژێمە پان عەرەبییەکان هاوپەیمانی مۆسکۆن لە هەرێمەکەدا. میسر لە ناوەڕاستی پەنجاکان و عێراقیش لە کۆتایی پەنجاکاندا، کە ڕێڕەویان لە لایەنداریێتی ڕۆژئاواوە بەرەو حکوومەتی نیمچە سۆشیالیست وەرگەڕاند و پەیوەندییان لەگەڵ مۆسکۆدا پەیداکرد و چەک و جبەخانەشیان لەوێوە بۆ دابین دەکرا. بە دروستکردنەوەی دووەمین ڕژێمی بەعس لە ئاخر و ئۆخرییەکەی شەستەکاندا، ئیدی عێراق بووە سەرەکیترین هاوپەیمانی سۆڤیەت لە هەرێمەکەدا. لە ناوەڕاستی حوزەیرانی ١٩٦٩شدا، ئەسەدوڵلا ئەعلەم هۆشداری دایە باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران، بەوەی "عێراق بووەتە کۆڵۆنێکی (موستەعمەرەیەکی) سۆڤیەتی".[٣٠] پەیماننامەی دۆستایەتی عێراق-ڕوسیا لە نیسانی ١٩٧٢دا گڕی بەردایە گومانەکانی

[30] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. I: 1347–1348/1968–1969 (Bethesda, MD: Iranbook, 1993). p. 71.

**هاتنەڕیزی** مۆســـــکۆ- بەغدا.[٣١] ئەو وەهای دانابوو کە توانســـــت و نیازی سۆڤیەت بۆ وەرچەرخانی تەداروکی هێزی هەرێمی لەسەر حیسابی ئێرانە، کە "بەردەوام دەوڵەتی دراوســـــێی دژی تاران بەکاردەهێنێ" و توانســـــتی ســـــەربازیانەی دوژمنە هەرێمییەکانی ئێران پەرەپێدەدا.[٣٢] ئەو بەردەوام نیگەران بوو لەو پەیوەستییە سیاسی-سەربازییەی مۆسکۆ بە هەریەک لە ڕژێمە عەرەبییەکان و قەوارە نادەوڵەتییەکان، هەروەک فەڵەســـتینیەکان و شـــۆڕشـــگێڕانی غەففار لە عومان.[٣٣] لە هەمان کاتیشـــدا، چەک و جبەخانەی قەبەی ڕوســـــــی و یارمەتی دارایی بۆ ڕژێمە پان عەرەبییەکان و دەرفەتی هێنانەپێشەوەی ئەو هەڕەشەیەی مۆسکۆ بەوەی ئەو هێزانە ناچاربکا بەگژ ئێرانیاندا بێنی، ئیدی بەم جۆرە هەڕەشە سوورەکە بۆ سەر ئێران تا دەهات قەبەتر دەبوو. "**برێجنێف بە ئیرەییەوە هۆشـــداری دامێ بەوەی کێشـــەکانی کەنداوی فارســـــی لەوانەیە بۆ "هەڵگیرســـــانی" شـــــەڕێکی دیکەی جیهانی سەربکێشی**،" شا بەم شێوەیە نیگەرانییەکانی خۆی بۆ ئەعلەم سەبارەت بە پشـــتگیریی مۆســـــکۆ بۆ بەغـدا لە دژی ئێران ڕوونکردەوە.[٣٤] بە پلەی دووەمیش، لە ڕوانینی شـــــاوە، وڵاتە عەرەبییەکانی هەرێمەکە زەمینەیەکی لەبار بوون بۆ کودەتا و شۆڕشی کۆمۆنیستی. بۆ شا، کۆمۆنیزم کاریگەیی نەیارانەی لە هەرێمەکەدا هەبوو. شـا بە ســەرەک فۆردی گوت: "**خۆ ئەگەر**

---

[31] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995), p. 270.

[32] A secret U.S. State Department document, April 1974, Documents of the United States Embassy in Tehran, Volume 8, 1979, 65.

[33] A secret U.S. State Department document, April 1974, Documents of the United States Embassy in Tehran, Volume 8, 1979, 65.

[34] The Shah visited Moscow in June 1965. Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook. 2000). p. 253.

**جارێک حکوومەتێکی کۆمۆنیستی ڕەوات هەبوو، ئەوا یەکسەر دزە دەکەن و بەهەموو لایەکدا پەرشــوبڵاو دەبنەوە.**"[35] لە ڕوانگەی شـــاوە، دەوڵەتانی عەرەب هەم ســـاختە و هەم لاوازن؛ هەر بۆیە زوو یان درەنگ ســـەراوبن دەبن و ڕژێمی کۆمۆنیســـتی جێگەیـان دەگرێتەوە. دامەزرانـدنی ڕژێمی کۆمۆنیستی لە حوزەیرانی ١٩٦٩دا لە باشووری یەمەندا ئەم نیگەرانییانەی پشتڕاست کردنەوە.[36]

هەروەها هەرەشـــــە ســـــوورەکە هەردوو لای دەوڵەت و مانەوەی ڕژێمی خستبووە ژێر مەترسییەوە. ئێران وەک کۆمەڵگەیەکی دێرینی فرەڕەگەز و زمان، ئامانجێکی کۆمۆنیزمی ڕوســـی بوو. هەر لە بەرەبەیانی شـــۆڕشـــی بەلشــەفی لە ١٩١٧دا، مۆسکۆ ڕایەڵەی پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ گرووپە غەیرە فارســەکاندا ڕاچاند، بەتایبەتیش لەگەڵ ئازەری و کورد. هەر زووش دەســـتەبژێری ئازەری و کورد ڕەگەڵ کۆمۆنیســـتەکان کەوتن، نموونەش حزبە لایەندارەکانی ســۆڤیەت وەک تودە، حزبی دیموکراتی کوردســـتان و پـارتی دیموکراتی ئـازربـایجـان. هەروەهـا ســـۆڤیەت هەردوو کۆمـاری ئازەربـایجـان و مهابادی بەرهەم هێنا کە زیاتر لە ســـاڵێکیان نەخایاند (دیســیمبەری ١٩٤٥-دیســیمبەری ١٩٤٦)، ئیدی شـــا هەرگیز توانســتەکەی کۆمۆنیزمی لەبارەی خستنە ژێرباڵی گرووپە جوداخوازەکانی لەبیرنەچوو. سەرباری ئەمەش، دابەشکردنی نادادپەروەرانەی سامان، گەندەڵی بەربڵاو و پــاوانخوازێتی ســــیســـــتمی ئێرانی پەهلەوی، زەمینێکی بەپیتی بۆ بزووتنەوەی کۆمۆنیســـتی خۆشــکرد، کە ڕژێمی پەهلەویان کردە ئامانجی

[35] Memorandum of Conversation, May 15, 1975. (FRUS 1969–1974, XXVII, 377).

[36] Southern Yemen gained its independence initially under the name of the People's Republic of Southern Yemen on 30 November 1967 under the control of the National Liberation Front (NLF). Two years later, however, a radical Marxist wing of the NLF transformed the country into a communist one and reorganized it as the People's Democratic Republic of Yemen.

خویـان. تودە (بە فـارسـی واتە حیزبی گەل) کە لە ١٩٤١دا دامەزرا، لە مێژووی نوێی ئێراندا حزبێکی پڕجەماوەر بوو. بە بەهەندهەڵگرتنی بنکەی پشتگیریی دەرەکی و دۆستایەتی نزیکی لەگەڵ مۆسکۆ، شا وەهای بینی گوایە تودە تابووری پێنجەمی ڕوسەکانە کە دڵسۆزییان بۆ دەستووری تاران لەژێر پرسیاردایە. حیزبی تودەش بە پشتگیری خۆی بۆ داخوازی سۆڤیەت بۆ نەوتی ئێرانی لە دەریای خەزەردا و بە لایەنگری کۆمارە جواخوازییەکانیش ناسراو بوو. لە کۆتاییدا و دوای کودەتاکەی ١٩٥٣، حکومەت حزبەکەی سەرکوت کرد.

ـرەنگانێکی پەنجاکان، کۆمۆنیزم سەرلەنوێ لەژێر بەیداخی گرووپێکی میلیشیایی بە ناوی سازمانی چریکهای فیدائی خەلق و گرووپێکی ئیسلامی مارکسی بە ناوی سازمانی موجاهدینی خەلقی ئێران بووژایەوە. شا بەردەوام لەو بڕوایەدا بوو، **کە 'کۆمۆنیزم دژی قانونە'. ئەمەش ئەوی لێکەوتەوە؛ کۆمۆنیست بە زیندانی سیاسی نەژمێردرێ، بەڵکو بە تاوانبارێکی ئاسایی... 'ئەوانە ئەو خەڵکانەن دەبێ ئێمە لەناویان بەرین.'**[٣٧] کۆمۆنیزم تا کۆتایی فەڵەمڕەوێتی (شا)ش هەر بە مەترسییەکی گەورەی ناوەخۆ دادەنرا.

### گەف و هەڕەشەی عەرەب

هەر لەوکاتەی عەرەبی موسڵمان لە ماوەی نێوان ٦٣٢-٦٥٤ی زاییندا ئێرانیان خستە ژێر جڵەوی خۆیان، ئێران بووە بابەتێک بۆ هەڕەشەی عەرەب. وێڕای بە ئیسلامبوونی ئێران، هەرگیز وڵاتەکە بە عەرەب نەکرا. لە ڕێی دەستپێوەگرتنی توند بە شارستانیەت و بوژاندنەوەی زمانی فارسی، ئێران هەر بە ئێرانی مانەوە. دوای دوو سەدە لە بگرەوبەردەی ئاژاوە و یاخیبوونی بێ پسانەوە، ئێران سەریهەڵدایەوە. بە دامەزراندنی

---

[37] The Shah of Iran: An Interview with Mohammad Reza Pahlavi, New Atlantic. 1 December 1973.

ئیمپراتۆریەتی سەفەوی لە سەرەتای سەدەی شانزەهەمدا، دابەشبوونی سوننە و شیعە بووە سەرباری ڕکابەریی ئێرانی –عەرەب. ئیدی وێڕای ئەم پاشخانە مێژووییە، ئێران پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ دەوڵەتە نوێیە سەرهەڵدراوەکانی عەرەب لە هەرێمەکە لە سییەکاندا بەست. لەگەڵ ئەوەشدا، هەڕەشەی عەرەب ئەمەش لەگەڵ دیاردە جیۆپۆلتیکەکە و یەکێتیی عەرەب و ڕوانینە جیۆکەلتورییەکەی لە پان عەرەبیزم لە ئاخروئۆخری پەنجاکاندا هاتەوە پێش.

لە ناوجەرگەی جەنگی ساردیشدا، پان عەرەبیزم سەرەکیترین هێزی بەهەرێمبوون بوو، کە بەڵێنی بە هەرێمە عەرەبزمانەکان دەدا بۆ یەکێتی، ئەمەش هەر لە ئۆقیانوسی ئەتڵەنتی تا دەگەیشتە کەنداوی فارسی درێژ دەبووەوە. یەکەم جار پان عەرەبیزم لە لایەن جۆرجی زێدان و بزووتنەوەی نەهزە (النهضة) لە ئاخروئۆخری سەدەی نۆزدەهەمدا داڕێژرا. لەگەڵ ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش هەڕمێنی پەیداکرد،[٣٨] کەچی لە سایەی جەمال عەبدولناسردا پان عەرەبیزم بەسەر هەرێمەکدا کشا و باڵکێش بوو. ناسر بە کودەتاکەی ٢٣ی تەمموزی ١٩٥٢ دەسەڵاتی قاهیرەی وەرگرت و هەر زووش ئاڵنگاری هێزەکانی ڕۆژئاوا و هاوپەیمانەکانیان بە ئێرانیشەوە بوویەوە.[٣٩] قەیرانی سوئێسیش لە ١٩٥٦دا لە ڕاددەبەدەر پێگەکەی لە جیهانی عەرەبدا چەسپاند. پەیمانی بەغدای ١٩٥٧ وەک بەربەستێک

[٣٨] سەرەتا پان عەرەبیزم لە لایەن شەریف حوسێن بن عەلی، شەریفی مەککە پەیڕەوکرا. بەڵێنی ئەوەی دا دەوڵەتێکی عەرەبی یەکگرتوو دابمەزرێنێ، کە پێکبێ لە خاکی عەرەب، ئەو خاکەی ئەوەی لەژێر چنگی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو، ئەو لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا لایەنی سوپای بریتانیای دژی تورکەکان گرت. بیرۆکەی یەکخستنی خاکی عەرەب دوای ئەو لە لایەن کوڕەکەیەوە پەیڕەوی لێکرا، واتە عەبدوڵلای یەکەم لە ئوردن، ئەو کەسەی خەونی بە سوریایەکی مەزنتر دەبینی، کە بریتی بێ لە سوریا و ئوردن و فەلەستین.

[٣٩] پلاندارێژەرانی کودەتاکە ژەنەڕاڵ محەمەد نەجیبیان وەک یەکەمین سەرۆکی میسر دانا. هەرچەندە هەر زوو ئاشکرا بوو، کەوا سەرکردە ڕاستەقینەکەی شۆڕش ناسر بوو. هەر زوو کێشە لەگەڵ نەجیب لەبارەی ستراتیژیەکان پەیدابوو، سەرەنجام لە ١٩٥٤دا لەسەر تەخت لابرا.

ـەبەردەم یەکێتیی عەرەب دەبینرا، ئەوە بوو ناسر لە ٢٢ی شوباتی ١٩٥٨دا ـەگەڵ سـوورپادا کۆماری عەرەبی یەکگرتووی پێکهێنا. ئەمەش بزوێنەری زنجیرەیەک ڕووداوی ناسەقامگیری هەرێمەکە بوون، بە یەکەمین شەڕی ناوخۆی لوبنان لە ١٩٥٨ و کودەتاکەی عێراق لە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨. وێرای پەرەسەندنی گرژی لە نێوان بەغدا و ناسر لەسەر ڕابەرایەتیکردنی عەرەب، کەچی هەڕەشەی عەرەب بۆ ئێران لە شەستەکان و هەفتاکاندا ئاڵنگاری بوو.

بە ڕوانینی شا، پان عەرەبیزم بە شێوەیەکی سروشتکرد ئایدیۆلۆژییەکی دژەئێرانی بوو. سەرەتا شا ڕژێمە پان عەرەبیزمەکانی بە هاوپەیمانی سروشتی سۆڤیەت دانا. بە ڕوانینی ئەو، ناسر و سەرکردە پان عەرەبیزمەکانی بە پاشخانی بلۆکی سۆشیالیست، نۆکەری مۆسکۆ بوون تا دەست بەسەر کەنداوی فارسیدا بگرن. دوای کودەتاکەی عێراقیش لە ١٩٥٨دا، شا ڕووبەڕووی سەرهەڵدانی کۆمۆنیزم لە عێراقدا بووەوە. بارەگای سەرەکی حزبی تودەی ئێرانیش لە سلێمانی و بەسرا بوو. موسڵیش مێوانداریتی حزبە کۆمۆنیستەکانی تورکی و سوری کرد و پارتی کۆمۆنیستی ئوردنیش بنکەی خۆی لە نەجەف و کەربەلادا دانا.[٤٠] دووەم، پان عەرەبیزم لەسەر بنەمای شەقڵپێدانی هەڕەشەی دەرەکی ڕۆنرا تا ناسنامەی نایەکانگیریی ناسنامەی عەرەب پتەوتر بکا.[٤١] بۆ سەرکردە پان

---

[40] SAVAK Documents, No. f-b2b2/15607, 6 February 1960; SAVAK Documents, No. 7b4/8200, 13 December 1958; SAVAK Documents, No Number.

[41] For more detailed discussions see Laclau, Ernesto. New Reflections on the Revolution of Our Time, Cambridge: Cambridge University Press, 1990; Laclau, Ernesto. The Making of Political Identities, Cambridge: Cambridge University Press, 1993; Laclau, Ernesto, and Chantal Mouffe, Hegemony and Socialist Strategy: towards a Radical Democratic politics. Verso, 1985; Melucci, Alberto, Challenging Codes: Collective action in the information age, Cambridge University Press, 1996; Torfing, Jacob.

عەرەبیزمەکان، زایۆنیزم و ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوا دوژمن بوون. گومانی مێژووییانەی عەرەب لە ڕۆڵی ڕۆژئاوا بۆ دروستکردنی ئیسرائیل و لەیەکترازاندنی یەکێتیی عەرەب دنەی دەنگی پان عەرەبیزمی دژ بە ڕۆژاوا دلێرتر کرد.[42] ئیدی لەگەڵ ئەو بەرەوتەدا، ئیسرائیل و ڕژێمە لایەنگرەکانی ڕۆژئاوا، بەشێوەیەکی بەرچاویش ئێران، بوونە ئامانجی پروپاگەندەی پان عەرەبیزم و ئەوەیان جاڕدا گوایە ئێران ژێربەژێر هاوکاری ئیسرائیل دەکا، ئەمەش وەک "پیلانێکی ناپاکانەی تا عەرەب لەنێوخۆیاداندا دابەش ببن"[43] سەیر دەکرا. بە پلەی سێهەمیش، هەر زوو پان عەرەبیزم کەوتە داوی هێڵی شیرازەتێکچوونی ڕەگەزی-دینی عەرەب-ئێرانی و دابەشبوونی شیعە و سوننە. هەر بۆیە سنووری کێشمەکێشی ئێران لەگەڵ عێراقدا مەترسی ئەوەی لێکەوتەوە، هەرایەکی گەرم لەگەڵ وڵاتەکانی عەرەبدا پەیدابکا. بەگوێرەی قسەی سەرکردەکانی عێراق، شەڕ لەگەڵ ئێران، شەڕبوو لەگەڵ دوژمنی عەرەب. "عێراق شەڕی ئێران لەسەر یەکێک لە کێشەکانی لەگەڵ ئێراندا ناکا، بەڵکو مەبەستەکە ئەوەیە ڕێگر بێ لە چاوتێبڕینی ئێران و پارێزگاریکردنە لە عەرەبایەتی کەنداوی عەرەب(فارسی) و مافی عەرەب لە ڕێرەوی یەکاوی (شط) عەرەب (ڕێگای ئەروەند). عێراق لەگەڵ ئێران لەسەر بەرمیلی نەوت شەڕ ناکا، بەڵکو بەرگری لە سامانی نەتەوەی عەرەب دەکا لە {کەنداوی فارسی}.[44]سەرکردە پان عەرەبیزمەکانی بەغدا هەوڵیاندا بە تیشکخستنەسەر پەیمانی کۆنینەی هاوپەیمانی لەنێوان کۆرشی مەزن و جوو[45]، ڕەوایەتی ئەوە بدەنە دەست

---

Poststructuralist Discourse Theory: Foucault, Laclau, Mouffe, and Zizek, Cambridge: Cambridge University Press, 2005

[42] Barnett, Michael N. Dialogues in Arab Politics. (Columbia University Press, October 15, 1998). pp. 108–29

[43] Neda al-Watan, 22 March 1969.

[44] Kuwait 3511 to Ministry of Foreign Affairs, 13 February 1975.

[45] Beirut 3506 to Ministry of Foreign Affairs, 2 December 1971.

پێگەی عێراق لەنێو جیهانی عەرەبدا، بەوەی گوایە ئەوان "پاسەوانی دەروازەی ڕۆژهەڵاتی جیهانی عەرەبن."[٤٦]

وێرای ئەوەی لەسەر ڕابەرایەتیکردنی عەرەب گرژی لە نێوان بەغدا و ناسردا پەرەیسەند، کەچی هەڕەشەی عەرەب وەک هەڕەشەیەکی نێوخۆیی بۆ سەر ئێران لە شەستەکان و هەفتاکاندا خۆی هەر نمایش دەکرد. سەرکردە پان عەرەبییەکان لەبارەی خەڵکی عەرەبزمانی لەو شوێنانەی کە دەوڵەتیان نەبوو، لە ناوچەکەدا نیگەران بوون، بە پارێزگا پڕنەوتەکەی خوزستانی ئێرانیشەوە. ئاخر لەوەی نزیکەی نیوەی دانیشتوانەکەی عەرەبن، ئیدی هەر زوو خوزستان بووە ئامانجی سەرەکی مجێزی فراوانخوازییانەی عێراق. عەبدولکەریم قاسم خوزستانی بە "عەرەبستان" ناوبرد و ناسریش ناوی لە کەنداوی فارسی نابوو "کەنداوی عەرەبی". هەروەها سەرکردەکانی عێراق ئەوەیان دەگوت گوایە "عێراق بۆ ئەوە لەگەڵ ئێراندا ناجەنگێ تا تەنیا خاکە داگیرکراوەکەی عێراقی لێ بسەنێتەوە، بەڵکو بۆ ئەوەیە تا ناوچەی کەنداوی {فارسی} لە داگیرکاریی ئێران بپارێزێ."[٤٧] ئەوان پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت گوایە "ئێران یەدەگی نەوتی داگیرکردووە، نەوتی پارێزگای عەرەبزمانی خوزستان و موحەمەرەمە {خوڕەمشەهر} و نەوتی ئێمە {نەوتی عەرەب} دەدزێ."[٤٨] پاشان، سەددام حوسێن ڕاشکاوانە ئەو لێدوانەی دا؛ "عێراق سەبارەت بە یەکاوی عەرەب (ڕێگای ئەروەند)ەوە کێشەیەکی سەرەکی لەگەڵ ئێراندا نییە، ئاخر خۆ ئەم شوێنە خاکی عێراقە، بەڵکو کێشەی عێراق لەگەڵ ئێران لەسەر خوزستانە، کە بەشێکە لە نەوتی عێراق و بە دەسەڵاتی زاڵی بێگانە بە ئێرانەوە لکێنراوە!"[٤٩] مەبەست لەم گوتەیەی گوایە "داگیرکراوی ئێرانییەکانە" بۆ ئەوە

---

[46] Kuwait 9939–12352 to Ministry of Foreign Affairs, 10 February 1975.

[47] Kuwait 3511 to Ministry of Foreign Affairs, 13 February 1975.

[48] Neda al-Watan, 22 March 1969.

[49] Rajaiee, Farhang, The Iran-Iraq War: The Politics of Aggression. (University Press of Florida, April 20, 1993), p. 12.

بوو تا ئیسرائیل و ئێران بە یەک چاو سەیر بکەن. ئەم گوتەیەش لە شەستەکان و هەفتەکاندا بەردەوام لەسەر زاروزمانی سەرکردە پان عەرەبیزمەکان بوو.

هەروەها عێراق پشتگیری چەندین جوداخواز و ڕێکخراوی دژەشای کرد. ئەوان چەندین لایەن بوون، لی هێشتا لاواز بوون، ئەوان دەستەی جیاخوازیی عەرەب بوون بە بەرەی ڕزگاریخوازی عەرەبستان (ALF)، بەرەی نیشتمانیی بۆ ڕزگارکردنی عەرەبستان، بەرەی ڕزگارکردنی کەنداوی عەرەب و ئەلئەهوازیشەوە، کە هەر هەمووشیان دەستچنی عێراق بوون.[50] سەرکردە پان عەرەبیزمەکانی هەرێمەکە پیلانی ئەویان گێڕا تا لە نێو کۆمەڵگە غەیرەفارسەکانی کوردستانی ئێران، ئازەربایجان و بلوجستانیشدا کێشە بنێنەوە.[51] هۆزەکانی بلوچی سوننەمەزهەب ئەوانەی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێران دەژیان، بە سەرکردایەتی پەناهعەلی خان جەوانشیر یەکێک بوو لەو ئامانجانە. لە ئەنجامی ئەو نوشستییەی کۆماری ئازاربایجانی دەسکەلای سۆڤیەت، ژمارەیەکی کەم لە سەرکردەکانی بەرەو تاراوگە بۆ عێراق هەڵاتن، بەتایبەتیش محەمەد پەناهیان.[52] لە ئاخروئۆخری شەستەکاندا، بەغدا یارمەتی ئەو ناوبراوەی دوایی دا تا جەبهەی میللی خەلق (بەرەی نیشتمانیی خەڵک) پێکبهێنن، مەبەست لەو پارتە فرەڕەگەزییە ئەوە بوو، دنەی دەستەبژێری غەیرەفارس بدا تا لە ئێران جیاببنەوە.

---

[50] هەروەها عێراق دزەی کردبووە نێو کۆمەڵگەی عەرەبزمانی خوزستانیشەوە. لە ناوەڕاستی شەستەکاندا، مامۆستا ئێرانییە عەرەبزمانەکان بە زاریا ئەلموحیەدینیشەوە لە قوتابخانە عیراقیەکانی خورەمشەهردا بە تەواوی بە ئیستخباراتی عێراقەوە گریدرابوو، کە مەبەست لەوە دنەی هەستی دژەئێرانی لەنێو خەڵکی عەرەبزماندا بدرێ. بە یارمەتی ڕاستەوخۆی دەستوەردانی مۆسادەوە، ساواک توانی پلانەکەیان سەرکوت بکا. چاوپێکەوتن لەگەڵ لیوا مەنسور قەدەر، مێژووی زارەکی، دامەزراوەی مێژووی ئێرانی.

[51] Abdulghani, Jasim, Iraq and Iran: The Years of Crisis. (The Johns Hopkins University Press, October 1, 1984). p. 52.

[52] پەناهیان لە کۆماری ئازربایجانی دەسکەلای سۆڤیەت لە (١٩٤٥-٤٦) وەزیری جەنگ بوو.

هەروەها محەمەد تەقی زەهتابی و محەمەد دوعائی لایەنگری ئایەتوڵڵا خومەینی لە ڕادیۆی بەغدادا یارمەتی پەناهیان دا.[٥٣] هەردوو لایان، چ ناسر و چ سەرکردەکانی عێراق ناسەرکەوتووانە هەوڵ و تەقەلایان دا بچنە بن کلیشەی کوردی ئێران، بەتایبەتیش دنەی جوانمەردی بدەن لە دژی تاران.[٥٤] وێرای پشتگرتنی دەستە و تاقمە جوداخوازەکان، ڕژێمەکانی عێراق پشتی هەڵگەڕاوە ئێرانییەکانیان گرت، بەتایبەتیش تەیمور بەختیاری سەرۆکی پێشووی ساواک. لە میسریش جەمال عەبدولناسر دەستی لە پشتی سازمانی مەخسوسی ئیتحاد و ئامال (ڕێکخراوی تایبەت بۆ یەکێتی و کردەوە یان SAMA) دا، ئەو ڕێکخراوەی لە لایەن هەندێ توخمی دینداری بەرەی نیشتمانیی ئێران دامەزرابوو. هەرچەندە هەڕەشەکەی عەرەب دوای شەڕی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧ زیانی پێکەوت، کەچی بە سەردەمی دووەمی هاتنەوە سەر حوکمی ڕژێمی بەعس لە بەغدا بووژایەوە و تا هەرەسی حوکمی بنەماڵەی پەهلەوی بە هەڕەشەیەکی بەرچاوی سەر ئاسایشی ئێرانیش مایەوە.

## هەڕەشەی کورد

لەوکاتەی سۆڤیەت پشتی کۆماری مهاباد (١٩٤٥-٤٦) گرت، شا بە شێوەیەکی حیساببۆکراو لەبارەی هەڕەشەی کوردەوە نیگەران بوو. وێڕای لە سێدارەدانی قازی محەمەد[٥٥] سەرکردەی جیاخواز، کۆماری مهاباد چوارچێوەیەکی هەڕەشەداری بەخشییە گرووپە جوداخوازەکانی کورد لە

---

[٥٣] زەهتابی ئایدیۆلۆیکیستی سەرەکی پان تورکیزم بوو لە ئێران. دوعائیش ڕیفۆرمیستێکی مەزهەبی و سەرنووسەری ڕۆژنامەی ئەلئیتلاعاتی بوو ە ١٩٩٤ەوە.

[54] SAVAK Documents, No. A/316/23010, 1 September 1964, and SAVAK Documents, No. 2399, 10 September 1966.

[٥٥] هەندێ بەڵگەنامەی بە هێز هەن، کە شا نەیوستووە قازی محەمەد لە سێدارە بدری. ئەوە فەریقی سوپا حاجی عەلی ڕەمەزانی سەرکردەی سوپای ئێرانی و پاشان سەرەوەزیر بوون، کە فەرمانی لەسێدارەدانی قازی محەمەدیان دەرکرد.

ئێران و لە بەرانبەریشـــدا گومانی شـــا لەبارەی بزووتنەوە کوردییەکان لە هەرێمەکە تیرتر بوو. هەڵگیرســـــانی شــــەڕی کورد لە ١٩٦١ لە باکووری عێراق، شــمشــێرێکی دوو تیغ بوو بۆ ئێران. لە ســـەرێکەوە، ئێران پشــتی کوردی عێراقی گرت تا عێراقی پان عەرەبیزم بەرزەفت بکا. لە ســـــەرێکی دیکەشـــەوە، شـــا نیگەران بوو لەوەی نەبادا پڕیشــکی یاخیبوونی کوردان بپەڕێتەوە کوردســتانی ئێرانیش.[٥٦] هەر بەڕاســتیش، ئەو هەرگیز پشــتیوانی بیرۆکەی ســـەربەخۆیی کوردســـــتانی لە هەرێمەکەدا نەکرد. ئەوەبوو هەر زوو کوردەکانی ئێران پشـــتگیریی خۆیان بۆ بارزانی و پێشـــمەرگەکانی دەربڕی.[٥٧] چەندین کوردی ئێرانی خەڵکی مهاباد و ســـنە هەروەک هۆزی جوانڕۆیی (جوانڕۆد Javanroudis) لە کوردســـــتانی ئێران چوونە پاڵ کۆمەڵەی کـورد (جەمـاعەتـی کـورد Jamiat-e Kurd) ی لایەنگری بارزانی.[٥٨] ســەید عەبدوڵڵای ئیســحاقی (کە بە ئەحمەد تۆفیق ناســرابوو)، ســەرکردەی حیزبی دیموکراتی کوردســتانی ئێران فشــاری خســتە ســەر بارزانی تا پشــتی کوردی ئێران بگرێ، کەچی لە هەمان کاتیشــدا داوای لە کوردی ئێران لە مهـابـاد کرد بەڵکو کـاری تێکـدەرانە دژی تەهران بکەن. لەپاڵ ئەمەشدا، هەڵگیرسانی شەڕ لە باکووری عێراقدا، ئاسایشی نیشتمانیی ئێرانی خســتە مەترســییەوە، ئەمەش بە هۆی کاریگەریی قەبەی ئەو ئاوارە کوردانە بوو، کە لە ســـــنووری ئێران پەڕینەوە. بە گوێرەی ســـــاواک بێ، بارزانی داوای لە پەنابەرانی کورد کرد لە ئێران بمێننەوە، ئاخر ئەوان لەوێ دەکرا وەک بنکەیەکی پڕوپاگەندە بن دژی ئێران.[٥٩] ویڕای ئەو بنکە فراوانە پشـــتگیرییەی لەنێو کوردی ئێراندا هەبوو، کەچی ســــەرکردەکانی کوردی

---

[56] SAVAK Documents, 311/185-2-d, 6 May 1962; SAVAK Documents, 331/21715, 28 August 1963.

[57] SAVAK Documents, No. 312/54991, 21 April 1961; SAVAK Documents, No. 2b/1729, 18 May 1961.

[58] SAVAK Documents, No. a1/43476, No Date.

[59] SAVAK Documents, 234/0245, 13 May 1963.

عێراق لەبارەی پشتگیریی کۆمۆنیستە کوردەکانی دیکەدا دابەش بووبوون. بەهۆی ئەوەی تادەهات پشـــتگیری ئێرانیان زیاتر دەبوو، ئیدی بەرەبەرە بـارزانی خۆی لە پـاڵپشـــتیکردنی کوردی ئێران نەبـان کرد. لە کۆتـایی شـەستەکاندا، بارزانی ئەندامانی کۆمیتەی شـۆڕشـگێری دژە ئێرانی (کاک) کوشتن و تەرمەکانیشیان ڕادەستی ساواک کردنەوە.[٦٠]

هەروەها شـا لەبارەی پەیوەندییەکانی کورد-ڕوسـیا ش نیگەران بوو. خۆی ئەوە ســـتـالین و ئـاژانەکەی ئەو میر جەعفەر بـاقرۆڤی ســـەرکردەی کۆمۆنیســـتی ئازربایجان (١٩٣٢-١٩٥٣) بوو، هەردوو کۆماری ئازربایجان و مهابادی وەک دەسـکەلا بەرهەمهێنا.[٦١] ئیدی لە زەینی شـا بەو پاشـخانە

---

[٦٠] لە ١٩٦٧دا ، چەندین ئەندامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لەنێویاندا ئیسماعیل شـەریفزادە، قەدەر شـەریف و سولەیمان موعینی وازیان لە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی ئەحمەد تۆفیق هێنا. ئەوان لەســـەر ململانێی چەکداری لە دژی تاران مکوڕ بوون. ئەوان پەیوەندییان بە حیزبی تودەوە هەبوو. بڕوانە بەڵگەنامەکانی ساواک ,2 August 1967 No. 232/49824 .

[٦١] لە مانگەکانی کۆتایی دووەمین جەنگی جیهاندا، ستالین نەخشەی بەیەکەوەلکاندنی چەندین پارێزگای لە باکوری ئێران کێشـــا. ئەو چاوتێبڕینەی پارێزگاکانی ئێرانی لە ئازربایجان، کوردســـتان، گەیلان، مازندەرزان و خوراســـان گرتەوە. بڕوانە "ڕێنمایی نهێنیی ســـۆڤیەت لەبارەی ڕێکاری جیبەجێکردنی خەملاندنی تایبەت بۆ تەواوی خوارووی ئازربایجان و پارێزگاکانی باکووری ئێران، ئەمەش هەوڵێک بوو بۆ دامەزراندنی بزووتنەوەی جیاخوازی لە باکووری ئێراندا، مێژووی ١٤-٠٧- ١٩٤٥، لە نێو پرۆژەی مێژووی نێودەوڵەتی جەنگی سارددا بەردەستە:

www.wilsoncenter.org/index.cfm?topic_id=1409&fuseaction=va2.browse&sort =Collecti on&item=1945%2D46%20Iranian%20Crisis;

نەسرەتوللای جیهانشـاهلوی سـەرەوەزیری پێشـوو و وەزیری تەندروستی حکوومەتەکەی پیشەوەری لە کۆماری دیموکراتیکی ئازربایجان، ڕەفتاری بەســـووکســـەیرکردنی ســـۆڤیەتەکانی لەبەرانبەر پیشەوەری ڕوونکردەوە و گوتی: "مستەر گۆلیف (کونسولی سۆڤیەت لە تەورێز) ئێمەی لە ژوورێکی بچکۆلەدا بینی." بەهۆی ڕەفتـاری ڕوســـەوە تووڕە بوو، ئەو کۆلۆنێلی ڕەتکردەوە. گۆلیف گوتی: "ئێوە(ڕووســـی) ئێمەیان خســـتە ئەو پێگەیە. هەنووکەش ئێوە وازتان لێهێنان، ئەمەش لەوکاتەی (پشـتگیریی کۆماری ئازربایجان لە ئێران) ئیدی هەرگیز لەبەرچاوی پەسـندنامەی تودا نەماوە... دەی ئێسـتا پێمبلێ کێ لەو پشـیویەدا بەرپرسـیارە؟" ئیدی ئەو لەو سـکاڵایەی پیشـەوەری دەهری بوو. گۆلیش پێیڕاگەیاند، "ئەوەی ئەوی هێناوەتە ئێرە، هەر ئەویش پێتان دەڵێ بڕۆن."

مێژوویە، وەهای دانابوو گوایە هەر سروشتکردانە هەڕەشەی کورد بە هۆی هەڕەشە سوورەکەوە جۆش دەدرێتەوە. سەربارەی جەعفەر پیشەوەری و قازی محەمەد، سەرکردەکانی کۆمارە ڕەگەزییەکانی ئێران، بارزانیش پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ مۆسکۆدا هەبوو. بارزانی لەو بڕوایەدابوو، کوردستانێکی سەربەخۆ و یەکگرتوو کە لە پارچەکانی تورکیا و عێراق و ئێران پێکدی، دەکرێ تەنیا و تەنیا بە پاڵپشتیی ڕووسیا بێتەکایە.[٦٢] ئەوەبوو بارزانی لەماوەی تاراوگەبوونی لە مۆسکۆ بۆ ماوەی زیاتر لە ١٣ ساڵ و لەژێر ناوی مەمەدۆڤدا، پەیوەندی بە سوپای سوور و کەی جی بییەوە هەبووە و بڕوانامەیەکیشی لە قوتابخانەی باڵای حیزبەوە بەدەستهێنابوو.[٦٣] تەنانەت دوای سەرهەڵدانی یاخیبوونی کوردیش، هێشتا

---

Jahanshahloo, Nosratollah, We and the Foreign: Political Memoirs of Dr Nosratollah Jahanshahloo, Samarghand Publicatio, 1385, p. 190; For more discussion, see Joseph V. Stalin to Ja'far Pishevari, Leader of the Democratic Republic of Azerbaijan, 8 May 1946. AVP RF, f. 06, op. 7, p. 34, d. 544, II. 8–9 Available: http:/ /digitalarchive. wilsoncenter. org/document/ 117827); Archive of the Ministry of Foreign Affairs of the RussianFederation, АВПРФ ,ф. 094 ,оп. 38 ,п. 364 А ,д. 49 ,л. 1–7 Федерации Архив внешней политики Российской; Archive of Political Parties and Social Movements of the Azerbaijan Republic, AR SPIHMDA ,f. 1 ,s. 89 ,i. 114 ,v. 218–2.

[62] Tafreshian, Aboulhasan, Qiam-e Afsaran-e Khorasan (The Revolt of Khorasan Officers). (Atlas, Tehran, 1988). p. 112–5.

[63] Research Study RNAS-10 prepared by the Department of State, May 31, 1972, FRUS 1969–1976, E4, 310; Memcon, April 12, 1962, FRUS 1961–1963, XVII, 243; Gallman to Department of the State, 14 Oct. 1958, in U.S. Department of State, Foreign elations of the United States, 1958–1960, Vol. XII (Washington, DC: Government Printing Office, 1993), pp. 344–46; Barzani's alleged ties to the KGB are discussed in Pavel Sudolatov and Anatoli Sudoplatov with Jerrold. L. Schecter and Leona P. Schecter, Special Tasks: The Memories of an Unknown Witness—A Soviet Spymaster (Boston: Little, and Co., 1994), pp. 259–64.

تاران گومانی لە پشتگیریی مۆسکۆ بۆ بارزانی هەبوو.[٦٤] هەرچەندە هەرگیز بارزانی نەبووە کۆمۆنیست،[٦٥] مۆسکۆش هەرگیز بە تەواوی پشتی کوردی نەگرت،[٦٦] هەمیشە شا لەوە نیگەران بوو نەوەک سۆڤیەت پشتگیری دامەزراندنی کوردستان بکا.

هەروەها تاران لەو پەیوەندییە نهێنییەی نێوان کوردی عێراق و قاهیرەشەوە هۆشداری پێدرا. هەر بەڕاستیش، ئەگەری کوردستانێکی سەربەخۆ دەکرا دەرفەتی ئەوە بداتە میسر دزەبکاتە سنووری ڕۆژئاوای ئێران. چەند مانگێک بەر لە هەڵگیرسانی شەڕی کورد لە ١٩٦١دا، ڕایەدارانی کۆماری یەکگرتووی عەرەب هەوڵیاندا پشتی کوردی عێراق بگرن. ژەنەڕاڵ محەمەد عەبدولحەکیم عامر سوپاسالاری لەشکری میسر، هەردوو لای ڕوسی و بارزانی بینی تا پشتگیریی خۆی بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ لە عێراق پێڕابگەیەنێ.[٦٧] ئەمەش نمایشێکی سێ قۆڵی هاوپەیمانێتی هەڕەشەکانی سوور/عەرەب/ کورد بوو بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی ئێران. بارزانی لە ناوەڕاستی شەڕی قاسمدا، عەبدولڕەحمان شەڕەفکەندی (هەژار

---

[64] SAVAK Documents, No. 311/185, 6 May 1962.

[65] O'balance, Edgar. The Kurdish Revolt, 1961–1970 (London: Faber and Faber Ltd., 1973). pp. 63–64.

[٦٦] لەماوەی نێوان ١٩٦١-١٩٧٩، سۆڤیەت ستراتیژی دژیەکانە(دڕدۆنگانە)ی گرتووەتەبەر. لەسەرێکەوە، پشتگیریی مۆسکۆی مێژووی بۆ بزووتنەوەکانی ڕزگاریی لە جیهانی سێیەم، پەیوەندییە بەردرێژەکانی بارزانی لەگەڵ کەی جی بی ڕووسی و پەیوەندی لەگەڵ سەرکردە کوردەکانی لایەنگری سۆشیالیزم وەک تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد پەیوەندییەکانی ڕووسی-کورد بەهێزتر کرد. کەچی لە سەرێکی دیکەوە، بەدەر لە بەرزاو و نیشتاوی و تەوژمی نێو حکومەتی سەنتراڵ، کەچی هەموو سەرکردەکانی عێراق پەیوەندییەکی دۆستانەی زۆر باشیان لەگەڵ مۆسکۆدا هەبوو. ئەم ڕەوشە دژبەیەکە لە قەیرانی قۆچی ئەفریقا لە شەستەکان و حەفتاکاندا بۆ سۆڤیەت هێناوەتەبیر. هەروەک چۆن جارێک خالد بەگداش دەرهەق کورد، ئەفسەری حزبی بەعسی سوری گوتی؛ "**کێشەی کورد ئەوەیە کە زۆر لە سنووری ڕوسیاوە نزیکە ڕوسیاش نیازی نیە ئێران و تورکیا و سوریا پەست بکا. خۆ ئەگەر کورد لە ئەفریقیا بوونایە ئەوا ڕوسیا دەوڵەتێکی بۆ دروست دەکردن. سیاسەتی ڕوسیا دەرهەق کورد هەمیشە سیاسەتێکی داردەستانە بووە.**"

[67] SAVAK Documents, No. 13808, 12 February 1961

موکریانی) لە بەهاری ١٩٦٢دا نارده لای باڵوێزی میسر لە بەغدا. هەژار وەها ڕووداوەکە دەگێڕێتەوە، "من چوومە بەغدا تا قسە لەگەڵ باڵوێزی میسر لە بەغدا بکەم. من ئەوەم خستنە بەردەم کە کودەتایەک لە ئێران بکەین یان بەلای کەمییەوە لە کوردستانی ئێران شەڕێک لەگەڵ ئێراندا هەڵبگیرسێنین. هەروەها ئەوەشم بۆ زیاد کرد، کە پێویستە میسر لەپاڵ ئەو چەکەی دەماندات تانک و فڕۆکەشمان بداتێ تا هێرشێکی چڕی کاریگەر بکەینە سەر ئێران و ئەو بووکەڵەیەی پەیمانی سەنتۆ لاواز بکەین."[٦٨] سەرەڕای پشتگیرییە قورسەکەی ئێران بۆ کوردی عێراق، بارزانی هێشتاش پەیوەندییە "دۆستانە، بەڵام بێکەڵکانە"[٦٩] لە ناوەڕاستی شەستەکاندا لەگەڵ قاهیرەدا پاراست. هەر بەڕاستیش، ساواک ئاگای لە بەڵێنی ناسر بوو بۆ پشتگیری "ئۆتۆنۆمییەک، تەنانەت کوردستانێکی سەربەخۆش."[٧٠] لە کۆتاییدا بە نسکۆکەی ناسر لە شەڕی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧دا کۆتایی بە پشتگیری پچڕپچڕ بۆ بارزانی هات.[٧١]

هەروەها شا لە کەسایەتی بێمتمانەی بارزانیش هەراسان بوو. لەچاو پەرەسەندنی "جەماوەرییەکەی" لەنێو کورد لە پاش سەرهەڵدانی بزووتنەوەکە،[٧٢] ئیدی چارەنووسی ڕاپەڕینی کوردی کەوتەدەست. وێڕای هاوپەیمانێتی کورد-ئێران لە دژی بەغدادا، بارزانی هەرگیز دڵسۆزیی تەواوی خۆی نیشانی شا نەدا. وەرچەرخانی ئەو لەچەند بۆنەیەکدا بۆ لای

---

[68] aneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani (After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani). (Elm Publication, Tehran, October 2012).

[69] Baghdad 150 to State; September 20, 1962 (NARA/RG59/R2/787.00/9-2062), pp. 1–2.

[70] SAVAK Documents, No. 231/45008, 12 February 1965, and SAVAK Documents, No. 2/13998, 3 October 1965.

[71] SAVAK Documents, No. 6218, 11 January 1968.

[72] SAVAK Documents, No. j5/18801, 13 June 1961; SAVAK Documents, No. 5541, 5 January 1961.

بەغدا، هەروەک ئاگربڕی ١٩٦٤، ئەوەی پشتڕاست کردەوە، کە ئەو هاوپەیمانێکی نییە تا ئێران پشتی پێ ببەستێ. لەڕاستیشدا بارزانی وەها بوو، سەرکردەیەکی پراگماتی بوو، بەدوای هاوسەنگی لەنێوان ئێران و هێزەکانی دیکەدا دەگەڕا، وەک سۆڤیەت و میسر، بۆ ئەوەی سازشی زیاتر بەدەستبێنێ.[٧٣] هەروەک ساواک بەڕاستی مشتومڕی ئەوەی دەکرد، "**مەلا پیاوێکی مجێزبەرزە" ئەو نە کۆمۆنیستە و نە پیاوی ڕۆژئاواشە، بەڵکو ئەو کوردێکی بارزانییە.**"[٧٤] لە ڕوانگەی شاوە، بارزانی سەرکردەیەکی هەلپەرست بوو، کە بەرژەوەندییەکانی خۆی نەوەک هەر لە سەرووی هی کورد بەڵکو هی ئێرانیشەوە دەبینی. کەواتە ئێران پشتی بیچمی دژەبارزانی وەک ئیبراهیم ئەحمەد و تاڵەبانی گرت، بۆ ئەوەی پارسەنگی پێگەی بارزانی لە کوردستانی عێراق بداتەوە.[٧٥] وێڕای پشتگیریی ئێران بۆ کوردی عێراق، بیرۆکەی پەڕینەوەی کوردستانێکی سەربەخۆ بۆ کوردستانی ئێران، پەیوەندییەکانی بارزانی بە مۆسکۆ و قاهیرە و بێمتمانەیی ئەو، هێشتاش هەڕەشەی کورد بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی ئێران بەردەوام بوو.

**هەڕەشەی ڕەش**

ئیسلامیزم –کە شا ناوی نابوو هەڕەشە ڕەشەکە- لە دوای ناوەڕاستی شەستەکاندا خەریک بوو ببێتە ئاڵنگارییەک بۆ سەر ڕژێمی پەهلەوی. لە پاڵ میسر و تورکیا، لە ئاخروئۆخری سەدەی نۆزدەهەمدا ئێران بووبووە چەقی بازنەی بزووتنەوەی ئیسلامی. بە هاوبەشبوونی پرسگەل لەگەڵ ڕاچەنینی ئیسلامی، ئیدی بەرەبەرە ئیسلامیزم دوای جەنگی دووەمی جیهان هەڵکشا، لە کاتێکدا پان عەرەبیزم لە دوای نسکۆکەی ١٩٦٧دا داکشا،

---

[73] SAVAK Documents, No. p. 348, 16 March 1966.

[74] Kuwait 1904 to Ministry of Foreign Affairs, 6 July 1963..

[75] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani (After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani), (Elm Publication, Tehran, 2009). p. 787.

ئەوەبوو ڕاچەنینی ئیسـلامیزم بەرەبەرە وەک جێگرەوەیەکی ئایدیۆلۆژیای جۆشـدەر لە هەرێمەکەدا سـەریهەڵدا و تا وەک دەرەتانێک بۆ یەکبوونی جیهانی ئیسـلامی لە دەوری چەقی بازنەی "ئیسـلام" کۆبکاتەوە."[٧٦] دوابەدوای ئەوەی شا لە کانوونی دووەمی ١٩٦٣دا جاڕی شۆڕشی سپی دا، ئایەتوڵڵا ڕوحوڵڵا موسـەوی خومەینی لەبەر بەرنامەی بە ڕۆژئاواییکردنی ئێران، ڕەخنەی لە ڕژێمی شـا گرت. لە حوزەیرانی ١٩٦٣ بەم جۆرە ڕەخنەی لە شا گرت؛ "هۆ خاوەن شکۆ، جەنابی شا، ڕێگەم بدە ئامۆژگاریەکت بکەم. تۆ ئەی پیاوی داماوی کەسـاس، کات نەما تا تۆی بچووک بیربکەیتەوە و کاردانەوەت هەبێ، تا بیر لەوە بکەیتەوە کە ئەو شـتە بەرەو کوێت دەبا؟... ئاغای شـا، ئایا دەتەوێ وام لێبکەی بڵێم، تۆ باوەڕت بە ئیسـلام نییە و لە ئێران دەربکرێی؟"[٧٧] ئیدی هەر دوای گرتنی لەسەر ئەو وتە ئاگریناویەدا، لە قوم و ناوەندی تاراندا بووە هەراوبەزمێکی خوێناوی و خۆپیشاندەران دروشمی ئەوەیان دەگوتەوە "یان خومەینی یان مردن." لەگەڵ ئەوەی ڕاپەڕینەکە بەشـێوەیەکی توندوتیژانە سـەرکوت کرا. کەچی شـا جڵەوی کەشـوهەوای سـیاسـیانەی توندتر کرد، گرووپە نەرمڕەوەکانی قەدەغە کردن و چالاکییە سیاسییەکانی ئایەتوڵڵا شیعەکانی سـنووردار کرد. هەرچۆنێک بێ، هەڵگەڕاوەکان ڕادیکالانەتر بوون. وێڕای پەرەسـەندنی سـەرهەڵدانی گرووپە چەکدارەرە چەپگەراکان لە جیهاندا، کەچی بەرەبەرە و سـەرکەوتووانە گرووپە ئیسـلامییەکان ئایدیۆلۆژیەکەی خۆیان لە ئێراندا بڵاودەکردەوە. وەک پارتێکی هەواداری موسـەدیق، بزووتنەوەی ئازادی لە ئێران بووە هێزێکی سـەرەکی نیشـتمانی-دینی لە ئێران. بە کارانگازی عەلی شـەریعەتی، بیرمەندە سـەرەکییەکەی شـۆڕش، سـازمانی ئیسـلامی موجاهیدینی خەلقی ئێرانی وەک یەکێک لە

[76] Sayyid, Bobby S. A Fundamental Fear: Eurocentrism and the Emergence of Islamism. (Zed Books; Revised edition, February 7, 2004).

[77] Ruhani, Hamid, Nehzat-e Imam-e Khomeini [Imam Khomeini's Movement], 2 vols (Tehran, 1979), 1, p. 25.

دەســـتڕۆیشـــتووترین گرووپی چەکداری لە حەفتاکاندا دامەزرا. هەر لەو بەرەوتەشـــدا بوو شـــا وتەکەی خۆی دارشـــت کە گوتی "هاوپەیمانیەتێکی پیرۆزی ئیرتجاعی ســـورخ و ســـیا (هاوپەیمانی پاشـــکەوتوانەی ســـور و ڕەش). بە گوێرەی شــــا ئەم هـــاوپەیمـــانێتییە ئـــامـــاژەبوو بۆ ئەوەی، ئۆپۆزسیۆنی گەریلا، ئیسلامی لەگەڵ مارکسیزم بۆ ئایدیۆلۆژیای شۆڕش یگرتووە. ســـــەرەڕای بەجەمـــاوەربوونی بزووتنەوەی ئـــازادی ئێران و موجاهیدین، ئەوە ئایەتوڵڵا خومەینی و لایەنگرانی بوون ســــــەرکەوتووانە شـــیکارییەکی ســـیاســـیانەیان بۆ ئیســـلامی شـــیعە کرد. لە ناوەڕاســـتی هەفتاکانیشــــدا، لە ئێران ئیســـــلامیزم بووبووە بەهێزترین ئایدیۆلۆژیای دژەشا.

ســــــەرەداوە ســــــەرەکییەکانی بزووتنەوەی ئازادیی ئێران و موجاهیدین و لایەنگرانی ئایەتوڵڵا خومەینی لەو لاتە عەرەبییەکانی هەرێمەکەدا بوون لە نێویشیاندا عێراق، سوریا، میسر و نەخاسمە لوبنان. لە خەمڵاندنی شا بۆ هەرەشـــــەکان، مێوانداریتیکردنی بەغدا بۆ توخمە ئێرانییە ئیســـــلامییەکان، هاوپەیمانییەتێکی شـــــوومی پان عەرەبیزم و ئیســــلامیزمی لێکەوتەوە. هەروەها ئەم گرووپانە لوبنانیان بۆ وەک مێرگ بوو تا لەوێ خەباتی خویان لە دژی تاران جاڕبدەن. لەپاڵ ئەمەشـــدا، پەیامە بەهێزەکانی ســـەدر بنکەیەک بوون بۆ بووژانەوەی ئیســـلام و یەکگرتنی جیهانی ئیســـلامی. بە پەیوەندییە پچڕپچڕەکانی لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامی ئێرانی، لە کۆتاییدا تارانی پەهلەوی ســـیاســـەتی خۆی لەبارەی شـــیعەی لوبنان بەشـــێوەیەکی بەرچاو گۆڕی. هەروەها پشـــتیوانی ســـەدر لە فەلەســـتینییەکان شـــەقڵێکی دیکەی نمایشـــــی ئەو هاوپەیمانێتییە ناپیرۆزەی ســـــوور و ڕەش بوو. لە ئەنجامدا و لە شـــۆڕشـــی ئیســـلامی ١٩٧٩دا هەڕەشـــە ڕەشـــەکە ڕژێمی پەهلەوی ڕوخاند.

## هەڕەشەی فەڵەستینی

بە پێچەوانەی ڕوانینە گشتییە باوەکە، شا دژی بیرۆکەی فەڵەستین نەبوو. پێشبینییەکەی شا ڕەوا بوو بەوەی دامەزراندنی دەوڵەتی جوو لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا؛ "نەوەک هەر بۆ چەندین دەیە بۆ چەندین سەدە دەبێتە مایەی توندوتیژی."[٧٨] هەر لەگەڵ بەرەبەیانی سەرهەڵدانی قەیرانەکە، ئەو پێی لەسەر دامەزراندنی "دەوڵەتێکی فیدراڵ" داگرت، کە هەردوو لایەنیان، عەرەب و جوو بگرێتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ، تاران لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا دەنگی لە دژی دابەشکردنی فەڵەستین دا،[٧٩] هەروەها ڕەتیشی کردەوە بە فەرمی دان بە ئیسرائیلدا بنێ. لەگەڵ ئەوەشدا ناسەقامگیریی هاوکێشەی هێز لە هەرێمەکەدا زەمینەی بۆ ڕوانینی دژیەکانەی شا لە هەمبەر کێشەکەدا خۆشکرد.

هەرچەندە کێشە درێژخایەنەکەی ئیسرائیل-فەڵەستین لە ئێرانەوە دوور بوو، کەچی بۆی بووە مایەی هەڕەشەیەکی جیۆکەلتوری. کێشەی فەڵەستین ئاگری هەرسێ هەڕەشەی عەرەب و هەڕەشەی ڕەش و هەڕەشە سوورەکەی بۆ سەر ئێران خۆشکرد. ئاخر لەسەرەتاوە هاوپەیمانێتییە نافەرمییەکەی ئێران لەگەڵ ئیسرائیل، وێنە و ئەندێشەی ئێرانی لەچاوی عەرەبدا زەرەرمەند کرد.[٨٠] لە تەممووزی ١٩٦٠دا، شا لێدوانێکی دا بەوەی "لەمێژە دانی بە ئیسرائیلدا ناوە،" ئەمەش ئاماژە بوو بە دانپێدانانی دیفاکتۆی ئێران لە ١٩٥١دا بە دەوڵەتی ئیسرائیل.[٨١] ئەو دیدارە بێ باکییەی شا بەهانەی دایە دەست ناسر تا پەیوەندییە دیپلۆماتەکانی لەگەڵ تاراندا

---

[78] UN Special Committee on Palestine, Recommendations to the General Assembly, September 3, 1947.

[٧٩] لە کۆتاییدا و لە ٢٩ی نۆڤیمبەری ١٩٤٧دا ئەنجوومەنی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری دروستکردنی دوو دەوڵەتی لە فەڵەستین دەرکرد.

[٨٠] لە دیدارێک لەگەڵ فەریق مەنسور قەدەر، مێژووی زارەکی، دامەزراوەی مێژووی ئێران.

[81] Ramazani, Rouhollah, Iran's Foreign Policy 1941–1973 (Charlottesville: University Press of Virginia, 1975). p. 404.

بپچڕێنێ. لە چوارچێوەی ئەو هەوڵەی شای ئێران بە بووکەڵەیەکی دەستی ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوادا بنێ، ئیدی ناسـر فشـاری خسـتە سـەر ڕژێمە عەرەبییەکان بەڵکو چاو بە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئێراندا بخشـێننەوە. سـەرکردەکانی عێراقیش هەمان زمانیان لە دژی ئێران بەکارهێنا و ڕەخنەیان لە پەیوەندییە ئابوورییەکانی ئێران لەگەڵ ئیسرائیل گرت.[٨٢] ئینجا شا لە پەیوەندی فەڵەستینییەکان بە سۆڤیەت سەخڵەت بوو. لە دیسیمبەری ١٩٧٤دا، لە چـاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ڕۆژنـامەی لوبنـانی (الحوادث)دا، هاوسۆزی خۆی بۆ فەڵەستینییەکان دەربڕی، لەکاتێکدا هۆشداری ئەوەشی دا، "ئەوەی من لێی دەترسـم ئەوەیە؛ لەوانەیە فەڵەسـتینییەکان ڕێگە بە هەلومەرجێکی نێودەوڵەتی بدەن، کە دۆزەکەیان وەک ئامرازێکی سـۆڤیەتی یان ستراتیژی دیکەی نێودەوڵەتی بخرێتەگەڕ."[٨٣] شا لە هەڵوێستیکی دیکەدا گوتی؛ "دۆستە باشە فەلەستینییەکانمان پێویستە ئەوە بزانن، کە سنوورێک هەیە بۆ ئەو پێلیهەڵبڕیەی ئەوان و کەڵەگاییکردنە سـەرجیهان بە تیرۆریزم و سیاسەتی دادۆشین" بۆیە بە پێداگیرییەوە داوایلێکردن؛ "سیاسەتێکی نوێ بگرنەبەر، چونکە ئەوەی ئێستایان نایانگەیەنێتیە هیچ شوێنێک."

بروانە:

(The Shah on Israel,Corruption and Torture. https://www.nytimes.com/1976/10/22/ archives/the-shah-on-israel-corruption-torture-and.html).

لەچاوی شادا، دۆزی فەڵەستین سەرچاوی ناسەقامگیری هەرێمیی بوو تا دەرفەتی ئەوە بدرێتە مۆسکۆ دەستی خۆی بخاتە نێوکاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوین. بە پلەی سـێهەمیش، سـەرکردە ئیسـلامییەکان دۆزی فەڵەسـتینیان وەک هێمایەکی چەوسـاندنەوەی موسـڵمانان دانابوو. پەیامی ئیسـلامییانەی

---

[82] Baghdad 2243 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 1 September 1969.

[83] Ramazani, Rouhollah, Iran's Foreign Policy 1941–1973 (Charlottesville: University Press of Virginia, 1975). p. 427.

ســـەدر بۆ پشـــتگیریی فەڵەســـتینییەکان لێکەوتەیەکی کارانگازی گەورەی لەسەر سیاسەتی دەرەکی نادەوڵەتیانەی ئێران لە لوبنانەوە هەبوو. لەوەش جەوهەریتر، فەڵەستینییەکان داوایان لە گرووپە ئسـلامییەکانی ئێران وەک توخم و شـوێنکەواتوانی ئایەتوڵڵا خومەینی و بزووتنەوەی ئازادی ئێران و موجاهیدەکان کرد دابڕسێنە تاران.

لەوەش پتر، خەباتی چەکدارانەی فەڵەســـتینییەکان بووە مایەی دنەدانی یاخیبووەکانی دژە شا، ئەوسا بە دوو لا، چ مارکسی و چ ئیسلامییەکان، بۆ ئەوەی ســـتراتیژی توندوتیژی لەوانە فێربن و دژی تاران ببنەوە. شـــا هۆشـــداری مەترســـی پەیوەندی نێوان گرووپە فەڵەســتینییەکان و چەپ- ئیســـلامییە ئێرانییەکـانی دا، لەم بـارەیەوە لیدوانی دا کە، "هەنـدێ لەو گرووپانەی یاخیبوو، مەشـــق و ڕاهێنان بە گێرەشـــێوێنی ئێرانی دەکەن تا دزە بکەنە نێو خـاکمـان، خەڵکمـان لێ بکوژن و دامودەزگـاکـانمـان بتەقێننەوە."[٨٤] لەم بەرڕەوتەدا، جڵەوکردن و چاودێریکردنی پەیوەندییەکانی یاخیبووە ئێرانییەکان لەگەڵ فەلەســـتینییەکان کەوتبووە نێو ئامانجەکانی تاران لە هەرێمەکەدا.

**خشتەی ٢-١ : هەڕەشە جیۆپۆلۆتیکی و جیۆکەلتورییەکان**

| ئاست/ ڕەهەند | جیۆپۆلیتیک | جیۆکەلتور | جیۆئابووری |
|---|---|---|---|
| نێوەدەوڵەتی | فراوانخوازێتی ڕوسیا | کۆمۆنیزم | ....... |
| هەرێمایەتی | یەکێتیی عەرەب<br>کوردستانی گەورە<br>فەڵەستین | پان عەرەبیزم<br>ناسیونالیزمی کوردی<br>....... | |
| ناوەخۆ | ....... | ئیسلامیزم | |

لە لێکەوتەدا، ســـیاســـەتی دەرەکیی نـادەوڵەتییـانەی ئێران لەژێر ڕکێفی حوکمڕانیی شـادا، بە خەسـتی لەژێر شـەقڵی هەڕەشـەکانی جیۆپۆلیتیکی و

[٨٤] هەمان سەرچاوە.

جیۆکەلتوری دا بوو بە کـارلێککەری هەرسـێ ئـاسـت: نێودەوڵەتی، هەرێمایەتی و نێوخۆیی. لە ڕاستیدا، سیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران، بۆ ئەوە داڕێژرابوو، تا سـنوورێک بۆ هەڕەشـەکانی سـەر ئێران دابنێ. بەگوێرەی کـارلێککەری ڕەهەنـدەکـانی جیۆپۆلیتیک و جیۆکەلتور، هەڕەشـەی نێودەوڵەتی کە لە هەڕەشـەی سـوور بەرجەسـتە بووبوو، کاریگەرییەکی بەرفرەوانی لەسـەر هەردوو ئاسـتی هەرێمایەتی و ناوخۆیی هەبوو. هەڕەشـە هەرێمایەتییەکان لە لایەن عەرەب و کورد و کێشـەی فەلەسـتین کاریگەرییەکی بەرفرەوانی لەسـەر ئاسـتی ناوەخۆییەوە هەبوو. بۆ ئەم بـارە ئـاڵۆزەی هەڕەشـەی جیۆپۆلیتیک-جیۆکەلتور و شـەقڵی بەرڕەوتی سـیاسـەتی دەرەکی نـادەوڵەتیـانەی ئێران دا لەبن جلەوێ حوکمڕانێتی شادا (بڕاونە خشتەی ژمارە ٢-١).

**٢- دەرفەتەکان**

شـا وەها ئامۆژگاری ڕیچارد نیکسنی کرد: "لەسـەر کۆشکی سپی پێویستە فشـار بخاتە سـەر هێزە هەرێمییەکان، ئەوانەی توانای ئەوەیان هەیە ناوچەکە سەقامگیر ڕابگرن تا ڕۆڵێکی گەورەتر لە پرسـی ئاسایشدا وازی بکەن. وەهاش بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان باشترە، کە ئێران بتوانێ بەرگری لە خۆی بکا لەوەی ... ڤێتنامێکی دیکە بێ."[٨٥]

سـەرۆک نیکسـنیش بە ڕاوێژکارەکانی گوت: "ئەو[شـا]م خۆشـدەوێ، ئەوم خۆشـدەوێ و وڵاتەکەیشـیم[ئێران] خۆشـدەوێ، لێ هەندێ بیژمۆتی دیکە لەوێ هەن، خۆشم ناوێن."[٨٦]

---

[85] Afkhami, Ghoma Reza, The Life and Times of the Shah (Berkeley, CA, 2009). pp. 302–03.

[86] Conversation among President Nixon, MacArthur, and Haig, Washington, April 8,1971, FRUS 1969–1976, E-4, 122.

ســــەرباری هەرەشـــــەکان، لەوێدا دەرفەتگەلی نێودەوڵەتی و هەرێمیش هەبوون، ســـیاســـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانیان ئاســـانتر کرد. ئەو دەرفەتگەلانە لەخۆگرتنی ستراتیژ و سیاسەتی سەرەکی بوو، کە لە لایەن هاوپەیمانانی ئێران لە میانەی جەنگی ســــاردا گیرانەبەر، ئەوانیش وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل و ئینگلستان بوون. ئەوان زەمینەیەکی لەباریان بۆ شـــا ڕەخســـاند تا ڕایەڵەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ کاراکتەرە نادەوڵەتییەکان لە هەرێمەکەدا بەرفرەوانتر بکا.

## سروشتی ئەنجام سفری٨٧ جەنگی سارد و ڕێبازی نیکسن

ڕەوتی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانی پەهلەوی بە ستراتیژەکانی جەنگی ســـاردی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە کارانگاز بوو. هەرچەندە وڵاتە یەکگرتوەکان لە دەســـتپێکدا مەیلی بە لای کێشــــەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەچوو، کەچی وردەوردە لە ڕێی سـروشـتی بەئەنجامگەیشـتنی سـفر هیچ بەدەسـتی بەرانبەر لە جەنگی سـارد، گلایە نێو سـیاسـەتەکانی هەرێمی. ئامانجی سەرەکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەها دارێژرابوو؛ لە ڕێی پشـــتگیریکردنی ســـتەمکارانی دژە چەپی هەرێمەکە، ڕووبەڕووی دەستوەردان و هەژموونی سۆڤیەت بۆ سەر سەرچاوەکانی نەوتی ببێتەوە. هەر لەبەر ئەوەشـــە ســـەبارەت ئایدیۆلۆژی هاوپەیمانەکانی تا ئەوکاتەی بە غەیرە کۆمۆنیستی دەمانەوە زۆر وردکار نەبوو.

ئەوەی جێگەی بایەخە، قەیرانی ئێران لە ١٩٤٦ و دروســـتبوونی هەردوو کۆماری ئازربایجان و مهاباد لە باکووری ئێران، کە سۆڤیەت پشتوپەنایان بوو، سـەرەتای سـەرهەڵدانی جەنگی سارد بوو. شکستپێهانی ئیسرائیل بە

---

[87] لەمەودوا ئەم دەستەواژەیە چەند جارێک دێتەپێشـەوە. گەمەی ئەنجام سفر، گەمەیەکی بیردۆزانەی بیرکاری و ئابوورییانەیە، هاوکێشــەیەکی دووســـەرەیە، بەشـــێوەیەک ئەنجامەکەی لە بەرژەوەندی تایەکی هاوکێشـــەکەدا و لە زیانی تایەکەی دیکە دایە، واتە بری قازانجی لایەکیان یەکســـانە بە بڕی زیانی لایەکەی دیکە. وەرگێڕ.

لەشـــکرکێشـــییەکەی ســـوپای عەرەبان لە ١٩٤٨ و پاشـــان جوولانەوەی خۆمالیکردنی نەوتیی ئێران لە ١٩٥١-١٩٥٣دا وایکرد دەستوەردانی ئەمریکا لە هەرێمەکە خێراتر بکا. لەو نێوەشـــــدا ڕێبازی ئایزنهاوەر شـــێوەیەکی دامەزراوەیی دایە دەســـتەواژەی دەلەســـی[٨٨] وەزیری کاروبارەی دەرەکی، کـاتێ لە دامەزرانـدنی پەیمـانی بەغـدادی بۆ بەرزەفتکردن و لە خۆگرتنی سـۆڤیەتییەکان دەسـتەواژەی "توێژی باکووری" هێنایە گۆڕێ. ئەو توێژەش لە دەریای سـپیی ناوەڕاسـت تا بانی بامیر درێژ دەبووەوە، توێژی باکوور قـایشـــێکی کەمەری جیۆپۆلیتیک بوو، مەبەســـتیش لێی ڕێگرتن بوو لە دزەکردن و دەســـتوەردانی ڕوســـیا لە کانە نەوتەکانی کەنداوی فارســـی، ئەمەشـــی لە ڕێگەی بنیاتنانی بنکەی ســـەربازی ئەمریکای ئەنجام دا. لە ١٩٥٥دا، تورکیا و عێراق و ئێران و پاکســـتان لەگەڵ بریتـانیا بەیەکەوە ڕێککەوتنی پەیمانی بەغدایان سـازدا. ئەم پەیمانەش بەربەستێکی سـەرەکی بوو لەبەردەم ســـەرکردایەتی نـاســـر بۆ یەکێتیی عەرەب. کەچی لەگەڵ ئەوەشـــدا، پەیمانەکە لەگەڵ کودەتاکەی عێراق لە ١٩٥٨دا ڕوخا و ڕژێمی نوێی عێراقیش سـیاسـەتی لایەنگیریی سـۆڤیەتی گرتەبەر. هەر بەڕاسـتیش، پێگەی جیۆسـتراتیژی عێراق کە لەنێو جەرگەی هەرێمەکەدا بوو، وایکرد بۆ مۆسکۆ ببێتە ئامانجێک، بەو هیوایەی بازدانێک بێ بەسـەر قەڵغانی ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەلات و کەنداوی فارسی. ئیدی بە سروشتی ئەنجام سفری جەنگی سارد، گەرمبوونی پەیوەندی عێراق لەگەڵ مۆسکۆ وەها دانرا، گوایە عێراق بەرەو تەوەری هەژموونی ڕوســـیا کشـــاوە[٨٩]. هەر لەبەر ئەو بەرڕەوتەش بوو، شا کلکی لەگەڵ کوردی عێراق گرێدا.

---

[٨٨] جۆن فۆرســـتەر دەلەس (١٨٨٨-١٩٥٩) ســـیاســـەتمەدار و پارێزەر و ئەندامی پارتی کۆماریی ئەمریکی، لە (١٩٥٣-١٩٥٩)دا لە ئیدارەی ئایزنهاوەردا وەزیری کاروباری دەرەوە بووە. وەرگێڕ

[89] National Security Council 5820/1 in Keefer, E.C. and G.W. LaFantasie ed., Foreign Relations of the United States, 1958–1960, Volume XII, Near East Region; Iraq; Iran; Arabian Peninsula (Washington 1992), p. 191.

لە ناوەڕاستی شەستەکانیشدا، ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕەتیکردەوە بۆ پشتگیری کورد لە دژی عێراقدا ڕەگەڵ ئێران بکەوێ. ئەوەبوو لەژێر جڵەوی حوکمڕانی عارفی دژەکۆمۆنیست لە بەغدا، جەنگی کورد لە لایەن کاربەدەستانی ئەمریکا بە چوارچێویەکی "کاروباری تەواو ناوخۆیەوە" دانرا.[90] هەرچۆنێک بێ، ئەم سیاسەتە وردەوردە لە ئاخیروئۆخری شەستەکان بەلاوە نرا. ئەوە بوو لە ٢٥ی تەمموزی ١٩٦٩دا سەرەک نیکسن جاڕی ئەوەی دا، کە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:

> ***پێویستە لەو جۆرە سیاسەتە دووربکەوینەوە، کە ولاّتەکانی ئاسیا بە شێوەیەک پابەندی ئێمە وەک ئەوەی ڤێتنام تا لە کێشەکانیان بگلێین... مەگەر ئەو هەڕەشانەی کاریگەرییەکی هەرە سەرەکییان سەبارەت بە چەکی ناوەکی ئێمەوە هەبێ... ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرەو ئەوە دەڕوا ولاّتەکانی ئاسیا هان بدا و هەر ئەوەشیان لێ چاوەڕێ بکا، کە خۆیان بەرپرسیاریێتی خۆیان هەڵبگرن.***[91]

بە گوێرەی ڕێبازی نیکسن، هاوپەیمانە هەرێمییەکانی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە ئێرانیشەوە، دەکرا لە ڕووی سەربازیی و پشتگیری داراییەوە یارمەتیان بدرێ تا سۆڤیەت و ولاّتەکانی کەمەری ئەو لە جیهانی سێیەمدا لەخۆ بگرن و بەرزەفت بکرێن، ئەمەش بەبێ ئەوەی ئەمریکا ڕاستەوخۆ خۆی تێهەڵبقورتێنێ. هەروەک نیکسن سەرەداوەکانی ڕوونکردنەوە؛ "لە کۆتاییدا ئەوەی لەو ولاّتە دوورەدەستانە ڕوودەدا، ئەوا لەڕووی داراییەوە لە ئایندەیەکی نزیکی بەرچاودا هیچ کاریگەرییەکی لەسەر سیاسەتی

---

[90] McKesson to Baundy, August 6, 1963, (FRUS 1961–1963, XVIII, 307).

[91] Editorial Note, (FRUS 1969–1976, I, 29); Richard Nixon, "Asia after Vietnam," Foreign Affairs 46, no. 1 (1967): 113–25.

دەرەکی ئێمەدا نابێ."[92] ئەوەی مایەی سەرنجڕاکێشانە، دیارە سەردانەکەی نیکسـن بۆ تاران لە دیسـێمبەری ١٩٥٣ و نیسـانی ١٩٦٧دا تۆوی ڕێبازی نیکسنی چاندبێ.[93]

ئەوەی ڕاسـتی بێ، ڕێبازی نیکسـن تێکهەڵکێش بوو لەگەڵ پلانی هەردوولایان، نیکسن-کیسینجەر بۆ خاوبوونەوەی گرژیی نێوان زلهێزەکان و نزیکبوونەوە لە چین. کۆبوونەوەی لووتکەیی مۆسـکۆش لە ١٩٧٢دا پەیوەندییەکانی زلهێزەکانی لە قووتدان و بەرزەفتکردن بۆ کرانەوە و دانان بە هاوژیانێکی ئاشتییانە لەگەڵ یەکدا گۆڕی. لە سـەرەتاوە شـا وەهـای ڕوانیە سـیاسـەتی کرانەوە، گوایە زەمینەیەکی لەبـارە بۆ نەشونماکردنی هەڕەشەکەی سۆڤیەت. "شا بە مەیلێکی پڕەوە لە سیاسەتی کرانەوەمان لەگەڵ یەکێتیی سـۆڤیەت و ئەگەری والابوونی سـەرچاوەکانی سـۆڤیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا دەڕوانێ.... شـا هێشـتا لە ئەگەری ناسەقامگیریی و هەلقۆستنەوەی سۆڤیەت لەو مەیدانەی وڵاتە دراوسێکانی ئێران دەگریتەوە، نیگەرانە."[94] لەگەڵ تێپەڕینی کاتیشـدا، پەی بە توانسـتی دەرفەت لەو کرانەوە و خـاوبوونەوەیە پێبرد. لە میـانەی کۆبوونەوەی لووتکەیی ١٩٧٢دا، نیکسن بە شای گوت؛ "وەها سەیری سیاسەتی کرانەوە و خاوبوونەوە مەکە وەک ئەوەی تۆ لاواز بکا، بەڵکو وەهای تەماشـا بکە،

92 Memorandum from President Nixon to Haldeman, Ehrlichmann, and Kissinger, March 2, 1970, (FRUS 1969–1976, I, 61).

93 Alvandi, Roham, (2012) "Nixon, Kissinger, and the Shah: the origins of Iranian primacy in the Persian Gulf," Diplomatic History, 36(2). pp. 337–372; هەرچۆنێک بێ ڕاوێژی شا بۆ نیکسن هۆکارێکی لێبڕاو بوو بۆ ئەو مشتومڕەی دواتر لەگەڵ سەرۆک کرد، قابیلی موناقەشـەکردن بوو. بیرۆکەی "دەسـترۆیشـتنی هەرێمی" لەهەمان کاتدا لە بازنەی سیاسەتی دەرەکی واشنتندا هاتەکایە. بڕوانە:
Parsi, Trita. Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the U.S. (Yale University Press, 2007). p. 36.

94 U.S. State Department document, April 1974, Documents of the United States Embassy in Tehran, Volume 8, 1979, 65.

ڕێگەیەک بێ بۆ گەڕاندنەوەی دەستتڕۆیشتنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا."[95] (شا)ش بەو زمانە زیرەکانەی ڕێبازی نیکسن وەڵامی دایەوە بەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان پێویستە "هاوپەیمانی ڕاستودروستی هەبن... خۆ ئەگەر ئەوان بتوانن پشت بە خۆیان ببەستن، ئەوا پێشوازی لێدەکەن. ئەگەر ئەوان ئەو پرینسیپەی جەنگیان هەبێ تا دوا سەربازی ئەمریکی ئەوا ئەوان پێشوازی لەو بارودۆخە ناکەن... پێویستە ئێران هەروەک ئیسرائیل بتوانێ بەتەنیا لەسەرپێی خۆی بوەستێ."[96] دواجار سیاسەتی کرانەوە و خاوبوونەوە، مجێزبەرزیی ئێرانی ناسییەوە و ئەو توانستەی خستەبەر شا تا سیاسەتێکی هەرێمایەتی سەربەخۆییانەتر بگرێتەبەر.

وێڕای ئەمەش، سەرۆک نیکسن پەیوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ شادا بەست. نیکسن لە کەسایەتی تایبەخۆی شادا ئەوەی بینی: پراگماتێکی دڕندە کە دوژمنێکی قەستەسەری کۆمۆنیستە. هەردوو پیاوەکان عەودالی سیاسەتی واقیعییانە بوون و خۆشیان وەک سەرکردەی پڕ لە حیکمەتی جیۆپۆلیتیک دەبینی. جارێکیان نیکسن بە ڕاوێژکارەکانی گوت: "**من ئەو(شا)م خۆشدەوێ، ئەوم خۆشدەوێ و وڵاتەکەیشیم(ئێران) خۆشدەوێ. لێ هەندێک بیژمۆتی[97] دیکەی ئەوێم خۆشناوێن.**"[98] هیچ سەرکردەیەکی بێگانە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ سەرکردەی ئێران وەک سەرۆک نیکسن باسی نەکردووە و پەسنی نەداوە. هەر بەڕاستیش وابوو، نیکسن، عێراق و

[95] White House, Memorandum of Conversation, May 30, 1972—5:35 to 6:35 p.m. (FRUS/1964–68/XXI/doc200), pp. 1–2; and Memorandum of Conversation, May 31, 1972—10:30 a.m. to 12:00 p.m. (FRUS/1964–68/XXI/doc201), pp. 1–3.

[96] Memorandum of Conversation, Tehran, May 30, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 200).

[97] بیژمۆت: زۆڵێک کە بەرە لاساری و سەربزێوییەکی لێهاتووانەدا بڕوا. وەرگێڕ

[98] Conversation among President Nixon, MacArthur, and Haig, Washington, April 8, 1971, FRUS 1969–1976, E-4, 122.

کەنداوی فارسـی لە چاوی (شـا)دا دەبینی. "هەروەک خۆت دەزانی، هزری تۆ و هی من لە کۆمەڵێ خاڵی ئەم بابەتە یەک دەگرنەوە، هەروەها لەچەند جارێک لەمیانەی سـەردانەکەی ئاسـیام لە هاوینی ڕابردوودا ئەوەم دەربڕیوە –هەروەک خۆشـت تێبینیت کردووە- لەسـەر کۆمەڵێ لەو کێشـانەی لە هەرێمەکەی تۆدا هەن، جێبەجێدەبن."[٩٩] (شـا)ش ئاماژەی بەوە کرد، کە "بیرۆکەکـانی جیۆپۆلیتیکی کیسـینجەر کتومـت لەگەڵ هی من دێنەوە."[١٠٠] لە کۆتاییدا ئەم بیرۆکە قوولانە سـەری کێشـا بۆ قایلنامەی یاداشـتی بڕیاری ئاسـایشـی نیشـتمانیی (NSDM)[١٠١] ژمارە ٩٢ لە ٧ی نۆڤێمبەری ١٩٧٠دا، کە دانی بە "سـەربەخۆیی دەسـەلاتی ئێران" بەسـەر کەنداوی فارسـدا دانا.[١٠٢] هەرچەندە نیکسـن لەبلەبانانە[١٠٣] جەختی لەسـەر هاوکاریی عەرەبسـتانی سـعودی-ئێران کردەوە، کەچی لەبەر هۆکاری سـیاسـەتی هەرێمەکە ڕۆڵی "کۆڵەگەیی سـعوودی هەر بەناو مایەوە."[١٠٤] جەوهەری گریمانەکەی ڕێبازی نیکسـن لە ناوچەکەدا لەسـەر "هاوژینێتی ئەوەی هەیە" ڕۆنرابوو،[١٠٥] ئەوەی ڕاسـتیش بێ پشـتگیرییەکی لەڕاددەبەدەری ئێران وەک هێزێکی حاشـاهەڵنەگر لەناوچەکەدا بە لۆژیکی

---

[99] Letter from President Nixon to the Shah of Iran, February 23, 1970, (FRUS 1969–1976, E-4, 48).

[100] Pahlavi, Mohammad-Reza Shah, The Shah's Story, Published by Michael Joseph. (London, September 29, 1980). p. 144.

[101] Memorandum from Saunders and Kennedy to Kissinger, June 3, 1970, (FRUS 1969–1976, E-4, 70).

[102] Letter from Laird to Rogers, October 27, 1970, (FRUS 1969–1976, E-4, 93); National Security Decision Memorandum 92, November 7, 1970, (FRUS 1969–1976, E-4, 97).

[١٠٣] لەبلەبان؛ مەعلان، کارامە ، کەسێکە لە قسە و دواندا ڕەوانبێژ بێ. وەرگێڕ.

[104] Memorandum from Kissinger to President Nixon, October 22, 1970, (FRUS1969–1976, E-4, 91).

[105] Harold Saunders in an interview with William Burr, February 24, 1987, Washington, DC, tape 2B, FISOHC.

هاوکاری لەنێوان ئێرانێکی باسکئەستوور و عەرەبستانێکی سعوودی لێهات."[١٠٦] ڕێبازی نیکسن سیاسەتی کۆڵەگە جمکەکەی بەلاوەنا و ئێرانی وەک تاکە دینگەی دەسەڵات لە کەنداوی فارسیدا ناسی.

هەروەها ڕێبازەکەی نیکسن زەمینەیەکی لەباری بۆ ئێران دابین کرد تا وەک هاوکارێکی سەرەکی جەنگی ساردی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێ لە هەرێمەکەدا. نیکسن بە شای گوتبوو؛ "من ڕۆڵی جیهان و ئەو بەشە ڕۆڵەی ئێران تێیدا زۆر بە جوانی دەبینم."[١٠٧] ئەم داننانە بە هەژموونی ئێران بەسەر هەرێمەکەدا وایکرد لە ڕووی سەربازییەوە یارمەتییەکی قەبەی بدرێ. (شا)ش بەهەمان زمانی زیرەکانەی ڕێبازی نیکسن ئاخقی، شا بڕوای وەها بوو، "دەبێ ئێران توانستێکی زەبەلاحانەی کوشتنی هەبێ، بەشێوەیەک ئەگەر یەکێک هەوڵی ئەوە بدا پەلاماری ئێران بدا، پێویستە لەسەری سێ جاران بیربکاتەوە."[١٠٨] لە کۆتاییدا، نیکسن لە کۆبوونەوەی لووتکە لە تاران لە ١٩٧٢دا کاغەزی سپی دایە ئێران تا بە ئارەزووی خۆی و تاڕادەیەک داوای هەموو جۆرە چەکێک بەدەر لە چەکی ناوەکی بکا.[١٠٩]

---

[106] Memorandum from Saunders and Kennedy to Kissinger, June 3, 1970, (FRUS 1969–1976, E-4, 70).

[107] Memorandum from Kissinger for the President's File, undated, (FRUS 1969–1976, XXVII, 28).

[108] Memorandum of Conversation, Washington, October 22, 1969, (FRUS 1969–1976, E-4, 33).

[١٠٩] هەرچەندە پینتاگۆن بە توندی دژی ئەو جووڵەیە بوو –ئاخر پێدانی ئەو متمانەیە سەربازییە زێدەیە بە ئێران بۆ کڕینی چەک و جبەخانە وا دەکا کێبڕکێی خۆپڕچەککردن لە هەرێمەکە دوژمنایەتی ئێران-عەرەب قوڵتر بکاتەوە- لەم بارەیەوە کیسنجەریش پشتی شای گرت و لە یاداشتێکدا وەهای نووسی: "بە گشتی، پێویستە پرسی چەکدابینکردن بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ حکومەتی ئێران جێبهێڵدرێ. خۆ ئەگەر حکومەتی ئێران بڕیاریدا ئامێر و تفاقی دیاریکراو بکڕێ، ئەوا دەبێ لایەنی فرۆشیاری چەک و تفاقەکە هانی ئەو دەرفەتە بێخەوشە بدا، هەروەها ڕاوێژی تەکنیکی توانیستی ئەو ئامێر و تفاقانە بداتە لایەنی کڕیار.

Available at the National Security Archive, http:// www.gwu.edu/~nsarchiv/NSAEBB/ NSAEBB21/03-01.htm

ئەوەی لەو نێوەدا شـــتێکی زۆر جەوهەری بوو ئەوەبوو جێبەجێکردنی ڕێبازەکەی نیکسن داخواز بوو پشـتی سیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بگرێ. لە کۆبوونەوەی لووتکەی تـارانـدا، نیکسـن ڕێگەی بە ئۆپەراسـیۆنێکی ژێربەژێری سـی ئای ئەی دا تا لەگەڵ ساواکدا پشتی کوردی عێراق بگرێ بۆ ئەوەی بەغدا پەک بخا و هەژموونی دەستڕۆیشتنی مۆسکۆش لە بەغدا کز بکا. هاوکاریی ساواک و سی ئای ئەی و مۆساد سـەرکەوتووانە دەسـتوپێی ٨٠٪ی سـوپـای عێراقی بەسـتەوە و خۆنمایشـکردنی هێزی عێراقیشـی لە کەنداو پەکخسـت.[١١٠] هەر زووش هاوکارییەکە بووە نمایشـی ڕێبازەکەی نیکسـن بۆ داننان بە سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران. بە پێچەوانەی "سـیاسـەتی دۆسـتایەتیەکی خۆدوورگر"ی جۆنسـۆن لە بەرانبەر عێراقدا،[١١١] سـەرۆک نیکسـن وڵاتە یەکگرتووەکانی بەرەو نێو جەنگی کورد لە کوردسـتانی عێراقدا کێشـکرد، "ئەمەش هەمووی لەبەر خاتری شا" بوو.[١١٢] هاوکاریی سی ئای ئەی لەگەڵ سـاواک لە کوردسـتانی عێراقدا بەگوێرەی کۆمیتەی پایک، ئەو ڕاسـتییەی ڕوونکردەوە کە "بەرژەوەندی نیشـتمانیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەشێوەیەکی کاریگەر لەگەڵ هی شادا ئاوێزان بووبوو."[١١٣]

لە ئەنجامی کۆبوونەوەی لووتکەی تاران لە ١٩٧٢دا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەهـای دانـا، جەنگی کورد وەک بەرەیەکی نوێی ململانێی جەنگی سـاردە لەگەڵ کرملیندا، نەوەک کێبڕکێیەکی هەرێمی بێ لەنێوان تاران و بەغدا یـان شـەڕێکی نێوخۆیی بێ لەنێوان بەغـدا و کورد. ئیـدی لەبەر

---

[110] Tehran 10954 to U.S. Department of State, "U.S. Policy on Iraqi/Iranian Conflict," December 30, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), pp. 1–2.

[111] Hahn, Peter, Missions Accomplished? The United States and Iraq Since World WarI (Oxford University Press, 2011). pp. 51–53.

[112] Memconn, July 23, 1973, (FRUS 1969–1976, XXVII, 24).

[113] U.S. Congress, House Select Committee on Intelligence, CIA: The Pike Report. (Nottingham, England: Spokesman Books, 1977). p. 198.

بەرڕەوتی لۆژیکی گەمەی ئەنجام سفری جەنگی سارددا، کیسنجەر نیازی وابوو جەنگی کورد بۆ سۆڤیەت بکاتە "چاڵێکی بێ بن" و "زامێکی کراوە". ئەو ویستی ڕژێمە هەوادارەکانی سۆڤیەت لەوە تێبگەن، کە "ناتوانن گەشتێکی بەخۆڕایی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا بکەن."[114] کیسنجەر بە پێداگرییەوە گوتی: "خۆ ئەگەر توانیمان سەرچڵییەکەی سۆڤیەت لە عێراقدا مایەپووچ بکەینەوە، ئەوا جڵەوی مجێزی لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا دەگیرێ."[115] خۆی ئەمە لێککێشانەوەیەکی تەواو لۆژیکیانەی سنووری سیاسی جەنگی سارد بوو لەبارەی قەیرانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین، لە بەرانبەریشدا دەستکردنەوەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانیش بوو. لە ڕەوتی توندبوونی جەنگی ساردا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر باش ئاگای لە بایەخی بەرچاوی جیۆستراتیژی ئێران بوو بۆ لابالی باشووری سۆڤیەت. هەربۆیە ڕایەڵەی پەیوەندی ڕاچاندنی لەگەڵ ئێران و پاراستنی لە لایەن ئەمریکاوە وەک خاڵێکی ستراتیژیی جەنگی سارد چڕ دەکرایەوە. بەگوێرەی ڕاپۆرتێک، "هەڵکەوتەی ستراتیژی ئێران لە نێوان کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەت و کەنداوی فارسدا و سەرچاوەی زەبەلاح لە یەدەگی نەوت وای لێدەکا پەیوەندییە دۆستایەتییەکەی بۆ ئەمریکا هەرە بایەخدار و چارەنووسساز بێ، ئیدی دەبێ سەربەخۆیی و یەکانگیریی خاکەکەشی پارێزراو بێ."[116] **بە کورتی، بەرڕەوتی جەنگی سارد دەرفەتێکی گەورەی دایە ئێران تا ڕەوایەتی بداتە پاڵپشتیکردنی کوردی عێراق بۆ ئەوەی ڕێگە لە دزەپێکردنی سۆڤیەت بگرێ.**

---

114 86Memcon, July 23, 1973, (FRUS 1969–1976, XXVII, 24).

115 Minutes of Senior Review Group Meeting, July 20, 1973, (FRUS 1969–1976, XXVII, 23).

116 National Security Council Report, Statement of US Policy to Iran, 6 July 1960, FRUS, 1958–1960: Near East Region; Iraq; Iran; Arabian Peninsula, 12, pp. 680–8.

## ئیسرائیل و ڕێبازی کەمەرەیی

بنەچەکی ڕێبازی کەمەرەیی ئیسرائیل یان ستراتیژی کەمەرەیی بۆ کۆتایی سییەکان دەگەڕێتەوە. ئاخر تاقانە مانەوەی دەوڵەتی جوو لە نێو دەریاییەک لە وڵاتە عەرەبییە نەیارەکان، وایکرد ئیسرائیل پێویستی بە پەرەپێدانی ستراتیژی دۆستایەتی لەگەڵ وڵاتە ناعەرەبییەکان هەبێ تا جیهانی عەرەب لە دەرەوەرا ئابلووقە بدا، ئەم دەوڵەتانەش ئێران و تورکیا و ئەسیوبیا بوون، هەروەها ئیسرائیل ڕووی کردە کەمینە نەتەوە غەیرە عەرەبەکانی نێو جیهانی عەرەب، ئەمانیش بریتیبوون لە مارۆنەکانی لوبنان و کورد و جڤاکی قیبتی لە میسر. بەر لە سەرهەڵدانی سەید موسا سەدر، کەمایەتی شیعەی لوبنان لەنێو سیرەی ئامانجەکانی ئیسرائیل بوو. لە هەمان کاتیشدا، ئێران پێویستی بە ئیسرائیل هەبوو، هەرچەندە ئیسرائیل بۆ هەمان ئاست بایەخی بۆ ئێران نەبوو. ئاخر لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە، شا بەدوای تەکنەلۆژیای ئیسرائیل و بەهەمان شێوەش بەدوای لۆبی جوو لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا وێڵ بوو بۆ ئەوەی یەکێتیی سۆڤیەت لەخۆبگرێ و بەرزەفت بکا.

بە تێپەڕبوونی ڕۆژگاریش، ڕژێمە پان عەرەبییەکانی هەرێمەکە ڕۆڵێکی مەزنتریان لە پەیوەندییەکانی ئێران-ئیسرائیل گێڕا. کودەتاکەی عێراق لە ١٩٥٨دا سەری بۆ ئەوە کێشا ئیسرائیل لە ڕێی بنیاتنانی هاوبەشکردنی هەواڵگیریی سێ سەرە لەگەڵ ئەنقەرە و تاران لە ١٩٥٨دا ڕێبازی کەمەرەیی خۆی دابڕێژێتەوە. ئەم پەیوەندییە سێ سەرەیە بۆ کۆبوونەوەی نیمچە فەرمی "بەڕێوبەرانی دەزگا هەواڵگرییەکانی ساواک و مۆساد و میت پەرەیسەند، بۆ ئەوەی بەردەوام چاودێری هاوکارییەکەی سۆڤیەت-میسر-عێراق بکەن.[١١٧] هەر بەڕاستیش، جێگیرکردنی ئەو ئاراستەکرانەوە و گونجانەی ئێران-ئیسرائیل کەمتر لەسەر پێکهاتەی غەیرەعەرەبی ئەو دوو

---

[117] Military Attaché Report 196-45 from captain Archibald B. Roosevelt, Jr. (Baghdad), "Tribal Revolt in Kurdistan," August 16, 1945.

ولاتە لە دژی ڕژێمە عەرەبییەکان ڕۆنرابوو لەوەی خەملاندنی هەڕەشـــەی هـاوبەشـــیان و لۆژیکی هـاوســـەنگی هێز بێ. لە ســـەرێکەوە، دەوڵەتە غەیرەعەرەبە دژەمۆســـکۆییەکانی هەرێمەکە دەیانتوانی ڕووی ئاراســـتەی بەغدا و قاهیرە لە ڕۆژئاوای ئێران و کەنداوی فارس وەربگێڕن. لە سەرێکی دیکەشـــەوە، ئێرانێکی بەهێز دەبووە مـایەی ئەوەی بەغـدا لە ڕەوتی چوونەڕیزی ســـوپا عەرەبییەکان لە دژی ئیســـڕائیل ئازاد بکا. هەرچەندە هەرگیز ئێران بە فەرمی دانی بە ئیسڕائیلدا نەنا، کەچی شـا پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئیسڕائیل بە ستراتیژ دەزانی. "ئێمە سیاسەتی ئەوان [ئیسڕائیلمان] لە داگیرکردنی خـاکی عەرەب خۆشـــنـاوێ و بە فەرمیش چەنـدین کەڕەت ڕامانگەیاندووە؛ هەرچەندە، ئێمە شـــادمانین بەوەی [ئیســـڕائیل] ڕژێمە عەرەبەکانی خســـتۆتە ئەو پێگەیەی خۆیان. [هەر لەبەر ئەوەش] شـــتێکی شێتانە دەبێ [بە فەرمی] پشتگیری سیاسەتەکانی ئیسڕائیل بکەین."[١١٨]

وێڕای ئەو پەیوەندییە سێ قۆڵییە،[١١٩] عێراقی پان عەرەبیزم لە شـەستەکان و حەفتاکاندا گەیاندە ئەوەی هاوپەیمانیی ئێران-ئیســڕائیل- کورد بێتەکایە. ئاخر کورد لە هەرێمەکەدا بە ژمارە گەورەترین کەمینەی غەیرەعەرەبی بێ دەوڵەت بوون، هەر لە جەنگی یەکەمی جیهـانیشـــەوە لە دژی بەغـداوە وەســـتـاونەتەوە. لەوەش پتر، جیۆســـتراتیژی نـاوچە وشـــکـانییە

---

118 Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. I: 1347–1348/1968–1969 (Bethesda, MD: Iranbook, 1993). p. 196.

١١٩ ئەم هـاوپەیمـانییەی تـاران-ئیســـڕائیـل جووت بوو لەگەڵ ســـتراتیژی هـاوکـاریی لە ڕەهەندەکانی دیکەشـدا بە بنیاتنانی هێڵی لوولەکێشـی نەوت ئیلات-ئەشـکالۆن لە بەندەری عەقەبەوە بۆ سـەر دەریای سپیی ناوەڕاست، ئەمەش ئەو توانستەی دەدایە ئیسڕائیل نەوتی ئێران هـاوردە بکـا و هەروەهـا نەوتیش بۆ ئەورووپـا بنێرێ، هەڵبەت ئەم کـارەش بە بەلاوەنانی نۆکەندی ســـوئێس بوو. هەڵبەتە عێراقییەکـان لە پەیوەنـدی ئابووری ئێران- ئیسڕائیل " و هێڵی لوولەکێشی نەوتی ئیلات-حەیفاش دەهری بوون". بڕوانە:
Baghdad 293 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 8 April 1961.

(ناکەناراوییەکە)ی خاکی کورد لە عێراق و سووریادا بنکەیەکی ستراتیژی بەخشییە ئیسرائیل.[١٢٠] وێڕای ساواکیش، ئیسرائیلییەکان تا ڕاددەیەک ڕۆڵێکی جەوهەرییان بینی لەوەی شای ئێران قەناعەت پێبکەن تا پشتی کوردی عێراق بگرێ. لە ڕەوتی جەنگی کورددا، ئێران "بۆ کردەی تێکدەرانە و تیرۆریستیانە" ڕێڕەوێکی تایبەتی دابووە ئیسرائیلییەکان.[١٢١] **ساواکیش بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوی هەواڵگریی کوردستان –پاراستن- کاری لەگەڵ مۆساددا کرد، ئەمەش بۆ ئەوەی هەواڵی هەواڵگرییانە لەبارەی سوپای عێراق کۆبکەنەوە. ئیدی هاوپەیمانی ئێران-ئیسرائیل کوردی عێراق تا ١٩٧٥دا مایەوە، تا ئەوکاتەی تاران لە ١٩٧٥دا ڕێککەوتننامەی جەزائیری واژۆ کرد.** ئەنجامی ڕێککەوتنی جەزائیریش تا ڕاددەیەک پەیوەندییەکانی ئێران-ئیسرائیلی گرژ کرد. ئاخر هەر لەبەر ئەو بەردەقەدا بوو، کە شا ڕەخنەی لە هێز و دەسەڵاتی لۆبی ئیسرائیلی لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا گرت و ناوی لێنا "تەنانەت بە بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیلیش زیاد لە پێویست"ە. شا ڕاشکاوانە جەختی لەوە کردەوە، کە لۆبی جوو "زۆر شتی" جڵەوکردووە بە "ڕۆژنامە، میدیا، بانک و باری داراییشەوە." بڕوانە:

---

[١٢٠] سەرباری ئەمەش، هاوپەیمانیی ئیسرائیل-کورد لە ڕێی سیاسەتی دیمۆگرافیی ئیسرائیلی چڕتربووەوە. دانیشتوانە کەم ژمارەکەی دەوڵەتی جوو پاڵی بە سەرکردە ئیسرائیلییەکانەوە نا تا هانی جڤاتە جووە دوورەدەستەکانی دیاسپۆرا بدەن بەتایبەتیش ئەوانەی ڕۆژهەڵاتی ناوین تا بەرەو "وڵاتی بەڵێنپێدراو" باربکەن. لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی عەرەب ئیسرائیل لە ١٩٤٨-١٩٤٩، کەمایەتی جوو لە عێراق کە نزیکەی ١٢٠٠٠٠ کەس دەبوون، خەریکبوون لە وڵاتەکە باربکەن. لە ڕێی دەستوەردانی ڕاستەوخۆیی ساواکەوە، جووەکانی عێراق لە ڕێی کوردستانی عێراقەوە بەرەو شاری ورمێی باکووری ئێران بەقاچاغ کۆچیان پێکرا، ئیدی لەوێوە ڕادەستی ڕێکخراوە جووەکان دەکران، تا جووە عێراقییەکان ڕەوانەی ئیسرائیل بکەن. بڕوانە:

The Pragmatic Entente: Israeli-Iranian Relations, 1948–1988 (New York: Praeger, 1989). p. 86.

[121] For details see Ostrovsky V. By Way of Deception: The Making of a Mossad Officer. (Toronto: Staddart, 1990).

https://www.nytimes.com/1976/10/22/archives/the-shah-on-israel-corruption-torture-and.html

لەگەڵ ئەوەشدا، کشانەوەی خێرای شا لە باکووری عێراق و زیادبوونی رەخنەی لە لۆبی ئیسرائیلی نەبووە مایەی لاوازکردنی هاوپەیمانیی ئێران-ئیسرائیل، ئاخر ئێران چەقی بازنەی رێبازی کەمەرەیی ئیسرائیل بوو.

**کشانەوەی بریتانیا لە رۆژهەڵاتی سوێس**

لە کانوونی دووەمی ١٩٦٨دا بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر و ناکاو شانشینی یەکگرتووی بریتانیا رایگەیاند، کە هێزەکانی خۆی لە ئاخروئۆخری ١٩٧١دا لە "رۆژهەڵاتی سوێس"دا دەکێشێتەوە. بڕیارەکەش دوابەدوای پاشەکشەی بریتانیا لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیدا درا. کەوتنە سامناکەکەی سینگافۆرا لەگەرمەی جەنگی دووەمی جیهان بە دەستی هێزەکانی ژاپۆنی و پاشان سەربەخۆبوونی هیندستان (هیند و پاکستان) لە ١٩٤٧دا زەبرێکی کوشندە بوو بۆ ئیمپراتۆریەتی بریتانیا و لاوازی کرد. قەیرانی سوێسیش لە ١٩٥٦دا کوتانی دوا مێخ بوو لە تابوتی ئابووری و هێزی سەربازی بریتانی و وای لێکرد بگاتە رادەی کەوتنە نێو قەیرانی دارییەوە. ئەوەبوو لە کانوونی دووەمی ١٩٦٨دا هارۆلد ویلسنی سەرۆوەزیر و دینیس هیلی وەزیری بەرگری، کشانەوەی هێزەکانی بریتانیایان لە زۆری بنکەکانی هێزی سەربازیی بریتانیان راگەیاند. وێڕای ئەوەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لۆبییەکی چڕوپڕی بۆ قەناعەتپێهێنان بریتانیا کرد بەڵکو بڕیارەکەی رانەگەیێنێ، کەچی کشانەوەی بریتانیا بووە "بڕیارێکی پاشگەزنەبووەوە."[١٢٢]

---

[١٢٢] (دین رسک)ی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکا لە کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ جۆرج براونی هاوپیات لە کاروباری دەرەوەی بەریتانیادا، هێڵی بەژێر سەرەداوی بەرچاوی هەبوونی بەریتانیای لە رۆژهەڵاتی ناویندا دانا و هۆشداری دایێ ئەگەر بریتانیا بکشێتەوە ئەوا زەمینە لەبار دەبێ بۆ دزەکردنی رووس. تەنانەت رسک لەبەر کاربەدەستە بەریتانییەکانیش پارایەوە: "بۆ خاتری خوا، وەک بەریتانییەک رەفتار بنوێنە!" بروانە:

بە پێچەوانەی ڕوانینی باو، کشانەوەی بریتانیا سیاسەتی جووت کۆڵەگەیی لە کەنداوی فارسدا لاواز کرد.[١٢٣] ڕەگوڕیشەی ئەم سیاسەتەش بۆ ستراتیژی لەندەنی بەر لە ڕۆژگاری جەنگی دووەمی جیهان دەگەڕایەوە. زووتر، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، کەنداوی فارسی بووبووە "دەریاچەیەکی بریتانی". لە میانەی جاڕدانی کشانەوەکەدا، لەندەن شێخنشینەکانی کەنداوی فارسی قەناعەتپێهێنابوو تا یەک فیدراسیۆن بۆ لەخۆگرتن و بەرزەفتکردنی هەژموونی سۆڤیەت لەناوچەکەدا دروست بکەن.[١٢٤] لەوەش گرنگتر، شانشینی یەکگرتووی بریتانیا سیاسەتێکی داهێنا، کە لەسەر هاوسەنگی هێز لەنێوان تاران و ڕیاز پێکهاتبوو، ئەمەش بۆ ئەوەی ڕێگربێ لەوەی هیچ کامێک لەو دوو دەوڵەتە ببنە تاکە "زلهێز" بەسەر ناوچەکەدا.. ئیدارەی جۆنسنیش ئەم سیاسەتە جووت کۆڵەگەیەی لە بریتانیاوە بۆ بەمیرات بەجێمابوو. وێڕای فشاری بەردەوامی (شا)ش، کەچی ئەمریکا توند دەستی سیاسەتی جووت کۆڵەگەیەوە گرتبوو، هەروەها دنەی هەردوو دەوڵەتەکەشی دەدا تا لە هەرێمەکەدا هاوکاریی یەکدی بکەن.[١٢٥]

---

Memorandum, Battle to Rusk, “British Plans to Accelerate Withdrawal of Military Presence from the Persian Gulf: Your Meeting with Foreign Secretary Brown, January 11,” January 9, 1968 (FRUS/1964–68/XXI/doc.122).

[١٢٣] بەگشتی واباو بوو سیاسەتی ئەمریکای کەنداوی فارسی بەر لە شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران بە دەستەواژەی جووت کۆڵەگە بەکاردەهات، بەڵام هەرگیز لە بەڵگەنامەکانی ئەمریکادا ئەم دەستەواژەی جووت کۆڵەگەیی تۆمار نەکراوە.

[١٢٤] ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو (UAE) لە میرنشینەکانی ئەبوزەبی، عەجمان، بەحرەین، دوبەی، فوجەیرە، ڕەئسولخەیمە و ئوم ئەلقەیوان پێکهاتبوو.

[١٢٥] پاکانەی ئیدارەی جۆنسن بۆ سیاسەتەکە ئەوەبوو؛ "خەرجی قەبەی سەربازییانە دەکرێ کاردانەوەی پێچەوانە بخاتەسەر پەرەسەندنی ئابووریانەی ئێران" و لەوەش هەستیارتر "پرچەکبوونی ئێران نابێ بە ڕاددەیەک بێ وڵاتە کەناراوەکانی دیکە بتۆقێنێ و و ڕامانی هاوکاریی نێوان ئێران و عەرەبیش بخاتە مەترسییەوە. بڕوانە:

لەگەڵ ئەوەشـــدا، ڕێبازی نیکســـن ئەو دەرفەتەی بە ئێران بەخشـــی بەڵکو کەلێنی هێز لە کەنداوی فارســـی پڕبکاتەوە. شـــا هەر لە ١٩٦٩ەوە تا ١٩٧٢ لۆبی دەکرد، فشـــاری ئەوەی دەخســـتە ســـەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەڵکو واز لە سیاسەتی ناسروشتییانەی هاوسەنگی هێز لە کەنداوی فارسی بهێنێ. شـــا بە پێداگرییەوە داوای دەکرد، باشـــترین ســـتراتیژی بۆ ئەمریکا ئەوەیە ئێران بخاتە بەر ئەو بەردەقەی کە "ئەگەر پێویست بێ خۆی لەسـەر پێی خۆی بوەســـتێ."[١٢٦] هەروەهـا ئەو هۆشـــــداری دایە دۆگلاس مـاک ئارسەری دووەم باڵوێزی ئەمریکا لە تاران؛ "ئاخر تۆ بڵێی کێ لە ناوچەکەدا هێزێکی زەبربەدەســـتی دەمشـــکێنی لە کەنداوی فارســـییدا هەبێ؟ پاکســـتان، عەرەبســـتانی ســـعودی یان ئەو وڵاتە زەبونانەی ســـەر کەنداوی فارســـی؟ هەڵبەتە نەخێر."[١٢٧] هەروەها شـا لەبارەی هەردوو پلانە نهێنییەکەی بریتانیا لە دژی ئێران نیگەران بوو. "شا فەرمانی پێکردم، تا بە باڵوێزی ئینگلستانێ [لە تاران] بڵێم، بەڵکو مێشـــــکی خۆیان بکەنەوە. منیش پێمگوتەوە لەوانەیە بریتانییەکان لێمان هەراسان بن و بەربەستمان بۆ دروست بکەن. ئەوەیش قسەکەمی سەلماند. ئەوان نەیاندەویست کەنداوی فارسی لە دەستی ئێراندا ببینن."[١٢٨] ئەو هۆشداری ئەوەی دا، "ئێمە ڕێگە نادەین بۆ پاراستنی بەحرێن کەشـــتیگەلی ئەمریکی جێگەی کەشـــتیگەلی بەریتانی بگرێتەوە... خۆ ئەگەر هـاتوو ئەمریکییەکان چەکیان نەداینێ، ئەوا لە ڕوســـــەکان دەیکڕین."[١٢٩] لە

---

Memorandum from McClelland to Handley, August 28, 1968, (FRUS 1964–1968, XXI, 155).

[126] Memorandum of Conversation, Washington, October 22, 1969, (FRUS 1969–1976, E-4, 33–35).

[127] Telegram 1019 from the Embassy in Iran to the Department of State, March 19, 1970, (FRUS 1969–1976, E-4, 55).

[128] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. I: 1347–1348/1968–1969 (Bethesda, MD: Iranbook, 1993). p. 160.

[١٢٩] هەمان سەرچاوە ل ١٥٩

کۆتاییشدا، ئەو لەوەدا سەرکەوت قەناعەت بە نیکسن بێنێ تا بەوە قایل بێ، کەنداوی فارسی وەک "دەریاچەیەکی فارسی" سەیر بکا.[١٣٠]

کشـــانەوەی بریتانیا، ســـیاســـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانی گۆڕی، بەتایبەتیش لەبارەی کوردی عیراقەوە بەرەو دوو ئاراستەی گۆڕی. یەکەم، کشـــانەوەی بریتانیا لەوێ واتای ئەوەی گەیاند، وڵاتەکانی ســـەر کەنداوی فارســـی بەخۆیان ئاســـایشـــی خۆیان دابین بکەن و ئەو دەرفەتەشـــی دایە ئێران ڕۆڵەکەی خۆی تا کەنداوی فارســـی درێژ بکاتەوە. لە چاوی شـــادا، کەنداوی فارســـی حەوشـــەی پشـــتەوەی ئێران بوو، هەر بۆیەشـــە بۆ ســـەر ئاسایشی نیشتمانیی ئەو دژوار بوو. بە کشانەوەی بریتانیا لە خۆرهەڵاتی ســـوێس، شـــا هەوڵیدا ئێران وەک دەوڵەتێکی ســـەربەخۆ وێنابکێشـــێ، کە دەکرێ ببێتە پاســـەوانی کەناراوەکانی کەنداوی فارســـی. لە ئازاری ١٩٦٩دا و لە دیدارێکی لەگەڵ نیویۆرک تایمزدا، بە متمانەوە پێداگر بوو لەســـــەر ئەوەی، "دەبێ ئەمریکییەکان ســـوپاســـگوزار بن، کە ئێمە ڕێگە نادەین هیچ هێزێکی بیانی پێ بنێتە کەنداوی فارســـی. پێویســـتە ئەمریکا ســـوپاســـگوزار بێ، لەوێدا وڵاتێک هەیە بە هیچ کەســـێک پابەند نییە و ســـەریش نانەوێنێ." لە کۆتاییشـــدا کۆشـــکی ســـپی پێشـــوازی لە بڕیارەکەی ئەو کرد. بەگوێرەی قســـەی کیســـنجەریش بێ، "ئەو کەلێنەی کشـــانەوەی بریتانیا بەجێیهێشـــت، لەبن هەڕەشـــەی داگیرکاری ســـۆڤیەتی و ڕەوتی ڕادیکالی دایە، بۆیە دەبێ ئەم کەلێنە لە لایەن هێزێکی دۆســـــتی ئێمە [مەبەســـــت ئێران بوو] پڕبکرێتەوە."[١٣١] ئەو کەلێنەی هێزە لە کەنداوی فارســـیدا هەڵســـەنگاندێکی هاوبەشـــیانەی هەڕەشـــەی پەیداکرد و هاوکارێتی لە هەرێمەکەدا قووڵتر کردەوە، بە کوردســـتانی عێراقیشـــەوە. دووەم شـــتیش، ســـەرهەڵدانی ڕەوتی

---

[130] Letter from Laird to Rogers, October 27, 1970, (FRUS 1969–1976, E-4, 93); National Security Decision Memorandum 92, November 7, 1970, (FRUS 1969–1976, E-4, 97).

[131] Kissinger, Henry, The White House Years. (Little Brown & Co, Boston, Massachusetts, 1979). 1264.

هێزی ئێران لە کەنداوی فارسییدا سیاسەتی عێراقی ڕادیکالانەتر کرد. ئەوە بوو لە ٣٠ نۆڤێمبەری ١٩٧١دا، هێزەکانی ئێرانی لە دوورگە جیۆستراتیژەکانی ئەبو موسا و تونبەکان لە کەنداوی فارسییدا بڵاوبوونەوە. لەوکاتەش ئەم دوورگانە لە ڕووی مێژوویەوە بەشێک بوون لە ئێران، شیخنشینەکانی شاریجە و ڕەئسولخەیمە، سەروەریتی خۆیان بەسەر دوورگەکان ڕاگەیاند. کاردانەوە توندەکەی عێراقیش لەبارەی ئەو جووڵەیەی ئێران، شای هێنایە سەر ئەو بڕوایە، دەبێ پشتگیریی خۆی بۆ کوردی عێراق چڕتر بکا. لەژێر ئەو بەرڕەوتەدا شا پەیوەندییە گەرمەکەی بەغدا –مۆسکۆ بە گەف و هەڕەشەیەکی جەوهەری بۆ سەر سیاسەتی ئەمریکای جەنگی سارد دانا. کشانەوەی بریتانیاش پشتبەستنەکەی ئەمریکایان بە ئێران لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا خێراتر کرد، وەنەبێ بە پێچەوانەوە بکەویتەوە، ئاخر تاران کۆشکی سپی هێنایە ڕەدایی تا لە کوردستانی عێراقدا پشتی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بگرێ.

سیاسەتی ئەمریکای جەنگی ساردی بۆ بەرزەفتکردنی یەکێتیی سۆڤیەت و هاوپەیمانەکانی لە هەرێمەکەدا، ڕێبازی نیکسن، ڕێبازی کەمەرەیی ئیسرائیل و کشانەوەی بریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی نۆکەندی سوێس، هەر هەموو ئەمانە بەیەکەوە دەرفەتی دارشتن و کشانی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانیان هێناپیشەوە، نەخاسمە لە کوردستانی عێراقدا.

**٣ - دامودەزگاکان**

**"شـــا پیاوێکی توندی بێهەســـت و ســـۆز و بەتوانایە. ئەو ڕوانینێکی جیۆپۆلیتیکییانەی هەیە."١٣٢**

**کۆلۆنێل عیســـا پژمان: جەنابی خاوەنشـــکۆ، تکایە لەبیری کە. گیانی هاوچەرخبوون و بەرڕەوتی هەرێمایەتی بە تەواوەتی گۆڕاون."١٣٣**

**ســـەید موســـا ســـەدر بە ئیحســـان نەراغی گوت؛ "داوام لە شـــا کرد تا نەخۆشخانەیەک بۆ شیعە دروست بکات. پاشان دەتوانین زانکۆیەکیشیان بۆ دروســـت بکەین. (شـــا)ش قایل بوو. لێ قادر(مەنســـور قەدەر باڵوێزی ئێران لە لوبنان) هەوڵیدا شا ساردبکاتەوە."١٣٤**

بەردەوامبوون و وەرچەرخانی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لایەن کارلێککەری نێوەخۆی دامودەزگا ســـیاســـییەکانی ئێرانیشـــدا وایکرد ســـیاســـەتەکە شـــەقڵی خۆی وەربگرێ. بە پێچەوانەی تەوژمی ســـەرەکیی ســـیاســـەتی دەرەکیی ئێرانی پەهلەوی، کە جەختی لەســـەر ڕۆڵی شـا وەک ڕاســـپاردەی ســـیاســـەتی دەرەکی دەکردەوە، کەچی چەندین دامودەزگای ســیاســی ســـەرەکی هەبوون ڕۆڵی چارەنووســـسـازانەیان لە شـــەقڵپێدانی ڕەوتی پێشوەچوونی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بینی، لەنێو ئەو دامەزراوانەشدا ساواک، وەزارەتی کاروباری دەرەوە، سوپای ئێران و ڕایەڵەی دینداری وڵاتەکە بوون.

---

132 Memorandum of Conversation, May 15, 1975, (FRUS 1969–1974, XXVII, 371).

133 Qaneifard, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman (Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman). (Elm Publication, Tehran, 2012). p. 45.

134 Naraghi's interview with Khabar-Online, 2 May 2011. http://www.farsnews.com/ newstext. php?nn=8711240772.

## شـــــا

سیاسەتی دەرەکیی ئێران بەر لە شۆڕش وەک سیاسەتی کەسەکی شا چوارچێوەرێژ کرابوو. هەر بەڕاستیش، مشوورخواردنی سەرەکی شا لە ماوەی جڵەوی حوکمڕانییەکەیدا سوپا و سیاسەتی دەرەکی بوون. ئەو ڕەخنەی لە ڕەزاشای باوکیشی گرتبوو، بەوەی لەبارەی نەرمونیانی سیاسەتی دەرەکی و چۆنیەتی "کارکردکردن لەگەڵ بێگانەکان" کەمتەرخەم بووە."[١٣٥] هەر بەڕاستیش، سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران نمایشێکی سەرەکی سیاسەتێکی نەرمونیانانەی شا بووە.

لە چلەکان و سەرەتای پەنجاکاندا، شا لە دەرەوەی پێواژۆی دارشتنی بڕیاری سیاسی بوو. بە تێپەڕینی کاتیش، بەتایبەتیش دوای کودەتاکەی ١٩٥٣، ئیدی بەرەبەرە شا سەرەداوی وردەکاری بەڕێوبەرایەتی هەردوو کاروباری نێوەخۆ و دەرەکی بۆ لای خۆی هەلوێزنینەوە. بە سەرهەڵدان و نەشونماکردنی ئێران لە ڕووی هێز و سامانەوە لە سەرەتای حەفتاکاندا، تا دەهات شا ملهوڕتر دەبوو. "شا جڵەوی قەڵەمڕەوێتییەکەی خستە بەردەستی خۆی. هەموو بڕیارە گرنگەکانی دەدا و تەنانەت بڕیارە ناگرنگەکانی ئێرانیشی دەدا."[١٣٦] ئەو خۆی بە ماموٚتکی[١٣٧] جیۆپۆلیتیک دەزانی، ئەو کەسەی لە ماوەی کەمتر لە سێ دەیەدا، وڵاتە هەرێمییەکانی ناچارکرد وەک هێزێکی مەزن دان بە ئێراندا بنێن. لەچاوی ئەو گوایە هەر بەخۆی وایکردووە وڵاتێکی دواکەوتوو لە هەرێمێکی پڕ لە ئاژاوەدا بکاتە دەوڵەتێکی خاوەن پیشەسازییەکی نوێ و هێزدار، ئەمە وای لێکرد چەشە

---

[135] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973 (Bethesda, D: Iranbook, 1995), p. 62.

[136] Department of State, Scope Paper, August 15, 1967. Available at the National Security rchive.

[١٣٧] لێرەدا ماموٚتکم بە عەڕاب (godfather) و باوکی ڕۆحی داناوە. وەرگێڕ.

و مجێزی بۆ هێز و دەسەڵات زیاتر هەڵبکشێ. بەتێپەڕینی کات و گەیشتنی بە ناوەڕاستی هەفتاکان، شا تا ڕاددەیەک دەسەڵاتێکی ڕەهای لە سیاسەتی ناوەکی و دەرەکی ئێراندا هەبوو، هەروەها بووبووە حکوومەتی یەک تاکە پیاو. لە کانونی دووەمی ١٩٧٣شـــدا، باڵوێزی ئەمریکا لە تاران وای هەڵسەنگاندبوو، شا "وەک زەبەلاحێک لە پشت دیمەنی سیاسیی ئێران وەستاوە، بەوەی جڵەوی تەواوی دەسەڵاتی لە دەست دایە و بەوەش دەزانێ کە هیچ ڕکابەرێکیشی نییە... ئەو سەرکەوتنە تەواوعەیارەش وێنە و نمایشنامەی خۆی پتر کرد و ئەوی وەک دەسەڵاتدارێکی بێوێنە، ڕابەری نەتەوە و چاودێر و باوک و ڕیشسپیی، کەچی بۆ هەندێکیش نموونەی ستەمکار و تێکدەری ئازادییە تاکەکەسییەکان بوو."[١٣٨] ئەوەبوو هەر لەنێو ئەو بەردەقەدا بوو، شا پشتگیری خۆی لە کوردی عیراق و شیعەی لوبناندا دەربڕی.

لە ڕاستییشدا، هەندێ لە ڕاوێژکارەکانی بەئاگابوون لە لێکەوتە دژوارەکانی ئەو بڕیارانەی دەیدان. هەرچەندە، هیچ کەسێک نەدەوێرا ڕووبەڕووی بڕیارەکانی ببێتەوە. لەنێو ژینگەیەکی سیاسیانەی گشتیی کۆتوبەندکراودا، نە دەمەتەقێی کراوە و گشتی لەبارەی سیاسەتی دەرەکی هەبوو نە هیچ ئامراز و میکانیزمێکیش بەدەر لە ڕوانینی خودی شا بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەوتەکە هەبوو. شکستی ڕاوێژنەکردن لەگەڵ کاربەدەستانی ئێرانی ڕێک ئەو شەقڵەی دەسەڵاتی تاکڕەهەندانەی ئەو بوو. دیاربوو ئەو متمانەبەخۆبوونە و توندوبەندییەی شا بەشێوەیەکی سەرسام و کتوپڕانە بە توندی دژبەری کورتهێنی متمانەبەخۆبوونی شابوو لە نێوەڕاستی قەیرانە نێوخۆییەکاندا، نەخاسمە پرسی خۆماڵیکردنی نەوت و شۆڕشی ئیسلامی.

---

138 Airgram from the U.S. Embassy in Iran to the Department of State, Tehran, January 1973.

**ساواک**

لەژێر ڕکێفی حوکمڕانی شـــادا، یەکێک لە گرنگترین دامودەزگاکـان، کە سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانی بەڕێوەبرد: سـاواک، سـازمانی ئیتیلاعات و ئەمنیەتی کیشوەر (دەزگای هەواڵگری و ئاسایشپارێزی وڵات) بوو. بە فەرمی ئەم دەزگایە لە ١٩٥٧ بە یارمەتی سـی ئای ئەی و مۆسـاد دامەزرا، سـاواک سـەرکەوتووانە نەیارەکانی شـای سـەرکوتکردن، بەتایبەتیش حیزبی تودەی مـارکسـی و لایەنگرانی بەرەی نیشـتمانیی موسـەدیق. بەگوێرەی قسـەی ژەنەڕاڵ حوسـێن فردۆسـت بێ،[١٣٩] "دوای کودەتـاکەی ١٩٥٣، ئەمریکـاییەکـان بڕیـاریـان دا ئێران وەک بنکەیەکی سـەرەکی لە هەرێمەکەدا بهێڵنەوە. کەواتە ئەوان دژەهەواڵگریی سـوپا و پاشـان سـاواکیشـیان دروسـتکرد."[١٤٠] سـەرەتا دەزگاکە لە لایەن ژەنەڕاڵ تەیمور بەختیار، حـاکمی عەسـکەریی تاران لە کانونی یەکەمی ١٩٥٣دا سـەرۆکایەتی دەکرا، ئینجا سـاواک تۆوەکەی بەرفرەوانتر کرد و بووە ڕێکخراوێکی هەواڵگریی نوێ و مەشـقی تەکنیکەکـانی هەواڵگریی بە ئەندامەکانی کرد. (شـا) بە خۆی کۆنترۆڵی سـاواکی لەدەسـت دابوو، هەرچەندە بەڕێوبەرانی سـاواک بە شـێوەیەکی فەرمی لەبن دەسـەڵاتی سـەروەزیردا بوون. بە گوێرەی قسـەی فردۆسـت، "ساواک دوو ئەرکی لە ئەسـتۆ بوو، هەواڵگریی (ئەوەی پەیوەندی بە پرسـی دەرەکییەوە هەبوو) لەگەڵ ئاسایشپارێزی (ئەوەی تایبەت بوو بە پرسی ناوەکی)."[١٤١] ساواک لە

---

[١٣٩] فردۆست هاوڕێی منداڵیی شا بوو. بۆ ماوەی دە ساڵ جێگری بەرپرسی ساواک بوو (لە ڕاستیشدا ئەو سەرۆکی ڕاستەقینەی ساواک بوو) هەروەها سەرۆکی نووسینگەی تایبەت -کە بە ساواکی نێو ساواک وێنا دەکرا- و چاودێریی شاهانە بوو. ئەو گوێچکەی شا بوو.

[140] Fardoust, Hossein, Khaterat-e Arteshbod-e Baznesheshteh Hossein Fardoust: Zohour va Soqout-e Saltanat-e Pahlavi (The Memoirs of Retired General Hossein Fardoust: The Rise and Fall of Pahlavi Dynasty). (Moasese-e Etelaat va Pajouhesh-ha-ye Siasi, Third Edition, 1991). p. 382.

[١٤١] هەمان سەرچاوە ل ٣٨٢.

چەندان هۆبەی جیاواز پێکهاتبوو، ئاخر تێکەڵەیەک بوو لە ئێف بی ئای FBIی و سی ئای ئەی ئەمریکی. سێیەمین هۆبە یاخود نووسینگەی ئاسایشی ناوەخۆ گرنگترینیان بوو، لە هەموو دەزگای ساواکدا سامناکتیرینیان بوو. سێیەمین بەشیان لە لایەن پەرویز سەباتییەوە بەڕێوە دەبرا، کە لە شەش بەڕێوبەرایەتی پێکهاتبوو، ئەمانە تیشکیان خستبووە سەر هەرەشە ناوەکییەکان.[142] بە سەرپەرشتی مەنوچەهر هاشمی، هەشتەمین هۆبەی دژەهەواڵگریی بۆ جڵەوکردنی ڕایەڵەی هەواڵگریی سۆڤیەت لە نێو ئێراندا دامەزرا. ئەم دوو هۆبەیە ڕەوشی کێشە ناوخۆییەکانیان خستە ژێر چاودێری خۆیانەوە.[143]پرسە دەرەکییەکانیش لە لایەن ڕێکخراوی هەواڵگریی دەرەکییەوە چاودێری دەکران، کە پێکهاتبوو لە هۆبەی دووەم و حەفتەم. بەسەرپەرشتی لیوا مەنسور قەدەر -پاشان سەرهەنگ عەلی فەرەزیان- هۆبەی دووەم تیشکی خستە سەر کۆکردنەوەی هەواڵگریی دەرەکی. هۆبەی حەفتەمیش بە سەرپەرشتی سەرهەنگ محەمەد عەلی کاوە، تیشکی خستە سەر شیکردنەوەی هەواڵگریی دەرەکی. هەروەها ڕێکخراوی هەواڵگریی دەرەکی لە لایەن لیوا

---

[142] یەکەمین بەڕێوبەرایەتی ئەم بەشەیان چاودێریی حیزبی تودە و گرووپە کۆمۆنیستەکانی دیکەیان دەکرد. دووەمین بەڕێوبەرایەتیش کۆنترۆڵی بەرەی نیشتمانی و چەندین ڕێکخراوی ناحکومییان دەکرد بە کرێکاران و ژنانیشەوە. هەروەها هەر ئەم بەڕێوبەرایەتیانە کۆنترۆلی بەربژارەکانی پەرلەمانیشیان دەکرد. بەڕێوبەرایەتی سێیەم و چوارەم چاودێری جیاخوازەکانیان لە کوردستان، خوزستان و ئازربایجان و هەروەها هۆزەکانیش دەکرد. پێنجەمین بەڕێوبەرایەتیش سووسەی حزبە نوێیەکان و چالاکی دژەشایان دەکرد. شەشەمین بەڕێوبەرایەتیش زانیاری لەبارەی بیچمە دژە ڕژێمیان کۆدەکردەوە.

[143] بە سەرهەڵدان و تەشەنەسەندنی چالاکیی توندوتیژانەی گەریلایی دژەشا لە ئێران و پاشان لە کێبڕکێی نێوان دەزدامودەزگا ناوخۆییەکان بۆ سەرکوتکردنی گەریلاکاز، ئەوە بوو کومیتەی موشتەرەکی زدی خرابکاری [کۆمیتەی هاوبەشی دژە وێرانکاریی] لە کۆتایی کانوونی دووەمی ١٩٧٢دا دروست بوو. ئەم کومیتەیە بەسەردەستەیی لیوا جەعفەر غولی سەدری و پاشان سەرهەنگ زەندیپوور بوو، کە پێکهاتبوو لە توخمەکانی ساواک، ژاندرمە، شارەبانی و سوپا.

عەلی مورتەزاد بەڕێوە دەبرا. ئیدی لە نێو ئەو تەداروکە دامەزراوەیەدا، وەها ڕەچاو دەکرا وەزارەتی کاروباری دەرەوە زانیارییە کۆکراوەکان بداتە ئەم ڕێکخراوە.[١٤٤]

هەرچەندە ڕۆڵی شا لە داڕشتن و شەقڵوەرگرتنی سیاسەتی دەرەکی ئێراندا حاشایی لێنەدەکرا، کەچی چەند کاربەدەستێکی ساواک ڕۆڵی بەرچاویان لە داڕشتەی ڕەوتی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێراندا هەبوو. لەنێو هەرە سەرەکییەکانیشیاندا، لیوا مەنسور قەدەر و کۆلۆنێل عیسا پژمان بوون. قەدەر بە دەستپێشخەری خۆی دوای تەواوکردنی دەرچوونی لە خوێندنی هێزی تۆپخانە چووە ڕیزی سوپای شاهانەی ئێران. پاشان لە ١٩٥٨دا پەیوەندی بە هۆبەی دووەمی ساواکەوە کرد. یەکەمین ئەرکیشی دامەزراندنی ویستگەیەکی ساواک بوو لە دیمەشق. پاشان وەک سکرتێری یەکەمی باڵوێزخانەی ئێران لە لوبنان لە ١٩٦١دا دەستبەکار بوو. ساڵێکیش دوای ئەوە، بە سەرۆکی بەڕێوبەرایەتی ڕۆژهەڵاتی ناوینی ڕێکخراوی هەواڵگریی دەرەکی دەستنیشانکرا. دواتر کرایە سەرۆکی هۆبەی دووەمی ساواک. مەنسور قەدەر لە ١٩٦٣شدا، وەک پاشکۆی پلە دوو باڵوێزخانەی دیسان نێردرایەوە بەیروت، لە ١٩٦٧ تا ١٩٧٢ پلەی قەدەر بەرزکرایەوە و کرایە باڵوێزی ئێران لە ئوردن. بەو پاشخانە دیپلۆماتی و ئاسایشییەی خۆی، لە کۆتاییدا کرایە باڵوێز و سەرۆکی ویستگەی ساواک لە بەیروت و تا کانوونی یەکەمی ١٩٧٩ لەوێ مایەوە. لە ناوەڕاستی حەفتاکانیشدا مەنسور قەدەر بووە بەهێزترین باڵوێزی تاران لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا. وەک

---

[١٤٤] باقی هۆبەکانی ساواک بۆ پرسە جیاوازەکانی دیکە تەرخان بوون. هۆبەی چوارەم چاودێری چالاکیی ڕۆشنبیران و هونەرمەندان و ئەدیبانی دەکرد و سانسۆرێکی قورسیشی خستبونەسەر. هەرچی هۆبەی پێنجەم و شەمیش بوو کونترۆڵی بودجە و دامەزراندنی کردبوو. هۆبەی نۆیەمیش بۆ کردەی ڤیزا تەرخان بوو. دەیەمین هۆبەش کە دواتر دامەزرا، بۆ چاودێری باری تەندروستی گشتیی کارمەندانی ساواک بوو.

"فێڵبــاز و ڕازگر، بەڵام پیــاوێکی زۆر زیرەک"،[١٤٥] ئیــدی هەر زوو لە هەرێمەکەدا بووە باڵوێزی دڵخوازی شـــا. کاتێکیش خەلعەتبەریی وەزیری کاروباری دەرەوە بۆ شــای ڕوونکردەوە، کە بەیروت خاڵێکی وەرچەرخانە بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین و وەها پێویستە مەنسـور قەدەر وەک باڵوێزی ئێران لە بەیروت دابنرێ، ئیدی شا مەراق بوو بزانێ، ئاخۆ "لوبنان ئەوەندە گرنگە تا مەنســور قەدەری بۆ بنێرێ."[١٤٦] هێزی مەنســور قەدەر لە دۆســتایەتییە نزیکییەکەی بە فەردۆســـتەوە ســـەرچاوەی گرتبوو. لەبەر ئەوەی ئەو متمانەیەکی زۆری بەو ڕایەڵانە هەبوو، بۆیە هەر زوو پلەکەی بەرزکرایەوە. بەگوێرەی قســەی قەدەر خۆیشــی، "دوای ئەیلوولی ڕەش، مەلیک حوسـێنی ئوردن، شــای لە ڕۆڵی من بۆ یارمەتیدانی حکومەتی ئوردن ئاگادارکردەوە. هەرچەندە من لەو کاتەدا بەشێکیش نەبووم لە سوپا، کەچی شا پلەی منی

---

[١٤٥] بە گوێرەی ڕای ئیحسان نەراغی کە ڕاوێژکاری فەرەح پەهلەوی بوو، قەدەر بووبووە ئەو ئاژانەی لەنێو نووســـینگەکەی خۆیدا گوێی لە هەموو دەنگوباســـێکی تایبەت بە ئێران و بەتایبەتتر دەربارەی شــا دەگرت. هەر بۆ نموونە، جەنابی خاوەنشـکۆ لە کاربەدەسـتەکانی پرســـی ئاخۆ بۆچی ئەوان لەکاتی ســـەفەری شـــا بۆ زنجان بەنزینی کۆگان بەکارناهێنن. ئەوەبوو قەدەر دەســـتبەجێ شـــــای لەوە ئاگادارکردەوە، کە "بە گوێرەی لێکۆڵینەوە لە وڵاتەکانی دیکە، ئەوان هەموویان بەنزین وەک ســـووتەمەنی بەکار دەهێنن" ئەمەش تا ئەوە دەربڕی گوایە شـــا زانیارییەکی گشـــتگریی لەوبارەوە هەیە. وێڕای ئەمەش، قەدەر لەگەڵ باڵوێزی لوبنان نهێنییەکانی دەبەشـیەوە. هەموو ئەندامانی ماڵباتەکەی هەدرووکیان چ باوک و چ کوڕ گەنـدەڵ بوون. بـاڵوێزەکەی لوبنـان دوو خوشـــکی هەبوون. ئەو بەردەوام خوشکەکانی دەناردنە لای ئەسەدوڵلا ئەعلەم. ئەعلەمیش پیاوێکی بە زەوق و مێباز بوو. ئەم ژنانە ئەعلەمیـان خســـتە نێو داوی عیشـــوەی نازونوزیانەوە، زەمینەیەکی لەباریـان بۆ دۆسـتایەتی قەدەر-ئەعلەم سـازاند، کە بەهۆیەوە تواناکانی قەدەر سـەرنجی (شـا)یان بۆ لای خۆی ڕاکێشا. بڕوانە :

Fars News Agency, Interview with Ehsan Naraghi. Available: http://www.farsnews.com/newstext.php?nn=8711240772.

[146] Fars News Agency, Interview with Ehsan Naraghi, http://www.farsnews.com/newstext.php ?nn=8711240772.

بۆ ســـەرهەنـگ بەرزکردەوە. لە ١٩٧٥یشـــدا، کرامە لیوا."[١٤٧] لەوەش جەوهەریتر، مەنســور قەدەر ڕۆڵێکی چارەنووســسازانەی وەرچەرخانی ڕۆڵی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێراندا گێڕا، قەدەر، سەدری بە مێڵی ســـەرەکی خۆی لە لوبنان دانابوو، ئەمەش لەوکاتەی ســـەدر ئەو پەیوەندییە ئاژانسـیانەی سـەرەکی خۆی لەگەڵ قەدەردا ڕەتکردەوە. قەدەر خۆیشـــی ڕەتیکردەوە ڕۆڵی تێکدەرانەی خۆی ببینێ. "ئێمە چەندین جار هەوڵماندا قەناعەت بە شا بێنین تا پەیوەندییەکەی لەگەڵ سەدرا بژێنێتەوە، بەڵام شـــا دژی بیرۆکەکە بوو. هەرچەندە ســـەدر لەو بڕوایەدا بوو، کەوا پەیوەندی شـیعە-ئێرانم تێکداوە."[١٤٨] لەســەر زەمینی واقیعشـدا، مەنسـور قەدەر ڕۆڵێکی تێکدەرانەی لەوەدا بینی، کە سەدر وەک دوژمنی شا نیشان بدا. کۆلۆنێل عیســا پژمانیش یەکێک بوو لەو کاربەدەســتە ســەرەکییانەی ســـاواک بۆ بنیاتنانی پەیوەندییەکی تۆکمە لەگەڵ کوردی عیراقدا. پژمان وەک کوردێکی ئێرانی یەکێک بوو لەو ئەفســـەرە ســـەرەتاییانەی چوونە ڕیزی ســاواک و پاشــان لە لایەن کۆلۆنێل حەســەن عەلیفیکیای بەرپرســی هۆبەی سێیەم و پاشـان جێگری دەزگای ساواک بە مێجەر/ڕائید پاشاهیی ســەرۆکی بەڕێوبەرایەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـتی ســاواک ناســانرا. لەژێر سەرپەرشتی خوێندنێکی توند و مەحکەمی پاشاهیدا، پژمان بووە ئەندامێکی سـەرەکی دیسـکە نوێیەکەی کوردسـتانی بەرێوبەرایەتی ڕۆژهەڵاتی ناوینی دەزگای ساواک. پاشـان پلەی پژمان بۆ بەرپرسـی ساواک بۆ کوردسـتانی ئێران بەرزکرایەوە. لە ماوەی نێوان سـاڵەکانی ١٩٥٧ تا ١٩٦٩شـدا، پژمان بۆ چەندین پلە و پۆسـتی جیاوازجیاواز دەســستنیشـان کرا، بە ســەرۆکی وێستگەی ساواک لە عێراق و پاشـکۆی سـەربازیی باڵوێزخانەی ئێران لە بەغدا و سەرۆکی هۆبەی کوردستان لەنێو نووسینگەی دووەمی ساواک و

---

[147] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[١٤٨] هەمان سەرچاوە.

پاشـــان ســـەرۆکی هۆبەی حەوتەم و ئینجا بەرپرســـی هەواڵگریی هۆبەی شـارەبانی (هێزی ئاسـایشـپارێزی هاوکاریی پۆلیس لە شـارەکانی ئێراندا). هەروەهـا عیســـا پژمـان زاوای ئەشـــرەف پەهلەوی (خوشـــکە دەسـتڕۆیشـتووەکەی شـا) بوو. **هەر بەڕاسـتیش ئەوە عیسـا پژمان بوو قەناعەتی بە بەختیاری بەڕێوبەری سـاواک و پاشـان خودی شـا کرد تا لەســـەر دەرچوواندنی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیزمان و پەخشـــکردنی ڕادیۆی کوردی لە ئێران پەسـندنامەیان وەربگرێ. هەرچەندە لە بەرابیەوە شـا ڕەتیکردەوە پشـتی بارزانی بگرێ، لێ ئەوە عیسـا پژمان بوو قەناعەتی پێهێنا تا هەڵوێستی لە بەرانبەر کوردی عێراقدا بگۆڕێ.**

***من یەکێک بووم لەوانەی پێشـنیازم بۆ شـا کرد پشـتگیریی سـەربازییانەی هەڵگەڕانەوە لە عێراقدا بکا... (شـا)ش لێیپرسـیم ئاخۆ پشـتگیریکردنی ئێران بۆ کوردی عێراق پێویسـتە و ئەوەشـی بۆ زیادکرد: "ئاخر بارزانی سەربازی سوپای منی کوشتوون (لە میانەی کۆماری کوردی مهاباد)". منیش وەڵامم دایەوە، "خاوەنشـکۆ، تکایە ئەمە لەبیر بکە. گیانی سـەردەم و بەرژەوتی هەرێمایەتی بە تەواوی گۆڕاون". لە کۆتاییشدا شا پلانەکەی پەسەندکرد [تا ئێران پشتگیریی کوردی عێراق بکا] و فەرمانی پێدام نامەیەک بۆ ژەنەڕاڵ حەسـەن پاکرەوانی جێگری سەرۆکی ساواک بنووسم. داوام لە شا کرد هەزار برنۆ[149] و یەک ملیۆن فیشەک لەگەڵ ۲-۳ ملیۆن ڕیال (دراوی ئێرانی) بداتە کوردی عێراق. کاتێکیش شـا لەسـەر پشـتی نامەکە بۆ ژەنەڕاڵ پاکرەوان نووسـی "پەسـەندکرا"، هەسـتمکرد سـەرکردەیەکی ڕاسـتەقینەی بزووتنەوەی کورد بووم. ئینجا دەسـتبەجێ گەڕامەوە بەغـدا و لەوێ لە مـاڵەکەم چـاوم بە تـاڵەبـانی کەوت و پێمکوت: "پیرۆزە!" جەلالیش هێدمەگرتی و وەڵامی دامەوە، "من تا ئێسـتا ژنم نەهێنـاوە!" منیش پێمکوت، "ئـاخر کێ خەمی ژنهێنـانیەتی. شـا***

[149] ئەو تفەنگانەی جۆری ۲٤ کەلە چیکۆسلۆڤاکیا لە ۱۹۲٤ تا ۱۹٤۲ بەرهەمهێنراون.

***نەخشــەکەی پەژراند. ئیدی جەلال باوەشــی پێداکردم و گوتی: "کاک عیسا، ئەمە تاکە ڕێگەی ئێمەیە بۆ ڕزگارکردنی کوردستان."***[١٥٠]

بە پێچەوانەی ڕامــانە بە هەڕمێنەکەی ســــاواک وەک میکــانیزمێکی ســــەرکوتکردن، ئەوا پەیوەندییەکانی ئێران بە کوردی عێراق و شـــیعەی لوبنان بە شـــێوەیەکی ســــەرەکی لە لایەن ڕێکخراوی هەواڵگریی دەرەکی ســـاواکەوە چاودێری دەکرا. کاتێکیش پەیوەندییەکانی ســـەدر لەگەڵ تاران زیاتر شــێوا، ئیدی پرســی شــیعەی لوبنان بە هاوکاریی ســێیەمین هۆبەی ساواک بەڕێوەبرا. بە کورتی، ڕۆڵی ساواک لە شــەقڵپێدان و بەڕێوەبردنی ســیاســەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بەدەر لە شــا لە هەموو پرســە سیاسییەکانی دیکە بەهەڕمێنتر بوو.

## سوپا

پەیوەندی ســتراتیژی ئێران بە کوردی عێراق لە شەســتەکان و ســەرەتای حەفتاکاندا، بەشــێوەیەکی کاریگەر ڕەوشــی هێز و دەســەڵاتی بەغدای لە ناوچەی کەنداوی فارسییدا گۆد کرد[١٥١]. لەگەڵ ئەوەشدا ژەنەڕاڵەکانی ئێران هەمیشــە گومانیان لە بارزانی و پێشــمەرگەی کورد هەبوو. ئەم گومانەش بەشــێکی بۆ بەشــداربوونی بارزانی لە کۆماری مهابادی دەســـتکردی ســـۆڤیەت دەگەڕایەوە. کاتێکیش ســـوپای ئێران بێ خوێن ئازەربایجان و مهابادی گرتەوە، ئەوەبوو بارزانی لە ڕێگەی خۆی بەرەو یەکێتیی سۆڤیەت و بە پشتگیری خەڵکی ئاسایی تاکە یاخیبوو بوو لە شەڕکردن و کوشتنی سەربازانی ئێرانی بەردەوام بوو. سوپاش هەرگیز ئەمەی لەبیر نەچووبوو. لەمەش پتر، ســـوپا وەک "پاســـەوان"ی ســـەرەکی خاکی ئێران، ڕاپەڕینی

---

[150] Qaneifard, Tondbad–e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman (Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman). (Elm Publication, Tehran, 2012). p. 129.

[١٥١] گۆد: سڕ، ئیفلیج .وەرگێر.

کوردی عێراقی بە پلانێکی مەزنی سۆڤیەت دەزانی، گوایە ئامانجەکەشی یەکێتیی نیشتمانیی ئێرانە. بە کورتی، **سوپای ئێران هەرگیز متمانەی بە کوردی عێراق نەکرد، خۆی ئەوە ساواک بوو پشتگیریی پێشکەش بە کوردی عێراق کرد.**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە**

ئەوەی مایەی سەرنجڕاکێشانە، وەزارەتی کاروباری دەرەوە بە شێوەیەکی کاریگەرانە دەستی لە شێوە و شەقڵوەرگرتنی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێراندا نەبووە. ئاخر وەزارەت دوا قسەی لە پێواژۆی داڕشتنی بڕیاری سیاسەتی دەرەکییدا نەبوو. ئەوەی ڕاستی بێ، بەرە بەرە شا لە دەستوەردانی وەزارەتی دەرەکییدا نارەحەت دەبوو، ئەمەش وایدەگەیاند کە بۆچی ئەو هەرگیز ڕێزی لە وەزیرانی دەرەوەی وڵاتەکەی خۆی نەگرتووە. کاتێکیش هینری کیسنجەر سەردانی شای کرد، جەنابی خاوەنشکۆ فەرمانی دا بەتەنیا کیسنجەر ببینێ. عەباس عەلی خەلعەتبەری، وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەوکات لەکاتی خوانی نیوەڕۆدا چووە لایان.[١٥٢] لە ئەنجامی سیاسەتی سەرکەوتووانەی ئۆپیک (ڕێکخراوی وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوت) لە ١٩٧٤دا، شا جڵەوی وەزارەتی دەرەوەی توندتر کرد. جارێکیان شا بە عەلامی گوت: "من بە وەزیری کاروباری دەرەوەم گوت؛ نابێ هیچ کەسێک بەدەر لەمن دەستوەربداتە نێو کاروباری وەزارەتی دەرەوە."[١٥٣]

وردە وردە وەزارەتی کاروباری دەرەوە لەبارەی پەیوەندییەکانی ئێران لە لوبنان و بەتایبەتیش لەگەڵ عێراقدا لە تاریکایی هێڵرایەوە. هەرچەندە

---

[152] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 274.

[١٥٣] هەمان سەرچاوە.

کاربەدەســـتانی وەزارەتەکە هەندێک ئاگایان لە پەیوەندی ئێران بە کوردی عێراق و شـــیعەی لوبنانەوە هەبوو، بەڵام هێشـــتا مەودای قووڵی ئەو پەیوەندییانە لە ئەوان شـاراوە بوون. "زۆر جاران" دیپلۆماتە پێشـووەکانی ئێران ڕوونیان دەکردەوە، کە "تەنانەت ئێمە نەشـــماندەزانی ئاخۆ چی لە گۆڕێدایە."[154] نە لە دەستپێخەرییەکان و نە بڕیاردانی پشتگیریی بۆ هەردوو قەوارە نـادەوڵەتییەکـان پرس بە وەزارەتی کـاروبـاری دەرەوە نەدەکرا. هەرچی پەیوەندی بە شـــیعەی لوبنانەوە هەبوو، ئەوە مەنســـور قەدەری باڵوێز بوو کۆنترۆڵی سیاسـەتی تارانی لەبەرانبەر سـەدردا دەکرد. بڕیارە سـەرەکییەکان لە لایەن ڕاپۆرتەکانی مەنســـور قەدەر بۆ ســـاواک دەدران نەوەک وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ئینجا شـــا ئەو ڕاپۆرتانەی پەســـەند دەکرد. هەروەک مەنسور قەدەر مشتومڕی لەسەر کرد؛ "هەرگیز وەزارەتی کاروباری ئێران بە هێز نەبووە. ئەوان تێگەیشـــتنی هەمەلایەن و زانیاری وردیان لەسـەر پرسە هەرێمایەتییەکان نەبوو، ئاخر هەروەک خەلعەتبەریی وەزیری کاروباری دەرەوە قەناعەتی بە شـــا هێنابوو تا دان بە ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستین بنێ، بەڵام دواتر من شـام هێنا سـەر ئەو ڕایە کە بیرۆکەکەی بگۆڕێ."[155] بەهەمان شـێوەش وەزارەتی کاروباری دەرەوە لە پرسـی کورد دوورخرایەوە. بە پێچەوانەی سـاواکیشـەوە، کە هانی شـای دەدا پشـــتی کورد بگرێ، ئەوا وەزارەتی کاروباری دەرەوە بێئاگا بوو لە قووڵایی پشـتگیریی بۆ پێشـمەرگەی کورد. کورت و پوخت، بە شـێوەیەکی سـیسـتماتیکیانە شـا و سـاواک وەزارەتی کاروباری دەرەوەیان لەبارەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە تاریکاییدا هێشتبووەوە.

---

[154] Parsi, Trita. Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the U.S. (Yale University Press, 2007). p. 62.

[155] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

### دامودەزگا دینییەکان

هەرچەندە شا دوای ئاژاوە و بگرەوبەردەی دا،١٩٦٤ چالاکییەکانی ئاخوندە شـــیعەکانی زێدە کۆتوبەند کردبوو، کەچی پەیوەندییەکانی ئێران لەگەڵ قەوارە نادەوڵەتییەکان تۆکمە دەبوو، بەتایبەتی لەگەڵ شـــیعەی لوبنان، کە ئەوان بە شـێوەیەک لە شـێوەکان بە ڕایەڵەی مەرجەعیەتی شـیعە پابەند بوون. هۆکاری سـەرەکی ئەمەش بۆ ڕۆڵی حاشاهەڵنەگرانەی موسا سـەدر لەنێو کۆمەڵگەی شیعەدا دەگەڕایەوە. هەرچەندە ساواک کارایانە ئەو شتەی کۆنترۆڵ کردبوو، کەچی پەیوەندییەکانی نێوان مەرجەعیەتی شیعە و سەدر پارێزراو بوون. ئەم ڕایەڵەش وەک شـیری دووتیغ بۆ سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لەکاردابوو. ئەوان لە شـــەســـتەکاندا زەمینەیەکی لەباریان بۆ زیاترکردنی پشـــتگیریی بۆ شـــیعەی لوبنان بەگەڕخســـت. بە پاڵپشـــتی ئایەتوڵلای گەورە ســـەید حوســـێن بروجەردی لە قوم و پاشـــان ئایەتوڵلا سەید موحسین ئەلحەکیم لە نەجەف، سەدر لە ئێران باری کرد و ڕووی کردە باشووری لوبنان، لەوێ ئەو بەتەنیا هەستێکی بە کۆمەڵبوونی ناســـنامەی بۆ شـــیعەکان دامەزراند، کە وەک قەڵایەک بە ڕووی تەوژمی سـەرهەڵدەری پان عەرەبیزم هەڵشاخا.

بە سەرهەڵدانی ئیسلامیزم لەگەڵ ئاژاوەی ١٩٦٤دا، ئیدی ڕایەڵەی پەیوەندی لە نێوان ســـەدر و قوم لە لایەن ســـاواکەوە چاودێری کرا. پەیوەندییەکانی ســـەدر بە هەڵگەڕاوە ئێرانییەکان، بە شـێوەیەکی ســـەرەکی لەگەڵ ئایەتوڵلا خومەینی و ئیســـلامییەکان، وای لێکرد ببێتە ســـەرەکیترین کاراکتەری کێشـەدروسـتکەر بۆ سـەر ئاسـایشـی ئێران. تا دەهات ساواک لە کۆمەکی داوای ئـایەتوڵاکـانی ئێران بۆ شـــیعەی لوبنـان نیگەران دەبوو. هەر بە ڕاسـتیش، ڕایەڵەی مەرجەعیەت لە ڕەوتی شـۆڕشـی ئیسـلامییدا بووبووە سەرچاوە و کوانووی جۆشدان. ڕایەڵەی بەرچاوی مەرجەعیەت لە ڕەوشی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێراندا سەلمێنەری سروشتی جیاواز و ڕەهەندە کەلتوری-دینیەکە بوو، کە لە بەرانبەریدا "دەوڵەتەکە" توندوبەند و

## ساواک و نەخشەی "ڕزگارکردنی عێراق"

قاسم لە مانگە بەراییەکانی کودەتاکەدا نیازی نەبوو کەشوهەوای ئاسایشی ئێران تێک بدا. جەعفەر ڕائیدی باڵوێزی عێراق لە ئێران، لە بایۆگرافییەکەی خۆی وەهای نووســـیوە: "هەرکاتێک ئەو [قاســـم] ببینم، داوای ئەوە دەکا بەڵکو پەیوەندییەکی باشـــتر لەگەڵ شـــای ئێراندا هەبێ . ئەو لەکاتێکدا ئاماژەی بەوە دەکرد، کە شـوێنکەوتووانی ئەو دژی هێزی پاشـایەتی بوون لە عێراق، ئاخر ئەوان دژی شـا نەبوون."[٢١٣] لەگەڵ ئەوەشـدا ترسـی ئەو لە ئیرادەی ئێران و ئەگەری جۆشـــدانی کورد و شـــیعە و گرووپە دژەکۆمۆنیســـتەکان لە عێراق وای لە قاســـم کرد لەگەڵ تاران واز لە پێکهێنانی دانوسـتانێکی بنیاتنەرانە بهێنێ. شـیرازەی پەیوەندییەکانی ئێران-عێراقی زیاتر بەوە لەیەکترازا، کاتێک قاســـم لە کۆنفرانســـە فەرمی و دیدارەکانییدا، شـــای ئێرانی بەوە شـــەرمەزار دەکرد، گوایە بووکەڵەیەکی دەستی ڕۆژئاوایە. ئینجا قاسم داوای ڕۆژهەڵاتی یەکاوی عەرەب (ئەروەند رود-شـــط العرب) و شـــاری ئێرانی خوڕەمشـــەهر دەکرد، دەیگوت گوایە بەشـــێکی دانەبڕاوی خاکی عێراقە. ئەم قســـەیەی لە ئازاری ١٩٥٩دا کرد. هەروەها لیدوانی ئەوەشـی دا، گوایە سـەروەریی بەسـەر پارێزگا بە نەوت دەوڵەمەندەکەی خوزســـتان لە باشـــووری ڕۆژئاوای ئێران بۆ عێراق دەگەڕێتەوە، ئەوەشـــی گوت؛ "برا عەرەبەکـان [خەڵکە عەرەبزمـانەکـانی خوزستان] چەندین ساڵە لەژێر نیری ئێرانییەکان دان"[٢١٤] لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٩شدا، قاسم ئەو گوتەیەی خۆی دووبارەکردەوە کە:

***ئێمە حەز بەوە نـاکەین ئـامـاژە بە مێژووی نیشـــتەجێبوونی هۆزە عەرەبییەکان لە ئەلئەهواز و موحەمەڕەدا بکەین (دوو نـاوی عەرەبین بۆ***

---

[213] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 81.

[214] SAVAK Documents, No. 2b2/10384, 15 March 1959.

***خوزســتان و خورەمشــەهر). عوســمانییەکان ئەو خاکەیان دایە ئێران کە دەکرا بەشێک بووایە لە خاکی عێراق... ڕێککەوتننامەی ۱۹۳۷ بە شێوەیەکی ناڕەوا بەسەر بەغدادا سەپێنرا و عێراق ٥کم دووجای بە بەلاش دایە ئێران. هەرچۆنێک بێ ئەم بەخشندەییە لەژێر فشاردا بوو، هەنووکەش عێراق پێی قایل نییە. ئێران مافی بەسەر ئەو ٥ کلم دووجایەوە نییە و لە دواییدا عێراق هەر وەریدەگرێتەوە."***[٢١٥]

هەروەها ئەو پشتی ئەو عەرەبە جیاخوازانەی بەرەی ڕزگاریی عەرەبستان (ALF)ی دەگرت و ناســەرکەوتووانەش پرســی داواکردنی خاکەکەی بۆ کۆمکاری عەرەبی بەرز دەکردەوە. لە لێکەوتەی زیادبوونی ناســەقامگیری لە بەغدا، لەبلەبانێتی وتاری دژەئێرانیی قاســم ئامرازێکی کاریگەر بوو بۆ ئەوەی خەڵکی عێراق لە دەوری خۆی خڕ بکاتەوە. بە گوێرەی ساواک بێ، "پڕوپاگەندەی دژ بە ئێران ببووە مایەی پتەوترکردنی یەکێتی نێوان ســوپا [ی عێراقی] و قاسـم."[٢١٦] کاتێک شـا بە توندی ئەو دابەشـکردنەی قاسمی ڕەتکردەوە و بە "شــێتی" ناوزەد کرد، ئیدی گرژیی نێوان هەردوو وڵاتەکە گەیشــتە ســەر جاڕدانی جەنگ.[٢١٧] ئەرســەلان خەلعەتبەری، نوێنەری دەســتڕۆیشــتووی پەرلەمانی ئێران، لێدوانی دا بەوەی: "**١٥٠ ســاڵ بەر لە ئێستا، هەردوو شـارەکە، بەغدا و بەسڕا بەشـێک بوون لە ئێران. ئێستاش قـاســم داوای ئەو پێنج کیلۆمەترە دووجـایە لە ئێران دەکـاتەوە.**"[٢١٨]

---

[215] Karsh, Efraim. The Iran–Iraq War: 1980–1988. (Osprey Publishing, 25 April 2002). pp. 1–8, 12–16, 19–82; Qaneifard, Tondbad–e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 78.

[216] SAVAK Documents, No. 2b2/12592, 29 December 1959.

[217] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat–e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran, 2009), p. 620.

[٢١٨] هەمان سەرچاوە.

ئەلئیتلاعاتیش کە ڕۆژنامەی هەرەگرنگی بوو لە تاران دەردەچوو وەهای نووسی: "**ڕژێمە نوێیەکەی عێراق نازانی ئاخۆ ئەگەر ئێران بەدوای داواکانی خۆیدا بچێ، ئەوا هەموو پارچە خاکی دەوڵەمەند بە نەوتی عێراق بەتایبەتی هی کوردستان، دەبێ بگەڕێتەوە سەر ئێران.**"[219]

کودەتاکەی عێراق لەپاڵ هەرەشەکانی کورد و عەرەبی جیاخواز، قەناعەتی بە دژەشا، بە ئۆپۆزسیۆنی مارکسیستی هێنابوو بەوەی بۆ داڕسانە ڕژێمی پەهلەوی، ستراتیژی توندوتیژی بگرنەبەر، ئەمەش لە سۆنگەی دانانی بنکەی سەربازیی خۆیان. بە گرتنەبەری سیاسەتە توندەکەی ناسر لە بەرانبەر کۆمۆنیستەکانی میسر و سوریا، مەکۆی سەرەکی حزبە شیوعییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین لە سۆفیای پایتەختی بولگاریا گواسترایەوە بۆ بەغدا. ئیدی لەو بەرەوتەدا، زۆرینەی سەرکردەکانی حزبی تودەی ئێرانی بەرەو عێراق ڕۆیشتن تا لەوێ چالاکییان دژی شا جۆش بدەنەوە.[220] حیزبی توودە دوو ئەرکی هەبوو: مەشقپێدانی حیزبی شیوعیی عێراقی و بنیاتنانی پەیوەندی ژێربەژێر لەگەڵ ئەفسەرە لایەنگرەکانی تودە لەنێو سوپای ئێرانیدا. سەرکردەکانی حزبی تودە سەرکەوتووانە حیزبی شیوعیی عێراقییان ڕێکخستەوە.[221] سەرهەنگە سەربازییەکانی لایەندارانی تودەش

[219] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran, 2009) p. 620.

[220] ڕەزا ڕادمانش، ئیحسان تەبەری، ڕەزا ڕوستا، حوسێن جەودەت، نورەدین کیانوری، ڕەحیم اموە، بزورگ عەلەوی، فەرەیدون کشاوەرز، ئیرەج ئەسکەندەری، ئەحمەد قاسمی و بزورگ عەلەوی هەروەک سەرهەنگ پەرویز ئیکتشافی، محەمەد (قاسم) پۆلازادە، هامید زەرگەری و لوتفعەلی موزەفەری: بڕوانە بەڵگەنامەکانی ساواک؛ No. 13977, 26 August SAVAK Documents, No. 19456, 27 January 1959; SAVAK 1958, and January 1959. Documents, No. 19456, 27

[221] سەرکردەکانی تودە لەنێویان ئیحسان تەبەری و ڕادمانش و فەرەیدون کشاوەرز سەرپەرشتی ئەم پرۆسەیان کرد. بەڵگەنامەکانی ساواک، بێ ژمارە.

وەک (پۆلازادە) و (پزشـــکیان) چوونە ڕیزی ســـوپای عێراقی. هەر زووش پۆلازادە بووە سەرۆکی فایلی ئێران لە دووەمین سوپای عێراقیدا.[٢٢٢] دواتر، ڕادیۆی ســـەر بە تودە، "دەنگی نیشـــتمانیی ئێران" لە لایەن ڕوســـەکان لە چەمچەماڵی کوردســـتانی عێراقدا دۆزرایەوە.[٢٢٣] هەروەها حزبی تودە لە عێراق ڕاهێنانی تەکتیکی شۆڕشگێرانەی بە پەنابەرە ئێرانییەکان دژی تاران دەکرد.[٢٢٤]

پشـــتیوانیی بەغدا بۆ لادەرە ئێرانییەکان بووە مایەی خێراترکردنی پیلانی هاوپەیمانییە شـــوومەکەی ســـۆڤیەت-بەغدا لە دژی ئاســـایشـــی نیشـــتمانیی ئێران.[٢٢٥] بە گوێرەی ســـــاواک؛ "لەپاڵ ئەو ١٥٠٠ ئەندامەی حزبی تودە، هەزاران کوردی ســـۆڤیەتیش[٢٢٦] هاتنە نێو عێراق تا لەگەڵ حیزبی شـــیوعیی عێراق هاوکار بن."[٢٢٧] ســـاواک لەبارەی کودەتایەکی ســـەر بە ســـۆڤیەت لە ئێران نیگەران بوو، بۆیە دەیگوت گوایە "چەند هەزار عیراقی و کۆمۆنیستی ئێرانی بە نیازی کردەی تێکدان و وێرانکاری بەتەمان دزەبکەنە نێو خاکی ئێران."[٢٢٨] هەڕەتی هەڕەشـــەی ســـوور-عەرەب –کورد بۆ ســـەر ئێران لە کۆنفرانســـی بەغدا بۆ پارتە کۆمۆنیســـتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوینەوە هات، کە لە ٢٦ی شـــوباتی ١٩٥٩دا لە بەغدا بەســـترا. کۆنفرانســـەکە هەم پشـــتی ســـیاســـەتی قاســـم و هەم هی مافەکانی کورد لە وڵاتە دراوســـێکانی عێراقی گرت. هەروەهـا جەختی لەســـــەر پشـــتگیریی حزبی تودەی ئێران وەک ئامرازێکی ســـەرەکی بۆ "ڕزگارکردنی ئێران لە دیکتاتۆری" و دامەزراندنی

222 SAVAK Documents, No. 2b2/3216, 29 May 1959.
223 SAVAK Documents, No. 129, 2 January 1960.
224 SAVAK Documents, No. 5111-3-2, 26 February 1960.
225 SAVAK Documents, No. 13-1d/3356, 9 December 1959.
٢٢٦ دیارە ساواک مەبەستی گەڕانەوەی پێشمەرگە تاراوگەنشینەکانینی یەکێتی سۆڤیەت بووە بۆ عێراق، لە ژمارەکەشدا زیدەڕۆیی زۆری کردووە. وەرگێڕ.
227 SAVAK Documents, No. 129, 19 March 1959.
228 SAVAK Documents, No. 2rd1/9431, 23 September 1959.

کۆمـارێکی دیموکراتیـک کردەوە." بە گوێرەی ڕاپۆرتی ســـــاواک بێ، کۆنفرانسـەکە دنەی کردەی تێکدان و خۆپیشـاندانی لە پارێزگا ئێرانییەکانی ئازربایجان و کوردسـتان بە پشـتیوانی بەغدا و مۆسـکۆ دا.[229] بە هاتنی بەهاری ١٩٥٩ش عێراق بووە مەکۆی هێزەکانی ناسەقامگیربوونی ئێران.

ئیدی لەنێو ئەو ڕەوشـــەدا بوو، شـــا لەبەر دارشـــتنی ســـتراتیژێکی قەناعەتپێهێنەرانەدا بوو تا ئەو هەڕەشـانەی لە عێراقەوە دەهاتن لەخۆبگرێ و بەرزەفتیان بکا. فەرمان بە ســـاواک کرا نەخشـــەیەک ئامادەبکا بەڵکو ڕژێمی کۆمـاری لە عێراق بڕوخێنێ و حوکمی پـاشـــایەتی هـاشـــمی بگەڕێنێتەوە. بۆ ئەوەی ئەم کارەش بکرێ، ســـاواک پەیوەندی بە ئاغا و دەرەبەگی عێراق، بە ئەوانەی لایەنگری هاشـــمییەکان بوون، هەروەها بە ژەنەڕالانی ســوپا کرد بەڵکو کودەتایەک بەســـەر قاسـمدا بکەن. کۆلۆنێل عیســا پژمان شـتەکە وەها دەگێڕێتەوە؛ "من بانگکرامە بارەگای ســەرەکی ســـاواک. بەڕێوبەری ســـاواک، ژەنەڕاڵ تەیمور بەختیـار، پرســـێکی ســەرنجڕاکێش (نەخشـەی کودەتایەک لە عێراق)ی وروژاند. خۆ ئەگەر ئەم نەخشـەیە ســەربگرێ، ئەوا دەبێتە شـاکاری ساواک لە جیهاندا".[230] دواتر نەخشـەکە بە پلانی "ڕزگارکردنی عێراق" ناسرا، بە شـێوەیەکی سـەرەکیش بەئامانجگرتنی دەســـتەبژێری لایەنگرانی هاشـــمییەکان بوو لە بەیروت و بەغدا.[231] لەژێر ســـەرپەرشـــتی کۆلۆنێل پاکرەوانی جێگری بەڕێوبەری ساواک، نەخشەکە لە وێستگەی ساواک لە بەغدا و کۆلۆنێل عیسا پژمانیش بۆ ســـەرپەرشـــتیکردنی ئەم نەخشـــەیە لە عێراق دیاریکرا.[232] لە هەنگاوی پاشـتریشـدا، سـەرگورد پاشـای ، ژەنەڕاڵ بەختیاری بەڕێوبەری گشـتیی

---

229 SAVAK Documents, (p. 20).

230 Qaneifard, Erfan, Tondbad–e Havades: گوتوبێژ با عیسا پژمان Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011). p. 73.

٢٣١ هەمان سەرچاوە.

٢٣٢ هەمان سەرچاوە.

ســـاواک و کۆلۆنێل حەســـەن عەلەڤیکیا ســـەردانی بەیروتیان کرد تا دەســـتەبژێرە عێراقییەکانی لایەنگرانی بنەماڵەی هاشـــمی لەنێویشـــیاندا بەتایبەتی عەبدولهادی چەلەبی بۆ ئەم مەبەســـتە بهێننە ڕیزی خۆیان.[٢٣٣] ساواک بانگهێشتی چەلەبی و کۆلۆنێل مەهداوی سەرۆکی ئەمنی عامەی عێراقی کرد بۆ ئێران.[٢٣٤] لە سەرەتاوە نەخشەکە بە پشتگیریی شا حوسێنی ئوردنەوە بوو، ئەو کەســـەی حوکمڕانییەکەی کەوتبووە بن گەف و هەڕەشـــەی ئاژاوە و پشـــێوی ناوەخۆ، ئەمەش دوای ئەوەی بەغدا شـــا حوسێنی بە بەبووکەڵەی ئیمپریالیزم وێناکردبوو، داواشـی لە ئوردنییەکان کردبوو بەڵکو تەخت و تاراجی هاشـمییەکانی ئەوێش بڕوخێنن. بەختیار و پاشـایی و پژمان لە عەممان چاویان بە شـاحوسـێن کەوت تا نەخشـەکە جێبەجێبکەن.[٢٣٥] پژمان دەگێڕێتەوە: "بەختیار لەســـەر خوانی نانی نیوەڕۆ، پوختەی نەخشـەکەی بە شـا حوسـێن ڕاگەیاند، شـا حوسـێنیش تەواوی پشـتیوانی خۆی بۆ نەخشـەکە دەربڕی. ئینجا فەرمانی بە شـازادە حەسـەن (بن تەلال)ی جێنشین کرد کارئاسانی هاوکارییەکە بکا."[٢٣٦] پاشتر، کۆلۆنێل

---

[٢٣٣] لە کەسە سەرەکییەکان ئەو عێراقییانەی لە تاراوگەدا دەژیان؛ عەبدولهادی چەلەبی (باوکی ئەحمەد چەلەبی)، عەبدولکەریم ئوســـەری، جەودەت ئەیوبی، توفیق ئەلســـویەدی، ئەحمەد موختار بابان، محەمەد موختار بابان و ژەنەراڵ عەبدولمەجید ماج بوون. بڕوانە:
Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK. (January 1997) Middle Eastern Studies. 33 (1): 68.

[234] Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK. (January 1997) Middle Eastern Studies. 33 (1): 68.

[235] Summary of communiqué on the talks between President Shamun and the Shah of Iran, Beirut, 23 December 1957, in M.S. Agwani, The Lebanese Crisis: 1958: A Documentary Study. (Bombay, Asia pub. House. 1965). p. 29.

[236] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: ADialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011). Summary of communiqué on the talks between President Shamun and the Shah of Iran, Beirut, 23 December 1957, in M.S. Agwani, *The*

عەلی موتزاد بە پاشـــکۆی ســـەربازیی باڵوێزخانە لە عەمان دیاریکرا، لە بەرانبەریشـــدا کۆلۆنێل (عومەر مەدانی) وەک پاشـــکۆ لە ئێران دانرا.[٢٣٧] لەگەڵ ئەوەشـــدا بەختیار هاوکارییەکەی لەگەڵ ئوردنییەکان ڕاگرت. لە نێوەڕاستی گفتوگۆدا، ئەو بۆی دەرکەوت، کە شـا حوسـێن نیازی وەهایە تەختی پاشایەتی هاشمی لە بەغدا بژیێنێتەوە و ئینجا لەژێر جڵەوی خۆیدا عێراق و ئوردن یەک بخـا.[٢٣٨] هەروەهـا ســـاواک لەوەش تێگەیشـــت، دەستەبژێری لایەنگرانی پاشایەتی هاشمی شوێنیان لە بەڵێنداندا هەڵکێشاوە، لەکاتێکدا ئەوان لەبارەی هێزی ڕاستەقینەوە لەسەر زەمین بۆ پەیڕەوکردنی پلانەکە کورتهێنن. ئیدی نەخشەی "ڕزگارکردنی عێراق" کۆتاییپێهات.

ســاواک دوابەدوای نەخشـــەی "ڕزگارکردنی عێراق"، ڕووی خۆی لە هۆزە شیعەکانی عێراق وەک هۆزی بەنی لام Beni-Laam کرد، ئەو هۆزەی لە گەشـــەکردنی کۆمۆنیزم نیگەران بوو.[٢٣٩] ئەوە بوو عیســـا پژمـان بەو کۆتاییەوە چاوی بە ڕەشـید کلیلدار، بیچمی دەســـتڕۆیشـتووی شـیعە لە کـازیمەین کەوت. هەرچۆنێـک بێ ئەم نەخشـــەیەش بە مەرەدی پلانی "ڕزگارکردنی عێراق" چوو. لەکاتێکدا خەڵکی شیعە لە عێراقدا زۆرینە بوون، کەچی لە مەیدانی ســـیاســـی و ئابووریدا پەراوێزخرابوون و لەبارەی هەبوونی ڕێکخراوی بەهێزی سیاسیش کورتهێن بوون.

---

*Lebanese Crisis: 1958: A DocumentaryStudy*. (Bombay, Asia pub. House. 1965). p. 29. p. 73.

[237] Summary of communiqué on the talks between President Shamun and the Shah of Iran, Beirut, 23 December 1957, in M.S. Agwani, The Lebanese Crisis: 1958: A DocumentaryStudy. (Bombay, Asia pub. House. 1965). p. 29.

[238] Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK. (January 1997) Middle Eastern Studies 33 (1): 68.

[239] SAVAK Documents, No. d/16/14032, 15 January 1960.

## عێراقی شڵۆق

بە ماوەیەکی کەم دوای دامەزراندنی ڕژێمی نوێ لە بەغدا، ململانێی پتری تیژ و لەپڕ پەیدابوون. قاسم و عارف لەسەر سێ پرسی دیار ناکۆک بوون: لەسەر پرسی کورد، لەسەر ڕۆڵی حیزبی شیوعیی عێراقی لە سیاسەت، لەگەڵ یەکگرتن لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو. عارف بە پێچەوانەی ڕوانینی قاسم، پێی لەسەر یەکێتی لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو دادەگرت، لە کاتێکدا ڕەخنەی لە بارزانی و کۆمۆنیستەکانیش هەبوو. هەروەها قاسمیش هیچ پلانێکی وەهای بۆ کورد و حیزبی شیوعیی عێراق نەبوو تا زیاتر بۆیان دانەوێنێ، ئەو وردە وردە لە دژی عارف لایەنی کورد و حیزبی شیوعی گرت. لە کۆتایی ڕەوتی ململانێکەدا، عارف لە دەسەڵات داماڵرا.[240] ئینجا قاسم فشاری خستە سەر سوریا تا هاوپەیمانیەتییەکەی لەگەڵ میسر هەڵبوەشێنێتەوە.[241] قاسم بە درەنگانێکی ١٩٥٨ پێگەی خۆی وەک تاکە ڕابەر (الزعیم الاوحد) لە عێراقدا چەسپاند. لەگەڵ ئەوەشدا عێراق تووشی پاشاگەردانی بووەوە[242]. زۆر لە ئەفسەرە عەرەبەکانی نێو سوپا دژی کورد، دژی حیزبی شیوعیی عێراق و دژی سیاسەتی قاسم لە هەمبەر ئەو دوولایەنە بوون.[243] ناسرییەکان لە عێراق پێیان وابوو حیزبی شیوعیی عێراق هۆکاری سەرەکی قووڵکردنەوەی کەلێنی نێوان کۆماری عەرەبی

---

[240] لە سەرتادا عارف لە ٣٠ ئەیلوولی ١٩٥٨دا وەک باڵوێزی بەغدا لە بۆن، لە ئاڵمانی ڕۆژئاوا دانرا. پاشان لە نۆڤێمبەری ١٩٥٨دا گیرا، ئەمەش لەوکاتەدا بوو کە ڕەگەڵ پیلانی کودەتا کەوت کە ناسر پشتگیری لێدەکرد، ئەو کودەتایەی لە لایەن ڕەشید عالی گەیلانی ڕابەڕایەتی دەکرا. ناوبراو لە میانەی جەنگی دووەمی جیهاندا سەروەزیری عیراقی دژەئینگلیز بوو. بڕوانە بەڵگەنامەی ساواک: No. 84, 19 November 1959.

[241] SAVAK Documents, No. d/16/14415, 1 January 1960; SAVAK Documents, No. 3/A/53, 26 March 1960.

[242] SAVAK Documents, No. fb15/5177/38, 10 October 1959; SAVAK Documents, No. fb15/5357/38, 10 October 1959.

[243] SAVAK Documents, No. d/16/16644, 8 March 1960.

یەککگرتوو و عێراقە.[244] ناســـەقامگیرییەکەش لەو کاتەدا زیاتر پەرەیســـەند کاتێک ئەفســـەرە پان عەرەبیزم و بەعســـییەکان بە پشـــتیوانی ســـوریا و بەســـەرکردایەتی عەبدولوەهاب شـــەواف لە ٦ی ئازاری ١٩٥٩دا دەســـتی بەسەر موسڵدا گرت. هەرچەندە ئاژاوەکە خێرا لە لایەن سوپای عێراقی و پارتیزانانی حیزبی شیوعی و پێشمەرگەکانی بارزانی کپ کرایەوە، ئەمەش بەهانەی دایەدەست قاسم تا حکوومەت و سوپا لە ناسری و بەعسییەکان پاک بکاتەوە. هەروەها ئاژاوەنانەوەکە ئەو دەرفەتەی بە حیزبی شـــیوعیی عێراق بەخشـــی تا بە شـــێوەیەکی بێ پێشـــینە لە عێراق دەســـتی بڕوا و بەپێداگیرییەوە داوایان لە قاســـم کرد بەرەو ڕووی بلۆکی ســـۆڤیەتەوە وەربچەرخێنێ. هەر لەبەر ئەو بەرڕەوتەداشـــدا بوو قاســـم لە ٢٤ی ئازاری ١٩٥٩دا لە پەیمانی بەغدا کشـــایەوە. بۆ ئێرانیش پەردەی ئاســـنین بەســـەر عێراقدا درا.[245]

بە تێپەڕینی کـات، هێزی حیزبی شـــیوعیی عێراقیش کزبوو. بە دامرکاندنەوەی ئاژاوەی موســـڵ و توانســـتی خەڵک کۆکردنەوە، بەرەبەرە خودی حیزبی شیوعیی عێراق بۆ قاسم بووە هەڕەشە. لە ١٠ی تەمموزی ١٩٥٩ دیســــان ئـاژاوەیەکی دیکەی دژوار لە کەرکوک پەیدابوو، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە گرووپێکی ڕێکخراوی شـــیوعی بە ناوی بەرەی بەرگریی میللی و تورکمان لەیەکیان دا. ئەم ڕووداوەش بۆ حیزبی شـــیوعیی عێراقی خاڵی وەرچەرخان بوو.[246] قاســـم بە توندی ســـەرکۆنەی توندوتیژییەکەی کەرکوکی کرد، لەبری کورد ئەو حیزبی شـیوعیی عێراقی بە بەرپرســیاری

---

244 Baghdad 1540 to Ministry of Foreign Affairs, 18 March 1961.

245 Baghdad 2758 to the U.S. Department of State, March 26, 1959, (FRUS/1958–60/ XII/doc.166), p. 398.

246 SAVAK Documents, No. 12/586, 22 April 1960; SAVAK Documents, No. 12/3750, 29 August 1960; SAVAK Documents, No. 281, 11 October 1960.

هەراوزەنای کەرکوک زانی.[٢٤٧] قاسم هەروەک ئاژاوەکەی موسڵ، هی کەرکوکیشی بە بەهانەیەک زانی تا سنوورێک بۆ شیوعییەکان دابنێ. بە هاتنی مانگی کانوونی دووەمی ١٩٦٠، قاسم حیزبی شیوعیی عێراقی لاشەڕ کرد، ئینجا لە ئازاری ١٩٦٠دا ڕێگەی بە پێکهاتنی حزبێکی دیکەی کۆمۆنیست دا تا حیزبی شیوعیی عێراقی لاواز بکا.[٢٤٨] ڕاپۆرتەکانی ساواک ئاماژەیان بە لەیەکچوونی ڕەوشی عێراق بە ڕەوشی ئێران لە سەردەمی موسەدیق کرد:

*دوو ساڵ دوای شۆڕش (ی تەمموزی ١٩٥٨)، ڕەوشی عێراق وەک ڕەوشی ئێران بوو لەژێر فەرمانڕەوایەتی دکتۆر موسەدیقدا. لەیەکچوونەکە لە ڕووی سیاسەتی دەرەکییەوە لە بەرانبەر بەرڕەوتی ناوەخۆ نارۆشنتر بوو... لە بەراییەوە قاسم پشتی حیزبی شیوعیی عێراقی گرت و بە ناوی "عێراقییە هەرە نیشتمانپارێزەکان" بانگیکردن... لە سۆنگەی نزیکبوونەوەی سیاسەتی مۆسکۆ لە قاسم، دیاربوو ڕۆژنامەکانی حیزبی شیوعیی عێراق پشتگیریی خۆیان بۆ قاسم دەردەبڕی. لەگەڵ ئەوەشدا لە کۆبوونەوە تایبەتییەکانی خۆیاندا ڕەخنەیان لە خۆپارێزییەکانی قاسم دەگرت... ئەویش ناچار بوو سنوورێک بۆ حیزبی شیوعیی عێراق دابنێ، هەرچەندە حیزبی شیوعی پشتی قاسمی گرت و هۆشداری دایە گرووپە ڕاستڕەوەکان کە، "هەر کردەیەکی دژەقاسم بە توندی وەڵام دەدرێتەوە و عێراقیش تووشی شەڕێکی ناوخۆی خوێناوی دەکا." ئەمەش هەروەک چالاکییەکانی حزبی تودە بوو لە ماوەی حوکمڕانی موسەدیقدا.*[٢٤٩]

وێڕای ئەو ڕووداوە ناسەقامگیرییانە، دیاربوو هێشتا پەیوەندییەکانی قاسم لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان بێ زیان بوون. لە بەرەبەرەی کۆتایی

---

[٢٤٧] ئاخر ژمارەیەکی ناتەریبی هەردووکیان چ حیزبی شیوعیی عێراق و چ هێزی بەرگریی میللی لە باکووری عێراقدا کورد بوون.

[248] SAVAK Documents, No. 2/1965, 8 March 1960.

[249] SAVAK Documents, No. 2d1/355, 3 September 1960.

مانگی ئابی ١٩٥٩دا، حیزبی شـــیوعیی عێراق لە کوردســـتانی عێراقدا پاکســازی کرا.[٢٥٠] بارزانی بەوەی ئاگای لە هەستی سەخڵەتبوونی قاسم هەبوو، بۆیە ئەو ئەندامــانەی نێو پــارتی دیموکرات کە لایەنگری کۆمۆنیســـتەکان بوون، لە ڕیزی پارتیدا دەریکردن. لە کۆنگرەی چوارەمی پارتی دیموکراتی کوردســتان لە تشــرینی یەکەمی ١٩٥٩دا، بارزانی هەمزە عەبدوللای لایەنگری کۆمۆنیســـتەکانی لادا و ئیبراهیم ئەحمەدی لە جێگەی ئەو کردە سـکرتێری گشــتی و ڕێگەشــی بە مەکتەبی سـیاســی دا جەلال تاڵەبانی وەک ئەندامی مەکتەب بهێننەوە. وێڕای دڵسـۆزی بۆ قاسـم، کەچی وردە وردە دەســـەڵاتی بارزانی وەک هەڕەشـــەیەک بۆ ســـەر بەغدا خۆی نیشــان دەدا. قاسـم لە ئاگایی خۆی بە گرژیی درێژخایەنی پێشـتری نێوان هۆزە کوردییەکان هانی ئاغاکانی دا دژی بارزانی بوەســتنەوە.[٢٥١] بە هاتنی پایزی ١٩٥٩، بەهێواشـــی کوردســـتان بەرەو یاخیبوون ملی نا. بەگوێرەی ســاواکیش بێ؛ "خەڵکی سـلێمانی ئامادەی ڕاپەڕین بوون."[٢٥٢] عەبدولکەریم قاسم لە سەرەتای شەستەکاندا، ڕاشکاوانە پارتی دیموکراتی کوردستانی شـەرمەزار کرد و لایەنی هۆزە دژە بارزانییەکانی لە سورچی و زێباری و هەرکی گرت. هەرچۆنێک بێ بارزانی ئەوانی تا شـــوباتی ١٩٦١ ســـەرکوت کردن. دەســـەڵاتی بێ ڕکابەری ئەو بەســـەر کوردســتاندا وای لە قاسم کرد بەڵێنەکانی خۆی بۆ کورد بەوەی "جیاکردنەوەی کەلتوری کوردی لە باقی عێراق و پێشـــکەشـــکردنی زمانی کوردی وەک زمانی مەشـــق و ڕاهێنان."

---

250 SAVAK Documents, No. 48048, 27 February 1960.

٢٥١ خۆی پێشتر بە هۆی چاکسازیی کشتوکاڵییەکانی قاسم و گەڕانەوەی بارزانی، دەسەلاتی ئاغاکان کەم بووبووەوە. دوای کودەتاکەش چەندین ئاغا بەرەو ئێران هەڵاتن و هەندێکیشیان دژی ڕژێمی شـۆڕشـگێری بەغدا وەسـتانەوە. لە نیسـان و ئایاری ١٩٥٩دا، پێشـمەرگەکانی بارزانی و هێزی بەرگری میللی و سوپای عێراق ئاغاکانی برادۆست و پشدەرییان بەزاندن. بەدوای ئەودا، بارزانی، ئەحمەد محەمەد ئاغا، برای شـێخ مەحمود بەرزنجی و ســـەرۆکی زێبارییەکانی کوشت و پەلاماری هەرکی و سورچی و برادۆستیشی دا.

252 SAVAK Documents, No. 6/16/10659, 20 October 1959.

پشتگوێ خست.[٢٥٣] بە هاتنی مانگی کانونی یەکەمی ١٩٦٠یش لەسۆنگەی ئەوەی قاسم زۆر جەختی لەسەر ناسیونالیزمی عەرەب دەکردەوە[٢٥٤] کورد هەستیکرد لە قاسم نامراد بووە.[٢٥٥] هەروەها کورد بەغدای بەوە تاوانبار دەکرد، کە ژێربەژێر لەگەڵ تاران لە دژی کوردان لە وتوویژ دان.[٢٥٦] لەو نێوەشدا، ڕۆژنامەکانی سەر بە قاسم ناویان لە بارزانی نابوو مەلای سوور "ملا الاحمر"، وەک بوکەڵەی دەستی کۆمۆنیست ناویان دەهێنا. قاسم لە کۆتاییدا و لە حوزەیرانی ١٩٦١دا داخوازینامەی کوردی پشتگوێخست و مووچەی حکومەت و زێدەمافەکانی لەسەر بارزانی بڕی.[٢٥٧] ئیدی لەبەر ئەم بەرڕەوتەدا بوو، ئێران لەگەڵ کورد خەریکی ڕۆنانی پەیوەندی بوو.

## چاندنی تۆوی شۆڕش

کاتێک قاسم حکوومەتەکەی لە حیزبی شیوعیی عێراق پاککردەوە، کەمێک گرژیی پەیوەندی ئێران و عێراق خاوبوویەوە. بەغدا دژە پڕوپاگەندەی لەگەڵ ئێران ڕاگرت و هەوڵیدا لە نیسانی ١٩٦٠دا پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ تاراندا ببوژێنێتەوە. هەورەها قاسم بۆ نیشاندانی نیازپاکی بۆ تاران،

---

[253] SAVAK Documents, No. 71, 21 September 1959.

[254] SAVAK Documents, No. f-b-d/16/10272, 20 December 1960.

[255] SAVAK Documents, No. j5/18801, 13 June 1961..

[256] Baghdad 8457 to Ministry of Foreign Affairs, 13 March 1961.

[٢٥٧] لابردنی "ئەفسەرە عەرەبە ناحەزەکان" و هێزی چەکداری حکوومەت لە هەریمەکە، گەڕاندنەوەی کاربەدەستەی کورد لە ناوچە عەرەبییەکان بۆ باکوور، ناساندنی زمانی کوردی وەک زمانێکی فەرمی، پێشخستنی چاکسازییەکانی کەرتی کشتوکاڵ و پیشەسازی (بە خۆماڵیکردنی پیشەسازی نەوتیشەوە) و کۆتاییهێنان بە حوکمی عورفی و وازهێنان لەوەی پێیدەگوترا قۆناغی گواستنەوە، بوژاندنەوەی ئازادییە دیموکراسییەکان و هەنگاوی کردەیان بۆ پیادەکردنی ماددەی سێیەمی دەستوری کاتی و ڕێگەدان بە دەرچوونەوەی ڕۆژنامە کوردییەکان: بڕوانە

Baghdad A-124 to U.S. Department of State, August 12, 1961 (NARA/RG59/R2/787.00/8-1261), pp. 1-2; McDowall, David, A Modern History of the Kurds. (London, New York 2004). p. 308.

پەنابەری سیاسی و لادەری ئێرانی ڕەتکردنەوە.[٢٥٨] ئەو عەبدولموتەلیب ئەمینی وەک باڵوێزی عێراق لە تاران دانا، لە بەرانبەریشدا لە حوزەیرانی ١٩٦٠دا یەدوللا ئازودی وەک باڵوێز نێردرایە بەغدا. لە دانیشتنێک لەگەڵ ئازودیدا، قاسم خواستی خۆی بۆ باشترکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران دووبارە کردەوە. هەرچۆنێک بێ ئێرانییەکان لەسەر ئەوە کۆدەنگییەک نەبوو. لە کاتێکدا غولام عەباس ئارامیی وەزیری کاروباری دەرەوە هەوڵیدا پەیوەندییەکان لەنێوان هەردوو وڵاتدا ببوژێنێتەوە، لێ ساواک هێشتا لە قاسم بەدگومان بوو. لەنێو ئەو گرژییەی نێوان قاسم و حیزبی شیوعیی عێراق، هێزەکانی سەر بە قاسم سۆڤیەتیان بەدەستوەردان لە کاروباری ناوەخۆی عێراق تاوانبار کرد.[٢٥٩] لەگەڵ ئەوەشدا ساواک ئەو گرژییانە بە "شتێکی لەخشتەبەر" دانا.[٢٦٠] هەر بەڕاستیش ساواک وایدەبینی کە، هەردوو دنەدەری ئابووری و دژە کۆماری یەکگرتووی عەرەبی لەپشت ئەم سیاسەتە نوێیەی قاسم بوون لە بەرانبەر ئێراندا.[٢٦١] لەسەرێکی دیکەشەوە، بارزانی عەودالی پەیداکردنی پشتیوانیی دەرەکی بوو تا لەبەرانبەر قاسمدا هاوسەنگی ڕابگرێ. لەوکاتەش بارزانی پێیوابوو شا "کلیلی (لایەنی) ڕۆژئاوایە"، بۆیە مەبەستی سەرەکی بۆ پشتیوانییە دەرەکییەکە ئێران بوو.[٢٦٢] بیچمەکانی دیکەی پارتی دیموکراتی کوردستان، وەک ئیبراهیم ئەحمەد دژی پاڵدانە پاڵ تاران بوون. ئیبراهیم ئەحمەد گێڕایەوە: "بارزانی بۆ پشتیوانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تکاخواز بوو. کەواتە ئەو دەیەویست لەگەڵ ئەندامانی ڕێکخراوی پەیمانی ناوەند سەنتۆ CENTO

---

[258] SAVAK Documents, No. 13j/7665, 21 December 1961.

[259] Baghdad 1665 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 12 June 1961.

[260] SAVAK Documents, No. f-b-13d/10823, 4 March 1961.

[261] SAVAK Documents, No. 24 January 1961.

[262] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 637.

بێ بە[ ئێران] و ئیمپریالیزمیشـــەوە.[٢٦٣] هەرچۆنێک بێ کەس نەیدەتوانی خۆی لە شانی مەلا مستەفا بارزانی بدا.

هەرچەندە سیاسەتی بارزانی دەکرا بێتە پشتگیرییەکی ستراتیژی بۆ ئێران تا هەڕەشەی عێراق لەخۆبگرێ و بەرزەفتی بکا، لێ هێشتا شا دوودڵ بوو. خەمی ســـەرەکی شـــا پەڕینەوەی یاخیبونی کورد بوو لە عێراقەوە بۆ نێو کوردی ئێران. سەرباری ئەو پەیوەندییە دۆستایەتییە نزیکییەی بە کوردی عێراقەوە، ئەو پاشـــکەوتنەی دۆخی ئابووری لە کوردســـتانی ئێراندا دنەدەرێک بوو بۆ گرووپە جیاخوازەکان. ســاواک، بەتایبەتیش تەبرێزی کە ســەرۆکی هۆبەی دووەمی ســاواک بوو، قەناعەتی بە شــا هێنابوو بەوەی بەخێرایی هەندێک چاکســازیی ئابووری لە کوردســتانی ئێراندا بکا، بەڵکو هەستی دژەڕژێم لە کوردستانی ئێراندا خاوبکاتەوە.[٢٦٤]

لەوەش ســـەرنجڕاکێشـــتر، هێشـــتا شـــا لەبارەی پەیوەندی بارزانی بە مۆسکۆوە نیگەران بوو. ئاخر پێشتر پارتی دیموکراتی کوردستان ڕەخنەی لە پەیمانی بەغدا گرتبوو، بەگشـــتی پەیمانەکەی بە هاوپەیمانییەتێکی ئیمپریالیستی دیکەی لە دژی بلۆکی سۆشیالیستی و بە تایبەتیش بە دژە کوردی دانابوو. وتارێک لە ڕۆژنامەی خەبات، زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بڵاوکرابووەوە کە، پەسنی ڕۆڵی سوپای ڕوسی لە "ڕزگارکردنی پارچەکانی کوردســـتان لەدەســـت 'چەوســـاندنەوەی ئێرانییەکان'.. و دامەزراندنی کۆماری دیموکراتیکی مهاباد دابوو".[٢٦٥] لەگەڵ گەشـــتەکەی بارزانی لە کانوونی دووەمی ١٩٦١دا بۆ مۆسکۆ، هەڕەشەی کورد-سوور تیرتر بوو. ساواک ڕاپۆرتی دا گوایە مەبەستی سەردانەکە "دروستکردنی کوردســـتانی مەزنی ســـەربەخۆیە، کە لە چیاکانی تۆروس لە تورکیاوە بۆ ســەر کەنداوی فارسی درێژدەبێتەوە." ڕاپۆرتەکە ئەوەشی لێ زیادکردبوو

---

[٢٦٣] هەمان سەرچاوە ل ٨٤٥.

[264] SAVAK Documents, No. 234/5436, 29 May 1961.

[265] Baghdad 5384 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 10 March 1961.

گوایە "بارزانی لەبەردەم نەخشـــەیەکی ســـاختەی کوردســـتانی مەزن وەســـتابوو." ســـاواک ئەو شـــتەی بەوە دانابوو کە، "پلانی مۆســـکۆ بۆ دروستکردنی ڕێڕەوێکە لە کەناری باکوورەوە بۆ ســەر کەنداوی فارســی، ئەمەش لە ڕێی بەڵێنی ئەو لە خوزستانی بە نەوت دەوڵەمەند."[266] بەگوێرەی ســاواک، "نەخشــەی بارزانی بۆ دامەزراندنی کوردســتانێکی ســەربەخۆ لە پارچەکانی کوردســـتانی عێراق و تورکیا و ئێران و ســـوریا و باشـــووری ئەرمینیاوەیە. ئەوەش گوتراوە کە خرۆشـــۆف بەڵێنی بە بارزانی داوە کە بەشێکی باشووری ئەرمینیا ببەخشێتە کوردستانی ئازاد."[267]

خۆی دەبووایە شـــا تـا هەتـایە گومـانی لە بـارزانی هەبووایە؛ کەچی ســـەرهەڵدانی گرژیی لەنێوان کورد و قاســـم، وردە وردە قەناعەتی ئەوەی پێهێنا بە دەســـــت لە پشـــتدانی یاخیبووانی کورد عێراق بەرزەفت بکا. زووتریش، چەندین ســـــەرکردەی کورد، وەک شـــێخ عەبدولقادر ئەوەیان خســـتە بەردەم ســـاواک، بەڵکو لە دژی بەغدا یاخیبوون جاڕبدەن. شـــێخ عەبدولقادر ئەفســـەرانی ســاواکی دڵنیاکردبووەوە، لەوەی هۆزە کوردەکان دێنە ڕیزی بزووتنەوەکەی.[268] هەرچۆنێک بێ، ساواک ئەم شتەی بە جدی وەرنەگرت، هۆیە ســەرەکییەکەشــی بۆ کورتهێنی پایەی ئەو لەنێو کورداندا دەگەڕایەوە. بەپێچەوانەوە، میللییەتی بـارزانی وایلێکردبوو تـاکە کورد بێ توانســـــتی یەکخســـــتنی چەنـدین هۆزی لەنێو بۆتەی پێکهێنـانی هێزێکی چەکداری بەرچاو هەبێ. دوابەدوای ســــەرنەکەوتنی ســــاواک لە "پلانی "ڕزگارکردنی عێراق"دا، تاکە بژاردە بۆ ئێران بۆ ئەوەی عێراق بەرزەفت بکا تەنیا پشتگرتنی بارزانی مابووەوە.

بە ماوەیەکی کەم بەر لە کودەتاکەی عێراق، (بەختیار)ی بەرپرسی ساواک عیســا پژمانی ناردبووە هەرێمی کوردســـتانی ئێران، لەوێش بە پشـــتیوانی

---

[266] SAVAK Documents, No. 13j/10177, 15 February 1961.

[267] SAVAK Documents, No Number.

[268] SAVAK Documents, No. 2/969, 15 January 1960.

کۆلۆنێل کەمالی، بەرپرسی دەزگای ساواک لە سەقز بە دزییەوە ئاودیوی سنووری عێراق بووبوو. عیسا پژمان لە ڕۆژە ئارامەکانی بەغدادا، هۆشداری دابووە ساواک بەوەی کودەتایەک لە عێراق نزیکە بکرێ. کەچی لە لایەن کاربەدەستانی ساواک، لە لایەن بەختیار و تەنانەت شاشەوە گاڵتەیان بە ڕاپۆرتەکە هاتبوو.[٢٦٩] دوابەوای ئەوە، پژمان سەردانی کوردستانی تورکیا و سوریاشی کردبوو تا زانیاری لەسەر پاشخانی کۆمەڵایەتی-سیاسی گەلی کورد کۆبکاتەوە. لە ڕاپۆرتی دووەمیدا ئەوەی تۆخ کردبووەوە، کە ئەگەری ڕۆڵی کورد لە گۆرانکاریی ئایندەی عێراق پێویستی وەبەرهێنانی ستراتیژی پرسی کورد بۆ لاوازکردنی دراوسێ ڕۆژئاواییەکانی ئێران هەیە. ڕێک و ڕاستیش دوای کودەتاکە- عیسا پژمان کرایە بەرپرسی وێستگەی ساواک لە بەغدا- چاوی بە عیسا زەبیحی[٢٧٠] بەرپرسی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان لە بەغدا کەوت، تا بۆی ڕوونبکاتەوە کە ستراتیژی نوێی ئێران بەرەو کوردی عێراق وەرچەرخاوە و داوایلێکرد بەڵکو کۆبوونەوەیەکی نهێنی بۆ لەگەڵ بارزانی ڕێکبخا.[٢٧١] بەرلەوە، پژمان لە ماوەی ئاهەنگی نەورۆزدا چووبووە سلێمانی و لەوێ سەرکەوتووانە قەناعەتی بە جەلال تاڵەبانی هێنابوو تا ڕەگەڵ پلانە نوێیەکەی ئێران بکەوێ.

---

[269] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 231.

[٢٧٠] عیسا زەبیحی واتە مامۆستا عەبدولڕەحمان زەبیحی (عولەما) وەرگێر.

[271] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p p. 97.

لەو نێوەشـــدا، عیســـا پژمان چووە پاریس تا چاوی بە کەســـایەتی دەســـترۆیشـــتووی ڕۆشـــنبیریی کورد، کامەران عالی بەردخان بکەوێ.[٢٧٢] پژمان ستراتیژە نوێیەکەی ئێرانی بەرانبەر کورد بۆ ڕوونکردەوە. کامەران عالی بەدرخانیش لە عیســـا پژمانی پرســـی؛ "خۆ ئەگەر شـــا لەگەڵ وەرچەرخانە نوێیەکەی ئێران ڕاســـتگۆ بێ، کەواتە ئەدی کوا ڕۆژنامەیەکی کوردی لە ئێران؟"[٢٧٣] ئیدی پژمـان لە گەڕانەوەی بۆ تـاران، قەنـاعەتی بە دەزگای ســـاواک هێنا کە لە قازانجی ئەواندایە ڕۆژنامەیەکی کوردیزمان لە ئێران دەربکرێ. بە بودجەی بەڕێوبەرایەتی ســـاواک و پشـــتیوانی شـــێخ عوســـمان نەقشـــبەندی و ئەدەب، ڕۆژنامەیەک بۆ کوردســـتان لە لایەن عەبدولحەمید بەدیعولزەمان دەرچووێنرا.[٢٧٤] هەردوو برا موفتیزادەکان[٢٧٥] و شوکروڵلای بابان ڕۆژنامەکەیان بەڕێوەبرد. کەچی ڕۆژنامە کوردییەکە بۆ هەردوو سوپای ئێرانی و تورکی مایەی هۆشداری بوو. ئەوەبوو باڵوێزی تورکیـا لە تـاران لە کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ شـــــادا ڕەتیکردەوە کە ناســـیونالیزمی کوردی بەکاربهێنرێ. ژەنەڕاڵی ســـوپای ئێرانیش، نادر جیهانبانی و ژەنەڕاڵ محەمەد شـــابەختی بە دەوری خۆیان هۆشـــدارییان دایە شـــا بەوەی ئەم بڕیـارە لێکەوتەی کۆنترۆڵنەکراوی لە هـانـدانی بزووتنەوەی جیاخوازی لە ئێراندا بەدەواوە دەبێ. شاش فەرمانێکی دەرکرد بەوەی ڕۆژنامەکە بوەســـتێنرێ؛ کەچی عیســـا پژمان قەناعەتی پێهێنا ڕۆژنـامەکە دەربچووێنرێتەوە. ئیـدی ڕۆژنـامەکە دەرچوویەوە، لێ

---

[٢٧٢] کامەران عالی بەدرخان پرۆفیسـۆرێکی زانکۆی سـۆربۆن و سـەرۆکی هاوکاری کورد لە ئەوروویا بوو. هەروەها نەوەی بەدرخانی دوا میری میرنشینی جزیری بۆتان بوو.

[273] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 50.

[٢٧٤] هەر ناوی ڕۆژنامەکەش کوردستان بوو. وەرگێڕ.

[٢٧٥] مەبەست محەمەد سادق موفتیزادە و ئەحمەد موفتیزادەن. وەرگێڕ.

ئەمجارەیان بە شـــێوەیەکی ســـنووردار.[276] هەروەها کامەران عالی بەدرخانیش بانگهێشتی تاران کرا و خشتەی چاوپێکەوتنێکی لەسەر خوانی نیوەڕۆ لەگەڵ شـــادا بۆ ڕێکخرا. شـــای پەهلەوی بەڵێنی پێدا بەڵکو ســـپۆنســـەری کۆنفرانســـێکی نێودەوڵەتی بۆ جڤاتی کۆچبەرانی کورد لە ئەورووپادا بکا.

لەوەش پتر، کۆلۆنێل بەهرامی، بەڕێوەبەری ساواک لە کرماشان، کە شاری هەرە گەورەی کوردنشـــینە لە ئێران، ئەوەی خســـتە بەردەم تاران، کە پارێزگاکە ڕادیۆیەک بۆ جۆشدانی هۆزەکانی کوردی عیراق لەسەر سنوور بەکـاربهێنی، ئەمەش لە ڕێی نیشـــانـدانی گەنـدەڵی لەنێو ڕێکخراوە شـــیوعییەکانی نێو عێراق.[277] ئینجا ســـاواک ڕادیۆی کوردی لە ڕێی ڕادیۆ میللی ئێران [ڕادیۆیی نیشتمانیی و دەزگای تەلەفزیۆنی ئێران] لە کرماشان و مەشهەد پەخشکرد.[278] ڕادیۆی کوردی کە ساواک ڕێکیخست، هەڵمەتێکی پڕوپاگەندەی کارا بوو بۆ بەرپەچدانەوەی پڕوپاگەندەی هەردوو لایەنی شـۆڕشـگێڕێتی عێراقی و مۆسـکۆ، کە ڕادیۆیەکی نوێیان بە زمانی کوردی کردبووەوە. ڕادیۆکە شـــوکروڵڵای بـابـان بەڕێوەی دەبرد، ئەم کەنـاڵە کوردییە لەگەڵ کۆمەڵێک بیچمی ڕۆشنبیریی و کەلتوری کورد هاوکار بوو،

---

[276] ڕۆژنامەکە تەنیا لە کوردســـتانی ئێران دابەشـــدەکرا و تەنیاش بۆ "کەســـایەتییە کوردە بڕواپێکراوەکان بوو." بڕوانە:

Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 92.

[277] SAVAK Documents, No. s/7272, 21 February 1959.

[278] وێڕای ڕۆژئاوا و ڕۆژئاوای باکووری ئێران، کوردە ئێرانییەکان لە باکووری خوراســـان و لە باکووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتیش هەن. هۆزەکانی کورد ئەوسا لە سـەردەمی قەڵەمڕەویی شا عەباسی یەکەمی سەفەوی لە بەرایی سەدەی حەڤدەهەمدا ناچارکراون بەرەو ناوچەی خوراسان کۆچبکەن تا ببنە بەربەستێک لە بەرانبەر پەلامارەکانی ئۆزبەگ کە پسانەوەیان بۆ نەبوو.

لەنێویاندا عەبدولڕەحمان شـــەرەفکەندی (هەژار موکریانی).[٢٧٩] هەر بەڕاستیش، هەردووکیان ڕۆژنامە و ڕادیۆ کوردییەکە یارمەتی ئێرانیان دا تا لەنێو کوردی عێراقدا ناوبانگیان پەیدا بێ و ببووژێنەوە.

هەروەها ســـاواک پەیوەندییەکی کەســـیی لەگەڵ بارزانی دروســـتکرد. سەرباری ئاسایشی توند و مەحکەمی عێراقی-ڕووسی لە بەغدا، ئەوەبوو عیســا پژمان بۆ یەکەمین جار بارزانی بینی و ئامادەیی تەواوی شـــای بۆ پشـــتگیریی کوردی عێراق پێڕاگەیاند، بارزانیش دەســـتبەجێ پێشـــوازی لە پلانەکە کرد و بەڵێنی دایە ئێران کە، "**دۆســتێکی هەمیشــەیی و خزمەتکاری شا بێت." لە بەرانبەریشدا داوای لە تاران کرد دوورکەونەوە لە پشتگرتنی ئاغاکانی کورد بە شێخ لەتیف حەفیدزادە (کوڕی شێخ مەحمود بەرزنجی) و محەمەد ڕەشـــید بانەییشـــەوە، کە هەردووکیان بە نهێنییەوە لە لایەن پاسەوانانی سنووری ئێرانییەوە کۆمەک دەکران.**"[٢٨٠] ئینجا ساواک بڕێکی تا ڕادەیەکی باش فیشـــەک و تەقەمەنی دایە بارزانی و ڕێگەشـــیان پێدا وێستگەی ڕادیۆیەک لەسەر خاکی ئێران دابنێ.[٢٨١] لەوەش سەرنجڕاکێشتر ئەوەبوو، ســاواک پلانێکی قاســمی بۆ لەناوبردنی بارزانی پووچەڵکردەوە. عیســـا پژمان گێڕایەوە:[٢٨٢] "ســـەرتیپ فوئاد عارف کە یەکێک بوو لە ژەنەڕاڵەکانی ســـوپای عێراقی، پلانێکی قاســـم بۆ لەناوبردنی بارزانی

---

[٢٧٩] عەبدولحەمید بەدیعولزەمان، محەمەد ســـادق موفتیزادە، هەژار، ئەحمەد موفتیزادە و عابد سیراجەدینیش هاوکاری ڕادیۆی کوردستان بوون بڕوانە:
Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 93.

[280] SAVAK Documents, No. 213-821-314, 4 April 1962.

[281] O'balance, Edgar, The Kurdish Struggle, 1920–94 (London: Macmillan, 1996), p. 61.

[282] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 122.

پێڕاگەیاندم. منیش لە ڕێی تاڵەبانییەوە بە بارزانیم ڕاگەیاند کە تازووە بەغدا جێبێڵێ." لە هەمان کاتیشدا، کۆلۆنیل ئیرەج مەنسورپوور وەک پاشکۆی سەربازیی ساواک لە کوردستانی عێراق دانرا تا چاودێری ڕێگەی دابینکردنی ستراتیژیی سەرسنوور بکا لەگەڵ ئێران. بە پاڵپشتی دارایی ساواک، دوو بنکەی ستراتیژی سەربازیی بۆ پێشمەرگەکانی بارزانی لەسەر سنوور لەگەڵ ئێران کرانەوە. ئیدی دیمەنەکە بۆ شۆڕشی کورد ڕێکخرا.

## پەیوەندییەکانی کوردی-ئیسرائیلی

بارزانی دوابەدوای پێکهێنانی هاوپەیمانیی تاران-کوردی لە هێزێکی دەرەکی دیکە دەگەڕا تا بەغدای پێ لاواز بکا. ئەگەر بەشێوەیەکی ستراتیژی دایبنێی، پشتبەستن بە شا بۆ کورد بڕیارێکی ئاوەزمەندانە نەبوو. لەپاڵ ئەمەشدا، بارزانی پێیوابوو دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل وەک دەستپێکی ڕاکیشانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وایە بۆ نێو ململانێیەکە. ئاخر لە سەرووی هەموو ئەوانەوە، لۆژیکی جیۆپۆلیتیکی هەرێمەکە هەستیار بوو بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانیی ئیسرائیل. کورد وەک پێکهاتەیەکی سەرەکی بۆ ڕێبازی کەمەربەندی ئیسرائیلی، ئەوا پشتگیریی ژێربەژێری تەلئەبیب بۆ کورد هەنگاوێکی لێبڕاوانە بوو بۆ بەرزەفتکردنی بەغدا. هەر بەڕاستیش، بەغدا بەشداری شەڕی عەرەب-ئیسرائیلی لە ١٩٤٨دا کرد بێ ئەوەی هیچ ڕێککەوتننامەیەکی ئاگربەستیش لەگەڵ ئیسرائیلدا مۆر بکا. بە ماوەیەکی کەمیش دوای دامەزراندنی پەیمانی "تریدەنت"ی ١٩٥٨، بارزانی، کامەران عالی بەدرخانی ناردە زیوریخی سویسرا، ئەوەبوو لە ١٩٥٩ ئەو لەوێ بەگەرمی لە لایەن گۆلدا مایەری وەزیری کاروبارەی دەرەوەی ئیسرائیل پێشوازی لێکرا. بەڵێنی پشتگیری بێ قەیدوشەرت بە کامەران عالی بەدرخان بۆ جەنگان لە دژی بەغدای دوژمنی هاوبەش و دامەزراندنی دەوڵەتێکی غەیرە عەرەبی درا. ئێلیازەر تسافریر بەرپرسی ئۆپەراسیۆنەکانی مۆساد لە کوردستانی عێراق لێدوانی دابوو؛ "ئێمە بە

کوردمان گوت... [کە] هەرچی بیکەن ئێمە پشتیان دەگرین جا چ لە شەڕ بێ یان لە ئاشـــتی".[283] تەلئەبیب لە ئاخیروئۆخری پەنجاکان دانووی لەگەڵ تاران نەدەکولا.

هێشـــتا شـــا لە ناوەڕاســـتی ١٩٥٩دا لە لایەنگرتنی کورد دوودڵ بوو. بە گوێرەی قســـەی تســـافریر بێ، ڕژێمی ئێرانی "مەلا مســـتەفا بارزانی خۆشنەدەویست، چونکە پێیانوابوو **مەلای سوورە**. ئاخر ئەو دوازدە ساڵان وەک پەنابەر لە ڕووســـیای بەســـەربردبوو."[284] ســـەرباری ئەمەش، تاران دژی ئامادەیی ئیســـڕائیل بوو لە کوردســـتانی عێراق. هەر کۆمەکێکیش بۆ کوردی عێراق بەبێ مۆڵەتی تاران دەکرا بوایە هەڕەشـــەیەکی ئاییندە بۆ سەر ئاسایشی نیشتمانیی ئێرانی. نابێ بایەخی ئەوەش نادیدە بگیرێ، کەوا شـــا لەوەدا خۆپـاریز بوو بەهۆی پشـــتیوانی ئیســـڕائیـل بۆ کورد پەیوەندییەکانی زیاتر لەگەڵ دەوڵەتە عەرەبییەکان تێک بدا. هەرچۆنێک بێ، قاســـم بە پشـــتیوانی ســـۆڤیەت داوای گێڕاندنەوەی خاکی ئێرانی چڕتر کردەوە، ئیدی شا لە پشتیوانیکردنی کوردی عێراق ڕەگەڵ ئیسڕائیل کەوت و ئینجا ڕێگەی دا چەکی پێشـــکەوتووی ئیســـڕائیلی لە ڕێی ئێرانەوە بگاتە بارزانی.[285]

### جووڵانەوەی ئەیلوولی ١٩٦١

لە ١٠ی ئەیلوولی ١٩٦١دا، ڕەتڵێک لە ســـوپای عێراق کەوتە نێو بۆســـەی هێزی گرووپێکی کوردی و قەتڵوعـام کران، گرووپەکە لە لایەن عەبـاس مامەندی هاوپەیمانی بارزانی فەرماندەیی دەکرا و ڕووداوەکەش لە نزیک

---

283 Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 53.

٢٨٤ هەمان سەرچاوە لاپەرە ٥٣.

285 Rubin, Avshalom, Abd al-Karim Qasim and the Kurds of Iraq: Centralization, Resistance, and Revolt, 1958–63 (2007) Middle Eastern Studies, 43 (3): 373.

بارزان بوو. بەغداش کەوتە بەردەم دوو بژاردە، یان "ئۆتۆنۆمی بۆ کورد دەســـتەبەر بکا" یاخود "بە هێزی ســـەربازی لەگەڵیان بجووڵێتەوە".[٢٨٦] ئەوەبوو خێرا قاسم بژاردەی ستراتیژی مستی ئاسنینی گرتەبەر. لە کاتێک لە بەراییەوە بـارزانی خۆی لە ململانێیەکە بەدوور گرت، کەچی هێزی ئاســـمانی عێراقی بارزانی بۆمباباران کرد، ئەمەش وایکرد ئەو و ئاغاکانی دیکەش بدەنە پاڵ شەڕەکە.[٢٨٧]

ئێران و ئیسرائیل تەنانەت میسری نەیاریشیان پێشوازییان لە هەڵگیرسانی شـەڕەکە لە کوردسـتانی عێراق کرد. ڕکابەری قووڵی نێوان ناسـر و قاسـم لەبارەی ڕابەرایەتیکردنی جیهانی عەرەبی، ئەوەبوو ڕادیۆی دەنگی عەرەب (صوت العرب)ی میسری دارِسایە ڕژێمی بەغدا.[٢٨٨] بارزانیش پێشتر بەرەو ناسـر وەرچەرخابوو، هەروەها لە هەمان کاتیشـدا لە پاڵپشـتیکردنی خالد بێگی سـەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردسـتانی سـووریا وەسـتا بۆ ئەوەی دڵی قاهیرە ڕازی بکا. نـاســـریش لە بەرانبەردا، بەڵێنی پێدا، هەرچەندە بەزارەکیش بوو، کەوا پشـتیوانی لە داواکانی کورد بکا تا لافوگەزافی قاسـم بۆ ناسـیونالیزمی عەرەبی لاواز بکا.[٢٨٩] لەگەڵ ئەوەشـدا قاسـم سـەرکۆنەی کوردی کرد و بە "نۆکەری ئەمریکای" وێناکردن.[٢٩٠] خالی ســـەرنجڕاکێش

---

286 Tabriz A-26 to the U.S. Department of State, "The Kurdish Movement in Iraq as seen from Mahabad," September 3, 1961 NARA/RG59/ R2/ 787.00/9 –361) , pp. 1–4.

287 Baghdad 162 to the U.S. Department of State, September 19, 1961 (NARA/RG59/ R2/787.00/9–1961), p. 1.

288 Al-Samarrai, Wafiq, Hottam al-Bawabat al-Sharqi [The Destruction of the Eastern Gate], translated in Farsi, (Tehran, Markaz Asnad va Tahghighat-e Defa-e Moghaddas) pp. 33–4.

289 SAVAK Documents, No. 2b/1729, 18 May 1961.

290 Baghdad A-245, September 27, 1961, "Qasim Accuses British and Americans of complicity in Kurdish Revolt Exonerates USSR; Dissolve

لێرەدا ئەوەبوو، هیچ کامێکیان، نە ئێران و نە ئیسرائیل ئاگایان لە بڕیاری بارزانی نەبوو بۆ دانەپاڵ شەڕەکە. **دەگوترێ کەی جی بی فشاری خستووەتە سەر بارزانی تا شەڕەکە هەڵبگیرسێنێ.**[٢٩١] دیار بوو لۆژیکی ململانێی جیۆپۆلیتیک لەگەڵ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەروەها هەڵمەتی قاسمی دژە حیزبی شیوعیی عێراقی، سیاسەتەکەی سۆڤیەتیان گۆڕیبوو.[٢٩٢] لە وەرچەرخانێکی مێژوویی بێوینەدا، ڕکابەرایەتی سیاسەتی نێودەوڵەتیی سۆڤیەت لەگەڵ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەرفەتێکی

Kurdish Democratic Party," September 27, 1961 (NARA/RG59/R2/787.00/9- 2761) p. 2.

[291] Zubok, Vladislove M. Spy vs. Spy: The KGB vs. the CIA, 1960–62, Cold War International History Project, Woodrow Wilson Center for Scholars, No 4 (1994). pp. 28–29.

[٢٩٢] **لە سەرەتای حوزەیرانی ١٩٦١، کەمێک بەر لە شەڕی کورد، قەیرانی بەرلین سەریهەڵدا. کاتێکیش ڕوبەڕووبوونەوە لەبارەی بەرلینەوە تیرتر بوو، سەرانی ڕووس لەبەر نەخشەیەکدا بوون تا بە هۆیەوە ڕووی سەرنج و بایەخی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە قەیرانی بەرلینەوە بگۆڕن و "ستراتیژی پەیداکردنی قەیران" لە چەندین ناوچەی جیاجیای جیهان بە مەبەستی بەلاوەنان و پەرتەوازەکردنی هێزی ئەمریکا و ولاتەکانی خولگەی ئەو وەربگێڕن، بەم جۆرە ئەوان بە شوێنی دیکە ببەستێتەوە، تا کێشەی ڕێککەوتنامەی ئاشتی ئاڵمان و بەرلینی خۆرئاوا چارەسەر دەکا." بۆ ناسەقامگیرکردنی ئێران و تورکیا لەپاڵ ولاتە یەکگرتووەکان و بریتانی، ئەوەبوو ئەلێکساندەر شێلیپینی بەڕێوبەری کەی جی بی ڕێنمایی ئەوەی دا بەڵکو سۆڤیەت پەیوەندییە کۆنەکانی لەگەڵ بارزانی بژێنێتەوە "بۆ کاراکردنی جووڵانەوەی خەڵکی کورد لە عێراق و ئێران و تورکیا بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ، بە جۆرێک پارێزگاکانی ئەو ولاتە ناوبراوانە بگرێتەوە... [لەو کاتەی] نیگەرانی جدی لە نێو زلهێزەکانی ڕۆژئاوا دەوروژێنێ و لەپێش هەموشیان ئینگلستان، ئەمەش لەبەر "دەستهەبوونی لە نەوتی عێراق و ئێران، هەروەها بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش کە بنکەی سەربازی لە تورکیادا هەیە." کەی جی بی لە نامرابوون لە وەرچەرخانە ناچاوەڕوانەکەی قاسم و پاکتاوکردنی حیزبی شیوعیی عێراق، وەهای بینی کە، شەڕی کورد ستراتیژێکی لەبارە بۆ هەژاندنی قاسم، "ئەو کەسەی بەتایبەتی لەم دواییانەدا خەریکبوو لەگەڵ سیاسەتی ڕۆژئاواییدا بڕوا."** بڕوانە ڤلادیسلۆڤ زوبوک :

Vladislove Zubok, "Spy vs. Spy: The KGB vs. the CIA, 1960–62," Cold War International History Project, Woodrow Wilson Center for Scholars, No 4 (1994), pp. 28–29.

ستراتیژی بۆ هێزە هەرێمییەکانی وەک ئێران و ئیسرائیل هێنایەپێشەوە تا لایەنی سەرکردەیەکی خۆجێی وەک بارزانی بگرن.

بە هاتنی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٦١، سوپای عێراق هێزە ناڕێکوپێکەکەی مامەندی بەزاند؛ لەگەڵ ئەوەشدا لێهاتوویی بارزانی لە شەڕی نانیزامییدا لەسەر حیسابی قاسم، شەڕەکەی توندتر کرد. وێڕای زاڵدەستی هێزی ئاسمانی، لێ سەربازەکانی بەغدا لەسەر وشکانی لە ئەزموونی کورتهێن بوون تا لە چیاکانی زاگرۆسی کوردستانی عێراقدا بجەنگن. کاتێکیش شەڕ بە زیانی قورسی سوپای عێراقییەوە درێژەی دەکێشا، بەشێک لە خاکی کوردستان کەوتە دەستی پێشمەرگە.[٢٩٣] بەڕێوەبردنی شاشی شەڕ و نەبوونی متمانەیەکی قووڵ بە فەرماندەکان بووە مایەی شکست لە دوای نوشتی ئەو لە چاوی سوپادا. ئەوەی قورەکەشی خەستتر کرد، ئەو خستنەڕووەی قاسم بوو بۆ ئاشتی، کە لە تشرینی دووەمی ١٩٦١ تا ئازاری ١٩٦٢ خستیە بەردەم بارزانی و ئەویش لە لای خۆیەوە ڕەتیکردەوە. لەو نێوەشدا، قاسم خستنەڕووەکەی سۆڤیەتی ڕەتکردەوە بەوەی پەلامارەکان ڕابگرێ و بە حکوومەتە ئۆتۆنۆمیدارەکەی بارزانی لە باکووری عێراق قایل بێ.[٢٩٤] ئیدی شەڕەکە بووە هەورێکی سەر بە گێژەلووکە بۆ قاسم.[٢٩٥]

شەڕەکە بۆ ئێران دەستکەوتێکی ستراتیژی بوو. ئاخر نزیکەی هەموو کۆمەکی کورد یان لە ئێران یاخود بە ڕێی ئێرانەوە دەهات. بە ئاگابوون

[293] Baghdad D-635 to the U.S. Department of State, "Kurdish Revolt Reportedly Increase in Intensity; Qasim Offers Kurds 'Last Chance'; Kurdish Propaganda Attacks Qasim," April 3, 1962 (NARA/RG59/R2/787.00/4-362), pp. 1–3.

[294] SAVAK Documents, No. 311/763, 20 January 1962.

[295] Baghdad 127 to the U.S. Department of State, September 7, 1962 (KPL/NSF/ Countries/BOX 117/Iraq.1961–62), pp. 1–2.

لەو پشـــتگیرییەی ڕوســـییەکان بۆ کوردی عێراق،[٢٩٦] **ئێران چاوی خۆی لەو چەکەی لە ســـۆڤیەتەوە بە قاچاغ ئاودیو دەکرا دەنووقاند.** بەگوێرەی ڕاپۆرتەکانی ســاواک بێ، ڕووســەکان لە ڕێی ئێران و هۆزە کوردەکان بە ئاغاکانی هۆزی شـــکاکیشـــەوە، چەکیان بۆ بارزانی دەنارد.[٢٩٧] هەروەها بارزانیش لە ڕێی ئەحمەد تۆفیقەوە پەیامی بۆ تاران نارد تا قەناعەت بە کاربەدەســـتە ئێرانییەکان بکا، بەوەی پشـــتی کورد بگرن.[٢٩٨] لەو مانگانەی بەدوایدا هاتن، توخمەکانی ســـاواک ڕۆڵێکی کلیلئاســـایان لە گۆڕینی ســیاســەتی ئێرانی دەرهەق کوردی عێراقدا بینی. (ئەعلەم)ی ســەروەزیری ئێران بە یولیوس هۆلمزی باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە تارانی ڕاگەیاند کە:

***تا ئەنووکە ئێران هەر ســـیاســـەتی خۆبەدوورگرتنی گرتووەتەبەر، تەنیا ڕێکاری پێویستی بۆ پاراستنی سنووری ئێران-عێراق لە ماوینی ڕابردوو گرتووەتەبەر، ئەوەش لەوکاتەدا بوو کە ئەگەری تەشـــەنەکردنی شـــەڕی بارزانی بۆ نێو ئێران لە ئارادابوو. ئەعلەم گوتی؛ بارزانی لە چەندین بۆنەدا بۆ داواکردنی پشـــتگیری لە دژی عێراق لە شـــا نزیکبووەتەوە. لە بەرانبەر هاوکاریدا بەڵێنی گەورزۆنە گەورزۆنەی داوەتە ئێران بەوەی کوردســـتانی عیراق بە ئێرانەوە بلکێنێ. لە کاتێکدا شا ئەو خستنەڕوویانەی ڕەتکردنەوە، کەچی توخمگەلێک لەنێو سوپای ئێراندا هەن لەو بڕوایەدان، کە یارمەتیدانی کورد دەکرێ بۆ لاوازکردنی قاسم داردەستێکی لەبار بێ.***[٢٩٩]

لە ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٦٢دا، وەزارەتی کـاروبـاری دەرەوەی ئەمریکـا ئاماژەی بەوەدا، کە "کەســـانی گرنگ لە نێو حکومەتی ئێراندا.... دەکرێ بە

---

[296] SAVAK Documents, No. 311/706/2-d, 26 April 1963.

[297] SAVAK Documents, No. 313/29188, 5 May 1963.

[298] SAVAK Documents, 4632, 28 November 1962.

[299] Tehran 136 to the U.S. Department of State, August 2, 1962 (NARA/RG59/ R2/787.00/8-162), pp. 1–2.

گۆڕانکارییەک لە بنەمای سیاسەتی ئێرانییەکان لە ڕابردوو و هەنووکەوە دابنرێ بەوەی لە هەڵویستێکی نەیارانەی ساردوسڕەوە لە هەمبەر یاخیبووە کوردەکان بۆ هەڵویستێکی هاوکاری ژێربەژێر بگۆڕێ."[300] شا بە باوەڕپێهێنانی لەلایەن ساواکەوە "پێگە و هەڵویستی ئەرێیانەی زیاتر لەهەمبەر کوردی عێراق" بگیرێتەبەر.[301] کۆمەکی ئێران تفەنگی ئاسایی بڕنۆ و فیشەکی گرتنەوە، بەهۆی "دۆستایەتی و نزیکی" KAR98K پەیوەندییەکانی بارزانی بە تاران لە سنوور بە ئازادانە دەگوازرانەوە.[302] بارزانیش لە بەرانبەردا وریابوو لەوەی کێشە بۆ ئێران دروست نەکا. ئەو چەندین جار هۆشداری دایە کوردانی ئێران بەوەی هیچ هەنگاوێک لە دژی ڕژێمی ناوەند لە تاران نەهاوێژن.[303] لە کاردانەوەی پشتگیری تاران بۆ کورد، قاسمیش هەوڵیدا هۆزە کوردەکانی ڕۆژئاوای ئێران، بە شێوەیەکی سەرەکیش جوانڕۆییەکان لە دژی تاران جۆش بدا و بجووڵێنێ و چەک و تەقەمەنییان بداتێ.[304] لەگەڵ ئەوەشدا یاخیبوونی جوانڕۆیی بە ئاسانی لەسەر دەستی سوپای ئێرانییەوە سەرکوت کرا.

### ئێرانی و ئەمریکی و کورد

جێگەی سەرنجە، جەنگی کورد لە پەیوەندییەکانی ئێران -ئەمریکادا بووە پرسێکی کێشەلەسەر. لە کاتێکدا تاران وای دانابوو، کە کوردی عێراق بۆ فشارخستنە سەر عێراق داردەستێکی ستراتیژییە، کەچی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێی وانەبوو عێراق کەوتبێتە تەوەرەی سۆڤیەتەوە،

---

[300] The U.S. Department of State Ca-2856 to US Embassy Tehran, May 24, 1962 (NARA/ RG59/R2/787.00/5-2462), p. 1.

[301] Tehran 136 to the U.S. Department of State, August 2, 1962 (NARA/RG59/ R2/787.00/8-162), pp. 1–2.

[302] Baghdad 150 to the U.S. Department of State, September 20, 1962 (NARA/RG59/ R2/787.00/9-2062), pp. 1–2.

[303] SAVAK Documents, No. 2/453, 12 January 1961.

[304] SAVAK Documents, No. 163, 5 May 1963.

نەخاسمە دوای ئەوەی قاسم حیزبی شیوعیی عێراقی ڕامالّی. ئەمریکییەکان لە پەیوەندییەکانی بارزانی بە مۆسـکۆوە بە گومان بوون. ئەوان بڕوایان وابوو، بارزانی مووچەیەکی مانگانە بە بڕی هەزار دیناری عێراقی (لە ١٩٦٢دا دەیکرد ٢٨٠٠ دۆلاری ئەمریکی) لە لایەن سـۆڤیەتییەکانەوە دەیدرێتێ.[٣٠٥] هەروەها ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەو بڕوایەدا بوو دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ هەردوو ولاتی ئێران و تورکیا دەشلەژێنێ و بۆ سۆڤیەتیش دەبێتە بنکەیەکی ستراتیژی لە نێوچەرگەی ڕۆژهەلاتی ناویندا. بە درەنگانێکی مانگی ئەیلوولی ١٩٦١دا، کورد بەلّێنی بە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دا بچنە ڕیزی سـەنتۆ CENTOوە، بەلّکو ببنە قەلایەکی قایم لە دژی یەکێتیی سـۆڤیەت". لەگەلّ ئەوەشـدا، جێمس ئاتکین، ئەفسەری بالّوێزخانەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەغدا، ئەو خواسـتەی کوردانی ڕەتکردەوە و یاخیبوونی کوردی لە عێراق بە کێشەیەکی ناوخۆ دانا.[٣٠٦] لە نێوەڕاستی شەڕەکەشدا، بارزانی ڕاشکاوانە داوای پشتیوانی لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکرد، ئەو لێدوانی وەها دا: "**دەکرێ ئێمە بۆ ولاتە یەکگرتووەکان سـوودبەخش بین. خۆ ئەگەر حیزبی شیوعی خزمەتی بەرژەوەندییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت بکا، ئێمەش دەکرێ خزمەتی ولاتە یەکگرتووەکان بکەین... سـەیری پێگە ستراتیژییەکەمان لە هەر جوولەیەکی سـۆڤیەت لە ڕێی قەوقازەوە بۆ ڕۆژهەلاتی ناوین بکەن و ئەوە لەبیر نەکەن، گەر ئێمە ئەوسا چ پارتیزانی بین یان هێزێکی تەکوزی(نیزامی)، ئەوا لە ڕۆژهەلاتی ناویندا باشترین سەربازین.**"[٣٠٧] هەرچەندە ئەو بەلّێنەی شا، کوردستانێکی سەربەخۆ دەکرێ

---

305 Baghdad 150 to the U.S. Department of State; September 20, 1962 (NARA/RG59/ R2/787.00/9-2062), pp. 1–2.

306 Baghdad 177 to the U.S. Department of State; September 29, 1961 (NARA/RG59/ R2/787.00/9-2961), pp. 1–2.

307 Dana Adams Schmidt, Kurdish Rebels Confident of Victory in Iraq: Warn United States to Aid Them or Soviet's Will, The New York Times, September

ببێتە: "ولایەتێکی دیکەی یەکێتییەکە، کە دەکرێ کۆمپانیا ئەمریکییەکان ئیمتیازاتی کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوک وەربگرن،"[308] کەچی ولاتە یەکگرتووەکان ئەم داوایەیان ڕەتکردەوە. پەیوەندی بارزانی بە مۆسکۆ و بەشداریکردنی لە کۆماری مهابادی دەستکردی سۆڤیەت، کاربەدەستە ئەمریکییەکانی هێنا سەر ئەو قەناعەتە، کە ئەگەری نیازی سۆڤیەت هەیە کورد بۆ ئەوە بەکاربێنێ بەڵکو ستراتیژی لەخۆگرتن و بەرزەفتکردنی ئەمریکای ڕۆژهەلاتی ناوین تێپەڕێنێ. هەروەها کاربەدەستانی ئەمریکا ڕەخنەی ئەوەیان لە پشتگیریی ئێران بۆ بارزانی گرت بەوەی دەکرێ هەڕەشە ناوخۆییەکانی لە ئێران و تورکیاش بوروژێنێ. لە ڕوانگەی ئەمریکاوە، "دەستوەردانی [ئێرانییەکان]... دەرخەری دژواریی زیاترە لەوەی بەرژەوەندییە چارەنووسسازیەکانی ئێران یان ئەمریکا بێنێتەدی." لەگەڵ ئەوەشدا داوای ئەمریکا لە تاران بۆ ئەوەی "سیاسەتێکی "بێلایەنانەی توند و چاوەڕوانییەکی وریایانە" بگرێتەبەر لەوەی "ڕاشکاوانە یان ژێربەژێر بۆ دەستوەردان پابەند بێ"[309] گوێی لێنەگیرا.

## شۆڕشی ڕەمەزان[310] لە ١٩٦٣دا

پێشمەرگە بە هاتنی هاوینی ١٩٦٢ شوێنێکی کوشندەی لە ژێرخانی هێڵی لوولەکێشی نەوت و غاز کردە ئامانج و دەستی بەسەر دهۆکیشدا گرت.[311]

---

10, 1962, ppBaghdad to the U.S. Department of State, September 20, 1962, (FRUS 1961–1963, XVIII, 49.. 1–14.

[308] Baghdad to the U.S. Department of State, September 20, 1962, (FRUS 1961–1963, XVIII, 49.

[309] The U.S. Department of State Ca-2856 to the U.S. Embassy Tehran, May 24, 1962 (NARA/RG59/R2/787.00/5-2462), p. 1.

[310] سەیرە نووسەر بۆ ئەو کودەتایە ئاوەڵناوی شۆڕشی بۆ بەکارهێناوە! وەرگێڕ.

[311] Baghdad A-210 to the U.S. Department of State, August 27, 1962 (NARA/RG59/ R2/787.00/8-2762), p. 1; London 3852 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 19 February 1962.

بەغـداش لە تۆڵەکردنەوەدا، پەلامـارەکـانی بە فڕۆکە چڕترکردنەوە. هەرچۆنێک بێ بارزانی بە دەستلەپشتدانی ئێران، توانی بەرانبەر بە سوپای عێراق بوەستێتەوە. بە درەنگانی ١٩٦٢ هێزی کوردی لە زنجیرەیەک شەڕدا شـکسـتی بە سـوپای عێراق هێنا و زیانی لە ورە و ناوبانگی سـوپا دا.[٣١٢] دوای شـکسـتی هەڵمەتی سـەربازیی ٢٠ مانگی لە دژی کورد، قاسـم تا دەهات زیاتر لە ڕووی سـیاسـییەوە لە بەغدا گۆشـەگیرتر دەبوو. لە بەرانبەریشـدا دەروو لەسـەر حیزبی بەعسـی دژە قاسـم کرایەوە.[٣١٣]لە کـانوونی دووەمی ١٩٦٢دا و دوای گفتوگۆیەکی نهێنی لەگەڵ کورد دا، شـەوکەت ئاکرەیی سـەرکردەی بەعس داوای لە ئیبراهیم ئەحمەد کرد، هێرشـی نوێ نەکەنە سـەر سـوپای عیراق لەبەر ئەو هاوکارییەی سـوپا لەگەڵ پیلانگێڕانی کودەتـا. لە بەرانبەریشـدا، ئـاکرەیی بەڵێنی بە پـارتی دیموکراتی کوردستان دا ئۆتۆنۆمییەکی بەرفرەوانتر بداتە کوردسـتان.[٣١٤]لە ٨ی شـوباتی ١٩٦٣شـدا هاوپەیمانیی هێزە لایەنگرەکانی ناسـر، ئەفسـەرانی بەعسـی و ژەنەڕاڵە دەسـترۆیشـتووەکانی سـوپا بە سـەرۆکایەتی عەبدولسـەلام عارف، کودەتایەکیان جاڕدا، دواتر بە شـۆڕش(کودەتا-وەرگێڕ)ی ڕەمەزان نـاویـدەرکرد. قـاسـمیش ڕاپێچی دادگـایەک کرا کە عەبدولسـەلام سـەرۆکایەتی دەکرد و بەشـێوەیەکی دڵڕەقانە کوژرا.[٣١٥]

---

312 Baghdad 309 to the U.S. Department of State, December 23, 1962 (NARA/RG59/ R2/787.00/12-2362), p. 1.

313 SAVAK Documents, No. d/16/12509, 7 February 1961.

314 Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 685.

٣١٥ ڕژێمە نوێیەکە لە پیاوەکانی سـێ گرووپ پێکهات، عەبدولسـەلام عارفی ناسـری بە سەرۆک، ئەحمەد حەسەن ئەبەکر، ژەنەڕاڵی بەعس بە سەرۆوەزیر و عەلی سالح ئەلسەعدی بە جێگری سـەرۆوەزیر، وەزیری ناوەخۆ و سکرتێری حزبی بەعس هەرێمی (عێراق) حزبی بەعس کە ئەنجومەنێکی نیشتمانیی بۆ سەرکردایەتی شۆڕش دامەزراند کە دەسەڵاتی هەرە باڵای بوو لە وڵات.

پیلانگێرانی کودەتاکە قاسـمیان بە دامەزرێنەری "سـەردەمی تیرۆر و بنکۆڵکەری برایەتی عەرەب-کورد تاوانبار کرد."[316] راسـتەوخۆش هەر دوای کودەتایەکە، حەرەسی قەومی، میلیشیای بەعس شاڵاوێکی دڵڕەقانەی کوشـتن و بڕینیان لە دژی شـیوعییەکانی عێراق و "کوشـتارگەیەکی خوێناوییان" سـازدا.[317] کودەتاکەی ١٩٦٣ سـەرکردەکانی تودەشـی ترساند.[318] دیاربوو لە کۆتاییدا سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بەری گرتبێ.

**٢ - دروستبوون: شیعەی لوبنان**

کۆلۆنێل پاشـاهی لە کۆبونەوەیەکی سـاواکدا وەهای ڕوونکردەوە: "***بۆ ئەوەی ڕێگربین لە خوێنرژان لەسـەر خاکی ئێران، دەبێ ئێمە بجەنگین و هەڕەشـەی [ناسریزم] لە کەناراوی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاستدا بەرزەفت بکەین.***"[319]

**پان عەرەبیزم و پەیوەندیی تاران- بەیروت**

سـەرهەڵدانی پان عەرەبیزم شـای تیختیخە دا تا جموجۆڵی میسـر لە ڕۆژهەڵاتی ناوین بەرزەفت بکا. تاران سـەرباری پێکهێنانی پەیمانی بەغدا، سەرنجی خۆی وەرگەڕاندە سەر لای ڕۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاست تا لە لوبنان (وەک یەکێک لە مەکۆکانی کەلتوری-ڕۆشـنبیریی جیهانی

---

[316] The Declaration of Iraq Ramadhan Revolution, Baghdad to Iran's Ministry of Foreign Affairs, February 8, 1963.

[317] CIA, "Background on 8 February Revolt in Iraq." OCI No. 0487/63, February 8, 1963 (JFK/NSF/RKF/Box426/Iraq.1961–63), pp. 1–2.

[318] SAVAK Documents, No. 312/1211, 6 July 1963.

[319] بۆ زیاتر وتوویژکردن لەسـەر پلانە سەوزەکە، بڕوانە نامەی عیسـا پژمان کە ئەلەموتی مستەفا چاپی کردۆتەوە:

Iran dar Asr-i Pahlavi [Iran in the Pahlavi Era] Vol.II, Jang-i Qodrat dar Iran [Power Struggle in Iran] (London, 1992) pp. 521–3.

عەرەب) لە ڕێی ڕاچاندنی تەونی پەیوەندی لەگەڵ جڤاتەکانی لوبنانی دابڕسێتە سەر جەمال عەبدولناسر. ئێران وێڕای پەیوەستی دینی-کەلتوری مێژوویی لەگەڵ شیعەی لوبناندا، لە دەستپێکەوە تیشکی خستە سەر ڕاچاندنی پردی پەیوەندی لەگەڵ دەستەبژێری مارۆنییە بەدەسەڵاتەکان.[320] دەستەبژێری مارۆنییەکانیش تەوژمی پان عەرەبیزمیان بە هێزێکی پاڵنەری نوێی عەرەبی سوننە دەزانی بۆ ئاڵنگاری سەر سیستمی سیاسی. لە کاتێکدا کەسایەتییەکانی پان عەرەبیزم لە لوبنان، وەک سائیب سەلام، وەلید جنبلات و ئیبراهیم کولەیلات پشتی میسرییان دەگرت، کەچی کەمیل شەمعونی سەرۆک و دەستەبژێری مارۆنی بە شێوەیەکی تاکتیکیانە لایەنگری پەلاماری سەر نۆکەندی سوێس بوون و ئەوەیان ڕەتکردەوە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ڕۆژئاوادا بپچڕێنن. دوابەدوای قەیرانی سوێسیش لە ١٩٥٦دا، سەرۆک کەمیل شەمعون لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لە ئینگلستانێ نزیک بووەوە و لایەنگریی ئەندامانی پەیمانی بەغدای گرت بەتایبەتیش هی ئێران.

شا لە کانوونی دووەمی ١٩٥٧دا چاوی بە کەمیل شەمعون کەوت. لە کۆبوونەوەکەدا هەردوو سەرکردەکە پێیان لەسەر دژایەتیکردنی هەر دەستوەردانێکی دەرەکییدا گرت، مەبەستیش دەستوەردانی میسری بوو لە کاروباری ناوەخۆی وڵاتەکانیان.[321] بە ماوەیەکی کەمیش دوای ئەو کۆبوونەوەیە، پێکهێنانی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو بەدوای خۆیدا ئاژاوە و پشێوی سیاسیی لە نێو کۆمەڵگە عەرەبییەکاندا، نەخاسمە لە لوبناندا هێنا. لە کاتێکدا مارۆنییەکان نیازیان وابوو لوبنان بە هاوپەیمانی ڕۆژئاوا

---

[320]. بەگوێرەی پەیمانی نیشتمانی (میثاق الوطني)ی ساڵی ١٩٤٣، دەبوایە هەمیشە سەرۆکی کۆماری لوبنان لە مارۆنییە کاسۆلیکەکان بێ.

[321] Summary of communiqué on the talks between President Sham'un and the Shah of Iran, Beirut, 23 December 1957, in Agwani (ed.), The Lebanese Crisis, 1958: A Documentary Study (Bombay, 1965), p. 29.

بهێڵنەوە، کەچی سوننەکان بە ڕابەرایەتی ڕەشید کەرامی سەروەزیر، پاڵی بە بەیروتەوە نا بەرەو کۆماری عەرەبی یەکگرتوو بڕوا. لە حوزەیرانی ۱۹۵۸دا، کەمیل شمعون داوای لە ئێران و تورکیا و کۆمکاری عەرەبی کرد لە دژی حزبەکانی سوننە و دروزی پشتبەستوو بە کۆماری عەرەبی یەکگرتوو لە لوبنان پشتیان بگرن.[٣٢٢]

هەر بەتەنیا ئێران بوو کە پشتی بەیروتی گرت و فەرمانی بە ساواک کرد کۆمەکی سەربازیی بگەیەنێتە دەستی مارۆنییەکان. ئەو ئۆپەراسیۆنەش لە لایەن سەرهەنگی هێزی ئاسمانی حامید ناسریی، پاشکۆی سەربازیی ئێران لە بەیروت و مەنسور قەدەری بەڕێوبەری ئەوسای کونسلخانەی ئێران لە دیمەشق بەڕێوەچوو.[٣٢٣] پشتگیریی ئێران بۆ بەیروت قەناعەتی بە ئیسرائیل هێنا چەکی دەستکردی سۆڤیەت، ئەو چەکەی لە کاتی جەنگی سوێس لە ۱۹٥٦ دەستی بەسەرداگیرابوو، بدەنە مارۆنییەکان. چەک و تەقەمەنییەکەی ئیسرائیلی لە فڕۆکەخانەی میهرئاباد دابەزێنرا و لەوێش لە تاران لە ڕێی ساواکەوە گەیەنرایە دەستی هێزەکانی سەر بە شمعون لە بەیروت.[٣٢٤] ئۆپەراسیۆنی بەیروتی ساواک-مۆساد لە لایەن ئەحمەد ئەمزای ئەفسەری دەریاوانی هۆبەی هەواڵگریی دەرەکی ساواک و ئەمیر فەرید شەهاب بەڕێوبەری گشتی ئاسایش بەڕێوەچوو.[٣٢٥] ڕەحمەت ئەتابکی، باڵوێزی

---

[٣٢٢] حزبە پشتیوانەکانی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو لە لوبنان پێکهاتبوون لە بزووتنەوەی سەربەخۆیی ناسرییەکان (حركة الناصريين المستقلين یان بە سادەیی المرابطون) بە ڕابەرایەتی ئیبراهیم کولەیلات، پارتی سۆشیالیستی پێشکەوتوخواز (حزب التقدمي الاشتراكي) بە ڕابەرایەتی کەمال جونبلات و حیزبی شیوعی لوبنانی.

[٣٢٣] بەگوێرەی قسەی مەنسور قەدەر بێت، پێدەچوو ئەوکات ناسری زۆر جێگەی متمانە نەبێ. ئاخر ئەو یەکێک بوو لە خزمەکانی سالاری سەرلەشکر باتمانخیلیش. بڕوانە دیدار لەگەڵ ژەنەڕاڵ مەنسور قەدەر:

General Mansour Qadar, Oral History, Foundation for Iranian Studies.

[324] Interview with General Mansour Qadar, Oral History, Foundation for Iranian Studies.

[٣٢٥] هەروەها شەهاب ئەندامی هۆبەی دژەکۆمۆنستیش بوو لە لوبنان.

ئێرانیش لە بەیروت بەشـــداری ئۆپەراســـیۆنەکە بووبوو. لەگەڵ ئەوەشـــدا، هاوپەیمانیی تاران-بەیروت سەری نەکێشا بۆ ڕۆنانی قەڵایەکی مەحکەم لە دژی ڕەوتی پـان عەرەبیزم. بە گوێرەی قســـەی مەنســـور قەدەر بێ؛ "هێزەکانی ســـەر بە کەمیل شـــمعون چەک و تەقەمەنییان لە ئێرانەوە بۆ دەهات. هەرچەندە ئەوان زۆر لە چەکەکانیان بە هێزەکانی ســەر بە ناسـر فرۆشـت! هەروەها کەسـانێک لە نێو هێزەکانی سـەر بەناسـریش چەکیان بە هێزەکانی سەر بە کەمیل شمعون دەفرۆشت. ئاخر لەوێ گەندەڵییەکی زۆر قەبە لە ئارادا بوو. هەر بەتەواوی ئۆپەراسـیۆنەکە ئۆپەراسـیۆنێکی بێ بەر بوو."[٣٢٦] ئێران لە لوبنان پێویستی بە هاوپەیمانێکی بەهێزتر هەبوو.

**کودەتاکەی عێراق لە ١٩٥٨ و "پلانە سەوزەکە"ی ساواک**

لە ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨دا، تەختی بنەماڵەی پاشـــایەتی هاشـــمییەکان وەرگەڕێنرا. ئەم ڕووداوەش لەپاڵ ســـەرهەڵدانی میلیشـــیاکانی لوبنان ئەوانەی لە لایەن کۆماری یەکگرتووی عەرەبی پشـــتیوانی لێدەکران، دنەی سـەرۆک کەمیل شـمعونی دا تا داوای پشـتگیریی سـەربازییانە لە سـەرۆک ئایزنهاوەر بکا. لەسەر داوای پاشای عەرەبستانی سعوودی،[٣٢٧] هەروەها بە فشـاری شـا لەسـەر ئازنهاوەر، لە کۆبوونەوەی تەممووزی ١٩٥٨دا،[٣٢٨] وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ١٥ی تەممووزدا و لەژێر ناوی ئۆپەراســـیۆنی شەمشەمەکوێرەی شین Blue Batدا، شەشەمین کەشتیگەلی مارینزی لە

326 Interview with General Mansour Qadar, Oral History, Foundation for Iranian Studies.

327 Memorandum of Conference with President, White House, 14 July 1958, (FRUS 1958–1960, Vol. XI, 212).

328 The U.S. Department of State telegram, 16 July 1958, (FRUS, 1958–1960, Vol. XI, pp. 306–308). The Shah's doubts are seen again in "internal Political Situation in Iran," the U.S. Department of State Memorandum, 788.00/11 February 1961, FOIA; and CIA, "The Arab Threat to Iran."

بەیروت دابەزاند.[329] لە هەمان کاتیشدا هێزی سەربازی بریتانی لە ئوردن دابەزین. هەرچۆنێک بێ، قەیرانی ناوەخۆی لوبنان تا لاچوونی کەمیل شمعون لەسەر تەختی سەرۆکایەتی و جێگرتنەوەی لە لایەن فوئاد شەهاب لە ۳۱ی تەمموزی ۱۹۵۸دا درێژەی کێشا. دەستبەجێش فوئاد شەهاب رێکاری چاکسازیی سیاسی و پێشوەچوونی کۆمەڵایەتی بۆ هێواشکردنەوەی گرژیی لەگەڵ ناسرییەکان گرتنەبەر.[330] سەرباری کەمە سەرکەوتنێکی چاکسازییە سیاسییەکانی فوئاد شەهاب، کەچی نەبوونە بەربەست لەبەردەم سەرهەڵدانی پان عەرەبیزم لە لوبنان. بە جۆشی کودەتاکەی ۱۹۵۸ی عێراق، پان عەرەبیزم بووە مایەی ئەوەی چاو و دڵی گەنجان، سوننە و دروزە شارنشینەکان بۆ خۆی رابکێشێ.

کردە سنووردارەکەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا شای ئێرانی هێنایە سەر ئەو رایە، بۆ بەرزەفتکردنی میسر و عێراق ناتوانێ پشت بە هاوپەیمانەکانی ببەستێ. بۆیە فەرمانی بە بەختیاری بەرێوەبەری ساواک کرد تا پلانێک بۆ راگرتنی تەشەنەسەندنی هەڕەشەی پان عەرەبیزم دابرێژێ. بە سەرکردایەتی حەسەن پاکرەوان، دەزگای ئاسایشی ئێران نەخشەی گەراندنەوەی تەختی پاشایەتی هاشمی بۆ عێراق

---

[329] ee Beirut 358 to the U.S. Department of State, July 14, 1958 (FRUS/1958–60/XI/doc.121), p. 208; Eisenhower, pp. 271–271; White House, Memorandum of Conferencewith the President, July 14, 1958 (FRUS/1958–60/XI/doc.128), pp. 226–28; and U.S.Navy, Director of Naval Operations to the Commander in Director, U.S. Naval Forces, July15, 1958 (FRUS/1958–60/XI/doc.130), p. 231.

[330] See Beirut 358 to the U.S. Department of State, July 14, 1958 (FRUS/1958–60/XI/doc.121), p. 208; Eisenhower, pp. 271–271; White House, Memorandum of Conferencewith the President, July 14, 1958 (FRUS/1958–60/XI/doc.128), pp. 226–28; and U.S. Navy, Director of Naval Operations to the Commander in Director, U.S. Naval Forces, July15, 1958 (FRUS/1958–60/XI/doc.130), p. 231.

دارشــــت.[٣٣١] لەکاتێکدا نەخشــــەی "ڕزگارکردنی عێراق" بۆ تاران پلانێکی شــکســـتخواردوو بوو، ســــەردانە بەردەوامەکانی ســـاواک بۆ بەیروت هـاوپەیمـانی نوێی بۆ ئێران لەگەڵ خۆیـدا هێنـا. لوبنـان وەک وڵاتێکی دیموکرات، بەڵام ناســــکی جەنجاڵ بە فرە ئەتن و ئایین و ئایینزا، کارێکی وایکرد ببێتە ئامانجێکی تەواوعەیار بۆ ئێران تا ســــیاســـەتی دەرەکی نادەوڵەتیانی خۆی لەســەر ڕۆبنێ. هەر زووش ساواک نەخشـەیەکی نوێی دانا، کە بە "پلانی ســــەوز" ناســــرا. هەروەک پێشـــڕە/ڕائید پاشــاهی بە پێداگرتنەوە داوایکرد، " **بۆ ئەوەی ڕێگربین لە خوێنڕژان لەســــەر خاکی ئێران، دەبێ ئێمە بجەنگین و هەڕەشــــەی [نـاســــریزم] لە کەنـاراوی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاستدا بەرزەفت بکەین.**"[٣٣٢] ئامانجی ئێران لە شەقڵپێدانی پلانی سەوز بەرزەفتکردنی پان عەرەبیزم بوو لە لوبنان لەبری ئەوەی ســــەر ســــنووری ڕۆژئاوای لە عێراق، ئەمەش بەوە پێکهات، کە لە جیاتی مارۆنییەکانی لوبنان ڕایەڵەی پەیوەندی لەگەڵ شــــیعەکانی ئەوێ ڕابچێنێ. بەســــەرپەرشــــتی ئەفســــەری هێزی ئاســـمانی حەمید ناســـری، بەرپرســـی وێســتگەی ساواک لە بەیروت،[٣٣٣] پلانە ســەوزەکەی ســاواک، کۆمەکە داراییەکـانی بۆ کۆمەڵگەی شــــیعە بۆ ٣٢،٠٠٠ دۆلار ســــاڵانە بەرزکردەوە. بۆرەکۆمەکی پێشــتری ئێران بۆ شـیعەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین بە شـیعەی لوبنانیشــەوە لە لایەن بونیادی پەهلەوی بوو (پاش شــۆڕشــی ئیســــلامی لە ١٩٧٩ بووە دامەزراوی عەلەوی). دامەزراوەکە ئەو کۆمەکە

---

[331] Letter from Isa Pejman, reprinted in Alamuti, Mostafa, Iran dar Asr-i Pahlavi [Iran inthe Pahlavi Era] Vol.II, Jang-i Qodrat dar Iran [Power Struggle in Iran] (London, 1992)p. 521; and Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 95.

[٣٣٢] بۆ زیاتر باسوخواسی پلانی سەوز بروانە نامەکەی عیسا پژمان:
Pejman letter, in Alamuti, Mostafa, Iran dar Asr-i Pahlavi, Vol.II, Jang-i Qodrat dar Iran (London, 1992), pp. 521–3.

[333] The U.S. State Department, 4 May 1958, (FRUS, 1958–1960, Vol.XI, 29).

داراییەی لە ڕێی ڕایەڵەی پیاوە ئاینییەکان بەتایبەتیش لە ڕێی ئایەتوڵڵای گەورە بروجەردییەوە دەگەیاندە جڤاتە شیعییەکەی ئەوێ. لە سایەی پلانی سەوزیشەوە، ساواک ڕاستەوخۆ، نەوەک ڕایەڵەی مەرجەعی شیعە ۸۰٪ی کۆمەکەکەی بەسەر قوتابخانە و ئاخوندە شیعەکانی لوبنان دابەش دەکرد.[٣٣٤]

هەرچەندە کۆمەڵگەی شیعە ئامانجی سەرەکی ساواک بوو، لێ پلانە سەوزەکە ڕایەڵەی پەیوەندی لەگەڵ لایەن و جڤاتەکانی دیکەی بەیروتیش کردەوە. لە بەرەبەرەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی ۱۹٦۰دا، تاران هەڵمەتێکی دژەناسری سەرپێخست. ساواک بڕی ۳۳۰،۰۰۰ دۆلاری ئەمریکی بۆ خەرجی دارایی کەتائیبی مارۆنەکان (کە بە حیزبی کەتائیبیش دەناسرا) و سەرکردەکەیان پیری جمەیل،[٣٣٥] و کەمیل شمعونی سەرۆکی پێشوو و هەروەها بلۆکی نیشتمانی (الكتلة الوطنية) بە سەرۆکایەتی ڕیمون ئەددە خەرجکرد.[٣٣٦]حیزبی داشناک، باڵی ڕاسترەوی حیزبی ئەرمەنییەکانیش کۆمەک کران، ئەمەش دوای ئەوەی ئێران ڕەزامەند بوو لەسەر گەشتی ئاسمانی یەریڤان-بەیروت بەسەر ئاسمانی ئێراندا. ساواک بە ناڕاستەوخۆش کۆمەکی ڕۆژنامە و گۆڤارە دژەناسرییەکانی دەکرد، بەتایبەتیش ئەلحەیات و ستوونووسە ناودارەکەی بە ناوی کەمال مەروە

---

334 Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK (January, 1997) Middle Eastern Studies. 33 (1): 67.

335 Letter from Isa Pejman, reprinted in Alamuti, Mostafa, Iran dar Asr-i Pahlavi [Iran in the Pahlavi Era] Vol.II, Jang-i Qodrat dar Iran [Power Struggle in Iran] (London, 1992) p. 524; Stoakes, The Super vigilantes: The Lebanese Kataeb Party as a Builder, Surrogate, and Defender of the State, (January 1975) Middle Eastern Studies, 11 (1): 233.

336 Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK, (January, 1997) Middle Eastern Studies, 33 (1): 70.

و دە دێیلی ستاریش The Daily Star.[٣٣٧] پارتی سۆشیالیستی نەتەوەیی سووریش (الحزب السوري القومي الاجتماعي)، کە کۆمەکی دارایی لە هاشمییەکانی عێراق وەردەگرت، ئەوانیش کەوتنە بەر ئامانجە لە پێشینەکانی ساواک. لەگەڵ ئەوەشدا شا بەخۆی فەرمانی لادانی لیستەکەی کۆمەکی ساواکی دەرکرد، ئەمەش دوای ئەوە هات کە پارتی سۆشیالیستی نەتەوەیی سوری پشتگیریی ڕوانینی سوریای گەورەتری دوای پێکهێنانی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو کرد.[٣٣٨] پلانە سەوزەکە مژدەی پەیوەندییەکانی ئێران–لوبنانی پێبوو.

**سەدر و تاران**

ناو و ناوبانگی موسا سەدر بە درەنگانێکی پەنجاکان لە قوم وەک گەنجێک، وەک موجتەهیدێکی بەهرەدار گەشایەوە.[٣٣٩] لە کانوونی یەکەمی ١٩٥٧دا، سەید عەبدولحوسێن شەرەفەددین مرد، دەستبەجێش لە لایەن شوێنکەوتووانی شەرەفەددینەوە داوا لە سەدر کرا بچێتە سور (صور). ئەوەی ڕاستی بێ، شەرەفەددین بەر لەمردنی وەسیەتی کردبوو، موسا سەدر جێگەی بگرێتەوە.[٣٤٠] سەید جەعفەری، کوڕەکەی شەرەفەددین داوای لە سەید ڕەزای براگەورەی سەید موسا کرد، بەڵکو قەناعەت بە برا بچووکەکەی بهێنێ تا جڵەوی ڕابەرایەتی شیعە لە سور بگرێتەدەست.[٣٤١]

---

[337] CIA, Intelligence Memorandum: The Arab Threat to Iran, 21 May 1966, in the Declass. Docs. 1988, #3107, LOC, and M. Copeland, The Game of Nations (London, 1969), pp. 246–7.

[338] Little, Douglas. Cold War and Covert Action: The United States and Syria, 1945–1958 (Winter 1990) Middle East Journal, 44 (1): 64.

[٣٣٩] موجتەهید ئەو کەسەیە لە بەرەوپێشبردنی فیقهی شیعەدا لێهاتوو بێ.

[340] Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai [Socio-political Diaries] (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) vol. 1, p. 89.

[341] Interview with Seyyed Hussein Sharaf al-Din (he was Seyyed Abd al-Husayn Sharaf alDin's grandson and Seyyed Musa's brother-in-law. See:

بەگوێرەی قســـــەی ئایەتوڵڵا ســــەید محەمەد عەلی موەحید ئەبتاهی بێ، منداڵەکانی شـــــەرەفەددین لە بۆنەی بەخاکســــپاردنی باوکیان لە نەجەف داوایان لە ســەید موســا کرد، ڕابەرایەتی شــیعە لە باشــووری لوبنان بکا. هەروەهـا ئەوان چوونە قومیش تـا داوا لە ئـایەتوڵڵای گەورە بروجەردی بکەن، بەڵکو ســەید موســا ســەدر بهێنێتە ڕایێ، قایلبێ و بچێتە لوبنان. هەر بەڕاســــتیش زۆرینەی ئـاخونـدە شــــیعەکـانی ئەوکـات پیر و گەنـدەڵ بوون.[٣٤٢] گەورە مەرجەعەکانی دیکەش، بە ئایەتوڵڵا ئەبولقاســــم خوئی و ئایەتوڵڵا موحسین ئەلحەکیم هەروەها شێخ مورتەزا ئەلیاسریش خواستی خۆیـان بۆ ڕابەرایەتیکردنی ســــەدر بۆ شــــیعەکـانی لوبنـان دەربڕی. بروجەردیش پەســەندی کرد و لە کۆتاییدا ســەید موســا ســەدر بۆ لوبنان باریکرد.[٣٤٣]

سەرباری وەسیەتنامەکەی شەرەفەددین، پێدەچوو کۆچکردنی موسا سەدر بۆ باشــــووری لوبنان بەشــــێک بێ لە نەخشـــــەی دیینی گەورە ئایەتوڵڵا بروجەردی. وەک ڕەواترین پیـاوی دینی و دوامەرجەع، کە دەســــەڵاتە دینییەکەی بە پەســــەندنامەی جیهانی شــــیعە بوو، ئەوەبوو بروجەردی ستراتیژێکی نۆژەنکردنەوەی گرتەبەر، بەوەی خوێندکارەکانی بۆ وڵاتەکانی دیکە بنیرێ، بەڵکو فیقهی شــیعە بڵاوبکەنەوە. بۆ ڕاییکردنی ئەم کارەش، لە کۆتـایی پەنجـاکـانـدا مەهـدی حـائری یەزدی نێردرایە وڵاتە یەکگرتووکـانی ئەمریکـا و محەمەد موحەقیقی لەحجی ڕەوانەی هـامبورگ کرا. لەبەرایـیـدا

---

http://www.lakzaee.com/index.php?option=com_content&task=view&id=2135&Itemid=64.

[342] Abtahi was Seyyed Musa's classmate in Hawza Qom. See: http://www.mashreghnews. ir/fa/news/459203.

[343] Interview with Seyyed Hussein Sharaf al-Din (he was Seyyed Abd al-Husayn Sharaf alDin's grandson and Seyyed Musa's brother-in-law). See: http://www.lakzaee.com/index. php? option =com_ content &t ask=view&id =2135 &Itemid=64.

بروجەردی نیازی وابوو موسـا سـەدر بە دەسـەڵاتی تەواوی نوێنەرایەتی خۆی بینێرێتە ئیتاڵیا. کەچی سـەید موسـا سـەدر لەگەڵ ئەو داخوازییەی ئـایەتوڵڵای گەورە نەبوو، بەڵکو لەبری ئەوە داوای لە بروجەردی کرد بینێرێتە لوبنان. موسـا سـەدر خۆیشـی بەڵگەوبەندی بەهێزی هەبوو تا لە ئێران بڕوا. ئاخر دوابەدوای کودەتای ١٩٥٣ هاوئاهەنگ لەگەڵ سـی ئای ئەی، مەرجەعی شـیعە عولەماکان بەزۆری ناچارکرابوون لە مەیدانی سیاسەت دابڕێندرێن. بەگرژبوونی کەشوهەوای سیاسی لە ئێران، زۆرینەی عولەمای شیعە شوێنکەوتەی هێڵی سیاسیانەی گەورە ئایەتوڵڵا بروجەردی بوون. چالاکییەکانیان بە تیختیخەدانی خەڵکیش لە دژی بەهائییەکان، تەنیا بە پرسی ئایینەوە سنووردارکرابوو. ئیدی بۆ مەلایەکی گەنج، کەسێک کە سـەری لە سـیاسـەت بخورێ، بەجێهێشـتنی ئێران و ڕابەرایەتیکردنی کۆمەڵگەیەک هەرچەندە دوور و بێدەسـەڵاتیش بێ، دەرفەتێکی قۆزراوە بوو. وێڕای ناڕەزایەتیماڵباتی موسـا سـەدر،[٣٤٤] ئەوەبوو لە ئاخروئۆخری ١٩٥٩دا موسا سەدر بۆ س(ص)ور، شارە سەرەکییەکەی باشووری لوبنان باریکرد.

بەگوێرەی گێڕانەوەیەکی دیکە، دیاربوو سـاواک ڕۆڵێکی کلیلئاسـای لەم قۆناغەدا وازیکردبێ. ساواک بە پلانە سەورزەکەوە لە وردەکاری سیاسی ناو لوبناندا زیاتر تێکەڵ بوو، بەتایبەتیش لە باشـوور. دوابەدوای مەرگی شـەڕەفەددین، لە سـەرەتاوە بەختیاری بەڕێوەبەری سـاواک لایەنگیریی یەکێک لە کوڕەکانی شـەڕەفەددینی کرد تا ڕابەرایەتی شـیعەی لوبنان بکا. بە فشـاری سـەید ئەحمەد تەباتەبائی قومی، کە خزمێکی نزیکی سـەدر

---

[344] دیدار لەگەڵ سەید حوسێن شەڕەفەددین (کوڕە گەورەی سەید عەبدولحوسێن شەڕەفەددین و برای هـاوژینی سـەیـد موسـا سـەدر بوو) بڕوانە: http://www.lakzaee.com/index.php?option=com_content&task=view&id=2135&Itemid=64.

بوو،[٣٤٥] بەختیار ڕای خۆی گۆڕی و وای دانا کە موسا سەدر بۆ شیعەکانی لوبنـان ڕابەرێکی گونجـاوە. بەختیـار لە کۆبوونەوەکەی لەگەڵ موســـا ســەدردا، بە کەسـایەتییەکەی کارانگاز بوو. ئیدی بەختیار بە یەک مەرج بە ڕابەرایەتیەکەی ئەو قایل بوو، ئەوەیش ئەوەبوو ســـەدر هاوکاری تاران و مەنســـور قەدەر بکا تا ببێتە "هاوپەیمـانیی ئێران لە لوبنـان."[٣٤٦] هەروەک مەنسور قەدەر گوتی، بە قایلنامەی بەختیار، بروجەردی –کە هەرگیز داوای سـاواکی ڕەتنەدەکردەوە- موسـا سـەدری بە ئیمامی شـاری سـور دانا.[٣٤٧] سـەید حوسـێن نەسـر فەیلەسـوفی گەورەی ئێران گوتی: "موسـا سـەدر ئاژانێکی سـاواک نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی بە بەختیار و سـاواکەوە هەبوو. ســـەدر بە چرای ســـەوزی بەختیار چووە لوبنان."[٣٤٨]بەختیاریش

---

[٣٤٥] ســـەید ئەحمەد تەباتەبائی قومی برابچووکی ئایەتوڵلا ســـەید ئاغا حوســـێن قومی بوو. ئایەتوڵلا حوسێن قومیش لە دوای ئایەتوڵلا سەید عەبدولحەسەن ئیسفەهانی پێش ئایەتوڵلا حوسێن کازیمەینی بروجەردی مەرجەعی سەرەکی شیعە بوو. سەید سەدرەدین سەدری باوکی موسـا سـەدریش زاوای ئایەتوڵلا حوسـێن قومی بوو. مەنسـور قەدەر ئەوەی گوت گوایە تەباتەبائی کوڕە خاڵی دووەم یان سێیەمی موسا سەدر بوو. هەروەها مەنسور قەدەر ئەوەیشـــی گوت، گوایە تەباتەبائی پەیوەندییە تایبەتی بە مەلاکانی شـــیعە و تەیمور بەختیارەوە هەبوو. هەروەها ئەوەشی گوت کە، موسا سەدر خۆی داوای لە سەید ئەحمەد کردبوو تا بەختیار قەناعەت بە بروزوردی بهێنێ بەڵکو ئەو بە ڕابەری شـــیعەکانی لوبنان دابنێن. بڕوانە دیدار لەگەڵ سوپاسالار مەنسور قەدەر:

Oral History, Foundations for Iranian History; Bakhtiar, Chapoir. Ma fidélité (Paris, 1982), p. 217; and Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK, Middle Eastern Studies, vol. 33, No. 1 (January, 1997). p. 72.

346 قەدەر ئەوەی گوت گوایە ســەدر بەنهێنییەوە بۆ ماوەی چوار مانگ لەلایەن سـاواکەوە فێرکراوە. ئەو بڕی ١٥٠٠ لیرەی لوبنـان(٤ ملیۆن تومەنی ئێران)ی. Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

347 Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

348 Interview with Seyyed Hossein Nasr, Baltimour, 24 February 2017.

دەستەبەجێ ڕێنمایی ئامادەکاریی بۆ ڕۆیشتنی سەدر بۆ لوبنان دەرکرد.[٣٤٩] خۆ ئەگەر ئەم گێڕانەوەیەش ڕاست نەبێ، ئەوا ئامادەیی موسا سەدر لە لوبنان دەستکەوتێک بوو بۆ ئێران. دوابەدوای گەڕان و کنجکۆڵی ئێران بۆ ڕۆنانی پەیوەندی ستراتیژی لەگەڵ شیعەی لوبناندا، مجێزبەرزیی سەدر بۆ ڕابەرایەتیکردنی جڤاکی شیعە، پاشخانە لوبنانییە ئێرانییەکەی، پەسەندنامەی شەڕەفەددین، نەخشەی دینیی بروجەردی و پلانە سەوزەکەی ساواک، هەموو ئەمانە ئەوەی لێکەوتەوە، موسا سەدر ئێران بەرەو باشووری لوبنان بەجێبێڵێ.

### ڕابەرە لاوەکە

موسا سەدر بە درەنگانێکی ١٩٥٩ گەیشتە باشووری لوبنان. بەگەیشتنی ئەو بۆ ئەوێ تووشی نارەزایەتی چەند کەسێکی شیعە بووەوە، ئەوانەی پشتی سەید محەمەد حوسێن فەتحوڵڵایان دەگرت تا ڕابەرایەتی شیعە بکا. لەگەڵ ئەوەی نارەزاییەکان دینیی بوون، لێ ڕوخساری سەردەستایەتیی عەرەبییانەیان پێوە دیار بوو، ئاخر ڕەخنەیان لە سەدر هەبوو کە لە ئێران لەدایک بووبوو. هەرچۆنێک بێ کاریزامی سەید سەدر هەر زوو دڵی شیعەکانی بۆ خۆی ڕاکێشا. "سەدر پیاوێکی قۆز بوو... ئەو زیرەک بوو، خوێندنی تەواوکردبوو، پیاوێکی قسەزان و کاریزما بوو."[٣٥٠] پیاوێکی باڵابەرزی شەش پێ و شەش ئینچ، ڕووخسار جوان، چاوکەسکی تیژبین، "پیاوی خوایی" هاوچەرخ، ئەوکەسەی بە عەرەبی و فەرەنسییەکی جوان دەئاخاوت، چارەنووسی وای هێنا ناسنامەی بەکۆمەڵی شیعە لە لوبنان ببووژێنێتەوە.

شیعە لە بن باری هەژاری و پاشکەوتووی دەیانناڵاند. ئەوان لەبارەی ناسنامەی سیاسییانەی تایبەت بە خۆیان هەروەک دەسەڵاتی سیاسی و

[349] SAVAK Documents, No. 231/466, 10 September 1957.

[350] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

زێدەمافەکانیان کورتهێن بوون. وێڕای زیادبوونی ژمارەیان، کەچی داواکانیان بۆ پلەوپایەی زیاتر لە دارشتنی بڕیار و ناسنامەی نیشتمانیی لوبناندا پشتگوێخراو بوو. لەو بەرڕەوتەدا بوو موسا سەدر بانگی بۆ چەوساوە و بەشمەینەتییەکانی کۆمەڵگەکەی ڕادەهێشت. ئەو دەستی بە دامەزراوەییبوون کرد. بەپێچەوانەی زۆر لە مەلا نەریتخوازەکان، "ئەو پیاوێکی منەوەر بوو،"[٣٥١] کەسێک "باوەشی بۆ تەکنەلۆژیای هاوچەرخ کردەوە و لە هەردوو شت، لە هێز و ڕای گشتیی گەیشت و ئامرازەکانیان گەیشت کە چۆن جیهانی نوێی پێ جۆشدەدرێ."[٣٥٢] ئەو دەرسی زمانی فارسی و چەندین دەرسی لەبارەی ئێران لە قوتابخانەی عاملی، فیقهـ لە قوتابخانەی ئەلقاسیدی سوننی و فەلسەفەی ئیسلامی لە زانکۆی شیینت یوسف لە بەیروت گوتەوە. هەروەها ئەو دامەزراوە دینیی و دەزگا خێرخوازییەکانیشی وەک جماعة البر و الاحسان (کۆمەڵەی چاکە و خۆشگوزەرانی) ڕۆنایەوە، کە تێیدا منداڵە بێ دایک و باوکەکانی فێردەکردن،[٣٥٣]هەروەها الموسسة الاجتماعیة (دامەزراوەی کۆمەڵایەتی) و هەتیوخانەیەکی شیعەی لە سوور دامەزراند. لە ١٩٦٣ بیت الفتات (ماڵی کچان)، قوتابخانەی پەرستاری و دروومان و معهد الدراسات الاسلامیة (پەیمانگای خوێندنی ئیسلامی) دامەزراند. هەروەها کارخانەیەکی مافوورچنینیشی کردەوە.[٣٥٤] بەگوێرەی قسەی ئیبراهیم یەزدی بێ، "موسا سەدر لە لوبنان زیاتر لە هەزار کیلۆمەتر بە بە ترومبێلەکەی خۆی گەڕا و سەردانی هەموو گوند و شارەکانی کرد تا ڕاستەخۆ لە دەستی یەکەمەوە

---

351 Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

352 Bonnin, Richard, Arrows of the Night: Ahmed Chalabi and the Selling of the Iraq War (Anchor; Reprint edition November 13, 2012) p. 57.

٣٥٣ جەماعەتی ئەلبر وەلئیحسان بۆ یەکەمجار لە لایەن سەید عەبدولحوسێن شەرەفەددین دامەزرا.

٣٥٤ سەید موسا سەدر داوای لە براگەورەی خۆی سەید ڕەزا سەدر کرد، بەڵکو کەرەستەکانی کارخانەکەی بۆ چاکبکاتەوە. بڕوانە http://www.imamsadr.com .

زانیاری لە لوبنانییەکان کۆبکاتەوە."[355] بەرەبەرە لەلایەن بازرگانە دەوڵەمەندەکان و گەنجانی شارستان پشتگیری بیرۆکە نوێخوازییەکان و چالاکییەکانی موسا سەدر کران.

لە بەراییەوە ساواک پێشوازی لەو چالاکییانەی سەدر کرد. بەرنامەی ئەو هەم چارەی پان عەرەبیزم و هەم مارکسیزمیشی لە لوبنان دەکرد، ئەوەش لە ڕێی باشترکردنی پێگەی شیعە بوو تا وایان لێبکا نەچنە ڕیزی حیزبە پان عەرەبییەکان. لە کاتێکدا لە سەرەتاوە بیرۆکەی پان عەرەبیزم وەک بیرۆکەیەکی گشتگر خۆی نیشان دەدا، لێ نەیتوانی سەرنجی کەمینەی شیعە بۆ لای خۆی ڕاکێشی، ئاخر بیرۆکەی نەتەوەیەکی عەرەبی مەزن هەر نمایشێک بوو بۆ زاڵکردنی دەسەڵاتی سوننە. کۆمەڵگەی شیعە بە ناسنامە بەکۆمەڵە بەهێزەکەی خۆی دەکرا هەر وەک هاوپەیمانییەکی "سروشتکرد"ی ئێران، بەوەی لەبەرامبەر هێزی سوننەی پان عەرەبیزمدا پارسەنگێک بێ. بە پێچەوانەی کوردستانی عێراق، تاران خۆی لەوە دوورخستەوە چەک و تفاقی سەربازی بداتە شیعەکانی نیشتەجێی کەناراوی دیوی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست، لەبری ئەوە، پەیامەکەی سەدر خۆی دەکرا تەواوکارییەک بێ بۆ پلانە سەوزەکەی ئێران. سەدر پارێزگاری لە پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ باڵوێزخانەی ئێران و ویستگەی ساواک لە بەیروت کرد. لە بەراییەوە پەیوەندی بە ناسرییەوە هەبوو. مەنسور قەدەریش وەهای گوت گوایە "ناسری پیاوێکی توڕەوتوسن و میزاج گەرم بوو، کەچی سەدر پیاوێکی زۆربلێی ماکیاڤیلییانە بوو. کەواتە ئەوان نەیاندەتوانی بەیەکەوە هەڵبکەن."[356] لە سەرێکەوە، بەختیاری مجێزبەرز، ئەو کەسەی نەخشەی ئەوەی هەبوو

---

[355] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

[356] قەدەر ئەوەشی گوت گوایە سەدر لە ڕووی داراییەوە لە لایەن بەختیارەوە کۆمەک دەکرا. ئەم پشتگیرییە داراییە یارمەتی سەدری دا تا وا لە شیعەی لوبنان بکا ببنە ناوەندێک بۆ خۆیان.
Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

دەستەبژێری دینیی و سیاسی لە دەورەی خۆی کۆبکاتەوە، سەدری بە هاوپەیمانێکی بەهێز دانابوو. هەروەک مەنسوور قەدەر گوتی، بەختیار ڕێنمایی دابووە سەدر لە ڕێی پاشاییەوە خۆی بە ئەو گرێبدا و باز بەسەر باڵوێزخانەی ئێرانیشدا بدا. سەدریش لە ٢٠ تشرینی دووەمی ١٩٦٠ تا ٢٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٣مانگانە لە بەیروت لەگەڵ پاشایی کۆدەبووەوە.[357] سەرباری کاریزمایەتییەکەی سەدر، ئەوە پاشایی بوو لە سەرەتاوە پەیوەندییەکانی سەدری بە دەستەبژێری لوبنانی لە بەیروتەوە گرێدا. ئەم پەیوەندییانەش لەنێوان سەدر و پاشاییدا بوونە دۆستایەتییەکی درێژخایەن. بە گوێرەی بەڵگەنامەکانی ساواک بێ، سەدر جەختی لەسەر پاشخانە ئێرانییەکەی دەکردەوە و لە چەندین دوان و وتەی کۆبوونەوەکانیدا ڕێزێکی زۆر مەزنی بۆ ئێران دەربڕیوە.[358]لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز سەدر نەبووە ئاژانێکی نۆکەر بۆ ڕژێمی شا. ئەو لەوە بەئاگا بوو، کە مەودایەک لە دووری ڕژێم وەستاوە و هەرگیزیش ڕاستەوخۆ کۆمەکی دارایی لە تاران وەرنەگرتووە. سەدر هێشتا لەو بڕوایەدا بوو، کە کۆمەکی ڕاستەوخۆ لە شا، دەکرێ وڵاتە هەرێمییەکانی دیکە کۆسپ و تەگەرە بخەنە بەردەم بەرژەوەندییەکانی شیعەی لوبنان. ئاخر لە نێو کۆمەڵگەیەکی پارچەپارچەبووی وەک لوبناندا، پشتگیریی ڕاستەوخۆی ئێران بۆ شیعە دەبووە مایەی دنەدانی ڕکابەرییەکی تێکدەرانە و دەستوەردانی هێزەکان لە لوبنان. لەوەش پتر، دەوڵەتێکی غەیرە عەرەبی دووری وەک ئێران بەو پەیوەندییە ژێربەژێرییانەی لەگەڵ ئیسرائیلدا دەکرا ببێتە هەڕەشەیەک بۆ سەر کۆمەڵگەیەکی پەراوێزخراوی وەک شیعە لە لوبنان. کەچی لەگەڵ ئەو هەموو نیگەرانیانەشدا، هێشتا سەدر پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ ئەفسەرە ئێرانییەکاندا هەر پاراست.

---

[357] amii, Abbas William, Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK (January 1997) Middle Eastern Studies, vol. 33 (1): 73.

[358] SAVAK Documents, No. do231/362, 7 September 1963.

# bibLiography

## *Archival Collections* Iran

Markaz-e Amouzesh va Pajooheshhay-e Beynolmelali-e Vezarat-e Omour-e
Kharejeh [Center of International Research and Education of the Ministry of
Foreign Affairs]

*Published Government Documents*

Hezb-e Democrat-e Kurdestan-e Araq be Ravayet-e SAVAK [Iraqi Kurdistan
Democratic Party according to SAVAK]

Ravabet-e Iran va Araq be Ravayat-e SAVAK [Iran-Iraq Relations According to
SAVAK]

*United States of America*

US National Archives and Records Administration (NARAI), College Park,
Maryland

Central Intelligence Agency Records Search Tool (Crest)

General Records of the Department of State, Record Group 59 (RG59)

Central Foreign Policy Files (CFP), 1967–69

Central Foreign Policy Files (CFP), 1973–76, Access to Archival Databases
(AAD). Available at: http://aad.archives.gov/aad/

Records Relating to Iran, 1965–1975, LOT 77D400

*Congressional Record*

Foreign Relations of the United States (FRUS) (Washington, DC: US Government
Printing Office)

1958–1960

XII: Near East Region; Iraq; Iran; Arabian Peninsula (1992)
1961–1963
XVII: Near East, 1961–1962 (1994)
XVIII: Near East, 1962–1963 (1995)
1914–1968

XXI: Near East Region; Arabian Peninsula (2000)
XXII: Iran (1999)
Public Papers of the Presidents: Dwight D. Eisenhower, 1953. Washington, DC:
US Government Printing Office, 1960.
National Security Archive, George Washington University (NSA-GWU), Washington, DC
Digital National Security Archive (DNSA). Available: http://nsarchive.chadwyck.com/
Electronic Briefing Book (EBB) 265. Available at: http://www2.gwu.edu/~nsarchiv/NSAEBB265/

***Author's Interviews and Correspondence***
Ebrahim Yazdi
Seyyed Hossein Nasr
***Published Interviews***
Foundation for Iranian Studies Oral History Collection (FISOHC)
General Mansur Qadar
Harold Saunders
Harvard Iranian Oral History Project (HIOHP)
Colonel Isa Pej

***Books***
Agwani, M.S., *The Lebanese Crisis: 1958: A Documentary Study* (Bombay, Asia
pub. House, 1965).
Alamuti, Mostafa, *Iran dar Asr-i Pahlavi [Iran in the Pahlavi Era]* Vol.II, Jang-i
Qodrat dar Iran [Power Struggle in Iran] (London, 1992).
Al-Samarrai, Wafiq, *Hottam al-Bawabat al-Sharqi [The Destruction of*

*the Eastern*
*Gate].* translated into Farsi. (Markaz Asnad va Tahghighat-e Defa-e Moghaddas).
Bakhtiar, Chapour, *Ma fidélité*. A. Michel (Paris, 1982).
Chaliand, Gerard, *A People Without a Country: The Kurds and Kurdistan* (Interlink
Pub Group Inc, 1993).
Jawad, Sa'ad, *Iraq and the Kurdish Question: 1958–1970* (London 1981).
Karsh, Efraim, *The Iran–Iraq War: 1980–1988* (Osprey Publishing, 25 April
2002).
Little, D, Cold War and Covert Action: The United States and Syria, 1945–1958.
(Winter 1990). *Middle East Journal,* 44 (1).
McDowall, David, *A Modern History of the Kurds* (London: I.B. Tauris, 2007 ed).

O'balance, Edgar. *The Kurdish Revolt, 1961–1970* (London: Faber and Faber Ltd.,
1973).
Parsi, Trita, *Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the U.S.*
(Yale University Press, 2007).
Qaneifard, Erfan, *Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After*
*Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani]* (Elm Publication, Tehran,
October 2011).
Qaneifard, *Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A*
*Dialogue with Isa Pejman]* (Elm Publication, Tehran, 2011).
Rubin, Avshalom H, Abd al-Karim Qasim and the Kurds of Iraq: Centralization,

Resistance, and Revolt: 1958–63. (2007). *Middle Eastern Studies*, 43 (3).
Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK. (January
1997). *Middle Eastern Studies*, 33 (1).
Stoakes, F, The Supervigilantes: The Lebanese Kataeb Party as a Builder, Surrogate
and Defender of the State. (January 1975). *Middle Eastem Studies*, 11 (1).
Tabatabai, Mohammad Sadeq, *Kahterat–e Siasi Ejtemai [Social Diaries]* (Moassese
Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) vol. 1.
Zubok, Vladislove M., *Spy vs. Spy: The KGB vs. the CIA, 1960–62*, Cold War
International History Project, Woodrow Wilson Center for Scholars, No 4 (1994).

سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لەم ماوەیەدا چالاکتر بوو. کودەتاکەی عێراق لە ١٩٦٣دا بەشـێوەیەکی کاتی بۆ ئێران سـەرکەوتنێک بوو بۆ خۆی. وێڕای سروشتی دژەکۆمۆنستانەی خۆی، ڕژێمی بەعس-عارف لە عێراق بە گەرمییەوە پێی لەسـەر تۆنی دەنگی پان عەرەبیزمدا گرت، دانوسـتانەکانی سـەبارەت بە یەکێتیی عەرەب لەگەڵ ناسـردا بوژاندنەوە و داوای خاکی بەری ڕۆژهەڵاتی یەکاوی عەرەب (ئەروەند ڕود) و پارێزگای خوزستانی ئێرانیشیان کرد. بە پەلاماردانی عێراق لە هاوینی ١٩٦٣[1] بۆ سـەر کوردستانی عێراق، ئیدی ئێران پشتیوانی خۆی بۆ کورد چڕتر کردەوە. سـەرەڕای نارەزایەتی ئاشـکراکەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەژێر ئیدارەی هەردوو سـەرۆک کەنەدی و جۆنسـۆندا، کەچی ئێران لایەنی کوردانی گرت تـا ڕێگربێ لەوەی پـان عەرەبیزم وەک هەڕەشەیەک بۆ خوزستان و کەنداوی فارسی بپەڕێتەوە.

ئێران هاوکات لەگەڵ ئەم پێشـهاتانەدا، پەیوەندییە سـتراتیژییەکانی خۆی لەگەڵ شیعەی لوبنان پاراست، بەو مەبەستەی لە لوبنان قەڵایەک لە دژی ناسر ڕۆبنێ. ئەم پەیوەندییانە ئەوەندە مەحکەم و توندوتۆڵ بوون، تەنانەت پشـتیوانی ناڕاسـتەوخۆی سـەدریش بۆ پشـێویەکانی ١٩٦٤ و ئایەتوڵڵا خومەینی، هەروەک دیداری لەگەڵ بەختیاری بەڕێوەبەری ساواک، سـەری نەکێشـا بۆ گۆڕانکارییەکی گەورە لە سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لوبناندا. بە پێچەوانەوە باڵوێزەکانی ئێران لە بەیروت هاوکاریی تەواوی سـەدریان کرد، سـەدریش ئەوکەسـەبوو، ناو و ناوبانگی وەک بیچمێکی دیاری نیشتمانیی لە شەستەکاندا گەیشتە ئەوپەڕی چڵەپۆپەی خۆی.

---

[1] هێرشەکە ڕێک لە ١٩٦٣/٦/١٠ەوە بوو. وەرگێر.

### ١- هەڵکشان: کوردی عێراق

**مەلا مستەفا گوتی: "کورد لە هەر کوێیەک بژی، ئەوێ ئێرانە."**

**ئیبراهیم ئەحمەدیش لێدوانی دا: "کورد لە هەرکوێیەک بژین، ئێرانین."**

### یەکەمین ڕژێمی بەعس

دوابەدوای کودەتاکەی عێراق لە ١٩٦٣دا، شـا وای بینی پێکهێنانی ڕژێمێکی دژەکۆمۆنیستی لە بەغدا دەکرێ هەژموونی سۆڤیەت لە هەرێمەکە کز بکا. وێڕای هاوکاریی سـەرەتاییانە لەگەڵ عێراق لەبارەی ڕادەسـتکردنەوەی پەنابەرە کۆمۆنیستەکان، کەچی ئەو لە پەیوەندی گەرمی نێوان بەغدا و قاهیرە بەدگومان بوو. ئەوەی ڕاستی بێ، کودەتاکەی ١٩٦٣ پرسی یەکێتیی عەرەبی میسر و عێراق و سوریای ژیاندەوە. بە دانوستاندنی ٢٢ی شوباتی ١٩٦٣ لە نێوان عێراق و میسردا، شـا وەهای خوێندەوە؛ کودەتاکە بۆ ئەوە سـەردەکێشێ دەسـەڵاتی میسرییەکان لە هەرێمەکەدا بەرفرەوان ببێ. ئیدی ئێران زۆر پێویستی بە کوردی عێراق بوو.

وێڕای پێشـوازی بەراییان بۆ کودەتاکە، کەچی هەردوو لایان، چ کورد و چ خەڵکی شیعەی عەرەبزمان لەوە ناڕازی بوون ببنە بەشێک لە "قەوارەیەکی گەورەتری عەرەب کە عەرەبی سوننە تێیدا باڵادەست بن."[2] لەگەڵ گەیشتنی نێردەی عێراقی بۆ دووەمین خولی دانوستان بۆ یەکێتیی عەرەب بۆ قاهیرە، بارزانیش تاڵەبانی بۆ ئەوێ نارد تا جەمال عەبدولناسـر ببینێ.[3] ناسـر یەکێک بوو لەو ژمارە کەمەی سەرکردەی عەرەب، بڕوای بە چارەسەرییەکی ئاشـتییانە بۆ کێشـەی کورد هەبوو.[4] لەگەڵ کودەتاکەی ١٩٦٣دا داوای لە بەغدا کرد بەڵکو سـیسـتمێکی فیدراڵی بۆ عێراق بە چەشـنی یۆگسـلاڤیا و

---

[2] CIA, Office of Current Intelligence, OCI No. 2024/63, 13 June 1963.

[3] SAVAK Documents, No. d/16/12509, 7 February 1961.

[4] لە گەرمەی کودەتاکەی قاسـمدا، جەمال عەبدولناسـر لە ئۆکتۆبەری ١٩٥٨دا بەگەرمی پێشـوازی لە ئیبراهیم ئەحمەد کرد و بەڵێنی دانانی ڕادیۆیەکی پەخشی کوردی پێدا.

یەکێتیی کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەت دابمەزرێنن و ئۆتۆنۆمییەک بدەنە کەمایەتی کورد. تاڵەبانی لە دیدارەکەی لەگەڵ ناسردا پێی لەسەر دۆستایەتی لەمێژینەی کورد-عەرەبدا گرت، لەکاتێکدا مشتومڕی ئەوەی کرد، کاتێ عێراق لەگەڵ میسر و سوریا یەکدەگرێ، ئەوا کورد لە نێو قەوارەی کۆمەڵگەی زۆرینەی عەرەبدا پەراوێزدەخرێ. کەواتە داوای گرەنتی لە قاهیرە کرد تا پشتیوانی لە ئۆتۆنۆمی کوردستان بکا. ناسریش "پشتیوانەیەکی تەواوی لە داواکانی کورد بۆ ئۆتۆنۆمی لەنێو عێراقدا کرد و هیوای خواست بگەنە رێککەوتنێکی پێگەیشتوو."[٥] لەگەڵ ئەوەشدا ناسر لەبارەی روانینی پاکانەئاسای شا، تاڵەبانی ئاگادارکردەوە و پێیگوت: "ئاگادار بە، محەمەد رەزا شا دوژمنی کوردە. ئەو خاوەنی بەشێکی گەورەی خەڵکی کوردە. خۆ ئەگەر ئەو پشتی ئێوە بگرێ، ئەوا لەبەر ئەوەیە ئێوە لە دژی عەرەب بەکاربهێنێ و بگاتە ئامانجی خۆی."[٦] هەروەها داوای لە نێردەی کورد کرد جارێ داخوازییەکانیان بۆ پێکهێنانی حکوومەتی هەرێمی دوابخەن.[٧] کاتێکیش دانوستانێکی دیکە لە ٥ی ئازاری ١٩٦٣دا لەگەڵ بەغدا کرا، پارتی دیموکراتی کوردستان داخوازییەکانی خۆی راگەیاند و داوای لە سەرانی عەرەب کرد دان بە کوردستاندا بنێن وەک "کۆڵەگەی چوارەم، هەرچەندە عێراق پشتی بە دینگەی سێکوچکەی

---

[5] Baghdad 501 to the U.S. Department of State, March 1, 1963 (KPL/NSF/Countries/ Box117a/Iraq.3/63-5/63/doc.2), pp. 1–2.

[6] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 783.

[7] Baghdad 501 to the U.S. Department of State, March 1, 1963 (KPL/NSF/Countries/ Boxes117a/Iraq.3/63- 5/63/doc.2), pp. 1–2; Heikal, Nasser's ghostwriter and editor-inchief of the Al-Ahram, also put emphasis on the peaceful settling of the Kurdish question in the north of Iraq. See Baghdad 774 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 28 April 1963.

فیدراسیۆنی میسر و سوریا و عێراق بەستووە.[8] سەرانی کورد هەڕەشەی ئەوەیان کرد دەست لە دانوستانەکان بەربدەن ئەگەر هاتوو عێراق داخوازییەکانیان ڕەتبکاتەوە.[9] لەگەڵ ئەوەشدا، لەترسی ئەگەری داوای شیعە بۆ ئۆتۆنۆمی وای لە بەغدا کرد هەڵوێستێکی توند لەبەرانبەر کورد بگرێتەبەر.[10] لە ١٠ی ئازاری ١٩٦٣دا، سالّح عەلی سەعدی لێدوانی ئەوەی

[8] لەندەن ١٣٠٥ بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ٢ی ئابی ١٩٦٣. داوا سەرەکییەکانیان پێکهاتووە لە: (١) داننان بە عێراق لەسەر بنەمای دوو نەتەوەی کورد و عەرەب بە مافی هاوشان. (٢) پێکهێنانی حکوومەتێکی ئۆتۆنۆمی هەرێمی بۆ کورد کە لە سلێمانی و کەرکوک و هەولێر و کوردە نیشتەجێیەکانی موسڵ پێکبێ. (٣) دامەزراندنی ئەنجومەنێکی جێبەجێکار لەگەڵ ئەنجومەنێکی قانوندانەر بۆ ئیدارەی هەرێمە کوردییەکە و بەئەندامبوونی سەرکردە کوردەکان لە ئەنجوومەنی شۆڕش. (٤) دابەشکردنێکی گونجاویی پارە و داهاتی نەوت و گومرگە سنوورییەکان لەنێوان کورد و عەرەب و (٥) ئەندامێتی کورد لە حکوومەت بە ڕەچاوکردنی ژمارەی دانیشتوان. بڕوانە :
London to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 8 May 1963.

[9] لە ٨ی نیسانی ١٩٦٣دا جەلال تاڵەبانی لێدوانی دا: "ئەگەر عێراق بیەوێ بچێتە نێو کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، ئەوا پێویستە کورد حکومەتی ئۆتۆنۆمییان بدرێتێ. خۆ ئەگەر عێراق بڕیاریدا بەهاوپەیمانیی گەورەتر لەگەڵ وڵاتە عەرەبییەکانی دیکە بلکێ، ئەوسا کورد دەبێ خاوەن ناسنامەی تایبەتی هەرێمایەتی خۆیان بن. کورد نیازی نییە سەربەخۆ بێ. بڕوانە:
Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani (After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani), Elm Publication, Tehran, p. 710
هەورووەها بارزانیش هەڕەشەی هەڵگیرسانەوەی جەنگی لە بەغدا کرد، مەگەر ڕژێمی عێراق و فیدراسیۆنی عەرەب ئۆتۆنۆمی بۆ هەرێمی کوردی نەپەژرێنن. بڕوانە: See Amman 198/21/2 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 8 May 1963.

[10] CIA, Office of Current Intelligence, OCI No. 2024/63, 13 June 1963
لەگەڵ ئەوەی کورد هەنگاوی نیازپاکی بە بەردانی ١٥٠٠ دیلی عەرەبی گرتەبەر، کەچی ڕژێمی بەعس گیراوە کوردەکانی ئازاد نەکردن و لەبری ئەوەدا ئابلۆقەی ئابووری لەسەر توندتر کردن.

دا، کە عێراق تەنیا بە ئۆتۆنۆمی کەلتوری لەبری ئۆتۆنۆمی سـیاسـی بۆ کورد قـایلە.[11] بەغـدا داوای ئەوەی کرد گوایە زۆر لە هۆزەکـانی کورد نـایـانەوێ ڕەدووی سـەرچڵییە بێ بەرهەمەکـانی بـارزان بکەون.[12] لە ناوەڕاسـتی ئەپریلی ١٩٦٣دا[13]، عێراق و میسـر و سـوریا ڕێککەوتنێکی فەرمییان لەبارەی کۆماری عەرەبی کۆنفیدرالی مۆرکرد، لەکاتێکدا مافەکانی کوردیشـی ناوهێنابوو.[14] هێشـتاش پردی نێوان کورد و بەغدا دورەدەسـت بوو هەڵبیبەسترێ.

### جی ئێف کەنەدی لە بەرانبەر شا

لەو کاتەی شـەڕی کورد لە ١٩٦١دا هەڵگیرسـا، سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بەدژ لە بەرانبەر سـیاسـەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق وەستا. مایەی سەرسوڕمان نەبوو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشـوازی لە ڕژێمی بەعسـی دژەکۆمۆنیسـت کرد. وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو؛ "وەک لێکەوتەی کودەتاکەی عێراق، سـۆڤیەت لەبن باری نسـکۆی عێراق و سـیاسـەتی گشـتییان لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا ناڵاند."[15] باڵوێزی ئەمریکا لە بەیروت ڕایگەیاند؛ "وڵاتە

---

Baghdad 500 to U.S. Department of State, March 1, 1963 (KPL/NSF/Countries/Boxes117a/ Iraq.3/63-5/63/doc.1), pp. 1–3.

[11] ئەلسـەعدی وەک سـکرتێری گشـتیی فەرماندەیی هەرێمایەتی حزبی بەعسـی عێراق دەستڕۆیشتووترین بیچمی سیاسی بوو لە بەغدا.

[12] Amman 276/21/2 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 20 May 1963.

[13] ڕێککەوتنەکە لە ١٩٦٣/٤/١٧دا ڕاگەیەنرا. وەرگێر.

[14] McDowall, David, A Modern History of the Kurds (London, New York 2004) p. 313.

[15] The U.S. Department of State, Bureau of Intelligence and Research, "Implications of Iraqi Coup for Soviet Policy," BSB-25, February 15, 1963 (JKF/NSF/RKF/Box426/Iraq- 1961-63), pp. 1–2.

یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتگیریی ڕژێمی بەعس لە عێراق و سوریا دەکا، چونکە لەسەر هێڵی سیاسەتی دژە کۆمۆنیست دەڕۆن."[16] لە ڕوانگەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، پێکهێنانی فیدراسیۆن عێراق و سوریا و میسری دژە کۆمۆنیستی دەکرێ وەک قەڵایەک لە دژی دزەکردنی سۆڤیەت لە هەرێمەکەدا بکەوێتەکار.[17] ئەمریکییەکان هێشتا لەبارەی ئەنجامە کاولکارییەکانی جەنگی کورد بۆ زەبوونکردنی ڕژێمی عێراقی دژەکۆمۆنیست و هاندانی گرووپە کوردییە جوداخوازەکان لە تورکیا و ئێران نیگەرانتر بوو، کە دەکرا لەلایەن مۆسکۆوە بەکاربهێنرێ.[18] کورد پێشتر داوایان لە کاربەدەستانی ئەمریکا کردبوو، بەڵکو فشار بخاتە سەر بەغدا تا قەیرانەکە بە ئاشتیانە چارەسەر بکا.[19]کەچی داواکەیان گوێی پێنەدرا. مشتومڕی کاربەدەستە ئەمریکییەکان لەسەر ئەوەبوو، گوایە پرسی کورد "بە تەواوی کێشەیەکی ناوخۆیی عێراقە بەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیچ ڕۆڵێکی نە بەڕاستەوخۆ نە ناڕاستەوخۆ تێدا نییە."[20]

پشتیگیریی ئەمریکا بۆ بەغدا ڕێک پێچەوانەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بوو. ئیدارەی کەنەدی فشاری خستە سەر ئێران تا دەستوەرنەداتە سەختانگەکە، هۆشداری دایە ئێران بەوەی "دەستی خۆی

---

16 Jeddah 1249 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 10 August 1963.

17 CIA, "The Soviet Role in the Arab World," DNSA, Soviet Estimate Collection, Item Number: SE00382, 6.

18 (FRUS, 1961–1963, Vol. XVIII, Near East, 1962–1963, p. 674); and CIA, "The Soviet Role in the Arab World," DNSA, Soviet Estimate Collection, Item Number: SE00382, 5.

19 Baghdad 500 to the U.S. Department of State, March 1, 1963 (KPL/NSF/Countries/ Boxes117a/Iraq.3/63- 5/63/doc.1), pp. 1–3.

20 The U.S. Department of State CA-9411 to Certain Posts, "Interim Policy Guidelines for Dealing with Iraq and with the Implications for the Middle East of the Recent Iraqi Coup," March 2, 1963 (FRUS/1961-63/XVIII/doc. 174), pp. 382–389.

لە سـەر عێراق هەڵبگرێ". کاربەدەسـتە ئەمریکییەکان مشـتومڕی ئەوەیان بوو، کەوا سـیاسـەتی شـا لە بەرانبەر کوردی عێراقدا ئەوەندە "کورتبینە"، دەکرێ 'لەگەڵ بەرژەوەندیی ئاسـایشـی هەمەلایەنەی ئێران ناحەز بێ."[21] هەروەها ئەوان هۆشـداریيان دایە شـا بەوەی "دوورکەویتەوە لەوەی لەوانەیە ببێتە زۆنگاوێکی سـیاسـی و سـەربازیی بۆ وڵاتێکی بێگانە."[22] هەرچەندە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ژێربەژێر چەکی دەدایە سـوپای عێراقی،[23] کەچی شـا پشـتگیریی ئێرانی بۆ کورد چڕترکردەوە بۆ ئەوەی سیاسەتی ئەمریکا بنکۆڵ بکا.

لەگەڵ بەرایی حوزەیرانی ١٩٦٣دا، دوا خولی دانوسـتانی عێراقی-کورد، بەتایبەتیش لەبارەی کەرکوکی دەوڵەمەند بە کانە نەوتییەکان، گەیشـتە بنبەسـت. لەگەڵ ئەوەی عەبدولسـەلام عارف مەیلی لێبوو قەیرانەکە ئاشتییانە چارەسەر بکا، بەڵام سەرۆوەزیری بەعس، ئەحمەد حەسەن بەکر ڕێککەوتنێکی ئاشـتی لەگەڵ بارزانی بۆ قوت نەدرا، ئاخر ئەو ئاژاوەی بەعسی ١٩٥٩ لە موسڵ سەرکوتکرد. کاتێکیش مۆسکۆ بەرەبەرە پشتی کوردانی گرت و ڕادیۆیەکی دژەبەعسی لە کوردستانی عێراق پەخشکرد، ئیدی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێیوابوو "شـکسـتهێنان لە چارەسـەرکردنێکی سـیاسـییانە بۆ کێشـەی کورد تەنیا لە بەرژەوەندی سـۆڤیەتییەکان و شـیوعییەکانی عێراق دایە."[24] دیاربوو بارزانیش بە

[21] White House, Memorandum, Saunders to Bundy, April 2, 1963 (JKF/NSF/RKF/ Box426/Iraq-1961-63-White House Memoranda, p. 1.

[22] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[23] SAVAK Documents, No. 1083, 28 July 1963; Komer to Bundy, March 1, 1963, FRUS 1961–1963, XVIII, 305.

[24] The U.S. Department of State CA-9411 to Certain Posts, "Interim Policy Guidelines for Dealing with Iraq and with the Implications for the Middle East of the Recent Iraqi Coup," March 2, 1963 (FRUS/1961-63/XVIII/doc.174), pp. 382–389.

دانوســـتانەکان قایل بوو، داوای لەبەغدا کرد بەڵکو ڕژێمێکی یەکگرتووی نیشـتمانی لە هەردوو گرووپی چەپ و ڕاسـت پێکبهێنرێ، بە گوێرەی ڕای تاڵەبانیش ئەم خواسـتە دژی پێواژۆی ئاشـتی بوو.[٢٥] لەو نێوەشـدا، هێزە چەکدارەکانی عێراقی جۆشـدرانەوە و بنکەوبنەیان لە ناوچەی کوردسـتان دامەزراند. هێزی ئاسـمانیش بە شـێوەیەکی بەرچاو بەهێز کرا.[٢٦] لە ٥ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا، هێزەکانی بەعس سـولەیمانییان گەمارۆدا و حوکمی عورفیان چەسـپاند. لەبەرانبەریشـدا، کورد هەڕەشـەی تەقاندنەوەی هێڵی لوولەکێشی نەوتیان کرد.[٢٧]بەم جۆرە جەنگ دەبوو هەر بقەومێ.

## یەکەمین شەڕی بەعس –کورد

لە ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا، بەغدا بە هێزێکی ٤٥٠٠٠ سـەربازەوە، کە دەیکردە نزیکەی دووسـێیەکی سـوپای عێراق، هێرشـی کردە سـەر کوردسـتان.[٢٨] کاتێکیش بۆمباردمانی خەسـتی بۆسـەر گوندەکان دەسـتپێکرد،[٢٩] ڕادیۆی بەغدا پێشـمەرگەی کوردی بە شـیوعی و جیاخواز ناوزەدکرد.[٣٠] هێزەکانی بەعس دەسـتەبژێری کوردیان لە بەغدا گرتن،[٣١] و دوا هۆشـداریشـیان دایە کورد تا خۆیان بەدەسـتەوە بدەن، هەروەها پاداشـتی ٢٨٠،٠٠٠ دۆلاریشـیان بۆ ئەو کەسـە ڕاگەیاند، کە بارزانی

---

[25] SAVAK Documents, No. 234/0876, 24 August 1963.

[26] CIA, Office of Current Intelligence, OCI No. 2024/63, 13 June 1963.

[27] Kuwait 1897 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 6 July 1963.

[28] CIA, "Iraq-Kurdish Rebellion," OCI No. 2024/63, June 13, 1963 (KPL/NSF/Countries/Box117a/Iraq.6/63- 8/63/doc.7), p. 2.

[29] CIA, Office of Current Intelligence, OCI No. 2024/63, 13 June 1963.

[30] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 720.

[31] London 1305 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 2 August 1963.

بکوژێ.[٣٢] ســــەرۆک عارفیش گوتی: "بەم زووانە یاخیبوونی کورد کۆتایی پێدەهێنرێ. ئـاخر چیدی لەوان نـابوورین."[٣٣] لەو نێوەشــــدا ڕۆژنـامەی ئەلجمهوریەی عێراقی هێڵی بەژێر پەیوەندییەکانی کوردی-شــیوعیدا داهێنا و دزەکردنی سۆڤیەتی بۆ ناو عێراق شەرمەزارکرد. ڕۆژنامەی ئەلشەعبیش بارزانی بەوە تۆمەتبارکرد گوایە "ئیمپراتۆریەتێکی نەوتی" لە باکوری عێراق پێکهێناوە.[٣٤] لە هەمان کاتیشدا بەغدا هۆزەکانی دژەبارزانی تاودەدا.[٣٥] بەغدا چاوەڕێی ســــەرکەوتنێکی ئاســــان بوو.[٣٦] کەچی شــــتەکە تراویلکە بوو. بەگوێرەی ڕۆژنــامەی ئەلمەنــار؛ "ئەوە گوتراوە مێژوو خۆی دووبــارە دەکاتەوە؛ کەچی لە عێراق پێدەچێ ئەم شتە بە بەردەوامی ڕوویدا."[٣٧]

جەنگی کوردی ١٩٦٣ کەلێنی نێوان هێزە عێراقییەکانی ناســــرپەروەر وەک حیزبی حەرەکەت لەلایەک و حیزبی بەعس لەلایەکی دیکە بەرفرەوانتر کرد. هەرچەندە حزبی بەعس لە ســــەرەتادا لە لایەن ناســــرەوە پشــتی دەگیرا،[٣٨] کەچی ئەوان هەرگیز بەتەواوی پشــتی یەکگرتنی ســیاســییان لەگەڵ قاهیرە

---

[32] New York 514 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 14 June 1963.

[33] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 720.

[34] Baghdad 1788 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 19 June 1963.

[٣٥] لەنێویاندا خێڵی زێباری بە ســــەرۆکایەتی شــــێخ مەحمود زێباری، خێڵەکانی زاخۆ بە ســەرۆکایەتی شــەمدین ئاغا و مەزنی نەقشــبەندییەکان وەک شــێخ مەسـعود نەقشــبەندی و شــێخ جەلالەدین بریفکانی. Baghdad 1639 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 13 June 1963.

[36] Baghdad 854 to the U.S. Department of State, June 10, 1963 (KPL/NSF/Countries/ Box117a/Iraq.6/63-8/63/doc.3), pp. 1–3.

[37] Amman 438/28/2 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 16 June 1963.

[38] Al-Samarrai, Wafiq, Hottam al-Bawabat al-Sharqi [The Destruction of the Eastern Gate] translated in Farsi, (Tehran, Markaz Asnad va Tahghighat-e Defa-e Moghaddas) p. 36.

بە ڕابەرایەتی ناسـر نەدەگرت.[٣٩] کەواتە حزبەکانی بەعس لە سـووریا و عێراق زۆرینەی ڕۆژنامە ناسرپەروەرەکانیان سنووردارکرد و توخمەکانی ئەوانیان لە نێو حکومەت و سـوپاتا پاکتاو کرد.[٤٠] قاهیرەش لە تۆڵەکردنەوەدا، پڕوپاگەندەیەکی توندی لە دژی بەغدا کرد.[٤١] لە کاتێکدا ڕژێمی بەعس کوردستانی بە "ئیسرائیلێکی نوێ" وێناکرد، بەوەی گوایە پلانێکی "ئیمپریالیزم و کۆمۆنیزم و زایۆنیزمە" و وبارزانیش وەک "ئاژانێکی ئەوان" سـەرۆکایەتی دەکا تا "یەکێتیی عەرەب ڕابگرێ،" کەچی قاهیرە ڕایگەیاند، حزبی بەعس "تاوانبارێکی جەنگە" لە دژی کورد.[٤٢] هەرچەندە پشـتیوانی ناسـر بۆ کورد "لێبڕاوانە نەبوو"،[٤٣] کەچی بیرۆکەی یەکگرتنی عێراق لەگەڵ میسر بە جەنگی هەڵگیرساو لەگەڵ کورد وردوخاش بوو. لە

---

[٣٩] ئەو جاڕنامەی دوای کۆبوونەوەی سـەرانی عەرەب ڕاگەیەنرا دەسـەلاتێکی بێ ڕکابەری دایە جەمال عەبدولناسری سەرۆکی پێشبینکراوی فیدراسیۆنی عەرەب. محەمەد حەسەنێن هەیکەلیش جەختی لە "فەرماندەیی یەکێتیی سـیاسـی" لەژێر ڕابەرایەتی ناسـر کردەوە و هاوپەیمانێتی هەڵکشـاوی نێوان "ئیمپریالیزم و ئیسـرائیل لە دژی "یەکێتیی عەرەب" بە ئالا سـێ ئەسـتێرەکەی" ڕوونکردەوە. Baghdad 774 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 28 April 1963. بە پێچەوانەشـەوە سـەرانی بەعس ڕابەرایەتی تایبەتی ناسـر و هەژموونی ئەویان بەسـەر عێراق و سـوریا و ئەگەری ئوردنیش هەبوو ڕەتکردەوە. شـا حوسـێن قایلنامەی خۆی بۆ چوونە ڕیزی فیدراسـیۆنی عەرەب دەربڕی بە مەرجێک هەر ئەندامێکی ئەو فیدراسیۆنە هاودەسـەلات بێ. سـەرانی بەعسیش داوای سـەرکردایەتییەکی هاوبەشیان دەکرد کە لە بڕیاردارشتندا هاوشان بن.

[40] London 1305 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 2 August 1963

[٤١] ناسر ئاماژەی بەوە دا: "دۆستایەتی بەعسی فاشت شتێکی مەحاڵە." بڕوانە:
See Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 722.

[42] Baghdad 1626 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 12 June 1963.

[43] SAVAK Documents, No. 311-2-v-791, 26 May 1963; London to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 13 June 1963; SAVAK Documents, No. 311-2-v-791, 25 July 1963.

وەرچەرخانێکی مێژوویی بێ وێنەدا، ئێران لەبارەی پشـــتگرتنی کورددا لایەنی دوژمنە هەرێمییەکەی خۆی گرت.

لەو نێوەدا، بەغدا بۆ بوژاندنەوەی یەکێتیی عەرەب لە ڕژێمی بەعســـی دیمەشق نزیکبووەوە. سەرۆکوەزیری سوریاش، سەلاحەددین ئەلبیتار بەڵێنی هاوکاری ســـەربازی لە دژی یاخیبووانی کورد بە عێراق دا.[٤٤] ئەگەری کشـــانی کەمایەتی کورد و دۆزینەوەی کانە نەوتییەکان لە پارێزگا کوردنشـینەکانی جزیرەدا دیمەشـقی هێنایە سـەر ئەو قەناعەتە بەشـداری جەنگی کورد بکا.[٤٥] **دیمەشق فڕۆکەی جەنگی و ترومبێلی زرێپۆش و ٦٠٠٠ ســـەربازی ڕەگەڵ شـــالاوی ســـەربازییانەی عێراق خســـت تا دژی کورد بوەســـتنەوە.** وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێرانیش بڕوای وابوو، ئەم هاوکارییە یەکێتیی عێراق-سوریا بسازێنێ.[٤٦] **سوپای عێراقی بە پشتیوانی دیمەشـــق درندانە لادێی کوردی وێران کردن و خەڵکی مەدەنی کوردی قەتڵوعام کردن.**[٤٧] بە هاتنی مانگی ئەیلوولی ١٩٦٣ش، ســـوپای عێراق زۆرینەی بەشی کوردستانی عێراقی گرتەوە، بە بارزان و سلێمانیشەوە.[٤٨] لەگەڵ ئەوەشـدا، نەخشـەی سـوپا بۆ سـەرکوتکردنی پێشـمەرگە لە ماوەی چەند هەفتەیەکی کەمدا سـەلماندی کە شـتێکی ناڕاسـتە. "تێچوونی شـالاوە درێژخایەنەکە"ی سـەر کوردستان کەلێنی جیاوازیی نێوان کورد و عەرەبی بەرفرەوانتر کرد.[٤٩] بە هاتنی هاوینی ١٩٦٣، جەنگی کورد بووە پرســـی سەرەکی هەرێمەکە.

---

[44] Baghdad 1639 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 13 June 1963.

[٤٥] لە ٢٣ی ئابی ١٩٦٢دا، حکومەتی ســـوریا لە دژی کورد ئامارێکی تایبەتی بە ســـەرژمێری خەڵکی جزیرە کرد.

[46] London to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 25 September 1963.

[47] London 1305 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 2 August 1963.

[48] McDowall, David, A Modern History of the Kurds (London, New York 2004) p. 315.

[49] CIA, Office of Current Intelligence, OCI No. 2024/63, 13 June 1963.

مۆســـکۆش لەو نێوەدا بە پشـــتیوانی کردنی کورد هەڕەشـــەی لە بەغدا دەکرد.[50] دوای پەلامـاردانی کوردســـتـان، ڕووســـەکـان پڕوپـاگەنـدەی دژەبەعســـیيان چڕترکردەوە و یارمەتی دابینکردنی چەک و جبەخانەیان بۆ بەغدا هەڵپەســـارد.[51] ســـەرانی حزبی شـــیوعی عێراقیش لایەنی کوردیان گرت.[52] بـارزانیش لە بەرانبەردا، ڕێگەی بە شـــیوعییەکـان دا بچنە کوردستان.[53] سۆڤیەت لە ٦ی حوزەیرانی دا بە فەرمی پشتگیریی خۆی بۆ کوردان ڕاگەیاند،[54] فشاریان خستە سەر ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان تا لە جەنگی کورد بکۆڵێتەوە و تاوانی جینۆســـایدکردنی دایەپاڵ بەغدا.[55] ئەو جووڵەیەی ڕووس وای لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد پشتگیریی خۆی بۆ بەغدا چڕتر بکاتەوە. ئیدی لەبەر ئەم بەرڕەوتەدا بوو کە ئەمریکا داوای کوردانی ڕەتکردەوە بەوەی فشـار بخاتە سـەر بەغدا بەڵکو شـەڕەکە ڕابگرێ.[56] بە هـاتنی پایزی ١٩٦٣ش، جەنگی کورد بووە گۆڕەپانی جەنگی سـارد.

---

[50] New York 564 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 21 June 1963.

[51] London 1305 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 2 August 1963; CIA, "Moscow Turning Against Baathist Regime in Iraq," Current Intelligence Weekly Summary, June 28, 1963 (JKF/NSF/RKF/Box426/Iraq-1961-63/doc.23), p. 9.

[52] ئەنوەر مستەفا ئەندامی پلەباڵای حیزبی شـیوعی عێراقی بە توندی پشـتی کوردی گرت و لەبارەی "تاوانی قەتڵوعامی خەڵکی بێتاوانی کورد" دابەزییە سەر بەغدا.

Paris 36 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 7 July 1963.

[53] SAVAK Documents, No. 313/38548, 19 December 1963.

[54] London 1305 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 2 August 1963.

[55] On July 27, 1963, Outer Mongolia, one of the Soviet satellites, asked the UN. See USUN 12 to the U.S. State Department, July 2, 1963 (KPL/NSF/Countries/Box117a/ Iraq.6/63–8/63/doc.21), p. 1.

[56] Tabriz 1 to the U.S. Department of State, July 24 (KPL/NSF/Countries /Box117a/ Iraq.6/63–8/63/doc.31), pp. 1–2; and Tehran A-67 to U.S. Department of State, "Mullah Mustafa Barzani's Letter to President

ئێران بە پێچەوانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بە چاوی هەرێمایەتی لە شـــەڕی کوردی دەڕوانی نەوەک وەک جەنگی ســـاردیی نێودەوڵەتی. هەڵگیرســانەوەی شــەڕەکە ئامرازێکی ســەرەکی ئێران بوو تا هەڕەشــەی هەرێمایەتی پان عەرەبیزم لەجێی خۆی ڕابگرێ و بەرزەفتی بکا. لە بەرایی مانگی ئەیلوولی ١٩٦٣دا بارزانی چووە تاران تا بۆ یەکەمین جار چاوی بە شـا بکەوێ و داوای پشـتگیریی جەوهەریانەی زیاتری لێکرد. (شـا)ش قایل بوو، فەرمانی بە ساواک کرد خۆی کۆبکاتەوە و کۆمەکی کوردان بکەن. لە ١٦ی ئەیلوولدا، پاکرەوانی بەڕێوەبەری ســاواک چاوی بە یۆلیۆس هۆلمزی باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران کەوت و داوای لێکرد ڕوانینی شـــا بۆ کورد لەبەرچاوبگرێ. بەگوێرەی شـــا هەروەک پاکرەوان لێدوانی دا، ئامانجی ســەرەکی بارزانی ئەوەبوو؛ "ئۆتۆنۆمییەکی سنووردار" بەدەستبێنێ نەوەک "کوردســتانێکی ســەربەخۆ" و ســەرکردەی کوردیش پێیباشـتر بوو لەگەڵ بەغدا بکەونە دانوســـتان؛ هەربۆیە دەکرێ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گرەنتییەکی بەهێز بداتە کورد تـا قەنـاعەتیـان پێبهێنێ بەوەی شــــەڕەکە ڕابگرن.[٥٧] بەڵێ بە ئاگابوون لەوەی هۆکاری ئەمریکا بۆ پشـــتگرتنی بەغدا بەوەی ســـروشـــتی ڕژێمی بەعس دژە کۆمۆنیســـتە،[٥٨] بۆیە شـــا دڵنیا بوو لەوەی ڕۆڵی چارەنووسسازانەی ئەو لە هاوپەیمانیی ئەمریکا-کورد، وێنەی بارزانی لە بووکەڵەیەکی ڕووســـی بۆ هەڵپەرســـتێک دەگۆڕێ.[٥٩] ئەوەش یەکەمین جار بوو تاران بە فەرمی لەبری کورد بە کردەیەکی دیپلۆماســـی ڕاببێ.

Kennedy," letter attached, July 30, 1963 (NARA/ RG59/CFPF/ Box3944/ POL- 13-Non -Party Blocs [Iraq] 2/1/63), pp. 2–3.

[57] Tehran 276 to U.S. Department of State, September 17, 1963 (KPL/NSF/Countries/ Box117a/Iraq.9/63- 11/63/doc.8), pp. 1–3.

[58] SAVAK Documents, No. 1106, 30 July 1963.

[59] White House, Memorandum, Komer to Bundy, June 19, 1963 (KPL/NSF/Countries/ Box117a/Iraq.6/63- 8/63/doc.12), p. 1.

لەگەڵ ئەوەشـــدا داوای شـــا لەم بارەیەوە لە لایەن ئیدارەی کەنەدییەوە ڕەتکرایەوە. وەزارەتی کاروباری دەرەوە ڕێنمایی دا، "پشکی چارەنووسساز لە هەر سیاسەتێک سەبارەت بەو پنتە پێویستە لێدان بێ لە شا."[٦٠] هەروەها باڵوێزی ئەمریکاش لە بەغدا لەبارەی پشـتگیری ئێران بۆ کورد هۆشـداری دایە باڵوێزی ئێران لە بەغدا.[٦١] کەچی شـا ئەم شـتەی لەبەرچاو نەگرت و لەسەر دابینکردنی "پشتگیریی سنووردار بۆ کورد" بەردەوام بوو.[٦٢] ساواک بەشی سەرەکی چەکەکانی لە ئەورووپاوە ئامادەکراو بۆ کوردستانی عێراقی گواسـتەوە.[٦٣] وێڕای ئاسـانکاری بۆ بۆ کۆمەکی ئیسـرائیلی بۆ دابینکردنی خۆراک بۆ کورد،[٦٤] ئێران وێسـتگەیەکی ڕادیۆی بۆ کورد لە ئـاڵمـانەوە کڕی،[٦٥] دواتر بەقاچاغ ئاودیوی کوردســتانی عێراقیان کرد و بە ئامرازی نوێی هاوچەرخەوە لە ئەشـکەوتێکی بەرینیان دامەزراند.[٦٦] بە چاودێری عیسا پژمان و عیسا زەبیحی ڕادیۆی ئازادی پارتی دیموکراتی کوردستان کە لەنێو خەڵکی کورد بە ڕادیۆی ساواکیش ناسـراو بوو، پڕوپاگەندەی لە دژی بەغـدا بڵاوکردنەوە.[٦٧] زۆر لە ڕاگەیەنراوەکـانی پـارتی دیموکراتی

---

[٦٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[61] SAVAK Documents, No. 234/535, 30 September 1963.

[62] CIA, Office of Current Intelligence, OCI No. 2024/63, 13 June 1963.

[63] CIA, "Iran Increases Clandestine Support of Kurds in Iraq," Central Intelligence Digest, October 7, 1963 (JKF/NSF/RKF/Box426/Iraq. Kurds-1961-63/doc.1), p. 1.

[64] SAVAK Documents, No. 1540, 2 October 1964.

[65] Beirut 236 to U.S. Department of State, September 13, 1963 (KPL/NSF/Countries/ Box117a/Iraq.9/63- 11/63/doc.4), p. 2.

[٦٦] SAVAK Documents, No. 313/38548, 29 November 1963. (ئەوەی ڕاسـتی بێ ئێزگەی دەنگی کوردسـتان لە ٢٠ی ئابی ١٩٦٣دا لە گوندی گردەڕەش لە ناوچەی ماوەت پەخشـی خۆی کرد .وەرگێڕ)

[٦٧] لە بەراییەوە ناوی ڕادیۆکە "دەنگی کوردستان" بوو. لە ترسی گەلی کورد لە هەردوو دیوی تورکیا و ئێران، شـا و ژەنەڕاڵ پاکرەوان ئەو ناوەیان ڕەتکردەوە. بەم جۆرە ناوەکەی گۆڕا و بۆ ڕادیۆی ئازادی پارتی دیموکراتی کوردستان بروانە:

کوردســـــتان لەبن چاودێری ســـــاواک لە باڵوێزخانەی ئێران لە بەغدا بڵاودەکرانەوە.[٦٨] لە هەمان کاتیشــدا، ئێران چاوی لە ئاودیوبوونی کوردانی ئێران بە سنووری عێراقدا پۆشــی.[٦٩] هەر بەڕاسـتیش، بەرگریی بارزانی لە دژی سـوپای عێراق جورئەتی دایە بەر کوردانی ئێران، بەتایبەتی ئەوانەی مهاباد تا بچنە ڕیزی پێشـــمەرگە و لە دژی بەغدا بجەنگن.[٧٠] بە هاتنی هاوینی ١٩٦٣ شـۆڕشـی کورد بووە توخمێکی سـەرنجڕاکێشـی سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران.

## ناگربڕەکەی کوردی عێراق لە ١٩٦٤

لەوکاتەی شـــەڕەکە خەریکبوو لەدەســـت دەربچێ، ململانێی دەســـەڵات لە بەغدا لەبارەی پرســـــی یەکێتیی عەرەب تیرتر بوو. لەکاتێکدا ئەلســـــەعدی پشــتی یەکگرتنی لەگەڵ ســوریادا دەگرت، کەچی ئەحمەد حەســەن بەکری سەرکۆمار لەگەڵ یەکگرتندا بوو لەگەڵ ناسر. لە کۆتاییدا ئەم بەریەککەوتنە وای لە عارف کرد لە کودەتای ١٨ی نۆڤێمبەری ١٩٦٣دا بەعســـییەکان ڕابماڵێ.[٧١] ڕوخانی حکومەتی بەعس وای لە عارف کرد هێڵی گرژ و فشــار

---

Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 132.

[68] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 132.

[69] SAVAK Documents, No. 331/15417, 10 July 1963; SAVAK Documents, No. 423/3438, 4 November 1963.

[70] SAVAK Documents, No. 311/2-d/1476, 7 July 1963.

[71] عەبدولســەلام بە یارمەتی براکەی ســەرتیپی سـوپا عەبدولڕەحمان عارف، بەعســییەکانی ســەرکوت کردن و میلیشـیای حەرەســی قەومی تێکشـکاندن و بارەگاکانیانی بۆمباباران کرد. CIA, "Military Activity and Possible Coup," November 18, 1963 (KPL/NSF/Countries/Box117a/Iraq. 9/63-11/63/doc.63), p. 1.

لەبارەی کێشـــەی کورد خاوبکاتەوە. بە قەناعەتپێهێنانی ناســـر و ئەحمەد بنبێلای سـەرۆکی جەزائیر، ئەوەبوو عەبدولسـەلام عارف خولی دانوسـتانی لەگەڵ کورددا گرِدایەوە. ئەو داوای لە سـوپای سـوریا کرد، کوردسـتانی عێراق جێبهێڵن. بە مەبەسـتی باڵکێشـبوون بەسـەر کوردسـتان لەبری شـــەڕوشـــۆڕی خوێناویی لەگەڵ بەغدا، بارزانیش پێشـــوازی لە نیازپاکیی عارف کرد.[٧٢] بارزانی وەها لێدوانی دا: **"ئێمە دەبێ شەڕەکە ڕابگرین... ئاخر عارف [موسـڵمانێکی] ئیمانداره و پێویسـته بڕواش به ئیمانداران بکرێ."[٧٣]** بارزانی بە پێچەوانەی پێشـبینییەکانی سـاواک، لە ١٠ی شـوباتی ١٩٦٤دا ڕێککەوتننامەی لەگەڵ عارفدا واژۆکرد. هەرچەندە ئاگربەسـتەکە ئۆتۆنۆمی بۆ کورد تێدا نەبوو، هەروەها لەبری "کوردسـتان" دەسـتەواژەی "ناوچەی باکوور"ی نەرمونیانی پانعەرەبیزمی تێدابوو، کەچی بارزانی پەسـەندی کرد و شـاڵاوێکی دڵڕەقانەشـی لە دژی حیزبی شـیوعی عێراقی سـەرپێخست.[٧٤] بارزانی ئەوەشـی گوت گوایە: **"دەوڵەتی عێراق وەک باوکێک وایە کە بیر لە دوارۆژ و پێشـــخســـتنی ماڵ و منداڵەکانی دەکاتەوە."** هەروەها پەسـنی

---

[72] پێدەچوو عـارف بەر لە کودەتاکەی لەگەڵ بـارزانی لە پەیوەندیدا بێ، داوای لێکردبوو درێژە بە شەڕی بەعسییەکان بدا: Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. Qaneifard, Erfan, *Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani]* (Elm Publication, Tehran) p. 768. 873.

[73] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 768.

[٧٤] ئاگربەسـتەکە بە شـێوەیەکی بەشـەکی دانی بە مافەکانی کورد دانا کە پێکهاتبوو لە مافە زمانی-کلتوورییەکان لەنێو عێراقێکی یەکگرتوو، هەڵگرتنی ئابڵوقەی ئابووری و ئازادکردنی گیراوەکان. SAVAK Documents, No. 316/16041, 7 July 1964.

ناسـریشـی دا و گوتی کە کورد "ئامادەیە [بۆ ڕەگەڵکەوتن لەگەڵ ڕژێمە عەرەبییەکانی هەرێمەکە] بۆ شەڕکردن لە دژی ئیسرائیل."[٧٥]

لەگەڵ ئاگربەسـتی ١٩٦٤دا، دیپلۆماتەکانی ئەمریکی لە بەغدا پێزانینیان بۆ بارزانی هەبوو بەوەی "ئاوەزمەندانە بەرگەی دنەدەرییە هیچوپووچەکانی ئێرانیـان گرت" و داوایـان لێکرد بەڵکو "ئـارام بگرێ و هەوڵبـدا لەگەڵ حکومەتەکەی عێراق کار لەسـەر چارەسـەرێک بکەن."[٧٦] بەپێچەوانەوە ئاگربەستەکە شای ئێرانی هێدمەگرتی کرد. کوردی عێراق وازیان لە تاران هێنـا و لای عـارفی نـاسـرپەروەرییـان گرت. ئەنجـامی ڕاسـتەوخۆی ئاگربەسـتەکەش دەبووە مایەی دروسـتبوونی قەوارەیەکی گەورەتری عەرەب لەسـەر سـنووری ڕۆژئاوای ئێران، هەروەها ئەگەری ئەوەش لە گۆڕێدابوو، کە بارزانیش بەسـەر کوردسـتانی ئێراندا باڵبکێشـێ. ئیدی بە گوێرەی سـاواک، پێکهێنانی حکومەتێکی ئۆتۆنۆمی لە کوردسـتانی عێراقدا کوردی ئێرانی تـاودەدا تـا ئەوانیش هەندێ سـازش بە ئێران بکەن.[٧٧] کوردانی ئێرانیش پێشـوازییان لە ئاگربەسـتەکە کرد، ئەوان شـتەکەیان بە سەرکەوتنێکی مێژوویی بۆ هەموو کورد بینی.[٧٨] ئێران بە درەنگانێکی ساڵی ١٩٦٤دا، ڕووبەڕووی سـەرهەڵدانی هەڕەشـەکانی پـان عەرەبیزم و جیابوونەوەی کورد بووەوە.

**شەڕی ناوخۆیی (براکوژیی) کورد**

ڕێککەوتنامەی ئاشتیی ١٩٦٤ بۆ ئێران نسکۆ بوو. بۆ خۆی بە بریندارکردن لە نێوان کوردانی عێراقدا براکوژی سەریهەڵدا. ئیبراهیم ئەحمەد و تاڵەبانی ئاگربڕەکەیان سـەرکۆنەکرد، ئاخر ڕێککەوتننامەکە ئۆتۆنۆمی خۆجێیی بۆ

---

[75] Baghdad 6020 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 23 February 1964.

[76] Baghdad 486 to U.S. Department of State, December 16, 1964, FRUS 1964–1968, XXI, 171.

[77] SAVAK Documents, No. 2r/75, 27 March 1963.

[78] SAVAK Documents, No. 313/44155, 6 March 1964.

کورد تێدا نەبوو، هەروەها ڕەخنەشیان لە بارزانی گرت بەوەی ڕێککەوتننامەکەی بەبێ ڕاوێژکردن لەگەڵ ئەندامانی پارتی دێموکراتی کوردستان واژۆ کردووە.[٧٩] ئەمەش بە دووکەرتبوونی پارتی دیموکراتی کوردستان کۆتاییهات، پارتەکە بووە دوو بەرەی بارزانیپەروەر و ئیبراهیم ئەحمەد-تاڵەبانی.[٨٠] سوپای ئێران وەها لە گرژیی نێوان بارزانی و تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەدی ڕوانی کە شتێکی ساختەیە، ئاخر هەردوولایان نەخشەی ئاسانکارییان بۆ پێشڕەوی پێشمەرگە بۆ ناو خاکی ئێران داناوە.[٨١] ساواکیش بە پێچەوانەوە پێیوابوو ئەو دوژمنایەتییە مێژوویەی نێوان خێڵە کوردییەکان و بەڵگەوبەندی توند لەبارەی ئاگربەستەکەدا ڕەگوڕیشەی سەرەکین بۆ لەیەکترازانی کورد و فرەوانبوونی کەلێنی نێوانیان.[٨٢] لەپاڵ ئەمەشدا "خۆپەرستی بارزانی، گۆترەکاری، نارەوایی،

[79] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 148.

[٨٠] پشتیوانانی ئیبراهیم ئەحمەد و تاڵەبانی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون، پێکهاتبوون لە: عەلی عەسکەری، عومەر دەبابە، نوری شاوێس، ئەحمەد تەها، عومەر مستەفا،

عەلی عەبدوللا و حیلمی عەلی شەریف.

The U.S. Department of State 198 to U.S . Embassy Tehran, September 3, 1964 (FRUS/1964–68/XXI/doc.166); Tehran A-466 to the U.S. State Department, "Implications of the Kurdish Cease-Fire: One Iranian Official View," enclosure 1, February 29, 1964 (NARA/RG59/CFPF/1964–66/Box2339/POL 13-3-Ethnic Minorities), p. 1.

[81] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 893.

[٨٢] کەرتبوونە سیاسییەکەی هەردوو بەرەی ناکۆک دیارخەری پێگەی نالەباری بنکەی پشتیوانانی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، ئاخر بارزانیپەروەرەکان لە خێڵە گوندنشینەکان، لە ڕەوەند و توخمگەلی نەریتپارێزی نێو کۆمەڵگەی کوردی بوون، لە سەرەکەی دیکەشەوە، ئەوانەی سەر بە

پاشـــکەوتووی خێڵەکی و تەنانەت ناراســـتگۆییش" لە تەگەرەکانی بەردەم پێواژۆی بڕیاری دیموکراتییانەی پارتی دیموکراتی کوردســـتان بوون.[٨٣] بەگوێرەی قســـەی عیســـا پژمانیش بێ، "هەر خودی بارزانی نە بەهرەی هەبوو نە مەیلیشـــی لە بەڕێوەبردن و بیرۆکراســـیەتی حزبەکە هەبوو. بە پێچەوانەوە، ئەوە ئەندێشەی ڕۆشنبیرییانەی ئیبراهیم ئەحمەد و کەسایەتی ئەو بوو گەنجەکان و کوردی خوێندەواری تێگەیشتووی بەر لە شۆڕش بۆ حزب ڕادەکێشـــا.[٨٤] لە کۆتـاییـدا و لەگەڵ ڕاگرتنی شـــەڕ لە ١٩٦٤دا جیاوازییەکانی نێوان هەردوو بەرە چڕتر بوونەوە.

هەر یەکسەریش دوای ڕێککەوتننامەی ئاگربەستەکە، عیسا پژمان نێردرایە بارەگای بارزانی لە حاجی ئۆمەران تا هۆکاری وەستاندنی شەڕەکەی بەبێ ڕاوێژکردن لەگەڵ ئێرانی لێ بپرسێ. لە وەڵامدا بارزانی وەهای گوت: "ئاخر من حیزبم"[٨٥] – ئەو دەربڕینەی کە گوتە ناوبانگەکەی لویســـی چواردەیەم بـــیـــردەهـــێـــنـــێـــتەوە "مـــن دەوڵەتـــم L'État, c'est moi" سەرباری بەڵێنی پژمان بەوەی ئێران پشتیوانی بۆ کۆمەکی قورسی سەربازی پشتیوان دەبێ، کەچی بارزانی هیچ نەرمونیانییەکی نیشان نەدا و وەڵامی دایەوە؛ **"ئێمە هیچ هەنگاوێکمان لە دژی ئێران و بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانی نەهاوێشتووە. هەرتەنیا نیازمان وابووە لەبارەی داواکانمان لەگەڵ عارف بکەوینە دانوستان. داواکانمان دژی شا و دژی ئێران نین. لە**

ئیبراهیم ئەحمەد بوون ڕۆشـــنبیرە پێشـــکەوتنخواز، شـــارســـتانەکان و کوردە خوێندەوارەکان (دەرچووەکان) بوون.

SAVAK Documents, No. h4/2367, 1May 1964; SAVAK Documents, No. 313/123, 9 February 1964.

[83] Dann, Uriel, Iraq under Qasim: A Political History, 1958–1963 (London, Praeger, 1969) p. 335.

[84] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 84.

[٨٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٤٨

**سەرووی هەمووشیانەوە، پێشمەرگەی ئێمە لە شەڕی خوێناوی سوپای نوێی عێراقدا ماندوو بووە.**"[٨٦] ئینجا ساواک فشاری خستە سەر بەرەی ئیبراهیم ئەحمەد و تاڵەبانی تا بەرانبەر بارزانی ببنەوە. ئەم بەرەیە ڕاشکاوانە دابەزیە سەر ڕێککەوتنەکە، جەختیان لەسەر داوای کورد بۆ ئۆتۆنۆمی کورد کردەوە و جاڕیاندا کە بارزانی چیدی ڕابەری بزووتنەوەی کوردی نییە. عومەر دەبابەش گوتی؛ گوایە بارزانی "جانتایەکی ڕەشی پڕ لە دیناری عێراقی" لە عارف وەرگرتووە.[٨٧] لەو نێوەشدا، تاڵەبانی سەری بەغدای دا تا لەگەڵ ساواک و شادا ڕاوێژ بکا. هەرچۆنێک بێ ئەوان نەیانتوانی دابڕسێنە پێگەی بارزانی وەک تاکە ڕابەری کورد. ئەوەبوو هەر زوو بارزانی لەگەڵ گەیشتنی نوێنەرانی ئەو بەرەیە بۆ کۆنگرەی شەشەمی پارتی لە تەمموزی ١٩٦٤ لە قەڵادزێ گرتنی و ئیدریسی کوڕە گەورەکەشی ڕوانەی سەر بارەگاکەی ئەوان لە ماوەت کرد، ئەمەش لەوکاتەدا بوو کە تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد فەرمانی بارزانییان ڕەتکردەوە بەوەی هێزی چەکدارییان هەڵبوەشێننەوە.[٨٨] تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد هێزی خۆیان کێشایەوە سەردەشت لە باکووری ڕۆژئاوای ئێران.[٨٩] ئەوان لەوێ چەکەکانیان ڕادەستی سوپای ئێران کردن و لەوێشەوە ڕەوانەی هەمەدان کران، کە تا هاوینی ١٩٦٥ لەوێ مانەوە.[٩٠] **شەڕی ناوخۆی کورد لە**

---

[٨٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ١٤٨.

[٨٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٤٨.

[88] McDowall, David, A Modern History of the Kurds, London (New York 2004) p. 316.

[٨٩] بە عومەر دەبابە و عەلی ئەسغەری و عەزیز ئاکرەییش.

[90] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 148.

**ناوەڕاستی شەستەکاندا کوردی عێراقی بۆ چەندین دەیە بەسەریەکدا دابەشکرد و تۆوی شەڕی براکوژی نەوەدەکانیشی چاند.**[٩١]

هەرچەندە شەڕی ناوخۆی کورد سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی لە عێراق تووشی سەرسامی کرد، کەچی ئێران کۆمەکی دارایی و لۆجستی لەسەر بارزانی نەبڕی. وێڕای بڕیاری شا بۆ بڕینی پشتگیری، کەچی ساواک ڕۆڵی کلیلئاسایان لە پاراستنی پەیوەندی بەکراوەیی بینی. عیسا پژمان گێڕایەوە: "خاوەن شکۆ، پێموایە عارف و عەبدولڕەحمان ئەلبەزازی سەرەوەزیر لە کۆتاییدا ڕێکەوتننامەکە جێبەجێ ناکەن. لەوەش پتر، زۆرینەی سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە دژی ڕێککەوتنەکەن. لە کۆتاییشدا ئێمە پەیوەندیی قووڵمان لەگەڵ هەردوو بەرەکەدا دروستکردووە. کەواتە، ئەمە بیرۆکەیەکی باش نییە کە بە تەنیا جێیان بێڵین."[٩٢] لە کۆتاییشدا شا هاتەڕایێ بەوەی ناردنی چەک و جبەخانە لەسەر بارزانی نەبڕین، هەرچەندە بۆ ئەوەش تێکۆشا، بەڵکو گرژیی نێوانی هەردوو بەرەکە خاوبکاتەوە.

---

[٩١] پاشان تاڵەبانی دانیپێدانا: **"یەکێک لە هەڵە گەورەکان کە من کردیێتم ئەوەیە لە بارزانی جیابوومەوە. خۆی نەدەبووایە وەهام بکردبایە. ئەگەر بە گشتی قسە بکەین، نەدەبووا بەو شێوەیە جووڵابامەوە کە لە هاوینی ١٩٦٤دا جووڵامەوە. ئەوێ دەمێ، هەڵوێستی هەردوولا، هی بارزانی و ئیراهیم ئەحمەدیشم بەر ڕەخنەدا. هەردوولایان ڕادیکاڵ و کەڕەپ(لامل و نەسەلمێن) بوون. دەبووایە لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە بوەستابامایە. هەرچۆنێک بێ، بەهۆی کۆمیتێی توندم لە حیزبە ئەوەم لێهەڵبژارد لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد و شوێنکەوتووانی بمێنمەوە"**

Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat–e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 991.

[92] Qaneifard, Erfan, Tondbad–e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 149.

## یەکێتیی عێراق-میسر و ڕوخانی ئاگربەڕەکەی ١٩٦٤

ڕێککەوتننامەی ئاگربەستی ١٩٦٤ شەڕی کوردی لە کۆڵ عارف کردەوە و لە بەرانبەردا دامەزراندنی "یەک سوپا و یەک ئابووری و یەک نەتەوە"ی لە عێراق و میسر بووژاندەوە.[٩٣] عارف بە پشتیوانی سوپاوە لە ٢٢ی ئازاری ١٩٦٤دا نەخشـــەی یەکگرتنی لەگەڵ میســـردا ڕاگەیاند، هەر دوو مانگیش دواتر، واتە لە ٢٦ی حوزەیراندا، ئەنجوومەنێکی ســـەرۆکایەتی هاوبەش بە ڕابەرایەتی ناسر پێکهێنرا.[٩٤] بەهۆی سـەرکوتکردنی پیلانی بەعس لە لایەن هێزەکانی ناســـرپەروەرەوە لە بەغدا، قاهیرە هێزێکی ٦٠٠٠ کەســـی بۆ ئاسایشپارێزیی ڕژێم ناردە عێراق. هەرچۆنێک بێ ساواک ئەم جوولەیەی ناســری بە نەخشـــەیەک بۆ تێکدانی ئێران دانا.[٩٥] پاشـــان میســـر خەریکی پێکەوەنانی هێزێکی دەریایی بوو لە فاو، فاویش تاکە دەروازەی ئاویی عێراق بوو لەسەر کەنداوی فارس، ئەو ئەنجوومەنە نوێیەی سەرکردایەتیش ناوی نا کەنداوی عەرەبی.[٩٦] بە مانۆڕی ســـەربازییانەی عێراق و میســـر، گەفی یەکێتیی عەرەب لەسەر سنووری ڕۆژئاوای ئێران گەیشتە ئەوپەڕی لووتکەی خۆی.[٩٧] کاتێکیش عارف داواکردنەوەی عێراقی بۆ خوزســـتان چەند پاتە کردەوە، ئینجا شـا مشـتومڕی لەسـەر ئەوەکرد؛ "سـەرەکیترین هەڕەشـــە لەســـەر ئێران یەکێتیی ســـۆڤیەت نییە، بەڵکو کۆماری عەرەبیی یەکگرتووە."[٩٨] هەر لەو کەشوهەوایەشدا بوو شا فەرمانی بە ساواک کرد، پەیوەندییەکان لەگەڵ بارزانییدا ببووژێننەوە.

---

[93] SAVAK Documents, No. 477, 27 May 1964.

[94] SAVAK Documents, No. 316/11439, 22 June 1964; SAVAK Documents, No. 321/26593, 16 October 1964.

[95] SAVAK Documents, No. 1/1073, 6 September 1964.

[96] SAVAK Documents, No. 2/910, 7 August 1964.

[97] SAVAK Documents, No. 1470, 22 September 1964.

[98] SAVAK Documents, No. 213/45247, 13 March 1965.

کات تێدەپەڕی و ئاگربەستەکەی ١٩٦٤یش سەری نەکێشا بۆ ئاشتییەکی هەمیشەیی. ئەوەی ڕاستی بێ، ئەو جوولە تاکتیکەی هەردوو لایان، ڕێگەی پێدان خۆیان ڕێکبخەنەوە و پێگەکانیان سەقامگیر بکەنەوە.[99] جاڕدانی دەستووری کاتیی لە حوزەیرانی ١٩٦٤دا بەبێ ئەوەی باسی داواکانی کوردی تێدابێ ئەوانی نامراد کرد. هەر لە هەمان کاتیشدا بارزانی لەژێر فشاری ئێرانی و ئیسرائیلییەکاندا بوو تا شەڕەکە هەڵبگیرسێنێتەوە. بارزانی لە ١١ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٤دا بەئاشکرا داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عێراق کرد. ئەو هەڕەشەی لە بەغدا کرد بەوەی ئەگەر هاتوو عێراق لەگەڵ میسر یەکبگرێ، ئەوانیش جاڕی سەربەخۆیی دەدەن.[100] عارف بەو قەناعەتەی لە لایەن ژەنەڕاڵەکانی پێیکرابوو، داوای بارزانی ڕەتکردەوە.[101] سوپای عێراقی هەر لە کۆتایی پەنجاکانەوە وەک بەهێزترین دامودەزگا دژی هەر سازشکردنێک بوو بۆ کورد. بە گوێرەی ساواک بێ، "فاکتەری هەرە گرنگی بۆ حوکمگێرانی عێراق و سەقامگیری لە وڵاتێکی ناسک،

---

[99] بە جێگیربوونی دەسەڵاتی پارتی دیموکراتی ، بارزانی سێ ئەنجوومەنی بۆ ڕایکردنی کاروباری کوردان پێکهێنان. مەلا مستەفا کوردستان ئەنجوومەنێکی پیرانی لە ٤٣ ئەندام بە سەرۆکایەتی شێخ لەتیف و ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری لە ١١ ئەندام بە سەرۆکایەتی مامەندی عەباساغا و ئەنجوومەنێکی جێبەجێکاریشی بە ناوی "ئەنجوومەنی شۆڕشگێڕی" لەژێر سەرپەرشتی خۆی پێکهێنا. بڕوانە:
O'Ballance, Edgar. The Kurdish Revolt, 1961–1970 (London: Faber and Faber Ltd., 1973). p. 123.

[100] بارزانی داوای کانە نەوتەکانی کەکوک و خانەقینی ورووژێنەری کرد، بەوەی دەبێ داهاتی نەوتی عێراق بە عادیلانە دابەش بکرێ و بە فەرمیش دان بە زمانی کوردی لە کوردستاندا بنرێ.
Baghdad 3298 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 29 October 1964.

[101] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 906.

پێویستە سوپای عێراق لایەنگیریی ئێوە بێ.[102] لە ٣ی دیسێمبەری ١٩٦٤دا، ســــوبحی عەبدولحەمیدی وەزیری کاروباری ناوەخۆ داواکەی بارزانی ڕەتکردەوە و لێدوانێکی دا؛ "حکوومەتی ناوەندی هیچ نەخشـــەیەکی بۆ پێدانی مافی ئۆتۆنۆمی بۆ هیچ ناوچەیەکی عێراق نییە."[103] سەرباری فشاری ناسر بۆ چارەسەرکردنێکی ئاشتییانەی کێشەکە،[104] کەچی بەغدا هێرشێکی دیکەی کردە سەر کوردستانی عێراق.

هەڵگیرســـاندنەوەی شـــەڕی کورد لە بەرژەوەندی ئێران بوو. ســـاواک و مۆســـــاد بۆ لاوازکردنی بەغدا و قاهیرە بەســـــەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بازیان دا و لە ڕووی لۆجستی و تەقەمەنییەوە کۆمەکی کوردانیان کرد. ئێران لەپاڵ پڕچەکردنی پێشـــمەرگەی بارزانی، تێکۆشـــا پردی پەیوەندیشی بەسەر کەلێنی نێوان هەردوو بەرەی کوردا ڕانا. ئاخر ساواک بەئاگا بوو لەوەی لە کاتی هەڵگیرسانەوەی جەنگەکەدا عارف پشتی بەرەی ئیبراهیم ئەحمەد-تاڵەبانی گرتبوو تا پێگەی بارزانی لاواز بکا. ئەوەبوو بە پشتیوانی بەغدا، تاڵەبانی لقێکی پارتی دیموکراتی کوردستانی لە هەولێر و ڕواندزدا کردەوە.[105] ساواک پێیوابوو ئەم پێشهاتە هەنگاوێکی ناسرە بەسەر عارف تا پشتی تاڵەبانی بگرن، بەڵکو شۆڕش لە دژی ئێران هەڵبگیرسێنن و هاوپەیمانێتی ئێران-بارزانی لاواز بکەن.[106] بەگوێرەی ســـــاواک، پلانی

---

[102] London 1305 to Ministry of Foreign Affairs, 2 August 1963.

[103] The U.S. Department of State, INR, "The Kurdish Situation in Iraq," RNA-11, April 5, 1965 (JPL/NSF/Box.28/RWK /Iraq–Kurds [1964–March 1966]/doc.9), pp. 3–12.

[104] ئاخر ناسـر بە دڵنیاییەوە دەیزانی هەڵگیرســـاندنەوەی شـــەڕ لە کوردســـتان نەخشـــەی یەکێتیی عەرەب لەباردەبا.

Baghdad 362 to U.S. Department of State, October 26, 1964 (FRUS/1964–68/ XXI/doc.167).

[105] SAVAK Documents, No. 314/34828, 12 October 1965.

[106] SAVAK Documents, No. 232, 8 June 1967.

عێراق بۆ ئەوە داڕێژرابوو تا کوردی ئێران تیختیخە بدەن.[١٠٧] ئێران لەبەر ئەم ڕەوتەدا هەوڵیدا هەردوو بەرە لەیەکجیاوازەکە بەیەک بگەیەنێتەوە. ئیبراهیم ئەحمەدیش بە فشاری ساواک لە ١٦ی ئازاری ١٩٦٥دا نامەیەکی بۆ بارزانی نووسی و داوای لێکرد چاو لە دوژمنایەتی نێوەخۆیی کورد بپۆشێ.

بەغدا لەو نێوەدا و لەگەڵ پەرەسەندنی ئارەزووی بۆ تێکشکاندنی پێشمەرگەدا پڕوپاگەندەیەکی توندیشی لە دژی تاران کرد. ناجی تاڵب، وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق لە نیسانی ١٩٦٤دا لەسەر پشتگیریی بۆ کورد سەرکۆنەی ئێرانی کرد و وەهای باسکرد کە دەستوەردانی ئێران هۆکاری سەرەکی شکستیی عیراق بووە لە جەنگی دژی کورددا. ناجی تالیب گوتی گوایە؛ "چەندین بار تفاق و کەلوپەل لە ئێرانەوە بە جێبی بێ ژمارە گوازراونەتەوە بۆ نێو خاکی عێراق."[١٠٨] عارفیش ئاماژەی بەوە دا؛ "ڕژێمێکی بیانی دواکەوتوو [واتە ئێران] پشتی گرژیی ئەتنی و خێڵەکی لە عێراق دەگرێ."[١٠٩] محەمەد حەسەنێن هەیکەل، ڕۆژنامەنووسی گەورەی ناسرپەروەریش شای ئێرانی تۆمەتبار کرد بەوەی وەک "ئاژانێکی ڕۆژئاوا" بە کۆمەکردنی کورد و گەریلا دڵسۆزەکانی خۆی لە یەمەن شەڕی گەلی عەرەب دەکا. سەرتیپی سوپا عەبدولقادر یاسینیش گوتی؛ کورد ڕاستەوخۆ لە لایەن ئێرانەوە کۆمەک دەکرێن و ئێرانییەکان ٤٠،٠٠٠ تفەنگیان

---

[١٠٧] وەهادانرا بوو پشتیوانی هەریەک لە قوباد سمکۆ لەگەڵ ڕەحیم سەیفی قازی و کوڕی قازی محەمەد بکرێت تا سەرپەرشتی کوردستانی ئێران بکەن. بەڵگەنامەی ساواک:
SAVAK Documents, No. 4394, 25 August 1966.

[108] he U.S. Department of State, Memorandum of Conversation, "The Kurdish Problem," December 10, 1964 (JPL/NSF/Box.28/RWK/Iraq [December 1963–March 1966]/doc.18a), pp. 1–2.

[109] SAVAK Documents, No. 231/45304, 19 March 1965.

داونەتێ.[١١٠] لەگەڵ ئەوەشدا ئێران هەر سووربوو لەسەر پشتیوانیکردنی کورد.

**شا لە بەرانبەر جۆنسندا**

سیاسەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەرانبەر کورد و بەغدا دا هێشتا هەر لەگەڵ هاوپەیمانەکانی ناکۆک بوو.[١١١]دوابەدوای هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە کوردستانی عێراقدا، ساواک و مۆساد کۆمەکی سەربازیی و داراییان بە پێشمەرگەی بارزانی کرد. هەردوو دەوڵەتەکە لە لایەن لەندەنەوە پشتگیری دەکران، سیاسەتی لەندەنیش ئەوەبوو میسر لە کەنداوی فارسی بەرزەفت بکرێ و ڕابگیرێ. ستیڤن ئیگرتن، باڵوێزی ئینگلستان لە بەغدا بە پێداگرییەوە داوای لە بارزانی کرد شەڕەکەی لەگەڵ عارف هەڵبگیرسێنێتەوە و بەڵێنیشی پێدا لە ڕێی ئێرانەوە هاوکارییان بکاتەوە.[١١٢]بەگوێرەی سترۆنگی باڵوێزی ئەمریکا؛ "بریتانیان بۆ دژایەتی ناسر لەگەڵ ئیسرائیل و شادا بە قووڵی هاوئاوازە... بەگوێرەی ئەو ناحەزییە قووڵەی {بریتانی] بۆ ناسر و بایەخی کەنداوی[فارسی] بۆ ئینگلستان. لەوانەیە بریتانیا هاوکاری ژێربەژێری ئێران و ئیسرائیل لە دژی ڕژێمی عێراقی بکا، کە لەبن هەژموونی ناسرییەکاندا دایە هەروەک ئەوەی

---

[110] SAVAK Documents, No. 142613.

[111] Patterson E.A., "Airgram from the Embassy in Iraq to the Department of State," FRUS, 1964–1968, Volume XXI, Document 177; and Patterson E.A., "Telegram from theEmbassy in Iraq to the Department of State," FRUS, 1964–1968, Volume XXI, Document 171.

[١١٢] یاداشتی باڵوێزخانەی ئینگلستان لە بەغدا، "ئاماژەکانی چالاکیی بەریتانی لە دژی عێراق هاوکاریکردنی ئێران لەو جۆرە چالاکیانە."

October 15, 1964 (JPL/NSF/Box.28/RWK/Iraq [December 1963 –March 1966] /doc. 23a), p. 1.

لە دژی ناسریش لە هەر شوێنێک بێ بجوولێنەوە."[113] پاکڕەوانی بەڕێوبەری ساواک لە ئابی ١٩٦٤دا چاوی بە کاربەدەستانی MI6ی بریتانی لە لەندەن کەوت و سەرکەوتووانە پلانی پاڵپشتی ئێرانی-ئینگلیزییان بۆ کوردان داڕشت.[114] هەر بەڕاستیش پان عەرەبیزم بووبووە هەڕەشەی هاوبەش بۆ ئێران و ئیسرائیل و بریتانیا. کوردی عێراقیش بووبوونە داردەست بۆ شلۆقکردنی عێراق، بۆ ئەوەی بەغدا لە ڕەوتی ئەگەری شەڕی عەرەب-ئیسرائیل لاپەڕگە بکەن و میسریش لە کەنداوی فارسی دووربخەنەوە.

لەگەڵ توندبوونی شەڕەکە لە باکووری عێراقدا، عەبدولسەلام عارف داوای لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد فشار بخاتە سەر ئێران تا کۆمەک لە سەر بارزانی ببڕێ. ئیدارەی جۆنسۆنیش پێشتر داوای بارزانی بۆ پشتگیریی ڕەتکردبووەوە، ئاخر ئیدارەکە پێیوابوو هەڵگیرسانی جەنگ لەوانەیە دنەی چالاکی تێکدەرانەی مۆسکۆ لە دژی بەغدادا بدا.[115] کۆشکی سپی هەوڵیدا قەناعەت بە شا بهێنێ تا خۆی لە پشتیوانی کورد نەبان بکا،

---

[113] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٢؛ ئامانجی لەندەن ئەوەبوو؛ "بەربەستێک لەبەردەم یەکگرتنی عێراق- میسردا دابنرێ،" "هێشتنەوەی عێراق بە پارچەپارچەکراوی و لاوازی،" و "هێشتنەوەی پاراستنی بەرژەوەندیی نیشتمانی لە کەنداوی فارسی دوور لە دەستی بەغدا و هەروەها بەردەوامبوون لە هەڵقولانی نەوت لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا."
Baghdad A–424 to U.S. Department of State, enclosure: "Kurds – Iraq," no date (NARA/RG59/ CFPF/1964–66/Box2339/POL 13-3–Ethnic Minorities), p. 1.

[114] U.S. Embassy Baghdad, Memorandum, "Indicators of British Activity Against Iraq and Cooperation with Iran in such Activity," October 15, 1964 (JPL/NSF/Box28/RWK/Iraq [December 1963–March 1966]/doc23a), p. 2.

[115] Tehran A-625 to U.S. Department of State, "Iran-Iraq: Letter to President Johnson from Mullah Mustafa Barzani," March 12, 1965 (NARA/RG59/CFPF/1964–66/ Box2339 /POL 13- 3–Ethnic Minorities), pp. 1–2.

بۆ ئەم مەبەستەش کاتێ (دین رسک)ی وەزیری کاروباری دەرەوەی لە میانەی مانەوەی لە کۆبوونەوەی سەنتۆ لە ٧ی نیسانی ١٩٦٥دا چاوی بەشا کەوت، پەیامەکەی پێراگەیاند. شا لە نێوەڕاستی گفتوگۆدا، نیازی خۆی ئاشکرا کرد، کەوا پشت لەکورد ناکا مەگەر ڕژێمێکی نیشتمانیی لە بەغدا دانەمەزرێ. هەروەها ئەوەشی بە ڕوونی گوت؛ بۆیە پشتی کورد دەگرێ تا دەستوپێی سوپای عێراق ببەستێتەوە، چونکە بەغدا لایەنی قاهیرەی گرتووە.[١١٦] ئێران پشتگیریی بۆ کورد چڕترکردەوە، بەتایبەتیش دوای سروودی نیشتمانیی عێراق و ئالای یەکگرتنەوەیان لەگەڵ میسر لە ٣١ی حوزەیرانی ١٩٦٥دا.[١١٧]لە ١٣ی ئابیشدا، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا "نیگەرانی خۆیان لەبارەی فشارەکانی عێراق سەبارەت بە زیادبوونی ڕاددەی کۆمەکی ئێرانییەکان بۆ کورد" بە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێرانی ڕاگەیاند.[١١٨]عەباس ئارام، وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێرانیش لە بەرسڤدا، حاشای لە پشتیوانی کورد کرد و گوتی گوایە؛ "ئەوە عێراقە سیاسەتی هەراسانکردنی ئێرانی گرتووەتەبەر."[١١٩]

پەیوەندییەکانی ئەمریکا لەوکاتەی عەبدولڕەحمان بەزازی ی پارێزەری مەیل ڕۆژئاوایی لەدوای ١٩٥٨دا کرایە یەکەمین سەروەزیری مەدەنی لە عێراق لەگەڵ بەغدا بەرەوپێشەوەچوون. ڕێک هەر دوای کودەتا شکستخواردووەکەی سەروەزیر عارف عەبدولڕەزاقی ناسرپەروەر، ئەوەبوو سەرۆک عەبدولسەلام عارف توخمە ناسرییەکانی لە کابینەی حکومەتەکی ڕیشەکێش کردن و پەیوەندییەکانی بەغدا-قاهیرەش لاواز

---

[116] Tabriz A-25 to State, "Iranian Government Policy in Kurdestan and its Effect on Kurdish Attitudes," March 24, 1966 (NARA/RG59/CFPF/1964-66/Box2339/POL 13-3–Ethnic Minorities), pp. 5–9.

[117] SAVAK Documents, No. 314/16084, 1 June 1965.

[118] The U.S. Department of State 138 to U.S. Embassy Tehran, August 11, 1965 (FRUS/1964-68/XXI/doc.175).

[119] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بوو.[120] یەکەمین جووڵەی بەزازیش داواکردن بوو لە ئەمریکا تا فشار بخاتە سەر تاران شەرە ژێربەژێرەکەی لەهەمبەر عێراق ڕابگرێ. بەزاز لە ئۆکتۆبەری ۱۹٦٥دا بە (ڕسک)ی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکای گوت: "ئێرانییەکان بە درێژەدانیان بەو پشتیوانییە ژێربەژێرە کاولکارییەی بۆ یاخیبوانی کوردی عێراق، کێشەیەکی ئایندەییان بۆ خۆیان دەخوڵقێنن."[121] ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش هەمان ڕوانینی هەبوو، ئاخر "**پلەیەکی بالا لە ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆیی بۆ کوردی عێراق سەقامگیریی ناوچەکە دەهەژێنێ و لە ماوەیەکی دوورمەودادا بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دەخاتە مەترسی، ئەمەش بە وروژاندنی پرسی کورد لە ئێران و تورکیا و دەشێ مۆسکۆ بیقۆزێتەوە.**[122] کەواتە، **باشترین بژاردە بۆ ئەمریکا ئەوەبوو قەناعەت بە کوردان بهێنێ بەڵکو لە "یەکێتیی عێراق" بەشدار بن.**[123] (سرتونگ)ی بالوێزیش ئامۆژگاری کوردی کرد بەوەی خۆیان لە لایەنگیریی هێزێکی دەرەکی، کە ئێرانە بەدووربگرن[124]، چونکە دانوستانەکانی بەغدا-بارزانی دەکرێ ببێتە "گەرەنتی چوارچێوەی دەوڵەتی عێراق و دەستوەدانی دەرەکیش کەم بکاتەوە."[125] هەر بەڕاستیش، نیگەرانی سەرەکیی ئەمریکا لە عێراق

---

[120] SAVAK Documents, No. 313/20851, 27 June 1966; SAVAK Documents, No. 313/27705, 4 September 1965.

[121] U.S. Department of State, Memorandum of Conversation, "Kurdish Affairs," October 8, 1965 (JPL/NSF/Box28/RWK/Iraq [December 1963–March 1966]/doc.8), pp. 1–2.

[122] Baghdad A-424 to U.S. Department of State, "Analysis of the Kurdish Problem," October 30, 1965 (NARA/RG59/CFPF/1964–66/Box2339/POL 13-3–Ethnic Minorities), pp. 1–2.

[123] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[124] Patterson E.A., "Telegram from the Embassy in Iraq to the Department of State," FRUS, 1964–1968, Volume XXI, Document 167.

[125] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ڕێگریکردن بوو لە کۆمۆنیزم و وڵاتەکەش نەکەوێتە باوەشی مۆسکۆ.[126] لەگەڵ ئەوەشدا ئامانجی سەرەکی ئێران ئەوەبوو عێراق "لاواز و پارچەپارچە و دووربێ لە ناسر" تا خۆی بەسەر کەنداوی فارسیدا زاڵ بێ.[127] ئیدی لەبەر ئەو بەرژەوەندیانە بوو باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغدا هۆشداری ئەوەی دا، کە "بەردەوامبوونی دەستوەردانی ئێرانی-ئیسرائیلییەکان هەڕەشەیەکە بۆ سەر پێگەی ئەمریکا لە عێراق، بەڵام بۆ بەدبەختی هیچ کامێکیان لەم پرسەدا بەرژەوەندی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەبەرچاو ناگرن."[128] ئێران بەشێوەیەکی کارایانە دارِسایە بەرژەوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

### سێکوچکەی ناعەرەبی: ئێران و ئیسرائیل و کورد

لە پاییزی ١٩٦٥دا شەڕ بۆ عێراق بووە کارەسات. ئاخر کورد لە نۆڤێمبەری ١٩٦٥دا بە پشتیوانی قورس و گەورەی سوپای ئێرانییەوە هێرشێکی سەرکەوتووانی کردە سەر قەڵا و چەپەرەکانی عێراق.[129] لە تۆڵەشدا و لە ٧ی کانوونی یەکەم ١٩٦٥دا لە لایەن چەکداری ناتەکوزی (نانیزامی) عێراقییەوە[130] تەقە لە چەند سەربازێکی ئێرانی کرا. ئیدی گرژی لەنێوان

---

[126] Baghdad A-424 to U.S. Department of State, enclosure: "Kurds – Iraq," no date (NARA/RG59/CFPF/1964 –66/Box2339/POL 13-3 – Ethnic Minorities), p. 1.

[127] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[128] Baghdad A-424 to State, "Analysis of the Kurdish Problem," October 30, 1965 (NARA/RG59/CFPF/1964–66/Box2339/POL 13-3–Ethnic Minorities), pp. 1–2.

[129] Tehran A-607 to U.S. Department of State, "The Iran-Iraq Crisis of December/ January: An Analysis," March 5, 1966 (NARA/RG59/CFPF/1964– 66/Box2339/ POL 13-3– Ethnic Minorities), pp. 2–3.

[130] لەوانەیە مەبەست لەو چەکدارە نانیزامییانە جاشەکان بن. وەرگێڕ.

هەردوو وڵاتەکە لەگەڵ بۆمبابارنکردنی فڕۆکەی میگی عێراقی لە ٢١ی دیسامبەری ١٩٦٥ بۆ سەرسنوور بەرزبوویەوە. ئێرانیش لە بەرتەکدا هێزەکانی لەسەر سنوور خستە حاڵەتی ئامادە و ئەم جارەیان بە چڕی پشتیوانی لە کورد کرد. پێشمەرگە بە پاڵپشتی چارەنووسسازیانەی تۆپخانەی ئێرانییەوە پاشەکشەی بە هێزی سەربازی عێراقییەوە کرد و بۆ هێڵەکانی دواوەی گەڕاندەوە. کاتێکیش بەهاری ١٩٦٦ نزیک بووەوە، بەزاز سەرچڵییەکی کرد تا لە بارزانی نزیک ببێتەوە، پێشنیازکردنی پڕۆژەی قانونی لامەرکەزی کرد، بەوەی لە کوردستانی عێراق لە ڕووی ئابووری و کلتوری و کۆمەڵایەتییەوە بووژێنێتەوە و بەتەواویش دان بە ناسنامەی کوردییدا بنێ.[١٣١] لەو نێوەشدا ئەو بانگهێشتی ئەمیر عەباس هوەیدای سەرۆوەزیری ئێرانی بۆ بەغدا کرد. لەگەڵ ئەوەشدا ژەنەڕاڵەکانی نێو سوپای عێراقی بەر لە هەر دانوستانێک داوای وەستاندنی پشتگیریی ئێرانیان بۆ کورد دەکرد، بۆیە پڕۆژەکەیان لەباربرد.[١٣٢] هەردووڵاشیان هەم عەبدولسەلام عارف و هەم ژەنەڕاڵ عەبدولعەزیز عەقیلی، وەزیری بەرگریی عێراق و سوپاسالاری عێراق دژی پلانەکە بوون.[١٣٣] ئەوان لەو

---

[١٣١] بەزاز پڕۆژەکەی وەها ڕوونکردەوە: "ئەم قانوونە ئیدارییە نوێیە ڕاستیی نەتەوەیی کوردی دەسەلمێنێ و وا لە هەموو هاووڵاتیانمان لە باکوور دەکا میراتی زمان و کلتووری خۆیان بهێڵنەوە و بیپارێزن. هەروەها ئەو توانستەشیان دەداتێ، چالاکیی خۆجێی ڕاستەڕێ بخەن ئەو چالاکیانەی لەگەڵ یەکێتیی دەوڵەتەکەدا ناکۆک نابن، ئاخر هیچ ڕێگەیەک بۆ ئەوە خۆش ناکرێ کە هیچ بەشێک لە نیشتمانەکەماندا لەدەست بدرێ." بڕوانە:

See McDowall, David, A Modern History of the Kurds (London, New York 2004) p. 318.

[132] Tehran A-607 to the U.S. Department of State, "The Iran-Iraq Crisis of December/ January: An Analysis," March 5, 1966 (NARA/RG59/CFPF/ 1964–66/ Box2339/POL 13-3–Ethnic Minorities), p. 3.

[133] Baghdad A-801 to U.S. Department of State, "Confidential Contacts Between the Iraqi Government and the Kurdish Rebels," March 26, 1966 (NARA/RG59/CFPF/1964–66/ Box2339/POL 13-3–Ethnic Minorities), pp. 1–4.

بڕوایەدابوون، هەر ســـــازانێک بۆ کرد دەبێتە مایەی لاوازکردنی بەغدا.[١٣٤] ئیدی وتووێژی ژێربەژێر لەگەڵ بارزانیدا وەستا، ئەوەش لەوکاتەدا بوو کە ئەلعەقیلی لێدەوانی دا بەوەی؛ "ئۆپەراســـیۆنە ســـەربازییەکانمان تا 'لەوێ کورد' دەبەزێ، بەردەوام دەبن."[١٣٥] لە کاتێکدا بەزاز مشـــتومڕی لەســـەر چارەســـەرییەکی ئاشـــتییانەی بۆ پرســـی کورد دەکرد، بەوەی مەرجی پێشـوەختەیە بۆ بەرەوپێشـوەچوونی عێراق، کەچی ئەلعوقەیلی سـوور بوو لەسـەر ئەوەی بارزانی بەچۆکدا بێنێ، ئاخر ئەو بەتوندی لەو بڕوایەدا بوو؛ "هەردوو بەرە، ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات، خەریکی دروسـتکردنی 'ئیسـڕائیلێکی نوێن' لە باکووری عێراقدا."[١٣٦]

بۆ بەغـدا ســـێکوچکەی هـاوپەیمـانێتیی ئێرانی- ئیســـڕائیلی- کوردی هەڕەشەیەکی دەرەکی بوو. ئیسڕائیل بۆیە پشتی کوردانی گرتبوو تا ڕووی ســوپای عێراق لە جەنگی داهاتووی عەرەب –ئیســڕائیلدا لە بەرەی ئوردن یان سوریا وەربگێڕێ. لە ١٩٦٤دا کامەران عالی بەدرخانی نێردەی بارزانی بانگهێشـتی ئیسـرائیل کرا تا چاوی بە سـەرانی ئیسـڕائیلی بکەوێ. ئەوسـا داود بنگۆریۆن دەستی مۆسادی کردەوە تا کۆمەکی پارە و چەکی دژەتانک و دژەفڕۆکەیان بۆ بنێرێ، هەروەها داود کیمخ (David Kimche)ی وەک نێردەیەک ناردە کوردســـتانی عێراق. ئەوەبوو کیمخ لە حوزەیرانی ١٩٦٥دا چووە کوردســـتانی عێراق و چاوی بە بارزانی کەوت. پێشـــتریش شـــا لە ١٩٦١ەوە ڕێگەی بە پشـــتگیرییەکی ســـنوورداری ئیســـڕائیلی بۆ کورد

---

[134] SAVAK Documents, No. 232/47162, 1 March 1966; SAVAK Documents, No. 233/43229, 12 April 1966

[135] Baghdad A-792 to U.S. Department of State, "Iraqi Defense Minister Uqaili on Kurdish Situation; Outlook for Spring Campaign," March 26, 1966 (NARA/RG59/ CFPF/1964–66/Box2339/POL 13-3– Ethnic Minorities), pp. 1–2.

[136] Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 916.

دابوو،[137] بەڵام ڕێگر بوو لەوەی ئیسرائیل هاوکاریی تەواوی کوردی عێراق بێ. بۆ ئیسرائیلیش ئەو دوودڵیەی شا دارسانێکی گەورە بوو بۆ ڕێبازی کەمەربەندی ئیسرائیلی. بە تێپەڕینی ڕۆژگاریش، کاتێک داواکردنەوەی خاکی خوزستان و یەکاوی عەرەب (ئەروەند ڕود) لە لایەن عارفەوە کرا، ئیدی ئەو دووڵییەی ئێرانی نەهێشت تا بۆ پاڵپشتیی کوردی عێراق بەتەواوی لەگەڵ ئیسرائیلدا هاوکار بن. بۆ سووککردنی باری گومانی شا، مایەر ئامیتی بەڕێوەبەری مۆساد لە پاریس چاوی بە پاکڕەوانی بەڕێوبەری ساواک کەوت. پاکڕەوان لەو دیدارەدا لەبارەی نیگەرانی تاران لەمەڕ هەڕەشەی کورد هۆشداری دایە مایەر ئامیت و پێی لەسەر ئەوە داگرت، لەمەودوا هەر ئۆپەراسیۆنێک دەبێ لە ڕێی ساواکەوە بێ.[138] هەروەها پاکڕەوان ئەوەشی خستە بەردەم هاوتاکەی لە مۆساد، کە هاوکارییەکەیان بە نهێنی بهێڵنەوە. ئیسرائیلیش دەستبەجێ مەرجەکەی تارانی پەژراند و قایلبوو لەسەر ئەوەی وردەکاری زانیارییەکانیان لەگەڵ ساواکدا ئاڵوگۆڕ بکەن. هەروەها ئەوان بڕیاریشیان دا هاوکارییەکانیان لە هاوپەیمانەکەی خۆیان، لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بشارنەوە و ئەگەر هاتوو پشتگیرییەکەیان بۆ کورد ئاشکرا بوو، حاشایی لێ بکەن.[139] خۆی ئەمەش یەکێک بوو لەو حاڵەتە دانسقانەی ئێران و ئیسرائیل وەک هاوپەیمانی ئەمریکا، هەوڵی ئەوە بدەن بەسەر هاوپەیمانە زلهێزەکەیان باز

[137] Rubin, Avshalom, Abd al-Karim Qasim and the Kurds of Iraq: Centralization, Resistance, and Revolt, 1958–63, (2007) Middle Eastern Studies, 43 (3): 373.

[138] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 53.

[139] Schonmann, Noa, Israel's Phantom Pact: Foreign Policy on the Periphery of the Middle East: Foreign Policy in the Periphery of the Middle East (I.B. Tauris & Co Ltd., 2015) p. 259.

بدەن.[١٤٠] هەرچەندە ئەمریکا ئاگای لە دیدارە ژێربەژێرییەکەی ئێران-ئیسرائیل لەبارەی پرسی کورد هەبوو، لێ ئاستی بەرفرەوانی هاوکارییەکە بۆ کۆشکی سپی روون نەبوو. لە یاداشتێکی سترۆنگی باڵوێزی ئەمریکا، بۆ یەکەمین جار باس لە هاوکاریی ئیسرائیل و ئێران بۆ کوردستانی عێراق دەکا: "ئیسرائیل رۆڵێکی گرنگ لە ئێران وازیدەکا و ئەوەش دیارە کە پشتی کورد دەگرێ."[١٤١]

پاش چەندین مانگ لە لۆبیکردنی ئیسرائیل و لە کۆتاییدا لە حوزەیرانی ١٩٦٥دا یەکەمین ڕێککەوتنی سێکوچکەی ناعەرەبی ئێران، ئیسرائیل و کورد مۆرکرا.[١٤٢] **ئەوەبوو ژەنەڕاڵ تقزی تزور، سوپاسالاری سوپای بەرگری ئیسرائیلی و دوو ئەفسەری پایەبەرزی هەواڵگریی ئیسرائیل بە جلی کوردی و بە یاوەری عیسا پژمان بە پێ لە سنووری ئێران عێراق لە حاجی ئۆمەران بەرەو بارەگای بارزانی پەڕینەوە.**[١٤٣] دوای دوو ڕۆژ لە وتووێژکردن، ئیسرائیل بڕێکی قەبەی لە کەرەستە و تفاقی سەربازی، لە فیشەک لەگەڵ کۆمەکی دارایی خستە بەردەم بارزانی. ئێرانیش کۆمەکی مادیی و دارایی بۆ کردن و بووە سەرەکیترین کەناڵی بۆ کەلوپەلی سەربازیی و داودەرمانی ئیسرائیلی. **کەشتی باری چەک و تەقەمەنی**

---

[١٤٠] لە بۆنەیەکی دیکەدا، ئێران و ئیسرائیل هەوڵێکی زۆر بەردرێژیان دا تا هاوکاریی موشەکی بالیستیکییان، ئەوەی پێی دەگوترا پرۆژەی گوڵ، لە هاوپەیمانە ئەمریکاییەکان بشارنەوە. بڕوانە؛ Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) pp. 74–78.

[١٤١] لە یاداشتی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغدا، "ئاماژەی چالاکی بەریتانی لە دژی عێراق هەیە و لەگەڵ ئێرانیشدا بۆ ئەو جۆرە چالاکییانە لە هاوکارییدان.

" October 15, 1964 (JPL/NSF/Box28/RWK /Iraq [December 1963–March 1966]/doc23a), p. 2.

[142] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 13.

[143] Qaneifard, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman (Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman) (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 165.

**ئیسرائیلی، کە بەزۆریش چەکەکان چەکی رووسی بوون، لەو چەکانە بوون کە دەســـتکەوتی جەنگی عەرەب – ئیســـرائیل بوو لە هاوینی ١٩٦٥دا بەرێگەی ئێران گەیشـــتنە کوردســـتانی عێراق.**[١٤٤] ئاماژەی کاریگەری ئەو خۆتێهەڵقورتاندنەی ئیســـرائیل لە باکوری عێراقدا باشـــتر دەرکەوتنی تاکتیکەکانی پێشمەرگە بوو. پێشتر بەشێوەیەکی سەرەکی سەرکەوتنەکانی پێشـــمەرگە بۆ ناتوانایی ســـوپای عێراق دەگەڕایەوە نەوەک بۆ هونەری جەنگی پێشـمەرگەی جەنگاوەر، ئاخر هەردوولایان، پێشـمەرگە و ســوپای عێراق لەبارەی تەکتیکی جەنگەوە لێهاتوو نەبوون.[١٤٥]"بە پێچەوانەشـــەوە، کورد لەپاش هاوکاریی مۆســـاد-ســـاواک، ڕەتیانکردەوە بەرگری لە ناوچە دەشـتاییەکان بکەن، لێگەڕان حکوومەت بەرەو ناوچە شـاخاوییەکان بکشێ ئەگەرچی لەســـەر حیســـابی هەندێ قوربانیدانیش بووایە، ئەوان پەلاماری هێڵی دابینکردنی ئازوقەی ســـوپایان دەدا و ئینجا دیاربوو پەلاماری مۆڵگە کاتییەکانیان دەدا."[١٤٦]

مایەی تەوسیشە هۆبە وەها لەنێو ساواک و سوپای ئێرانیدا هەبوون لەگەڵ هاوکاریی ئێرانی-ئیســـرائیلی- ناکۆک بوون. ئەوان پێیان وابوو، پەیوەندی گەرم لەگەڵ ئیســـرائیلدا بە شـێوەیەکی بەرچاو زیان بە پێگەی هەرێمایەتی وڵاتەکە دەگەیەنێ، چونکە خۆی لەبەر پڕوپاگەندەی پان عەرەبیزم ڕووت دەکاتەوە. هەروەها ئەوان مشتومڕیشیان لەسەر ئەوە دەکرد، گوایە چاکەی

---

[١٤٤] خۆی ئەمە بیرۆکەیەکی زیرەکانە بوو لە لایەن ســـاواک و مۆســـادەوە پەیڕەوکرا. ئاخر بە پلەی یەکەم چەکی دەستکردی ڕووسی لە جیهانی سێیەم و لە ناوەڕاستی جەنگی ساردا کێشـەی وەهای نەدەنایەوە. بە پلەی دووەمیش بە پێچەوانەی چەکی دەستکردی ئەمریکا، ئەوا چەکی ڕوسی ڕێگە بە ئێران دەدا بەوەی حاشای لێ بکەن لەوەی دەستیان وەرداوەتە نێو خاکی عێراق. بە پلەی سێ‌یەمیش، هەبوونی چەکی ڕوسی لە کوردستانی عێراقدا گرژیی نێوان مۆسکۆ و بەغدای قووڵتر دەکردەوە.

[145] Baghdad A-1115 to U.S. Department of State, "Kurdish Revolution of 1961," June 30, 1965 (NARA/RG59/CFPF/1964–66/Box2339/POL 13-3–Ethnic Minorities), pp. 14–15.

[١٤٦] هەمان سەرچاوی پێشوو.

هەر ســـەرکەوتنێکی پێشـــمەرگە بەســـەر ســـوپای عێراق لە کۆتاییدا بۆ ئیسرائیلییەکان دەگەڕێتەوە نەوەک بۆ ئێران، چونکە ئەوان لەبواری مەشق و ڕاهێنانی پێشـــمەرگەدا لە ئێرانییەکان کاراترن. کەواتە ئەم کارە وێڕای "سنوورە خوێناوییەکەیان" مەودایەکی ستراتیژیی دەداتە دەوڵەتی جوو کە دەکرێ لە بەرانبەدا و لەداهاتوو بە هۆی چاندنی تووی جیاخوازیی کورد ببێتە مەترسی لەسەر ئاسایشی نیشتمانیی ئێران.[١٤٧]

**عیسا پژمانیش گێڕایەوە:**

***"لە لایەن سـوپاسـالار عەلی مورتەزای سـەرۆکی هۆبەی دەرەکی دەزگای هەواڵگریی ساواک لە بەغداوە بۆ تاران داواکرامەوە. سـوپاسـالار پێیگوتم کە، ســوپاســالاری ئیســرائیلی و جێگرەکەی خۆی بە یاوەری ســەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی دووەم و ســێیەمی ســـاواک بارزانییان بینیوە. منیش لە هۆکاری پێویســتی پەیوەندی بە مۆســادم بە کوردەوە لێپرســی. ئەویش دەستبەجێ وەڵامی دامەوە: 'هەر شا دەیزانێ'"***[١٤٨]

ئەو لە هەبوونی ستراتیژێکی ئیسرائیلی لەسەر سنووری ڕۆژئاوای ئێراندا نیگەران بوو، ئـاخر بەمە هیچ مەودایەک بۆ ئێران نەدەمـایەوە. لەگەڵ ئەوەشـدا، نە سـاواک و نە سـوپای ئێران زاتی ئەوەیان نەکرد بڕیارەکەی شا ڕەتکەنەوە.

لە دیوەکەی کوردیشـــەوە، کۆدەنگییەک لەبارەی لایەنگرتنی ئیســـرائیلەوە نەبوو. لەکاتێکدا بارزانی پێشـوازی لە ڕۆنانی پەیوەندی لەگەڵ ئیســرائیلدا دەکرد، کەچی تـاڵەبـانی و ئیبراهیم ئەحمەد دژی بوون. هەروەهـا ئەوان بێئاگابوون لە دیدارە نهێنییەکانی کامەران عالی بەدرخان لە ئەورووپا و

---

[147] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 164.

[١٤٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ١٦٤.

ئیسـرائیل. تاڵەبانیش ڕوونیکردەوە: "ڕوسـەکان بەڵێنیاندابوو بەتەواوی پشتی بزووتنەوەکەمان بگرن. تەنانەت پێیان گوتم، دەکرێ کورد پەیوەندی لەگەڵ شـا لە دژی بەغداشـدا بپارێزێ. هەرچەندە ئەوان بە توندی هۆشـداریان داینێ لەوەی نابێ پەیوەندی لەگەڵ ئیسـرائیلدا گرێ بدەین."[١٤٩]هەرچۆنێک بێ کەس نەیدەتوانی ئاڵنگاری بڕیارەکانی بارزانی ببێتەوە.

## بەغدایەکی لەرزۆک

بەغدا لە نیسانی ١٩٦٦دا پلانی دوا هێرشی خۆی دارشت. هەرچۆنێک بێ عەبدولسەلام لە ١٣ی نیساندا لە تێکشکانی هەلیکۆپتەرێکدا کوژرا.[١٥٠]مەرگی عارف لە بەغدا بووە مایەی ململانێیەکی توندی توخمگەلی مەدەنی و سەربازی لەسەر دەسەڵات. لەپاش چوار ڕۆژ لە وتوویژ و مشتومڕ و سەرۆکایەتی کاتیی بەزاز، بڕیاردرا ژەنەڕاڵ عەبدولڕەحمان عارف، واتە برای عەبدولسەلام عارف ببێتە سەرۆکی نوێ. کوردیش پێشوازی لە مردنی چاوەڕواننەکراوی عەبدولسەلام عارف کرد.[١٥١] لەو نێوەشدا، شەڕ

---

149 Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011). p. 785

. پاش سێ دەیە و لە ناوەڕاستی شەڕی براکوژی لە نەوەدەکاندا، ئەو ناوی مەلا مستەفای بە "کرێگرتەیەکی" ئیسرائیلی هێنا. هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٧٨٦.

١٥٠ بە لایەنی زۆری بڕوای ئەوە هەبوو کەوا تێکشکانی کۆپتەرەکە لە لایەن کەسانی بەعسی لەنێو هێزی چەکدرای عێراقییەوە کرابێ. بڕوانە:

Abdul-Rahman Aref, 91, Former Iraqi President, Is Dead," The New York Times. August 25, 2007.

١٥١ بە گوێرەی گێڕانەوەی تاڵەبانی: "**بە هیچ شێوەیەک عەبدولسەلام عارف پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ کوردلاندا نەبوو. من بەڕوونی دەتوانم بڵێم کە قاسم و عارف سیاسەتی لەیەک جیاوازیان دەرهەق کورد هەبوو. هەرچەندە ئێمە دژی قاسم وەستاینەوە، لێ ئەو دژی کورد نەبوو. لە بری ئەوە، قاسم بە توندی بڕوای بە مافە سیاسی و بیرۆکراسی کورد هەبوو، هەرچەندە بە شێوەیەکی سنوورداریش**

لە مەیدانی شـەڕگەدا لەسـەر قسـەی بارزانی بۆ ماوەی مانگێک ڕاوەسـتا، بەڵکو بەغدای نوێ لەهەمبەر داواکـانی کورددا کـاردانەوەیـان هەبێ. لە بەرانبەریشـدا عەبدولڕەحمان عارف، ئەلعوقەیلی شـەڕخوازی لادا و زیاتر پشـتی بە عەبدولڕەحمان ئەلبەزاز بەست. لەگەڵ ئەوەشـدا گەشـبینییەکەی کوردان زوو ڕەوایەوە، ئاخر ژەنەڕاڵەکانی سـوپا گرەوی مشـتومڕی وتووێژەکانیان لەبارەی شـەڕەکە بردەوە و لە ٢ی حوزەیرانی ١٩٦٦دا جاڕی شالاوێکی دیکەی هێرشیان بۆ سەر کورددا دا.[١٥٢] دەزگای سوپا بە ٤٠،٠٠٠ سـەربازەوە پەلاماری کوردسـتانی عێراقیان دا. مەبەسـتی سـەرەکییان بڕینی هێڵی ئازوقەی چیا بوو کە لە ئێرانەوە بۆ بارەگاکانی بارزانی لە ڕواندز دەهات. سەت فڕۆکەی جەنگی کوردیان بە گازی ژاراوی بۆمباباران کرد، گوندەکانی ئێرانی نزیک سـنوور لەگەڵ عێراقیان وێران کردن.[١٥٣]هەروەها سوپای عێراق ڕێگای دابینکردنی سەرەکی ئازوقی کە لە سـنووری ئێرانەوە دەهات و چیایەکی سـتراتیژیش، وەک چیای زۆزکی گرت.[١٥٤]لەگەڵ ئەوەشـدا ، هێشـتا ژەنەڕاڵەکانی عێراقی بێ ئاگا بوون لەو

---

بووبێ. ئەوەی ڕاستی بێ، ئەو سـووکە گرژییانە [لە نێوان قاسـم و پارتی دیموکراتی کوردسـتان] بوونە مایەی ئەوەی مەیلی بۆ [هاوکاریکردنی] کورد نەچێ. بە پێچەوانەی ئەویشـەوە، عەبدولسـەلام عارف ڕوانینێکی پان عەرەبیانە ڕاسـیزمی و تەنانەت شـۆڤینیانەشـی دەرهەق کورد هەبوو. ئەو بڕوای وەهابوو کە کورد عەرەبن.- ئەو تیۆری قۆڕی هەبوو، وای دەگوت گوایە کورد عەرەب بوون، ئەو عەرەبانە بوون کەوا وردە وردە بە تێپەڕینی سـەدەکان زمانیان گۆڕا و لە شـاخان نیشـتەجێ بوون!

Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran) p. 786.

[152] O'Ballance, Edgar, The Kurdish Revolt, 1961–1970 (London: Faber and Faber Ltd., 1973) pp. 136–7.

[153] Paris 3800 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 18 March 1966.

[154] Baghdad A-212 to U.S. Department of State, "Kurdish and General Iraqi Situations," September 14, 1966 (NARA/RG59/CFPF /1964–66/Box2339 /POL 13-3–Ethnic Minorities), p. 1.

قووڵایی پشتگیریی مۆساد-ساواک بۆ کورد. **بە پشتیوانی لۆجستییانە سوپای ئێرانی و ساواک و بە فەرماندەیی ئەفسەری ئیسرائیلی، زوری ساگی Zuri Sagy، پێشمەرگە لە چیای هەندرێندا گەمارۆی لەشکری عێراقیان دا. دوای دوو ڕۆژ لە شەڕێکی دەستەویەخەی خوێناوییدا، ١٤٠٠ تا ٢٠٠٠ سەربازی عێراقی کوژران و بەسەدانیشیان لێ بەدیل گیران و بڕێکی زۆری چەک و تەقەمەنیشیان لەپاش بەجێما.**[155] شەڕی چیای هەندرێن ورەی سوپای عێراقی وردوخاش کرد و هەڕەشەکەی سوپای عێراقیشیان بە پەندی زەمانە برد. ئەمەش لووتکەی شەڕی ژێربەژێری ئێران-ئیسرائیل بوو لە کوردستانی عێراقدا.

شەڕی چیای هەندرێن بێکەڵکبوونی بەکارهێنانی زەبروزەنگی دڵڕەقانەی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردی سەلماندەوە، ئیدی بەغدای ناچارکرد چارەسەرییەکی ئاشتیانە بخاتە بەردەم بارزانی. پاش چەند هەفتەیەکی کەم لە گفتوکۆ، عەبدولڕەحمانی سەرۆوەزیر "نەخشەی دوازدە خاڵی" ڕاگەیاند، کە بە "جاڕنامەی بەزاز" ناسراوە و لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦دا ڕاگەیەنرا. ئەم جاڕنامەیە داخوازییە سەرەکییەکانی کوردی لەخۆگرتبوو،[156]

---

[155] Pollack, Kenneth. Arabs at War: Military Effectiveness, 1948–1991 (University of Nebraska Press, 2002) p. 163.

[156] جاڕنامەی بەزاز پێکهاتبوو لە: (١) دانانان بە مافە نەتەوەییەکانی کورد. (٢) لامەرکەزی ئیداری بۆ ئەوەی ئەو مافانە دەستەبەر بکا، (٣) دانان بە زمانی کوردی وەک زمانێکی فەرمی، (٤) نوێنەرایەتی کورد لە پەرلەماندا هەبێ، (٥) کورد هاوبەش بێ لە پلەوپایە فەرمییەکان، (٦) کوردی خوێندن بۆ کوردان و لقی زانکۆی بەغداش لە باکوور بکرێتەوە، (٧) حکوومەتی کاربەدەستی خۆجێی کوردی دابمەزرێ، (٨) ڕێگە بە ڕێکخراوە کوردییەکان بدرێ، (٩) لێخۆشبوون بۆ کوردان دەربکرێ، (١٠) پێشمەرگە بۆ پلە و پێگەی جارانیان بگەڕێنەوە و هەندێکیان لە ڕێکخراوی خۆیان (وەک پێشمەرگە) بمێننەوە؛ (١١) باری ئابووری ئاسایی و کۆمەک بکرێ و لە کۆتاییشدا (١٢) نیشتەجێکردنەوەی کورد و غەیرەکورد لە شوێنەکانی جارانیان. بڕوانە: Baghdad A-1065 to U.S. Department of State, "Iraqi Government's 12-Point Proposal to the Kurds," June 22, 1966v(NARA/RG59/CFPF/1964–66/Box2339/POL 13-3–Ethnic Minorities), pp. 1–2.

دەستبەجێش جاڕنامەی بەزاز لە لایەن بارزانییەوە پەسەند کرا، هەرچەندە شەشەمین کۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستان ئاماژەی بەوەدا، کەوا کورد هێشتا لە نۆڤێمبەری ١٩٦٦دا ئاماژە بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی دەکا. هەروەها جاڕنامەی بەزاز لە لایەن ئەمریکاوە پێشوازی لێکرا، لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر کەسایەتی لاوازی عەبدولڕەحمان عارف نەیتوانی لە بەغدا کۆتایی بە ململانێی دەسەڵات بهێنێ. لەگەڵ ئەوەی جاڕنامەی بەزاز دەستکەوتێکی بازگرتوو بوو، کەچی بە توندی لە لایەن سوپاوە ڕەخنەی لێگیرا، ئاخر گومانیان لە نیازی بەزاز هەبوو بەوەی بودجە و زێدەمافەکانی سوپا سنووردار بکا. ئیدی بەهۆی کودەتایەکی لەبارچووی ناسرپەروەرەکان لە ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٦٦دا، کە لەلایەن ژەنەڕاڵ عارف عەبدولڕەزاقی سەروەزیری پێشتر سەرکردایەتی دەکرا،[157] ئەوەبوو سوپا فشاری لەسەر عەبدولڕەحمان عارف چڕتر کردەوە و لە ٦ی ئابی ١٩٦٦دا بەزازیان بە ژەنەڕاڵ ناجی تاڵب گۆڕی و ئەو تاکە حکوومەتە مەدەنییەی پێش سەردەمی ٢٠٠٣ عێراق کۆتاییپێهات.

شەڕەکەی چیای هەندێک سووکە بووژانەوەیەکی بە پەیوەندییەکانی بەغدا-تاراندا دا. بەزاز تکای لە شا فەیسەڵی عەرەبستانی سعوودی کرد بەڵکو نێوانی ئێران و وڵاتەکەی بکا. بە ڕۆڵی کارای مەهدی پیراستەی باڵوێزی ئێران لە بەغدا، هەردوو وڵات دوای چەند خولێ گفتوگۆ، گرژییەکانی نێوانیان خاوکردنەوە و بەوەی پڕوپاگەندی قوڕس و توندیان لە دژی یەک هەڵگرت و کۆمیتەیەکی هاوبەشیشیان بۆ ناکۆکییەکانی سەرسنووریان پێکهێنا و ئێرانیش هێزی خۆی لە خاڵە وروژێنەرەکانی سەر سنور کێشایەوە. لە دیسێمبەری ١٩٦٦دا، عەباس ئارامی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران چووە بەغدا، لە بەرانبەریشدا عەبدولڕەحمان عارف لە

---

[157] ئەو لەوکاتدا سوپاسالاری هێزی ئاسمانی بوو.

Baghdad 12 to U.S. Department of State, July 2, 1966 (FRUS/1964–68/XXI/doc.182).

١٣ی ئازاری ١٩٦٧دا سەری تارانی دا و لە کۆشکی نیاڤاران لەگەڵ شادا کۆبووەوە. هەردوو سەرۆکەکە لەبارەی یەکاوی عەرەب و کێشەی کورد گەیشتنە ڕێککەوتنێک. عەبدولڕەحمان عارف هەوڵیدا پەیوەندیەکی دۆستانە لەگەڵ شا خۆی ببەستێ. بە گوێرەی قسەی جەعفەر ڕائیدی دیپلۆماتی ئێرانی بێ، لە گەرمەی گفتوکانیاندا، عارف پێشنیازی بۆ شا کرد بەڵکو گفتوگۆکانیان دووبەدوو، بەبێ ئامادەبوونی هیچ کام لە دیپلۆمات و وەزیر و باڵوێزەکانیش بێ. "عارف هەر عەرەبی دەزانی، ئەوسا بانگی وەرگێڕ کرا. لە کۆبوونەوەکەدا، عارف بەڵێنی بە شا دا کۆتایی بە کێشەی ئەروەند ڕود بهێنێ و ئامانجەکانی شا بەدیبێنێ. داواشی لە شا کرد کۆمەک لە سەر کورد ببڕێ. شاش دەستبەجێ ڕەزامەند بوو[158] ئەمەش سەرکەوتنێکی شا بوو. ئامانجی سەرەکی شا بردنەوەی کێشەی سنووری بوو لە ئەروەند ڕود و ڕێگریش بکا لە پێکهێنانی ڕژێمێکی ناسرپەروەر لە بەغدا. کاتیش لە پشتی شاوە بوو.

### ساڵە وەرچەرخاوەکانی ١٩٦٧-١٩٦٩

ئیسرائیل لە ٥ی حوزەیرانی ١٩٦٧دا، شەڕێکی خۆپارێزی لە دژی میسر و سوریا و ئوردن جاردا. هێرشەکە بۆ عێراق مایەی سەرسامی بوو، ئاخر نەیدەتوانی بەشداری شەڕەکە بێ، هەرچەندە مۆڵگەی فرقەی سێیەمی زرێپۆشییشی لە ئوردن، لە نزیک کەناری ڕۆژئاوا دامەزرابوو. لەپاڵ سەرکەوتنە تەڕدەست و چارەنوسسازییەکەی ئیسرائیل بەسەر سوپای ئوردنی لاوازدا، هەڕەشەی کوردیش دەست و پێی سوپای عێراقی لە کوردستان بەستبووەوە. بەغدا بەهۆی دابەزینی ورەی دوای شەڕی چیای هەندرێن نەیدەویست سەرچڵی بکا و ڕووی سوپاکەی لە کوردستان

[158] Qaneifard, Erfan, [Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman (Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 159.

وەربگێڕی.[159] بە ماوەیەکی کەم بەر لە هەڵگیرسانی شەڕی شەش ڕۆژە، "ئاژانێکی ئیسرائیلی... سەردانی مەلا مستەفای کرد بەڵکو ئەگەر ڕێتێبچی کورد دەست بکاتەوە و هەندێ شت بکا تا دەستوپێی سوپای عێراقی ببەستێتەوە."[160] **هەرچەندە کورد لە حوزەیرانی ١٩٦٧دا هیچ هێرشێکی نەکرد، لێ هاوکاریی سەربازییانەی کورد-ئیسرائیلی گومانەکانی ساواک و سوپای ئێرانی پشتڕاستکردەوە بەوەی ڕۆڵی ئیسرائیلییەکان لە کوردستانی عێراقدا لە هەڵکشاندایە. شتەکە ئەوەی نیشان دا کە بارزانی دەتوانێ بەسەر ساواکادا بازبدا و خۆی لەگەڵ لە دژی هەر دەوڵەتێکی هەرێمی خۆی گرووپبەندی بکا. لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەو سەرکەوتنە وێرنکارییەی ئیسرائیل، تەوژمی ڕادیکالیزم و دژە ئامریکایی لە جیهانی عەرەبدا تاودا.** لەوەش باڵکێشتر کاردانەوە ناکاراییەکەی بەغدا لە شەڕەکەدا، ڕژێمی نەرمڕۆی عارفی لەبەرژەوەندی "توندئاژۆکان لەژێر ناوی یەکێتیی نەتەوەییدا" لاواز کرد.[161] لەسۆنگەی زەرەرمەندبوونی نمایشی پێگەی ڕژێمی عارف لەپاش شەڕی چیای هەندرێندا، مەیدانەکە بۆ پیلانی بەعس و گرووپە ناسیونالیستەکانی عەرەب لەبارتر بوو.[162]

---

[159] Pollack, Kenneth. Arabs at War: Military Effectiveness, 1948–1991 (University of Nebraska Press, 2002) p. 167.

[160] U.S. Department of State, Bureau of Intelligence and Research, "New Kurdish Insurgency Threatens," IN-709, September 1, 1967 (FRUS/1964–68/XXI/doc.197).

[161] Baghdad 2143 to U.S. Department of State, June 8, 1967 (FRUS/1964–68/XXI/ doc.195).

[162] بەگوێرەی سی ئای ئەی بێ؛ "هاوسەنگی هێز بە شێوەیەک هیچ گرووپێک ئەوەندە هێز و دەسەلاتەی نەبێ کە هەنگاوی لێبڕاوانە بنێ، ئەنجامەکەی هەر ئەوەی لێدەکەوێتەوە کە زۆر لایەنی بایەخداری سیاسی و ئابووری بە سووک و ئاسانی بەلاوە بنرێن.

* CIA, "Iraq: The Stagnant Revolution," SM 11-68, May 22, 1968 (JPL/NSF/HSF/Box16/Iraq 4/1/66-1/20/69/doc25), pp. 1–15.

وەرچەرخانی ژێرخانی قۆناغی دوای جەنگەکە لە مەودای جیۆپۆلیتییکی لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا جاڕنامەی ١٩٦٨ی لەندەنی بۆ کشـــاندنەوەی هێزە چەکدارەکانی لە "بەری ڕۆژهەڵاتی نۆکەندی ســـوێس لە کۆتایی ١٩٧١دا" بەدواداهـات. لەنێو جەرگەی جۆشـــوخرۆشـــی ڕەوتی دژە ئـامریکـایی دوابەدوای جەنگی شـەش ڕۆژە و ڕاگەیاندنی بریتانی لەبارەی کشـانەوەی هێزەکانی لە ناوچەکەدا ، ئەوەبوو مۆسکۆ جووڵەی خۆی بۆ دەستڕۆیشتنی لە نێو عێراقدا چڕترکردەوە. لە ٢ی نیسـانی ١٩٦٨دا، مۆسـکۆ ڕێککەوتنێکی نەوتی لەگەڵ بەغدا مۆرکرد و لە ١١ی حوزەیرانیشـــــدا، هێزی دەریـایی ڕوســـی بۆ یەکەمین جار لەوەتەی ١٩٠٣ەوە گەیشـــتە کەنداوی فارســـی سـەردانی بەندەری فاوی عێراقییان کرد. ئەمەش پێشوەچوونێکی بەرچاوی پەیوەندییەکانی ڕوسـی-عێراقی بوو کە بۆ ئەمریکا هۆشـداری بوو. هارۆلد سـاندرس پێشنیازی بۆ کۆشـکی سپی کرد، بەڵکو پشتگیری کورد بکەن "تا ئەوکاتەی هۆکاری گونجاو بۆ گۆڕینی هەڵوێســـتەکەیان دیتەگۆڕێ."[١٦٣] بۆ یەکەمین جار بوو "کێشەی کورد وەها ختوکەدەر نەبێ."[١٦٤]

**بریکاری ئێرانیی غەیرەکورد**

لادانی بەزاز، کەسـایەتی لاوازی عەبدولرەحمان عارف ئەگەری کودەتایەکی نزیک لە بەغدا، هەموو ئەمانە بەســـەریەکەوە دوودڵییەکەی شـــای ئێرانی قووڵترکردەوە لەوەی ســـەبارەت بە ســـنوری کێشـــەلەســـەر لەگەڵ عارفدا بکەوێتە دانوسـتاندن. وێڕای قایلنامەی تەواوی عارف بە داواکانی ئێران بۆ خاک کە لە لێدوانەکەی تارانیدا دیاربوو، کەچی شـــا نەیدەویســـت گرەو

---

[١٦٣] ساندرس گەورە یاریدەدەری ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین، دوای دیدارێکی لەگەڵ شـەفیق قەزازی نوێنەری بارزانی ئاماژەی بە پێشـنیازی وەها بۆ کۆشـکی سپی کرد

. "Memo for Mr. Goldstein," March 13, 1968 (JPL/NSF/HSF/Box16/Iraq 4/1/66-1/20/69/ doc.6), p. 1.

[١٦٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو

لەســــەر ڕژێمێکی لاوازدا بکا، کە لە گیانەڵای ململانێی دەســــەڵاتدایە. لە هەمان کاتیشـــــدا ئێران، خۆی لەوە بەدوور گرت هەموو هێلکەکانی خۆی بخاتە نێو ســـەبەتەی کورد. شـــیعەی عێراق و حزبی بەعســـی دژەناســـر ئامانجی ژێربەژێری ئێران بوون. هەرچەندە هاوپەیمانیی شـــیعە-ســـاواک دوای کـودەتـــاکەی ١٩٥٨ی عـێـراق زۆر کـــارا نەبـوو، کەچـی ئـێـران پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئەواندا هەر پاراســـتبوو. لە ناوەڕاســـتی شـەســتەکاندا، هەرەشـــەی هاوپەیمانیی عێراق-میســـر ختووکەی شـــیعەی عێراقی دا. هەردوو لایان، کورد و شیعە دژی یەکگرتنی عێراق بوون لەگەڵ میســردا.[165] مەلا گەورەکانی شـیعە لە کەربەلا دابەزینە ســەر هاوپەیمانێتی پـــان عەرەبیزم[166] و ڕەخنەیـــان لەوەگرت کە میســــــر جڵەوی بەغـــدای کەوتووەتەدەســــــت.[167]لەپاڵ عولەماکانی شــــیعەدا، حیزبی فاتیمی دژی یەکگرتنی میسر-عێراق بوو. حزبی فاتیمی وەک حیزبێکی شیعە هێشتا هەر پشتگیریی لە بیرۆکەکانی قاسم دەکرد،[168] پشتی داواکانی کوردیشی گرت و بەڵێنی بە بارزانیش دا کە شــــیعە لەگەڵ ئۆتۆنۆمییە بۆ کورد.[169] حیزبی فاتیمی بە ڕاوێژی تاران تێکۆشــــا بەڵکو کوردی عێراق و حیزبی بەعس لە دژی عارف بگەیەنێتە یەک.[170] ســەرباری پڕوپاگەندەی عێراقی لە دژی شـا و وێناکردنی بەوەی هاوپەیمانی ئیسرائیلە، کەچی ئێران بەرەی دووەمی لە بـاشـــووری عێراق پێکهێنـا. بە زیـادبوونی لایەنـداریێتی ئێران لە لایەن شیعەکانی عێراقەوە، ئەوەبوو عارف هەڕەشـەی دەرکردنی لە ئاخوندەکانی شـــیعە کرد، بەتایبەتیش لە ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم کە وای لێبکا بۆ ئێران بار بکا. ئەم جووڵەیە ڕووهەڵماڵراوە بە توندی لە لایەن جڤاتە شـــیعییەکانی

---

[165] SAVAK Documents, No. 326/609, 8 June 1964.
[166] SAVAK Documents, No. 768, 15 July 1964.
[167] SAVAK Documents, No. 1097, 14 August 1964.
[168] SAVAK Documents, No. 7 March 1965.
[169] SAVAK Documents, No. A-872, 4 December 1964.
[170] SAVAK Documents, No. 313/35298, 1 January 1965.

هەرێمەکە بەر ڕەخنە درا.[171] لەگەڵ ئەوەی عارف هەڕەشەکەی جێبەجێنەکرد، کەچی لەنێو ڕێکخراوە سیاسییەکانی شیعەدا، تا دەهات هەستی دژەبەغدا پتر گەشەی دەکرد.

حیزبی بەعس لە ١٩٤٣[172] و لەسەر دەستی میشێل عەفلەق و سەلاحەدین ئەلبیتار بە دروشمی "یەکێتی، ئازادی، سۆسیالستی" وەک دەربڕێکی نوێی پان عەرەبیزم و شۆشیالیزم دامەزرا. وێڕای پەسندانی بۆ چالاکیی شۆڕشگێڕیی بۆ گەیشتن بە یەکێتیی عەرەب، کەچی حزبی بەعس لە شەستەکاندا هێزی سەرەکی بوو لە جیهانی عەرەبیدا کە دارِسابووە ناسر. لەپاڵ ڕوانینە دژەناسرییەکەی خۆی، ئایدۆلۆژیای دژەکۆمۆنیستی حزبی بەعس ڕێک لەگەڵ ئاسایشیی نەتەوەیی ئێرانیدا دەهاتەوە. هەر بەڕاستیش، بۆ سەرکوتکردنی خوێناوی حزبی شیوعی عێراقی، ساواک هاوکاریی حزبی بەعسی کرد.[173] دیاربوو پەلاماری میلیشیای بەعس بۆ سەر کورد لە هاوینی ١٩٦٣دا وایکرد پەیوەندییەکانی لەگەڵ ساواک بپچڕێ؛ هەرچۆنێک بێ کاتێکیش عەبدولسەلام عارف لە هاوینی ١٩٦٤دا حزبی بەعسی دەرکرد ، ساواک پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەرکردەکانی بەعس گرێدایەوە، بەتایبەتیش لەگەڵ ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆوەزیری پێشوو. سەرانی بەعسیش بەشێوەیەکی بەشەکی پشێوازییان لە پشتگیری ساواک بۆ ڕووخانی ڕژێمی عارف کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، هاوکاریی ژێربەژێری بەعس-ساواک ئەنجامی خۆی بەدەستەوە نەدا، هۆکارە سەرەکییەکەشی

---

171 SAVAK Documents, No. 313/20615, 5 July 1965.

١٧٢ ئەوەی ڕاستی بێ وەک لە بڵاوکراوەکانی مێژووی حزبی بەعسدا هاتووە، حیزبەکەیان لە ١٩٤٧دا دامەزراوە. وەرگێڕ.

173 Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 170.

بۆ مەیلی پێشـــنۆرەی ئێران دەگەڕایەوە کە لەگەڵ پێکهێنـانی ڕژێمێکی هاشمیپەروەر بوو لە بەغدا.[174]

### ٢ هەڵکشان: شیعەی لوبنان

*شا بە ئەفسەرەکانی ساواکی گوت: **"سەدر (لە بەرژەوەندی ئێراندا) بەقەد سێ باڵوێزی ئێران لە لوبنان کارایە."***[175]

*لە ڕاپۆرتێکی سـاواک لە شـەسـتەکاندا هاتووە: **"سـەدر بووەتە 'دڵی لوبنان'"***[176]

### یەکەمین گرژی

سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لوبنان لە ناوەڕاسـتی شـەسـتەکاندا گەیشـتبووە لووتکەی خۆی. ڕایەڵەی سـاواک لەگەڵ چەندین ڕۆژنامە و کەسانی دەستەبژێری لوبنانییدا هەروەک لەگەڵ شیعەی لوبناندا سەرکەوتووانە هەڵمەتێکی دژە ناسری لە بەیروت ڕاگەیاند. نزیکەی هەموو توخمگەلە پان عەرەبییەکان لە لوبنان سـوننەمەزهەب بوون، فشـاریان خستبووە سەر بەیروت تا لەگەڵ کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو یەکبگرن یان لەگەڵ قەوارەیەکی گەورەتری عەرەبی. ئیدی لەژێر ئەو بەرڕەوتەدا بوو کە تێکۆشـانی سـەدر بۆ بووژاندنەوەی ناسنامەی شیعە و لابردنی بەربەستە بەردرێژەکانی بەردەم جڤاتە شیعییەکان بووە مایەی لاوازکردنی توخمگەلی ناسرپەرەوەرەکان. سـەدر بە شـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ بووبووە بزوێنەری سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لوبناندا.

لەپاڵ کەسـایەتییە کارێزمایەکەی، هەندێ کردەنیازی دیاریکراوی دەسـەڵات لە لوبناندا ئەو دەرفەتەی بە سـەدر دا ناسـنامەی بەکۆمەڵی شـیعە

---

[174] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٧١.

[175] SAVAK Documents, No. h/7/9048, 14 October 1965.

[176] SAVAK Documents, No. (39–40).

ببووژێنیتەوە. مارۆنییەکان لە بەرانبەر دارِسانی ناسرپەروەرەکان و سوننەی لوبناندا، سەدریان وەک ئەگەرێکی هاوپەیمانی خۆیان دانا. ئاخر هەر لە بەرایی شەستەکانەوە، سەدر رایەڵەی پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ کریستیانەکان راچاندبوو. "**جەنابی خاوەن پایە! من زۆرم لەبارەی تۆوە بیستووە! من بڕوام بەوە هەیە کە مێژووی لوبنان دابەش دەبێتە سەر دوو سەردەم، 'هی پێش سەدر و هی دوای سەدر،'**" ئەمە قسەی کاردینال فرانس کوینینگی سەرقەشەی ئاشوورییەکان بوو بە سەدری گوت.[١٧٧] مارۆنییەکان، نەخاسمە سەرۆک فوئاد شەهاب هەر لە بەرایی شەستەکانەوە پشتگیریی دارایی سەدری کردوە.[١٧٨] هاوپەیمانێتی مارۆنی-شیعە رەنگدانەوەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی بوو.[١٧٩]بەگوێرەی قسەی باڵوێزی ئەمریکا لە بەیروت بێ، کەسایەتی سەدر "ئاڵنگاری پڕجەماوەریی ناسری دەکرد لە لوبنان."[١٨٠] مارۆنی و دەستە و تاقمەکانی دیکەی کریستیانی وەهایان دەڕوانییە هەوڵوتەقەللای سەدر بۆ بووژاندنەوەی رەگوڕیشەی شیعە لە لوبنان، کەوا قەلا و چەپەرێکی مەحکەمە بەرووی هاتنە ناوەوە و دزەکردنی ناسر بۆ لوبنان. بەو زانیارییەی هاوپەیمانی دژەناسریی شیعە-مارۆنی، پێدەچوو سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لوبنان بەری دابێ.

---

[177] Kamalian, Mohsen and Ali-Akbar, Ranjbar-Kermani, Ezat-e Shia, (winter 1377, Sahife Kherad press, Qom) p. 20.

[١٧٨] مەنسوور قەدەر گوتی گوایە مارۆنییەکان لە حازمییەدا تەلارێکی ناوازەیان بۆ سەدر کڕیوە.

Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian Hi Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History story.

[179] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

[180] SAVAK Documents, No number, 15 June 1966.

لەگەڵ ئەوەشـــدا لە حوزەیرانی ١٩٦٣دا وێنەی ســـەدر لە تاران تەڵخ بوو، ئەمەش دوای "شۆڕشی سپی" شا هات، کە چەندین مەلای گەورەی شیعە بەتایبەتیش ئایەتوڵڵا ڕوحوڵڵا خومەینی دارِسایە دەسەڵاتی پەرەسەندووی شـــا. ســـەدریش لەپاڵ زۆر لە بیچمە بەناوبانگەکانی دینییەوە، نامەکەی لە دژی شـــا واژۆ کردبوو.[١٨١]لەو نێوەشـدا شـەپۆلی نارەزایەتی خۆپیشـاندانی بزووتنەوەی ١٥ی خورداد هەرزوو بەنێو ئێراندا تەقییەوە و بووە ئاژاوە و ڕاوەدوونانی پڕ لە توندوتیژی. ئیدی دەســـتبەجێ شـــا و ســـاواک هێزی دەرەکیان بەتایبەتیش میسریان سەرکۆنە کرد بەوەی لەپشتی ئەو پشێوی و ئاژاوەوە بووە. ڕێک و ڕەوانیش هەر دوای خۆپیشـــاندانەکان، ســـەدر هەوڵیدا ئایەتوڵڵا خومەینی ئازاد بکا، ئاخر ئەو حوکمی مەرگی بەســـەردا درابوو. بۆ ئەم کارەش، ئەو داوای لە مامۆســـتاکەی خۆی، لە ئایەتوڵڵا سـەید ئەبولقاسـم کرد بەڵکو قەناعەت بە شـا بێنێ تا حوکمی لەسـێدارەدانی خومەینی ڕابگرێ.[١٨٢] هەروەها ســـەدر، پاپا پاولی شـــەشـــەمیشـــی بینی و داوای لێکرد فشـار بخاتە سەر شـا. "دوابەدوای پشێوی و ڕاوەدونانەکەش، چەندین ئاخوندی گەورە داوایان لە ســـەدر کرد بەڵکو تکا لە شـــا بکا ئایەتوڵڵا خومەینی و چەندین ئاخوندی شـــیعە دیکە لە زیندان ئازاد بکا. ئیبراهیم یەزدیش لێدوانی وەهای دا؛ "من ئەوە دەزانم کە ســـەدر نامەیەکی بۆ شـا نووسـی."[١٨٣] هەر بەڕاسـتیش هەوڵ و تەقەللای سـەدر لەپاڵ داوای پـاپـا و نـاوبـژیـی کـاریـگەرانەی ژەنەراڵ پـاکـرەوان و ئـایەتـوڵـڵا شـەریعەتمەداری،[١٨٤] لە هەمووشـــی ســـەرنجڕاکێشـــتر هەوڵەکانی ئایەتوڵڵا

---

[181] SAVAK Documents, No. 241/573, 17 July 1965.

[١٨٢] ئایەتوڵڵا خوئی پشـتڕاسـتیکردەوە کە بەهۆی سـەدر بوو شـا ئایەتوڵڵا خومەینی بەردا. بڕوانە: http://fa.alalam.ir/news/1511871.

[183] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

[١٨٤] لەکاتێکدا هەڵوێست توندەکان لەناو ڕژێمدا وەک ئەعلەمی سـەروەزیر و نیعمەتوڵڵا ناسری سـەرۆکی سـاواک فشـاریان خسـتە سـەر شـا تا خومەینی لە سێدارە بدا، کەچی پاکرەوانی بەڕێوبەری سـاواک قەناعەتی بە شـا هێنا تا ڕێگە بە ئایەتوڵڵا شـەریعەتمەداری مەرجەعی

حوسـێن عەلی مونتەزری هۆکاری سـەرەکی بوون قەناعەتیان بە شـا هێنا بە حوکمی مەرگی ئایەتوڵڵا خومەینیدا بچێتەوە. باڵوێزخـانەی ئێرانیش لە بەیروت بە توندی ڕەخنەیان لە سەدر گرت کە چۆن نامەکەی لە دژی شادا واژۆ کردووە. سەدریش هەوڵیدا گرژییەکە خاوبکاتەوە بەوەی بڵێ نامەکەی لەبەر خاتروخۆتری ئاخوندەکان واژۆکردووە تا پەیوەندییەکانی لەگەڵیان بپارێزێ.[185] ئەو بە وەزیری کـاروبـاری دەرەوەی پاپـای گـوت کە "گەورە ئایەتوڵڵاکان نارەزایەتییەکی گشتییان لەسەر شۆڕشی سپی نییە، هەرچەندە دەیـانەوەێ هەنـدێ لە وردەکـارییەکـان هەموار بکرێنەوە؛ بۆ مـایەی بەدبەختیش، هەندێ لە سـەربزێوەکان لەپشـت ئەو ئاژاوەی هەنووکەیەی ئێران بوون و هەرزووش تەمی نیگەرانی گەورە مەلاکانیش ڕەوایەوە."[186] وێڕای گومانی ساواک، کەچی تاران نەیدەویست پەیوەندییە ستراتیژییەکەی لەگەڵ ئەودا بپچڕێنێ. سـەدریش لای خۆیەوە گرژییە هەڵچووەکانی لەگەڵ ئێرانـدا خـاوکردنەوە. بە گـوێرەی قسـەی یەزدی بێ، "دوابەدوای خۆپیشـاندانەکانی ١٩٦٣، ئایەتوڵڵا خونسـاری ڕێنمایی دایە سـەدر تا پەیوەندی باشـی لەگەڵ شـادا هەبێ، بەهۆی ئەوەی کە شـیعەی لوبنان بۆ شـا گرنگن."[187] دوای هەموو شـتێکیش، بەجەماوەربوون و پێگەی سـەدر لە نێو کۆمەڵگەی لوبنانیدا هی ئەوە نەبوو بوەستێنرێ.

ڕێزلێنگیروای قوم بدا بۆ ئەوەی ڕاپیگەیەنێ کە ئایەتوڵڵا خومەینیش مەرجەعە، بەم جۆرە ژیانی بپارێزرێ.

[185] Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK (January 1997) Middle Eastern Studies, 33 (1): 74.

[186] SAVAK Documents, No. 231/2/8702, 16 December 1963.

[187] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

**بەجەماوەربوونی ئیمام**

هەرزوو سەدر لە لوبنان سەرکەوتنیی سیاسی-کۆمەڵایەتی و پێگەیەکی بێپێشینەی لەنێو جڤاکی شیعەدا بەدەستهێنا. دەستکەوتەکانی بەزۆری لەسەر توانستی بۆ کۆکردنەوەی هێزی شیعە ڕۆنرابوون. کاریزمای کەسایەتی ئەو و وزە لەڕادەبەدەرەکەی سەرنجی ڕووبەرێکی زۆری لە شیعەکان بۆ خۆی ڕاکێشا. بەردی بناغەی هزری سەدر لەسەر بنەمای ڕەتکردنەوەی شیعەگەرایەتی نەریتخوازی بوو، کە ئەویش لەسەر پەسەندکردنی بێبەشکردنی شیعە ڕۆنرابوو. ڕوانینی ئەو بە توندی دژی ڕۆڵی بیچمە دینیەکانی شیعە لە نێو کۆمەڵگا و لە بواری سیاسییەوە وەستایەوە. بۆ چەندین سەدە، شیعەکانی لوبنان پێیان باشتر بوو "ڕاڤەکردنێکی نەرمونیانانەی" ئەو گۆشەنیگایە هەڵبگرن و بەرگەی ژیانە کولەمەرگی و چەوساندەوەکەیان بکەن تا "دونیا کۆتایی پێدێ"، تا ئەوکاتەی "مەهدی"ی دوازدەمین ئیمام دەگەڕێتەوە و حکوومەتێکی دادپەروەرانە بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دادەمەزرێنێ. هەربۆیە ، دەبووایە ئاخوندەکانی شیعە خۆیان لە هەڵقورتاندن لە کاروباری سیاسی بەدوورگرتبا، ئاخر خۆ حکومەت ناڕەوایە، هەقە لەبری ئەوەدا دەبێ ئەوان خۆیان بۆ دین و چالاکییەکانی دینی تەرخان بکەن. ئەم ڕوانینە لەبۆتەی ڕوانینی جەبریەت/جەبرگەرای جیهانبینی بوو بەوەی دەبێ شیعەی ئیماندار بە چارەنووسی خۆی قایل بێ، هەروەک چۆن حوسێنی کوڕی عەلی [ئیمامی سێیەمی شیعان] لە کەربەلا کردی. ئەوەش ڕوون و بەرچاو بوو کەوا هیچ بوارێک بۆ چاکسازیی کۆمەڵایەتی-سیاسیی نەبوو کە مەلایەکی دیار ڕابەرایەتی بکا. کەچی بەپێچەوانەوە سەدر ڕێچکەیەکی دیکەی نیشانی شیعەی لوبنان دا. زۆریش لە قەشە کاسۆلیکەکانی ئەمریکای لاتین و لاهوتییە ڕزگارکەرەکەیان دەچوو، ئاخر سەدر ماندونەسانە کاری لەسەر باشکردنی پێگەی کۆمەڵگەی شیعە کرد و وای لێکردن دەنگ و و ناسنامە و هێزیان هەبێ. ئەو پەیامەکەی وەها ڕوونکردەوە: "**لەهەر کوێیەک هەزاران**

**خۆیان لە شـۆڕشـی کۆمەڵایەتی تێوەگلاند، ئەوا ئەوە پشـتڕاسـت دەبێتەوە کە نادادی چارەنووسـی نووسـراو نییە."**[188] سـەدر بڕوای وابوو کە مەلای شـیعە لەپاڵ ڕۆڵە دینییەکەی، هەردوو ئەرکی سـیاسـی و کۆمەڵایەتی لە ئەسـتۆ دایە. بە لەیەکدانی چالاکیی کۆمەڵایەتی لەگەڵ ناسـنامەی شـیعەدا ئەو بەڕوونی لە پرسـی سـیاسـییانە لە لوبنان نزیک بووەوە. ئەم تێهەڵکێشـییەی بووە هۆی بەدیهێنانی ناسـنامەیەکی نوێی بە کۆمەڵ بۆ شـیعە لەگەڵ عەرەبە سـوننە سـەردەسـتەکانی لوبنان جیابکاتەوە. پەیامە نوێیەکەی سـەدر توێژ و چینە نوێیەکانی ناو کۆمەڵگەی شـیعەی وەک پارێزەران بۆخۆی ڕاکیشـا و ئیدی پردی پەیوەندی بەسـەر ئەو کەلێنە بێمتمانەیەی نێوان خەڵکی هاوچەرخ و نەریتخواز هەروەک لەنێوان دیندار و سـێکولارەکانی نێو کۆمەڵگایەکە هەڵبەسـت. هێز و دەسـەڵاتی سـەدر لە میانەی جەژنی ڕەمەزاندا گەیشـتە لووتکە، کە سـەرۆک شـارل حلو لەنێوان سـەدر و حەسـەن خالیدی گەورە مفتی و ڕابەری سـوونەکانی لوبنان دانیشـتبوو.[189] **وەک دەنگێکی ئاوەزمەندانە پێگەی سـەدر ئەوەندە لای لوبنانییەکان قووڵ بووبووە، ئەوەندە خۆشـەویسـت بووبوو تەنانەت دەنگەکەشیان لاسایی دەکردوە کە شێوەزاری فارسییانەی پێوە دیاربوو.**

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جەماوەرییەی ئەو لەلایەن شیعەی زوعەما بەتایبەتیش کامل ئەلئەسـعەد و کازم ئەلخەلیل (کازم بەگ)ی وەزیری پێشـوو، مایەی ئاڵنگاری بوو. کازم بەگ ناسـەرکەوتووانە هەڵمەتێکی لە دژی سـەدر ڕاگەیاند، ئەوی بە لادانی سـێکسـی لەقەڵەم دا.[190] هەروەها لەسـەر ئەوەش سـەرزەنشـتی کرد، گوایە کار بۆ هەواڵگریی لوبنانی دەکا، کە کارایانە

[188] Norton, Augustus R. Hezbollah: A Short History (Princeton University Press, 2007) p. 40.

[189] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[190] Cobban, H. The Making of Modern Lebanon (London, 1985) p. 172.

سەرۆک شەهابی گەڕاندەوە بۆ ئەوەی زوعەما لاواز بکا.[191] وێڕای شیعەی زوعەما، کۆمەڵگەی سوننەش سەدری بە گەف بۆ هێز و دەسەڵاتی خۆی لە لوبناندا دەبینی. سونە کە زۆربەیان شارنشین بوون هەر لە کۆنەوە لەو وڵاتەدا ناحەزی شیعە بوون. ناسرپەروەرەکانیش لە لوبنان، بەتایبەتی ئەلمروابتون (جووڵانەوەی سەربەخۆی ناسرپەروەر یان INM) بەرابەرایەتی ئیبراهیم کولەیلات ڕەخنەی لەسەدر دەگرت، بەوەی لەبەرانبەر پان عەرەبیزم وەستاوەتەوە و بەوە تۆمەتباری دەکرد کە پشتیوانی لە شای ئێران و پەیمانی سەنتۆوە وەردەگرێ. سوننەش جا قەیدی نەبوو چ هەواداری ڕۆژئاوا بووایە یان پان عەرەبیزم یاخود چەپ، ئەوا دەسەڵاتداریی کەسێک کە لای ئێران (سەید)ی پێدەڵێن وەک ناپاکییەک لە ئامانجی سونە تەماشا دەکرا و بۆ ئەندێشەی یەکێتیی عەرەبی مایەی ئاڵنگاری بوو. ئەمەش دەبووە هەڕەشەیەک بۆ سەر ئەو واقیعە مەحکەمە سەپێبراوەی هەژموونی سوننە لە لوبنان و هەروەها بۆ کشان بەنێو ڕۆژهەڵاتی ناویندا.

سەدر بایی ئەوەندە زیرەک بوو تا بتوانێ هەڕەشەی سوننە و شیعە بەرهەڵستکارەکانی خۆیی سنووردار بکا. ئەو پشتی چاکسازییە سیاسییەکانی شەهاب و پەرەسەندنە کۆمەڵایەتییەکانی کرد. ئەوەی ڕاستی بێ، ئەو هاوپەیمانی سەرەکی شەهاب بوو بۆ بەهێزکردنی سوپا و دەستوەردانی حکومەت بۆ کاروباری ئابووری وڵات. بە ڕوانینی سەدر ئەو بەرنامەیە دەیتوانی شیعە لە ئەگەری پەلاماری ئیسرائیل بۆ باشووری لوبنان بپارێزێ و ڕێکارە جیاکەرەوەکانیش (دیسکریمینێشن)ش لە دژی شیعە هەڵبگرێ. لە سەرووی هەمووشیان، هاوپەیمانیی شەهاب-سەدر ڕێک لەگەڵ سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی بۆ ڕاگرتن و بەرزەفتکردنی

---

191 Johnson, M. Factional Politics in Lebanon: The Case of the Islamic Society of Benevolent Intentions (Al-Maqasid). in Beirut (January 1978) Middle Eastern Studies, 14 (1): 74, n. 31.

پان عەرەبیزم لە لوبنان دەهاتەوە. پاشـــان ئەو هاوپەیمانێتییە لە ٢٤ی ئازاری ١٩٦٤دا بە پێدانی ڕەگەزنامەی لوبنانی بە سـەدر و هاوژینەکەی بە ناوی پەریڤان خەلیلی پتەو و مەحکەمتر کرا. سـاواکیش لەلای خۆیەوە لەبارەی ئەم پێشـهاتە بێدەنگ نەبوو، چونکە ڕەگەزنامەی ئێرانی لە سـەدر هەڵپەسـارد.[١٩٢] هەرچۆنێک بێ ئەم دۆخە کاتی بوو. ئاخر سـەدر بە قەناعەتپێهێنانی پاشایی لە ٢٩ی تەمموزی ١٩٦٥دا سەردانی ئێرانی کرد و شاش فەرمانی بە وەستانی هەڵپەساردنی ڕەگەزنامەی ئەوان کرد.[١٩٣]

لەو نێوەشـدا، سـەدر پەیوەندییە مەحکەمەکانی بە باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروتەوە پاراست. سەدر لە ٥ی نۆڤێمبەری ١٩٦٥دا چاوی بەو ژەنەڕاڵ پەرویز خۆسـرەوانی کەوت و ولاتپارێزی و دڵسـۆزیی خۆی بۆ شـا بۆ دەربڕی.[١٩٤] پاش سـەردانەکەی سـەدر بۆ ڕۆژئاوای ئەفریقا، ئەوەبوو لە ١٤ی تەمموزی ١٩٦٧دا و لە شـاری سـوردا مەنوچەهر داودی، کە ئەفسـەرێکی سـیاسیی باڵوێزخانەی ئێران بوو لە لوبنان بینی و لێپرسی ئاخۆ دەکرێ باڵوێزی ئێران لە لوبنان ببینێ. سـەدریش پێشـوازی لە بیرۆکەکە کرد و ئەوەی نیشـان دا گوایە پشـتگیریی ئەو بۆ ئێران لەسـەر بنەمای "ولاتپارێزی"یە و لەودیوی سیاسـەتەوەیە.[١٩٥] بەڵێ شـا ڕاست بوو لەوەی جارێکیان وەها مشـتومڕی لەسـەر سـەدر کرد و گوتی "**کارەکانی سەدر [لە بەرژەوەندی ئێراندا دەشکێنەوە] بەقەد [کارابوونی] سێ باڵوێزی ئێرانییە لە لوبنان.**"[١٩٦]

لەگەڵ ئەوەشدا ساواک ڕوانینێکی هاوئاوازانەی لەگەڵ سەدردا نەبوو. هەر بۆ نموونە لە کاتێکدا هۆبەی حەوتەمی سـاواک مشـتومڕی لەسـەر ئەوە

---

[192] SAVAK Documents, No. 821/5749, 29 July 1965.

[193] SAVAK Documents, No. 6300, 25 August 1965.

[194] The summarized background of Seyyed Musa Sadr," SAVAK's Seventh Office. Khosravani was the founder of the famous sports club Taj.

[195] SAVAK Documents, No. 1584, 14 July 1967.

[196] SAVAK Documents, No. h/7/9048, 14 October 1965.

دەکرد کە سەدر و پێشوەچوونی شیعە لە لوبناندا "دەکرێ زێدەمافێک بداتە ئێران"[197] کەچی لە هەمان کاتدا هەندێ توخم لە ساواکدا سەدریان بە وتەی دژتاران تاوانباردەکرد. مەبەستیش لە وتەکەی سەدر بوو لە ٢١ی تەمموزی ١٩٦٦ کاتێک پەیمانی سەنتۆی بە "پیلانێکی ئەمریکی" دانا.[198] ئەو توخمانەی نێو ساواک لەو بڕوایەدابوون، کە ڕەخنەی سەدر لە پەیمانی سەنتۆ پشتڕاستکردنەوەی ڕوانینی ناسرییە.[199] هەروەها لەسەر پەیوەندییەکانی لەگەڵ میسر لۆمەیان کرد و ئەویان وەک ئاژانێکی قاهیرە لە لوبنان وێناکرد.[200] هەرچەندە دواتر جێگرتنەوەی سەرۆکی ساواک بە بەختیار وەها لێکدرایەوە کە هۆکاری سەرەکی گۆڕانی سروشت و جەوهەری پەیوەندییەکانی سەدر بە تارانەوە.[201] خۆی ئەو هێز و دەسەڵاتە هەڵچووەی سەدر لە سیاسەتەکانی لوبناندا وایکرد ببێتە بنەمایەک بۆ لێکدانەوە دژەیەکە ڕووکەشەکانی ساواک. ساواک مشتومڕی لەسەر ئەوە دەکرد؛ هەرچەند سەدر خۆشەویستتر و پڕجەماوەرتر دەبوو، ئەوەندە کەمتر پشتی بە ئێران دەبەستێ، لە بەرانبەریشدا هانی سەدر دەدرا، بەڵکو خۆی لە تاران دووربخاتەوە. لەگەڵ ئەوەی سەدر کراوە بوو بۆ پشتگیریی ئێران لە شیعە، بەڵام ئەوەشی نەدەویست وەها وێنا بکرێ گوایە ئاژانێکی تارانە لە نێو وڵاتێکی عەرەبییدا. لە دیدارێکیدا لە ١٥ی ئابی ١٩٦٦دا، ئەو خۆی وەها نمایش کرد، "سەرکردەیەکی دینیی"یە و ئەو "ئەوە دەکا کە بڕوای پێی هەیە" و بۆیە لەکاتێکدا دەکرێ "بە هاوپەیمانی دەسەڵاتدارێکی دیکە لەقەڵەم بدرێ [مەبەستیشی شای ئێران بوو]، بەڵام نابێ ئەوە وەها لێکبدرێتەوە ئەو ملکەچی دەسەڵاتێکی بێگانەیە [نموونەی ئێران]."[202] لەگەڵ

[197] SAVAK Documents, No. 12/54, 3 April 1967.
[198] SAVAK Documents, No. 212/877, 21 July 1966.
[199] SAVAK Documents, No. 241/573, 16 June 1965.
[200] SAVAK Documents, No. 241/573, 16 June 1965.
[201] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.
[202] SAVAK Documents, No. 212/8219, 17 July 1966.

ئەوەشـــدا ئەم ڕوونکردنەوەیەی قەناعەتی بە توخمەکانی نێو ســـاواک نەهێنا،[٢٠٣] کەچی شا هێشتا سەدر و شیعەی لوبنانی بە ئەگەری هاوپەیمانیی ئێرانی دەزانی بۆ بەرزەفتکردنی ڕەوتی پان عەرەبیزم.

[203] SAVAK Documents, No. 4610/14/702, 17 May 1963.

# bibLiogrAphy

## *Archival Collections* Iran

Markaz-e Amouzesh va Pajooheshhay-e Beynolmelali-e Vezarat-e Omour-e
Kharejeh [Center of International Research and Education of the Ministry of
Foreign Affairs]*Published Government Documents*
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Aval, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol I, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Dovom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol II, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Sevom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol III, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Hezb-e Democrat-e Kurdestan-e Araq be Ravayet-e SAVAK [Iraqi Kurdistan
Democratic Party according to SAVAK]
Ravabet-e Iran va Araq be Ravayat-e SAVAK [Iran-Iraq Relations According to
SAVAK]
*United States of America*
US National Archives and Records Administration (NARAI), College Park,Maryland
Central Intelligence Agency Records Search Tool (Crest)
General Records of the Department of State, Record Group 59 (RG59)
Central Foreign Policy Files (CFP), 1967–69
Central Foreign Policy Files (CFP), 1973–76, Access to Archival Databases
(AAD). Available at: http://aad.archives.gov/aad/

Records Relating to Iran, 1965–1975, LOT 77D400
*Congressional Record*
Foreign Relations of the United States (FRUS) (Washington, DC: US Government
Printing Office)
1958–1960
XII: Near East Region; Iraq; Iran; Arabian Peninsula (1992)
1961–1963
XVII: Near East, 1961–1962 (1994)
XVIII: Near East, 1962–1963 (1995)
1964–1968
XXI: Near East Region; Arabian Peninsula (2000)
XXII: Iran (1999)
*Online Document Collections*
National Security Archive, George Washington University (NSA-GWU),
Washington, DC
Digital National Security Archive (DNSA). Available: http://nsarchive.chadwyck.com/
Electronic Briefing Book (EBB) 265. Available at: http://www2.gwu.edu/~nsarchiv/NSAEBB265/
*Author's Interviews*
Ebrahim Yazdi

Published Interviews
*Foundation for Iranian Studies Oral History Collection (FISOHC)*
*General Mansur Qadar*
*Harvard Iranian Oral History Project (HIOHP)*
*Colonel Isa Pejman*
Books
*Al-Samarrai, Wafiq, Hottam al-Bawabat al-Sharqi [The Destruction of the Eastern*
*Gate]. translated in Farsi. (Markaz Asnad va Tahghighat-e Defa-e Moghaddas).*
*Cobban, Helena, The Making of Modem Lebanon (Westview Press, London,*
*November 7, 1985).*
*Dann, Uriel, Iraq under Qasim: A Political History, 1958–1963 (London, Praeger,*
*1969).*
*Johnson, Michael, Factional Politics in Lebanon: The Case of the Islamic Society*

*of Benevolent Intentions (Al-Maqasid) in Beirut (January 1978) Middle*
*Eastern Studies, 14 (1): 74, n. 31.*
*Kamalian, Mohsen and Ali-Akbar, Ranjbar-Kermani, Ezat-e Shia (winter 1377,*
*Sahife Kherad press, Qom).*
*McDowall, David, A Modern History of the Kurds (London: I.B. Tauris, 2007 ed).*
*Norton, Augustus R, Hezbollah: A Short History (Princeton University Press,*
*2007).*
*O'balance, Edgar, The Kurdish Revolt, 1961–1970 (London: Faber and Faber Ltd.,*
*1973).*
*Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the U.S.*
*(Yale University Press, 2007).*
*Pollack, Kenneth, Arabs at War: Military Effectiveness, 1948–1991 (University of*
*Nebraska Press, 2002).*
*Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After*
*Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran,*
*October 2011).*
*Qaneifard, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A*
*Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011).*
*Rubin, Avshalom H., Abd al-Karim Qasim and the Kurds of Iraq: Centralization,*
*Resistance, and Revolt: 1958–63. (2007). Middle Eastern Studies. 43 (3).*
*Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK. (January*
*1997). Middle Eastern Studies, 33 (1).*
*Schonmann, Noa, Israel's Phantom Pact: Foreign Policy on the Periphery of the*
*Middle East: Foreign Policy in the Periphery of the Middle East (I.B. Tauris & Co*
*Ltd, 2015).*

سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لەم ماوەیەدا گەیشـتە لووتکەی خۆی. ئێران بە پێکهێنـانی دووەمین ڕژێمی بەعس لە بەغـدا، کۆمەک و پشتیوانی خۆی بۆ کوردی عێراق چڕتر کردەوە، لە هەمان کاتیشدا لەبارەی ڕێرەوی ئاوی یەکاوی عەرەب (ئەروەند ڕود) فشـاری خسـتە سـەر عێراق. لەو نێوەدا شــا قورسـایی خۆی خسـتە سـەر داوای کورد لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەڵکو بۆ بەرزەفتکردنی هەڕەشـەی عێراق لایەنی ئێران بگرێ. شـا بە بەکارهێنانی زمانە بەرفرەوانەکەی جەنگی سـارد و لە کۆتاییدا لە کۆبوونەوەی لووتکە لە ١٩٧٢ تاران قەناعەتی بە نیکسـن و کیسـنجەر هێنا لە بەرانبەر عێراقدا سـیاسـەتەکەی ئەو پەیڕەو بکەن. لەو نێوەشدا شا وردە وردە شەڕی کوردی بە کێشەی سنوور لەسەر ئەروەند ڕود لەگەڵ عێراقدا دەبەسـتەوە. ئەمەش دەنگ و سـەدای گۆڕانێکی لە سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە کوردستانی عێراق دەگەیاند.

دوابەدوای پاشـەکشـەی جۆشـوخرۆشـی پان عەرەبیزم(عروبە/عەرەبایەتی) لەپاش شـەڕی شـەش ڕۆژەدا و دوای وەرچەرخانی ڕەوتی جیۆپۆلیتیکی ڕێکخسـتنی هێزی هەرێمی، پێگەی بەرچاوی لوبنان بۆ ئێران لەبەرچاو ون دەبوو. سـەدریش لەومـاوەیەدا پشـتگیریی خۆی بۆ جەنگـاوەرە فەڵەسـتینییەکان دەربڕی، پەیوەندییەکانی ئەو بە دەوڵەتە عەرەبییەکانی نـاوچەکە و پشـتگیرییە زیـادبووەکەی بۆ شـۆڕشـگێڕانی ئێرانی، پەیوەندییەکانی ئەوی بە تارانەوە کز کرد. لەوەش سەرنجڕاکێشتر مەنسور قەدەری بـاڵوێزی ئێران بوو لە بەیروت؛ ئەو کەسـەی پەیوەنـدییەکـانی سـەدری بە ئێرانەوە بنکۆڵ کرد. ئەم هۆکـارانە پێشـبـاری گۆڕان و وەرچەرخانی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بوو لە لوبنان.

### ١- بەرزەخ: کوردی عێراق

*شا لە کۆبوونەوەکەی لەگەڵ سەرۆک فۆرد و کیسنجەر بە پێداگیرییەوە گوتی: "یەکێتیی سۆڤیەت میلالێکی سووری لە سووریا و عێراق دەوێ."* [٢٠٤]

***جەنابی خاوەنشکۆ، گەلی ئێمە بە چاوی باوک و پارێزەر تەماشای تۆ دەکا ، هەروەها دڵنیاشە لەوەی هەر دەرگایەکی دیکە لەسەر ئێمە بکرێتەوە ئەوا هەولوتەقەللای تۆی لەپشتەوەیە... تۆ لە چەندین بۆنەدا لێدوانت داوە... کە پەیوەندی ئێران و کوردی عێراق پێویستە قووڵتر بێ لەو پەیوەندییەی لەنێوان تورکیا و تورکی قوبرسدا هەیە.*** [٢٠٥]

### کودەتاکەی بەعسی ١٩٦٨

حزبی بەعس بە پشتیوانی سوپاوە لە ١٧ی تەممووزی ١٩٦٨دا سەرکەوتووانە کودەتای کرد و ڕژێمی عارفی ڕوخاند.[٢٠٦] ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆوەزیر، حیزبی بەعس و سوپا بە یارمەتی دەزگای نوێی دامەزراو، ئاسایشی بەعس کە لە لایەن سەددام حوسێن دامەزرابوو، پێگەیان لەنێو حکومەتدا زیاتر چەسپاند.[٢٠٧] لە هەنگاوی دووەمیشیاندا،

---

[204] Memorandum of Conversation, Ford, the Shah, Kissinger, and Scowcroft, May 15, 1975. May 15, 1975

[205] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995), p. 115–116.

[٢٠٦] پیلانگێرە سەرەکییەکانی کودەتاکە ئەمانە بوون: سەددام حوسێن، سەرهەنگ ئیبراهیم عەبدولڕەحمان داود، سەرهەنگ عەبدولڕەزاق ئەلنایف و سەرگورد/پێشڕەو سەعدون غەیدان. بڕوانە Al-Samarrai, Wafiq, Hottam al-Bawabat al-Sharqi [The Destruction of the Eastern Gate], translated in Farsi, (Tehran, Markaz Asnad va Tahghighat-e Defa-e Moghaddas) p. 38.

[٢٠٧] ئەحمەد حەسەن بەکر وەک ڕابەری ئۆپەراسیۆنی کودەتا چەکدارییەکە پێگەی خۆی لە سکرتارییەتی هەرێمایەتی حزبی بەعسدا وەرگرتەوە و ئەنجوومەنی باڵای وڵات کە بە ناوی

سەددام حوسێن لە ڕووی سیاسییەوە هەردوو لایەن، ناسرپەروەرەکان و کۆمۆنیستەکانی ڕامالّین.[٢٠٨] لە بەراییەوە لە لایەن شاوە سروشتی دژەناسری و دژە کۆمۆنیستی حیزبی بەعس پێشوازی لێکرا، ئاخر ئێران یەکەمین دەولّەت بوو دانی بە ڕژێمی بەعسدا نا. بە ڕوانینی شا، کودەتاکەی بەعس سێیەمین شکستی بەدوای یەکدا هاتووی جەمال عەبدولناسر بوو لەپاش شەڕی شەش ڕۆژە و شەڕی ناوەخۆی یەمەن.

هەرچۆنێک بێ مانگی هەنگوینی لەنێوان هەردوو ولاتەکەدا زوو کۆتایی هات. دوابەدوای کودەتاکەی ١٩٦٨دا، بەغدا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەلّ سۆڤیەت چاککردەوە.[٢٠٩] لەپالّ ئەمەشدا، بەغدا هیچ نەرمونیانی لەبارەی سنووری کێشەلەسەر لەگەلّ ئێراندا نەنواند. لە دیدارێکی لەگەلّ شادا، ژەنەڕالّ حەردان تکریتی سوپالاری لەشکری عێراق و جێگری سەرووەزیر، هێلّی تالوک –هێلّی ناوەڕاستی بەرینی ئەروەند ڕود– نەپەژراند و داوای عێراقی بۆ گەڕاندنەوەی کەناری ڕۆژهەلاتی ئەروەند ڕودیش دووبارە کردەوە. لەوەش پتر، ڕوانینی شۆڤینیانەی عێراق دەرهەق بە کورد و شیعە، پەیوەندییەکانی لەگەلّ ئێراندا تێکدا. سەرباری بانگەوازی یەکسانی بۆ کەمایەتییە دینی و ئەتنییەکان، کەچی حزبی بەعس هەردوو کەمایەتی وەک تابووری پێنجەمی ئێران لەقەلّەم دان. هەرچەندە ئەحمەد حەسەن بەکر سەرکۆنەی چاودێریی ئیسرائیلی-ئەمریکی کرد کاتێ لێدوانی دا؛ "لەکاتێکدا عێراق ڕووبەڕووی دوژمنەکەی خۆی لەبەرەی جەنگی عەرەب-ئیسرائیلدا دەبێتەوە، کەچی تابووری پێنجەمی ئاژانی ئیسرائیل و ئەمریکا لەپشتەوە

ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بوو، ئەویش بە سەرۆک، سەرووەزیر و فەرماندەی گشتیی هێزە چەکدارەکان و سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دانا.

208 Tripp, Charles. A History of Iraq (Cambridge University Press, 2010) p. 188.

209 U.S. Department of State, Hughes to Rusk, "Right-wing Ba'thi Takeover in Iraq: Nearterm Outlook," IN-618, August 6, 1968 (NARA/RG59/SN/1967-69/Box 2221/ "POL 15-Iraq 1/1/67"), p. 7.

خەنجەر دەوەشێنێ."[210] بەغدا هەر لەسەر ئەو مشتومڕەی خۆی بوو، گوایە کورد و شـــیعە مەیلێکی "ســـروشـــتکردیان" بۆ ئێران هەیە. ئیدی لەو بەرڕەوتەدا بوو دانوســتانەکان وەســتان و ڕژێمی بەعس بۆ دووەمین جار بەکارهێنانی هێزی چەکداری بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە لێگرت.

لە بەرابییەوە بەغدا بۆ لاوازکردنی پێگەی بارزانی لە کوردســـتانی عێراقدا، ســـتراتیژی پەرتکە و زاڵبەی بەکارهێنا، بەوەی لایەنی تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەدی گرت. بە پێچەوانەی دوودڵیی بارزانی، ئەو دووانە پێشوازییان لە بەعسی بەغدا کرد. لە تشرینی یەکەمی ١٩٦٨دا، پێشـمەرگە دڵسـۆزەکانی بارزانی زەبرێکی کوشـــندەیان لە هێزەکانی تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد دا. لە بەرانبەریشـدا، سـوپای عێراق لە ٣ی کانوونی دووەمی ١٩٦٩دا هێرشـی خۆی پترکرد.[211] تارانیش دەستبەجێ پشتیوانی خۆی بە کۆمەکی تۆپخانەی پێشـــکەوتوو زیـاترکرد. هەر تەنیـا لە دوای ســـێ هەفتەدا، شـــالاوی چەکدارییانەی بەعس بەهۆی زستانی سەختی ١٩٦٩ بە بنبەست گەیشت.[212] ســەرباری بەبنبەســتگەیشــتنی لەناکاوی جەنگەکە، کەچی شــا فەرمانی بە بارزانی کرد دامودەزگاکانی نەوتی عێراق لە کەرکوک و موســڵدا پەک بخا. ئەوەبوو پێشــمەرگە لە ١ی ئازاری ١٩٦٩دا، دامودەزگای کۆمپانیای نەوتی عێراقی بۆمباباران کرد و توانســـتی پەمپدانی نەوتی عێراقی لەوێوە بڕی. ئەمەش زەبرێکی کوشـــنـــدە بوو بەر شـــکۆی بەعس کەوت.[213] ئەعلەم گێڕایەوە: "شـا هەسـتی بە گەورەیی کرد. بەنهێنییەوە پێمڕاگەیەنرا کە کورد

[210] U.S. Department of State, Bureau of Intelligence and Research, Hughes to Rusk, "Iraq: Internal Stresses and the Search for the Bogeyman," RNA-6, February 14, 1969 (FRUS/1964–68/XXI/doc.251), p. 6.

[211] Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

[212] O'Ballance, Edgar. The Kurdish Revolt, 1961–1970 (London: Faber and Faber Ltd., 1973) p. 151.

[213] Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, p. 23827.

هێڵی لوولەکێشی نەوتی عێراقی لە موسڵ و کەرکوکدا بۆمبابارانکردووە، کۆمپانیاکانی نەوتیش پاکانەی ئەوەیان کەوتە دەست هاوکاریی عێراقییەکان نەکەن، چونکە لە ڕووی ئاسایشسیپاریزییەوە کورتهێنن، هەروەها لە بەرانبەریشدا و لەسەر حیسابی عێراق ڕووی ئامانجی بەرهەمداری خۆیان وەرسووڕاندە سەر ئێران.[٢١٤] هەرچەندە جارێکی دیکە سوپای عێراق بنبەستبوونی لە دژی کوردستان شکاندەوە، لێ لە کۆتایی مانگی نیساندا گرژییەکەی لەسەر سنوور لەگەڵ ئێران دژوارتر بوو. ئەمجارەیان ئێران بە پێچەوانەی هێرشەکانی پێشووتری عێراق بۆ سەر کوردستان، بە هەڕەشە و گوڕەشەوە فشاری خۆی خستە سەر عێراق بەوەی ڕاستەوراست لە یەکاوی عەرەبدا لەگەڵیدا دەکەویتە جەنگ.

### قەیرانی یەکاوی عەرەبی لە ١٩٦٩

پشتگیریی ئێران بۆ کوردی عێراق بەرەبەرە تێهەڵکێش بوو لەگەڵ کێشەی درێژخایەنی سنوور لەگەڵ عێراق لەسەر ئەروەند ڕود یان یەکاوی عەرەب(شط العرب)، ئەو ڕێڕەوە ئاوییەی لە بەیەکگەیشتنی هەر سێ ڕووباری دیجلە و فرات و کارون دروست بووە. ڕەگوڕیشەی ئەو ناکۆکییە درێژخایەنەی چەندین سەدەیە بۆ شەڕی عوسمانی-سەفەوی بۆ دەستبەسەرداگرتنی میزۆپۆتامیا دەگەڕێتەوە. تەنانەت لە ڕێککەوتننامەی زەهاوی ١٦٣٩دا چارەسەری کێشەی کۆنترۆڵکردنی ئەو ڕێرەوە ئاوییەی نەکرد.[٢١٥] دووەمین ڕێککەوتنامەی ئەرزەڕۆم و پاشان هی ئیستەنبول لە

[214] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. I: 1347–1348/1968–1969 (Bethesda, MD: Iranbook, 1993), p. 143.

[٢١٥] لە ١٧ی ئایاری ١٦٣٩دا، ئێران و ئیمپراتوریەتی عوسمانی ڕێککەوتننامەی زەهاویان مۆرکرد. بەگوێرەی ڕێککەوتننامەکە بێ، ئێران بۆ هەتاهەتایە میزۆپۆتامیا، واتە عیراقی ئێستای بۆ عوسمانییەکان لەدەست دا. هەر لە سەردەمی هەخامەنشی ئیمراتوریەتی ئێراندا، عێراق بەشێک بوو لە هەرێمە لەیەکجیاوازەکانی ئیمپراتوریەتی ئێرانی.

١٩١٣دا سـنووری عوسـمـانی-ئێرانیـان بە درێژایی هێڵی تـالوک پشتڕاستکردەوە.[٢١٦] هەرچەندە ڕێککەوتننامەی ١٨٣٧یش، دانی بە سنووری عێراق بە درێژایی تەنکاودا لە دیوی کەناری ئێرانی ڕێڕەوە ئاوییەکەدا دانا و تا ڕاددەیەک تەواوی ئەروەند ڕودی بەدەر لە عەبادان و خوڕەمشـەهر دایە دەستی عێراقی نوێ، واتە لەو شـوێنەی ڕێککەوتننامەکە سنوورەکەی بە درێژایی هێڵی تـالوکدا دانـا.[٢١٧] ئەوەی ڕاسـتی بێ، ڕێککەوتنـامەکە سەروەریی تەواوی خاکەکەی بەسەر ئەروەند ڕودا وەک دەرچەیەکی کارا بۆ سەر کەنداوی فارسی دایە عێراق و لە بەرانبەریشدا، ئێران لە یەکێک لە ڕێڕەوە ئاوییە سەرەکییەکان بێبەش کرا. شا لەو بڕوایەدا بوو مەرجەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیەی بە پشـتیوانی بەغدا کۆنترۆڵی ڕێڕەوی ئاوییەکەی ئەروەند ڕودی بە تەواوی داوەتە دەسـت بەغدا، ئەمەش ئەگەری ئەوەی هێنـایەپێشـەوە لەوانەیە پـاڵاوگەی عەبـادان، بەنـدەری سـتراتیژی خوڕەمشـەهری ئێرانی بخاتە مەترسییەوە.[٢١٨] سـەرباری بێدەسـەڵاتییەکەی، کەچی بەغدا ئەوەی داوادەکرد گوایە تەواوی ئەروەنـد ڕود تـا کەنـاراوی دیوی ئێران، خاکێکی ناوەخۆیی دانەبڕاوی خۆیەتی. بەپێچەوانەشـەوە، شـا پێداگیر بوو لەسەر ئەوەی نزیکەی هەموو سنووری ڕووبارەکە بە درێژایی هێڵی تالوک هی ئەوانە. شـا بەنیاز بوو بنەماڵەی پاشـایەتی پەهلەوی لە دەست ڕێککەوتننامەی ١٩٣٧ ڕزگار بکا.

سـەربـاری بەرزەفتکردنی ڕژێمەکـانی پـان عەرەبیزم لە بەغـدا و پووچەڵکردنەوەی ئەگەری هەڕەشەی سۆڤیەت لە کەنداوی فارسدا، کەچی

---

[٢١٦] یەکەمین جەنگی جیهانی مەرجەکانی ڕێککەوتننامەی ئیستەنبولی ١٩١٣ی هەڵوەشاندەوە.
[217] Boundary Treaty and Protocol Concerning the Shatt-al-Arab Waterway, 190 UNTS 4423 (4 Jul. 1937).

[٢١٨] وێڕای ئەوەی توانسـتی ڕێڕەوی بەندەری عەبادان بۆ دوورگەی خەرجی لە کەنداوی فارسی گوێزرا -ئەوەش پێشهاتێک بوو کە دەکرا بە ڕێژەی ٩٨٪ی نەوتی ئێرانی پێ بنێرێتە دەرەوە- لێ هێشـتا کانەکان و پاڵاوگەی نەوتی عەبادانی ئێرانی هەر لەبن مەودای تۆپخانە و هێزی هەوایی عێراقییدا بوون.

شا بەرەبەرە دەبووە شوانی سەرەکی کوردی عێراق، بۆ ئەوەی سەرنجی بەغدا لەسەر ئەروەند ڕود لابدا. ئاخر هەر لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە، ستراتیژی درێژخایەنی شا لە کوردستانی عێراقدا "قۆستنەوەی پەیوەندییە گرژییەکان بوو تا کێشەی یەکاو (شط)ەکەی پێ چارەسەر بکا."[219] ئەو بە متمانەبەخۆبوونەوە بە ئارمین مایەری باڵوێزی ئەمریکا لە تارانی گوت، کەوا چاوەڕێی چەند ساڵێکی کەم دەکا تا لە کۆتاییدا عێراق بەخۆی بێت لە هەڵگرتنی باری کێشەکە بەشداربێ و یەکاوەکەش لە نێوانماندا دابەش بکەین."[220] پێدەچوو ئامادەبێ دەستبەرداری کارتە براوەکە، کارتی کوردی عێراق بێ، بەڵام تەنیا لەوکاتەی بەغدا سازش لەسەر ئەروەند ڕود بکا. هەرچۆنێک بێ، حکومەتە غەیرە پان عەرەبییەکەی بەغدا زۆر دوور بوو لەوەی جورئەتی ئەوەی هەبێ بۆ دوژمنە مێژووییەکەی: بۆ ئێران، سازش لەسەر خاک بکا.

لە نێوەڕاستی ئاگربڕی پچڕپچڕ لە کوردستاندا، ئەوەبوو بەغدا سەرچڵییەکی لە بەرانبەر دراوسێ ڕۆژهەڵاتییەکی کرد. لە ١٥ی نیساندا، جێگری وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق ئەوەی گوت گوایە ئەروەند ڕود بەشێکە لە خاکەکەیان، کەواتە کاتێ بەلەم و کەشتی ئێرانی دەگەنە ڕێڕەوە ئاوییەکە، دەبێ ئاڵای ئێرانی دابگرن و کارمەندی هێزی دەریاییان لەسەر پشتی کەشتی و بەلەمەکانیان بکێشنەوە. بەغدا هۆشداریشی دا ئەگەر هاتوو ئەو داوایەیان جیبەجێنەکەن ئەوا "لە داهاتوودا ڕێگە نادەن کەشتی ئێرانی بێتە نێو یەکاوی عەرەبی (شط العرب)ەوە."[221] لە بەرتەکیشدا، شای ئێران لە نیسانی ١٩٦٨دا ڕێککەوتننامەی ١٩٣٧ هەڵوەشاندەوە و ڕایگەیاند کە "بەهای ئەم ڕێککەوتننامەیە نەما و

---

[219] hran A-1044 to U.S. Department of State, "Iran-Iraq Relations," January 20, 1966 (FRUS/1964–68/XXI/doc.179).

[220] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[221] Abdulghani, Jasim, Iraq and Iran: The Years of Crisis, The Johns Hopkins University Press (October 1, 1984), p. 118.

هەڵوەشـــایەوە"، چونکە عێراق پابەندییەکانی پێشـــێل کردووە.[٢٢٢] ئیدی ســـەرانی بەغدا هەڕەشـــەی جەنگیان لە بەرانبەر ئەو جووڵە ڕووقایمیەی ئێراندا کرد و ئەوەیـان گوت کەوا دژەکرداری قـانونی و ڕەوایـان دەبێ. ئەوەبوو پڕوپاگەندەیەکی توند لەنێوانیاندا تەقییەوە. ئەحمەد حەســەن بەکر دوانێکی دووردرێژی ئاگریناوی دا و گەفی لە ئێران کرد کە، "ئەگەر هات و ئەو هەڵوێستەی ئێران لەبیر بکەم ئەوا من نە عەرەبم و نە موسڵمانیشم. ئەوان [عەرەب و موسڵمان] لە دەستی منن. هەر کاتێک ویستم ئەوا لێیان [لە ئێران] دەدەم."[٢٢٣] ژەنەڕاڵ ســـالح مەهدی عەماش، وەزیری کاروباری ناوەخۆش شـــای بە "مەڕ" ناوبرد.[٢٢٤] لە دیوەکەی دیکەشـــەوە، ئەعلەم لە هەڵگیرســـــانی جەنگ لەگەڵ عێراقدا نیگەران بوو؛ "من مێنتالیتی عێراقی دەناسم. سووکە شکستێک ئێران شڵۆق دەکا، بەتایبەتیش ئەگەر شکستەکە لەسەردەستی وڵاتێکەوە بێ کە دەوڵەتێک [ی ڕاستەقینە] نەبێ."[٢٢٥] دیاربوو هەڵگیرسانی جەنگ شتێکی حاشاهەڵنەگر بێ.

ئێران گرژییەکانی تاودا و خەریک بوو لەڕێی ئامادەباشـــی هێڵی ســـووری سـوپاوە بە تەواوی جەنگی ســەرتاســەری جاڕ بدا. ئێران بە پێگەی لاوازی عێراقی دەزانی، ئاخر ٦٠،٠٠٠ لە هێزی چەکداری لە کوردســـــتانی عێراق بڵاوکردبووەوە ســێ فرقەشـــی لە ئوردن دامەزرابوون،[٢٢٦] ئەوەبوو شـــا لە ٢٢ی نیســـانی ١٩٦٩دا فەرمانی بە کەشـتییەکی بارگواســتنەوەی ئێرانی بە

---

[٢٢٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١١٩.

[223] Al-Samarrai, Wafiq, Hottam al-Bawabat al-Sharqi [The Destruction of the Eastern Gate], translated in Farsi, (Tehran, Markaz Asnad va Tahghighat-e Defa-e Moghaddas) p. 52.

[٢٢٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٥٣-٥٤

[225] A am, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. I: 1347–1348/1968–1969 (Bethesda, MD: Iranbook, 1993). p. 172–3.

[226] O'Ballance, Edgar. The Kurdish Revolt, 1961–1970 (London: Faber and Faber Ltd., 1973) p. 154.

ناوی ئیبن ســـینا و ١١٧٦ بوو، کرد بە یاوەری دەســـتەیەک لە فڕۆکەی جەنگی و کەشتی جەنگییدا بەرەو ڕێڕەوی ئاوی لە کەنداوی فارسی شۆڕ ببێتەوە بە بێ ئەوەی ئاڵای ئێرانیش نەوی بکاتەوە.[٢٢٧] کەشـــتیەکانی بار وەک ئاریا فار بە هەڵگرانی ئاڵای ئێرانەوە بەردەوامبوون بە ڕێڕۆیشـــتن بەنێو ئەروەند ڕودا. هەرچەندە عێراق ســـوپاکەی لە بەســـرا خســـتبووە حاڵەتی ئامادەوە، لێ لەوەدا ســـەرنەکەوت بەڵەم و کەشـــتییەکانی ئێرانی بخاتە مەترسییەوە. تانکی قورسی ئێرانی، هێزی ئاسمانی و تۆپخانە وایان لە ســـەرانی بەعس کرد ڕێڕەوە ئـاوییەکە دانەخەن. ئەمەش زەبرێکی کوشندەبوو لە بەغدا کەوت.

تاکە ڕێکاری تۆڵەکردنەوەی بەغدا بەدڕەفتارییبوو لەگەڵ هەزاران ئێرانیی نیشتەجێی عێراق، هەروەها قەدەغەکردنی کاڵای ئێرانی بوو، ئەمەش لەپێناو "پشـــتیوانیکردنی ئامانجەکانی نەتەوەی عەرەب بوو."[٢٢٨] لە ٨ی ئەیلوولی ١٩٦٩شـــدا مەدەنییەکی ئێرانی کە لە لایەن هێزەکانی عێراقییەوە لە نزیک ناوچەیەکی بندەستی کوردان گیرابوو، بە تۆمەتی سیخوڕی لەسێدارە درا. لە ١٨ ئەیلوولدا ڕادیۆی بەغدا ڕایگەیاند؛ تەقە لە ٣٠ سەربازی ئێرانی کراوە و چواردەی دیکەشیان لە لایەن سەربازانی عێراقییەوە لە نزیک ناوچەیەکی بندەســـتی کورداندا بەدیل گیراون. وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران، ئەردەشیر زاهیدی حاشای لە ڕاپۆرتەکەی عێراقییەکان کرد، لێدوانی دا کە؛ "چەند کەسێکی دیار لە خەڵکی نزیک سنووری هەرێمەکە، ئەوانەی نزیکەی ڕۆژانە ماڵوحاڵیان دەدرێتە بەر هێرشـــی ناپاڵم، ئەو هێرشـــانەی هێزی ســـەربازی عێراقی شـــەڕ لەگەڵ جەنگاوەرانی بارزانی دەکا، لەوانەیە ئەو

[227] Ramazani, Rouhollah, The Persian Gulf: Iran's Role, University Press of Virginia; First edition (1972) p. 44.

[228] Abdulghani, Jasim, Iraq and Iran: The Years of Crisis (The Johns Hopkins University Press, October 1, 1984) p. 121; Ramazani, Rouhollah, The Persian Gulf, at p. 44; Baghdad 2202 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 26 August 1969.

کەسانە بەبێ زانیاری حکومەتی ئێرانییەوە خۆیان لە شەڕەکە گلاندبێ.[229]
هەرچەندە عێراق پرسەکەی گەیاندە بەردەم ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، لێ قەیرانی ئەروەند ڕود سەرکەوتنی بەرچاوی ئێران بوو.

**لەبارچوونی پیلانی کودەتاکە**

دوابەدوای قەیرانی ئەروەند ڕود، پێشمەرگە سوپای عێراقی تێکوپێکشکاند و لە ئاخروئۆخری حوزەیرانی ١٩٦٩دا دەستی بەسەر پێنجوێن و قەلادزەدا گرت.[230] سوپای عێراق لە ئابی ١٩٦٩دا بەسەختی هێرشی کرد تا سنووری لەسەر ئێران پەک بخا و ڕێگەی ئازوقە و تفاقی سەربازی لەسەر کورد ببڕێ. هێزی هەوایی عێراقی ناپاڵم و بۆمبی ترشی نیتریکی بەسەر گوندی کورداندا باراند.[231] لەگەڵ ئەوەشدا دیسان هێرشەکە بەهۆی زستانی سەختەوە وەستا. وێڕای تاکتیکی نابەرابەرانەی سوپای عێراق، پشتیوانی قورس و مەحکەمی ئێران بۆ کورد قەناعەتی بە لاباڵێکی حیزبی بەعس بە ڕابەرایەتی سەددام حوسێن هێنا، بەدوای چارەسەرییەکی ئاشتیانە و پەسەندکراو بۆ قەیرانی کوردی بگەڕێ، بەڵکو ڕێگە لەوە بگرێ سازش لەسەر ئەروەند ڕود بۆ شای ئێران بکا. بۆ حیزبی بەعس، هەر سازشکردنێک لەسەر خاک بۆ ئێران دەبووە مایەی لەباریەکترازانی ڕەوایەتییە ناسکەکەی حزبی بەعس لەسەر خاکی نیشتمان و ئەو خۆهەڵکێشانەشی بنکۆڵ دەکرد گوایە پاڵەوانی عروبەن لە هەرێمەکەدا. ڕژێمی بەعس لە حوزەیرانی ١٩٦٩دا، بەنهێنی لە ماڵی میشێل عەفلەق لە

[229] Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

[230] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[231] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

لوبناندا لەگەڵ بارزانی کەوتنە دانوســـــتان.[232] نێردەی کوردیش لە بنەماوە ڕەتی کردەوە بەدەر لە جاڕنـامەی بەزازی ١٩٦٦ هیچ شــــتێکی دیکە بە چارەســەر بزانن، لە کاتێکدا سـوپای عێراق لەسـەر شـالاوی خۆی لە دژی پێشـــــمەرگە بەردەوام بـوو. لە بەرایـی ئـۆکـتـۆبەری ١٩٦٩دا، بەغـدا ڕێککەوتننامەیەکی خســـتە بەردەم کورد، بەڵام ئەوان ڕەتیانکردەوە.[233] هەر

---

[232] میشێل عەفلەق وەک دامەزرێنەر و بیرمەندی حزبی بەعس فشاری خستە سەر ڕایەدارانی بەغدا تا کێشــەی کورد بە ئاشـتییانە چارەســەر بکەن. لە وتارێکیدا کە لە ١٧ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٩دا بڵاویکردەوە، عەفلەق نووسـیبووی: "ناسیونالیزمی کوردی ڕەنگدانەوەی هەسـتێکی ڕەوایەتییە کە نابێ ســەرزەنشــت بکرێ، بەڵام قۆزراوەتەوە و ئامانجەکانی بەلاڕێدا براون. خۆی دەســـتکردی ئیمپریالیزم نییە، ناحەزیش نییە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی شــۆڕشـــی عەرەب." هەروەها ئەو ئەم ڕاستییەی هێنایە پێشەوە کە کورد و عەرەب بۆ چەندین سەدەی دوورودرێژ بەیەکەوە ژیاون و فشـــاری خســـتە ســـەر عێراق "پێویســـتە نەخشـــەی ئیمپریالیزمەکان پوچەڵ بکرێتەوە کە ئەوان بەدوای کەلێنی ڕق و ناحەزی لەنێوان هەردوو گەلـدا دەگەڕێـن." بـڕوانە: Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

{هەروەک مامۆستا مومتاز حەیدەری پشتڕاستی کردەوە، میشێل عەفلەق لە دوای کارەساتی ئازاری ١٩٧٥دا لێدوانێکی یەکجار فاشــیایانەی لە ژمارە (٨) (افاق العربية)دا بڵاوکردۆتەوە، دەق دەڵێ: بە گەڕانەوەی هاوڕێ ســەروکەوتووەکان و کۆتایی جێبی بەکرێگیراو دڵخۆش و شــاگەشــکەبووم، بەڵام کێشــەی کورد مەگەر بە ڕێگەی خەلیفە راشـیدییەکان نەبێ، دەنا چارەســـەر نابێ (کە مەبەســـت لێی بنبڕکرنە!)، ئەوســـا حیزبی شــیوعی عێراق هاوپەیمانی بەعس بوو لە بەغدا، هەوڵیان دا ئەم ژمارەیەی (افاق عربية) لە بازاڕ بکێشنەوە، بەڵام دیسان وتارەکە لە گۆڤاری المعلم الجديد بڵاوکرایەوە. هەر بۆ زانیارییش گۆڤارەکەی (افاق عربية) لە ئەرشیفی مامۆستا مومتاز حەیدەرییدا پارێزراوە. وەرگێڕ}.

[233] بەغدا دابەشـکردنێکی نوێی بۆ بەپارێزگاکردنی وڵات خســتەڕوو، کە لەبری ١٤ پارێزگا لە ١٦ پـارێزگـا پێکهـاتبوو، هەروەک ڕابردوو بە ڕێکـارێکی قەبەی ئۆتۆنۆمی خۆجێی لە ڕێی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی؛ کە سێ پارێزگای کوردی دەبن لە سلێمانی و هەولێر و دهۆک و پارێزگایەکی عەرەبی کوردیش کە کەرکوک دەبێ. ڕژێمی بەعس قایل بوو بە بەکارهێنانی زمانی کوردی لە داموودەزگا پەروەردە و فێرکردنی ناوچە کوردییەکان، دامەزراندنی زانکۆی سلێمانی، پێکهێنانی یەکێتیی نووسـەرانی کورد، دامەزراندنی خانەی چاپ و پەخشی کوردی

بەڕاستیش هەرگیز بارزانی متمانەی بە بەعسییەکان نەبوو. لە دیدارێکیدا لەگەڵ پەیامنێری ڕۆژنامەی لیمۆند Le Monde، لێدوانی دا؛ " **ناکرێ ئێمە لەگەڵ گورگان لەسەر هەمان مێز دانیشین.**"[٢٣٤] باڵوێزی عێراقیش لە پاریس وەڵامی ئەم گووتەیەی دایەوە بەوەی بڵێ کە تەواوی سەرژمێری دانیشتوانی لە پارێزگاکانی باکوور ١،٥٠٠،٠٠٠ کەس کە ٥٠،٠٠٠ کورد نین، هەروەها گوتی گوایە کورد "تەنیا لەوە سەرکەوتوو بوون کە بە هاوکاریی تانکەکانی ئێرانی ڕێرەوێکی باریک لە بەرەی جەنگەوە بشلەژێنن."[٢٣٥] لەگەڵ ئەوەشدا سەرانی بەغدا لێبڕاوبوون لەسەر ئەوەی بەرەی کوردی لەبن پێی ئێران دەربهێنن.

شا بە ئاگاداربوون لە دانوستانەکانی عێراقی-کوردیدا فەرمانی بە ساواک کرد، بەڵکو کودەتایەکی دژەبەعسی بەرپابکەن. ئاخر هەر لەو کاتەی لە ١٩٥٨ کودەتاکەی عێراق ڕوویدا، ساواک رایەڵەیەکی ئاڵۆزی ژێربەژێری لەگەڵ لادەر و یاخیبووە عێراقییەکان هەبوو، کە لە ژەنەراڵە بەرهەڵستکارەکانی ناوسوپا و مەدەنییە شیعەکان و ئەو کوردانەی لە بەغدا دەژیان پێکهاتبوون. وێڕای پەرسەندنی کەشوهەوای کۆنترۆڵکراوی بەغدا، کەچی ئەم تۆڕەی دروستکرابوو لە سەردەمی هەردوو سەرۆک، هی قاسم و هی هەردوو برا عارفییەکان سەلامەت مابوونەوە. لەسەردەستەی ئەو

---

هەروەها چاپ و بلاوکردنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار بە کوردی. هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٢٣٨٢٧

[٢٣٤] سەرباری ئەم قسەیەی، بارزانی لێدوای ئەوەشی دا کە حکومەتی ناوەندی لە بەغدا پێویستە لە سەرۆکێکی عەرەب و جێگرێکی کورد و کابینەییەک پێک بێ، کە لە نێوان کورد و عەرەبدا بەگوێرەی قەوارەی هەردوو پێکهاتەکە بێ. لە سەرووی هەمووشیانەوە، لە کوردستان (پێکبێ لە پارێزگاکانی سلێمانی، کەرکوک و هەولێر و ناوچە زۆرینە کوردنشینەکان لە موسڵ و دیالە)، لەوێ پێویستە ئەنجومەنێکی قانوندانان و کارگێڕیش هەڵبژێردرێ. ڕۆژنامەی لیمۆند ٢١ی دیسامبەری ١٩٦٩.

[235] Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

کەسـایەتییە سـەربازییانە هەر یەک لە ژەنەڕاڵ عەبدولغەنی ئەلراوی و ژەنەڕاڵ سـەعید سالیبی و سـەرهەنگ ساڵح مەهدی ئەلسامەرائی بوون.[٢٣٦] ئەوان لەبارەی بڕیاری بەعس بە چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشـەی کورد و مەیل بەرەو مۆسـکۆ ناڕازی بوون. لەنێو شـیعە مەدەنییەکانیشـدا سـەید مەهدی ئەلحەکیم، کوڕی ئایەتوڵلا سـەید موحسـین ئەلحەکیم[٢٣٧] و ئەحمەد چەلەبی کوڕەکەی عەبـدولهـادی چەلەبی هەبوون، ئەحمەد چەلەبی ئەو کەسـە بوو کە ڕەگەڵ گرووپێکی بچکۆلەی کوردان و سـاواک لە ئێران کەوت. چەلەبی دوای بینینی بـارزانی "هەم وەک ڕێنوێن و هەم وەک میدیاکارێک بۆ لەندەن، ئیسپانیا و ئوردن یان هەر شوێنێکی دیکە دەهات و دەچوو، هەم پەیامی دەگەیاند هەم لە جیاتی پیلانگێڕەکانیش دانوسـتانی دەکرد... ئەمە و لەگەڵ چەنـدین بیچمی دیـاری نێو کۆمەڵگەی شـیعەی عێراقیشـەوە.[٢٣٨] چەلەبی لە لوبنـان ڕێگەی بۆ پەیوەنـدی نێوان نێردەی کوردی و تۆماس کارۆلانی ئەفسـەری سیاسـی لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت خۆشکرد بەڵکو "پشتگیری بارزانی بکەن" و (شا)ش وەک کەسێکی

---

[٢٣٦] ئەلراوی جێگری سـێیەمی سـەرۆوەزیر بوو لە حکومەتی عارفدا، ئەو بۆ ماوەی چەندین مانگ لە تاران بوو. سلێبیش فەرماندەی بنکەی بەغدای هێزەچەکدارەکان بوو، بڕوانە:
Al-Samarrai, Wafiq, Hottam al-Bawabat al-Sharqi [The Destruction of the Eastern Gate], translated in Farsi, Markaz Asnad va Tahghighat-e Defa-e Moghaddas, p. 55; Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 180.

[237] Al-Samarrai, Wafiq, Hottam al-Bawabat al-Sharqi [The Destruction of the Eastern Gate] translated in Farsi (Tehran, Markaz Asnad va Tahghighat-e Defa-e Moghaddas) p. 55.

[٢٣٨] مار دۆسـتێکی نزیکیماڵباتی شـەهاب بوو. ماربرینی ژنەکەی چەلەبی بە ئامادەیی سـەید موسا سەدر بوو، چونکە ئەو دۆستێکی نزیکی بنەماڵەی شەهاب بوو:
Bonnin, Richard, Arrows of the Night: Ahmed Chalabi and the Selling of the Iraq War (Anchor; Reprint edition November 13, 2012) p. 57.

متمانەپێکراو لە نێوبژیکردن بەلاوە بنێن."[239] هەروەها ئەو بە شـــێوەیەکی ناڕاســـتەوخۆ پەیوەندی بە نیعمەتوڵلا ناســـری، بەڕێوەبەری ســـاواکەوە هەبوو. داود تاهیری، ســێیەمین ســکرتێری باڵوێزخانەی ئێران لە بەغدا لە ١٥ی نیســـانی ١٩٦٩دا، پەیوەندی بە کەســـایەتییەکانی هێزی ســـەربازی عێراقییەوە کرد و لە ٢٨ی ئەیلوولیشـــــدا پیلانگێڕانی کودەتاکی عێراق لە بـاڵوێزخـانەی ئێران لە کوێـت چـاویـان بە نوێنەرانی ئێرانی کەوت.[240] ســـەرکردەی کودەتاکە، ژەنەڕاڵ ئەلڕاوی و هەروەها نزیکەی ٣٠٠ کەس لە ئەفســـەران "بەتـایبەتی ئـاگـایـان لە پیلانەکە هەبوو" بەتەواوی لەگەڵ بـاڵوێزخـانەی ئێران لە بەغـدا هـاوکـار بوون.[241] هەرچەنـده تـاران هەوڵیدا شـــتەکە لە ئەمریکییەکان بشـــارێتەوە، لێ ئەوان تێبینی ئەوەیان کرد کە، ئێرانییەکان لەبەر ئەوەدان ڕژێمی بەعس بڕوخێنن.[242] شـــا تـا ئەوپەڕی ڕادده نیگەرانی پلانەکە و وردەکارییەکانی بوو.[243]

لەگەڵ ئەوەشـــدا دەزگای ئیســـتخبارات، دەزگای ئاســـایشـــی عێراقی ســـەرکەوتوانە دزەی کردبووە نێو ڕایەڵەی ســـاواک.[244] ئەوەبوو لە ٢٠ی

239 Bonnin, Richard, Arrows of the Night: Ahmed Chalabi and the Selling of the Iraq War (Anchor; Reprint edition November 13, 2012) p. 57.

240 Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

٢٤١ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

242 Talcott Seelye, "How to Buy a Revolution: Talk with an Iraqi Plotter," October 15, 1969 (FRUS/1964–68/XXI/doc.262), pp. 1–4.

243 Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 180.

٢٤٤ دیاربوو ئەفســـەرێکی ســـوپای عێراقی لە کانونی یەکەمەوە بە پیلانەکەی زانیبوو، ئینجا هەواڵەکەی بە حکوومەت ڕاگەیاندبوو. هەرچەنده ئاژانســـی ڕۆژنامەوانی ســـوری باســـی ئەوەی کردبوو گوایە حکوومەتی عێراقی سێ مانگ دەبێ گومانی لە پیلانەگێڕانەکە کردبێ.

ینایری ۱۹۷۰دا و لە شەوی کودەتایە نەخشەبۆکێشراوەکەدا، پیلانگێران لە مۆڵگەی ســـەربازیی ئەلرەشـــید لە دەرەوەی بەغداد کۆدەبنەوە، لەوێ بەتەواوی دەکەونە داوەکەوە. بۆ رۆژی پاشــتر، رژێمی بەعس رایگەیاند لە کودەتایەک بە پشتیوانی ساواک لە ئارادابووە. بە گوێرەی کاربەدەستانی عێراقی، ســاواک ۳۰۰۰ تفەنگی رەشــاش و ۶۵۰،۰۰۰ گوللە و دوو دەزگای رادیۆیی بیتەلی بە هــاوکــاریی بــاڵوێزخــانەکــانی ئێران لە بەغدا و کوێت گەیاندووەتە دەســتی پیلانگێرەکان.[٢٤٥] هەروەها ئەوەشــیان راگەیاند گوایە دەســـتیان بەســـەر گفتوگۆی تۆمارکراوی هەموو پیلانگێرانی کودەتاکە و نوێنەرانی ئێراندا گرتووە. بەهۆیەوە چەندین کەســــایەتی ســــەربازیی گوللەباران کران.[٢٤٦] سێ ئەندامی ساواکیش بە ئیسماعیل ناهید سەرۆکی وێستگەی ســاواک لە بەغدا و رێکخەری پیلانەکە، هەروەها لەگەڵ چەندین کورد و عێراقییە ئێرانییەکان بە بارســــتاییەک لە بەڵگەنامەکانەوە گیران. هەروەها بەغدا لە ۲۲ی ینایری ۱۹۷۰دا عیزەتوڵلا عاملی، بالوێزی ئێران لە

---

Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

[245] Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

[٢٤٦] ویرای هەڵاتنی عەبـدولغەنی ئەلراوی بۆ ئێران، ۸۷ ژەنەراڵ، ســـەربــاز و مەدەنی لەنێویشــیاندا ژەنەراڵ موســـڵح و ســـەرهەنگ ناســـری، ئەمانە هەر هەموویان بە تۆمەتی پیلانگێران تاوانبارکران ئەمانە لەگەڵ حەوت کەســـی دیکە کە پێشـــتر تاوانبارکرابوون، لەماوەی چوار رۆژی دوای رۆژی پووچەڵکردنەوەی کودەتاکە بە تاوانی ســـیخوری لە ســێدارە دران. پیلانگێرەکان لە لایەن دادگایەکی تایبەت بوو لە هەریەک لە نەقیب جەزراوی (ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش)، نازم گزار (بەرپرسی پۆلیسی ئاسایش) و عەلی رەزا (بەرێوبەری گشتی پەیوەندییە گشتییەکانی ئەنجومەن) ]پێکهاتبوو. بروانە:
Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

بەغدا و داود تاهیر و ئیسماعیل ناهیدی لە عێراق وەدەرنان.[٢٤٧] لە کاردانەوەشدا باڵوێزی عێراق لە تاران و پاشکۆی سەربازییەکەی ناچارکران ئێران بەجێبێڵن و بگەڕێنەوە بەغدا. [٢٤٨] هەروەها ئێران هێزی خۆی بە درێژایی سنووری لەگەڵ عێراقدا زێدەتر کرد. لە بەرانبەریشدا بەغدا سەرنجی نەتەوە یەکگرتووەکانی بۆ پرسەکە ڕاکێشا و سکاڵای لە پرکێشییە چەکدارییەکەی ئێران وەک هەڕەشەیەک بۆ سەر ئاشتی و ئارامی ڕۆژهەڵاتی ناویندا کرد. (زاهیدی) وەزیری کاروباری ئێرانیش گەفی لە بەغدا کرد بەوەی لە حاڵەتی هەر پەلاماردانێکی عێراق بۆ سەر ئێران، ئەوا ئێران دوودڵ نابێ لە تۆڵەکردنەوەی "ئاگر بە ئاگر" و "خاکی دەکرێتە خۆڵەمێش و لە تەورەکە دەنرێ."[٢٤٩] بە ناوبژی هەریەک لە نەتەوە یەکگرتووەکان و تورکیا[٢٥٠] لە کۆتاییدا گرژییەکە خاوکرایەوە و سەری نەکێشا بۆ هەڵگیرسانی جەنگ.

---

[٢٤٧] پاشکۆی سەربازیی ئێرانی، یاریدەدەری پاشکۆی سەربازیی و پاشکۆی ڕۆژنامەوانی لە بەغدا بە یەکەوە لەگەڵ دەستەی کونسوڵخانەی ئێران لە کەربەلا و بەسرادا لە عێراق وەدەرنران و ڕەوانەی ئێران کرانەوە.

[٢٤٨] لە گەڕانەوەی بۆ بەغدا دا باڵوێزی عێراق لە ٢٨ی ینایری ١٩٧٠دا ئەوەی گوت گوایە ئێرانییەکان "دڵڕەقانە" لەگەڵ ئەو و ستافەکەی جووڵاونەتەوە بە مەش عورفی دیپلۆماسییان پێشێل کردووە. تارانیش بە توندی سەرزەنشتی "بەدڕەفتاریی" سەر مەجید میهرانی هەڵسوڕێنەری کاروباری ئێرانی لە بەغدا کرد، کەوا پاسەوانانی سنوور ترومبێلەکەیان وەستاندووە و پشکنیویانە. هەروەها ئێران نارەزایی لەسەر ئەو ڕەفتارەی لەگەڵ عەبدولخالق بوشەهری زادەی سکرتێری دووەمی باڵوێزخانەی ئێران دەربڕی، کەوا ڕفێنرابوو هەروەها ئازار و ئەشکەنجەش درابوو. بڕوانە:
Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

[249] Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

[٢٥٠] لە ٣ی شوباتدا ژەنەڕاڵ عەباسی وەزیری ناوەخۆی عێراق گەیشتە تورکیا و نامەیەکی لە سەرۆک ئەحمەد حەسەن بەکرەوە بۆ سەرۆک سوونای بردبوو، تێیدا داوایکردبوو کە دەسەڵاتی خۆی لەگەڵ حکوومەتی تاران بەکاربهێنێ بۆ ئەوەی جەنگی سەرتاسەری

بەغداش لە بەرتەکی ئەو دوژمنکارییەی ئێراندا پشــتی بەختیاری گرت. بەختیاریش لە ئازاری ١٩٦١دا دوای ئەوەی گەشــتی وڵاتە یەکگرتووەکانی کردبوو گفتوگۆی لەگەڵ جەی ئێف کەنەدیدا کردبوو، بە گومانی ڕێکخستنی کودەتا لە دژی شا، لە ئێران دەرکرابوو. دوای ئەوەی لە ئەورووپا لە تاراوگە گیرســابووەبوە، ئەوە بوو دوای ســاڵێک لە ســویســڕاوە بەرەو لوبنان ســەفەری کرد، لەوێ بە شــێوەیەکی کاتی لەســەر داوای ئێران لە بەیروت گیرا. لەوکاتەی شــا لەبەر ئەوەدا بوو فەرمانی گرتنی و ڕادەســتکردنەوەی بۆ دەربچوێنێ، بەختیــار خۆی گەیانــدبووە عێراق و لەوێ بــارەگــایەکی دامەزراند بوو. لەوێ چەندین ئێرانی خۆبەخش ڕەگەڵ کەوتبوون، لەوێوە بە نهێنی لە دژی شــا خەریکی ســازدانی پیلانێک بوو. عێراقیش لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٧٠دا مافی پەنابەری سیاسیی بە بەختیار بەخشی. هەروەها بەغدا ســێ تا پێنج وێســتگەی ڕادیۆیی بۆ بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی دژە شــا دامەزراند و ٥٠ ملیۆن دۆلاریشــی بۆ چالاکی دژە شــا تەرخانکرد.[٢٥١] ســەددام حوســێن بە خۆی دانی بەوەدانا کە "ئێمە بۆ حەفت ســاڵی ڕەبەق بەرنامەی پەخشــی ڕادیۆییمان دانێ؛ ئێمە پارە و چەک و هەموو شــتێکمان دانێ کە بۆ دژایەتی شــا پێویســت بێ."[٢٥٢] هەرچۆنێک بێ بەختیار لە ١٢ی ئابی ١٩٧٠دا لە ئەلســەعدیەی نزیک خانەقین لە لایەن ئاژانێکی ســاواکەوە لەناوبرا.

لەگەڵ ئەوەی تاران لە بەرتەکدا بەکردەوە و لەســــەر مەیدان ڕووبەڕووی هیچ تۆڵەکردنەوەیەکی ســــەربازی نەبوو، بەڵام لەبارچوونی کودەتاکەی ١٩٧٠ ڕایەڵەی پەیوەندییەکانی ســــاواکی لە بەغدا لەناوبرد. هەرچەندە

---

هەڵنەگیرســێ. ئەوەبوو لەهەمان ڕۆژ ئۆرهان ئیرالپ، بەڕێوەی گشــتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی تورکیا بۆ تاران فڕی تا شا لە وتووێژی عێراقی-تورکی ئاگادار بکاتەوە.

[251] Abdulghani, Jasim, Iraq and Iran: The Years of Crisis, The Johns Hopkins University Press (October 1, 1984), p. 52.

[252] Abdulghani, Jasim, Iraq and Iran: The Years of Crisis, The Johns Hopkins University Press (October 1, 1984), p. 52.

سـاواک ناسـەرکەوتووانە هەوڵیدا ڕایەڵەی کاری خۆی لە هاوینی ۱۹۷۲دا دروسـتبکاتەوە،[٢٥٣] کەچی شـا هەرگیز لە ناسـری خۆش نەبوو، چونکە لە سـەرکردایەتیکردنی کودەتاکە لێهاتوو نەبوو.[٢٥٤] خۆی لەوەش بەدتر بوو لەڕێ بوو بگات. سـیاسـەتی تا سـەر لێواری خەرەند لەگەڵ عێراق لە ئەروەنـد ڕود دا و کودەتـا لەبـارچووەکە قەنـاعەتی بە بەغـدا کرد تـا ڕێککەوتنی عێراقی-کوردی سازبدا.

## ڕێککەوتنی ئازاری ۱۹۷۰

پاش سـێ ڕۆژ لە شـکسـتپێهێنانی پیلانەکە، بەغدا بۆنەنامەیەکی دەرکرد، تێیدا پشـتگیری چارەسـەرییەکی ئاشـتیانەی بۆ کێشـەی کورد بە پشـتڕاسـتکردنەوەی جاڕنامەی بەزاز دەربڕی.[٢٥٥] هەرچەندە بەکر لە ئـاخروئۆخری کـانوونی دووەمی ۱۹۷۰دا داواکـانی کوردی ڕەتکردەوە،[٢٥٦]

---

[253] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995) p. 299.

[254] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 181.

[٢٥٥] پێشتر ئەحمەد حەسەن بەکر خواستنامەی خۆی بۆ دانوستان لەگەڵ بارزانی دەربڕیبوو، هەر بۆیە لیوا فوئاد عارفی وەزیرە کوردەکەی پێشـووی لە کۆتایی دیسـێمبەری ۱۹٦۹دا ناردبووە لای. عارفییش وەها ڕاوێژی بۆ بارزانی کردبوو کە دەبێ هەر ڕێککەوتننامەیەک لەلای نەتەوە یەکگرتوەکان تۆماربکرێ تا لە جێبەجێکردنی دڵنیابین.

Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

[٢٥٦] نێردەکە ئەم داوایانەی کرد: (۱) شـێوەیەک لە حوکمڕانی خۆجێی، داننان بە کورد، بە مافە نەتەوەییەکـانی لە زمـان و کلتوری خۆیـان و خەرجکردنی ۸۰٪ داهـاتی نیشـتمـانیی بۆ قوتابخانە، ڕێگا و نەخۆشـخانە و پڕۆژەی سـەرمایەگوزاری دیکە لە ناوچە کوردییەکانی عێراق؛ (۲) دوورخسـتنەوەی هۆزە نیشـتەجێکراوەکانی عەرەب لە کوردسـتان؛ (۳)

کەچی هەر دوولای ئێران و ئیسرائیل پەرۆشی زیانەکانیان بوون لە باکووری عێراق. ئەوەبوو لە ٤ی ئازاری ١٩٧٠دا، ئیدریس، کوڕە گەورەکەی بارزانی لە تاران چاوی بە ناسری و ئەفسەرانی هەواڵگریی ئیسرائیلی کەوت. هەردوولایان، چ ئێرانی و چ ئیسرائیلی بۆ هەڵگیرساندنەوەی شەڕ لەگەڵ بەغدا فشاریان خستە سەر کورد. مۆساد بەڵێنی چەکی پێدا، لە کاتێکدا ساواکیش بەڵێنی زیادکردنی کۆمەکی دارایی پێدان بەوەی مانگانە بگاتە نزیکەی ٣ ملیۆن دۆلار.[٢٥٧]بەڕێوەبەری ساواک، نیعمەتولڵا ناسری بە ئیدریسی گوت کە " ئێران بە تەواوی لە پشتی پلانەکەی ئیسرائیلە بەوەی شەڕ لە باکوری عێراق هەڵبگیرسێتەوە... بارزانیش پێویستی بەوەیە بە وریاییەوە ئەو تێبینییانە بنووسێتەوە کە ئیسرائیلییەکان پێشنیازی دەکەن."[٢٥٨] لەگەڵ ئەوەشدا بارزانی پێشتر بڕیارەکەی خۆی دابوو. لەوکاتەی ئیدریس لە تاران بوو، ئەحمەد حەسەن بەکر جێگرەکەی خۆی سەددام حوسێنی ناردبووە کوردستان تا بگاتە ڕێککەوتنی ئاشتی.[٢٥٩] دوای مانگێک لە وتووێژ، گەیشتنە ڕێککەوتنی ئازاری ١٩٧٠. بە داننان بە ناسنامەی دوانەیی بۆ عێراق، ڕێککەوتنەکە گەیشتە ئەو ئاکامەی؛ "**مێژوو گەواهی ئەوە دەدا کە ئێوە [کورد] نەبراتان هەبووە**

---

هەڵوەشاندنەوەی پێشمەرگەکانی تاڵەبانی؛ (٤) کشانەوەی سوپای عێراقی لە پێگە ستراتیژییەکان لە کوردستان، هێزی کوردیش هەمان شت لە دیوەکەی لای خۆی دەکا؛ (٥) میکانیزمی جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەکە بە گرەنتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بێ؛ (٦) مانەوەی هێزێکی کوردی ژمارە کەم وەک پاسەوانی نیشتمانی بۆ **باکووری عێراق**. بڕوانە:
O'Ballance, Edgar. The Kurdish Revolt, 1961–1970 (London: Faber and Faber Ltd., 1973), p. 157–8; Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

[257] CIA, Information Cable, March 9, 1970. (FRUS 1969–1976, E-4, 267).

[258] CIA, "Israeli Aid to Kurdish Rebels," March 7, 1970 (FRUS/1964–68/XXI/doc.267), pp. 1–3.

[٢٥٩] لەو کاتەدا سەددام حوسێن جێگری سەرۆک و جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و یاریدەدەری سکرتێری گشتیی حزبی بەعسیش بوو.

**و نە هەرگیز برایەک و هاوپەیمانییەکی پشتبەستووتان وەک گەلی عەرەب دەبێ.**"[٢٦٠] بارزانی داهاتێکی مانگانەی بەدەستگەیشت و لەکاتێکدا پارەی پێشمەرگەش وەک پاسەوانی سنوور درا. بە هاتنی مانگی نیسان، بەشە سەرەکییەکانی ڕێککەوتنامەکە جێبەجێکران.[٢٦١] هەندێ لە کەسایەتییەکانی بەعس لەبارەی چارەسەری کێشەی کورد گەشبین بوون. تاریق عەزیز لێدوانی دا، "کاتێ ڕێککەوتنامەی ئازارمان ڕاگەیاند، ئێمە ڕاستگۆ بووین. شتەکە هەر بۆ پروپاگەندە نەبوو."[٢٦٢] تەنانەت کەسێکی ڕەشبینی وەک بارزانیش ئەوەی بینی کە پەرەسەندنێکی بەرچاوە بەرەو پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی. لە دیسێمبەری ١٩٧٠دا ئەو لێدوانی دا؛ "بۆ ئەم ساتە ئێمە گەشبینین. دوای دە ساڵ لە شەڕ وکوشتار، حکومەتی عێراقی لە ئازاری ئەم دواییە ئۆتۆنۆمی بۆ ئێمە خستەڕوو، پێدەچێ ئەوانیش ڕێککەوتنامەکە جێبەجێ بکەن."[٢٦٣]

ڕێککەوتنامەی ئازاری ١٩٧٠ بۆ ئێران شکستێک بوو. ئەسەدوڵلا ئەعلەم نیگەرانییەکانی لەبارەی ڕێککەوتنامەکە بەم شێوەیە هێنابووە گۆ: "**ئەگەر هاتوو [ڕێککەوتنەکە] دەرەنجامی بەرچاوی لێکەوتەوە، بەلای کەمییەوە ئەوا ٢٠،٠٠٠ سەربازی عێراقی لە سنوورەکانی کوردستان دەگەڕێنەوە سەر سنووری ڕۆژاوایمان و ئیدی عێراق دەسوپێوەندی [لە یاخیبوونی**

---

[260] Harris, G. S. Ethnic Conflict and the Kurds (1977) Annals of the American Academy of Political and Social Science, 433 (1): 118–120.

[٢٦١] ڕژێمی بەعس پێنج کوردی لە کابینەی حکومەتەکەیدا جێکردنەوە هەرچەندە ئەوان بە پلەی نزمتر لە وەزارەت و بەڕێوبەرایەتییەکاندا هەبوون، دەست بە بووژاندنەوە ناوچە هەژارنشینەکانی کوردستانی عیراق کرایەوە؛ زمانی کوردی بۆ یەکەمین جار بە فەرمی لە قوتابخانەکاندا دەرسی پێگوترایەوە، ئەنجوومەنێکی قانوندانان لەهەولێر کرایەوە تا لە ڕووی نەزەرییەوە سەرپەرشتی پارێزگا کوردییەکانی دهۆک و هەولێر و سلێمانی بکا.

[262] McDowall, David, A Modern History of the Kurds (London, Tauris. 2005) p. 528.

[٢٦٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٥٢٩

**کوردی] کراوە دەبێ... هەروەها دەکرێ ببێتە پڕوشەی پێکهێنانی کوردستانێکی سەربەخۆ لە ئێران و تورکیاش.**"[٢٦٤] لە تەممووزی ١٩٧٠شدا سەددام دارسایە ئێران و ئەوەی گوت گوایە "ئێمە ئامادەین ڕووبەڕووی ئاژانەکانی ئێران و ئەمریکا و بریتانیا و هەموو پاشکەوتونخوازەکان ببینەوە."[٢٦٥] هەرچەندە بارزانی پێگە ستراتیژییەکانی لەسەر سنوور لەگەڵ ئێراندا وەک خۆی بە ئاسایشپارێزی هێشتبووەوە و ڕێگای دابینکردن ئازوقەش هەر پارێزراو بوو. لێ ڕێککەوتننامەکە دیاربوو دەکرا نەخشەی شا بنکۆڵ بکا لەوەی کێشەکانی کوردی و ئەروەند ڕود بەیەکەوە ببەستێتەوە.

بە تێپەڕبوونی کاتیش، ئەوە ڕوون دەبووەوە کە بەغدا خەریکە کات بکڕێ. هەرچەندە سەددام دروشمی چارەسەری "تەواو و کۆتایی" دەکێشا، لێ ڕێککەوتننامەکە هەندێ پرسی کێشەلەسەری تێدابوو، کە ڕوون نەبوو ئاخۆ بەڕاستی جێبەجێ دەکرێن یان نا.[٢٦٦] ئەوەبوو بەغدا ڕەتیکردەوە کوردێک بکرێتە جێگری سەرۆک و کەرکوکی دەوڵەمەند بە نەوتیش بخرێتە سەر کوردستانی ئۆتۆنۆم. لە جیاتی ئەوە ڕژێم بەردەوام بوو لەسەر سیاسەتی تەعریب بۆ ئەوەی کورد لە ناوچە کێشەلەسەرەکانی کەرکوک و خانەقین کەم بکاتەوە. بارزانی بەو نواڕینەی کە ئۆتۆنۆمی داوێک بێ بۆ کورد و دەرفەتێکیش بێ بۆ بەغدا تا میکانیزمی سەربازییانەی خۆی ببووژێنێتەوە، ئامادە نەبوو مل بدا بۆ "جوانکاری ڕوخساری ئۆتۆنۆمی" لەکاتێکدا بەعس "هەموو سەرەداوە ڕاستەقینەکانی جڵەوی دەسەڵاتی سیاسی" لەبن دەستی

---

[264] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. I: 1347–1348/1968–1969 (Bethesda, MD: Iranbook, 1993). p. 393.

[265] Abdulghani, Jasim, Iraq and Iran: The Years of Crisis (The Johns Hopkins University Press, October 1984) p. 52.

[٢٦٦] بۆ دامەزراندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردی ڕێککەوتنی دووبەدوو ئاماری ناوچەی زۆرینەی کوردنشین دیاریدەکا.

خۆیدا بهێڵێتەوە.[٢٦٧] بە هاتنی هاوینی ١٩٧٠، کورد کەوتە هەوڵی جێگیرکردنی هێز و کۆکردنەوەی هاوپەیمانان لە دەوری خۆی.[٢٦٨] لە ناوەڕاستی دوودڵیی بارزانی بەوەی ڕەگەڵ حکوومەتێکی یەکگرتووی نیشتمانی بکەوێ، **بەغدا بە ڕاوێژی پشتگیری ڕوسەکان پلانێکی ژێربەژێری بۆ لەناوبردنی ئەوی لە ٢٩ی ئەیلوولی ١٩٧٠دا دانا.**[٢٦٩] وێڕای حاشایکردنی ڕژێم، لێ بارزانی هەر لەسەر ئەو قەناعەتە بوو کە سەددام لە پشت پیلانەکەدا بووە.[٢٧٠] بەو لەقبوونەی متمانە بە بەغدا، هێشتا بارزانی گومانی لەوە هەبوو کە ئێران بە تەواوی پشتی کوردان بگرێ. ئەوەی مایەی سەرنجدانیشە، **ساواک بەو بەدگومانییەی ئەوی دەزانی.**[٢٧١] بارزانی پێیوابوو کە پراگماتییە چاوقایمییەکەی شا لەبەرانبەر سازشکردن لەسەر ئەروەند ڕودا کورد دەفرۆشێ. هەروەها ئەو لە "دەستی قورسی کۆنترۆڵی

---

[267] Beirut A-38 to the U.S. Department of State, February 2, 1972, FRUS 1969–1976, E-4, 297.

[268] CIA Information Cable, August 10, 1970, FRUS 1969–1976, E-4, 273.

[269] U.S. Department of State, Bureau of Intelligence and Research, "The Kurds of Iraq: Renewed Insurgency?" 31 May 1972 (NPL/HAK/Box138/Kurdish Problem-Vol. I/June 1972–Oct 1973), p. 3; U.S. Interests Section to U.S. Embassy Brussels, "Attempt on the Life of AL-BARZANI," October 4, 1971 (NARA/RG59/Records Relating to Iraq/1966–1972/Box12/POL 23–7), p. 2; and Lawrence, Quil. Invisible Nation: How the Kurds' quest for Statehood is shaping Iraq and the Middle East, New York: Walker & Co. 2008. p. 22.

[270] Belgian Ministry of Foreign Affairs and Trade to the U.S. Department of State, "REPIR: Reports on Assassination Attempt Made on Al-Barzani," November 2, 1971 (NARA/ RG59/Records Relating to Iraq/1966–1972/Box12/POL 23–7), p. 2; Primakov, Yevgeny. Russia and the Arabs: Behind the scenes in the Middle East from the Cold War to the present. New York: Basic Books. 2009. p. 334)

[271] National Security Council, Memorandum, Saunders to Kissinger, "Supporting the Kurdish Rebellion," March 27, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.301), p. 3.

ئێران بەســـەر چالاکییە کوردییەکان" ماندوو بووبوو.[٢٧٢] بارزانی بۆ ئەوەی هەموو هێلکەکانی نەخاتە نێو ســـەبەتەی ئێرانییەکان، بەدوای پشـــتگیریی دەوڵەتی هەرێمی دیکەیدا گەڕا، بەتایبەتی ئوردن و عەرەبســـتانی سـعودی. شا فەیسـەلی عەرەبستانی سعودی پێشتر "لە ڕووی بنەماییەوە پشتگیری خۆی بۆ بیرۆکەی شـــۆڕشـــی عێراقی ڕاگەیاندبوو"، بەڵام بەرلەوەی هیچ جووڵەیەک بکا، پێویستی بە سەرچاوەی باوەڕپێکراوی دیکە هەبوو.[٢٧٣] شا حوسێنیش لە سۆنگەی پشتگیرییە ناکاراکەی بۆ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەســـتینی لە ئەیلوولی ڕەشـــدا،[٢٧٤] مەیلی بەلای جەنگی کورددا ڕۆیشـــت. ئەو بەڵێنی بە بارزانی دا قەناعەت بە وڵاتە یەکگرتووەکان بهێنێ بەڵکو بە ســـتراتیژی خۆیان دەرهەق بە کوردی عێراقدا بچنەوە.[٢٧٥] لێ هیچ کام لەم دوو دەوڵەتە توانستی ئەوەی نەبوو لە دژی بەغدا پشتی کورد بگرن.

**پەیوەندی بەغدا- مۆسکۆ و زەمانی جەنگی ساردی شا**

ڕێککەوتننامەی ئازار، جەنگێکی دە ســـاڵەی لە کۆڵ بەغدا کردەوە و لەبری ئەوە دەســـتی والاکرد بپڕژێتە ســـەر کێشـــە هەرێمییەکان. ڕژێمی بەعس لە ئـــاخـــروئـــۆخـــری ١٩٦٩دا هەوڵـــیـــدا خـــۆی لەگەڵ هەردوولای کـــورد و شـــــیوعییەکان بگونجێنێ، بنکەی ســـــیاســـــییانەی خۆی فرەوانتر بکا و لە

[272] Beirut 222 to U.S. Department of State, July 16, 1971, FRUS 1969–1976, E-4, 292.

[273] Baghdad 291 to U.S. Department of State, March 14, 1970 (NPL/NSC/NSF/ Box601/Country Files/Middle East/Iran/Vol. I/1/20/69–5/31/70), p. 1.

[٢٧٤] ئەیلوولی ڕەش ئامـاژەیە بە شـــــەڕی نـاوخۆیی لە ئوردن لەنێوان ١٦ و ٢٧ی ئەیلوولی ١٩٧٠، کە ناکۆکییەکی خوێناوی لە نێوان ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەســـتینی و هێزی سەربازی ئوردندا ڕوویدا. ئەو ناکۆکییە چەکدارییە بە دەرکردنی سەرکردایەتی ڕێکخراوەکە و هەزاران شەڕکەری فەڵەستینی بۆ لوبنان کۆتایی پێهات.

[275] Baghdad 291 to U.S. Department of State, March 14, 1970 (NPL/NSC/NSF/ Box601/Country Files/Middle East/Iran/Vol.I/1/20/69–5/31/70), p. 1.

مۆســـــکۆش نزیـک ببێتەوە و بۆ لای خۆی کێش بکـا.[٢٧٦] لەگەڵ ئەوەی ڕوســـــەکان دەیانزانی کە هـاوپەیمـانییان لەگەڵ بەغدا دەکرێ زیـان بە ناوبانگی ئەوان لەنێو کەماتییەکانی جیهاندا بە کوردیشـــەوە بگەیەنێ، لێ لە کۆتاییدا ئەوان هێلکەکانی خۆیان خســـــتنە نێو ســــەبەتەی عێراقەوە، ئاخر ئەوان نەیاندەویســــت دەرفەتی بۆشــایی دەســـەڵات لە کەنداوی فارســـــی لەدەست بدەن. هەر بۆیە ڕووسەکان لە ڕێی تێکەڵەیەک لە بەرتیل و فشـار وایان لە بارزانی کرد چارەســـــەرێک بۆ کێشـــــەکە ببینێتەوە تا لە کۆتاییدا سەریکێشا بۆ ڕێککەوتننامەی ئازار. ئەوەبوو پەیوەندییەکانی بەغدا-مۆسکۆ تەکانێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی و عێراق ڕێککەوتنێکی نهێنی بۆ کڕینی چەک لە ئەیلوولی ١٩٧١دا لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت مۆرکرد.[٢٧٧] سەددامیش لە شـــوباتی ١٩٧٢دا ســــەردانی مۆســـکۆی کرد و چەندین ڕێککەوتننامەی ســــــەربازی و ئابووری لەگەڵدا واژۆکردن.[٢٧٨] لە ٩ی نیســـــــانی ١٩٧٢دا پەیماننامەی دۆستایەتی و هاوکارییان مۆرکرد، کە بە هۆیەوە مۆسـکۆ بۆ ماوەی ١٥ ساڵ کۆمەک و هاوکاریی سەربازیی و ئابووری پابەند کردبوو.

---

[٢٧٦] بە پێچەوانەوەی ئەو ماوە کورتەی ١٩٦٣، ڕژێمی بەعس هەوڵیدا حزبی شیوعی ڕابکێشێتە ناو دەســـەڵات بە دەســـتنیشـــانکردنی ســـەرکردەکانیان بۆ پلەوپایە و ئازادکردنی زۆر لە شـیوعییەکان ئەوانەی لە زینداندا بوون. لە ٢٨ی کانوونی دووەمی ١٩٧٠دا، ژەنەڕاڵ تکریتی کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی لە بەیروتدا گرت و گوتی چەندین شـــیوعی پلەوپایەی خۆیان لەنێو ئیـدارەکەدا پێـدراوەتەوە و ئەوانەش شـــوێنەکـانیـان گیرابوو مووچەی خۆیـان پێدراوەتەوە. بڕوانە : Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives), Volume XVII, February 1970 Iraq, Page 23827.

[٢٧٧] ڕێککەوتنەکە پێکهـاتبوو لە چەکی دژە هەوایی، ڕۆکێتی دژەتـانـک، زرێپۆشـــی بۆ گواستنەوەی سەرباز و فڕۆکەی شەڕکەریش بڕوانە:
CIA, "Moscow and the Persian Gulf," IM-0865/72, May 12, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.307), p. 2; U.S. Department of State 12,737 to U.S. Embassy Iran, January 22, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.295).

[278] Moscow 1501 to U.S. Department of State State, February 18, 1972, FRUS 1969–1976, E-4, 298.

دوابەدوای سەردانی کۆسیجن بۆ بەغدا لە نیسانی ١٩٧٢دا ، حزبی بەعس ڕێگەی بە حزبی شیوعیی عێراق دا بگەڕێنەوە نێو کابینەی حکوومەت و بە فەرمیش بێنەوە نێو بەرەی نیشتمانپارێزیی وڵات، هەرچەندە دەسەڵاتی ڕاستەقینە هەر لەبن دەستی بەعسییەکاندا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەستبوونی بەغدا تا دەهات کەمتر دەبووەوە، هۆکاری سەرەکیش ئەو هەڵکشانە زۆرەی نرخی نەوتی خاو بوو، کە بەدوای قەیرانی نەوت لە ١٩٧٣-١٩٧٤ی دا هات، ئیدی وردە وردە حیزبی شیوعیی عێراق سەرکوت کرایەوە.

ئەو پەیوەندییە گەرمەی نێوان بەغدا و مۆسکۆ، شای ئێرانی نیگەران کرد. لەبەرڕەوتێکی بەرفرەوانتری خاوبوونەوەی گرژیی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و حەزنەکردنی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە دەستوەردانی ڕاستەوخۆ لە هەرێمەکەدا، ئەوا شا ئەو پێشڕەوییەی ڕوسیای بۆ بەغدا بە هەڕەشەیەکی تەشەنەکردووی بۆ سەر ئێران دانا. شا لە ئەنجامە پێشبینینەکراوەکان نیگەران بوو، لێدوانێکی دا بەوەی پەیماننامەکە "جارنامەی نمایشێکی هەرمێنپەیداکردنە بۆ هەردوولایان، هەرچەندە مایەی تێروانینیشە."[٢٧٩] ئەو دەیزانی کە جێبەجێکردنی تەواوی بەندەکانی ڕێککەوتننامەی ئازار زەبرێکە لە سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە کوردستانی عێراق و لە بەرانبەردا وا لە عێراق دەکا دەستوپێوەندی بۆ دەستوەردان لە ناوچەی کەنداوی فارسی بکاتەوە. ئەمەش بۆ پیاوێک کە وڵاتەکەی خۆی بە میراتگری سروشتی بەریتانییەکان لە کەنداوی فارسی دەبینی، مایەی پەژراندن نەبوو. بە ڕوانینی شا، ڕێککەوتننامەکە هەر بەراییەکی باڵکشانی زلهێزێتی مۆسکۆ نەبوو بەسەر هەرێمەکەدا، بەڵکو نیشانەنمای دامەزراندنی قەوارەیەکی کوردی گەورەتر بوو. لەپاش

---

279 Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 328.

کودەتاکەی ١٩٥٨دا، ئەوە یەکەمین جار بوو هەڕەشــە ســەرەکییەکانی پان عەرەبیزم و کۆمۆنیزم و جیابوونەوەی کوردان، هەر هەموویان بەیەکەوە کۆ ببنەوە. بەم بارودۆخەوە تاکەڕێگای دەربازبوونی ئەو ئەوە بوو، بە ڕاکێشــانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ناو شــەڕەکە، قەناعەت بە بارزانی بکا تا شەڕی کوردی هەڵبگیرسێنێتەوە.

شــا لە ئیدارەی نیکســن خەریکی لۆبیکردن بوو، بەڵکو واز لە ســیاســەتی دەســتبەردان لە بەرانبەر کوردی عێراق بهێنن. ئامرازە هەرە ســەرەکییەکەشــی قەناعەتپێهێنانی وڵاتە یەکگرتووەکان بوو بە ســتراتیژییەکەی خۆی، واتە زمانی جەنگی ســارد، بەوەی جەنگی کورد و پەیوەندییەکانی بەغدا-کرملین نەخشــەیەکی بەربەرینی سۆڤیەتە بۆ ئەوەی دزە بکاتە نێو هەرێمەکە. هەر چەند رۆژێک لە دوای ڕێککەوتننامەکە، هوەیدا ڕوانینی شــای لەبارەی ڕێککەوتننامەکە بۆ دۆگلاس ماکئارســەری باڵوێزی وڵاتە یەکگرتوەکان لە تاران ڕوونکردەوە، بەوەی "پێشــهاتێکی پەرەسەندووی مەترسیدارە، ئاخر مەترسییەکان بۆ سەر ناوچەی کەنداوی فارســی و نیمچە دوورگەی عەرەبی پتر دەکا"، ئەو پێداگرتنەی هوەیدا – لەڕاســتیدا هی شــا بوو- کەوا بەغدا زۆر کەوتۆتە بن کاریگەریی سۆڤیەتییەکان، چونکە بە پەیوەستبوونی بە هێزی سەربازیی سۆڤیەتی و ئەوانی دیکەیەوە خۆی دەرباز دەکا." هەروەها ئەوەشی بۆ زیاد کرد، گوایە ڕێککەوتننامەی ئازار دەستوپێوەندی عێراقی بەعس لە کوردستان دەکاتەوە و ڕێگەی پێدەدا ٢٠،٠٠٠ ســەربازی خۆی و ســامانی دیکەی عێراقی بخزێنێتە کەنداوی فارســی، "بۆ تێکدان و زیانگەیاندن بە وڵاتە بچکۆلەکانی کەنداوی فارســی و یان بۆ ئیســڕائیل." هوەیدا ئەوەشــی خســتەســەر، ڕێککەوتننامەکە لە چاوی شــا نیشــانەنمایەک بوو بۆ ڕووس تا "ڕۆڵێکی بەهێز لە وروژاندنی هەســتی نەتەوەیی گەلی کورد وازی بکەن و هانی کوردی تورکیا و ئێران بدەن دەســت بە چالاکیی تێکدەرانەی خۆیان بکەن

تا دەوڵەتی سەربەخۆیی کوردی بەربەرینتر داوابکەن."[٢٨٠] **ئەو گەیشتە ئەو دەرەنجامەی بڵێ کە ڕێککەوتننامەکەی ١٩٧٠ دەکرێ "ئامادەکاری بێ بۆ هەنگاوی داهاتووی نەخشـــەی ســـۆڤیەت تا لە کۆتاییدا ئۆتۆنۆمی پارێزگا کوردییەکـانی عێراق ببێتە دەوڵەتێکی کوردی ئۆتۆنۆم، بەو ڕوانینەی دەوڵەتی کوردی بەرفرەوان بکرێ تا لە کۆتاییدا ســـنووری بگاتە ســـەر ســـنووری یەکێتیی ســـۆڤیەت، ئیدی لەوێوە ســـۆڤیەت بتوانێ بە ئاســـانی بەربەستی تورکی-ئێرانی تێپەڕێنێ و ڕاستەوخۆ دەستی بگاتە ڕۆژهەڵاتی ناوین."**[٢٨١] بەکارهێنانی زمان جەنگی سارد نمایشێکی جەوهەری ستراتیژی شـــا بوو. بەپێی بیرکردنەوەی شـــا، "باڵکێشـــبوونی کۆمۆنیســـتی" واتای دامەزراندنی حکومەتێکی نیشـــتمانیی عێراقی یەکگرتووی دەگەیاند کە دەستوپێی سوپای عێراق لە کەنداوی فارسیدا بکاتەوە و بشبێتە مایەی پایەبەرزبوونەوەی پێگەی شیوعییەکان لە بەغدا.[٢٨٢] ئەمەش هەمان "ڕەوشی لەیەکچووە لەگەڵ وڵاتە گرێدراوەکان بە یەکێتیی ســـۆڤیەت لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا."[٢٨٣] هەر لەســـەر هەمان هێڵیشـــدا، حکومەتێکی نیشـــتمانیی یەکگرتووی عێراقی "دەکرێ شیوعی و ناسری و کوردانی سەربە بەعس لەخۆبگرێ... هەروەها ببێتە ڕەوشـــێکی دژ بە بەرژەوەندییەکانی ئێرانی و

[280] Tehran 928 to U.S. Department of State, March 12, 1970, FRUS 1969–1976, E-4, p. 53.

[281] Tehran 00928 to U.S. Department of State, "Soviet-Iraq Threat to Middle East (Shah's Views)," March 12, 1970 (FRUS/1964–68/XXI/doc.53), pp. 1–3.; and Tehran 928 to U.S. Department of State, March 12, 1970, FRUS 1969–1976, E-4, p. 53.

[282] National Security Council, Memorandum, Saunders to Kissinger, "Supporting the Kurdish Rebellion," March 27, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.301), pp. 3–4.

[٢٨٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا."[284] لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەمریکا شەڕی کورد ئەوەندە وەک توخمێکی ڕکابەری جەنگی سـارد لەگەڵ مۆسـکۆ نەدەهاتە پێش چاو وەک ئەوەی ناکۆکییەکی هەرێمی-خۆجێی دوورەدەست بێ.

### دوودڵیی ئەمریکییەکان

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ماوەی زیاتر لە یەک دەیە خۆپارێز بوو لەوەی خۆی لە جەنگی کورد هەڵبقورتێنێ. هەرچەندە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا لەسـەر زیادکردنی پشـتگیریی خۆی بۆ هاوچەرخکردنی هێزە چەکدارەکانی ئێران بۆ بەلاوەنانی هەڕەشـەی سـۆڤیەت دەربڕی، لێ ئەو چوارچێوە بیرکردنەوەی شـای ئێرانی ڕەتکردەوە کە ڕێککەوتننامەی ئازاری بە بەشـێکی گەورەی "نەخشـەڕێگای مۆسـکۆ" بۆ دروسـتکردنی "ڕێرەوێکی کوردی" بۆ سـەر کەنداوی فارسـی بێ، ئاخر ئەوان پێیان وابوو "پێناچی مۆسکۆ بیەوێ پەیوەندییە ورياییە سروشـتییەکەی لەگەڵ ئێران و تورکیا بەشتێکی وەها بخاتە بەر مەترسی."[285] وەزارەتی کاروباری دەرەوە پێیوابوو هەر یەک لە ئێران و ئیسـرائیل لەبارەی هەڕەشـەی سـۆڤیەتەوە زیادەڕۆییان کردووە.[286] تەنانەت کاردانەوەی عێراق بۆ وەرگرتنەوەی سێ

---

[284] National Security Council, Memorandum, Saunders to Kissinger, "Supporting the Kurdish Rebellion," March 27, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.301), p. 3.

[285] Tehran 00928 to U.S. Department of State, "Soviet-Iraq Threat to Middle East (Shah's Views)," March 12, 1970 (FRUS/1964–68/XXI/doc.53), pp. 1–3.

[286] Baghdad 291 to U.S. Department of State, March 14, 1970 (NPL/NSC/NSF/ Box601/Country Files/Middle East/Iran/Vol.I/1/20/69–5/31/70), p. 1; and U.S. Department of State 54,598 to U.S. Embassy in Tel Aviv, "Soviet Pressure for Iraqi-Kurdish Agreement," April 14, 1970 (FRUS/1964–68/XXI/doc.269), p. 3.

دوورگە ستراتیژییەکەی کەنداویشی بە هەڕەشە حیساب نەکردبوو.[٢٨٧] وەزارەت ڕەتیکردەوە هەژموونی عێراق لە دوای مۆرکردنی ڕێککەوتننامەکە لە جیهانی عەرەبدا زیادی کردبێ.[٢٨٨]لە بری ئەوە ئەوان مشتومڕیان لەسەر ئەوە بوو، کە بەغدا لەگەڵ ئەو پەیوەندییە گەرمەی لەگەڵ مۆسکۆ پەیدایکردووە، "تەنانەت لە لایەن تەوژمی سەرەکی جیهانی عەرەبیش گۆشەگیر بووە."[٢٨٩] کاتێکیش ئەندرێ گرۆمیکۆی وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت بۆ واژۆکردنی ڕێککەوتننامەی چەک سەردانی بەغدای کرد،[٢٩٠] ئەوا وەزارەت ئەمەی بەوە دانەنا "بەشێک بێ لە سیاسەتی دوژمنکارانەی لە کەنداوی فارسی و مەبەستیش لێی ئێران بێ"؛ بەڵکو بە چوارچێوەیەکی دانا کە هەنگاوێکە "بۆ هێورکردنەوەی بەغدا نەوەک بۆ

[٢٨٧] لە ٣٠ تشرینی دووەمی ١٩٧١دا، بەغدا بە توندی کاردانەوەی لە هەمبەر وەرگرتنەوەی دوورگەکانی ئەبو موسا و تونبی گەورە و بچووکەوە هەبوو، بەوەی پەیوەندییە دیپلۆماتەکانی لەگەڵ تاراندا بپچڕێنێ، هەروەها ٦٠،٠٠٠ عێراقی بە ڕەچەڵەک ئێرانی لە عێراق دەربکا، داوای خوزستان بکات و بە چڕیش پشتگیری جوداخوازە عەرەب و بلووچەکانی ئێران بکا.

288 The U.S. Department of State 213,299 to Tehran, November 24, 1971, FRUS 1969–1976, E-4, 294

ڕایگەیاند گوایە هەڕەشەی سوپای عیراقی لە لایەن شای ئێرانەوە شوولی لێهەڵکێشراوە، باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت پێی لەسەر ئەوە دادەگرت دەست بە سیاسەتی لەمێژینەی دەستتەخستنە کاروباری شەڕی کورددا بگرن، ئاخر خۆ سوپای عێراقی" دوای ئەو پاکتاوە وێرانکارییەی بەعس کردوویەتی هی ئەوە نییە بە ئاسانی لەسەرپێی خۆی بوەستێ و بجەنگێ. Beirut A-38 to U.S. Department of State, February 2, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 297).

289 U.S. Department of State 67,409 to Certain Posts, April 21, 1971, (FRUS 1969–1976, E-4, 286).

290 Beirut A-38 to U.S. Department of State, February 2, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/ doc.297), pp. 8–9.

هەڕەشـــەکردن لە شـــا."[291] ڕێککەوتننامەی ئاشـــتی ناویشـــی نرابوو "هیچ شـــتێک ســـەرســـام و یان لەناکاو نییە، بەڵکو جێگیرکردنی دۆســـتایەتییە هەبووەکەیە."[292] ئەوەی بە دانەیەکی دیکەی ڕێککەوتنی ســـۆڤیەت لەگەڵ هیندستان و میسر دانا،"[293] وەزارەت پێیوابوو هێزی سەرەکی پاڵنەری ئەم واژۆکردنەی پەیماننامەیە، کەمتر لەسەر بنەڕەتی هەڕەشەکانی جیۆپۆلیتیکی ڕۆنراوە، لەوەی دەســتپێشــخەرییەکی خودی ســەددام بووە، ئەو کەســەی گرتنەدەســتی جڵەوی دەســەڵات بەدوای پشــتیوانی ســۆڤیەتیدا دەگەڕێ.[294] لەبەر ئەو بەرڕەوتەدا جۆزێف فارلاندی باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران لێدوانی دا، هەر پشــتگیرییەکی کوردی عێراق دەکرێ "**بە بەراورد بە ســوودەکانی، سەرچڵییەکی لە ڕادەبەدەر بێ و لەدەست دەربچێ.**"[295] هارۆلد ساندەریش مشــتومڕی لەســەر ئەوە بوو، کە دەســتتێکەڵکردنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جەنگی کوردی دوورەدەســـتی نارۆشـــن، دەکرێ "لە لایەن ســـۆڤیەتیەکانەوە بە جووڵەیەکی ڕاســـتەوخۆی دژ بە ئەوان دابنرێ."[296] بە گوێرەی ڕای ساندەر هەردوولایان، ئێران و ئیسـرائیل هەوڵی ئەوە دەدەن ئەمریکا بخزێننە نێو قەیرانەکە بەوەی بە زیادەڕۆیی باسـی پەیوەندییەکانی عێراقی –ڕوســـی دەهێننەگۆڕێ، لەکاتێکدا و لە هەمان کاتدا ئەوان دەتوانن

[291] The U.S. Department of State 12,737 to U.S. Embassy Iran, January 22, 1972, (FRUS, 1969–1976, E-4, doc.295).

[292] National Security Council, "Iraq," May 18, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.308), p. 5.

[293] Saunders to Haig, March 27, 1972, (FRUS 1969–1976, E4, 301).

[294] Eliot to Kissinger, April 13, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 305); Kissinger, Years of Renewal, (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 581.

[295] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 581.

[296] National Security Council, Memorandum, Saunders to Kissinger, "Supporting the Kurdish Rebellion," March 27, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.301), p. 1; Saunders to Haig, March 27, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 301).

بەبێ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتی کورد بگرن. ئەوان "بە شێوەیەکی ڕەهـاوە هیچیـان پێویســـــت بە ئێمە نییە لەوە زیـاتر دەیـانەوێ ئێمە لە کوردستانی عێراقەوە بگلێین."[297] کاتیش لەبەرژەوندی ئێراندا نەبوو.

لەو نێوەشدا بارزانی لێبڕاوتر بوو لەسەر ڕێکخستنەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ هەر شـالاوێکی داهاتووی چەکدارییانەی بەعس. سـەرباری گومانی لە تاران، کەچی گوێی هۆشـدارییەکەی لە ڕومیانتەسـێفی جێگری سـەرۆکی یەکێتیی سـۆڤیەت نەگرت کە گوتبووی "بڕوا بە شـا مەکە."[298] ئەو لە نەخشـەداڕشـتنی پلانی کودەتاکەی ئازاری ١٩٧٢ کە بەسـەرپەرشـتی سـەرهەنگ عەبدولڕەزاق ئەلنایف بوو، ڕەگەڵ سـاواک کەوت.[299]هەرچەندە سـاواک پێداویسـتییەکانی دارایی و سـەربازیی بۆ پیلانەکە ئامادە کرد، لێ بارزانی گومانی لەوە هەبوو نەوەک سـاواک "بەڵێنەکانی نەباتەسـەر." ئاخر نە بارزانی و نە هیچ ئۆپۆزسیۆنێکی دیکەی عێراقی پێشوازی لەوە نەدەکرد " ڕاسـتەوخۆ ئێران کاروباری ناوەخۆی عێراق کۆنترۆڵ بکا یان دەسـتی

---

297 National Security Council, Memorandum, Saunders to Kissinger, "Supporting the Kurdish Rebellion," March 27, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.301), p. 1; Saunders to Haig, March 27, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 301).

٢٩٨ ڕومیانتەسـێڤ سـەرۆکی بەشـی عەرەب یان ڕۆژهەلاتی ناوین بوو لە هۆبەی کاروباری نێودەوڵەتی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیسـتی یەکێتیی سـۆڤیەت، کە بەسـەرۆکایەتی نێردەیەکی پلە بالا لە ٢٨ی شـوباتی ١٩٧٢دا نێردرابووە کوردسـتان تا قەناعەت بە بارزانی بکا ڕەگەڵ حزبی شیوعی عێراقی بکەوێ و بەرەی نیشتمانی پێکبهێنن.

Saunders to Haig, March 27, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 301); Helms to Kissinger, Rogers and Laird, March 31, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 303); Central Intelligence Agency, 20,505, March 29, 1972.

٢٩٩ عەبدولڕەزاق ئەلنایف سەرۆوەزیری پێشوو، سوپاسالاریش بوو.

بخـاتە نـاو و هەڵیسـورێنێ."[300] هەر بۆیە بـارزانی داوای لە وڵاتە یەکگرتووەکان و هەروەها لە شـا حوسـێنی ئوردنی کرد، بەڵکو پشـتگیری پیلانەکە بکەن.[301] لە هەمان کاتیشدا، ساواک بە پێداگیرییەوە داوای لە سی ئای ئەی کرد بە "پاڵپشـتی دارایی و سـەربازی" و "کۆکردنەوەی عێراقییە تاراوگەنشـینەکان بۆ ئەوەی ببنە کرۆکی دەسـتپێشـخەری حکومەتێکی جوداخواز کە بـارزانی داڵـدەی دابوون،" پشـتی پیلانگێرانی کودەتـاکە بگرێ.[302] لەگەڵ ئەوەشـدا وەزارەتی کاروباری دەرەوە ئەگەری ڕوخانی ڕژێمی بەعسـی بەکەم گرت، بەو بەڵگەوبەندەی کە ڕژێمی نوێی عێراق لاوازە و پەیوەسـتە بە سـۆڤیەتەوە لە ڕێی "ئەو ناوکەپەتکەی بارزانی بە مۆسـکۆوە هەیەتی." بەگوێرەی وەزارەتی کـاروبـاری دەرەوە، هەر هاوکارییەک بۆ کودەتا دەکرێ بەوە شـەقڵە لێی بڕوانرێ کە نموونەیەکی هـاوپەیمـانی وڵاتە یەکگرتووەکـانە لەگەڵ وڵاتە نـاعەرەبییەکـان لە دژی دەوڵەتە عەرەبییەکان و دەبێتە مایەی زیانگەیاندن بە نمایشی پەیوەندییەکان

---

300 Helms to Kissinger, Rogers, and Laird, March 29, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 302);
Helms to Kissinger, June 6, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 313).

301 هەردوو لایان، چ ئۆپۆزسیۆنی عێراقی و چ کورد لەسەر دەستتێکەڵکردنی شا حوسێن لە پیلانەکە سـوور بوون، چونکە (١) ئوردن وەک کەناڵێکی پشـتگیری بۆ عێراق باشـترین جێگرەوەیە بۆ ئێران؛ (٢) شـا حوسـێن دۆسـتێکی زۆر نزیکی شـا بوو، دەکرا ناوبژیوانی لەنێوان ئێران و کورددا بکا. بڕوانە:
Killogre to Sisco, April 3, 1972, (FRUS 1969–1976, 3–4, 304).

302 لە یاداشـتێکی سـی ئای ئەی، لە والەرەوە بۆ سـیسـۆ؛ "نیازی بارزانی سـەرکردە بۆ نزیکبوونەوە لە حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ پشـتیگیری؛ دەزگای هەواڵگریی ئێرانی داوای دەربڕینی خواستی حکومەتی وڵاتە یەکگرتووکان دەکەن بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس لە عێراق."
March 9, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.299), p. 1–2; CIA, Memorandum, Helms to Kissinger, et al., "Kurdish Efforts to Recruit International Support…," March 29, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.302), p. 1.

لەگەڵ هاوپەیمانانی عەرەب بۆ ئەمریکا. لەوەش پتر، ئەگەری هەیە ئەنجامەکەی بەوە بشکێتەوە کە، دەوڵەتێکی کوردی لە عێراق پێکبێ بەوەی پرسی ناسیونالیزمی کوردی لە ئێران و تورکیا دنەبدا و "زیاتر ببێتە مایەی شیرازەتێکچوونی ناوچەیەکی پێشتر شیرازەتێکچوو."[303] لە هەمان کاتیشدا، سی ئای ئەی لەسەر ئەوە پێداگیربوو کە هەر دەستتێکەڵییەک لە پیلانێکی وەها دەکرێ "سۆڤیەتییەکان بە جووڵەیەکی ڕاستەوخۆی دژ بە خۆیان بزانن."[304] **ولاتە یەکگرتووەکان نەیاندەویست لە کوردستانی عێراقدا لایەنی ئێران بگرن.**

### کۆبوونەوەی لووتکە / تاران لە ١٩٧٢

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەرەتای ١٩٧٢ هێشتا هەر پەرگیر بوو بەوەی لە دژایەتی بەغدا دا لایەنگیری ئێران و ئیسرائیل نەکا، تەنانەت کاتێک شا حوسێنیش ڕەگەڵ هەڵمەتی شا کەوت تا گوشار بخرێتە سەر کۆشکی سپی.[305] لەگەڵ ئەوەشدا شا دەستبەرداری ئەو هیوایەی نەبوو بەڵکو ولاتە یەکگرتووەکان بە سیاسەتی دەست بەدوورگرت لە کێشەی کوردستان بچێتەوە. لە شوباتی ١٩٧٢دا سەرۆک نیکسن سەردانێکی

303 The U.S. Department of State, Memorandum from Seeyle, "Some Reasons Why We Should Not Support Barzani Against the Iraqi Government," March 14, 1972 (NARA/ RG59/Records Relating to Iraq/1973–1975/Box1/POL 13), p. 1.

304 National Security Council, Memorandum, Saunders to Kissinger, "Supporting the Kurdish Rebellion," March 27, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.301), p. 1.

305 Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999) p. 581; SAVAK had already offered a secret "corridor," Jordan, to channel assistance "with only Barzani being aware." U.S. Department of State, Memorandum from Scotes, "Kurdish Appeal for U.S. Assistance," Memorandum of Conversation, April 3, 1972 (NARA/RG59/ Records Relating to Iraq/1966–1972/Box14/POL 13), p. 2.

پەکینی کرد، بە دوای سیاسەتێکی نوێدا گەڕا تا دواتر بە کۆبوونە لووتکەییە مێژووییەکەی مۆسکۆ لە حوزەیرانی ١٩٧٢دا بەرجەستە بوو. لە ڕوانگەی شاوە پەیماننامەی سنووردارکردنی چەکی ستراتیژی نیکسن-بریجینێڤ وەهای نمایش کرد کە، ولاتە یەکگرتووەکان مەیلێکی وەهای نییە تا پشتگیریی تەواوی هاوپەیمانەکانی خۆی بکا و داننانی تەواوی بە ناوچەی هەژموونی مۆسکۆ بە عێراق و ئەگەری کەنداوی فارسیشەوە.

نیکسن و کیسنجەر دوای یەک ڕۆژ لە کۆبوونەوە لووتکەییەکەی مۆسکۆیان، گەیشتنە تاران و لەوێ لە کۆشکی سەعدئاباد لەگەڵ شادا کۆبوونەوە. نیکسن لەسەر نانی نیوەڕۆدا لەگەڵ شا جەختی لەسەر پەیوەندییە تایبەتییەکەی لەگەڵ ئێراندا کرد و گوتی: "کرەملین کۆشک بوو، بەلام مانەوە لەوێ بۆ هەشت ڕۆژ زۆر خنکێنەر بوو. من لێرە لە مالی تایبەتی شادا بە ئاسوودەیی هەناسە دەدەم، ئاخر ئەو ماڵەکەی لەگەڵ بەش کردووم وەک ئەوە وام لە مالی خۆم بم."[٣٠٦] نیکسن بە ئاگاداربوون لە نیگەرانی شا لەبارەی لێکەوتەکانی کۆبوونەوەی لووتکە لە مۆسکۆ بۆ ئێران، بۆیە پابەندبوونی خۆی بۆ پشتگیری تەواو بۆ ئێران نیشاندا و چەکی نوێی پێدان بەتایبەتیش فڕۆکەی F-14و F-15 ئەویش بۆ بەرپەرچەدانەوەی فڕۆکە هەرە نوێیەکانی عێراق لە جۆری مێگ MIG-23 کە تازە درابوونە بەغدا.[٣٠٧] شا سەرکەوتووانە بە ئەعلەمی گوت؛ "نیکسن هەموو شتێکی دامێ کە داوام کرد."[٣٠٨]بڕیارەکەی نیکسن لەسەر ئەوە

306 Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 286.

307 White House, Memorandum of Conversation, "May 31, 1972–10:30 a.m. to 12:00 p.m.," (FRUS/1964–68/XXI/doc.201), p. 3.

308 Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 287.

بنیاتنرابوو کە ئەمریکا؛ "پێویستی بە پتەوکردنی پەیوەندی دۆستایەتییە لەگەڵ شای ئێران، کە وەک کلیلێکە بۆ پاراستنی سەقامگیریی ئێران.[٣٠٩] لەوەش سەرنجراکێشتر، بڕیارەکەی ئەو بناغەی ڕۆنانی ڕێبازی نیکسن بەوەی ئێران تاکە کۆڵەگە بێ لە ڕۆژهەلاتی ناوین، "لەگەڵ بەڕواڵەت کۆڵەگەبوونی عەرەبستانی سعوودی لەوێ بۆ هۆکاری سیاسی هەرێمی پێویست بوو."[٣١٠]ئەمەش بۆ شا سەرکەوتن بوو.

هەروەها شا فشاری خستە سەر نیکسن بۆ ئەوەی پشتگیریی کوردی عێراق بکا.[٣١١] ئەو لێزانانە زمانی جەنگی ساردی بەکارهێنا، بەوەی چوارچێوەی حکومەتی یەکێتیی نیشتمانی لە بەغدای بە پلانێکی سۆڤیەتی بۆ "پێکهێنانی هاوپەیمانییەتییک لە کورد و بەعسی و شیوعییەکان دانا." ئەو بەپێداگرتنەوە گوتی، "لەبری ئەوەی کێشەی کورد ببێتە دڕک لەبەرپێی [ڕژێمی بەعس لە بەغدا] دەکرێ ببێتە پێگەیەکی پاڵپشت بۆ شیوعییەکان" لە دژی ئێران و تورکیا. کاتێکیش هنری کیسنجەر پرسی؛ "چی بکرێ؟" شا هەر خێرا وەلامی دایەوە؛ "دەکرێ ئێران یارمەتیان بدا."[٣١٢] ئەو بۆ ڕۆژی پاشتر داواکەی دووبارە کردەوە بەوەی جەختی کردەوە کە مەترسی ڕاستەوخۆی سەر ئێران، "بە زۆری لە بەغداوە دێ، یان بەلای کەمییەوە

---

309 Offiler, US Foreign Policy and the Modernization of Iran: Kennedy, Johnson, Nixon and the Shah, Palgrave Macmillan UK, 2015.

310 Harold Saunders in an interview with William Burr, February 24, 1987, Washington, DC, tape 2B, FISOHC in Nixon, Kissinger, and the Shah: The United States and Iran in the Cold War by Roham Alvandi (Oxford University Press, Oxford, UK, 2014).

311 White House, Memorandum of Conversation, May 30, 1972–5:35 to 6:35 p.m. (FRUS/1964–68/XXI/doc200), pp. 1–2; and Memorandum of Conversation, May 31, 1972–10:30 a.m. to 12:00 p.m. (FRUS/1964–68/XXI/doc201), pp. 1–3.

312 Memcon, May 30, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 200).

بەشێکی بەر بەغدا دەکەوێ."[٣١٣] هەر بەڕاستیش شا لێزانانە یاری بە پرسە هەستیارەکانی وەک بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزم و جوداخوازی لە هەرێمەکەدا لەگەڵ وڵاتە یەکگرتوەکاندا کرد.

لە هەمان کاتدا، نووسینگەی هەواڵگریی و لێکۆڵینەوە BIR هۆشداری دایە وڵاتە یەکگرتووەکان بەوەی لە کوردستانی عێراقەوە بگلێ، ئاخر خۆی گەمەیەکی دوورەوە وا پرکێشی ئەوە بوون نەخشەکەی شا بۆ ڕاکێشانی وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ نێو جەنگی کورد ڕەتبکرێتەوە.[٣١٤] دەزگاکە مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو کە بارزانی تەمەن ٦٩ ساڵە؛ "**تاقە سەرکردەی کوردە بتوانێ گەلەکەی بۆ خاڵی یاخیبوون و شۆڕشی چەکدارانە یەک بخا**" و "**کەسایەتی سەرنجڕاکێشی ئەو بەهێزترە لە هەر بیچمێکی کوردی لەنێو نەوەی خۆیدا**،" وەهای بینی "ئەو ئامانجانەی کە گەلەکەی بۆی تێدەکۆشێ خەریکبوو بەدی بێن، لەبار بچێ، مەگەر ئەو بتوانێ هەندێ دەستکەوتی سیاسی گەورە بەدیبێنێ لەو هەلمەتەی کە پێدەچێ دوا تێکۆشانی بێ. هەروەها پێدەچێ ئەو پێشبینی ئەوەی کردبێ ئەگەر ئەو لەو دارسانە لابدا، ئەوا خۆری کەسایەتی ڕابەرایەتییەکەی ئاوا دەبێ." هەروەها ئەوەشی بۆ زیادکردبوو، کە بارزانی دوو مژاری وێرانکەری لەپێش بوو. لەکاتێکدا چوونەڕیزی حکوومەتێکی یەکگرتووی نیشتمانی کۆتایی هەوڵ و تەقەللایە بۆ ئۆتۆنۆمییەک لە کوردستانی عیراق، شەڕی "یاخیبوون(شۆڕش)"ێکی بەردرێژیش بێ ئەنجامە. هەروەها دەزگاکە پێشبینی ئەوەشی کرد، شکستی بارزانی دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی دەستەیەکی هەراسانی لایەنگری بەعس یان تەنانەت سەر بە سۆڤیەت بۆ جڵەوگرتنەدەستی کوردستانی عێراق، [کە] هەڵبەت فشار دەخاتە سەر ئێران و تەنانەت سەرئێشەش بۆ

---

313 Memcon, May 31, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 201).

314 Research Study RNAS-10 prepared by the U.S. Department of State, May 31, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 201).

ڕۆژهەڵاتی تورکیا دروست دەکا."[٣١٥] کەچی ئەم ڕایە بەر گوێی کەڕە کەوت و نەبیسترا. نیکسن ڕەزامەند بوو لەسەر "پشکداریی ئەمریکا بە شێوەیەک لە شێوەکان کە پێویست بە پاراستنی ورەی هاوپەیمانییە سەرەکییەکانی وەک ئێران و ئوردن، هەرچەندە ئەم دوو دەوڵەتەش لە ئامانجەکانیان جیاواز بوون، هەروەها بۆ ئەوەی لە هێزی هاوسەنگی هەرێمەکە پشکدار بێ."[٣١٦] بە لەبلەبانێتی زمانی جەنگی سارد کە شا هانای بۆ برد، نیکسن و کیسنجەر قایلبوون پشتگیری کوردی عێراق بکەن.[٣١٧]

شا متمانەی بەخۆ بوو بەوەی سیاسەتی ولاتە یەکگرتووەکان دەرهەق کوردستانی عێراق وەربچەرخێنێ. شا بە ئەعلەمی گوت؛ "کاتێک لەگەڵ نیکسن لەبارەی کوردستان و عێراق هەژموونی سۆڤیەت لە [عێراقەوە] قسەم کرد، ئەو زۆر خەمبار بوو و پێیگوتم ئەو هەر پلانێک پێشکەشی بکەم جێبەجێ دەکا."[٣١٨] ئاژانسەکەی ئەو بۆ گۆڕینی سیاسەتی ئەمریکییەکان لەسەر بنەمای "دۆستایەتییە تایبەتییەکەی" ئەو بوو لەگەڵ نیکسن. هەر بەڕاستیش نیکسن ئێرانی وەک "یەک دۆست لەوێ" دەبینی. ئەو جارێک گوتی؛ "بەهۆی خواوە ئەگەر ئێمە لەگەڵ ئەوان ڕێ بکەین و دەکرێ ئەو بەهێز بکەین و ئەوان لە نێو چەقی بازنەدان و دۆستێکی ئەمریکان، -لەوە پتر ناتوانم قایل بم- خۆی ئەوە شتێکە."[٣١٩] سەرباری

---

[٣١٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[316] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 581.

[317] Kissinger, Henry, White House Years, (Little Brown & Co, Boston, Massachusetts, 1979) pp. 1264–1265; Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 583.

[318] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 306.

[319] Conversation among President Nixon, MacArthur, and Haig, Washington, April 8, 1971, FRUS 1969–1976, E-4, 122.

ئەمەش هەردووکیان، چ نیکســـن و چ کیســـنجەر شـــتێکی کەمیان لەبارەی بنەچەکە و بزوێنەری پرسی کوردان دەزانی. **"ئێمە لەبارەی کوردەوە شت زۆر نازانین... پێمان وایە تیرە و هۆزی نیشتەجێی بەرزایین."** [٣٢٠]

کۆبوونەوەی لووتکەی ١٩٧٢ بۆ شـــەڕی کورد خاڵی وەرچەرخان بوو. هەرچەندە هەوڵدانیان بۆ دیتنی نیکســـن و کیســـنجەر ڕەتکرایەوە، [٣٢١] لێ کوردەکان لەبەر وەرچەرخانی سیاسەتی ئەمریکا نەدەکرا لەوە شادمانتر بان. هەر ڕۆژێک دوای ئەوەی نیکسن تارانی بەجێهێشت، بەغدا کۆمپانیای نەوتی عێراقی خۆماڵی کرد. ئەمەش جووڵەیەکی چارەنووســـاز بوو کە ڕێک لەگەڵ زمانی جەنگی ساردی شـا هاتەوە و ڕەوایەتی بە سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بەخشـی لەوەی بەردەوام بە دوای ڕاگرتنی "دزەکردنی سـوڤیەت بۆ سـەر ناوچەی بەرهەمهێنی سـەرەکی نەوت لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا" دەگەڕا. [٣٢٢] هەر تەنیا پاش هەفتەیەک، شـــا داوای لە کیسنجەر کرد بەڵکو بۆ مەبەستی درێژەدان بە هاوکاریی ئیدریس بارزانی و مەحمود عوســـمان ببینی. [٣٢٣] وێرای نـارەزاییەکی تونـدی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، [٣٢٤] کیســـنجەر چاوی بە نێرەدە کوردییەکە کەوت. هەر

320 Randal, Jonathan After Such Knowledge, What Forgiveness? My Encounters with Kurdistan. (London: Westview Press, 1999) p. 149.

321 Helms to Kissinger, June 6, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 313).

322 Randal, Jonathan. After Such Knowledge, What Forgiveness? My Encounters with Kurdistan (London: Westview Press, 1999). p. 152.

323 National Security Council, Memorandum, Saunders to Kissinger, "Message from Shah on Kurds," June 7, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.313), pp. 1–3.

٣٢٤ لە ٧ی حوزەیرانی ١٩٧٢دا، هارۆلد ساندەرس داوایەکی شای ڕەتکردەوە، بەوەی لەسەر ئاستێکی باڵا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پەیوەندی بە کورد بکرێ و هۆشداریشی دایە کیسنجەر کە خۆی لە تیوەگلانی ڕاستەوخۆ لە کوردستانی عێراقدا بەدووربگرێ. ئەو بە وریاییەوە هۆشداری دایە کیسنجەر کە، "لە باشترین حاڵەتدا بە بنبەست گەیشتنە و ئەگەر شەڕیش رووی لە کورد کرد ئەوا ئێمە نە دەستمان پێیان دەگا و نە لە بەرژەوەندیشماندایە گردەبڕانە کۆمەکیان بکەین." هەروەها ڕاوێژی ئەو دژی هەر پشتگیرییەکی ڕاستەوخۆ بوو،

یەک دوو ڕۆژیش پاشـــتر، جۆن کۆنلی وەزیری پێشـــووی گەنجینە چووە تاران و چۆنیەتی بڕیارە وەرچەرخاوەکەیان بۆ پشـــتگیریی کورد بە شـــا ڕاگەیاند.[٣٢٥] ئەمەش بۆ جەنگی کورد قۆناغێکی نوێ بوو.

ســـی ئـای ئەی بۆ دەســـتپێکی کردەوەکە ئەوەی خەملاند کە وڵاتە یەکگرتووەکان پێویســـتە ســـاڵانە ٢٤ ملیۆن دۆلار بداتە کوردان، ئەوەش تەنیا بۆ مووچەی سـوپای بارزانی کە لە ٥٠،٠٠٠ کەس پێکهاتبوو.[٣٢٦]وێڕای ئاگادارییەکانی سـاندەرس،[٣٢٧]ئەوەبوو ڕیچارد هێلمزی بەڕێوبەری سی ئای

---

ئەوەشی بۆ زیادکردبوو بەهۆی بەردەستبوونی "سەرچاوەی دەرامەتی دارایی لە (لەوانەیە ئێران بێ)...، ئەوا لەسەر ئەمریکا پێویستە ڕاوێژ لەگەڵ وڵاتە هەرێمییەکان بکا، ئاخۆ دەکرێ ئەوان بەڕێگەی هەمەجۆر ئامادەی پشـتگیریین." لەوەش پتر، سـاندەریس لەوەش نیگەران بوو کە، خۆتێهەڵقورتاندنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکرێ لە لایەن سـۆڤیەتەوە وەک "جووڵەیەکی دژ بە سۆڤیەت" بزانرێ، " ئاخر لەم دواییانەدا سۆڤیەت هەوڵوتەقەللای بۆ ئەوە داوە بەڵکو کوردان قایل بکا بۆ حکومەتی یەکێتیی نیشـتمانی لە بەغدا ڕەگەڵ حزبی بەعس بکەون." هەروەها ئەو ئەوەشـی خسـتەڕوو کە خۆی لەگەڵ نێردەی کورد "لەگەڵ ئیدریس بارزانی کوڕی سـەرکردەی کورد و مەحمود عوسـمان" لەجیاتی کیسـنجەر دابنیشـێ، بۆ ئەوەی ئەو سەرنجە لای بارزانی پەیدا نەبێ کە کۆشکی سپی بە پرسەکەیانەوە پابەندە. لە دواییشدا ئەو ڕاوێژی ئەوەی دابوو "خۆ ئەگەر ئێمە بڕیارمان دا کۆمەکیان بکەین، ئەوا وای دادەنێم بەشێوەیەک بێ دەستی ئێمە لەپاشخان بێ و شاراوەبێ." بڕوانە:

rom Harold H. Saunders to Kissinger, Subject: Message from Shah on Kurds, June 7, 1972."

[325] United States Congress, House Select Committee on Intelligence, CIA: The Pike Report (Nottingham, England: Spokesman Books, 1977). pp. 196, 212.

[326] Waller to Helms, June 12, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4. 315).

[٣٢٧] **سـاندەرس لەوە نیگەران بوو کە ڕۆڵی ئەمریکا هەر بە ژێربەژێری نامێنێتەوە و لە بەرانبەریشـدا دەکرێ زیان بە باری دۆخی ئاسـایکردنەوەی لەگەڵ یەکێتیی کۆمارەکانی سۆشـیالیستی سـۆڤیەت بگەیەنێ، هەروەک پێشـتر چۆن زیان بە ناوبانگی کۆشـکی سـپی لە جیهانی عەرەبدا گەیاندووە. هەروەها ئەو بڕوای وابوو کە هەردوو لایان، چ ئێران و چ ئیسـرائیل پێشـتر یارمەتی پێداویسـتییە چارەنووسـسـازەکانی کوردیان داوە، کەواتە کۆمەکی ئەمریکا پێویسـتی نەدەکرد.** بڕوانە:

Saunders to Haig, June 23, 1972, (FRUS 1969–1976, e-4, 318).

ئەی و سـەرھەنگ ڕیچارد کەنەدی گەورە ئەندامی سـتافی ئەنجومەنی ئاسـایشـی نیشـتمانی لە ۳۰ حوزەیرانی ۱۹۷۲دا چاویان بە نێردەی کورد کورت. ھێلمز "ھاوسـۆزیی وڵاتە یەکگرتووەکانی بۆ بزووتنەوەی کورد" دەربڕی و "**ئامادەیی خۆی بۆ لەبەرچاوگرتنی پێداویسـتی ئەوان بۆ کۆمەککردن**" نیشـان دا، **ئەمە لە کاتێکدا کە پێی لەسـەر داپۆشـران و نھێنیبوونی ئۆپەراسـیۆنەکە داگرت.** ئەو ئاگاداریکردنەوە کە "پەیوەندییەکەمان دەشـێوێ ئەگەر ھاتوو ڕێزی نھێنیبوونەکەی نەگرن." لەوەش سـەرنجڕاکێشـتر، ھێلمز بە ڕوون و ئاشـکرایی پێیراگەیاندن، کە "لەبەرئەوەی شـا داوای لە حکومەتی ئەمریکا کردووە" تا یارمەتی پێشـمەرگەکانی بارزانی بدا، ھەر بۆیە ئەوان نابێ بیر لە بازدان بەسـەر تاراندا بکەنەوە و ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە کۆشـکی سـپییەوە بکەن.[328] لە کۆتایی دیدارەکەشـدا، ئەو داوای لە ئێران کرد کەناڵێک بۆ کۆمەکە سـەربازییەکانی ئەمریکا بدۆزێتەوە.[329] سـەرباری ھۆشـدارییە بەراییەکان، کەچی سی ئای ئەی دوای دیدارەکە لەگەڵ کوردان، مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو ئاخۆ پشـتگیری ئەمریکا بۆ ئۆپەراسـیۆنی کوردی لە لایەن ئەمریکا لە بەرانبەر ھەڕەشـەی سۆڤیەت و عێراق بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی خۆرئاوا ڕەوا بوو.[330] ھیچ گومانێکیش لەوەدا نەبوو کە لەبەرژەوەندی خۆماندا بوو،

---

[328] Randal, Jonathan, After Such Knowledge, What Forgiveness? My Encounters with Kurdistan (London: Westview Press, 1999). p. 153.

[329] CIA, "Washington Meetings with Kurdish Representatives," July 5, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.319), pp. 1–4; Memcon, July 5, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 319).

[330] سی ئای ئەی وەھای شرۆڤەکرد کە ھەر پشتگیرییەکەی بۆ کورد دەبێتە مایەی "ئەگەرێکی ـەتمی" خۆتێکەڵکردنی سۆڤیەت لە شەڕەکە کە وەک ھەڕەشـەیەکی "زۆر ھەستیاریشە" بۆ ئەنقەرە لـەبارەی ھەڵکشـانی ناسـیۆنالیزمی کوردی. لەپاڵ ئەوەشـدا، تەمەنی مەلا مسـتەفا و کورتھێنی لەبارەی سـەرکردەیەکی بەھێز و ھەروەھا دابەشبوون و لەیەکترازانی ڕەگوڕیشـەیی خێڵەکی و سیاسـی و کۆمەڵایەتی لەنێو کوردلندا، پشـتگیری ئەمریکا بۆ کوردان پلانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەشـی بنکۆڵ کرد لەوەی پەیوەندییە دیپلۆماسییەکان لەگەڵ بەغدادا ببوژێنێتەوە.

هاوپەیمانەکانمان و حکومەتە دۆستەکانی دیکەی ناوچەکەش ببینن کە ڕژێمی بەعس لە عێراق هاوسەنگی هێزی لاسەنگ ببێ و ئەگەر بشکرێ بڕووخێنرێ، خۆ ئەگەر ئەو شتە بەبێ زیادبوونی دەستڕۆیشتنی سۆڤیەتەوە لە عێراق، یان بەبێ پەرەسەندنی دوژمنایەتی بۆ خستنە ژێر مەترسی ئاستی نێودەوڵەتی بکرێ،" بەم جۆرە ڕاپۆرتەکە داکۆکینامەی بۆ پشتگیری کوردان بەرزکردەوە.[٣٣١] **لە کۆتاییدا زمانی جەنگی ساردی شا لە لایەن ئەمریکییەکانەوە گوێی لێگیرا.**

لەو نێوەشدا ١٥،٠٠٠ سەربازی ڕوسی لە میسر کشانەوە. ئەمەش گۆڕانێکی بنەڕەتی بوو لە تەداروکاتی هێز لە هەرێمەکەدا.[٣٣٢]بەهاتنی هاوینی ١٩٧٢، بەغدا بووە توخمێکی باش بۆ ستراتیژی ڕۆژهەلاتی ناوینی مۆسکۆ.[٣٣٣] ئەمەش بۆ شا گۆڕینێکی بنەڕەتی بوو لە ڕێسای یارییەکە، بەوەی کۆمەککردنی زیاتری کورد لە جاران زۆر گرنگتر بوو.[٣٣٤] هەروەک کیسنجەریش گێڕایەوە، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا "زۆر هاتیەوە بوو بۆ یارمەتیدانی کورد."[٣٣٥] کەواتە ئەو ستراتیژەی لێهەڵبژارد؛ "لاوازکردنی هەر

---

CIA, "Support for Barzani: A Preliminary Estimate," no date (FRUS/1964–68/XXI/doc.321, attachment C), pp. 12–13. pp. 1–18. 128White House, Memorandum, Haig to Kissinger, "Kurdish Problem," July 28, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.321), p. 9.

331 White House, Memorandum, Haig to Kissinger, "Kurdish Problem," July 28, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.321), p. 9.

332 Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 584.

٣٣٣ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

334 White House, Memorandum, Haig to Kissinger, "Kurdish Problem," July 28, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.321), p. 1.

335 Randal, Jonathan. After Such Knowledge, What Forgiveness? My Encounters with Kurdistan (London: Westview Press, 1999). p. 151.

وڵاتێک کە دەســـتی لەگەڵ یەکێتیی ســـۆڤیەت تێکەڵ کردبێ." لە ١ی ئابی ١٩٧٢دا جووڵە بە ئۆپەراسیۆنی کورد کرا.

**سێکوچکەی هاوکاری لە کوردستانی عێراقدا**

**بە ماوەیکی کەم دوای سەرکەوتنی نیکسن لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە ١٩٧٢دا، یەکەمین کۆمەکی دارایی و باری چەکوچۆڵی دەزگای ســـی ئای ئەی لە ڕێی ساواکەوە گەیشتە دەستی بارزانی.[٣٣٦]شاحوسێنی ئوردنیش لە کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ شـای ئێراندا، ڕەزامەند بوو بەوەی پشتیوانی کورد بەو چەکانە بکا کە "لە فیداییە فەلەستینییەکانی گرتبوو"، ئەوەی لە ماوەی هەرای ئەیلوولی ڕەشی ١٩٧٠دا دەستی بەسەرداگرتبوو. لە ڕێی ساواک و ســـی ئای ئەی و مۆســـادەوە ١٤ فرۆکەی باری لە فرۆکەخانەی میهرئاباد نیشـــتنەوە و لەوێ بارەکەی خۆیان دابەزاند و گەیاندندیانە دەســـتی پێشمەرگە.[٣٣٧]ئۆپەراسیۆنی کوردی لە لایەن سەرهەنگی ئێرانی عیسا پژمان و ژەنەڕاڵ مەنوچەهر هاشـمیی بەرپرســی هۆبەی هەشـتەمی ســاواک و ئارســەر کالاهانی بەرپرســی وێسـتگەی سـی ئای ئەی لە تاران و دایڤید کیمخی ئیســـرائیلی بەڕێوەبرا.**[٣٣٨] بە پێچەوانەی ســـی ئای ئەی، هەریەک لە

---

[336] White House, Memorandum, Haig to Kissinger, "Kurdish Problem," July 28, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.321), p. 1.

[٣٣٧] یەکەمی فرۆکەی باری بریتی بوو لە ١٠ تەن چەک و فیشەکی دەستکردی سۆڤیەت کە پێکهاتبوو لە ٥٠٠ کلاشینکۆف AK-47، ٥٠٠ ڕەشاشی ڕوسی و ٢٠٠.٠٠٠ فیشەک گەیشتە کوردستانی عێراق. بە کۆتایی مانگی ئۆکتۆبەریش ١٠٠،٥٦٦ کیلۆ لە چەک و تەقەمەنی لە جبەخانەکانی سی ئای ئەیەوە هەروەها ٦٤،٣٢٦کیلۆش لە ئێرانەوە . بڕوانە:

White House, Memorandum, Kissinger to the President, "Progress Report on the Kurdish Support Operations," October 5, 1972 (FRUS/1969–76/E-4/doc.325), p. 1–103. See also Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[338] James Schlesinger in an interview with William Burr, Washington, May 15, 1986, Tape 1A, FISOHC.

ساواک و مۆساد سەربازی هەمیشەیی و ئەفسەری پەیوەندیی هەواڵگرییان لە حاجی ئۆمەران هەبوون. ئەو دەستە ژمارە کەمە ئیسرائیلیەی لەوێ بوون بە دەگمەن بەشداری شەڕی قورس بوون و کاریان مەشقپێکردنی پێشمەرگە بوو.[٣٣٩] حزووری گەورەی سەربازی ئێرانی خۆی لە یەک بەتالیۆنی تۆپخانە و بەتالیۆنێکی هێزی دژە ئاسمانی و چەند کارهەڵسوڕێنەرێکی ساواک دەبینییەوە.[٣٤٠] ئەوکات ئێران بە تۆپخانەی دوورمەودا پاڵپشتی دەکردن. هەرچی بەلایەنی ئەمریکییەکانیشەوە بوو، ڕیچارد هێلمزی بەڕێوەبەری پێشووی سی ئای ئەی، تازە باڵوێزی ئەمریکا لە تاران بیچمێکی کلیلئاسای ئۆپەراسیۆنەکە بوو.[٣٤١] ڕوانینی ڕیچارد هێلمز بە ئەرکڕابوونەکەی وەک "ئەمریکی پلە یەک"[٣٤٢] و "باڵوێزی پلە هەرە باڵای" وڵاتە یەکگرتووەکان لە هەرێمەکەدا،[٣٤٣] بۆ ئۆپەراسیۆنی کوردی و کاروباری ئێران لە لایەن سی ئای ئەیەوە بێ ڕکابەر بوو، وەزارەتی کاروباری دەرەوەش هەوڵەکانی خۆی دووقات کردنەوە تا تێوەگلانی ئەمریکا لە کوردستانی عێراقدا بە نهێنی بهێڵێتەوە. کۆمەکی سی ئای ئەی بۆ دابەزاندنی باری فڕۆکەکانی لە فڕۆکەخانەی میهرئاباد و تاران بەردەوام

---

[٣٣٩] تاکە حاڵەتی ڕیزپەڕی سەرەکی شەڕی چیای هەندرێن بوو. بڕوانە :
Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 54; Yaacov Nimrodi was an Iraqi Jew who served as the Israeli Army's first military attaché in Tehran.

[340] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 54.

[٣٤١] هێلمز دۆستێکی دێرینی شا بوو، ئاخر بەیەکەوە لە سویسڕا خوێندبوویان. دانانی هۆلمز بە باڵوێزی ئەمریکا لە تاران باشترین گواستنەوەی کارگوزاری بوو بۆ سیاسەتی دەرەکی نادەوڵەتیانەی ئێران. شا ئەوی وەک "بەبایەخپێدانی بیژماری وڵاتەکەی" دەزانی.
CIA Station in Tehran to Helms, December 11, 1972, CIA-Helms.

[342] CIA Station in Tehran to Helms, January 11, 1973, CIA-Helms.

[343] Conversation, Nixon and Helms, January 25, 1973

بوو تا لە کۆتاییدا لە ڕێی ســـاواکەوە بگاتە دەســـتی کوردان.[٣٤٤] **کاتێکیش ئێران ڕاددەی کۆمەکی دارایی خۆی سالآنە بۆ ٣٠ملیۆن دۆلار بەرزکردەوە، ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش پشـتگیرییە سـالآنەکەی خۆی لە ٣ ملیۆن دۆلار گەیاندە ٥ ملیۆن. هەروەها ئیسـرائیلیش بڕی ٥٠،٠٠٠ دۆلار موچەی مانگیانەیان دایە بارزانی.** ئەم کۆمەکە بەخشـــرایە بارزانی تا وای لێبکا دەســـت بە "حاڵەتی بەرگرییەوە" بگرێ و ئۆپەراســـیۆنەکەش بە نهێنی بهێڵێتەوە. کیســـنجەر وەها لێدوانی دا ؛ "حەزمان لێیە... لەو ســـەرنجە دووربکەوینەوە کە پابەندی پەرەســـەندوومان درێژخایەن بێ بەوەی بە بارزانی ڕابگەیەنین کە بەخشـینی پارەی ئەم سـاڵ لەسـەر بنەمای مانگانە دەبێ، بەڵام لەهەر پێشهاتێکدا جەخت لەوە دەکرێتەوە کە ئێمە ڕوانینی شا لەبەرچاودەگرین و دەیپارێزین کە حاڵەتی بەرگری کوردانە."[٣٤٥] بە هـاتنی سەرەتای ساڵی ١٩٧٣ش، هەموو ڕێگاکان دەچووونەوە سەر تاران.

مایەی ســەرنجدانە لە لایەن شــا و ســی ئای ئەیەوە باز بەســەر وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکادا درا. ئاخر لە دیســـێمبەری ١٩٧٢دا هۆبەی هەڵســـووڕاندنی کاروباری ئەمریکا لە بەغدا کرایەوە، کەچی بەرپرســـی هۆبەکە، کە ئارســـەر لاوری بوو ئاگای لە هاوکاری ژێربەژێری ســـاواک-ســی ئای ئەی-مۆســـاد نەبوو. [٣٤٦]ســـەرانی بەغداش ئاگایان لە پشـتگیریی

[344] Kissinger to Nixon, March 29, 1973, (FRUS 1969–1976, XXVII, 207).

[345] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999), p. 385.

[٣٤٦] لە بەرایی مانگی دیسێمبەردا، لاوری هیچی لەبارەی ئۆپەرانسیۆنە ژێربەژێرییەکەی سی ئای ئەی نەدەزانی، لەبری ئەوە چارەســەرکردنی کێشــەی باکووری عێراقی بەرز دەنرخاند وەک ئەوەی؛ "هیچ کام لە لایەنەکان نایانەوێ شـــەڕی مەودادرێژ هەڵبگیرســـێننەوە، لێ متمانەیەکی تەواو نییە بۆ ئەوەی هەنگاوی جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەکە بهاوێژرێ". بڕوانە : See Baghdad A-6 to U.S. Department of State, December 1, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, p. 328).

ئێرانی و ئیسـرائیلی و ئوردەنییەکانەوە هەبوو بۆ کورد؛[٣٤٧] کەچی هیچیان لەبارەی تێوەگلانی سـی ئای ئەیەوە نەدەزانی. براوەی ڕاستەقینەش هەر شا بوو. ئەو سەرکەوتوانە توانی بارزانی لە حکوومەتی یەکێتیی نیشتمانی دووربخاتەوە و ڕێگریش لە بەغدا بکا هێزی سەربازی خۆی بۆ ئەروەند ڕود بگوازێتەوە و جێگیری بکا. بە فرۆشتنی بڕی قەبە قەبەی چەک و تفاقی ئەمریکی بۆ ئێران، شا مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو کە عێراق زیاتر ڕوو لە یەکێتیی سۆڤیەت دەکات و ئەوەش سەردەکێشی بۆ کێبڕکێی چەکسازیی جەنگی سارد لە هەرێمەکەدا، ئەم ڕەوشەش وادەکا بەغدا وەک دەوڵەتێکی پاشکۆی سۆڤیەت نیشان بدا، هەر بۆیە ڕەوایەتی بە سیاسەتەکەی ئەو، سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە کوردستانی عێراق دەدا.

### دوودڵیی شا

لە ناوەڕاستی ئۆپەراسیۆنی کوردیدا، گۆبەندی واتەرگێیت لەبارەی پشتگیری کورداندا تۆوی گومانی لە مێشکی شادا چاند. ئەو وای بۆچوو لەوانەیە ئەم گۆبەندە وا لە کۆشکی سپی بکا چیدی پشتی شا لەبارەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە کوردستانی عێراقدا نەگرێ. بە ڕوانینێکی نێودەوڵەتییانەی بەرفرەوانتریش، ئەو لەبارەی توانستی وڵاتە یەکگرتووەکان نیگەران بوو لەوەی نەتوانێ لەنێو جەرگەی کشانەوەیان لە ڤێتنامدا، مۆسکۆ بەرزەفت بکا. ئەوەی ڕاستی بێ گۆبەندی واتەرگێیت "بۆ هەمووان بەدبەختی بوو."[٣٤٨] ئیدی لەو کەشوهەوایەدابوو شا خەریکی تاقیکردنەوەی چارەسەری دیپلۆماسییانە بوو لەگەڵ عێراق. ئەو پشتگیرییە پەککخەرانەی (شا)ش بۆ بارزانی قەناعەتی بایەخی دۆخ خاوکردنەوەی بە

[347] Baghdad 92 to U.S. Department of State, December 19, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, p. 329).

[348] Helms to Kissinger, July 7, 1973 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–8.

بەغدا هێنابوو.[349] لەسۆنگەی باسکئەستووری ئێران لە هاوکێشەی هێزدا، ئیدی بەعس ڕێزی توانای سەربازیی شایان لەبەرچاوبوو، بۆیە لە شالاوی ڕووبەڕوونەوە، کە ئەگەری هەبوو بەبەرفرەوانی ڕووبدا، پەشیمان بوونەوە. تەنانەت هەر بۆ ناویش دارسانە شا هێشتا وریایی و خۆپارێزی لەبەرچاو بوو.[350] ئەوەبوو وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران، عەباس عەلی خەلعەتبەری لە نیسانی ١٩٧٣دا لە جنێڤ چاوی بە هاوتا عێراقییەکەی کەوت؛ کەچی هەر زوو کاتێ بەغدا بە توندی داواکانی ئێرانی لەبارەی ڕێڕەوی ئاوی یەکاوی عەرەب ڕەتکردەوە، گفتوگۆکان وەستان.[351]شا زانی عێراق بە هێڵی تالوکی یەکاوی عەرەب قایل نابێ تا پێشوەختە ئێران پشتیوانی و کۆمەکی خۆی لەسەر کورد نەبڕێ. لەپاڵ ئەوەشدا، ئەوەشی زانی کە بارزانی بۆ هەمیشە خۆی ناگرێ. هەرچەندە "گەمەی قورسی شا لەساتەوەختی" جنێڤدا هیچ ئەنجامێکی یەکلاکەرەوەی لی بەرهەم نەهات،[352] لی کۆبوونەوەکە بۆ یەکەمین جار ئامانجە سەرەکییەکەی ئەوی هێنایە پێشەوە: "***واز لە کورد بێنە، ئەروەند ڕود ببە.***"

لە سەرێکی دیکەوە، گفتوگۆی جنێڤ کوردی دڵگران کرد. بارزانی دوای دزەپێکردنی گفتوگۆکان لەسەر زاری دوو دیپلۆماتی سۆڤیەتی[353]، چووە تاران تا ڕوانینی شا بزانێ. بارزانی ئەگەری چوونەڕیزی کوردانی بۆ نێو

349 Baghdad 266 to U.S. Department of State, May 17, 1973, (NPM, NSCF, CFME, Box 603).

350 National Intelligence Estimate 36-2-72, December 21, 1972, (FRUS 1969–1976, E-4, 330); and CIA, NIE 36.2–72, "Iraq's Role in Middle Eastern Problems," December 21, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.330), pp. 1–14.

351 CIA Station in Tehran to Helms, January 11, 1973, CIA-Helms.

352 Tehran 3974 to U.S. Department of State, June 9, 1973, RG59, SNF 1970–73, Box 2380.

٣٥٣ یاداشتێک، [دەهێنراو] بۆ ریچارد هێلمز، "یاداشتەکەت ئەوەی لێدوانەکەی شا لەبارەی نیگەرانی بارزانی گەیەنراوە." June 11, 1973 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–6; and Helms to [excised], June 9, 1973 (CIA/FOIA/Helms), p. 1.

حکوومەتی یەکێتیی نیشتمانی هێنایە پێشەوە. وەڵامی شاش کورتر و بەڵام گردەبڕانە بوو: "**ئەگەر دەتەوێ خۆبکوژی، بیکە!**"[354] شـــا لەجیاتی ئەمە، ئەوەی خســـتە بەردەم بـارزانی کە، **داوا لە بەغـدا بکـا وەک مەرجێکی پێشوەختە بۆ چوونە نێو حکوومەتی بەعس و حیزبی شیوعیی عێراقی ئەوا پێویسـتە هەڵبژاردنێکی ئازاد بکا، ئاخر ئەم داوایە هەم فشـارەکانی مۆسکۆ لەســـەر کورد کەم دەکاتەوە و هەم ســـەرکردە عێراقییەکانیش دەڕەنجێنێ، چونکە لە توانـایـدا نییە هەڵبژاردنی ئـازاد بکەن.**[355]بـارزانی لەبـارەی نیگەرانییەکانی ســـەبارەت بە پابەندییەکانی ئەمریکا داوای لە شـــا کرد "بە ناوی ئێمەش قســـە لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هەر شـــوێنێکی دیکە بکە، کە تۆ بە پێویســـتی دەزانی و ئێمەش ئامادەین پابەندییەکانی ســـەرشـــانی خۆمان قبووڵ بکەین لەگەڵ ئەو ڕێگایەی تۆی خاوەنشـــکۆ پێتوایە دەبێ پـابەنـدییەکـان پەیڕەوبکەین."[356] هەروەهـا ئەو لەبـارەی "پشتگیری مەعنەوی ئەمریکاش" داوای لە شا کرد بەڵکو ببێتە دەستەبەری "تێگەیشتنی تەواوی ئەمریکییەکان لە پرسەکە و پشتگیرییان" بۆ پێشمەرگە. (شـــا)ش بە متمـانەوە بەرســـڤی دایەوە: "ئێمە ئەوە دەســـتەبەر دەکەین."[357]بارزانی بە ئاگاداربوون لە ئەگەری ناپاکیی شا بەوەی ئەوان لە بەرانبەر عێراقدا بە ڕێڕەوە ئاوییەکەی ئەروەند ڕود بفرۆشێ، بۆیە هەوڵیدا پارە و چەکی زیاتر بەدەســـتبێنێ، ئەمەش بە گەفکردن لە هاوپەیمانەکان بەوەی دەچێتە ڕیزی بەغدا. لە دیداری مەحمود عوســـمان و مەســـعود بـارزانی لەگەڵ ڕیچـارد هێلمزدا داوایـان لە ئەمریکـا و ئێران کرد بەڵکو بە

---

354 Helms to CIA Offal, June 9, 1973, and CIA Official to Helms, June 11, 1973, CIA-Helms.

355 Helms to Kissinger, August 25, 1973 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–2.

356 Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 115–116.

357 Helms to Kissinger, August 25, 1973 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–2.

چەکی قورس پشتیوانیان بکەن، ئاخر دەکرێ بەو زووانە بە "گازی ژاراوی" هێرشیان بکاتە سەر.[358] هێلمزیش لە ٢٣ی تەمموزی ١٩٧٣دا وەک ڕاوێژێک بۆ هێنری کیسنجەری نووسی، **بەڵکو پارەی مانگانە بەبڕێکی کەم زیادبکرێ و لە بەرانبەریشدا چەک و تفاقی هێرشکردنیان نەدرێتێ.** کیسنجەریش بەمە قایل بوو و نووسیەوە، " با ئەوان [کورد] بڕە پارەیەکی دەربەستیان لەدەست بێ تا وەک درک لە چاوی حکومەتی عێراقیدا بمێننەوە."[359] ئەمەش بۆ بارزانی ڕێککەوتنێکی سوودبەخش بوو.

سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە کوردستانی عێراقدا کەلێنی جیاوازیی لەنێو گەورە سیاسەتداڕێژەرانی پێواژۆی سیاسەتی دەرەکی وڵاتە یەکگرتووەکاندا بەرفرەوان کرد. سی ئای ئەی، هێلمز، کیسنجەر و نیکسن وێناکردنەکەی شایان بۆ شەڕی کوردی وەک گۆڕەپانی جەنگی سارد پەسەند بوو، هەربۆیە پشتگیری بەرچاو بۆ کورد بۆ ئەوەی عێراق وەک "دەوڵەتێکی پاشکۆی یەکێتیی سۆڤیەت" بەرزەفت بکرێ.[360] بە پێچەوانەشەوە وەزارەتی کاروباری دەرەوە شتەکەی بە "پێشبینییەک کە خۆی بەدیدێنێ" وێناکرد.[361] لوری لەو لێکدانەوەی مانگی تەمموز بۆ ڕەوشەکە، داکۆکی لەوە کرد بەڵکو کۆشکی سپی "یەخەی خۆی لە کۆڵ قەیرانی کوردی بکاتەوە. ئەو مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو "لە هەر سازشێکی بەعس بۆ ئێران ئەوا کۆتایی بە بەرگریی کوردی دێ،" پێشی لەسەر ئەوە داگرت کە هەر چارەسەرییەک لەنێوان کورد و بەغدا دا دەکرێ خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا بکا، ئاخر بە نەمانی شەڕی

358 See CIA Station in Tehran to Helms, December 11, 1972, CIA-Helms.

359 ehran 4475 to U.S. Department of State, June 25, 1973, (FRUS 1969–1976, XXVII, 218).

360 Tehran 4475 to U.S. Department of State, June 25, 1973, (FRUS 1969–1976, XXVII, 218).

361 Baghdad 379 to U.S. Department of State, "Iraqi-Soviet Ties," July 1, 1973 (NARA/ AAD/RG59/CFPF/ET/1973), pp. 1–2.-150.

کورد پشتبەستنی عێراق بە بە مۆسکۆوە نامێنێ."[362] ڕوانینی (لوری) بۆ هەوڵوتەقەڵای سەرکردەکانی بەعس بۆ "نمایشی سەربەخۆیی" لە بەرانبەر سۆڤیەتدا، بە سیاسەتی نوێی عێراقییەوە پشتبەستوو بوو.[363] بەغدا لە ئازاری ١٩٧٣دا لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی خۆرئاوا گەیشتە ڕێککەوتننامەیەکی بێ پێشینە.[364] دوای لەبارچوونی کودەتای ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٧٣ کە بەسەرۆکایەتی نازم گزاری بەڕێوەبەری ئیستخبارات بوو، سەددام حوسێن لێدوانی دا کە "عێراق پێشوازی جووڵەکانی ئەمریکا و بریتانیا دەکا، کە بۆ ئاسایکردنەوەی پەیوەندییەکان سەربکێشێ"[365] لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەر بەدوای ڕوانینی شا کەوتبوو.

ئۆپەراسیۆنە ژێربەژێرەکەی ساواک و سی ئای ئەی و مۆساد لە کوردستانی عێراق لەگەڵ سەردانەکەی شا بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ٢٤ی تەمموزی ١٩٧٣دا گەیشتە ئەوپەڕی لووتکەی خۆی، ئەو لەوێ لە ئۆڤال ئۆفیس چاوی بە نیکسن کەوت و نیازی ئێرانی بۆ ڕێگرتن لە "هاوپەیمانێتی حزبی بەعس و کورد و شیوعییەکان پێڕاگەیاند." نیکسنیش بە قەناعەتهێنان بە لێکدانەوەکانی شا لەگەڵ "سیاسەتی هاوکاری تەواو"[366] کۆک بوو. ڕۆژێک پاشتر، لە کۆبونەوەی ئەو لەگەڵ کیسنجەر و هێلمزدا داوای پشتگیری زیاتری بۆ کورد کرد. **لەکاتێکدا شا ناکۆکبوونی**

[362] Baghdad 379 to U.S. Department of State, "Iraqi-Soviet Ties," July 1, 1973 (NARA/ AAD/RG59/CFPF/ET/1973), pp. 1–2.-150.

[363] Baghdad 202 to U.S. Department of State, March 3, 1973, (FRUS 1969–1976, XXVII, 212).

[364] Eliot to Kissinger, March 3, 1973, (FRUS 1969, XXVII, 203).

[365] U.S. Department of State 140,125 to U.S. Interests Section Baghdad, "Press Interview with Saddam Hussein," July 17, 1973 (NARA/AAD /RG59/CFPF/ ET/1973), pp. 1–2.

[366] Memorandum from Kissinger for the President's File, undated, (FRUS 1969–1976, XXVII, 28).

**خۆی بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ دەربڕی، لێ هێڵی بەژێر ئەوەشدا هێنا کە بڵێ کورد "تاکە دەسکی کردنەوەی دەرگای حکوومەتی عێراقن بۆ وڵاتە یەککرتوومکان و بۆ ئێران". ئەو کوردی بە کارتێکی براوە چوواند کە هەق نییە [ئێران و ئەمریکا] لەدەستی بدەن"،** ئەوەشی بۆ کیسنجەر دووپاتکردەوە کە کورد پێشتر "ئامادەیی خۆیان دەربڕیوە بەوەی هیچ هەنگاوێک بەبێ ڕەزامەندی (بەڵێ)ی ئەوان نەهاوێژن".[٣٦٧] لە کۆبوونەوەی دوای ئەودا، شا کیسنجەری لەوە ئاگادارکردەوە کە بە بارزانی گوتووە "بەهیچ شێوەیەکی بەشداری حکوومەتی هاوپەیمانی بەغدا نەکا. من پێمگوتن چیدیکە پێشوازی لە نوێنەرانی سۆڤیەت یان نوێنەرانی بەعس لە بەغداوە نەکەن. لێ ئەگەر ئێمە ئەو شتانەیان لێ داوابکەین، خۆ هەر دەبێ برە پارەیەکی زیاتریان بدەینی".[٣٦٨] لەپاڵ ئەمەشدا، شا زانی کە کیسنجەر و سی ئای ئەی ئاگاداری ئەو گفتوگۆ نهێنییانەن لەگەڵ بەغدا، ئەوانەی لە جنێڤ سازدران. شا لەپێناو کەمکردنەوەی ئەگەری ڕێککەوتن لەگەڵ بەغدادا، دانیشتنەکانی جنێڤی بە جوولەیەکی عێراقی بەنیازی "کات بەدەستهێنان" وێناکرد، گوایە ئەویش بە شتێکی لاوازی دەزانی.[٣٦٩] هەر بە ماوەیەکی کەم دوای گەڕانەوەی شا بۆ تاران، کیسنجەر ڕێنمایی بۆ سی ئای ئەی دەرکرد بەڵکو "چەک لە جبەخانەیەک بۆ حاڵەتی پێویست دابکەن" **بۆ شەڕی داهاتووی کورد و کۆمەکە داراییە مانگانەکەش بەڕێژەی ٥٠٪ زیاتر بکەن".[٣٧٠] لە هەمان کاتیشدا شای ئێران بڕی کۆمەکە داراییە ساڵانەکەی بۆ بارزانی "هەندێک پتر" لە ڕێژەی ٥٠٪ زیاتر کرد و گەیاندییە**

---

[٣٦٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[368] Memcon, July 27, 1973, (FRUS 1969–1976, XXVII, 30).

[٣٦٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[370] Kissinger to Helms, August 16, 1973, (FRUS 1969–1976, XXVII, 229); Helms to Kissinger, August 17, 1973 (CIA/FOIA/Helms), p. 1. Kissinger responded to Helms' cable in WH 31939.

**۳۰ ملیۆن دۆلار.[۳۷۱] شا هەم 'سەرسام و هەم دڵگەرم' بوو ئەو پشتیوانییە بۆ سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران و بە پشتیوانییەکی 'هێمادار'ی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەقەڵەم دا.[۳۷۲]**

## شەڕی ئۆکتۆبەر هەڵکشانی هەڕەشەی عێراقی

لە ٦ی ئۆکتۆبەری ۱۹۷۳دا، میسر و سوریا هێرشێکی کتوپڕی بەیەکەوەیان کردە سەر پێگە داگیرکراوەکانی ئیسرائیل لە نیمچە دوورگەی سینا و بەرزاییەکانی جۆلان. **ئیسرائیلییەکان لەناوجەرگەی شکستەکانیان لەبەرەی جەنگەوە، فشاریان خستەسەر بارزانی، بەڵکو ئەویش لە باکووری عێراقدا هێرش بەرێتە سەر سوپای عێراقی تا بەغدا بەری ئەوەی نەبێ ڕووبکاتە شەڕی عەرەب-ئیسرائیل. بارزانیش بە کیسنجەری ڕاگەیاند کە 'ئیسرائیلییەکان پێشنیازی ئەوە دەکەن، هەوڵبدەین لەو سەرقاڵییەی جەنگدا شوێنی دیکەی کوردستان بگرین. ئەوان بەڵێنیان دابوو کە لەگەڵ ئێران لەوە دەکۆڵنەوە بەچەک و تفاق یارمەتیمان بدەن. ئاخر نە هیچ هێزێک لە ناوچەکانی ئێمە کشاونەتەوە و ئێمەش ئەو جۆرە چەکەی پەلاماردەرمان نییە. ئێمە دەمانەوێ لەو بارەوە ڕای ئێوە بزانین.'[۳۷۳] لەگەڵ ئەوەی کیسنجەر لە ئەو پلانەی ئیسرائیلییەکان دڵنیا نەبوو[۳۷٤]، داوای لە هێلمز کرد شا ئاگاداربکاتەوە.**

---

[371] Helms to Kissinger, August 25, 1973 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–2; Kissinger, Years of Renewal, p. 585.

[372] Helms to Kissinger, August 25, 1973, (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–2.

[373] [excised] to Director, October 15, 1973 (CIA/FOIA/Helms), p. 1.

[۳۷٤] کیسنجەر دەگێڕێتەوە: **'کورد ژمارەکی زۆر کەمی لە چەکی قورس لەبەردەستدا بوو؛ لەو جۆرە تۆپخانەیە کە ئێرانییەکان هەڵیاندەسوڕاند زاتیان نەکردبوو لەسەر سنووری ئێران دووربکەونەوە. کورد دەیتوانی بەرگری لە نیشتمانە شاخاوییەکەیان بکەن ئاخر تانک و فڕۆکەی عێراقی بەزەحمەت پێیدەکرا لەوێ کردەی خۆی بکا. لێ هێزی چەکداری بە چەکی سووک نەیدەتوانی لە پێدەشت و بانەکانی دوور لە چەپەرەکانیان لەدژی سوپای عێراقی**

**شا بە توندی دژی ئەو پێشنیازە بوو، بە 'خۆکوشتن'ی لەقەڵەم دا.**[٣٧٥] ئاخر دەیزانی کورد لە چەکی قورسی پەلاماردەری کەمە، ئەو مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو، هەر هێرشێکی پێشمەرگە بە نسکۆیەکی کارەساتبار کۆتاییپێدێ. ئەو کۆک نەبوو لەسەر ئەوەی کورد لە پێناوی ئاسایشی ئیسرائیلییەکان لەناوببرێن، لێدوانی دا بەوەی؛ "نامەوێ کورد ببنە بریگرتەی ئیســـرائیل و ئەمریکا."[٣٧٦]هێلمزی باڵوێزی ئەمریکاش لەگەڵ شا هاوڕا بوو و کیسنجەری ئاگادارکردەوە لەوەی "**ئەگەر بە شـــێوەیەکی ســـەربازییانە ســـەری کورد پانبکرێتەوە ئەوا کارتی کوردی لەدەســـت شـــا دەردەچێ و ئەویش ئەمەی ناوێ.**"[٣٧٧]بە ڕاوێژی شا، کیسنجەر "وای دانا شتێکی ئاوەزمەندانە نییە کورد بە تەکتیکە تـایبەتییەکەی ئیســـرائیل ببەســـترێتەوە و بەهۆیە تووڕەیی دەوڵەتانی عەرەب لە کورد کە هەرخۆیان پێشـــتر تووڕە بووبوون، زیاتر ببێ"[٣٧٨] و ئینجا فەرمانی بە بارزانی کرد پێشـــنیازی ئیســـرائیلییەکان ڕەتبکاتەوە.[٣٧٩] **شـــا جارێکی دیکە ڕۆڵی جڵەوگیرانەی خۆی وەک بزوێنەری سیاسیانەی ڕۆژهەڵاتی ناویندا نیشاندایەوە.**

---

**پرچەک بە چەکی پێشـکەوتووی سـۆڤیەتی بجەنگن، کە بە سـەدان تانکی هەبوو. هێرشـێک بەدەر لە مەیدانی ســـەنگەرەکانیان واتای لەناوبردنی تەواوی هێزی چەکداری کوردی دەگەیاند.**

"Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 586–7.

375 Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 586–7.

376 Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 222.

377 Helms to Kissinger, October 16, 1973, NSA, KSWWOF, Box 19, GRFL.

378 Kissinger, Years of Renewal, (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 587.

379 White House, WH32507 to U.S. Embassy Tehran, October 3, 1973 (CIA/FOIA/ Helms), p. 1.

ســـــەرباری ئەو قســـــەیەی خۆی گوایە ئێران دەتوانێ "لە ماوەی چەند سـەعاتێکدا عێراق تێکبشـکێنێ"،[٣٨٠] کەچی شـا لە دەسـەڵاتە هەڵکشـاوەکەی سـەددام حوسـێن نیگەران بوو. دوای ئەوەی سـەددام قەناعەتی بە حیزبی شـــیوعیی عێراقی هێنا بچنە ڕیزی حکوومەتی یەکگرتوو، ئەوەبوو چەک و تفاقی جەنگی قورســـی لە ڕوســـیاوە دابینکرد.[٣٨١] جەنگی ئۆکتۆبەری ١٩٧٣ عێراقیەکـانی بەهێزتر کرد. بە ئـاگادارنەبوون لەو هێرشـــە لەنـاکاوەی هـاوپەیمـانی لە قـاهیرە، دیمەشـــق ، مۆســـکۆ[٣٨٢] کردیـان، کەچی بەغـدا ڕەتیکردەوە بەشـــداری ئابڵوقەی نەوتناردنی عەرەبی بکا، ئاخر فرۆشـــتنی نەوت داهـاتی بە دۆلار بۆ بەغـدا بوو. ئەوە لەبەر ئەو بەرڕەوتەدا بوو کیســـنجەر بەغدای لەکاتی ســـەردانەکەی بۆ تاران لە نۆڤێمبەری ١٩٧٣دا و بە "نۆکەری سـۆڤیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـتدا" وێناکرد. ئەو ئەوەی گوت کە "حکومەتی بەعس لەژێر جڵەوی ســـــەددام حوســـێندا بەردەوام پارەی داوەتە ڕێکخراوە تیرۆرســـــتەکان... و هەر ئەویش هێزی پاڵنەری بەرەی ڕەتکەرەوەی بایکۆتکردنی دەستپێشـخەرییەکانی ئاشـتی عەرەب-ئیسـرائیل بووە... و پێویســـتە ڕەوتی شــلۆقکردنی ئەو کەســـە برەوی پێبدرێ."[٣٨٣] لە

[380] The U.S. Department of State 118,336 to Tehran, (FRUS 1969–1976, XXVII,59); Tehran 2166 to the U.S. Department of State, (FRUS 1969–1976, XXVII, 39).

[٣٨١] پێکهاتبوو لە ٢٠٠ هەلیکۆپتەر و ١٤ فڕۆکەی بۆمبهاوێژی
14TU 22 Alam, ssadollah. Yad'dashtha- ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 213; Baghdad 513 to the U.S. Department of State, "Iraqi-Indian Relations," September 23, 1973 NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1973), p. 1.

[382] Baghdad 596 to U.S. Department of State, "Post War Assessment of Iraq and Policy Recommendations," November 4, 1973 (NARA/AAD/ RG59/ CFPF/ ET/1973), pp. 1–3.

[383] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 385.

ئەمریکا و بە درەنگانێکی ساڵی ١٩٧٣ پابەندبوون بە پاشایەتی پەهلەوی باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشابوو.

**٢ -بەرزەخ" شیعەی لوبنان**

*ئیبراهیم یەزدی گوتی: "**مەنسور قەدەر چاوەڕێی ئەوەی دەکرد سەدر بەدوای کەوی، بەلام سەدر شکۆی خۆی هەبوو. ڕەتیکردەوە وەها بکا.**"*[٣٨٤]

*سەدر بە ئیحسان نەراقی گوت: "**من داوام لە شا کرد بەڵکو نەخۆشخانەیەک بۆ شیعە دروست بکا. ئینجا ئێمە دەتوانین زانکۆیەکیشیان بۆ دروست بکەین. شاش ڕەزامەند بوو، بەلام مەنسور قەدەر هەولی دا شا ساردبکاتەوە.**"*[٣٨٥]

**شەڕی شەش ڕۆژە و کزبوونی ناسریزم**

ئیسرائیل لە ٥ی حوزەیرانی ١٩٦٧دا لەشکرەکانی عەرەبی تێکشکاند. قەبارەی سەرکەوتنە ڕووخێنەرەکەی ئیسرائیل بەو تەردەستییە خێرایەی دەستبەسەرداگرتنی ناوچەیەکی بەرفرەوان لە خاکی عەرەب، شکۆ و نمایشی ناسریزمی تێکشکاند. نسکۆی ١٩٦٧ ناسری هێنایە سەر ئەو بڕوایەی ستراتیژی خۆی هەڵبسەنگێنێتەوە و بەدوای باڵادەستێتی هەرێمیدا بگەڕێ، بەوەی بەلای یەکێتیی سۆڤیەتدا بیشکێنێتەوە و دابڕسێتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئێران.[٣٨٦] بەرەبەرە سەهۆڵبەندانی پەیوەندییەکانی

---

[384] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

[385] Naraghi's interview with Khabar-Online, 2 May 2011.

[٣٨٦] بە ناوبژیی کوێتییەکان ناسر هەوڵیدا گرژییەکانی لە گەڵ شای ئێراندا خاوبکاتەوە. شا بەو ئاگاییە لە دۆخی شپرزەیی ناسر تێکەوتبوو، داوای لە قاهیرە کرد بە فەرمی داوای لێبوردن لە ئێران بکا لەسەر ئەو پرکێشییەی پێشتری دژی تاران، ئەمەشی وەک مەرجێکی پێشوەختی نۆژەنکردنەوەی پەیوەندییە دیپلۆماسییەکان لەگەڵ میسر هێنایە کایە. ناسریش بەدەر لە پەژراندنی مەرجەکە هیچ بژاردەیەکی دیکەی لەدەستدا نەمابووەوە. ئەوەبوو

نێوانیان دەتوایەوە. هەر مانگێک لەپاش ئاســـایکردنەوەی پەیوەندییەکانی قاهیرە لەگەڵ تاراندا، جەمال عەبدولناســـر مرد و چیدی شـــای ئێرانیش لە لایەن میملە سـەرەکییەکەی لە هەرێمەکەدا گەف و هەڕەشـەرەی لێنەکرا.[٣٨٧] ئەوەش دوا بزمار بوو لە تابوتی ناسریزم درا.

بە نســـکۆی ١٩٦٧، هەســـتوســـۆزی پان عەرەبیزم زەبرێکی کوشـــندەی بەرکەوت، هەڕەشـــەی میســـریش تـــا دەهـات کەم دەبووەوە. ئەمەش ساتەوەختی خاڵی وەرچەرخانی بوو بۆ سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لەسەر کەناراوی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاستدا. بە کورتهێنی قاهیرە لە ڕووی هێز بەوەی ببێتە هەڕەشـــەیەک بۆ ســـەر ئاســـایشـــی نەتەوەیی ئێران و پێویستی بەرزەفتکردنی میسـر و ئینجا پێویسـتی ئێران بە شـــیعەی لوبنان لەبەین نەما. لەپاڵ ئەوەشـــدا چوار هۆکار ئێرانیان ناچارکرد ســـیاســـەتی دەرەکی ناوەدوڵەتیانەی لە لوبنان وەربچەرخێنێ: پەیوەندییەکانی ســـەدر بە جەنگاوەرە فەلەستینییەکان، پەیوەندییەکانی ئەو لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی، پەیوەندی ئەو لەگەڵ هێزودەسەڵاتی عەرەب لە هەرێمەکەدا و لە کۆتـاییشـــدا گرژیی ئەو لەگەڵ بـاڵوێزخـانەی ئێران لە

سالێک بەر لە مردنی، باڵوێزی میسر لە بەلگرادو، سربیا قسەی لەگەڵ باڵویزی ئێران کرد و مەیلی قاهیرەی بۆ سـەرلەنوێ دەسـتپێکردنەوەی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکان نیشـان دا. ئینجا میســـر یەکەمین هەنگاوی بەرەو گرێدانەوەی پەیوەندییەکانی هاویشـــت، کاتێک لە ئابی ١٩٧٠دا ڕەزامەند بوو لەســـەر بەیاننامەیەکی هـاوبەش بە دەســـتپێکردنەوەی تەواوی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانیان. سـەهۆڵبەندانی پەیوەندییەکانیان لەکاتی سـەردانکردنی هوەیدای سـەرۆوەزیری ئێران بۆ قاهیرە و بەشدارکردنی لە ڕێورەسمی بەخاکسپاردنی عەبدولناسـردا بەتەواوی توایەوە.

Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History; Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 32.

387 Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. I: 1347–1348/1968–1969 (Bethesda, MD: Iranbook, 1993). p. 125.

بەیروت. لەگەڵ ئەوەشـــدا هێشـــتا بەجەماوەربوونی ســـەدر لە کۆتایی شەستەکاندا هەر وەک خۆی لە برەودا مابووەوە.

## ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامیی شیعە

ســـەدر لە نیســـانی ١٩٦٦دا نەخشـــەی پێکهێنانی دەزگایەکی بە ناوی ئەنجوومەنی باڵای ئیســـلامی شـیعە (المجلس الاسـلامي الشـيعية العليا) بۆ "یەکخستنی هەموو شیعەکان" لە دژی نادادیی کۆمەڵایەتی و پەراوێزخستنی سیاسی و ئابووری و بۆ تێکۆشان بۆ "بەدیهێنانی مافەکانیان" پێکهێنا.[٢٨٨] لە ١٥ی ئابی ١٩٦٦دا داوای لە بەیروت کرد پرۆژەکەی پەســـەند بکرێ. لە کۆتاییدا نەخشـــەکە لە لایەن ســـەرۆک شـــارل حلو لە ١٩٦٧دا مۆرکرا. لە ٢٩ی ئایاری ١٩٦٩دا ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە بە فەرمی دامەزرا و ســـەدریش بە ســـەرۆکی دانرا، بەمە بەســـەر ڕکابەرە نەیارەکەی کەمال ئەلئەســـعەد (کەمـال بـای)دا زاڵ بوو.[٢٨٩]دامەزراندنی ئەنجوومەنی بـاڵای ئیســـلامی شـــیعە گەورەترین دەســـتکەوتی دیاری ســـەدر بوو، بە هۆیە دەزگایەکی ســـەربەخۆی لە بەرانبەر ســـوننی زۆرینەدا دامەزراند، ئیدی ڕەوایەتی بە کۆمەڵگەی شـیعە بەخشـی. ئەمەش لەوێ خاڵی وەرچەرخانی بەرجەستەبوونی ناسنامەی شیعە بوو.

هەر زوو ئەنجوومەنی باڵای ئیسـلامی شـیعە داوای پشـتگیری سیاسـی و ئـابووری لە بەیروت کرد، بە پـارێزگـاریکردن لە بـاشـــوور، پەرەپێدانی ناوچەی شـــیعە و زیادکردنی پلەوپایەی شـــیعە لە پێگەکانی حکوومەتدا. پاشـــان نازناوی "ئیمام" لە لایەن شـــوێنکەوتووانیەوە لە ســـەدر نرا،[٢٩٠] لە

---

[٢٨٨] SAVAK Documents, No. 212s/1445, 19 September 1966.

[٢٨٩] کەمال ئەلئەسـعەد وتەبێژی پێشـووی پەرلەمان، وەزیری خوێندن و هونەرە جوانەکان و زەعیمێکی دەسترۆیشتووی شیعەکان بوو لە ئەلتیبەدا.

[٢٩٠] لەکاتێکدا سـوننە ئەو زاراوەیە بۆ ڕابەرە هەر چالاکەکانی گروپێکی ڕێکخراو بەکاردەهێنن هەروەک نوێژکردن، کەچی شـــیعە هەرگیز وەک بیچمێکی دینی بەکـاری نـاهێنن ئـاخر

١٠ی ئابی ١٩٦٩شدا سەدر ئاڵنگاری هەم ئاخونده شیعه نەریتخوازەکان و هەم چەپەکانیش بووەوه بەوەی بانگی هەموو جڤاتەکانی لوبنانی کرد، بە یەکسانی و ماندونەناسانه ڕیفۆرمی سیاسی بکەن و دژی بێبەشکردنی هەموو دینەکان لە لوبنان بوەستنەوە. بەگوێرەی یەزدی بێ؛ "بانگەوازی سەدر هەر بەتەنیا بانگەوازێکی دینی نەبوو. ئەوەی ڕاستی بێ چەندین ئەندامی نادیندار بە کۆمۆنیستە شیعەکانیشەوە لە نێو ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعەدا هەبوون."[391] بەگوێرەی ساواک، ڕاگەیەنراوەکە وێنە و نمایشی سەدری وەک سەرکردەیەکی سیاسی لە لوبنان پشتڕاستکردەوە،

***سەید موسا سەدر مەلایەکی شیعەی پێگە "بەهێزە" لە لوبنان وەک ئەوەی ببێتە "دڵی بەیروت". هیچ [سیاسییەکی] لوبنانی زات ناکا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەکا. بۆ هەر کوێیەک، بە کورتە سەفەر بێت و بڕوا، ئەوا هەموو دەستەبژێری بەیروتی پێشوازی لێدەکەن و بەخێری دەهێنن. ئەو زۆر لە سەرۆکی لوبنان بەدەسەڵاتترە. مرۆ دەتوانی بە ئاسانی پەیامەکانی ئەو لەسەر ڕووپەڕی هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارەکان هەروەک لە هەموو بازاڕی لوبناندا ببینێ... سەدر چەندین دامەزراوەی لە بەیروت دروستکردوون. ئەو سەرۆکی ئەنجوومەنی شیعەکانە و لە لایەن شوێنکەوتووانی نازناوی ئیمامیان لێناوە. [خۆی لەوێدا دەنگۆیەک هەبوو] گوایە سەرۆکی لوبنان لە دەسەڵاتەکەی ئەو دەترسێ. هەموو ژەنەڕاڵەکانی هێزی سەربازی فیداییەکانی سەدرن... لە بەیروتدا هیچ هێزێک لەپشت هێزی سەدرەوە نییە و هەر کوێیەکی بوێ ئەوا بە ڕێوڕەسمی تایبەت***

لەوەتەی ئیمام "بەرەکەت"ێکی خواییە تەنها بە مەعسومەکان دەدرێ. لەگەڵ ئەوەشدا سەدر یەکەمین مەلای شیعان بوو کە نازناوی ئیمامی پێبدرێ. ئایەتوڵڵا سەید ڕوحوڵڵا خومەینی یش دواتر لەبەر ڕەوشی ١٩٧٩ ی شۆڕشی ئیسلامی بە ئیمام ناوبانگی دەرکرد.

391 Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

***سەری ئەوێ و هەر پارچەیەکی ئەم جیهانە دەدا... بە کورتی سەدر واتا لوبنان و لوبنانیش واتا سەدر.*** [392]

دیاربوو ڕۆژگار لەپشتی سەدرەوە بوو.

دامەزراندنی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە لە لایەن مارۆنییەکانەوە پێشوازی لێکرا، ئاخر سەرهەڵدان و هەڵکشانی شیعە، بەرەی سوننەکانی پان عەرەبیزمی بنکۆڵ دەکرد. بە پێچەوانەشەوە، سوننە دابەزینە سەر ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعەی سەدر. پێشتریش دەستەبژێری سوننە هەوڵیاندا سەدر لە پێکهێنای ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە ساردبکەنەوە بەوەی پلەوپایەی جێگری هاوپەیمانیی ئیسلامییان پێبەخشی کە سوننە بەسەریدا زاڵ بوو. سەدر بە ڕەتکردنەوەی ئەو داوایە، ئەوەبوو سەرکردەکانی سوننە بە شێخ حەسەن خالید، مفتی سوننی و سەرۆکی هاوکاریی ئیسلامی، سەدری بە ناپاکی بەرەی موسڵمانان لە دژی کریستیانەکان لەقەڵەم دا. توخمگەلی ناسرپەروەریش لە لوبنان، کە ژمارەی هەرە زۆرییان لە سوننەکان بوون، مشتومڕیان لەسەر ئەوە بوو کە "دیاریکردنی موفتییەک بۆ سوننە و ئیمامێکیش بۆ شیعە ، شتێکی پووچە، ئاخر خۆ دەبێ هەموو موسڵمان یەکبگرن." [393] چەپەکان و فەڵەستینییەکانیش دژی پێکهێنانی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە بوون. هەندێک توخم لە کۆمەڵگەی شیعەکانیش، بە سیاسی، دەوڵەمەند و زەویدار و مەلا نەریتخوازە دەستڕۆیشتووەکانیش ڕەخنەیان لە سەدر و ئەنجوومەنە پێکهێنراوەکەی گرت. شێخ حوسێن خەتیب، [394] ڕیاز تەها [395] و کامل ئەلئەسعەد لە نەیارە سەرەکییەکانی سەدر بوون لە باشوور. تەنانەت

---

392 SAVAK Documents, No. (39–40).

393 SAVAK Documents, No. 212/306, 3 May 1965.

394 خەتیب یەکێ لە مەلا شیعە دەستڕۆیشتووەکان بوو.

395 ڕیاز تەها سیاسییەکی لایەنگری حزبی بەعسی عێراقی بوو. بڕوانە:
SAVAK Documents, No. 212/971, 1 July

جەعفەر شــەرەفەددینیش پەیوەندییەکی باشــی لەگەڵ ســەدر نەبوو، ئاخر وای دەبینی کە ســـــەدر ناونیشــــانی باوکی ئەوی بۆ خۆی بردووە.[٣٩٦] دەستەبژێری شیعە هەر هەمان دروشمی بەکرێگیراوە شیعە و سوننەکانیان لەدژی ســـــەدر دەگوتەوە؛ "ئێمە نۆکەری ئێرانمــان [لە لوبنــان] ناوێ."[٣٩٧] ســەدریش لە وەڵامدا ئەوەی بۆ دووپات دەکردنەوە کە دامەزراوە نوێیەکەی ئەنجوومەنی باڵای ئیســلامی شــیعە بۆ ئەوە پێکنەهاتوە تا وەک رێبازێکی نوێ کێشە دروست بکا؛ بەڵکو بۆ سووککردنی باری لەیەکترازانی رێباز و مەزهەبە دینییەکانە [لە لوبنان]."[٣٩٨] لەگەڵ ئەوەشــــدا ســــەرکردە سوننەکان ئەویان بێزراند و وەک ئاژانێکی شای ئێرانیان لە لوبنان لەقەڵەم دا. رۆژنامەکانی ســوننەمەزهەب شــاڵاوێکی توندیان کردە ســەر ســەدر و وەهاین دانا؛ "یەکێک لە ئێرانییەکانە، کە هەموویان ســووســەکاری شــان، ئەوەی کە هەر دوێنێ هاتووەتە ئێرە [لوبنان] و بەنیازیشــە چارەنووســـی گەلی لوبنــان بخــاتە ژێر جڵەوی خۆی."[٣٩٩] هەروەهــا ســـــەدر بەوەش تۆمەتبارکرابوو کەوا کار لەگەڵ ســـــاواکدا دەکا و کەســــێکە کە جووڵە ســــیاســـییەکەی لەســــەر بنەمای پرۆژەی ســـاواکەوە بەندە."[٤٠٠] لەگەڵ وەرگەڕانی ســیاســەتی دەرەکی ئێران لە لوبنانەوە هێشــتا ســەدر لەلایەن نەیارە لوبنانییەکانەوە بە ئاژانێکی شا دادەنرا.

## پرسی فەڵەستین

جوگرافیا و مێژوو لەســەر پرســی فەڵەســتین نەفرەتیان لە لوبنان کردووە. هەر لە جاڕنامەی ســــەربەخۆیی ١٩٤٨ەوە، ئاســـایشـــی لوبنان بەڕووی

---

[٣٩٦] جەعفەر کوڕی سەید عەبدولحوسێن شەرەفەددین بوو.

[397] SAVAK Documents, No. 212/1494, 11 August 1970.

[398] Sadr's declaration, 29 May 1969.

[399] SAVAK Documents, No number, No date.

[٤٠٠] غەسان توینی، سەرنووسەری ئەلنەهار بە ئاژانی تاران تومەتبار کرا. بڕوانە:
SAVAK Documents, No. (p. 50).

هەرەشـــەی دەوڵەتێکی بێگانەوە ناســـک بووە، کە ئەویش ئیســـرائیل و کاراکتەرەکانی نادەوڵەتین کە خۆی لە جەنگاوەرانی فەلەستینی دەبینێتەوە. ڕێک هەر دوای دامەزراندنی ئیسرائیل، ١٠٠،٠٠٠ فەلەستینی بەرەو لوبنان هەڵاتن و لەوێ لەسەر سنووری باشوور لە ئۆردوگاکاندا مانەوە. شلۆقی لوبنانیش لەوکاتە زێدەتر بوو کاتێک ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی لە حوزەیرانی ١٩٦٤دا و لە کۆبوونەوەی لووتکەی عەرەب لە عەممان دامەزرا. هەرچەندە دوای شـەڕی شـەش ڕۆژەی ١٩٦٧ سـوپای لوبنانی مەشـقی بە دەیان جەنگاوەری فەڵەستینی کرد،[٤٠١] لێ بەیروت ڕەخنەی لە دامەزراندنی ئۆردوگای ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی لەسەر خاکەکەی خۆی گرت. لەگەڵ ئەوەشـدا جەنگاوەرە فەڵەستینییەکان لە بەیروتی ڕۆژئاوا و لە بەشی باشووری لوبناندا دەوڵەتیان لەنێو دەوڵەتدا دروستکرد. هەندێ لە سەرکردەکانی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی، وەک ئەحمەد شـوکری، یەکەمین سـەرۆکی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی تا ١٩٦٨دا هەر لە لوبنان مانەوە. لە دوای هەموو شـتێک سـوننەکانی لوبنان پشـتی فەڵەستینییەکانین گرت. دەوڵەتە عەرەبییە سوننەکانیش وەک لیبیا پشتگیری کۆچی فەلەستییەنییەکانیان بۆ باشووری لوبنان کرد. لەسـەرووی هەمووشـیانەوە، هەبوونی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی وای لە ئیسرائیل کرد باشـووری لوبنان بکاتە ئامانجی خۆی. لە کانوونی دووەمی ١٩٦٥دا ڕێکخراوی فەتح (بزووتنەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی فەڵەستین) ئۆپەراسیۆنەکانی خۆی دژ بە ئیسرائیل لە باشووری لوبنانەوە جۆشدا، ئەمەش بووە مایەی ئەوەی سوپای ئیسرائیلی هێرش بکاتە سـەر لوبنان. لە بەرانبەریشـدا، بەیروت لەسـەر هێرشـەکەی ئیسرائیل بۆسەر لوبنان سەرکۆنەی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی

---

401 Sayigh, Yezid. Turning Defeat into Opportunity: The Palestinian Guerrillas after the June 1967 War, (Spring 1992) Middle East Journal, 46 (2): 260.

کرد.[٤٠٢] ئەیلوولی ڕەشـــی ١٩٧٠ش هەبوونی جەنگـاوەری چەکـداری فەڵەسـتینی لەسـەر خاکی لوبنان زیاتر وروژاند، لە بەرانبەردا ناوبەناو بەیەکهەڵشاخان لەنێوان بەیروت ڕێکخراوە فەڵەستینییەکە نوێ دەبووەوە.

لە بەراییەوە سـەدر پشـتگیریی فەڵەسـتینییەکانی کرد. جەختی لەسـەر یەکێتیی ئیسلام دەکردەوە، ئەو دۆزی فەڵەستینی بە ڕەهەندێکی هاوبەشی بەرژەوەندیی موسـڵمانان دەزانی. ئەوەی ڕاسـتی بێ، سـەدر گرووپە فەڵەسـتینییەکانی هێنایە سـەر ئەو ڕایە کە ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەسـتینی دروسـت بکەن. سـەدر بە عەرەفاتی گوتبوو: "خەباتی ئێوە بێ ئەنجامە ئەگەر هاتوو خۆتان داوای وڵاتی خۆتان نەکەنەوە، بەڵکو لەبری ئەوە ڕێگە بە خەڵکی دیکە دەدەن لە جیاتی ئێوە ڕەفتار بکەن."[٤٠٣] بەشـێکی سـەرنجڕاکێشـی ئەندامانی ڕێکخراوی ئەلفەتح لە گەنجە شـیعەکانی لوبنان بوون، کە هاوسـۆزییەکی قووڵیان لەگەڵ کوێرەوەیی فەلەسـتیەنییەکاندا هەبوو. ئەوان لە ئۆردوگاکانی ڕێکخراوی ڕزگاری خوازی فەڵەسـتینی لە یمونە و عەین ئەلبونیە لە دەوروبەری بەعلبەگ مەشـقیـان پێدرابوو. دروشمی ناوداری سـەدریش؛ "ئێمە بەیتولمەقدسمان بەر لە صور دەوێ"،

[٤٠٢] هێزی ئاسـمانی ئیسـرائیلی چەندین کاربەدەسـتی پلەباڵای ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی، بارەگاکانی بەرەی دیموکراتی ڕزگاری فەلەستینی و ئۆردوگای پەنابەرانی وەک نهرالباند و بە داوی و چەندین گرووپی شـۆڕشـگێڕیی نێودەوڵەتی وەک چینی، ژاپۆنی، تورک، قوبرسـی و ئێرانی کردە ئامانج، کە بەرچاوترین ئۆردوگای مەشـقی جەنگاوەرانی ڕێکخراوەکە بوو. حکوومەتی ناوەندیی لوبنانیش لە نیسـانی ١٩٦٩دا باری ناکاوی ڕاگەیاند و هێرشێکی گەورەشیان کردە سەر الصاعقەی فەڵەستینی، ئەو گرووپەی فەڵەستینییەی لە خوارووی لوبنان بوون و سـووریا دەسـتی لەپشـت دەدان. دوای شـەڕی نێوان سـوپای لوبنانی و جەنگاوەرانی فەڵەسـتینی، ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەسـتینی و بەیروت لە کۆتایی ١٩٦٩دا ڕێککەوتنێکیان مۆرکرد و ئاگربەستیان پەژراند.

[403] See http://tarikhirani.ir/ Modules/News/ Phtml/News.Print Version.Html.php ?Lang =fa&TypeId=4&NewsId=924.

بەم جۆرە ڕوانینی خۆی لەبارەی دۆزی فەڵەسـتینییەکان دەردەبڕی.[٤٠٤] وێڕای نـاکۆکی جەوهەری، کەچی سـوننەی لوبنـانی و ڕێکخراوی ڕزگاریخوزازی فەڵەستینی پشێوازییان لەو پشتگیرییە بەرەو هەڵکشاوەی سـەدر بۆ فەڵەسـتینییەکان و میلیشـیا چەکدارەکانی کرد. ئیدی کۆمەڵگەی مارۆنی و کریستیانەکان خۆیان لە سەدر دوور دەخستەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا بە تێپەڕینی کات پەیوەندییەکانی نێوان سەدر و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەسـتینی بەرەو خراپی ڕۆیشـت. شـەڕی جەنگاوەرانی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەسـتینی لەسـەر خاکی باشـووری لوبنان سەریکێشا بۆ هەڵمەت و پەلاماری بێ وەستانی سوپای بەرگری ئیسرائیلی. هەرچەندە شیعەی لوبنان دڵسۆزیی خۆی بۆ دۆزی فەڵەستینی نیشـان دا، کەچی جەنگاوەرە بێ دیسپلینەکانی فەڵەستینی کێڵگە و مەزرا و گوندەکانی شـیعەکانیان داگیرکردن، ڕێگاوبانەکانیان لەسـەر بڕین و بە زۆرەملێش گەنجە شـیعەکانیان ناچارکرد بخزێنە ڕیزی میلیشـیاکانیان.[٤٠٥] شـیعە لە سـەرەتـای هەفتـاکـانـدا بە زۆرەملێ خزانە نێو دۆزە خوێنـاوییەکەی فەڵەسـتینییەکان، لەناو لوبناندا شـەڕیان لەگەڵ ئیسـرائیل و مێملەکانی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەسـتینیدا دەکرد. هەر بەڕاسـتیش دۆزی فەڵەستینی بۆ شیعە هەر بەتەنیا ماڵوێرانی بوو، باشووری لوبنانیش بووە مەیدانی شـەڕێکی خوێناوی. هەر بۆیە سـەدر تکای لە هەردوو لایەن، لە بەیروت و وڵاتە عەرەبییەکـانی کرد بەڵکو کوێرەوەریی شـیعەکـان لەبەرچاوبگرن. ئەوەبوو سەرکۆنەی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی کرد کە بووەتە مایەی ئەوەی ئیسـرائیل پەلاماری باشـووری لوبنان بدا. سەدر لە ئایاری ١٩٧٠دا ڕاشکاوانە دژی ڕەفتاری جەنگاوەرانی فەلەستینی

404 Khosrowshahi, Seyyed Hadi. Jonbesh-e Amal va Emam Musa Sadr [Amal Movement and Imam Musa Sadr], See http://iscq.ir/ ?part=menu&inc = menu&id =41.

405 Nasr, Vali, The Shia Revival: How conflicts within Islam Will Shape the Future (W.W. Norton & Company, 2007) p. 111.

لەگەڵ کچ و ژنانی شیعە وەستایەوە.[٤٠٦] "سەدر ڕایگەیاند؛ "باشوور بووەتە شلۆقترین ناوچەی لوبنان... لەکاتێکدا لە سەرەتاوە شیعە پشتی میلیشیا فەلەستینییەکانی گرت، کەچی هەندێ لە فەلەستینییەکان کێشەیان بۆ شیعە دروستکرد، وەک ئەوەی باج و سەرانەیان لێ بستێنن... من هەوڵم دا قەناعەت بە شیعە بهێنم بەوەی ئەو جۆرە ڕادیکالە تێکدەرانە هیچیان ناچنەوە سەر جەنگاوەرە فەلەستینییە ڕاستەقینەکان."[٤٠٧] سەرباری ئەمەش، زیادبوونی ژمارەی شالاوی ئاوارە فەلەستینییە سوننەکان بۆ ئەوێ دەبووە مایەی زیانگەیاندن بە دیمۆگرافیای پێگەی شیعە لە باشوور، کە لە بەرانبەردا وای لە شیعەکان دەکرد بە کۆمەڵ ئەوێ جێبهێڵن و بەرەو بەیروت کۆچ بکەن، لەوێ لە گەڕەکە هەژانشینەکان هەژار و نەدارتر بژین، ئینجا ئەمەش دنەی ئیسرائیل دەدا تا باشووری لوبنان داگیربکا. بەهۆی ناتوانایی بەیروت لە بەرگریکردن لە باشوور لە بەرانبەر ئیسرائیل و ئەو هەرا و پاشاگەردانییەی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی نابوویەوە، ئەوەبوو سەدر پێی لەسەر یەکێتیی نیشتمانیی لوبناندا داگرت. هەرچۆنێک بێ پشتگیریکردنی ئەو لە کارابوونی دەوڵەت لوبنان، فەلەستینییەکانی لەخۆی هاندا و بەوە سەرزەنشتیان کرد گوایە کرێگرتەی دەزگای هەواڵگریی لوبنانییە.[٤٠٨] هەر بەراستیش کەس دانی بە پێزانین و پشتگیری باوەڕدارانەی شیعە بۆ فەلەستینییەکان نەنا. جارێکی دیکە لە لایەن سوننەوە بە بێ باکی پشت لە ژانوناسۆری شیعە کرایەوە.

پاڵپشتی بەرایی سەدر بۆ جەنگاوەرە فەلەستینییەکان لێکەوتەی خۆی بەسەر پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێراندا هەبوو. بەرەبەرە ساواک وای دەبینی کە پەیوەندی نزیکی سەدر لەگەڵ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی وەک هەڵکشانی تەوژمێکی ئیسلامگەراییە کە لە لایەن گرووپە چەپە

406 SAVAK Documents, No. 212/320, 9 May 1970.
407 SAVAK Documents, No. 213/895, 11 March 1978.
408 SAVAK Documents, No. 213/895, 11 March 1978.

ڕادیکالەکانەوە دەستیان لەپشت دەدرێ. ڕەوشەکەش زیاتر ئەوکاتە شێوا، کە سەدر لەبەر خۆدوورخستنەوەی لە فەڵەستینییەکان و پشتیگیری ئیسرائیلییەکان ڕەخنەی لە تاران گرت. "خەڵکی ئێران پشتگیری عەرەبی کرد، چونکە ئەوان موسڵمانن. بۆ بەدبەختیش، حکومەتی ئێرانی پشتگیری فەڵەستینییەکانی نەکرد، لەبری ئەوە پەیوەندی باشی لەگەڵ ئسرائیلدا هەیە... خۆی دەبووایە ئێران پشتی فەڵەستینییەکانی بگرتبایە بەوەی چەکیان بداتێ هەروەک [ئێران] لە پاکستان کردی."[409] دوابەدوای کزبوونی ناسریزم، چوونەپاڵ یەکدی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی و شیعەی لوبنان، پەیوەندییەکانی سەدر و تاران شێواوتر بوو. گرژتربوونی پەیوەندییەکانی نێوان سەدر و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی گومانەکانی تارانی نەڕەواندەوە. لەجیاتی ئەوە باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروت سەدری بەوە تۆمەتبار کرد، گوایە پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ میلیشیا فەلەستینییەکان و سەرکردەکانیان هەیە هەروەک جۆرج حەبەش و نایف حەواتمە.[410] لەکاتێکدا سەدر بە ڕوونی ڕەخنەی لە میلیشیا فەڵەستینییەکان دەگرت، چونکە ئەوان ئازار بە شیعە دەگەیەنن، ئەوکات ئەو لە لایەن ساواکەوە بە هاوپەیمانێکی "سروشتی" فەڵەستینییە ڕادیکالەکان دادەنرا.

## سەدر و ڕژێمە عەرەبییەکان

لوبنان وەک دەوڵەتێکی ناسک بەخۆی و ئەو لەیەکترازانەی مەیدانی سیاسی و ناسنامەی لاوازی نیشتمانی، هەموو ئەمانە بوارێکی بەرفرەوانیان دایە دەست وڵاتە عەرەبییەکان تا پەیوەندی خۆیان لەگەڵ

409 Norton, Augustus R. Amal and The Shia: Struggle for the Soul of Lebanon (Austin, TX: 1987) p. 43; Ajami, Fuad, The Vanished Imam: Musa Al Sadr and The Shia of Lebanon (London, 1986) p. 175.
410 SAVAK Documents, No. 213/54013, 6 April 1974.

هەریەک لە جڤاتە لوبنانییەکان ببەستن. ڕاچاندنی ڕایەڵەی ئەم پەیوەندییانەش ڕێگەی بە دەستەبژێر و دەستە و تاقمە لوبنانییەکان دا تا مانۆری خۆیان بکەن و لە بەرابنەر یەکدیدا یاری بەو هێز و دەستە دەرەکییانە بکەن. دوابەدوای ئەوەی ڕووی خۆی لەسەر باشووری لوبنان وەرسووڕاندەوە، ئیدی سەدر بۆ جڤاکەکەی خۆی بەدوای پشتیوانییەکی دەرەکییدا گەڕا. سوریا و ڕایەدارە سیاسییە عەلەوییەکان یەکەمین ئامانجی ئەو بوون. عەلەوییەکان بەر نەفرەتی سوننە کەوتبوون و بە لادەر و بێ بڕوا و کافر و موشریک لە قەڵەم دەدران، بۆیە تادەهات کۆمەڵگەی عەلەوییەکان لە نێو کۆمەڵگەی بەرفرەوانتری موسڵمانانیدا پەراوێزخراوتر دەبوون.[٤١١] هەروەها جڤاتێکی بچکۆلەی عەلەوییەکان لە تەڕابلوس و عەکار لە باکووری لوبنان هەبوو، کە بۆ ماوەی چەندین سەدە لە لایەن عوسمانییە سوننەکان دەچەوسێندرانەوە. تەنانەت دوای سەربەخۆیی لوبنانیش، هێشتا ئەوان بە شێوەیەکی ڕەوا و قانونییانە ڕێگەیان نەدرا تێکەڵ بە کۆمەڵگەی لوبنانی ببن. دوابەدوای دامەزراندنی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە، هەوڵ و تەقەلای عەلەوییەکان بۆ دۆزینەوەی هاوپەیمانێک لە لوبنان لە لایەن سەدرەوە بەخێرهێنرا. هەرچەندە شیعەکانی لوبنان پەیوەندییەکی لەمێژینەی ڕەگئاژۆیان لەگەڵ عەلەوییەکاندا هەبوو، سەدر پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ ئەل ئەلواشی ڕابەری عەلەوییەکانی تەڕابلس پەیداکرد و جڤاتی عەلەوییەکانی هێنایە ژێر سایەی مەرجەعی فیقهی دوازدە ئیمامی.[٤١٢] وێڕای ئاماژەی ناڕوونی سەرچاوەکانی شیعەی دوازدە ئیمامی بۆ

[٤١١] ئایەتوڵلا سەید حوسێن ئەلحەکیم گەورەمەرجەعی دوازدە ئیمامییەکانی شیعە لە نەجەف، یەکەمین ڕابەری شیعە بوو پرسی عەلەوییەکان بەهەندهەڵگرت و شێخ حەبیب ئەلئیبراهیمی مەلای دۆڵی بیقاعی لە ١٩٤٧دا بۆ هەرێمەکە نارد. بڕوانە:
Martin Kramer, “Syria’s Alawis and Shi’ism,” in Shi’ism, Resistance, and Revolution, ed. Martin Kramer (Boulder, Colorado: Westview Press, 1987), pp. 237–54.

[412] SAVAK Documents, No. 212/4822, 7 February 1972.

عەلەوییەکان"، لێ وتار و دوانی سەدر بۆ بووژاندنەوەی ناسنامەی بەکۆمەڵی شیعە و یەکێتیی موسڵمانان هەروەک مجێزبەرزییەکەی "کشا تا گەیشتە باکووری لوبنانیش،"[٤١٣] سەری بۆ سیاسەتی لەخۆگرتنی عەلەوییەکان کێشا. لە کۆبوونەوەیەکی پڕ لە مقۆمقۆی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە لە درەنگانێکی ساڵی ١٩٦٩دا سەدر عەلەوییەکانی وەک لقێکی کۆمەڵگای شیعە ڕاگەیاند و ئەوانی هێنانە ژێر باڵی خۆی. وێڕای پێناخۆشبوونی سەرەتایی شێخە دیندارەکانی عەلەوی، ئەوەبوو حافز ئەسەدی عەلەوی لە کودەتاکەی ١٨ی ئایاری ١٩٧٠دا گەیشتە دەسەڵات و توندوتیژی سوننەکانیش لە ١٩٧٣دا عەلەوییەکانی هێنایە سەر ئەو ڕایە کە، دەبێ پەیوەندی شیعە-عەلەوی لە خۆرهەڵاتدا تۆکمە و بەهێز بکرێ. لەسەرێکەوە، ڕژێمە نوێیەکەی ئەسەد پێویستی بە ڕەوایەتی دینییەوە هەبوو. لەسەرەکی دیکەشەوە، شیعەی لوبنان پێویستیان بە پارێزەرێکی بەهێز هەبوو. ئەم ڕەوشەش قەناعەتی بە سەدر هێنا پەیوەندییەکی دۆستانە و ستراتیژیانە لەگەڵ دیمەشق ببەستێ.[٤١٤] سەدر لە تەمووزی ١٩٧٣دا، فەتوا مێژوویەکەی خۆی بۆ ناساندنی عەلەوییەکان وەک هاودینداریەکی شیعە دا و "**عەلەوییەکی خۆجێی وەک موفتییەکەی شیعەی**

---

[٤١٣] مارتین کرامەر مشتومڕی لەسەر ئەوەبوو کە نامە و نامەگۆڕینەوەکانی ئاتوڵلا موحەمەد کازم شەریعەتمەداری لەگەڵ شێخ ئەحمەد کفتارۆی گەورە مفتی سوونەکانی سووریا و خزمەتکاری ڕژێمی سووری بووە. لە دانیشتنێک لەگەڵ شەریعەتمەداری لە قوم لە هاوینی ١٩٧٣دا، شێخ ئەحمەد داوای لە شەریعەتمەداری کرد تا دان بە عەلەوییەکاندا بنێ، بەڵام شەریعەتمەداری لەسەری بێدەنگ بوو هیچ هێمایەکی نەدایە شێخەکانی عەلەوی کە بە پێداگرییەوە دەیانگوت ئێمە لەسەر دینی ئەوین. بڕوانە:

Martin Kramer, "Syria's Alawis and Shi'ism," in Shi'ism, Resistance, and Revolution, ed. Martin Kramer (Boulder, Colorado: Westview Press, 1987), 237–54.

[414] SAVAK Documents, No. 211/1064, 25 May 1971.

**دوازدە ئیمـامی لە تەڕابلس و بـاکووری لوبنـانـدا دانـا".**[٤١٥] ئەمەش جووڵەیەکی سـیاسـی-دینی یەکلاکەرەوە بوو کە ڕێگەی کردەوە عەلەوییەکان بخزێنە ژێر چەتری ڕەوایەتی ئەنجوومەنی باڵای ئیسـلامی شیعە.[٤١٦] هەروەها فتواکەی سەدر ڕەوایەتی دایە ڕژێمی ئەسەد و "ڕێی لە کەوتنی گرت" لە وڵاتێک کە زۆرینەکەی سـوننەیە.[٤١٧] **دیمەشـقیش لە بەرانبەردا، پشـتگیری تەواوی سیاسـی و دارایی و سـەربازی پێبەخشـی. ئیدی ئەوکات بەرژەوەندییە نیشـتمانییەکانی سـوریا و شـیعەی لوبنان ئاوێزان بوون.**

ئەو پەرەسـەندنەی هاوپەیمانی شـیعەی لوبنان-دیمەشـق بووە مایەی هەڕەشـە بۆ هەریەک لە مارۆنی و سـوننەکانی لوبنان. سـەرەڕای هاوبەشبوون لە هەمان ڕوانین لەگەڵ شیعەدا سەبارەت بە سەرکوتکردنی ڕادیکالیزمی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەسـتینی، کەچی مارۆنییەکان،

---

415 Martin Kramer, "Syria's Alawis and Shi'ism," in Shi'ism, Resistance, and Revolution, ed. Martin Kramer (Boulder, Colorado: Westview Press, 1987), pp. 237–54.

٤١٦ لە کۆبوونەوەکەدا سەدر هاوپشکیی عەلەوییەکانی لوبنان و شیعەی دوازدە ئیمامی ڕاگەیاند، **ئاخر خۆ هەردوولایان لەبن چەوسـاندنەوەدا دەیانناڵاند. "ئەمڕۆ ئەو موسـڵمانانە پێیان دەگوترێ عەلەوی برای شیعەکان، ئەوانەی لە لایەن بەدکارانەوە پێیاندەگوترێ موتەوەلی.. کاتێک گوێمان لەو دەنگانەی ناو سوریا و دەرەوەی سوریا بوو کە ئیسلام بۆ خۆیان پاوان دەکەن، دەبوایە ئێمەش بجووڵێینەوە، بەرگری بکەین، ڕووبەڕوویـان ببینەوە.. ئێمە ڕاسـتەوخۆ داوای بەیەکگەیشـتنی برایـانمـان، عەلەوییەکانی تورکیاش دەکەین. ئێمە دان بە موسـڵمابوونی ئێوەدا دەنێین." شـێخ عەلی مونسـوور، موفتی نوێش لێدوانی دا: "ئێمە بۆ ئەوانەی لە دژی ئێمەدا وەستانەوە ڕایدەگەیەنین کە ئێمە جەعفەری دوازدە ئیمامیین و قوتابخانەکەمان جەعفەرییە و دینیشتمان ئیسلامە."** بڕوانە:
Martin Kramer, "Syria's Alawis and Shi'ism," in Shi'ism, Resistance, and Revolution, ed. Martin Kramer (Boulder, Colorado: Westview Press, 1987), pp. 237–54.

417 Fawzi al-Qawuqji, the former heads of the Arab Liberation Army (Jaysh al-Inqadh alArabi or ALA). See SAVAK Documents, No. 212/4164, 11 December 1971.

سـوورییان وەک پارێزەرێکی بەهێز بۆ کۆمەڵگەیەکی لوبنانی بۆ قووت نەدەدرا. حکوومەتی لوبنانیش "بە گەمارۆدراوی لە باکوور و ڕۆژهەڵاتەوە بە سـووریا" وەهای دانا لەوەتەی کاتی سـەربەخۆییەوە پەیوەندی لەگەڵ سوریا 'گرنگ و چارەنووسسـازە'."[٤١٨] پاش هەموو شـتێکیش، خۆ هێشـتا سوریا بەدوای بەرجەستەکردنی بیرۆکەی سوریایەکی مەزنتردا وێڵ بوو، کە بەشی خۆرهەڵاتی لوبنان و سوریا و ئوردن و خۆرئاوای میزۆپۆتامیش لەخۆبگرێ.[٤١٩] شـتێکی ڕوون و ئاشـکرا بوو، بیرۆکەکە دژی مارۆنییەکان بوو، ئەوانەی وەهایان دەبینی کە ناسیونالیزمی سوری وەک هەڕەشەیەک بووە بۆ سـەر لوبنـان. لە چـاوی مـارۆنییەکـانەوە، نزیکبوونەوە پەرەسەندووەکەی سەدر لە دیمەشق یەکەمین هاوپەیمانی نێوان کۆمەڵگەی شیعی و ڕژێمێکی پان عەرەبیزمە.

ئێران وێڕای ناکۆکی لەبارەی بەرژەوەندییەکانی هەرێمی لەگەڵ دیمەشـقدا، نەچووە بن باری پەیوەندییەکانی سـەدر-سـوریای ئەسـەد. ئاخر هەر لەوەتەی کێبڕکێی بەغدا-دیمەشـق هەبوو، شـای ئێران سـووریای دوورەدەست ئەگەرێک بێ لە دژی بەغدا بەکاربێبهێنرێ. ڕێنمایی ساواکیش ئەوەبوو دیمەشـق لە دژی بەغدا بخرێتەکار. "لە ناوەڕاسـتی حەفتاکاندا، پێشنیازمکرد بەڵکو شا پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ دیمەشق دروستبکا، ئاخر سـوریا ناحەزی بەغدایە. ئەوەم بەبیر شـا هێنایەوە، کەوا من پەیوەندییەکی دۆستانەم لەگەڵ حافز ئەسەددا هەیە. ئێمە [مەنسور قەدەر و حافز ئەسـەد] لە دیمەشـق دراوسـێ بووین. دوابەدوای ئەیلوولی ڕەشـی ١٩٧٠، ئەو بانگهێشـتی کردم سـەردانی دیمەشـق بکەم. لە کۆبوونەوەیەکدا ئەو ئـامـاژەی بە مێزێـک لە نـاوەڕاسـتی هۆدەکەدا داو گوتی، "**وا بێنە**

[418] Madrid 1982 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 8 October 1970.

[٤١٩] کاتێک لوبنان لە ١٩٤٣شدا سەربەخۆی خۆی لە فەرەنساوە وەرگرت، ڕژێمی سوریی بێ هوودە نارەزایەتی خۆی لە دژی حکومەتی فەرەنسی نیشاندا بەوەی بەشێک لە خاکەکەی دابڕیوە تا لوبنانی پێدروست بکا و بەمەش ناسیونالیزمی عەرەبی پێ لاواز بکا.

**پێشـــچاوی خۆت مێزەکە عێراق بێ. باشـــە بۆچی نایەی ئێمە لەســـەر ئەو مێزە تۆقە لەگەڵ یەک بکەین؟ ئێمە دەتوانین بەســـــەر عێراقدا باز بدەین.** بەڵی، هەڵبەتە شـای خاوەنشـکۆ نابێ شـتێکی وەها لەمن ڕەچاوبکا، کە بە فەرمی جاڕی پشـــتگیریی ســـوریا بۆ ئێران بدەم لەســـەر وەرگرتنەوەی دوورگەکانی کەنداوی فارســـی [وەک ئەبو موســـا، تونبی گەورە و تونبی بچووک]. لێ من لەو باوەڕە دام ئەو دوورگانە هی ئێوە {ئێرانییەکان] بن. گوێ لە ڕۆژنامە و میدیا مەگرە،" قەدەر بەم قســـانە ئەوەی گوت گوایە ڕۆڵی لە قەناعەتپێهێنانی شـــا هەبووە تا پەیوەندییەکی دۆســـتانە لەگەڵ ئەسـەددا پەیدا بکا. پەرەسـەندنی پەیوەندی نێوان ئەسـەد و سـەدر ڕێگەی لەوە نەگرت کە پەیوەنـدییە دیپلۆمـاتییەکـانی تـاران-دیمەشـــق بۆ بەرزەفتکردنی عێراق ببووژێننەوە.

لەگەڵ ئەوەشـدا تاران ڕەخنەی لە باشـبوونەوەی پەیوەندییەکانی سـەدر-ناسـر گرت. هەوڵ و تەقەللای سـەدر لە شـەسـتەکاندا بۆ بووژاندنەوەی ناسـنامەی بەکۆمەڵی شـیعە لە لایەن ناسـر و ناسـرپەروەرەکانی لوبنان ڕەخنەباران کرا.[420] هەندێ دەنگۆش پەیدا بوون کە چەند کەســـایەتییەکی ناســـرپەروەر لە لوبنان نەخشـــەیان بۆ لەناوبردنی ســـەدر دانابێ.[421] هەرچۆنێک بێ وەرچەرخـانە جیۆپۆلیتیکەکەی بەدوای شـــەڕی شـــەش ڕۆژەدا هـات، پاڵی بە قاهیرەوە نا بە ســـیاســـەتی هەرێمایەتی خۆیدا بچێتەوە. موســـا ســـەدر لە دوای گەشـــتە کورتەکەی بۆ کوێت لە ئازاری ١٩٧٠دا، بۆ قـاهیرەش بـانگهێشـــت کرا.[422] لە دیـدارێـک لەگەڵ محەمەد حەســـەنێن هەیکەل لە قاهیرە لە ١٢ی ئازاری ١٩٧٠دا، ســـەدر لەبارەی

---

420 SAVAK Documents, No. 212/306, 3 May 1965.

421 SAVAK Documents, No.3000/A, 27 August 1967.

٤٢٢ خوی ئەوە ســـەبری حەمادەی وتەبێژی پەرلەمانی لوبنان بوو کە دیداری نێوان جەمال عەبدولناسر و سەید موسا سەدری ڕێکخست. بە پێچەوانەوە هەریەک لە کەمال جونبولاتی ڕابەری دروزەکان و سـەرۆکی پارتی سـۆشـیالیسـت و حەسـەن خالیدی موفتی سـوریا ناسەرکەوتووانە تێکۆشان ناسر لە بینینی سەدر سارد بکەنەوە.

پەیوەندییە تایبەتییەکەی لەگەڵ شـــۆڕشـــگێڕە ئێرانییەکان دواوە.[٤٢٣] هەر دوای چەند ســـەعاتێکی کەم لەو دیدارە، چاوی بە ناســـریش کەوت. لە یەکدیبینینەکەدا، ناسر پێداگیر بوو لەسەر ئەوەی کەوا هیچ دوژمنایەتیەکی لەگەڵ ئێراندا نییە و ئامادەیە تەواوی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانی لەگەڵ تاراندا دەســـتپێبکاتەوە، هەرچەندە قەیرانی ئەروەند ڕودی ئێران-عێراق بەربەســـتی ســـەرەکی دژی گرێدانەوەی پەیوەندییەکان بوو.[٤٢٤] هەروەها ناسری ڕێگەی بە سەدر دا خوتبەی ڕۆژی هەینی لە ئەلئەزهەر، کە زانکۆی هەرە شکۆداری سوننەکاندا بدا.[٤٢٥] هەر زووش کاربەدەستانی لە بەرانبەر دیدارەکەی ســـەدردا کاردانەویان پەیدا بوو. لە هەڵســـەنگاندنامەی شـــا بۆ هەڕەشە ئەوەبوو کە، مەحکەمی پەیوەندی شیعە-میسر ڕەوتی لاوازبووی پان عەرەبیزم لە لوبنان دەبووژێنێتەوە یان ڕێگە بۆ یەکێتیی عەرەب خۆش دەکا بە شیعە و سوننە و تەنانەت کریستیانیەکانیشـەوە. لەپاڵ ئەمەشدا ڕووەرگێرانی سەدر بەرەو میسر، دەکرێ دنەی جۆشدانی بوژاندنەوەی ئیســـلامیزم بدرێ -دواتر لە ئێران پێیگوترا ئیســـلامیەت-. لەســـۆنگەی خۆشـــەویســـتی و بەجەماوەربوونی ســـەدر لەنێو مەلا شـــیعەکاندا ئەوا پەیوەندی سەدر لەگەڵ ناسردا دەکرا بەیەکەوە ئاشتبوونەوە و گرێدانەوەی هەڕەشـــەی عەرەب-ڕەش بێ بۆ ســـەر ئێران. ئیدی لەبەر ئەم بەرڕەوتەدا بوو کە باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروت و توخمگەلی نێو ساواک ســـەدریان بە ئاژانێکی میسری لەقەڵەم دا. بە ئاگابوون لە گومانی شـــا لە دیدارەکەی لەگەڵ ناســـردا، ئیدی ســـەدر تێکۆشـــا گرژییەکەی نێوانیان خاوبکاتەوە. ئەوەبوو لە ١٧ی نیســـانی ١٩٧٠دا، ڕاپۆرتێکی بە وردەکاری دیدارەکەی

---

423 Interview with Zahir Assiran. See: http:// www. shianews. com/fa/ news/ 78226.

424 SAVAK Documents, No.212/83, August 1970.

425 Tabatabai, Mohammad Sadegh, Khaterat-e Siasi Ejtemai [Socio-political Diaries] (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) vol. 1, p. 221. 223SAVAK Documents, No. 316, 27 August 1970.

لەگەڵ ناسر دایە مەنوچەهر داودی و ئەوەشی خستەسەر کە سیاسەتی میسری نەرمڕەوتر و ئاوەزمەنداتر بووە لە قۆناغی بەر لە ساڵی ۱۹٦۷. هەروەها ئارەزووی ئەوەشی کرد کە تاران بە هاوکاریی سەربازییانە پشتی شیعەکانی لوبنان بگرێ.[٤٢٦] هەرچۆنێک بێ، داوانامەکەی ڕەتکرایەوە. تاران هێشتا لە پەیوەندییەکانی سەدر بە قاهیرەوە هەر بەدگومان بوو.

لە پاش سەردەمی ۱۹٦۷دا، سەرانی بەعس تێکۆشان تا عێراق وەها وێنا بکەن کە سەرکردەی نوێی دونیای عەرەبە. لە سەروبەندی ئەوەدابوون کۆمەکی چەندین مەلای شیعە بکەن بەڵکو جێپێیەکی ستراتیژی لە باشووری لوبنان بۆ خۆیان بکەنەوە و بەهۆیەوە سوریاش بەرزەفت بکەن و تەنانەت بەراددەیەک ئێرانیش. دیاربوو عێراق بە زۆرینەی دانیشتوانی کە لە شیعە پێکهاتبوو توانستێکی لەخۆدا دەبینی بۆ سەرنجڕاکێشانی ئاخوندە شیعەکانی دژ بە تاران و ئاشتکردنەوەی هەندێ لە نەیارەکانی. عێراقی حزبی بەعس، سەدری بە هەڕەشەیەک بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی خۆی دانابوو. بەغدا سەدری وەک نوێنەرایەتی نەجەفی دژەبەعس لە لوبنان هەژمار کردبوو.[٤٢٧] دۆستایەتی گەرمی سەدر لەگەڵ حافز ئەسەد و مەلا هەڵگەڕاوە شیعییەکان بەتایبەتی ئامۆزاکەی ئایەتوڵلا سەید محەمەد باقر ئەلسەدر بەغدای هێنایە سەر ئەو ڕایە، کە دەستبەژێری دژەسەدری لە لوبنان بە سەرۆکایەتی کامل ئەلئەسعەد شێخ حەسەن خالید و ڕیاز تەها جۆش و دنە بدا.[٤٢٨] هەرچەندە سەدر وریابوو لە ڕەفتارنواندن لەگەڵ دەستەبژێر لوبنانی، ئەوانەی عیراق دەستیان لەپشت دەدا، ئاخر دەکرا بەغدا بە کوشتنی ئایەتوڵلا سەدر تۆڵەی خۆی بکاتەوە.[٤٢٩] لەوەتەی

---

[426] SAVAK Documents, No. 316, 27 August 1970.

[427] SAVAK Documents, No. 212/13518, 11 August 1970.

[428] SAVAK Documents, No. 212/971, 1 July 1970.

[429] Interview with Mohammad-Sadegh Tabatabaie, (Winter 1377) Quarterly Periodical Mofid, IV (IV). See also SAVAK Documents, Imam Musa Sadr, vol. II, p. 347.

ڕەوشی سیاسی عێراق لەگەڵ شیعەکان توند و گرژ بووبوو، سەدر زۆر بەخەستی هەوڵیدەدا قەناعەت بە ئێران بێنێ تا یارمەتی ئایەتوڵڵا شیعەکانی عێراقی بدا. لە گفتوگۆی سەدر لەگەڵ داودیدا ئەوەی ڕاگەیاند کە "جەعفەر شەرەفەددین لە دوای پچڕانی پەیوەندییە دیپلۆماتەکانی ئێران-لوبنان، پەیوەندییەکی ژێربەژێری لەگەڵ ئیستخباراتی عێراقی گرێداوە." هەروەها ئەوەشی گوتبوو کە عێراقییەکان ٨٦ بکوژیان بۆ ڕەوانە کردووە تا لەناویبەرن.[٤٣٠] لەوکاتەی سەدر ناڕاستەوخۆ هەوڵی دەدا قەناعەت بە تاران بهێنێ تا سیاسەتی خۆی لە لوبنان بگۆڕێ، کەچی ساواک پێی باشتر بوو لە دەرەوەی بازنەی ناکۆکییە ناوخۆییەکانی شیعەدا بمێنێتەوە. لەپاڵ ئەمەشدا، ساواک مشتومڕی ئەوەی بوو کە هاوپەیمانی سەرەکی عێراق لە لوبنان چەپخواز و جەنگاوەرە فەلەستینییەکانن نەوەک شیعەکان. لە کاتێکدا ڕوانینی سەدر بۆ بەغدا لەگەڵ سیاسەتی ئێرانیدا یەکی دەگرتەوە، کەچی تاران توانستی سەدری بۆ زیانگەیاندن بە بەرژەوەندییەکانی عێراق لە لوبنان و نەجەف پشتگوێخست.

سەرباری یەکێتیی لوبنانی و دیارنەمانی دیاردەی جیاخوازی لە دژی کۆمەڵگەی چەوساوە و بندەستی شیعە، کەچی پەیامی سەدر زەنگی بووژانەوەی ئیسلام و یەکێتیی ئیسلامی بوو. هەرچەندە ئەو دژی ڕوانینی سوننە وەستایەوە سەبارەت بە داننان بە شیعەکانی لوبنان، لێ ئەو لە وتارەکانیدا هەڵوەدای یەکێتی بوو لە جیهانی ئیسلامییدا. بۆ تەواوکردنی ئەرکەکەی، ئەو ماندونەناسانە هەوڵیدا ڕوانینی سەرکردە عەرەبەکان لەبارەی ناکۆکییە هەرێمییەکاندا یەکبخا. ئەو خۆی لە عەرەبستانی سعودی و بەتایبەتیش لە شازادەکەی پاشان لە خودی شا عەبدوڵلاش نزیک کردەوە، ئەو کەسەی لە ڕووی داراییەوە کۆمەکی سەدری کرد تا قوتابخانەی عامیلی و دامەزراوەکانی دیکەی شیعە دابمەزرێنێ.[٤٣١]

---

[430] SAVAK Documents, No.316, 7 May 1970.

[431] SAVAK Documents, No. 223/10, 24 March 1966.

دۆستایەتی شازادە عەبدوللا و سەدر بەڕادەیەک پەرەیسەند، ڕێگە بە سەدر درا گۆڕستانی پیرۆزی ئەلبەقیع نوژەنبکاتەوە.[٤٣٢] هەرچۆنێک بێ ساواک ڕەخنەی لە پەیوەندییەکانی سەدر لەگەڵ وڵاتە هەرێمییەکان گرت. مەنسور قەدەری باڵوێزی ئێران لە لوبنان گوتی گوایە؛ "سەدر چووەتە عەرەبستانی سعودی وتاری داوە و ڕایگەیاندووە: "من بۆیە لێرەم چونکە یەکەمین خەلیفە، ئەبوبەکری سەدیق خەڵکی ئێرە بوو." ئاخر وەک شیعەیەک، نەدەبوو سەدر قسەیەکی وەها بکا. ئینجا شا خالید فەرمانیدا وتارەکەی سەدر لەنێو شیعەکانی عەرەبستانی سعودییدا بڵاوبکەنەوە."[٤٣٣] لە هەمان کاتیشدا، سەدر لە لایەن شێخنشینەکانی کەنداوی فارسییەوە بانگهێشت کرا. لە ئازاری ١٩٧٣دا ئەو چووە بەحرەین و قەتەر ئینجا ئیماراتی عەرەبی. هەرچەندە سەدر نیازی نەبوو هیچ جووڵەیەک لە دژی ئێران بکا، لێ ساواک پێی وابوو پەیوەندییەکانی سەدر بە ڕژێمە عەرەبییە نەریتپارێزەکان لە کەنداوی فارسییدا دەکرێ بووبێتە ئەوەی لە ڕووی داراییەوە کۆمەک کرابێ. ئیدی ساواک گەیشتبووە ئەو دەرەنجامە کەوا بەم کۆمەکە، دەکرێ سەدر "زانکۆیەک بۆ سەرجەم شیعەکانی جیهان لە باشووری لوبنان دابمەزرێنێ، لە بەرانبەریشدا زانکۆکە ببێتە بنکەیەکی ستراتیژی بۆ بەرهەڵستکارانی دژ بە شا لە ناوچەکە و ئەودیوی ناوچەکەدا." هەر بۆیە ساواک پێشنیازی کرد؛ "باشتر وایە تاران زانکۆیەکی ئیسلامی شیعە لە ئێران بکاتەوە تا ڕووبەڕووی نەخشەی دژەشابوونی

---

432 Masira al-Imam al-Seyyed Msa al-Sadr [Seyyed Musa Sadr's Journey], Vol III, Second Edition, p. 357. See http:// moodkerbes. info/1394/ 02/01/ imam-sadr-and-Al-Baqi.

گۆڕستانی جەننەت ئەلبەقیع لە مەدینە لە عەرەبستانی سعودیە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی مەسجید ئەلنەبەوی (مزگەوتی پێغەمبەر). گۆڕستانەکە گۆری زۆر لە یاران و خزمانی و ئیمامانی شیعە لەخۆدەگرێ. ڕژێمی وەهابی لە ڕیاز لە ساڵی ١٩٢٦دا گۆڕستانەکەی تێکدابوو.

433 Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

سەدر ببێتەوە، کە دەکرێ نەخشەکەی سەدر ببێتە مایەی هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نیشتمانیی ئێران."[٤٣٤] ئیدی وردە وردە سەدر لە لایەن ساواکەوە وەک مێملێک سەیردەکرا.

**بەختیار و سەدر**

پەیوەندییەکانی تاران-بەیروت بەهۆی دۆزی سـەرتیپ (تەیمور بەختیار) تێکچوو. لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا ئەو هەڵمەتێکی دلڕەقانەی بۆ تێکشکاندنی هێزەکانی دژەشا سەرپێخست.[٤٣٥] بەختیار وەک ئەفسەرێکی گەنجی سێ ئەستێرە لەسەر شان، لە شوباتی ١٩٥٦دا وەک یەکەمین بەڕێوەبەری دەزگای ساواک دەستنیشان کرا. ئەو لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٨ تا ١٩٦١ قۆناغی سەرەتایی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانی داڕشت و بەڕێوەبرد. هەرچەندە هەڵکشانی ئەو هەر زوو وەستا، ئاخر (عەلی ئەمین)ی سەرۆوەزیر هۆشداری دایە شا بەوەی بەختیار پەیوەندی ژێربەژێری لەگەڵ کەنەدی سەرۆکی ئەمریکادا هەیە. (شا)ش لە ترسی ئەوەی نەبادا بە پشتیوانی ئەمریکییەکان کودەتایەک بکا، بۆیە لە ١٩٦١دا بەختیاری لادا و پاشان ناچاری کرد لە جنێڤ لە سویسرا بە تاراوگەنشینی بژی. وێڕای سەرکۆنەکردنی جەمال عەبدولناسر بەدەستەلەپشدانی خۆپیشاندانەکان،[٤٣٦] شا لە دەستوەردانی ناڕاستەوخۆی بەختیار لە

---

[434] SAVAK Documents, No. 334/936, 10 June 1973.

[٤٣٥] بەختیار، (حوسێن فاتیمی)ی وەزیری کاروباری دەرەوەی دکتۆر موسەدیقی گرت و لەسێدارەی دا. هەروەها حزبی تودەشی تێکوپێکشکاند.

[٤٣٦] پەیوەندییەکانی جەمال عەبولناسر بە ڕێکخەرانی خۆپیشاندانەکان ساختە بوو. تەنانەت مەنسور قەدەریش دانیپێدا نا، "خۆی ئەوە ڕاستییەکە نەبوو." ئەو بۆی زیادکرد؛ "لەو کاتەدا دۆلار لە تاران زۆر گران بوو، لە کێبرکێشیدا زێر لە بەیروت هەرزان بوو. کەواتە، دەستەیەک لە ئاڵوگۆڕکەرانی دراو پەیوەست بوون بە بەقاچاخبردنی پارە لەنێوان تاران و بەیروت. لەگەڵ ئاژاوە و ڕاوەدونانەکانیشدا یەکێک لەوان بە ناوی عەبدولهادی ئەباچی کە نووسینگەی هەم لە دیمەشق و هەم لە بەیروتیش هەبوو، زیاتر لە یەک ملیۆن دۆلاری ناردە تاران. پارەکە لە

هەراوهوریای ١٩٦٣ بەگومان بوو. بە پەرەسەندنی گرژییەکانی نێوان شا و بەختیار، ئەوەبوو بەڕێوەبەری پێشووی ساواک پەیوەندییە نهێنییەکانی لەنێو تۆڕی ساواک و هاوپەیمانەکانی ئێران لە هەرێمەکەدا زیندوو کردەوە. مەنسور قەدەری باڵوێزیش وەهای دەگوت، گوایە گرووپێکی بەهێزی سەر بە بەختیار لەنێو ساواکدا هەیە. بە قسەی مەنسور قەدەر "سەرۆکی ئەو گرووپەش سەرهەنگ پاشایی بوو. ئەندامە سەرەکییەکانی دیکەش هەریەک لە تاجبەخش، ئەزمون، عیسا پژمان، ساڤادکوهی تا ڕاددەیەکیش ئالڤیکیا بوون."[٤٣٧] هەروەها بەختیار هەوڵیدا پەیوەندی لەگەڵ لادەرە ئێرانییەکان لە ئەورووپا و لوبنان و عێراقەوە بکا بە ئایەتوڵڵا خومەینی و ڕەزا ڕادمەنش و مەحمود پەناهیانیشەوە.[٤٣٨] لە شەستەکاندا بەختیار و ئایەتوڵڵا خومەینی لە گەورە لادەرە بەرهەڵستاکارەکانی شا بوون.

سەدریش لەنێو ئامانجە سەرەکییەکەی بەختیار بوو. مەنسور قەدەری باڵوێز، سەدری بەوە تۆمەتبار کرد گوایە پەیوەندییەکی نەگۆڕی لەگەڵ

---

فرۆکەخانەی میهرئاباد دەستی بەسەردا گیرا و پاشانیش ئەباچی گیرا. هەرزوو ساواک جەمال عەبدولناسری بە پشتگیری دارایی بۆ ڕێکخەرانی خۆپیشاندانەکە تۆمەتبار کرد. لە کاتێکدا بەختیار پارەی دەنارده ئێران [بۆ دارِسانە سەر دەسەڵتی شا]، پارەکە هیچ پەیوەندی بە ناسرەوە نەبوو. ئەمە کورتە چیرۆکێکی ساختە و ئەوکات بۆ میدیاکان هەڵبەسترا. بڕوانە :
Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

[٤٣٧] سەرتیپ ئەردەشیر تاجبەخش سەرۆکی دژەهەواڵگریی سوپای ئێرانی بوو. مەنوچەهر ئەزمونیش وەزیری کار و کاروباری کۆمەڵایەتی بوو.
Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[٤٣٨] ڕەزا ڕادمەنش لە ١٩٤٨ تا ١٩٦٩دا سکرتێری گشتیی حزبی تودە بوو، مەحمود پەناهیانیش وەزیری جەنگی کۆماری ئازربایجانی دەستکردی سۆڤیەتەکان و سەرۆکی بەرەی نیشتمانی نەتەوەی ئێران بوو.

بەختیاردا هەبووە، تەنانەت دوای ئەوەی لە ئێران دەرکراوە و لە تاراوگەشدا ژیاوە. ئەو وەهای دەگوت گوایە:

***کاتێک شـــای ئێران بەختیاری لادا، ســـەدر پەیوەندییەکانی لەگەڵ تاراندا پچڕاند و لە بەرانبەریشـدا سـاواک بریارپیدا پاڵپشـتییە داراییەکانی ڕابگرێ. لەگەڵ ئەوەشـــدا ســـەدر هەرگیز پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ بەختیاردا نەپچڕاند. کاتێک من لە باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروت بوومە هەڵسوڕێنەری کـاروبـاری ئێران، ئەوەبوو تەیمور بەختیـار پێنج جـاران لە مـاوەی نێوان ساڵەکانی ١٩٦٥ تا ١٩٦٧دا هاتبووە لوبنان. هەرچەندە تاران فشاری لەسەر دەکردم کە بەختیار بگرین، منیش داوام لە کاربەدەســـتان کرد خۆبگرن، ئاخر نووسینگەی سکرتاریەتی لە بەیروت بوو، بەحر ئەلعلومیش ئاژانێکی سـاواک بوو... بە ڕەوانی بە فارسـی قسـەی دەکرد، بەحر ئەلعلوم پیاوێکی عێراقی بوو، ڕایەڵەیەکی بەرفرەوانی لەگەڵ چەندین مەلای شـیعەدا هەبوو. هەردووکیان ســەید موســا ســەدر و ســەرهەنگ پاشـائیش بەشـداری کۆبوونەوەکانیان دەکرد... ئێمە بە تەواوی لە وردەکاریی نەخشەی بەختیار و هاوپەیمانەکانی ئاگادار بووین." ٤٣٩***

بەختیار لە ١٩٦٩دا گەیشتە لوبنان، بەڵام بۆ مایەی سەرسامی ئەمجارەیان گیرا. وێرای پێداگیری شا، کەچی ڕادەستی تاران نەکرایەوە و لە کۆتاییشدا لە ٤ی نیسانی ١٩٦٩دا بەیروتی بەجێهێشت. لەبەرئەوە ئێرانیش دەستبەجێ پەیوەندییە دیپلۆماتەکانی لەگەڵ لوبناندا پچڕاند. "شـــا ئەوەندە تووڕە بوو فەرمانی دەرکرد هەموو قەنەفە و کورســـی و ڕایەخەکانی باڵوێزخانەی ئێران لە لوبنان بفرۆشـــن، ئاخر بەگوێرەی شـــا نەدەبوو جارێکی دیکە بگەڕێنەوە ئەوێ."٤٤٠ لە کاتێکدا ڕژێمی مارۆنی بەیروت و سەرۆک (حلو) لە گرژییە دیپلۆماتییەکانی ئێرانی-لوبنانی بەرپرســـیار بوو، کەچی هەرزوو

---

[439] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[٤٤٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ســـاواک ڕەخنەی لە ســـەدر گرت، ئاخر ئەو "تاکەکەســـییانە بۆ ئازادکردنی بەختیار فشاری خستە بەیروت"، هەڵبەتە ئەمەش بەگوێرەی قسەی مەنسور قەدەر بوو.[٤٤١] پێدەچوو سەدر بە نهێنی بەختیاری دیبووبێ. مەنسور قەدەر وەهای گوت:

*کاتێک من وەک باڵوێزی ئێران لە ئوردن دانرام، بەختیار دوو جاری دیکە هاتە بەیروت. مایەی سەرنجراکێشان بوو ئەوکات مەنوچەهر زەلی باڵوێزی ئێران بوو لە لوبنـان، ئەو ئـاگـای لە پەیوەنـدییە بەرباڵوەکـانی ئەو نەبوو، ئاخر ســـاواک لەو شـــتانە ئاگاداری نەکردبووەوە. کاتێکیش بەختیار هاتە لوبنان، ئەو کەوتە حاڵەتی بەرتەک و بێمەبەستانە پرسەکەی بە سیاسـی کـرد. وێـڕای هەوڵ و تەقەلای بـێ مـانـدوبـوونـی بـاڵـوێـز زەلـی و ســـەرمایەگوزارییەکی بێژمـاری تـاران و هەڵرشـــتنی پارەیەکی زۆر بۆ کـاربەدەســـتـانی لوبنـان بە ســـەرۆک و وتەبێژی پەرلەمـان کەمـال ئەلئەســـعەدیشـــەوە، کەچی ســـەدر پارێزەرێکی بۆ دۆزی بەختیار گرت و قەناعەتی بە بەیروت هێنا ئازادی بکەن. بە ئازادکردنی بەختیار، پەیوەندییە نهێنییەکەی سەدر لە گەڵ ئەودا ئاشکرا بوو.[٤٤٢]*

لەگەڵ ئەوەشـــدا ســـەدر هەر هاوکارییەکی لەگەڵ بەختیار لە دژی تاراندا ڕەتکردەوە. ســـەدر مشـــتومڕی لەســـەر ئەوە بوو، کەوا هەرگیز بە پیلانی بەختیار بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی پاشایەتی پەهلەوی قایل نەبووە و دیدارەکەی لەگەڵ بەختیاردا هەر لە بەر پێگە دینییەکەی خۆی بووە لە نێو لوبناندا.[٤٤٣] ســـەدر بۆ مەنوچەهر داودی ڕوونکردەوە، کە ئەو ئێرانی بووە، کەســـێک بووە "وڵاتەکەی خۆی خۆشـــویســـتووە، بەڵام پێدەچێ لەســـەر ئەوەی من ئێرانیم سزا درابم. لە لایەن جەعفەر شەڕەفەددینەوە بە سەرچیخچوونەوە

[٤٤١] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[442] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[443] SAVAK Documents, No. 27 December 1971.

ڕاپۆرت لەســـەر من داروەتە ڕژێمی ئێرانی، گوایە من یەکێک بوومە لەو کەســـانەی لێنەگەڕاون بەختیار ڕادەســـتی ئێران بکرێتەوە.[444] لەگەڵ ئەوەشـــدا هەوڵ و تەقەلای ســـەدر بۆ خۆپاکردنەوە لە چالاکییەکانی دژەشـابوونی بەختیار بەر گوێی کەڕە کەوت و بایەخی پێنەدرا. هەرچەندە پەیوەندییەکانی تەهران-بەیروت لە کۆتاییدا و لە تەمموزی ١٩٧١دا لەگەڵ سەردانی سەرۆکی لوبنان کەمیل شمعون بۆ تاران و دیداری لەگەڵ شادا نوێکرانەوە، کەچی هێشتا ساواک لەسەر سەرزەنشتکردنی سەید موسا سەدر بۆ ئەو پەیوەندییە ژێربەژێرەی لەگەڵ بەختیاردا هەیبوو، نەکەوت.

## شۆڕشگێڕە ئێرانییەکان

بە پێچەوانەی پەیوەندییە تەمومژاوییەکانی لەگەڵ بەختیاردا، پشـــتیوانی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی سەدر بۆ ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی لێکەوتەیەکی زۆر گەورەی لەسەر سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لوبناندا هەبوو. ئاخر بەیروت هەر لە پەنجاکانەوە سەرەپردی سەرەکی ژمارەیەکی بەرفرەوانی لە ڕۆشنبیر و لادەری[445] سیاسیی هەمەڕەنگ بووە. هەبوونی جەنگاوەرانی فەڵەســـتینی لەوێ، ســـەرکەوتنی ســـەدر لە دروســـتکردنی دامودەزگای شـــیعەگەرایی، جوگرافیای تایبەتمەندی لوبنان و ناســـنامەی دەوڵەت و ســـیاســـەتی کراوە، هەر بەلای کەمیەوە گەر ئەم شـــتانە لەگەڵ دەوڵەتەکـانی دیکەی هەرێمەکە بەراورد بکرێن، ئەوا وادەکـا لوبنـان موگناتیسانە ببێتە ڕاکێشەر بۆ چەندین گرووپی ئۆپۆزسیۆنی لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا تـا لق و بـارەگـایـان لە بەیروت بکەنەوە. دوابەدوای کودەتـا هەماهەنگییەکەی ئەمریکا لە ١٩٥٣ و دانانەوەی شـا لەســـەر تەختی تاوس، ئەوا هەڵگەڕاوە و لادەرەکانی دژەشا بە بەرەی نیشتمانیی موسەدیقپەروەر و حزبی تودەی کۆمۆنیســـتیشـــەوە، بەشـێوەیەکی کارایانە ســـەرکوتکران.

---

[444] SAVAK Documents, No. 316, 6 May 1970.

[445] لێرە لادەرم لە بەرانبەر dissidents و (منشق)ی عەرەبی بەکارهێناوە. وەرگێر.

هەردوو لایان، چ هێزی ڕادیکالی دینی بەتایبەتی ئایەتوڵڵا سـەید ڕوحوڵڵا خومەینی و نەهزەتی ئازادیی ئێران (جووڵانەوەی ئازادی ئێران) لە دوای ئـاژاوە و ڕەشـبگیریی حوزەیرانی ١٩٦٣ لە وڵات دەرکران و بوونە تاراوگەنشـین و سـەرکوت کران. باقی مەلا نەریتخوازەکانی دیکە ملکەچ کران و هێنرانەڕیز تا هاوکاربن یان وەک ئایەتوڵڵای گەورە بروجێردی هێڵێکی سـیاسـیی لێگرت. هەرچۆنێک بێ بە ناوەڕاسـتی شـەسـتەکان چەوسـاندنەوە و سـەرکوتکردنی حزبە سـیاسـییە جەماوەرییە کۆنەکان وردەورده کارێکی وەهای کرد، لادەر و هەڵگەڕاوەکانی دوای ئەو ڕادیکال بین و وەک تاکە دەرەتانێک بۆ زیانگەیاندن بە ڕژێمی پەهلەوی دەسـت بۆ چەک ببەن. بە کاریگەری ماوتسی تۆنگ و شۆڕشی شۆڕشگێڕانی جیهانی سـێ لە جەزائیر، کوبا، فەڵەسـتین و ڤێتنام، شـەپۆڵێکی نوێی یاخیبوو و لادەری ئێرانی پەیدابوون، کە زۆربەشـیان لە خوێندکاران بوون. لە هەرە گرنگەکەیان سـازمانی موجاهینی خەلقی ئێرانی ئیسـلامی -چەپگەرا و سازمانی چریکهای فیدائین خەلقی چەپ بوون. هەبوونی بنکە و بارەگاکانی میلیشـیا فەلەستینییەکان لە لوبنان زەمینێکی لەبار و ئاسایشپارێز بوو بۆ نەهزەتی ئـازادیی ئێرانی شـێخ خەرج، موجـاهیـدین و فیـداییەکـان. بە درەنگانێکی شـەسـتەکانیش ئەو چالاکیانە بە چڕی و بەتایبەتی لە لایەن سـاواکەوە چـاودێری دەکران. سـاواک بە شـێوەیەکی تـایبەتمەنـد پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەڕێوبەرایەتی ئاسـایشـی گشـتیی لوبنانی بۆ جڵەوکردنی ئەو گروپە میلیشـیاییە ئێرانییانە بەکاردەهێنا. لەگەڵ ئەوەشـدا، کاتێک سلێمان فرەنجیە لە سالی ١٩٧٠دا گەیشتە سەر دەسەلات، دەزگای ئاسـایشـی لوبنانی لە هێزی لایەنداری سـەر بە شـەهاب پاکسـازی کرا،[٤٤٦] ئینجا دەسەڵاتی هەواڵگریی ئێرانی لە لوبنان سنووردار کرا.

---

[446] Stoakes, Frank. The Supervigilantes: The Lebanese Kataeb Party as a Builder, Surrogate and Defender of the State, (January 1975), Middle Eastem Studies, 11 (1): 220.

بە گەڕانەوەی ڕەگوڕیشـــــە بۆ هـاوکـاریی خوێندکارانی ئیســـــلامی، کە یانەیەکی خوێندکاران بوو لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیەوە دامەزرا و مەبەســـت لێی ڕێگرتن بوو لە بڵاوبوونەوەی و بەرفرەوانبوونی کۆمۆنیزم لە ئێران، بەوەی پێ لەســـــەر توانســـــتی بەیەکەوە گرێدانی ئیســـــلام و هـاوچەرخـایەتیدا بگرن، بزووتنەوەی ئازادیی ئێران لە لایەن ئەندامە لیبرال دینییەکانی نزیک لە بەرەی نیشـــتمانیی دکتۆر موســـەدیق دامەزرا بوو، کە مەهدی بازرگانی یەکەمین سەروەزیری دوای شۆڕشی ئیسلامی، ئایەتوڵڵا ســـــەید محەمەد تاڵەقانی گەورەئاخوند و ڕیفۆرمخوازە ناودارەکە لەگەڵ سیاسی ڕیفۆرمخواز ئەدوڵڵا شـەهابی لە ١٩٦١دا دامەزرا.[٤٤٧] دوای ئەوەی ڕێکخراوی نەهزەتی ئازادی لە ١٩٦٣دا پشـــــتی خۆپیشـــــاندانەکانی گرت، قەدەغە کرا. بە ماوەیەکی کەمیش پاش ئەوە، ئەندامێکی گەنجی ڕێکخراوەکە هۆبەیەکی لە دەرەوە بۆ نەهزەتی ئازادی دامەزراند.[٤٤٨] دوای کۆبوونەوە سەرنەکەوتووکەی لە ئەلجەزائیر، ئەوەبوو مستەفا چەمران، سادق قوتبزادە و ئیبراهیم یەزدی سازمانی مخصوص ئیتحاد و امل (ڕێکخراوی تایبەت بە یەکێتی و کاریان) لە میســـــر لە ١٩٦٤دا دامەزراند.[٤٤٩]دوای دوو ســـــاڵ لە مەشقی سەربازی لە ئەلخاص، مۆڵگەیەکی سەربازی لە دووری ٩٠ کلم لە قاهیرەوە، ڕێکخراوە تایبەتەکە لە ١٩٦٦دا میســـــری بەجێهێشـــــت، ئەمەش

---

[٤٤٧] بەر لە بزووتنەوەی ئـازادیی ئێران، ئەوان لەگەڵ ئـایەتوڵڵا زنجـانی بۆ دامەزرانـدنی ڕێکخراوی ژێرزەمینی بەرگری نیشتمانیی هاوکار بوون.

[٤٤٨] هەموو ئەندامە دامەزرێنەرەکانی ئەم ڕێکخراوەیە لە دوای شـــۆڕشـــی ئیســـلامی بوونە بیچمی دیـار و نـاســـراو. ئیبراهیم یەزدی (دووەمین وەزیری کـاروبـاری درەوە لە پاش شۆڕش)، مستەفا چەمران ساڤیهی (لە دوای شۆڕش بووە یەکەمین وەزیری بەرگری وڵات) و ســـادق قوتبزادەش (بووە وتەبێژی ئیمام خومەینی و بەرپرســـی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی نیشتمانیی ئێران) لە ولاتە یەکگرتووەکان، عەلی شەریعەتیش (بیرمەندی سەرەکی شۆڕشی ئیسـلامی)، عەبدولحوسـێن بەنی سـەدر (یەکەمین سـەرۆکی) لە فەرانسـە و سـەید سـادق تەباتەبائی (ئامۆزای سەید موسا سەدر و جێگری سەروەزیش) لە ئاڵمان.

[449] SAVAK Documents, No.213/16463, 16 October 1977.

بەهۆی سیاسەتی پەرەسەندووی میسری دژەئێران بوو، کە ئاماژەی بە وە دەدا گوایە کەنداوی فارسی نییە بەڵکو کەنداوی عەرەبییە و خوزستانیشیان بە عەرەبەســـتـان دادەنـا. ئینجـا ڕێکخراوەکە بـارگەوبنەی بۆ بەیروت پێچایەوە؛ هەرچۆنێک بێ بەهۆی فشـاری ئێران، هەردووکیان، چ یەزدی و چ چەمران گەڕانەوە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

لەو نێوەشـدا سـەدر داوای لە دۆسـتەکانی، لە مەهدی بازرگان و ئیبراهیم یەزدی کرد،[٤٥٠] بەڵکو بەڕێوەبەرێکی "مولەتەزیم" بۆ پەیمانگای تەکنیکی برج الشـمالی بۆ بدۆزنەوە.[٤٥١] بە گوێرەی قسـەی یەزدی، "سـەدر نەخشـەی بۆ دامەزرانـدنی دوو پڕۆژەی ســـەرەکی هەبوو: پەیمـانگەیەکی تەکنیکی و نەخۆشـــخـانەیەک لە ڕاس بەیروت. منیش پێشـــنیـازم کرد بەرەو نەخۆشـــخانەکە بڕوا؛ هەرچەندە وەها دانرابوو من بچمە نەخۆشـــخانەکە، بەڵام لەبەر کورتهێنـانی بودجەکە، ڕەتمکردەوە بچمە ئەوێ."[٤٥٢] ســـەدر خەریکبوو پەیمانگەیەکی تەکنیکی دابمەزرێنێ، پەیمانگەیەک لە شـــاری برج الشمالی لە باشوور و دەرەوەی شـاری صور، لەوێ هەم مەشقی تەکنیکی و هەم ئایدۆلۆژی بۆ دابین دەکرا. یەزدی ئەمەشـــی بۆ زیادکرد؛ "مەهدی بازرگان و من پێشـــنیازی چەمرانمان بۆ ســـەدر کرد."[٤٥٣] ئینجا مســـتەفا چەمران بۆ دووەمین کەڕەت لە ١٩٧١دا ئەمریکای جێهێشـــت و بۆ لوبنان ڕۆیشـــت. هەرزووش چەمران بووە بیچمێکی ســـەرەکی لە ئۆپۆزســـیۆنی ئێرانی لە لوبنان. مستەفا چەمران وەک "ئەندامێکی پێشووی کۆنفیدراسیۆنی

---

٤٥٠ دۆســـتایەتی ئەوان دەگەڕایەوە بۆ ڕۆژانی زانکۆی تاران، بڕوانە: nterview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

451 Tehran, April 4, 2016. 247Tabatabaie, Mohammad Sadegh, Khaterat-e Siasi Ejtemai [Socio-Political Diary] (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) Vol. II, p. 16.

452 Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

453 Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

خوێندکارانی ئێرانی"[٤٥٤] "پشتیوانی بەرەی نیشتمانی"[٤٥٥] "دەرچووی خوێندنێکی باڵا بوو لە وڵاتە یەکگرتووەکان و بە ڕژێمی ئێرانیش ڕەشبین بوو."[٤٥٦] دوای دەرچوونی لە زانکۆ، هەر زوو وڵاتە یەکگرتووەکانی بەجێهێشت و ڕووی کردبووە کوبا تا مەشقی سەربازی وەربگرێ.[٤٥٧] ئەو پێگەکەی خۆی وەک گەورە توێژەری ستافی زانستی لە تاقیگەی بێل و تاقیگەی جیت پرۆپلژنی ناسا بەجێهێشت تا بچێتە میسر و ڕێکخراوی نەهزەتی ئازادی دابمەزرێنێ. لە میسردا ئەو بە بەرپرسی سەربازییانەی ڕێکخراوەکە دانرا. دوای گەڕانەوەی بۆ ئەمریکا درێژەی بە چالاکییە شۆڕشگێڕییەکانی دا.[٤٥٨] بەگوێرەی ساواکیش بێ، چەمران "کەسێکی زۆر دیندار بوو. لەکاتێکدا هاوڕێکانی پێیانخۆش نەبوو کە ئەو بەم جۆرە دیندارە، ئەو دۆزەکەی لە مەزاجێکی ساردی خوێناوی سەیردا دەبینییەوە."[٤٥٩] مەنسوور قەدەر کەسایەتییە تایبەتمەندییەکەی چەمرانی پشتڕاستدکردەوە: "چەمران کەسێکی هەژار، لەخواترس، بەڕێز، مامۆستا و پاک و زیرەک بوو. ئەو خاکییانە بوو، تەنیا لە دوو هۆدەی بچکۆلانە لە

---

454 SAVAK Documents, No.213/265, 16 July 1975.

455 Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

٤٥٦ چەمران ماستەرنامەی لە زانکۆی تەکساس و دکتۆراشی لە ئەندازیاریی ئەلەکترۆنی پلازمای فیزیکی لە ١٩٦٣دا لە زانکۆی کالیفۆرنیا بێرکلی بەدەستهێنابوو. بڕوانە:
SAVAK Documents, No.222/2158, 16 March 1973.

457 Zabih, Sepehr, Aspects of Terrorism in Iran', (September 1982). Annals of the American Academy of Political and Social Science. International Terrorism (Sage Publications) 463: 84–94.

٤٥٨ چەمران لە سان جۆیس گرووپێکی بە ناوی شیعیزمی سوور بە مەبەستی مەشقی میلیشیایی دامەزراند. هەر ساڵێکیش دوای دامەزراندنەکە، واتە لە ١٩٦٨دا، ئیبراهیم یەزدی و چەمران گرووپێکی دیکەیان دامەزراند بە ناوی ڕێکخراوی هاوکاریی خوێندکارە موسڵمانەکان لە ئەمریکا کە لقیان لە ئەمریکا و فەرانسەدا هەبوو.

459 SAVAK documents, 27 August 1967.

صوردا دەژیا. ئێمە چەندین جار هەوڵماندا وای لێبکەین هاوکاری ئێران بکا و لەسەر دژایەتیکردنی ڕژێم ساردی بکەینەوە". [٤٦٠] وێڕای بەرهەڵستکاری ئەو لە دژی تاران کەچی چەمران "هەرگیز چالاکوانێکی سۆشیالیست-کۆمۆنیست نەبووە." [٤٦١] هەرچەندە بە ئەرنستۆ چی گیڤارا سەرسام بوو، لێ ئەو بیچمێکی دژە کۆمۆنیستی بوو. [٤٦٢] ئەو "هەر بڕوای بەوە هەبوو کە بڕوای پێی هەبوو." [٤٦٣] هەرزووش چەمران بووە دەستە ڕاستی سەید موسا سەدر. پەیوەندی چەمران-سەدر پەیوەندی عاشق و مەعشوق بوو، هەروەک چەمران ناوی لێنابوو "کەسێک لە هەمووان پتر خۆشدەوێ،" و "مانیفێستۆی ئیمام عەلی و جێگرەوەی ئیمام حوسێن." [٤٦٤] هەروەها ئەو بە قووڵی کاری لە سەدر کردبوو. [٤٦٥] لە پەیمانگا تەکنیکییەکەدا، ڕێگەیەکی داهێنراویان بۆ مەشقپێدانی کۆمەڵگەی شیعی پەیڕەو کرد. ئەوان لەهەر گوند و شارێکی شیعەنشیندا دوو خوێندکاریان لێهەڵدەبژارد و فێریان دەکردن، ئینجا دەیانگەڕاندنەوە زێدی خۆیان بۆ چاککردنی جڤاکەکانیان. [٤٦٦] مەنسور قەدەر ئەوەی گوت گوایە چەمران پەیوەندی لەگەڵ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاراندا هەبووە! هەر بۆیە سەرکۆنەی دەکرد بەوەی "ئەمریکییەکان بۆ ئامانجە شۆڕشگێرییانەکەی خۆی لە ئێران

---

460 Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

٤٦١ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

462 SAVAK documents, 27 August 1967.

463 Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

464 Tabatabaie, Mohammad Sadegh, Khaterat-e Siasi Ejtemai [Socio-Political Diary] (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) vol. II, pp. 83–84.

465 SAVAK Documents, No.5489, 29 July 1974.

466 Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

دەقۆزێتەوە."[٤٦٧] هەروەها ســـاواک ئەوەیشـــی دەگوت، گوایە هەر چەمران پەیوەندی "کاربەدەســتە دەرەکییەکانی بۆ ســەدر پەیدا کردووە."[٤٦٨] لە پاش شۆڕشــی ئێرانیش، چەمران لەنێو شــۆڕشــگێڕە دیندارەکاندا بووە هێمایەکی ســـەرەکی شـــەهیدبوون، ئەو کەســـەی بۆ خەباتکردن لە دژی شـــا و ئیمپریالیزم دەســـتبەرداری کارنامە ئەکادیمی و پێگە بالاکەی بوو لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا.

وەنەبێ چەمران بە تەنیا بیچمی لایەنگریی ســەدر بێ لەنێو شــۆڕشــگێڕە ئێرانییەکان. بەگوێرەی قســەی مەنسور قەدەر بێ، سادق قوتبزادە ســەدری بە ولاتە ئەورووپییەکان ناســاند و گرێدا.[٤٦٩] گوایە ئەو پەیوەندییەی ســـەدر لەگەڵ ئەوروپییەکان لە ڕێی قوتبزادەوە پەیدایکردبوو، بە لای ســـاواکەوە بووبووە مایەی هەڕەشـــە.[٤٧٠] ســاواک هەر لە بەراییەوە چاودێری بەســەر پەیوەندییەکانی سەدر بە قوتبزادوە کردبوو.[٤٧١] هەروەک ساواک گوتبووی، گوایە ســەدر لە ڕێی قوتبزادەوە ئەو باڵەخانە چوارنهۆمییەی ســەر جادەی کەنەدی لە پاریس کڕیبوو، تا کۆمەڵەی هاوکاریی ئیســلامی لێ دابمەزرێنێ و قوتبزادەش لە نهۆمی چوارەمیدا دەژیا.[٤٧٢] قوتبزادە هەروەک چەمران

---

[467] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[468] SAVAK Documents, No.849, 25 August 1977.

[469] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

[470] SAVAK Documents, No.213/479, 15 January 194

[471] SAVAK Documents, No.21/3916, 22 December 1971; SAVAK Documents, No. 30 September 1971.

[٤٧٢] مەنســـور قەدەر ئەوەی گوت گوایە قوتبزادە و ســـەدر دڵشـــاد و دەم بەخەندە بوون. هەروەها ئەو ســـەدریشـــی بەو تۆمەتبار دەکرد گوایا دەرمانی بێهۆشـــکەری دەخوارد و شەرابیشی دەخواردەوە. بڕوانە؛

Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

دەستکورت نەبوو.[٤٧٣] قەدەر ئەوەشی گوت گوایە: سەرباری دۆستایەتیە درێژخایەنییەکەی لەگەڵ قوتبزادەدا، کەچی چەمران ڕوانینێکی نەرێیانەی لەبارەی ئاهەنگە خۆشەکانی قوتبزادەوە هەبوو."[٤٧٤] تارانیش سکاڵای لە سەدر هەبوو سەبارەت بەوەی چەندین جار پشتی قوتبزادەی گرتووە،[٤٧٥] بەڵام هەموو داوایەکی لەم جۆرە بەر گوێی کەڕە کەوتن. لەکاتێک سەدر قوتبزادەی بە کەسێکی "میانڕەو و ئاوەزمەند" دەبینی،[٤٧٦] کەچی ساواک ئەوی بە "لایەنگری کۆمۆنستی،" "ئیسلامیکی کۆمۆنیستی" و "یەکێک لە سەرکردەکانی بەرەی نیشتمانی" دەبینی، کە چالاکی تێکدەرانە لە دژی تاران بەڕێوەدەبا.[٤٧٧] لە ڕاستیشدا سەدر کارئاسانی بۆ پەیوەندییەکانی لادەرە هەڵگەڕاوە ئێرانییەکان و دیمەشق دەکرد.[٤٧٨] بە ڕوانینی ساواک سەدر لە هەوڵی ئەوەدا بوو ئۆپۆزسیۆنە ئێرانییەکان لە دژی شا یەک بخا.[٤٧٩]

بە جووڵانی چەمران بۆ لوبنان، شەپۆلێک لە دژایەتی شا لەنێو گەنجە ئێرانییەکاندا ڕێگەی خۆیان بۆ لوبنان دۆزییەوە. پەنجەی تاوانبارییش بۆ

473 Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for IranianHistory.

474 Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

475 SAVAK Documents, No.213/479, 15 January 1974; SAVAK Documents, No. 5636–5637, 24 November 1974; SAVAK Documents, No. 9, 10 November 1976; SAVAK Documents, No. 134/3583, 10 November 1976; SAVAK Documents, No. 170/033- 3/1068, 7 May 1977; SAVAK Documents, No. 213/16463, 16 October 1977.

476 SAVAK Documents, No.6335, 12 December 1973.

477 SAVAK Documents, No.213/54013, 6 April 1974; SAVAK Documents, No.2219/8, 1 March 1976.

٤٧٨ سادق قوتبزادە یارمەتی لە سورییەکان وەردەگرت.

479 Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

سەدر درێژ دەکرا، بەوەی پەیوەندی بە خوێندکارانی بەرەی نیشتمانییەوە هەیە، هەروەک چۆن هەمان پەیوەندی بە گرووپە میلیشیاییەکانی ئیسلامییە چەپەکانی موجاهیدین و فیداییە مارکسی لینینییەکانەوە هەیە. ئەو رێکخراوەی لە لایەن شەش ئەندامی پێشووی بزووتنەوەی ئازادی ئێران لە ٥ی ئەیلوولی ١٩٦٥ەوە دامەزرا،[٤٨٠] موجاهیدیش بە خەستی کەوتبووە بن کاریگەری مەهدی بازرگان و تاڵەقانی و بەتایبەتیش عەلی شەریعەتی بیرمەندی سەرەکی شۆڕشی ئیسلامی. فیداییەکانیش لە لایەن ئەندامی پێشووی بەرەی نیشتمانی بیژەن جازانی و خوێندکارە لاوە مارکسییەکانی دیکەوە لە بەرایی شەستەکانەوە دامەزرا.[٤٨١] هەرچەندە ئەو دوو گرووپە دوور بوون لە خۆتێکەڵکردن لە سیاسەتی لوبنانی، لێ هەردوو گرووپەکە گومانیان لە سەدر هەبوو، ئەویش لەبەر هۆکاری سەرەکی کە دۆستایەتییەکی باشیان لەگەڵ جەنگاوەرە رادیکاڵە فەلەستینییەکان هەبوو. بەزۆری فیداییەکان لە ئۆردوگای میلیشیای فەتح لە ئوردنەوە ڕاهێنایان پێدەکرا ئینجا لە لوبنان لەلایەن بەرەی میللی ڕزگاریخوازی فەلەستینی جۆرج حەبەش[٤٨٢] و بەرەی میللیی ڕزگاریخواز بە سەرۆکایەتی ئەحمەد جبریلەوە. لەپاڵ ئەمەشدا بەرە بەرە فیداییەکان هەڵوێستی دژە دیمەشقیان وەرگرت، بەتایبەتیش کاتێک مەحمود زێدان (ئەبو عەباس) لە گرووپەکەی جبریل جیابووەوە. ویڕای جیاوازی ئایدیۆلۆژییان، کەچی موجاهدینی خەلق هەمان هەڵوێستی فیدائییەکانیان دەرهەق بە سەدر هەبوو. دوابەدوای ١٩٦٣، موجاهیدەکان بۆ یەکەم جار لە ڕێی دوبەی و ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبییەوە خەریکی پەیوەندی بوون لەگەڵ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی

[٤٨٠] لەنێویاندا محەمەد حەنەفیزادە، سەید موحسین و عەلی ئەسعەر بادیزادەگان بوون.

[٤٨١] لەنێویاندا حەسەن زیا زەریفی، ئەمیر ئەمیر پەرویز پاویان، مەسعود ئەحمەدزادە، حامید ئەشرەف و میفتاحی بوون. بە فەرمی فیداییەکان لە ٨ی شوباتی ١٩٧١دا جاری هەبوونی خۆیا دا، ئەوکاتەی جەنگاوەرانی فیدایی ناسەرکەوتووانە هێرشیان کردە سەر بنکەی سەربازیی ئێرانی لە سیاهـ کال لە باکووری ئێران.

[482] SAVAK Documents, No. 213/869, 7 March 1978; 25 February 1978.

فەلەستینییەوە.[483] لە سۆنگەی ئەم پەیوەندییەوە، لە تەمموزی ١٩٧٠ەوە چەندین ئەندامی موجاهیدین ئێرانیان بەجێهێشت و ڕوویان لە بنکە و بارەگاکانی ڕێکخراوی فەتح لە لوبنان و ئوردن کرد. لە کەسە سەرەکییەکانیشیان مەسعود ڕەجەوی، ئەو کەسەی لە ١٩٧٨دا لقێکی غەیرە مارکسی-لینینی لەنێو موجاهیدیندا ژیاندەوە. ئیدی هەرزوو بەیروت بووە سەرەپرد بۆ لقی دەرەوەی موجاهیدین لە دیمەشق، عەدەن، بەغدا، پاریس، لەندەن و تەرابلوسی لیبیا. کاتێکیش پەیوەندیی سەدر لەگەڵ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی تێکچوو، موجاهیدینەکان کەوتنە ڕەخنەگرتن لە ئەو و لە چەمران. لەوێدا هیچ گرێدانێک لەنێوان سەدر و میلیشیا ئێرانییەکاندا نەبوو.

سەرباری مەیلی ئایدیۆلۆژیای چەپگەرایی فیداییەکان و موجاهیدین و گرژییان لەگەڵ سەدردا، کەچی ساواک هێشتا پێی لەسەر ئەوە دادەگرت گوایە سەدر ژێربەژێر پەیوەندی بە گرووپە چەکدارە ئێرانییەکانەوە هەیە. لە کاتێکدا موجاهیدینەکان بە شێوەیەکی سەرەکی لە لایەن پارتی سۆشیالیستی پێشکەوتنخوازی کەمال جونبلاتەوە پشتگیرییان لێدەکرا، کەچی ساواک هەر سەرزەنشتی سەدری دەکرد بەوەی کۆمەکی داراییان دەکا. مەنسور قەدەر وەهای گوت گوایە؛

***"یەکەمین شت کە سەدر کردی پەیوەندی پەیداکردنی نێوان گرووپە فەلەستینییەکان و شەریعەتمەداری بوو. سەید موسا سەدر داوای کۆمەکی دارایی بۆ شیعە و خۆبەخشەکانی ڕزگاریخوازە فەلەستینییەکان کرد. هەرچەندە پارەکەش بۆ موجاهیدینی ئێرانی بوو، ئەوانەی لە لایەن فەلەستینییەکانەوە مەشقیان پێدرابوو. بڕە پارەیەکی یەکجار زۆر، بڕی پێنج ملیۆن دۆلار لەژێر ناوی کۆمەک بۆ شیعە لانەوازەکانی باشووری لوبنان و خۆبەخشانی ڕزگاریخوازی فەلەستین دراوەتە دەستی سەید***

---

483 Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK (January,1997) Middle Eastern Studies 33 (1): 78.

***موسـا سـەدر. من نازانم ئاخۆ شـەریعەتمەداری زانیویەتی پارەکە بۆ موجاهیدینەکان بووە یان نا. ئیدی لەوێ پارەکە لەبری ئەوەی بدرێتە خەڵکی شیعە، بەسەر گرووپە فەلەستینییەکان و موجاهیدینەکان دابەشکرا. بەڕێوەبەری هەرەگەورەی کارەشکەش بە دڵنیاییەوە سەدر بوو".[484]***

هەورەها سـاواک بڕوای وەهابوو، کە لیبیاش لە ڕێی سـەدرەوە کۆمەکی موجاهیدینەکانی کردووە.[485] وێڕای حاشـاکردنی سـەدر لەم شـتە، کەچی سـاواک لەسـەر تۆمەتبارکردنی سـەدر نەوەسـتا بەوەی **بە "مامۆتک"ی گرووپە ئۆپۆزسیۆنەکانی ئێرانی دابنێ.**

سـەربـاری بزووتنەوەی ئـازادیی ئێران، موجـاهیـدین و فیـداییەکـان و شـوێنکەوتووانی سـەید ڕوحوڵلا خومەینی لە کۆتایی شـەسـتەکانەوە لە لوبنان چالاک بوون. ئایەتوڵلا خومەینی وتار و دوانی دژی شـا هەبوو، ئەوی وەک کەسێکی "داماو" ناونابوو، هەروەها خۆپیشاندانە خوێناوییەکانی ٥ی حوزەیرانی ١٩٦٣ بووە مایەی سـەرهەڵدانی هێزی مەلا شـیعەکان، **سـەدریش ڕۆڵێکی کلیلئاسـای بۆ ڕزگارکردنی گیانی ئایەتوڵلا بینی و لە مەرگی ڕزگارکرد.** ساڵێک دوای ئەو ڕووداوەش، لە ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٤دا، ئـایەتوڵلا خومەینی ڕەخنەی لە شـا گرت بەوەی پـارێزبەندی دیپلۆماسـی داوەتە کەسـە سـەربازییەکانی ئەمریکا لە ئێران. **ئەم جارەیان خومەینی لە وڵات دەرکرا، سـەرەتا بۆ بورسـای تورکیا پاشـان بۆ نەجەف لە عێراق دوورخرایەوە، ئیدی ١٤ سـاڵی ژیانی دواتری لەوێ بەسـەر برد. هەر کەمێک دوای ئەوەی ئایەتوڵلا خومەینی گەیشـتە نەجەف، سـەدر کە خومەینی بە "ئیمـامی هەرەگەورە" دەبینی، یەکەمین دیـداری بۆ لەگەڵ گۆڤارێکی بیانی ڕێکخسـت. لوسـین جۆرجی هەواڵنێری لیمۆندی فەرەنسـی لەسـەر دەسـتی سـەدر بووبووە موسـڵمان، ئەوەبوو بە یاوەری قوتبزادە**

[484] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[485] SAVAK Documents, No. 1013, 9 March 1974.

**چووە عێراق و دیدارەکەی لەگەڵ خومەینی ساز دا.**[486] **لەبەرانبەریشدا، ئایەتوڵڵا خومەینی پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ سەدردا هەبوو، پێدەچوو سەدری بە جێگرەوەی خۆی دانابێ.**[487] بە گوێرەی قسەی یەزدی بێ، ئایەتوڵڵا خومەینی زۆر ڕێزی سەدری دەگرت.[488] بە پێچەوانەشەوە سەید حوسێن نەسر ئاماژەی بە گرژیی لەنێوان خومەینی و سەدردا دا. "سەدر پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ [ئایەتوڵڵا] خومەینیدا نەبوو. لەبری ئەوەدا ئەو زۆر لە [ئایەتوڵڵا] خوئی، [ئایەتوڵڵا] خونساری، عەلامە تەباتەبائی و [ئایەتوڵڵا] شەریعەتمەدارییەوە نزیک بوو."[489]

دوابەدوای تاراوگەنشینی، پەیوەندییەکانی خومەینی لەگەڵ سەدر لە لایەن ساواکەوە سووسە دەکران. بە ڕوانینی ساواک، پەیوەندییەکانی سەدر-خومەینی ئیسلامیزمی شیعەی برەوپێدەدا، سیاسەتی ناوخۆیی و سیاسەتی ئێرانی لە عێراق و ڕۆژهەڵاتدا دەشڵەژاند بەوەی شیعە لە دژی شادا بوروژێنن. باڵوێز مەنسور قەدەریش بە پێلێهەڵبرینەوە باسی ڕۆڵی سەدری کرد کاتی گوتی؛ "**تەنانەت خومەینیش لەلایەن سەدرەوە ڕابەرایەتی دەکرا. خۆی ئەوە سەدر بوو بیرمەندی ڕاستەقینەی پشت خومەینی بوو.**"[490] هەر بەڕاستیش چەندین توخم لە پەیوەندی نێوان سەدر و خومەینیدا مایەی گومان بوون. ئەم گومانانەش زیادیان کرد کاتێ سەدر لە ٦ی نیسانی ١٩٦٨دا صوری بەجێهێشت و بەرەو نەجەف ڕۆیشت تا سەردانی خومەینی بکا.[491] ساواک لەو بڕوایەدا بوو، کە خوێندکارە ئێرانییەکان لە ئەڵمان (وەک

---

[486] Interview of Ayatullah Khumayni with the Correspondent of Le Monde, Lucien Ge (Liberation Movement of Iran, 1978).

[487] SAVAK Documents, No. (62).

[488] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

[489] Interview with Seyyed Hossein Nasr, 24 February, 2017.

[490] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

[491] SAVAK Documents, No. 537, 28 April 1968.

ســــادق تەباتەبائی کە ئامۆزای ســــەدر بوو) هەروەک چۆن ڕۆژنامە و گۆڤاری لایەنگریی بەرەی نیشــــتمانیی وەک باختاری ئەمرۆ (ڕۆژئاوای ئەمرۆ) و خەبەرنامە جبهە میلی (هەواڵنامەی بەرەی میللی) زەمینەســــازی ئەو پەیوەندییانەن.[٤٩٢] بەگوێرەی ســــاواک بێ، یەزدی، چەمران و قوتبزادە بەرپرســــبوون لە پەیوەندی دروســــتکردنی نێوان خومەینی و ســــەدر.[٤٩٣] ئەحمەدی کوڕە بچووکی خومەینی [بە نوێنەرایەتی باوکی} چەندین جار چووەتە بەیروت و ســــەدری بینیوە. لە هەندێک لەو دیدارانەدا، ســــادق قوتبزادە، چەمران و من لەوێ بووین تا پەیوەندیی نێوانیان ڕێکبخەین،" یەزدی ڕۆڵی خۆی لە زەمینەســــازی پەیوەندی نێوان ســــەدر و خومەینی پشتڕاستکردەوە.[٤٩٤]

بە پەرەســەندنی ســتراتیژی ســەرکوتکردنی شــیعە بۆ لاوازکردنی ئەگەری دەســتڕۆیشــتنی شــیعەی عێراق، پاڵ بە مەلا گەورەکانی شــیعەوە نرا بەڵکو عێراق بەجێبێڵن و ڕووبکەنە لوبنان. لە گەرمەی بەزۆردەرکردنی ژمارەیەک لە ئێرانی و عێراقییە بەرەچەڵەک ئێرانییەکان لە عێراق، خومەینی لەلایەن ســــەدرەوە بانگهێشــــت کرا، بەڵکو بۆ لوبنان باربکا. هەرچەندە بانگهێشتنامەکەی بە ڕێزەوە ڕەتکرایەوە، لێ سەدر تێکۆشا ناوبژی لەنێوان بەغدا و ئایەتوڵلا شــیعەکاندا بکا. قەدەر گوتی گوایە "ســەید موســا ســەدر پەیامێکی بۆ خومەینی ناردوە. ســاواک لە ڕێی ســکرتاریەتی بەختیارەوە چاودێری نامەکەی کرد. لە نامەکەدا هاتبوو، ســــەدر داوای لە خومەینی کردبوو هۆشــداری بداتە ڕایەدارانی بەغدا کەوا دەرکردنی شــیعە لە عێراق دەبێتە مایەی پشــتڕاســتکردنەوەی هەڵوێســتی ئێران بۆ پشــتگیریکردنی

---

[492] AVAK Documents, No. 315/7480, 9 August 1968; SAVAK Documents, No. 315/115606, 8 March 1969.

[493] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[494] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

شـــیعەی عێراق."[٤٩٥] **هەرچەندە خومەینی عێراقی بەجێنەهێشـــت و بڕیاری دابوو لە نەجەف بمێنێتەوە، لێ هەندێک لە شـــاگردەکانی عێراقیان بەرەو باشووری لوبنان جێهێلا.** بە تێپەڕبوونی کاتیش توخمگەلی خومەینیپەروەر، پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ســـەدردا لاواز کرد. هەر بەڕاســـتیش هەبوونی ئۆپۆزسـیۆنی ئێرانی نەوەک هەر بەتەنیا پشـتیوانی ئێرانی بۆ شـیعەکانی لوبنان شـــل و خاوکردەوە، بەڵکو گرژیی نێوان ســـەدر و شـــۆڕشـــگێرە ئێرانییەکانیشی تاودا. **گەشتەکەی سەدر بۆ تاران، دوا مێخ بوو لە دارەبازی پەیوەندییەکانی ئەو و توخمگەلی سەربە خومەینی درا.**

## گەشتێکی بە مقۆمقۆ

هێشـــتا ســـەدر لە ســـەرەتای حەفتاکاندا لەبارەی قەناعەتپێهێنانی تاران گەشـبین بوو، بەڵکو بە سیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی خۆیدا بچێتەوە. ســـەدر پێیوابوو بە ئاوابوونی خۆری دەســـەلات و هەژموونی میســـر لە هەرێمەکەدا، ئەوا پەرەســـەندنی دەســـەلاتی هەرێمـایەتی ئێران دەکرێ بەرژەوەندییەکانی شیعە لە باشووری لوبنان بپارێزێ. بە گوێرەی ساواک، ســـەدر "ســـیاســـەتوانێکی ڕۆشـــنبیر، زیرەک و وریا و خۆپارێز بوو، کە سەرکەوتووانە سەرکردە کریستیانەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو، بووبووە دەمڕاســـت و مەزنی کۆمەڵگەی شـــیعە. ئەو خەســـڵەتی مەلایانەی وەک مجێزبەرزیی و دیماگۆگیی هەبوو... ئەو هەوڵیدەدا لە ئێران نزیک ببێتەوە، تا نمایشـــی خۆی لە لوبنان باشـــتر بکا، هەربۆیە ئەو هیچ شـــتێکی لە دژی جەنابی خاوەنشـــکۆدا نەکردووە!"[٤٩٦] لە دیدارەکەی لەگەڵ ســـەید حوســـێن ناسری سەرۆکی کۆلیژی ئەدەبیات لە زانکۆی تاران و فەیلەسوفی گەورەی ئێران، ســـەدر داوای لێکرد بەڵکو بە شـــا ڕابگەیەنێ کە پەلامارێکی نوێی

---

[495] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[496] SAVAK Documents, No. 213/1940, 8 November 1972.

ئیسـرائیل بۆ سـەر باشـووری لوبنان نزیکە. تکای لە شـا کرد بەڵکو پشتگیری ئێران بەدەستبێنێ، ئاخر شا "دەیتوانی لە ڕێی کۆشکی سپییەوە فشـار بخاتە سـەر ئیسـرائیل بەڵکو هێرشـەکەی سـەر لوبنان ڕابگرێ."[٤٩٧] هەرچەنـدە داواکەی ئەو بەر گوێی کەڕە کەوت، کەچی هێشـتا تـاران نەیدەویست بە تەواوی دەستبەرداری سەدر ببێ. هەر بۆیە داوای سەدر لە ڕوکنەدین ئاشتیانی، باڵوێزی ئێران لە لوبنان[٤٩٨] بۆ بوژاندنەوەی پەیوەندی دۆسـتانە لەگەڵ تاران پێشـوازی لێکرا. دیاربوو ئاشـتیانیی باڵوێز بۆ کارکردنە سەر سەرکردەی شیعە، ئاسانکاری بۆ گەشتەکەی تاران بۆ کرد و ئەوەشـی ڕێکخست بەڵکو لەوێ چاوی بە شـا بکەوێ. بەگوێرەی قسـەی یەزدی بێ، "سـەدر مەیلی لێ نەبوو سـەردانی شـا بکا، ئاخر پاشـای ئێران ناوبانگێکی خراپی هەبوو. بە پێچەوانەوە، ئەوە شا بوو مەیلی لەسەر ئەوە بوو پەیوەندییەکی دۆسـتانە لەگەڵ سـەرکردەیەکی دینی شـیعەی وەک سـەدری هەبێ."[٤٩٩] هەرکەمێک بەر لە گەشـتی سـەدر بۆ ئێران، سـاواک وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ڕاسـپارد بەڵکو داوا لە گەورە مەلاکانی حەوزەی قوم بکا، بانگهێشتی سەدر بۆ ئەوێ بکەن.[٥٠٠] ئەوەش هەنگاوێکی تاران بوو بۆ زیاترکردنی نمایشـی سـەدر وەک سـەرکردەیەکی دینی لە هەرێمەکە، هەروەها بۆ ئەوەی دیدارەکەی لەگەڵ شـا دا بکەنە شتێکی زۆر جەوهەری. بە بانگهێشتنامەی ئایەتوڵڵا شەریعەتمەداری، ئەوەبوو سەدر لە ٢٦ی تشـرینی دووەمی ١٩٧١ لە بەیروتەوە بەرەو تـاران فڕی. لە ١٨ی

[497] SAVAK Documents, No. 4 March 1970.

[٤٩٨] ئاشتیانی خزمی سەدر بوو. ئەو لە مەلاکانی خوراسـان بوو. مەنسور قەدەر گوتی گوایە ئاشـتیانی دەرفەتەکەی قۆزیوەتەوە بەڵکو دیدارێک لە نێوان شـا و یەکێ لە خزمەکانی ڕێک بخا. ئاشتیانی ڕۆڵێکی سەرەکی بینی لەوەی قەناعەت بە شا بکا تا سەدر ببینێ. بڕوانە: Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[499] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

[500] SAVAK Documents, No. 212/17101, 27 April 1971; SAVAK Documents, No. 312/1233, 17 May 1971.

دیســـیمبەردا لە تاران چاوی بە هویدای ســـەرۆکوەزیر و خەلیل ئەلخەلیلی باڵوێزی لوبنان لە تاران کەوت. ئەو "بارودۆخی نالەباری سیاسیی شیعەی لە لوبنان" بە هوەیدا ڕاگەیاند. ســەدر داوای پێشــووی خۆی بۆ پشــتگیری دووپاتەکردەوە و جەختی لەســـەر ئەوە کردەوە کە هەموو شـــیعە بە شـــیعەکانی لوبنانیشـــەوە" ڕێزی شـــا دەگرن و وەک ســـەرکردەیان سەیریدەکەن." بە دەربڕینی وڵاتپارێزی، پاشخانی ئێرانییانەی و دڵسۆزیی بۆ شا، سەدر لەسەر گرژییەکانی ئەو دوایەی لەگەڵ تاران بەهۆی چالاکی "هەندێ ئەفســـەری پلەنزم" لە لوبنان داخ و حەســـرەتی خۆی دەربڕی. لە دواییدا ســـەدر پێشـــنیازی بۆ هوەیدا کرد، کە ئێران دەکرێ کاریگەری زیاتری لەناو لوبنان و لە نێو کۆمەڵگەی شـــیعەی ئەوێدا هەبێ، ئەویش بە دامەزراندنی زانکۆیەک و نەخۆشـــخانەیەک بۆ شـــیعە.[501] لە دیدارەکەشـــی لەگەڵ پاشای پەهلەویدا، سەدر هەمان داوی خۆی دووبارەکردەوە. **(شا)ش پەســـەندی کرد و بەڵێنی پێکەوەنانی ٣٠ ملیۆن دۆلاری بۆ دامەزراندنی زانکۆیەک و نەخۆشـــخانەیەک و فەتواخانەیە (دار الفتوی) بۆ کۆمەڵگەی شـــیعەی لوبنان دا.[502] بە پشـــتگیری هوەیدا و ڕێپێدانی پەرلەمانەوە بڕی پارەکە پەســـەند کرا، کە لە ڕێی کۆمەڵەی شـــێروخورشـــیدی ســـووری ئێرانییەوە بـدرێ.[503] ئەوەش تەکـانێکی گەورە بوو لە بـاشـــبوونەوەی پەیوەندییەکانی سەدر- تاران.**

**لەوێدا هۆکاری دیکەش لەپشــت دیدارەکەی ســـەدر لەگەڵ شـــا دا هەبوون. هەر کەمێک دوای ئەوەی ســـەدر گەیشـــتە تاران، هەندێ بیچمی ڕابەرایەتی**

---

[501] SAVAK Documents, No. h/15–264(s)-49, 18 December 1971.

[502] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[503] ئەعلەم ڕاوێژی بە حکومەت دا، کە لەڕێی کۆمەڵەی شـــێروخورشـــیدەوە پارەکە ڕادەستبکرێ.

Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK, Middle Eastern Studies, vol. 33, No. 1 (January, 1997). p. 81.

**ئۆپۆزسیۆن، لە نێویاندا مەهدی بازرگان، مورتەزا موتتەهیری، سەید محەمەد حوسەینی بەهەشتی و ئایەتوڵڵا یەدوڵڵا شەهابی داوایان لە سەدر کرد بەڵکو وا لە شا بکا حوکمی لەسێدارەدانی سەرکردە دامەزرێنەرەکانی موجاهیدین هەڵبوەشێنێتەوە.**[٥٠٤] بە گوێرەی قسەی حوججەتی کرمانی بێ، "لەو دانیشتنەی لە ماڵی بەهەشتیدا بوو، ئەوان داوایان لە سەدر کرد شا ببینێ، بەڵکو سەرکردە دامەزرێنەرەکانی شیعە لەسێدارە نەدا. بەهەشتی پێی لەسەر داواکەی داگرت... هەر چەند شەوێکیش دوای ئەوە، عەباس مەسعودی پرسیاری لە سەدر کرد ئاخۆ شا دەبینێ. سەید موسا سەدریش وەڵامی دایەوە هێشتا بڕیاری خۆی نەداوە."[٥٠٥] ئەوان پێیانوابوو خاتری سەدر لە لای شا هەیە و دەکرێ قەناعەتی پێبێنێ بە فەرمانەکانیدا بچێتەوە. **هەندێ لە ماڵباتی زیندانییە سیاسییەکانیش وەک عەلی ئەکبەر هاشمی ڕەفسەنجانی داوایان لە سەدر کرد قەناعەت بە شا بهێنێ، بەڵکو شۆڕشگێڕەکان ئازاد بکا.**[٥٠٦] هەرچەندە سەدر مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو کەوا هەرگیز شا، دەسەڵاتدارەکەی پەهلەوی بە خۆتێهەڵقورتاندنەکەی ئەو قایل نابێ، لێ کۆمێنتەکەی ئەو بەر گوێی کەڕە کەوت. بەگوێرەی قسەی یەزدی بێ، "سەدر مەیلی لەسەر دیدارەکەی لەگەڵ شادا نەبوو. ئەو، ئەو دیدارەی هەر بۆ ئەوە کرد، بەڵکو بەر بە لەسێدارەدانی موجاهیدینەکان بگرێ."[٥٠٧] ئەعلەم بە خۆی بانگی سەدر و سەید ڕەزای برای سەدری کرد

---

[٥٠٤] ئەوانیش محەمەد حەنەفینەژاد، عەلی ئەسغەر بادزادەگان، سەعید موحسین، عەلی بەکری و ناسر سادق بوون. بڕوانە:

also http://www.mashreghnews.ir/fa/news/459203/.

[505] KhosrowShahi, Seyyed Hadi, Yad-Nameh Emam Musa Sadr [Imam Musa Sadr's Memoirs], 1387, pp. 384–5.

[506] SAVAK Documents, No. (66).

[٥٠٧] یەزدی بە ڕاستی ئاماژەی بەوە داوە کە زۆرینەی مەلا و دیندارەکانی شیعەی بەشێک لە کۆمەڵگەی ئێرانی لە دژی لەسێدارەدانی موجاهیدینەکان بوون. ئەو پێی گوتم؛ تەنانەت ئایەتوڵڵا محەلاتیش ڕایگەیاندبوو کە ڕێ لە لەسێدەرانی دامەزرێنەرانی موجاهیدین بگیرێ، هەرچەندە بەتەواویش لەگەڵ ڕوانینیان هاوڕانەبوو. لەوەش گرنگتر ، تاڵەقانی و بازرگان

تا شا ببینن.[٥٠٨] لە ٢٩ی شوباتی ١٩٧٢دا سەدر چاوی بە ئەعلەم، وەزیری دەربار کەوت تابزانێ ئاخۆ شا بە داواکەی قایل بووە. پاشان ئەو لە دیدارەکەی لەگەڵ شادا داواکەی خۆی دووبارە کردەوە. **هەرچەندە شا لە بەراییدا بەڵێنی ئەوەی دا زیندانییەکان لەسێدارە نەدا، لێ ئەو هەرگیز بەڵێنەکەی خۆی بەجێنەهێنا.[٥٠٩] دامەزرێنەرانی موجاهیدین لە ٢٤ی ئایاری ١٩٧٢ لەسێدارە دران.**

جێگەی تەوس و سەرسوڕمانیشە، ڕکابەرەکانی سەدر لە حەوزەی قوم هەروەک شۆڕشگێڕە ڕادیکالەکانی لە ئێران و لوبنان سەدریان بە بەکرێگیراوێکی شا تاوانبارکرد.[٥١٠] عەلی ئەکبەر موحتەشەمپوری شاگردە گەورەکەی خومەینی و وەزیری کاروباری ناوخۆ لە دوای شۆڕشی ئیسلامی گوتی کە دیداری سەدر لەگەڵ شادا "خاڵێ وەرچەرخانی پەیوەندییەکانمان بوو لەگەڵ سەید موسا سەدردا." ئەوە ئەوەشی خستەسەر:

*ئێمە لە دژی شا دەجەنگاین. زۆر لە مەلاکان خۆیان لە سەردانکردنی شا بەدوور دەگرت، بەڵام ئەم پیاوە چاوی بە شا کەوت. پیاوێک، کە چەندین سەرکردەی عەرەبی بینیبوون و لە نێو عەرەبدا ناودار بوو، چاوی بە شا*

قسەیان لەگەڵ شا حوسێنی ئوردن کردبوو، بەڵکو لە گەشتی داهاتووی بۆ تاران شا لە بڕیاری لەسێدارەدانی موجاهیدینەکان پەشیمان بکاتەوە." بڕوانە:
Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

[508] Sadr, Seyyed Mohammad, Enghelab va Diplomacy dar Khaterat-e Seyyed Mohammad Sadr [Revolution and Diplomacy in Seyyed Mohammad Sadr's Memories], Soureh Mehr publication, pp. 36–8. See also http://khateemam.Com/1392/12/25/4/4216.html/ . 305Tabatabaie, Mohammad Sadegh, Khaterat-e Siasi Ejtemai [Socio-Political Diary], Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388, vol. 1, p. 211.

[509] Tabatabaie, Mohammad Sadegh, Khaterat-e Siasi Ejtemai [Socio-Political Diary], Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388, vol. 1, p. 211.

[510] SAVAK Documents, No. (67).

*کەوت. پاشــــان ئەوەی گوت گوایە مەهدی بازرگان و شــــەهابی تکایان لێکردووە بەڵکو شا ببینێ. بەڵام من گومانم هەیە، کە سەدر هەرلەبەر داوا پشتراستنەکراوەکەی بازرگان شای بینیبێ. لەجیاتی ئەوە، من لەوە دڵنیام کە سەید موسا سەدر خۆی مەیلی لەسەر بووە شا ببینێ.*"[511]

سەید حامد ڕوحانی (زیارەتی)، شۆڕشگێڕێکی دیکەی خومەینیپەروەر،[512] لەســــەر دیدارەکەی لەگەڵ شــــادا ڕەخنەی لە ســــەدر گرت، وەها دوا کە "پەیوەندی ســــەدر بە ڕژێمی پەهلەوی هەر بە دیتنی شــــاوە ســــنووردار نەبووە، بەڵکو لەوەش پتر ئەو پەیوەندی لەگەڵ کاربەدەستە ئێرانییەکان لە لوبنان و دەربار لە تاران هەبوو. دیاربوو دایکی شــــاش ســــەدری بینیبێ. پەیوەندییە نزیکییەکەی ســــەدر لەگەڵ دیکتاتۆرانی هەرێمەکە وێنەکەی لەبەردەم ڕزگارکەران (ئێرانییەکان) شــــێواندبوو."[513] دیدارەکەی ســــەدر لەگەڵ شادا وێنەکەی ئەوی لەنێو شۆڕشگێڕە ڕادیکالە ئێرانییەکان شێواند. ســـەدر بە عەلی داقانی توێژەری ســـەرەکی لێکۆڵینەوەی ئیســـلامی گوتبوو: "جەنابی داقانی، ئێمە دوو کێشەمان لێرە [لە لوبنان] هەن. کاتێک کە دەچینە ئێران، هەندێ لە ڕکابەرەکانمان بە سیخوڕی شا ناومان دەهێنن. کاتێکیش لێرەین [ئەو] ئێرانییانە بە لایەنگری ناسر و سوننەکانمان لە قەڵەم دەدەن. باشــــە ئێمە چیبکەین؟ هیچ کامێک لەوانە ئێمەیان خۆش ناوێ".[514] ئەمە زەبرێکی کوشــــندە بوو بۆ ئەو، هەرچەندە هەرگیز ســــەدر تووڕەیی خۆی دەرنەبڕی. بەگوێرەی قســــەی حوججەتی کرمانی بێ، "کاتێک لەبارەی ئەو

---

[511] Interview with Ali-Akbar Mohtashamipour, Tehran, February 2016.

[512] دامەزرێنەر و سەرۆکی پێشووی مەکۆی بەڵگەنامەی شۆڕشی ئیسلامی.

[513] See http:// tarikhirani.ir/ Modules/News/Phtml/ News.PrintVersion. Html. Php ?TypeId = 4&NewsId=1649.

[514] http://www.mashreghnews.ir/fa/news/459203.

ڕەتکردنەوانەم لێپرسی، ئەو بە خەندەوە پێیگوتم: "خوا دەزانێ بۆچی شام بینی." ئەو بەسینگفراوانییەوە ئەو پرسەی بەلاوەنا."[٥١٥]

سەرباری شۆڕشگێڕە ڕادیکالە ئێرانییەکان، گەشتەکەی سەدر بۆ تاران لە لایەن ناحەزە هەرێمییەکانی شاشەوە ڕەخنەباران کرا، بەتایبەتی لە بەغدا. سەرهەنگ وەلید محەمەد سیراتی پاشکۆ لە باڵوێزخانەی عێراق لە بەیروت سەدری بە بەکرێگیراوی شا لەقەڵەمدا، گوایە لەوکاتەدا سەردانی تارانی کردووە کە ئێران بە نارەوا هەرسێ دوورگە کێشەلەسەرەکانی کەنداوی فارسی داگیرکردوون.[٥١٦] لەسەرووی هەمووشیانەوە، دەنگۆیەک لە بەیروت بڵاوبوویەوە، کە گەشتەکەی سەدر نەخشەیەک بووە تا قەناعەت بە شا بهێنێ بەڵکو دەستوەربداتە کاروباری هەڵبژاردنی لوبنانی بۆ ئەوەی پشتگیری خۆی و کەمیل شەمعونی پێبکا.[٥١٧] وێڕای ئەو هەموو دەنگۆیانە ڕەزامەندبوونی شا لەسەر کۆمەکی دارایی بۆ جڤاتی شیعە وای لە سەدر کرد پەیوەندییەکان بەکراوی بهێڵێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەفسەرێکی ساواک بەتەنیا پەیوەندییەکانی ئێرانی لەگەڵ جڤاتی شیعە لە لوبناندا پچڕاند.

### مەیدانبازیی[٥١٨] قەدەر لەگەڵ سەدردا

پەیوەندییە گرژییەکەی سەدر لەگەڵ مەنسور قەدەر کاری کردە سەر ڕەوتی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لوبنان. لەپاش نۆژەنکردنەوەی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانی تاران-بەیروت، ئاشتیانی کرایە باڵوێزی ئێران لە لوبنان. هەردووکیان، هەم ئاشتیانی و هەم جێگرەکەی

---

515 Khosrowshahi, Seyyed Hadi, Yad-Nameh Emam Musa Sadr [Imam Musa Sadr's Memoirs] 1387, pp. 384–5.

516 SAVAK Documents, No. 212/4412, 18 December 1971.

517 SAVAK Documents, No. 212/4965, 6 February 1972.

٥١٨ وشەی (مەیدانبازی)یم لە بەرانبەر وشەی *Duel*ی ئینگلیزی و *(مبارزة)ی عەرەبی بەکارهێناوە. وەرگێر.*

بەناوی لاڤانی پاشـــخانێکی دینییان هەبوو، کە سـەرکەوتووانە ڕایەڵەی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ شــیعەی لوبناندا ژیاندەوە. لەپاڵ ئەمەشــدا، ناووڕومەتی ســـەدر لە لوبنان هێشـــتا هەر لە لووتکەدا بوو. بەگوێرەی ســاواک بێ، ســـەدر "تەونێکی پەیوەندی خانەوادەیی چڕی دینی لە ئێران هەبوو."[519] کەمێک بەر لە گەشـتەکەی سـەدر بۆ ئەورووپا، سـاواک ڕێنمایی دایە وەزارەتی کـاروبـاری دەرەوە، هـاوزەمـان نوێنەری خۆی بۆ وڵاتـانی ئەورووپا بنێرێ. کاربەدەستانی ساواک گوتیان بەم کارە هەم نمایشی سەدر باڵاتر دەبێ و هەم پابەندبوونیش بە ئێرانەوە قووڵتر دەبێتەوە.[520] لەگەڵ ئەوەشـــدا کاتێ ئەم کەســـایەتیانە گۆڕدران و مەنســـور قەدەر جێگەیانی گرتەوە، قۆنـاغێکی نوێ لە پەیوەنـدی ئێرانی بە شـــیعەی لوبنـانەوە سەریهەڵدا. بەهۆی پاشخانە دیپلۆماتیی و ئاسایشیەکەی، ئەوەبوو قەدەر لە ئابی ١٩٧٣دا هەم وەک باڵوێزی ئێران لە بەیروت هەم وەک بەرپرســـی وێستگەی ساواک دانرا. قەدەر بەخۆی ئەوەی گوت گوایە، تاران پێویستی بە ئەزموونی ئەو بۆ هەڵســـووڕاندنی کاروبـاری باڵوێزخـانەی بەیروت هەبوو، ئاخر "ڕەوشــی ســیاســی لە ئوردن هێوربووبووە، بەڵام کۆمەڵگەی لوبنانی لەســەر لێواری گرژییەکی قووڵ بوو. کەواتە شـا فەرمانی کرد من لەبەر ئەزموونەکەم لە ڕەوشـــی ئوردن بنێرێتە لوبنان.[521] قەدەر بە عەقڵی

[519] SAVAK Documents, No. 213/1940, 8 November 1972.

[520] SAVAK Documents, No. 3266, 11 August 1972.

[521] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

پیلانگێڕانەی خۆی،[٥٢٢] هەر زوو باڵوێزخانەکە لە ڕکابەرەکانی پاککردەوە.[٥٢٣] وەک هەنگاوی داهاتووشـی، ئەو سـەرەتا بە نیازی چاودێریکردن بەسـەر لادەرە ئێرانییەکان لە سەدر نزیکبووەوە. قەدەر فشاری خستە سەر سەدر تا ببێتە ئاژانی ئەو، لەبری ئەوەی وەک مەلایەکی ڕێزلێگیراوی شـیعە یان سـەرکردەیەکی دەسـترۆیشـتویی لوبنانی ڕەفتاری لەگەڵدا بکا. سـەدریش

[٥٢٢] قەدەر وەهای گوت گوایە؛ "کاتێک من بە باڵوێزی ئێران لە بەیروت دیاریکرام، حکومەتی لوبنانی هۆشـــداری دایە تاران، بەڵکو دام نەنێن. ڕۆژنامەی لوبنانی هەڵمەتێکی لە دژی من جاڕ دا، ئاخر من ئەندامی هێزی ئاسـایشـی سـوپا بووم. ئەوان بە شـایان گوتبوو کە هێزی ئاسـایشـپارێزی لوبنان لەوانەیە نەتوانێ ڕێ لە لەناوبردنی قەدەر بگرێ. (شـا)ش بە توندی وەڵامی دانەوە و گوتی: 'خۆ ئەگەر ئێوە نەتوانن ئاسـایشـی باڵوێزەکەمان بپارێزن، کەواتە پێمان بڵێن کە هیچ باڵوێزێک بۆ ئەوێ نەنێرین. بەدەر لەوە قەدەر تاکە بەربژێری ئێمەیە بۆ باڵوێزخانەمان لەوێ.' هەر کەمێکیش بەر لەچوونم بۆ ئەوێ، وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران پێیگوتم: 'قەدەر، ئەرێ تۆ دڵنیایت لەوەی بچیتە ئەوێ؟ تۆ دەچیتە شانەی زەرگەتەوە.' منیش بەرسـڤم دایەوە، بەڵێ گەورەم من دەمەوەی ئەوە بکەم کە جەنابی خاوەنشـکۆ لێم دەخوازێ." بڕوانە:

Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[٥٢٣] دیاربوو قەدەر کودەتایەکی بەسـەر باڵوێز ئاشـتیانیدا کردبێ بەوەی تاوانباری کردبوو گوایە پەیوەندی بە وەزیری کاروباری دەرەوە حوسـێن فاتیمی، ڕاوێژکاری نزیک لە موسـەدیقی سـەرۆوەزیری پێشوو هەبووە (موسـەدیق لە خێڵی ئاشـتیانی لەدایک بووە دەگوترێ سـی ڕۆژ بەر لە کودەتاکەی ١٩٥٣ زەنگی بۆ موسـەدیق لێداوە ئاگاداری کردۆتەوە، کە ناسـری لەڕێیە بۆ لای پاشـا بۆنەنامەی لادانی ئەویشی پێیە؛ بڕوانە:

Dr. M. Mosaddegh (H. Katouzian, ed.) and Mosaddegh's Memoirs (London, 1988), p. 69).

هەروەها قەدەر بە پشتیوانی ژەنەراڵ ناسری بەرەی لەژێر پێی سـەرهەنگ عەباس شـەقاقی بەرپرسـی وێستگەی ساواک لە بەیروت دەرهێناوە. ناسری بەرپرسی ساواک هەر لەوکاتەی لەگەڵ شـەقاقی لە گاردی پاشـایەتی لە ١٩٥٣دا بەیەکەوە کاریان کردووە ڕقی لێبووەتەوە. دەگوترێ شـەقاقی ڕۆڵی لە ڕاگرتن و دوورخسـتنەوەی تەیمور بەختیار لە ئێران بینیوە. لە کۆتاییشـدا قەدەر کەسـەکانی نێو باڵوێزخانەی ئێرانی لە لوبنان گۆڕیە وەک کیبار. بڕوانە:

Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK, Middle Eastern Studies, vol. 33, No. 1 (January, 1997), p. 81.

وێڕای پێویستی بە پشتگیری تاران، کەچی ڕێککەوتنەکەی لەگەڵ قەدەردا ڕەتکردەوە. سەدر دوابەدوای پەرەسەندنی گرژی لە لوبنان و قووڵبوونەوەی دوژمنایەتی لەگەڵ جەنگاوەرە فەلەستینییەکان و شیعەی زوعەما، بڕوای وەهابوو، کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە دەزگایەکی ئاسایشپارێزی دەرەکی دەکرێ ناو و نمایشی سەرمایەی سۆشیال سیاسییەکەی بنکۆڵ بکا. ئیبراهیم یەزدی ڕوونیکردەوە؛ "قەدەر وای ڕەچاودەکرد سەدر بەدوای ئەو بکەوێ، بەلام سەدر بەشانوشکۆ بوو، ڕەتیکردەوە وەها بکا."[٥٢٤] بە ڕەتکردنەوەی سەدر بۆ پێشنیازی هاوکاریکردنی قەدەر لەدژی بەرهەڵستکارە ئێرانییەکاندا، ئەوەبوو قەدەر سەدری وەک کێشەیەکی سەرەکی بۆ ئێران لەقەڵەم دا. قەدەر گوتی گوایە: "دوای دیتنی پاتراریک مەعوشی سەرۆکی دینی مارۆنییەکان و حەسەن خالید، چاوم بە سەدریش کەوت. من دەمزانی کە پیلانگێڕیی موسا سەدر لەپشت ئەو هەموو هەراوزەنایەی دژی ئێران و دژی من بوو. سەدریش دەیزانی کە ئەوە من بووم پەیوەندییەکانی بەختیارم لە بەیروت ئاشکراکردوون."[٥٢٥]

لەوەش خراپتر بەڕێوە بوو. پەسەندنامەی شا بۆ پشتگیریی دارایی شیعەی لوبنان دەکرا پەیوەندییەکانی سەدر-تاران جۆشبداتەوە. هەرچەندە ئەمە بۆ قەدەر هەرەشەیەک بوو، ئیدی ئەو زۆر ماندونەناسانە هەوڵی ئەوەی دەدا کاریگەریی خۆی لە لوبنان بەرفرەوانتر بکا. کاتێک هەواڵی پەسەندنامەی شا بەرگوێی قەدەر کەوت، هەوڵیدا ڕەوتی پێواژۆی کۆمەکە داراییەکە بگۆڕێ و پارەکە لە ڕێی وەزارەتی کاروباری دەرەوە و پاشان لە ڕێی باڵوێزخانەی ئێران لە لوبنانەوە بەڕێ بکا. هەرچۆنێک بێ شا ئەم پلانەی ڕەتکردەوە. تادەهاتیش ڕق و کینەی قەدەر لە سەدر زێدەتر دەبوو. لەگەڵ

---

[524] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016

[525] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

تێپەڕینی کات و لە کۆتاییدا ئەو توانی سیاسـەتی تاران دەرهەق بە سـەدر وەرگێڕێ. هەرچەندە لە بەراییدا شـــا فەرمانی دەرکرد کۆمەکە داراییەکە بدرێتە سـەدر، لێ کۆمیتەیەک لە سـاواک، وەزارەتی کاروباری دەرەوە و وەزارەتی پەروەردە و خوێنـدن لە ١٥ی ئـازاری ١٩٧٢دا کۆبوونەوە و بیرۆکەی دامەزرانـدنی زانکۆیەکیـان لە لوبنـان ڕەتکردەوە. هوەیـداش لە بەرانبەردا (٣٠) کورسـی خوێندنی بۆ خوێنداکارانی شیعەی لوبنان تەرخان کرد. هەرچی لەبـارەی نەخۆشـــخـانەکەش بوو، کۆمیتەکە بڕیـاڕیـدا نۆڕینگەیەکی بچکۆلە لەبری نەخۆشـخانەیەکی گەورە لە صـور دروسـت بکا.[٥٢٦] کاتێکیش سـەدر لەم بڕیارانە ئاگادارکرایەوە و باڵوێزخانەی ئێرانی بە "درۆزن" لەقەڵەم دا و ئەوەی گوت کە "ئەوان [باڵوێزخانەی ئێران] هیچ کورسـیـیەکی خوێندن نادەنە هیچ کەس مەگەر تایبەتمەند نەبێ (یەکێک ڕایەڵەیەکی لەگەڵ تاراندا نەبێ)."[٥٢٧]

بە پێچەوانەشەوە قەدەر حاشایی لە ڕۆڵی خۆی بۆ ئەو ڕێنماییانە کرد، ئەو وەهای گوت گوایە:

*سەدر پەیوەندییەکی ژێربەژێری لەگەڵ قەزافیدا هەیە. پێشتر قەزافی داوای لە سەدر کرد بەڵکو مزگەوتێک لە میونیخ بکاتەوە. سەدر لە ١٩٧٢دا پەسنی قەزافی دا و لەبری ئەوە لە میونیخ شـــای ڕەخنەباران کرد. یەکێک لە ئاژانەکانی ساواک دوانەکەی سەدری تۆمارکردبوو، ئینجا بە شا ڕاگەیەنرا. (شـــا)ش کە بە خزمایەتی بنەماڵەیی ئاشـتیانی لەگەڵ سـەدردا دەزانی، دەسـتبەجێ ئاشتتیانی لەسـەر کار لادا و منی لەجێگەی ئەو کردە باڵوێزی ئێران لە بەیروت... کەمێک بەرلەوەی تـاران بۆ بەیروت بەجێبێڵم، شـــا پێیگوتم: "پێشتر فەرمانم بە تەرخانکردنی ٢٠ ملیۆن دۆلار بۆ سەدر دابوو. تۆ بە سـەدر مەڵێ کە ئێمە ئەو پارەیەی نادەینێ، لەبری ئەوە یاری لەگەڵدا*

526 SAVAK Documents, No. 16 March 1972.

527 SAVAK Documents, No. 6095, 6 February 1975.

*بکە." لی سەدر پێیوابوو من بوومەتە بەربەستی ئەم ڕێکارە. هەر بۆیە ئەو نەخشەی لەناوبردنی منی دانا." ٥٢٨*

گێڕانەوەی قەدەر هەڵە بوو. ئاخر بە گوێرەی ئیحسان نەراقی، نووسەری ئێرانی و ڕاوێژکاری پێشووی فەرەحی شابانو، ئەوە خۆی قەدەر بوو قەناعەتی بە تاران هێنا کە سیاسەتی خۆی دەرهەق بە سەدر بگۆڕێ. "سەدر پێیگوتم، کە قەدەر پەیوەندی نێوان شیعەی لوبنان و تاران پچڕاند." ئەو تێبینی کردبوو، قەول وابوو شا لە ڕووی داراییەوە پشتی سەدر بگرێ بۆ ئەوەی نەخۆشخانەیەک بۆ شیعەکانی لوبنان دروست بکا. نەراقی گوتی؛ "ئیمام سەدر بە خۆی بە منی گوت، ئەو قسەی لەگەڵ شا کردبوو."

***"ئیمام گوتی کە "من بە شام گوت کە عەرەب [ڕژێمەکانی هەرێمەکە] پشتگیریی سوننەی لوبنان دەکەن لەکاتێکدا ئەورووپی و ئەمریکییەکانیش پشتی مارۆنەکان دەگرن، لە سەرێکی دیکەوە شیعە نەیانتوانیوە پشتیوانێک [ی دەرەکی] بدۆزنەوە. لە وەڵامدا شا دڵنیای کردمەوە، هەموو شتێک دەکا کە من بمەوێ. داواملێکرد نەخۆشخانەیەک بۆ شیعە دروست بکا. دەکرێ دواتریش دامەزراندنی زانکۆیەکی پزیشکی بۆ شیعە دابمەزرێ و ئینجا زانکۆ سەرەکییەکە. شا قایل بوو بەڵام قەدەر تاکلایەنە نەخشەکەی گۆڕی. لە بەرانبەریشدا هەوڵیدا لەبری نەخۆشخانەکە چەند نۆڕینگەیەکی بچووک دروست بکا. مکوڕیش بوو لەسەر ئەوەی ناوی شایان لەسەردا دابنێ. سەدر لە دژی ئەو پلانە وەستایەوە و مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو، کە هیچ پشتیوانییەکی دەرەکی بەو شێوازە دابین ناکرێ. قەدەریش ئەم شتەی لە دژی سەدر قۆستەوە و لەبەرچاوی شای خست." ٥٢٩***

---

[528] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[529] Fars News Agency. Interview with Ehsan Naraghi, http://www.farsnews.com/ newstext.php?nn=8711240772.

گێرانەوەکەی نەراقی لە لایەن سـەید هادی خوسـرۆشـاهیشـەوە دووپات کرایەوە. مایەی سـەرنجراکێشـانە، هەردووکیان، هەم کەمال ئەلئەسـعەد و جەعفەرە شـەرەفەددین لەسـەر پەکەوتنی کۆمەکی شـا بۆ شـیعەی لوبنان سەرکۆنەی سەدریان کرد.[٥٣٠]

کشـانەوەی ئێران لە پشـتگیریی سـەدر دەرفەتێکی بە ڕووسـەکان دا پشـتگیری نەخشـەکانی بکەن. لە ١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٢دا، شـێخ زیائەدین باباخانۆڤی موفتی تاشـقەند لە ناوەڕاسـتی ئاسـیا بانگهێشـتی سەدری کرد تا سەردانی یەکێتیی سۆڤیەت بکا. دوای گەشتەکەی بۆ ئەوێ، کە بۆ شیعە گەشتێکی "ناوازە" و "مایەی تێڕامان" بوو.[٥٣١] سۆڤیەت بەڵێنی ١٥ ملیۆن لیرەی بە سەدر دا تا نەخۆشخانەیەک دروست بکا. کاتێک لێیان پرسـی لەوانەیە ئەم سـەردانەی دەوڵەتەکانی دیکە، نەخاسـمە ئێران تووڕە بکا، سـەدریش وەڵامی دایەوە کەوا ئەو پێشـتر داوای لە ئێران کردووە بەڵکو نەخۆشـخانەیەک دروسـت بکەن، بەڵام ڕایەدارانی ئێران تەنیا قایل بوون چەند نۆڕینگەیەک دروسـت بکەن.[٥٣٢] ئیدی گەشـتەکەی سـەدر بۆ سـۆڤیەت پاسـاوی دایە دەسـت قەدەر تا سـەدر بە توخمێکی بەهێزی پیلانگێڕی ڕووسـی لە ڕۆژهەڵاتدا دابنێ. بە بڕوای سـاواک پشـتگیریی سۆڤیەت بۆ سەدر دەبێتە مایەی ئەوەی پێگەیەکی ستراتیژی لە باشووری لوبنان بداتێ.[٥٣٣] لە کۆتاییشدا سەدر پشتگیرییەکەی مۆسکۆی ڕەتکردەوە. بەگوێرەی قسـەی یەزدی بێ، "قەول وابوو ڕووسـەکان بڕی ٤٠ ملیۆن دۆلار بدەنە شیعە تا نەخۆشخانەیەک لە (ڕاس بیروت) دروست بکا. کەچی

---

530 See http:// tarikhirani.ir/ Modules/News/ Phtml/News. PrintVersion. Html.php?Lang =fa&TypeId=4&NewsId=924.

531 SAVAK Documents, No. 212/509, 24 November 1972.

532 SAVAK Documents No. 213/2491, 26 December 1972.

533 SAVAK Documents, No. 213/54013, 6 April 1974.

ســـــەدر دوودڵ بوو لەوەی ئەو بەخشـــــندەییەی ئەوان وەربگرێ.[٥٣٤] ئاخر سەدر نەیدەویست دۆخەکە لەگەڵ تاران گرژتر بکا.

ســـــەرباری نامرادبوونی، کەچی ســـــەدر هەوڵی خۆی دا بەڵکو ئێران بە هەڵوێســـــتی خۆی لە بەرانبەر شـــــیعەدا بچێتەوە. ئەو ئاماژەی بەوە دا؛ پەیوەندییەکانی ئەو لەگەڵ تاران لە ســـــەردەمی باڵوێزایەتی باڵوێز شارستانیدا لەوپەڕەی گەشەی خۆیدا بووە، کەچی لەوەتەی قەدەر هاتووە، ڕەوشەکە شێواوە. ئەو ئەوەشی خستەسەر کە، "باڵوێزە نوێیەکە [قەدەر] لێیدەویســـــتم ببمە ئاژانێکی ئەو و ئینجا کۆنترۆڵی هەموو دانیشـــــتن و وتووێژەکانم بکا." لە دیدارێک لەگەڵ محەمەد عەنانی نووســـــەری ئەلحیات دا، گەفی ئەوەی کرد ڕاشـــــکاوانە جاڕی ئەوە دەدا کە ئێران دوژمنایەتی شـــــیعەی لوبنان دەکا و دانانی باڵوێزە نوێیەکەش تەنیا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە دژی شیعە.[٥٣٥] سەدر ئەوەی گوت کە قەدەر پیاوێکی دژوارە و هەر بەدوای شکستی شیعەی لوبناندا دەگەڕێ، ئاخر ئەو بڕوای وایە کە دەبێ جڵەوی تەواوی کاروباری شیعە لەدەستی ئەودا بێ. ئەو مشتومڕی لەسەر ئەوە دەکرد، کە گۆڕینی ئاشتیانی بە قەدەر، دیپلۆماسییەتی ئێرانی بۆ چالاکییەکی هەواڵگریی و دەزگایەکی ئاســـــایشـــــی گۆڕی، بەمەش بەرژەوەندییەکانی ئێرانی لە لوبنان خســـــتۆتە بەر مەترســـــی.[٥٣٦] ســـــەرباری هەوڵ و تەقەلاکانی، کەچی ســـــەدر لەوەدا ســـــەرنەکەوت تاران دەرهەق شیعەی لوبنان بە سیاسەتەکەی خۆیدا بچێتەوە. قەدەری باڵوێز، کارایانە وێنەی ئەوی شێواند.

---

534 Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

535 SAVAK Documents, No. 213/479, 15 January 1974.

536 SAVAK Documents, No. 213/2395, 26 January 1974.

# bibLiography

## *Archival CollectionsIran*

Markaz-e Amouzesh va Pajooheshhay-e Beynolmelali-e Vezarat-e Omour-e
Kharejeh [Center of International Research and Education of the Ministry of
Foreign Affairs]
Markaz-e Asnad-Enghelab-e Eslami [Islamic Revolution Document Center]
Sazman-e asnad va Ketabkhane Melli-e Jomouhori Eslami [National Library and
Archives of Islamic Republic of Iran]
*Published Government Documents*
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Aval, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol I, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Dovom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol II, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Sevom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol III, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Hezb-e Democrat-e Kurdestan-e Araq be Ravayet-e SAVAK [Iraqi Kurdistan
Democratic Party according to SAVAK]
Ravabet-e Iran va Araq be Ravayat-e SAVAK [Iran-Iraq Relations According to
SAVAK]
*United States of America*
US National Archives and Records Administration (NARAI), College Park,
Maryland
Central Intelligence Agency Records Search Tool (Crest)
General Records of the Department of State, Record Group 59 (RG59)
Central Foreign Policy Files (CFP), 1967–69

Central Foreign Policy Files (CFP), 1973–76, Access to Archival Databases
(AAD) Available at: http://aad.archives.gov/aad/
Records Relating to Iran, 1965–1975, LOT 77D400
Richard M. Nixon Presidential Library (RMNL), Yorba Linda, California.
Available at: https://www.nixonlibrary.gov/
Gerald R. Ford Presidential Library (GRFL), Ann Arbor, Michigan.
Available at:
https://www.fordlibrarymuseum.gov/collections-digital.aspx

Published Government Documents
United States Congress, House Select Committee on Intelligence, CIA: The Pike
Report. With an Introduction by Philip Agee, (Nottingham, England:
Spokesman Books, 1977).
Keesing's Record of World Events (formerly Keesing's Contemporary Archives),
Volume XVII, February 1970 Iraq.
Congressional Record
Foreign Relations of the United States (FRUS) (Washington, DC: US Government
Printing Office)
1964–1968
XXI: Near East Region; Arabian Peninsula (2000)
XXII: Iran (1999)
1969–1976
I: Foundations of Foreign Policy, 1969–1972 (2003)
XI: South Asia Crisis, 1971 (2005)
XXIV: Middle East Region and Arabian Peninsula, 1969–1972
XXVII: Iran; Iraq, 1973–1976 (2012)
XXXVIII: Foundations of Foreign Policy, 1973–1976 (2012)
E-3: Documents on Global Issues, 1973–1976 (2000)
E-4: Documents on Iran and Iraq, 1969–1972 (2006)
Public Papers of the Presidents: Gerald R. Ford, 1976–77, Book III. Washington,
DC: US Government Printing Office, 1979.
Online Document Collections

National Security Archive, George Washington University (NSA-GWU),
Washington, DC
Digital National Security Archive (DNSA). Available: http://nsarchive.
chadwyck.com/
Electronic Briefing Book (EBB) 265. Available at: http://www2.gwu.
edu/~nsarchiv/NSAEBB265/
Henry Kissinger Telephone Transcript (State-Kissinger), U.S. Department of State
Electronic Reading Room. Available at: http://foia.state.gov/Search/
Collections.aspx
Israel State Archives, On-Line Collection: Prime Minister Golda Meir and the
Shah of Iran in 1972. Available at: http://www.archive.gov.il/ArchiveGov/
pirsumyginzach/TeudaBareshet/GoldShah/
Special Collection: A Life in Intelligence—The Richard Helms Collections (CIAHelms), US Central Intelligence Agency Electronic Reading Room. Available at: http://www.foia.cia.gov/collection/life-intelligence-richard-helms-collection

Author's Interviews
Ali Akbar Mohtashampour
Seyyed Hossein Nasr
Ebrahim Yazdi
Published Interviews
Foundation for Iranian Studies Oral History Collection (FISOHC)
General Mansur Qadar
Harold Saunders
Harvard Iranian Oral History Project (HIOHP)
Colonel Isa Pejman
Books
Abdulghani, Jasim M., *Iraq and Iran: The Years of Crisis* (The Johns Hopkins
University Press, October 1, 1984).
Ajami, Fuad, *The Vanished Imam: Musa al-Sadr and the Shia of Lebanon* (Cornell

University Press, 1986).
Alam, Assadollah, *Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani* [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. I: 1347–1348/1968–1969 (Bethesda, MD: Iranbook, 1993).
Alam, Assadollah, *Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani* [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995a).
Alam, Assadollah. *Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani* [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995b).
Al-Samarrai, Wafiq, *Hottam al-Bawabat al-Sharqi [The Destruction of the Eastern Gate]*. translated in Farsi. (Markaz Asnad va Tahghighat-e Defa-e Moghaddas).
Bonnin, Richard, *Arrows of the Night: Ahmed Chalabi and the Selling of the Iraq War* (Anchor; Reprint edition, November 13, 2012).
Harris, G. S., Ethnic Conflict and the Kurds. (1977). *Annals of the American Academy of Political and Social Science*, 433 (1).
Kissinger, Henry, *Years of Renewal* (New York: Simon & Schuster, 1999).
Khosrowshahi, Seyyed Hadi, *Yad-Nameh Emam Musa Sadr [Imam Musa Sadr's Memoirs]* Moaseseh Farhangi-Tahghoghati-e Emam Musa Sadr, Tehran, 1387).
Kramer, Martin, *Shi'ism, Resistance, and Revolution*, ed. Martin Kramer (Boulder, CO: Westview Press, 1987).

Lawrence, Quil, Invisible Nation: How the Kurds' Quest for Statehood Is Shaping Iraq and the Middle East (Walker Books, July 7, 2009).
Masira al-Imam al-Seyyed Msa al-Sadr [Seyyed Musa Sadr's Journey], Vol III, Second Edition.

McDowall, David, A Modern History of the Kurds (London: I.B. Tauris, 2007 ed).
Mohtashamipour, Ali-Akbar, Khaterat-e Siasi [Political Diaries] (Kahneh-e
Andisheh-e Javan) Vol I.
Mohtashamipour, Ali-Akbar, Khaterat-e Siasi [Political Diaries], (Kahneh-e
Andisheh-e Javan) Vol II.
Nasr, Vali, The Shia Revival: How Conflicts within Islam Will Shape the Future
(W. W. Norton & Company, April 17, 2007).
Norton, Augustus R., Amal and The Shia: Struggle for the Soul of Lebanon (Austin,
TX: 1987).
Offiler, US Foreign Policy and the Modernization of Iran: Kennedy, Johnson, Nixon
and the Shah (Palgrave Macmillan, UK, 2015).
O'balance, Edgar, The Kurdish Revolt, 1961–1970 (London: Faber and Faber Ltd.,
1973).
Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the U.S.
(Yale University Press, 2007).
Primakov, Yevgeny, Russia and the Arabs: Behind the scenes in the Middle East from
the Cold War to the Present (New York: Basic Books, 2009).
Qaneifard, Erfan, Pas az Shast Sal: Zendegi va Khaterat-e Jalal Talabani [After
Sixty Years: The Life and Memories of Jalal Talabani] (Elm Publication, Tehran,
October 2011).
Qaneifard, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A
Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011).
Ramazani, Rouhollah K., The Persian Gulf: Iran's Role (University Press of Virginia, 1972).
Randal, Jonathan, After Such Knowledge, What Forgiveness? My Encounters with
Kurdistan (London: Westview Press, 1999).
Sadr, Seyyed Mohammad, Enghelab va Diplomacy dar Khaterat-e

Seyyed
Mohammad Sadr [Revolution and Diplomacy in Seyyed Mohammad Sadr's
Memories] (Soureh Mehr publication).
Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK. (January
1997). Middle Eastern Studies, 33 (1).
Sayigh, Yezid, Turning Defeat into Opportunity: The Palestinian Guerrillas After
the June 1967 War. (Spring 1992). Middle East Journal, 46 (2).
Stoakes, F., The Supervigilantes: The Lebanese Kataeb Party as a Builder, Surrogate
and Defender of the State. (January 1975). Middle Eastern Studies, 11 (1).

Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai [Social Diaries], Vol. 1
(Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388).
Tripp, Charles, A History of Iraq (Cambridge University Press, 2010).
Zabih, Sepehr, Aspects of Terrorism in Iran. (September 1982). Annals of the
American Academy of Political and Social Science. International Terrorism
(Sage Publications) 463: 84–94.

# بەندی ٧

## هەرەس: سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە ١٩٧٣-١٩٧٧

لەو قۆناغەدا بەتەواوی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە هەردووکیان، لە کوردستانی عێراق و لە لوبناندا گۆڕا. کاتێک شەڕەکە لە سەر حیسابی کوردی عێراق و ئەگەری زیاتربوونی بەشداری ڕاستەوخۆی ئێرانی هێنایەگۆڕی، ئیدی شا بەسەر ئەمریکا و ئیسرائیلە هاوپەیمانەکانی بازیدا و پشتگیرییەکەی بۆ بارزانی ڕاگرت. لە ڕێککەوتننامەی ١٩٧٥ی جەزائیردا، عێراق لەسەر ئەروەند ڕود بۆ ئێران سازشی کرد، لە بەرانبەریشدا ئێران پشتگیرییەکەی بۆ کوردان ڕاگرت. بەرگری پێشمەرگەی کوردیش، کە تا دەهات پشتی بە سوپای ئێران دەبەست، هەر زوو داڕما.

لەو نێوەشدا مەنسور قەدەری باڵوێز و ساواک لە کۆتاییدا قەناعەتی بە شا هێنا سیاسەتی خۆی لەبارەی شیعەی لوبنانەوە وەربچەرخێنێ. شەڕی ناوەخۆی لوبنان لە ١٩٧٥دا پێگەی سەید موسا سەدری لاواز کرد و کەلێنی نێوان کۆمەڵگەی شیعە و لایەنە لوبنانییەکانی دیکە، ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی و ڕژێمە عەرەبییەکانی قووڵ و بەرفرەوانتر کرد. سەرباری هەڵکشانی گرژیی نێوان سەدر و توخمە لایەنگرەکانی خومەینی، کەچی برەوسەندنی ئامادەیی شۆڕشگێڕە ئێرانییەکان لە باشووری لوبناندا وێنەی سەدری لە تاران تەڵخاند و شێواند. لە کۆتاییدا ڕژێمی پەهلەوی پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەدر بڕی پاسپۆرتە ئێرانییەکەشی لێ سەندەوە.

**١- هەرەس: کوردی عێراق**

***شا بە جێراڵد فۆردی گوت: "ئەوان [کورد] نەجەنگان؛ ئێمە بووین [لە کوردستانی عێراق لە دژی سوپای عێراقدا] جەنگاین."*** [1]

---

[1] یاداشتنامەی گفتوگۆی فۆرد، شا، کیسنجەر و سکۆوکرۆفت

May 15, 1975. Ford Library, National Security Adviser, Memoranda of Conversations, Box 11.

*لە نامەیەکدا سەرۆک ئەنوەر سادات بۆ مەلا مستەفا بارزانی نووسیبوو:* ***"گرفت نییە کە شا چی کردووە، ئەو گەلی کوردی زۆر خۆشدەوێ."*** [٢]

*ئیسحاق رابینی سەرۆوەزیر بە حەسرەتەوە لە بەردەم کیسنجەردا وەها گلەیی لە شا کرد:* ***"شا کوردی فرۆشت."*** [٣]

## دیپلۆماسییەتی جرت وفرت

ئێران لە ئاخروئۆخری ١٩٧٣دا، سەرکەوتووانە دەستوپێی سوپای عێراقی لە کوردستان بەستبووەوە و لێشنەگەرا بارزانی رەگەڵ حکوومەتی یەکگرتووی نیشتمانی بەغدا بکەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا شا گەواهی هەڵکشانی بەغدای دەدا. تەنانەت بووژاندنەوەی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانی لەگەڵ بەغدا لەپاش جەنگی ئۆکتۆبەری ١٩٧٣دا، هەرەشەی عێراقی هەر نەرەواندەوە.[٤] لە ٤ی شوباتی ١٩٧٤دا لەسەر سنووری عێراق-ئێراندا، بەیەکهەڵشاخانێکی نەخوازراو رووی دا. هەر چەند رۆژێک دواتر، ئەم بەیەکدادانە تەشەنەی سەند و خەریکبوو ببێتە جەنگ و بە تەواوی تۆپخانە

---

[٢] دیدارێک لەگەڵ د. ئەحمەد چەلەبی: ئەری چۆنە تا ئێستا سەددام لە بەغدا لە دەسەڵات ماوەتەوە؟ بڕوانە:
http://www.pbs.org/wgbh/pages/frontline/shows/saddam/interviews/chalabi.html.

[3] Memcon, March 9, 1975, NSA, Kissinger Reports on USSR, China and Middle East Discussions, Box 3, GRFL.

[٤] عێراق لە ٧ی ئۆکتۆبەری ١٩٧٣دا باڵوێزخانەکەی لە تاران کردەوە. وێڕای ئاماژەهەبوون سەبارەت بە وەرگەڕانی سیاسەتی هەرێمایەتی، کەچی نیازی سەرەکی سەرانی عێراق زیندووکردنەوەی پەیوەندییەکانیان بوو لەگەڵ تاران و ئینجا لەگەڵ لەندەن، ئەمەش رێکارێکی تۆڵەکردنەوە بوو لە ئەنوەر سادات و حافز ئەسەد و رووس. ئاخر عێراق هەستیکرد سووکایەتی پێکراوە چونکە لە لایەن عەرەبە دۆستەکانی لە پەلامارە هاوئاهەنگییەکەیان، واتە شەری ئۆکتۆبەر نەپرسی پێکرابوو نە ئاگاداریش کرابووەوە.

بکەوێتە گەڕ.[٥] لەو کاتەی ســـوپای عێراقی ٤٠ پاســـەوانی ئێرانی لە بەدرە کوشـــت، ئێرانیش پشـــتگیرییەکەی خۆی بەبێ گوێدانە لێکەوتەکانی بۆ هەڵگەڕاوە شیعەکانی باشووری عێراق چڕترکردەوە.[٦]

لەپاڵ قەیرانی کورد و ڕێڕەوە ئاوییە کێشـــەلەســـەرەکەی ئەروەند ڕود، **ئەوەی لەبن بەڕەی ئەو ڕووبەڕووبوونەودا بوو جرتوفرتە دیپلۆماسییەکەی هێنری کیسـنجەر بوو.[٧] کیسـنجەر بە یارمەتی ئەنوەر سـادات قەناعەتی بە شا هێنا لەسەر سنوور فشار بخاتە سەر بەغدا بەڵکو ناچاری بکا هێزەکانی لە بەرزاییەکانی جۆلان بکێشـێتەوە بۆ ئەوەی کشـانەوەی ئیسـڕائیلییەکان**

---

[5] United States Mission to the United Nations 472 to the U.S. Department of State, “Iraqi Request for SC Meeting,” February 12, 1974 NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), pp. 12; and Tehran 1159 to the U.S Department of State, “Iraqi-Iranian Border Clashes,” February 11, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), pp. 1–2.

[6] Al-Samarrai, Wafiq, Hottam al-Bawabat al-Sharqi [The Destruction of the Eastern Gate], translated in Farsi (Tehran, Markaz Asnad va Tahghighat-e Defa-e Moghaddas) p. 56.

[٧] لە ناوجەرگەی هەوڵوتەقەلای ڕۆنانی پێواژۆکەی کیسنجەر بۆ پێواژۆی ئاشتی عەرەب-ئیسرائیل لە دوای شـــەری ئۆکتۆبەری ١٩٧٣وە، کیســـنجەر ڕووبەڕووی کێشـــەیەکی کوشـــندەی چۆنیەتی ڕێکخستنی کشانەوەی سوپای ئیسرائیل بووبوو لە بەرزاییەکانی جۆلانی سەر بە سوریا. هەرچەندە ئەو دەســـتەبەری ڕێککەوتننامەی بە ئاشـــتی لەیەکجیاکردنەوەی هێزی چەکداری و کشـــانەوەی ئیســـرائیل لە نیمچە دوورگەی ســـینا لە ینایری ١٩٧٤دا کردبوو، لێ هەبوونی لیوایەکی زرێپۆش کە نزیکەی ســـێیەکی ســـوپای عێراقی دەبوو. لەســـەر خاکی ســـوریا بوو، بە هەڕەشـــەیەکی بۆ دەستپێشـخەری ئاشـتی دەبینی. بەڵێ ڕێک هەر دوای دروسـتبوونەوەی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکان لەگەڵ ئێران و لاشـەڕکردنی سنووری ڕۆژئاوا، ئیدی عێراق یەک لیوای زرێپۆشـی ڕەوانەی سـوریا کردبوو تا لە دژی ئیسرائیلدا بجەنگێ. بڕوانە:

*Years of Renewal* (New York: Simon &Schuster, 1999). p. 586.

بەغدا هەر زوو لە ناوەڕاستی شـەڕەکەدا لە سـوریا کشـایەوە، ئاخر سـەرانی عێراقی لە ئۆپەراسـیۆنە ژێربەژێرەکەی میسـر و سـوریا دەهری بووبوون. هەرچۆنێک بێ بە ناوبژێی لیبیا و جەزائیرییەکان، بەغدا لە نۆڤێمبەری ١٩٧٣دا جارێکی دیکە هێزی سەربازی خۆی ڕەوانەی سوریا کردەوە. بڕوانە:
Baghdad 600 to U.S. Department of State, “Iraq Rejoins Battle,” November 7, 1973 (NARA/AAD/ RG59/CFPF/ET/1973), pp. 1–2.

**لەوێ لە ئایاری ١٩٧٤دا مســـۆگەر بکا.** "میســـرییەکان داوایان لە من کرد قســـە لەگەڵ شـــا بکەم بۆ ئەوەی فشـــار بخاتە ســـەر عێراق بەڵکو هەموو هێزی خۆیان لە سوریا بکشێننەوە.... هەر بۆیە لە مانگی شوباتدا کێشە لە نێوانی عێراق و ئێراندا دروســـت بوو،" کیســـنجەر وەها بە گۆلدا مایەری سەروەزیری ئیسرائیلی گوت.[8] بە دەستبەستراوی لە کوردستان نەیدەتوانی هێرش بەرێ، بۆیە بەغدا داوای لە ئەنجوومەنی ئاســـایشـــی نەتەوە یەکگرتووەکـــان کرد کۆبوونەوەیەکی بە پەلە بکـــا و ســـەرکۆنەی شەڕانگێزییەتی ئێران بکا.[9] وێڕای جووڵە سەختەکەی شا[10]، کەچی عێراقی

[8] White House, Memorandum of Conversation, Kissinger and Meir, May 7, 1974 (DNSA/ KT01143), p. 12.

[9] U.S. Mission to the United Nations 531 to U.S. Department of State, "Baghdad: SC Meeting on Iraqi Complaint," February 15, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974),
p. 1; and U.S. Mission to the United Nations 575 to State, "Iraqi Complaint in SC," February 20, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), pp. 1–2.

لە فایلەکەی خۆیدا ئەنجوومەنی ئاســـایش وەهای باســـکردووە کە لێدوانی بەغدا وەها بووە: "ڕەوشـــی بەرەی پێشەوە بە خێراییەکی زۆر لەگەڵ دەستدرێژی بەردەوامی ئێرانییەکان شڵۆق بووە و هێزێکی زۆری ســـەربازی ئێرانی هێشـــتا لەســـەر سنوور لە پێشـــڕەویدایە... هێزی چەکداری ئێرانی بە ئاستی هەمەجۆر لەســـەر سنوور دەبینرێن و بەردەوامن لەسەر کردەوەی ســـەربازییانەیان، بە ڕاشکاوی و بە پلان خاکی عێراق پێشـــێل دەکەن، لەکاتێکدا هێزی ئاســـمانیشـــیان هەرەشـــەن بۆ ســـەر ئاشـــتی و سەروەری خاکمان." بڕوانە: .See SCOR Supp. S/11216 (12 Feb. 1974)

ئێرانیش لە بەرانبەردا عێراقی بە سنووربەزاندن و هێرشکردن تۆمەتبار کرد و داوای قەرەبوکردنەوەی قوربانییەکانی دەکرد. بڕوانە: See SCOR Supp. S/11218 (12 Feb. 1974).

یەمەن و ئیمارات و لیبیا چوونە ڕیزی گفتوگۆی ئەنجوومەنی ئاســـایش و داوایان کرد " دەســـتدرێژی ئێران بۆ ســـەر پێگە ســـنوورییەکانی عێراق بە تەشـــەنەســـەندنی گرژیی و مایەی نانەوەی دوژمنایەتی پلە باڵا لەقەڵەم دەدەن." بڕوانە:
Sturchler, Nikolas, The Threat of Force in International Law, 2009, p. 231.

[10] **بۆ دوورکەوتنەوە لەبەکارهێنانی ڤیتۆ بۆ ڕێگرتن لە بڕیاری ئەنجوومەنی ئاســـایش لە دژی تاران، ئەوەبوو کیســـنجەر داوای لە شـــا کرد بەیاننامەیەکی کۆدەنگی ســـووک بپەژرێنێ، کە پێشـــتر لە ٢٨ی شـــوباتدا ئامادەکرابوو و ڕێگەی بە کۆمەڵەی گشـــتیی دا لێکۆڵینەوەی خۆی بکا.** بڕوانە:

لاواز نیازی وابوو تاران بهێنێته سـەر مێزی دانوسـتاندن. ئیدی سـەددام داوای لە باڵوێزی ئێران لە بەغدا کرد، بەڵکو بانگهێشـتنامەی بگەیەنێتە شـا بۆ دانوسـتانی "پاکێجێکی ڕێککەوتن" لە ٣ی ئازاری ١٩٧٤.[11] کەچی هیچ شتێک ڕوووینەدا.

## هەرەسهێنانی ڕێککەوتننامەی ئازار

نـاڕوونی لەبـارەی پرسـەکـان لە ڕێککەوتننـامەی ئـازاردا، بە پلەی ئۆتۆنۆمیشـەوە بۆ هەرێمی کوردان، چەکەرەکردنی گومان بوو سـەبارەت بە درێژەی تەمەنی و هەروەها بە کاریگەرییەکەی.[12] بە کۆتاییهاتنی پایزی ١٩٧٣، سوپای عێراقی پێگە و مۆڵگەکانی خۆی لە پێدەشتەکانی کوردستانی عێراقدا قاییم کردن، لە کاتێکدا پێشمەرگەش ناوچە شاخاوییەکانی کۆنترۆڵ

---

U.S. Mission to the United Nations 634 to U.S. Department of State, "Developments in Iraqi SC Complaint," February 26, 1974 (NARA/AAD/RG59/ CFPF/ ET/1974), pp. 1–2; U.S. Mission to the United Nations 674 to U.S. Department of State, "Iraqi Complaint in SC," February 27, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), p. 1; U.S. Mission to the United Nations 697 to U.S. Department of State, "SC Adopts Consensus in Iran-Iraq Dispute," February 28, 1974 (NARA/AAD/ RG59/CFPF/ET/ 1974), pp. 1–2; and United Nations Security Council, "Note by the President of the Security Council," February 28, 1974, S/11229, pp. 1–2. But the Shah ignored it. See Tehran 1735 to U.S. Department of State, "Iran-Iraq Border Clash," March 4, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), p. 1; and Tehran 1779 to State, "Latest Iran-Iraq Border Clash," March 5, 1974 (NARA/AAD/RG59/ CFPF/ET/1974) , p. 1.

[11] کۆبوونەوەکە لە دووشەممەی ٨ی نیسانی ١٩٧٤ لە وەرزارەتی کاروباری دەرەوەی عێراق لە بەغدا لە سەعات ٥:٣٠خولەکی دوای نیوەڕۆدا کرا.

S-0904-0022-08, UNARMS.

[12] The U.S. Department of State 37806 to Tehran, "Soviet-Iraq Threat to Iran in Middle East," March 14, 1970 (FRUS/1964-68/XXI/doc.268), pp. 1–3.

کردبوو. وێڕای ئەو بەیەکهەڵشاخانە کاتییەکەی ساڵی ١٩٧٣، نەخاسمە لە کەرکوک و لە شەنگال، کەچی هیچ کامێکیان کارێکی وەهایان نەکرد هەڵگیرسانی جەنگ بوەستێنن. بارزانی بە پشتیوانی ئێرانی و ئیسرائیلی و ئەمریکییەکان هێزی پێشمەرگەی ڕێکخستەوە. لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٣دا ئەو داوای کوردانی بۆ کۆنترۆڵکردنەوەی کەرکوک و کانە نەوتییەکان ڕاگەیاند.[١٣] بە ڕەتکردنەوەی داواکانی بارزانی، ئەوەبوو بەغدا لە کۆتاییدا تاکلایەنە قانونی ئۆتۆنۆمی سنووردار لە ١١ی ئازاری ١٩٧٤دا بۆ کوردستانی عێراق ڕاگەیاند.[١٤] پڕۆژەکەی بەغدا ئەو بەڵێنانەی داواکانی کوردی ساڵی ١٩٧٠ی تێدا بەرجەستە نەبوون.[١٥] سەرباری فشارخستنە سەر بارزانی بەوەی تەنیا دوو هەفتە ماوەیان بۆ دانابوو تا پڕۆژەکە بپەژرێنێ، ئەوەبوو بەغدا ویستی نیشانی تارانی بدا کە لێبڕاوانەیە بۆ شکاندنی ڕێگەی بە بنبەست گەیشتنی لە کوردستان. **دیمەنەکان بۆ نسکۆپێهێنانی ڕێککەوتننامەی ئازاری ١٩٧٠ داڕێژران.**

بارزانی بە مانەوە لەنێوان بەرداشی ئاخۆ جەنگ هەڵبگیرسێنێتەوە یان خۆڕادەستی بەغدا بکا، چووە تاران. لە ١٨ی ئازاری ١٩٧٤دا چاوی بە شا کەوت و تکای چەک و تفاقی بۆ پێشمەرگە لێکرد بە چەکی دژەتانک و دژەفڕۆکە بۆ ئەوەی بتوانێ هێرشێکی گەورە و سەرتاسەری بکاتە سەر

---

[١٣] دووجار لەسەر یەک سەرژمێری ناوچە کێشەلەسەرەکان دواخرا، نەتوانرا بەسەر بەربەستی درێژخایەنی بەردەم پایتەختە پێشنیازکراوەکەی دەوڵەتی کوردیدا زاڵ بن، کە کەرکوک بوو. بارزانی پێشتر لە ساڵی ١٩٧٢دا پێشنیازەکەی بەغدای بە پەژراندنی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ بۆ یەکلاکردنەوەی کەرکوک ڕەتکردەوە ئاخر، واپێدەچوو بەگوێرەی ئامارەکە تورکمان زۆرینە دەربچن و تورکمانیش لەبەر ڕۆژە خوێناوییەکانی ١٩٥٩ لایەنی دەسەڵاتی بەعسییان پێ باشتر بوو.

[١٤] قانونی حوکمەزاتییەکەی بەعس لەژێر سەرپەرشتی شەش کەس لە دژەبارزانی و لە کوردە سۆشیالیستەکان بوو. بڕوانە:
McDowall, David, A Modern History of the Kurds (London, New York 2004) pp. 332–335.

[15] Baghdad 136 to U.S. Department of State, "Nominal Autonomy for Kurdistan," March 10, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), pp. 1–2.

عێراق. داوای لە شــا کرد ڕێگە بە کورد بدا ئۆتۆنۆمییەک بۆ کوردســتان ڕابگەیەنن و بڕی ١٨٠-٣٦٠ ملیۆن دۆلاریش سالآنە وەک پشتگیری دارایی بۆ خەرجییەکانیـان بـداتێ، هەروەهـا ئێران دانی پێدابنێ و لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش پشتی بگرێ، دەنا ئەوا داوای مافی پەنابەریتی لە ئێران دەکا بە گەلی کوردیش دەلێ باشترین ڕێککەوتن کە بگونجێ لەوانەیە لەگەڵ بەعس بیکەن.[١٦] **شــا بەڵێنی زیادکردنی پشــتیوانی ســەربازیی و دارایی پێدا، بەڵام ئەوەشـــی گوت کەوا لەبارەی چاپدانی ئۆتۆنۆمییەوە پێویستە ڕاوێژ بە هاوپەیمانەکانی بکا.**[١٧] بارزانی لە تاران لەبەردەم ئارسەر کـالاهـان داواکـانی دووبـارە کردنەوە. لەگەڵ ئەوەشـــدا ئەمریکییەکـان ڕەتیانکردەوە بە ڕوونی وەڵامی بدەنەوە و پێشنیازیان کرد شا لە پێگەیەکی باشـتردایە لەوان بۆ ئەوەی لە بەرانبەر داوای ئەوانەوە بجووڵێ.[١٨] لە ٢١ی ئازاری ١٩٧٤دا، بەڕێوبەرە نوێیەکی ســـی ئای ئەی بە ناوی ویلیەم کۆلبی ســـووکە نـارەزایەتییەکی ســـەبـارەت بە زیـادکردنی پشـــتیوانی وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ کوردان نیشان دا.[١٩] ئەو بڕوای وابوو، ئامانجی سەرەکی بۆ هـاوکـارییە ژێربەژێرییەکەیـان لەگەڵ ســـاواک کەمتر بۆ پشـــتیوانی ئۆتۆنۆمی کوردســـتان بووە لەوەی دۆخەکە لە کوردســـتان هەروا بە بنبەســـتی بهێڵدرێتەوە.[٢٠] ئەنجوومەنی ئاســـایشـــی نیشـــتمانیی ئەمریکا و ژەنەراڵ برێنت سکۆوکرافت هۆشداریان لە دژی کوردستانێکی سەربەخۆ

---

[16] Helms to Scowcroft, March 18, 1974, CIA-Helms; Helms to Scowcroft, March 18, 1974, (FRUS, 1969–1976, Vol XXVII).

[17] United States Congress, House Select Committee on Intelligence, CIA: The Pike Report (Nottingham, England: Spokesman Books, 1977). p. 197.

[18] Helms to Scowcroft, March 20, 1974 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–2.

[19] CIA, Memorandum for Kissinger, "Mullah Mustafa Barzani's Request," March 21, 1974 (NPL/HAK/Box138/Kurdishs Problem-Vol. I/June 1972–Oct 1973), p. 1.

[20] United States Congress, House Select Committee on Intelligence, CIA: The Pike Report (Nottingham, England: Spokesman Books, 1977). p. 214.

دا.[٢١] هەرچەندە هەردووکیان، چ کیسنجەر و چ شا پەرۆش بوون یارمەتی کورد بدەن، کەچی دوودڵ بوون لەوەی کوردستانێکی سەربەخۆ بپەژرێنن و پشتیوانییەکی ئەوتۆ بکەن لەودیو داواکاری کوردانەوە بێ بۆ مانەوەی شەڕکردنیان. **لە کۆتاییدا شا قەناعەتی بە بارزانی هێنا، جاڕدانی سەربەخۆیی دوا بخا، بەمەش کۆمەکی ساڵانەی ئێرانی بۆیان لە ٣٠ ملیۆن دۆلارەوە بگەیەنێتە ٧٤ ملیۆن.** شا بە زیادکردنی بڕی کۆمەکە بۆ کوردان، "**بۆ هێنانە کایەی دۆخێک بوو تا دووربکەونەوە لە خۆڕادەستکردنەوەی بەغدا.**"[٢٢] کیسنجەریش ڕێنمایی بۆ پترکردنی کۆمەکەی بۆ کوردان دەرکرد تا بگاتە بڕی 8.06 ملیۆن دۆلار ساڵانە بۆ ئەوەی "**حکومەتی عێراقی دەستوپێی ببەسترێتەوە و توانستی لە سەرچڵیکردن لە دەرەوەی سنوری**

---

[٢١] ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتمانیی ئەمریکا و سکۆوکرافت پێشنیازی پشتگیرییەکی داراییان بۆ کورد کرد لەگەڵ "بڕە پارەیەکی ڕەمزی" بە ٥٠٠،٠٠٠ –٧٠٠،٠٠٠ بۆ کۆمەکی پەنابەری. ئەوان لەوەش نیگەران بوون نەوەک ئۆپەراسیۆنەکە تورکیا، یەکێتیی کۆمارە سۆشیالیستەکانی سۆڤیەت و وڵاتە عەرەبییەکانیش بوروژێنێ. ئەوان وا باسیانکرد گوایە جاڕدانی بارزانی بۆ "جۆرە حکومەتێکی ناکام" دەبێتە خاڵێکی دژوار و گەورەترین ئاڵنگاری بۆ عێراق [بە پشتگیری بەهێزی سۆڤیەت و تەنانەت تورکیاش] [بۆ چوونە جەنگ] و "هیچ بژاردەیەکیش لەدەست عێراقدا ناهێڵێتەوە تەنیا هێرشێکی سەردکی نەبێ بۆ سەر کوردستان، ئەوەش ئەگەر هاتو بیەوێ یەکێتیی نیشتمانیی خۆی بپارێزێ" بەبێ هیچ دەستەبەرییەک لە پشتگیری شاوە. هەروەها "ئەوە [بۆ ئەمریکا] پرۆژەیەکە لەودیو سنوورەکانی ڕێککەوتنی نهێنی بوو، چونکە نهێنیبوون لە ئۆپەراسیۆنێکی وەهادا ئەستەمە و زیان بەتەواوی سیاسەتەکانی دیکەی دەگەیەنێ" ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتمانیی ئەمریکا مشتومڕی لەسەر ئەوەبوو کە هەر پشتگیرییەک بۆ کورد دەبێ وەک هاوسۆزییەکی ئەمریکا بۆ ڕاپەڕینی کوردان نمایش بکرێ، لەکاتێکدا بارزانی ساردبکەنەوە لەوەی داوایەکی ئەوەندە زۆر لە ئەمریکا نەکا بەوەی ئەمریکا نەتوانێ ئۆپەراسیۆنەکەی هەر بەژێربەژێری بهێڵێتەوە، ئاخر ئەمریکا نەیدەتوانی "ڕۆڵێکی سەرەکی لەیاری دووگۆڵیدا وازی بکا." بڕوانە:
White House, Memorandum, Scowcroft to Helms, no date, (NPL/HAK/ Box138/Kurdish Problem–Vol. II/doc.7), pp. 1–4.

[22] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). pp. 588–589.

**خۆیدا سـنووردار بکرێ."**[٢٣] بە هاوئاوازبوون لەگەڵ سـیاسـەتی شـا بۆ پشـتیوانییەکی سـنووردار، کیسـنجەریش لەسـیاسـەتی پارچەپارچەکردنی هەمیشـەیی عێراق دوورکەوتەوە، ئاخر "**ناوچەی کوردستانێکی سـەربەخۆ لە ڕووی ئابوورییەوە ناتوانا بوو، هەروەها وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێرانیش بەرژەوەندییان لە دەرگەداخستن نییە لەسەر پەیوەندی باش لەگەڵ عێراقێک لەبن دەسـەڵاتێکی میانڕەودا بێ."**[٢٤] کیسـنجەر لە پەیامەکەی ئەو بۆ شـا و ئینجا بۆ بارزانی، مشتومڕی لەسـەر ئەوە بوو کە "پشـتگیری حکوومەتێکی کوردی لەسـەر بنەمای ماوەیەکی درێژ خایەن بەم قەبارەیە بەو داوایانەی بارزانی هەیەتی لەودیو سـەرچاوە داراییەکانی ئێمەوەیە و ئەم پڕۆژەیە ناتوانێ [بەنهێنی] بەدیبێ. ئێمە هەسـت ناکەین کە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی کراوە لەگەڵ حکومەتی عێراق خزمەت بە بەرژەوەندی وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێران و خۆگری و مانەوەی مەودادرێژی کوردانیش بکا."[٢٥] ئەمریکییەکان وەهایان دانابوو، کە "بەردەوامبوونی شا لە پشتگیرییە گران و قورسەکەی بۆ کورد وەک باشـترین هەڵوێسـتی ڕاسـتەقینەیە لەوەی پەیوەندییە

---

[23] Kissinger to Nixon, April 11, 1974, NSA, KSWWOF, Box 19, GRFL.

پشـتگیرییەکە پێکهـاتبوو لە زیـادکردنی بڕی یەک ملیۆن دۆلار بۆ بەردەوامبوون لەسـەر "بەهانەوەچوونی پەنابەران"، هەروەها زیادکردنی کۆمەکی دارایی بە بڕی ٨ ملیۆن دۆلار و پێدانی 408.233کیلۆ چەکی بچووک و فیشەک کە سەرچاوەکانی ناناسرێتەوە. بڕوانە:

Kissinger to Nixon, April 11, 1974, NSA, KSWWOF, Box 19, GRFL; and U.S. Department of State, Memorandum of Conversation, "The Secretary's Principals and Regionals Staff Meeting, Monday, April 22, 1974—3:00 p.m.," April 23, 1974 (DNSA/KT01111), p. 41; Kissinger to Nixon, June 24, 1974, NSA, KSWOF, Box 19, GRFL.

[24] The U.S. Department of State, Memorandum of Conversation, "The Secretary's Principals and Regionals Staff Meeting, Monday, April 22, 1974—3:00 p.m.," April 23, 1974 (DNSA/KT01111), p. 41.

[25] Kissinger to Helms, undated, NSA, KSWWOF, Box 19, GRFL; Memorandum, Kissinger to Helms, no date (NPL/HAK/Box138/Kurdish Problem–Vol. II/doc.20), pp. 1–2.

دیپلۆماتییەکانی لەگەڵ عێراق نۆژەنبکاتەوە و دەستبەجێش ڕووبەڕووبوونەوە سەربازییانەکەی لەسەر سنووری هەردوولا بوەستێنێ."[26] لۆژیکی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە عێراق لە لایەن کۆشکی سپییەوە پەسەند بوو.

بارزانی بەڵگەوبەندی شای پەژراند و لە بەرانبەریشدا پاشایەتی پەهلەوی پێزانینیان بۆ پێگەی ئەو هەبوو بەوەی "خۆیان بەو هێڵەوە نووساندەوە و خۆیان بە بەشێک لە عێراق دەزانن و تەنیا دەیانەوێ بەرگری لە خۆیان بکەن لە دژی ڕژێمێکی ناڕەوا و بۆ هەموو خەڵکی عێراق بەدوای ئازادییە دیموکراتییەکاندا دەگەڕێن."[27] **بۆیە بارزانی لێگەڕا دوا مۆڵەتی بەغدا بۆ قایلبوون بە پرۆژەکەی تێبپەڕێ کە ٢٦ی ئازار بوو.**[28] ئەمەش کۆتاییهاتنی چوار ساڵی ئاگربەستە ناسکەکە بوو. هەرچەندە پێگەی بارزانی هەژا کاتێک کوڕەکەی خۆی بە ناوی عوبەیدوڵڵا هەروەها لەگەڵ چەند کەسێک لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و چەپە عێراقییە هاوسۆزەکانی داواکانی کورد، وایان دانا کە بڕیارەکەی بارزانی ناپاکییە لە بنەما سۆشیالیزمییەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان و لە کۆتاییشدا گەڕانەوە لای بەغدا. هەروەک عوبەیدوڵڵا لێدوانی دا، باوکی "ئۆتۆنۆمی نەدەویست تەنانەت ئەگەر کەرکوک و هەموو نەوتەکەشیان بدابووایە. ئاخر پەسەندکردنی قانوونەکە هەموو شتی لێوەردەگرتەوە و ئەویش دەیەویست وەک دەسەڵاتداری ڕەها بمێنێتەوە."[29] کاردانەوەی بارزانیش لەناوبردنی ڕکابەرەکانی بوو لە ڕێی پاراستنەوە، ئەو هێزەی لە لایەن ساواک و مۆسادەوە ڕاهێنرابوو. لە

[26] [Excised] to [Excised], June 27, 1974 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–2.

[27] Helms to Kissinger, May 21, 1974, CIA-Helms.

[28] The U.S. Department of State, Memorandum of Conversation, "The Secretary's Principals and Regionals Staff Meeting, Monday, April 22, 1974—3:00 p.m.," April 23, 1974 (DNSA/KT01111), p. 41.

[29] McDowall, David, A Modern History of the Kurds, London, New York 2004, p. 337.

دیوێکی دیکەشـــەوە، بەغدا ئەو جووڵە بوێرانەیەی بارزانی بە جاڕدانی سـەربەخۆیی بینی.[٣٠] **بەغدا لە ٦ی نیسـانی ١٩٧٤دا بانگی سـەربازە یەدەگەکانی خۆی کردەوە، ئابڵوقەی لەسـەر کوردسـتان توندتر کرد و هێزی هەوایی عێراقیش بە پچڕپچڕی بۆردومانی سـەنگەرەکانی پێشـمەگەی کرد.[٣١] دیمەنەکە بۆ دواین شەڕ سازێنرا.**

**دوایین شەڕ**

لە بەهـاری ١٩٧٤دا شـــەڕ و بەیەکدادان لە نێوان سـوپای عێراق و پێشمەرگەدا قەوما. بە داخستنی سنووری سەر عێراق لە لایەن تورکیاوە،[٣٢] تاکە دەروو بۆ کوردان بەتەنیا ئێران مایەوە. ئەمەش "ڕەوشێکی کەساسانە" بوو بۆ ئەوان.[٣٣] هەر زوو دوابەدوای ڕەتکردنەوەی بارزانی بۆ دوا وادەی مۆڵەتەکەی سـەددام، بەیەکهەڵشـاخانەکانی لێرەولەوێ بووە جەنگێکی سەرتاپاگیر.[٣٤] لە کۆتاییدا بەغدا هێرشێکی سەرەکی زەمینی کرد. لە هەمان کـاتیشـدا، خولێکی دیکەی گفتوگۆی نهێنی لەنێوان تـاران و بەغـدا

[30] Tabriz 7 to the U.S. Department of State, "Kurdish War in Iraq: Iranian Inputs," June 9, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), p. 1.

[31] Tabriz 7 to the U.S. Department of State, "Kurdish War in Iraq: Iranian Inputs," June 9, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974),. p. 1; and CIA, Memorandum, Colby to Kissinger, "Transmittal of Kurdish Democratic Party Autonomy Plan for the Kurdish Area of Iraq," April 16, 1974 (NPL/HAK/Box138/Kurdish Problem–Vol.II/ doc.21), p. 3. The Iraqi Army included two divisions of special mountain troops, one regular infantry division, and two armored brigades, supported by four air squadrons. Baghdad 221 to State, April 11, 1974, (FRUS 1969–1976, XXVII, 245).

[32] Helms to Scowcroft, March 18, 1974, (FRUS 1969–1976, XXVII, 242).

[33] Memcon, March 21, 1974, 01078, DNSA.

[34] Baghdad 280 to the U.S. Department of State, May 1, 1974, (FRUS 1969–1976, XXVII, 249).

دەســـتپێکرایەوە. بە ناوەندگیریی کۆرت ڤالد هایمی ســـکرتێری گشـــتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، سەددام حوسێن پەرۆشی خۆی بۆ کۆتاییهێنان بە گرژیی وڵاتەکەی لەگەڵ ئێران دەربڕی.[35] بەردی بناغەی ڕێککەوتنی پاکێجە عێراقییەکە لەســـەر پرســـە ئـاڵۆزکـاوەکەی ئەروەنـد ڕود-کورد بوو: سازشکردنی بەغدا لەمەڕ خاکی ئەروەند ڕود لە بەرانبەر دەستبەرداربوونی تاران لە پشـتگیری کورد. هەرچەندە ڕێککەوتنەکە بۆ شـا سـەرکەوتنێکی نایاب بوو، ئاخر ئەو پێشـتر گوتبووی گوایە ئێران دەتوانێ "بە ئاسـانی ... ئەو دەوڵەتە دەســـتکردەی {عێراق} تێکبشـــکێنێ... و دروســـتکراوەکەی [ونستن] چەرچل [عێراق]"[36] بەبێ دوودڵی "لەسـەر حیسـابی کوردی عێراق دەبێ.[37] لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا شا هەر پێی وابوو سەرانی عێراق ئامادەی "ســەودایەکی گەورە" نین. هەرچەندە هەڵگیرســاندنەوەی جەنگ دەکرا ئەو سیاسەتە ناسکییەی لە کوردستانی عێراق بشکێنێ و بلەنگێنێ، کەچی شا ئەو ســـەرچڵییەی کرد و پابەندبوونی خۆی بۆ بـارزانی دەربڕی.[38] لەو نێوەدا شـا هەوڵیدا ئەو گرژییە بەردرێژەی لەنێو کورد خۆیدا هەبوو ئاشت بکاتەوە. **فەرمانی بە عیســـا پژمان کرد قەناعەت بە جەلال تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد بهێنێ لە دژی هێرشـــەکەی بەعس ڕەگەڵ بــارزانی بکەونەوە.** پژمـانیش ئەرکەکەی بەجێهێنـا و تـارانیش کۆمەکێکی دارایی بەخشـــندانەی بۆ گرووپی دژەبارزانی تەرخان کرد و نەقیب تەها نوری

---

[35] Weckmann-Munoz to Waldheim, April 30, 1974, S-0303-0003-01, UNARMS.

[36] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[37] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[38] Tehran 3088 to U.S. Department of State, April 20, 1974, NPM, NSCF, CFME, Box 603.

(نوری ئەحمەد تەها –وەرگێڕ) دانا بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانی ئەوان لەگەڵ ساواک لە تاران هەڵبسووڕێنێ.[٣٩]

وێڕای پشتگیری ئێران، کەچی پێشمەرگە لە کێشەدا بوون. شا نیگەرانبوو لەوەی مەبادا شەپۆلی ئاوارەی کورد لەڕێگەدا بن.[٤٠] بە شالاوی بۆردومانی دڵڕەقانەی هێزی هەوایی عێراقی کە هێلمز ناوی لێنابوو "**شەڕی جینۆساید**"، ئەوەبوو خەڵکی سڤیلی کورد لە سنووری ئێران پەڕینەوە.[٤١] بە درەنگانێکی مانگی حوزەیران، چەندین ئۆردوگا بە درێژایی سنوور بۆ ٢٥،٠٠٠ ئاوارە سازکران.[٤٢] ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا نەیدەتوانی بەشێوەیەکی بەرچاو کۆمەک و پشتیوانییەکەی زێدەتر بکا، ئاخر ئەو "**گەیشتبووە بەرزترین ئاستی سنووورداری پشتیوانی ئەوەی کە بتوانرێ بە نهێنی بهێڵرێتەوە.**"[٤٣] لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا شا سوور بوو لەسەر ئەوەی پێویستی بە پشتیوانی زیاتر هەیە. ئەو ئاماژەی بە پەیوەندییەکانی بەغدا-مۆسکۆ کرد و هۆشداری لەبارەی "لێکەوتەی دژوار" –بۆ ئێران و تەواوی کەنداوی فارسی- دا، ئەگەر هاتوو بەرگری کورد هەرەس بهێنێ."[٤٤] ئیدی ڕەوشی باکوری عێراق پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی ئێران هەڵگەڕایەوە.

---

[٣٩] بیچمە سەرەکییەکانی دیکەی دژەبارزانی بریتیبوون لە عومەر دەبابە، عیسا زەبیحی و یەدوڵلا فەیلی. بڕوانە:

Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 173.

[40] Helms to Scowcroft, July 8, 1974, CIA-Helms.

[41] Helms to Scowcroft, March 20, 1974 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–2.

[42] Tabriz 12 to the U.S. Department of State, "Kurdish Refugees in Iran," June 31, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), p. 1.

[43] Helms to Kissinger via Scowcroft, July 8, 1974 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–4.

[44] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 590.

بە درەنگانێکی مانگی ئاب، سوپای عێراق هێزی پێشمەرگەی تێکشکاند، دەستی بەسەر سەنگەر و چەپەرەکانی داگرت و ڕێگەی ستراتیژی دابینکردنی ئازوقەشی کە لە ئێرانەوە دەهات، لەسەر بڕی.[٤٥] **بۆ ڕێگرتن لە سەرکەوتنی بەغدا، ئێران هەڵوێستێکی توندتری گرتەبەر. شا سێ فرقەی زرێپۆش، دوو فرقەی پیادە و دوو لیوای پیادەی لەسەر سنووری عێراق جێگیرکردن. هەر زووش لێرەولەوێ بەیەکهەڵشاخان دروست بوو.**[٤٦] لە ٢٤ی ئابی ١٩٧٤دا، بۆ چەند سەعاتێکی کەم شەڕ لەنێوان هەردوو سوپایەکەدا بەرپابوو.[٤٧] لەگەڵ ئەوەشدا سوپای عێراقی خۆپارێز بوو لەوەی ختووکەیان نەدا بۆ هێرشکردن.[٤٨] بەرەتکردنەوەی داوای بارزانی بۆ موشەکی دژە فڕۆکە،[٤٩] شا فەرمانی بە ساواکدا چەکی دژەفڕۆکە بدەنە پێشمەرگە. ئیدی لەسەر پشتی هێستر بارکران و بەڕێگەی مەترسیدار

---

[45] Tabriz 20 to the U.S. Department of State, "The Kurdish War in Iraq," September 4, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), pp. 1–10. See also O'Ballance, Edgar. The Kurdish Revolt, 1961–1970 (London: Faber and Faber Ltd., 1973). p. 96.

[46] Tehran 6788 to the U.S. Department of State, "Iran-Iraq Border Incidents Mar Talks in Istanbul," August 14, 1974, (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), pp. 1–2.

[47] Tehran 7134 to the U.S. Department of State, "Iran Details Additional Border Violations by Iraq," August 25, 1974 (NARA/ AAD/RG59/CFPF/ET/1974), p.1.

[48] Baghdad 564 to the U.S. Department of State, August 29, 1974, FRUS 1969–1976, XXVII, 260.

[٤٩] داوای بارزانی بۆ "بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشەی فڕۆکە بەرزەفڕە بۆمبهاوێژەکان" پشتگوێخرابوو، ئاخر شتەکە زۆر گەورە بوو (پێویستی بەهێزێکی ڕاگوێزانی زۆر دەکرد)، هەروەها ئەو دژە هەواییانەش زۆر ئاڵۆز و زۆر بە خەرجی بوون." بڕوانە:
Scowcroft to Helms, August 22, 1974 (CIA/FOIA/Helms), p. 1.

**لەجیاتی ئەوە ئەمریکییەکان چەکی AK–47 یان خستە بەردەست هەروەک بە بڕی یەک ملیۆن دۆلاری ئەمریکی چەکی دژە تانکیان خستە بەردەستی ساواک و سی ئای ئەی تا یارمەتی کوردانی پێبدەن.**

Scowcroft to Helms, August 22, 1974 (CIA/FOIA/Helms), p. 1.

گەیەنرانە چیای زۆزک. سەربازە ئێرانی، جەندرمە و ڕاوێژکاری سەربازیی ئێرانی بە جلی کوردییەوە شان بەشانی کورد لەدژی سوپای عێراقییدا جەنگان. **ئێران لە ئاخروئۆخری هاوینی ١٩٧٤دا چەند یەکەیەکی تۆپخانە و دژە فرۆکەی لە ناوچەکانی ژێردەستی شۆڕشگێڕەکانی لە کوردستانی عێراقدا دامەزراند.**[٥٠] بەتالیۆنێکی تۆپی دوورهاوێژی ١٧٥ ملمی لەسەر سنووری ئێرانەوە پێگە ستراتیژییەکانی سوپای عێراقی تۆپباران دەکرد.[٥١] هەر هەموو ئەم یەکانە لە لایەن ئەفسەرە ئێرانییەکان هەڵدەسووڕێنران. **هێشتا ئێران هەر لە پشتی کوردی عێراقەوە بوو.**

لەگەڵ ئەوەشدا دیار بوو ڕەوشی کورد لە بەرانبەر هێرشی زەمینی سوپای عێراق سامناک بوو. لەپاڵ قوربانی گەورە و قورس، بارەگای بارزانی لە حاجی ئۆمەران ڕاستەوخۆ کەوتە بەر حوکمی تۆپە دوورهاوێژەکانی عێراقی.[٥٢] **بەغدا لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٤ لە دوای هەڵگیرسانی شەڕ لە ئەیلوولی ١٩٦١ەوە زۆرینەی شوێنە ستراتیژییەکانی لە دەست کورد دەرهێنان و گرتییەوە.** دوابەدوای داوای بارزانی لە کۆبوونەوەکەی لەگەڵ شا لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٤دا بۆ خۆراک و چەک و تەقەمەنی،[٥٣] ئیدی

---

[50] Paper Prepared in the Office of Current Intelligence, Central Intelligence Agency, DCI/ NIO 1039–75, Washington, May 1, 1975, FRUS, 1969–1976, Iran-Iraq, 1973–1976 Volume XXVII. Central Intelligence Agency, NIC Files, Job 79R01142A, Box 5, Folder 5. Secret; [handling restriction not declassified].

تێبینییەک لە لاپەڕەی یەکەمدا وەها دەخوێندرێتەوە: "ئەم نووسینە لەژێر سەرپەرشتی ئەفسەری هەواڵگریی نیشتمانیی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین نووسراوە. لەلایەن سی ئای ئەی و بە ڕاوێژ لەگەڵ بەشی INR و DIAی لەوەزارەتی کاروباری دەرەوەدا داڕێژراوە."

[51] Intelligence Note prepared in the Bureau of Intelligence and Research, November 18, 1974, (FRUS 1969–1974, XXVII, 267, Tab B).

[52] Barzani to Kissinger, October 22, 1974, NSA, KSWWWOF, Box 19, GRFL.

[53] Parsons (Tehran) to Wright (London), October 24, 1974, Foreign Common Office 8/2309.

ســــوپای ئێرانی لە ســــنوور پەڕیەوە و بە یەکەی تۆپخانەی خۆی پێگەی هێزی پێشـمەرگەی بەهێزکرد.[٥٤] بۆ ڕاگرتنی بۆمبارانی خەسـت و قورسـی فڕۆکەی عێراقی، ساواکیش بڕیاری دا ڕێڕەوێکی ستراتیژی هەوایی بدرێتە پێشمەرگە. فەرمان بە مارشاڵ محەمەد ئەمیر خاتەمی سوپاسالاری هێزی ئاســمانی ئێرانی کرا، ئەرکەکە تەواو بکا. **ئەوەبوو ســێ فڕۆکەی فانتۆمی Phantom ئێرانی کە ســێ فڕۆکەوانەکەی کورد بوون، قەول وا بوو ســەنگەر و مۆڵگەکانی ســوپای عێراقی بۆمباران بکەن تا ڕێگەی تفاق و ئازوقە بۆ کوردان بکەنەوە. کەچی شــا ڕایەکەی خۆی گۆڕی و پلانەکەی وەســتاند.[٥٥] ئەو هێشــتا هەر دەســتی بە لۆژیکی شــەڕی ســنووردارەوە گرتبوو.**

لەو نێوەشــدا ئیســڕائیل فشــارەکانی بۆ ســەر کۆشــکی ســپی دووهێندە کردەوە، بۆ ئەوەی ئەمریکا پشتیوانە سەربازییەکەی بۆ کورد زێدەتر بکا.[٥٦] ساواک ڕۆکێتی دەستکردی ڕووسـی دژە تانک و دژە فڕۆکەی ئیسـڕائیلی دایە پێشمەرگە، ئەو ڕۆکێتانەی ئیسڕائیل لە ١٩٧٣دا لە شەڕی ئۆکتۆبەردا لە لەشکری عەرەبەکانی گرتبوو.[٥٧] لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٤دا ئیسڕائیل لە ڕێی

---

[54] CIA Memorandum, "Defense and Humanitarian Support for General Barzani," October 31, 1974, NSA, KSWWOF, Box 19, GRFL.

[55] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 196.

[56] "Cable from Jerusalem Translated by Shalev and Dictated to General Scowcroft," August 24, 1975, NSA, KSWWOF, Box 19, GRFL. Note prepared by the Government of Israel, August 24, 1974, NSA, KSWWOF, Box 19, GRFL.

[57] Scowcroft to Helms, August 24, 1974 (CIA/FOIA/Helms), p. 1; Helms to Scowcroft, August 25, 1974 (CIA/FOIA/Helms), p. 1; Memcon, September 17, 1974, NSA, KSWWOF, Box 19, GRFL; Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 591.

خاکی ئێرانەوە بڕێکی زیاتری چەک و تفاق گەیاند.[58] لە کۆتاییدا و بە پشتیوانی چەکی قورس و لۆجستیکی ئێرانی و و ئیسرائیلی، ئەوە بوو **پێشمەرگە 'چەندین تانکی عێراقی تێکشکاند' و بەری بە پێشڕەوی سوپای عێراقی گرت.[59] لە هەمان کاتیشدا، سێ فڕۆکەی شەڕکەری عێراقی بە باجەری TU-16 Badgerیشەوە بە یەکەی تۆپخانەی ئێرانی و بە چەکی ڕاپیر Rapiersی دەستکردی بەریتانییەوە لە ١٤ و ١٥ی دیسێمبەرەوە خرانە خوارەوە.**[60] کەچی هێشتا شا ڕێگر بوو لەوەی بە تەواوی هێرش بکرێتە سەر عێراق.

**ئامادەکاری بۆ سەودای گەورە**

کاتێک جەنگەکە لەسەر حیسابی کورد پەرەیدەسەند، حەز و ئارەزووی پاشای پەهلەویش بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتن لەگەڵ بەغدا زیاتر دەبوو. لەپاڵ ئەمەشدا، وازهێنانی نیکسن لە ئابی ١٩٧٤دا و متمانەلەقبووی (شا)ش بە وڵاتە یەکگرتووەکان لەبارەی جێبەجێکردنی پابەندییەکانیان بە هاوکارییە ژێربەژێرییەکەیان لەگەڵ کورد، هەموو ئەمانە (شا)یان هێنایە سەر ئەو بڕوایە لەگەڵ بەغدا ڕێک بکەوێ. لەپاڵ سیاسەتی دیپلۆماسیانەی نوێی عێراق، -ئەویش بەکەمترکردنەوەی گرژیی لەگەڵ ئەوروپای ڕۆژئاوا و تەکاندانی پەیوەندییەکان بۆ چوونەپێشەوە لەگەڵ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا- ئەوەبوو ئەنوەر سادات و شا حوسێنی ئوردن داوایان لەشا کرد، بەڵکو گفتوگۆ نهێنییەکانی لەگەڵ بەغدا دەستپێبکاتەوە. سادات بە شای

[58] 211- White House, Memorandum of Conversation, Kissinger and Dinitz, October 19, 1974 (DNSA/KT01377), p. 9.

[59] Including Sagger (AT-3) and Strela missiles (SA-7). White House, Memorandum of Conversation, Kissinger and Rabin, November 7, 1974 (DNSA/KT01405), pp. 10–11.

[60] Alam, Assadollah. The Shah and I: The Confidential Diary of Iran's Royal Court,1968– 1977 (New York: I. B. Tauris, 1991), p. 403.

گوت؛ بەغدا ڕاستگۆیانە بەنیازە لە تەوەرەی مۆسکۆ بکشێتەوە.[٦١] لەگەڵ ئەوەشدا هێشا شا قەناعەتی بەوەنەهاتبوو کە بەغدا لەبارەی چارەسەرێک، جدییە.[٦٢] ئەو وەسفی حزبی بەعسی وەها کرد کە "دەستە و تاقمێکی بکوژ و خوێنڕێژن و لە بەغداوە بەچاوی دوژمنایەتی دەڕواننە ئەو"،[٦٣] بەم جۆرە ئەو پێیوابوو هەوڵ و تەقەلای دیپلۆماسیانەی عێراقی "تاکتیکێکە بۆ سەرنج لادان لەسەر کێشە جدییە ناوخۆییەکانی خۆی."[٦٤]

لەسەرێکی دیکەشەوە، سەرانی بەعس هێشتا لەبارەی بەرژەوەندییەکانی ئێران بۆ دەستپێکردنەوەی گفتوگۆ لەگەڵیان، بەگومان بوون. ئەوان پێیان وابوو شا هەرگیز پشت لە کورد ناکا و تێدەکۆشی عێراق بڕووخێنی. شازل تاقەی وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق بە لووری گوت، "**ئەگەر شا یان هەر کەسێکی دیکە [هەر] بیرۆکەیەکی وەک بەنگلادیشێکی نوێی لەبارەی عێراقەوە هەبێ، ئەوا کەوتووەتە هەڵەیەکی گەورەوە.**" بەگوێرەی قسەی شازلی تاقە بێ، "بارزانی نوێنەرایەتی کورد ناکا، ئەو لە دوا ڕۆژەکانی خۆی دایە، ئەوانەش کە گرەوی لەسەر دەکەن ئەوا گرەو لەسەر ئەسپی تۆپیو دەکەن."[٦٥] لەوەش پتر، سەرانی عێراق لەسەر ئەوە

---

[٦١] بەهەمان شێوەش، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا وەهای دانا ئەو کرانەوەی بەغدا بەسەر ڕۆژئاوادا ئەوا خۆدوورخستنەوەیەکی مەودا گەورەیە ولاتەکەیە لە سۆڤیەت.
Baghdad 1109 to the U.S Department of State, August 2, 1974, NPM, NSCF, CFME, Box 603; and U.S. Department of State 170249 to Tehran, August 5, 1974, (FRUS 1969–1976, XXVII, 256).

[62] Amman 7404 to U.S. Department of State, December 11, 1974, NSA, PCFMESA, Box 22, GRFL.

[63] Tehran 10954 to the U.S. Department of State, December 30, 1974, NSA, PCFMESA, Box 14, GRFL.

[64] Tehran 6206 to U.S. Department of State, July 28, 1974, NPM, NSCF, CFME, Box 603.

[65] Baghdad 564 to the U.S. State Department, August 29, 1974 (FRUS 1969–1976, XXVII, 710).

مشـــتومڕیان بوو کە ســـیاســـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە کوردســـتانی عێراق بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ پێکهاتەیەکی ســـەرەکی ستراتیژی بوو لە هەمبەر عێراقدا. سەرەڕای ئەم قسانەشیان، عێراقییەکان لەوە بەئاگابوون کە چارەنووسی جەنگەکە لەبەردەستی ئەواندا نییە. ئاخر ئەوان لەبن فشـاری قورسـی مۆسـکۆش دابوون. سـەرانی سـۆڤیەت بە سـەددامیان گوتبوو؛ "خۆ ئەوە باشترە لەگەڵ ئێراندا بکەوینە دانوستان و ئەوەش مایەی هۆشـــمەندی نییە خۆت لە دوو بەرەی جەنگەوە [ئێران و کوردستان] تێوەبگلێنی."[٦٦] تەنانەت شێخ محەمەد بن موبارەک ئەلخەلیفەی وەزیری کاروباری دەرەوەی بەحرێنیش ئاماژەیەکی وای بۆ ســـەددام کردبوو، کە باشـــترین ڕێگە بۆ هاوکاریکردنی وڵاتەکانی کەنداو ئەوەیە، کێشەی سنوور لەگەڵ ئێران و کوێتدا ببڕێنێتەوە. **ئیدی عێراق هەستی کرد لە هەرێمەکەدا تەنیایە.**[٦٧]

لەنێوان ١٢ی ئاب و ١ی ئەیلوولی ١٩٧٤دا، دانوستانێکی بەرایی ئاستنزمی دیپلۆماسـی لە ئیسـتەنبول بە سـەرپەرشـتی عەبدولڕەحمان سـەدرەی باڵوێزی ئێران و تاڵب شـبیبی باڵوێزی عێراق سـازدرا.[٦٨] هەرچەندە ئێران هەر لە دۆخی شـەڕدا بوو، لێ هەردووولا "**هەندێ لە شـانازییەکانی خۆیان قووت دایەوە.**"[٦٩] دانوستاندنەکانی ئیستەنبول بە دەرکردنی بڵاونامەیەکی هـاوبەش کۆتـاییپێهـات، کە ڕێی خۆشـــکرد بۆ ئەوەی لە پەراوێزی کۆبوونەوەی کۆمەڵەی گشـــتی نەتەوە یەکگرتووەکان وەزیری کاروباری دەرەوەی هەردوو وڵات بەیەک بگەن. لە ناوەڕاســـتی ئۆکتۆبەری ١٩٧٤دا،

---

[66] Iran's Ministry of Foreign Affairs, no Number, no Date.

[٦٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[68] Tehran 6788 to the U.S. Department of State, August 14, 1974; and aghdad 583 to U.S. Department of State, September 7, 1974, RG59, CFPF 1973–76, AAD.

[69] Baghdad 583 to the U.S. Department of State, "Iraqi-Iranian Conflict," September 7, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), pp. 1–2.

لە نیویۆرک عەباس عەلی خەلعەتبەری، وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران چاوی بە هاوتا عێراقییەکەی شازل تاقە کەوت.[٧٠] هەرچۆنێک بێ دانوستانەکان بێ ئەنجام بوون. خەلعەتبەری گوتی، "گفتوگۆکان توند و رەق بوون، بێگومان نەرمونیان نەبوون." ئاخر هیچ لایەکیان [نەیدەتوانی] سازش بکا."[٧١] عێراقییەکان هیچ نەرمییەکان لەبارەی رێرەوە ئاوییەکەی ئەروەند رووددا نەنواند، کە "خاڵی بنەرەتی هەر چارەسەرییەکی نێوانیان بوو."[٧٢] شا وێرای روانینە توندەکەی، کەچی دەیزانی پێگەی کوردان ناسکە. ئەو لەگەڵ کیسنجەردا رەشبینی خۆی لەبارەوە دەربڕیبوو، وەهای گوتبوو؛ "خۆ ئەگەر تەنانەت عێراقییەکان لە تێکشکاندی کورداندا سەریش بکەون، ئەوا ئەوان وەک مێخ لەسەر سنووری ئێران لێیدادەکوتن، ئەویان پێباشترە لەوەی بچن و لەبەرەی سووریاوە رووبەرووی ئیسرائیلییەکان ببنەوە."[٧٣] ئەو دەیزانی پەرەسەندنی تێوەگلانی ئێران لە جەنگی کورددا هەرەشەیەکە بۆ وڵاتەکە، بۆ ئەوەی لەگەڵ عێراقدا بکەوێتە جەنگێکی سەرتاسەری.

**لە گومان نەمابووە کە جەنگ لە بەرژەوەندی کورداندا نییە. ئاخر هەر بە تەنیا ٤٠،٠٠٠ کورد بە چەکی بەرگرییەوە شەڕی ٢٠٠،٠٠٠ سەربازی عێراقی دەکەن. لە پاڵ ئەمەشدا زستانە نەرمەکەی ١٩٧٤-١٩٧٥ رێگەی بە هێزی هەوایی عێراقی دا "بۆ چەندین هەفتە" بەردەوام بێ لە بۆمبارانکردنی**

[70] Tehran 8821 to the U.S. Department of State, "Iran and Iraq Resume Talks; Khalatbary at UNGA," October 21, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), p. 1.

[٧١] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[72] Tehran 10592 to the U.S. Department of State, December 16, 1974, NSA, PCFMESA, Box 14, GRFL.

[73] Kisinger to Scowcroft, Isfahan, November 3, 1974, 0115Z, FRUS, 1969–1976, IranIraq, 1973–1976, Vol XXVII; Scowcroft to Ford, November 3, 1974, NSA, Trip Briefing Books and Cables for HAK, Box 3, GRFL.

**ســـەنگەرەکانی پێشـــمەرگەدا.**[٧٤] شـــا گوتی؛ ئەوە هەر یەکەکانی تۆپخانەی ئێرانی بوون بەدرێژایی سنوور پاڵپشتی پێشمەرگە بوون و ڕۆژانە بە ٣٠٠ تۆپ مۆڵگە و پێگەکانی عێراقییان دەکوتا.[٧٥] پشتگیری تۆپخانەی ئێرانی "زۆر کـاریگەر بوو"، ئەمەش یـارمەتی پێشـــمەرگەی دا، ئەوانەی "چیـدی نەدەکشـانەوە بەڵکو سـەرسـەختانە دەجەنگان."[٧٦] هەر بەڕاسـتیش، هێزی ئاگری تۆپەکانی تۆپخانەی ئێرانی بەغدای ناچارکرد سوپاکەی لە گەلییەکان بکێشـێتەوە، ئەمەش سـەنگەرەکانی کوردی لە حاجی ئۆمەران قایمکرد. بە هاتنی مانگی کانوونی یەکەم، ئێرانییەکان ڕێگەیەکی نوێیان لە کوردسـتانی عێراق لێدا. لەگەڵ ئەوەشـــدا کوردەکـان نەیـاندەتوانی وابکەن زیـانیـان پێنەکەوێ. لەم دوایـیـانەدا بە دانپێـدانـانی ڕووس، سـوپـای عێراقی سـەنگەرەکانی پێشـمەرگەی لە چیاکاندا تێکشـکاندبوو. کاتێکیش شـا بە کالاهانی گوت، بەتەنیا پشـتیوانی ئێران ناتوانێ دۆخە گرژەکە بگۆڕێ، کە هۆکاری سەرەکیش بۆ تاکتیکی نوێی سەربازیی عێراقی دەگەڕێتەوە.[٧٧] شا بەم جۆرە لە لای ئەسـەدوڵلا ئەعلەمدا نیگەرانی خۆی لەبارەی ڕۆڵی سـۆڤیەت لە جەنگەکەدا دەربڕی: **"بۆ بەدبەختیش، عێراقییەکان لێبڕاوانە کوردەکانیان بەزاند. ئێمە بۆ ئەوان [بۆ کورد] تۆپی دوورهاوێژ و ڕۆکێتی دژەتانکمان ناردن. پێموابوو ئەوان عێراقییەکان دەشکێنن. لەگەڵ ئەوەشدا،**

---

[74] Tabriz 32 to the U.S. Department of State, "Iraqi Kurdish War: Failure of Iraqi Summer Offensive," December 2, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), pp. 1–3.

[75] White House, Memorandum, "Defense and Humanitarian Support for General Barzani," October 31, 1974 (GFL/KSF/Box20//Kurds-10/15/73–12/5/74), p. 1.

[76] Helms to Kissinger via Scowcroft, November 13, 1974 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–7.

[77] Helms to Kissinger via Scowcroft, November 13, 1974 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–7.

**ئەوە ڕووس بوون نەوەک عێراقییەکان کە کوردیان بەزاند."[٧٨]** ئیدی لەو ڕەوشـــەدا پێشـــمەرگە بەبێ دەســـتوردانی ڕاســـتەوخۆی هێزی ئێرانی پێیدەرنەدەچوو؛ ئەمەش ڕاسـتییەکی تاڵ بوو بۆ شـا، ئەو کەسـەی وەهای دەبینی، جەنگ لەگەڵ عێراقدا شتێکە هەردەبێ بکرێ.

لەو نێوەدا پاشـای پەهلەوی دەستی بەکارکردن کرد لەسـەر هەردوو پلانی هێرش بردن و بەرگری. ئەو فەرمانی بە سـوپای ئێرانی دا تا نەخشـەیەک بۆ دابەزاندنی هێزەکانیـان بۆ نێو خـاکی عێراق و تـاودانی گرژییەکەیـان لەگەڵ بەغدا. هـاوزەمـان ئەســـەدوڵڵا ئەلئەعلەمیش بە هـاوکاری تەواوی ســـاواک و ســـوپا ڕێنمایی ئامادەکردنی پلانێکیان کرد بۆ ئەوەی ڕێگای ئاسایشپارێزی بۆ یەکەکانی تۆپخانەیان لەبن هەر بارودۆخێکدا بێ بۆ کاتی کشـانەوەیان لە کوردسـتانی عێراقدا ئامادە بکەن.[٧٩] لە هەمان کاتیشـدا شـا ئامادەبوو سـەودایەکی گەورە لەگەڵ سـەرانی بەعسـدا بکا. ئەوەبوو لە ٤ی دیســـێمبەری ١٩٧٤ پاشـــای پەهلەوی بە هێلمزی گوت، "**من مەراقم بزانم ئاخۆ بۆچی سوکوئاسان عێراقییەکان لەسەر ئەروەند ڕوددا لەگەڵمان ڕێک ناکەون؟**" هەروەها ئەوەندەشـی بۆ زیاد کرد؛ "خۆ لەپاش هەمووشـتێکیش، کێشـەکان ئەوەندە مایەی نیگەرانی نین."هێلمز لە ڕێی ئەعلەمەوە ئەوەی بۆ دەرکەوت کە **شا حوسێن خەریکی نێوەندگیرییەکی نهێنییە لەنێوان تاران و بەغدا** دا."[٨٠] ئینجا ئەو دەســـتبەجێ کیســـنجەری ئاگادارکردەوە لەوەی "هیچ شـــتێک لە پەســـەندنامەی عێراقییەکان بۆ یەکاوی عەرەبی و کێشـــە

[78] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani]. Vol. III: 1352/1973 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 211.

[79] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). p. 267.

[80] Tehran 10429 to U.S. Department of State, "King Hussein's Intermediary Role," December 10, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), pp. 1–2.

سـنوورییەکانی دیکە کەمتر بترازێ ئەوا لە ئێران گوێی لێناگیرێ. شـا بەتوندی پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە حکومەتێکی "شایستە"ی جیاواز بۆ بەغدا پێویستە. ئەمەش یەکێک بوو لە هۆکاری پشتیوانی سەربازییانە بۆ کورد. لێ ڕێک لەم کاتەدا هەر ڕێککەوتنێکی عێراقی بۆ چارەسەرکردن لەگەڵ ئێران زۆر جێی چاوتێبڕین بوو، ئاخر جەنگی کورد تا دەهات خەرجییەکەی زێدەتر دەبوو، بەڕوانینی ئێرانیش تادەهات دۆخەکە دژوارتر دەبوو.[٨١]

ئیدی لەم بەرڕەوتەدا، شـا ڕووبەڕووی بڕیارێک بووەوە، ئەوەتا یان جەنگەکە تاوبدا یاخود لەسەر پرسی کورد-ئەروەند ڕود بکەوێتە دانوستاندن. بەڵێ ئەو باش لەوە ئاگادار بوو، کە پێگەی سوپای عێراقی لە شەڕەکەدا باشتر بووە، بەغداش بڕیاریداوە لە بەهاردا کۆتایی بە شۆڕشگێڕانی کورد بهێنێ. کەواتە تاکە بژاردە بۆ شا مابێتەوە ئەوەبوو پەیوەستبوونی بە شەڕەکە چڕتر بکاتەوە، لە بەرانبەریشدا ئەو هاوپەیمانییە نوێیە تازەیەی لەگەڵ سەرکردە عەرەبە میانڕەوەکان پەیدایکردووە بەتایبەتی ئەنوەر سادات بنکوڵ بکا و لەناوبەرێ.[٨٢] لەسەرووی هەمووشیانەوە، شـا لە بارەی لاوازبوونی پێگەی سەوداکردنی ئێران نیگەران بوو. بە هەڵکشانی ئەگەری شکستی کورد، نەیدەویست توانستی عێراق بۆ سازکردن لەسەر ئەروەند ڕودیش بدۆڕێنێ.

---

81 Tehran 10429 to U.S. Department of State, "King Hussein's Intermediary Role," December 10, 1974 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1974), pp. 1–2.

٨٢ لە دیدارێک لەگەڵ ئەلبەیرقدا، سادات ئەو باسوخواسەی هێنایە گۆڕێ؛ "شای ئێران ئاوەزمەندە، سەرکردەیەکی هۆشمەند و بەهێزە بۆ لێکدانەوەی سیاسەتەکانی هەرێمی و نێودەوڵەتی. هەروەها ئەوەشی بۆ زیادکردبوو، کە قاهیرە لە هەوڵی نێوەندگیری نێوان ئێران و عێراقدا دایە.
Beirut 3464 to Ministry of Foreign Affairs, 9 January 1975.

**بە سـەردانی بەکر و سـەددام بۆ ئوردن لە ١٥ی ینایردا، بەغدا نەرمونیانی لەبارەی ڕێککەوتنەوە نیشـان دا.**[٨٣] هەر دوو ڕۆژیش دواتر خولێکی دیکەی گفتوگۆی دیپلۆماتی لە ئیسـتەنبول کرایەوە. لە دانیشـتنەکەدا، خەلعەتبەریی وەزیری کـاروبـاری دەرەوەی ئێران لەسـەر مـافی ئێران لە ڕێڕەوە ئـاوییەکەی ئەروند ڕووددا مکوڕ بووەوە، ئەمە و لەکـاتێکدا سـەعدون حەمـادی، وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراقیش داوای لە تـاران کرد واز لە پاڵپشتی کوردان بهێنێ. ڕاستییەکەش ئەوەبوو:

***هەرکاتێک داوای ئێران لەبارەی [ئەروەند ڕوددا] پەسـەند کرا، ئەوسـا لایەنەکان دەکرێ بابدەنەوە سەر چارەسەرکردنی کێشەی کورد. عێراقیش بە پێچەوانەوە، خوازیاربوو یەکەم جار کێشـەی کورد چارەسـەر بکرێ، ئینجا لەسـەر یەکاوی عەرەبی (شـط العرب) ڕێک بکەوێ. لەوەش پتر، لە کاتێکدا عێراق خوازیاربوو لەبارەی هەندێ ناوچەی کێشـەلەسـەر بۆ ئێران ئاسانکاری بکا و نەرمی بنوێنێ، کەچی بە سەروەرێتی ئێران بەسەر ناوچە ئاوییەکان قایل نەبوو.***[٨٤]

وێڕای ناکۆکی بەرچاو، کەچی گفتوگۆکانی ئیسـتەنبول سـەرکەوتوو بوو، چونکە ئامادەکارییەک بوو بۆ کۆبوونەوەی شـا و سـەددام لە پەراوێزی کۆبوونەوەی سـالانەی ڕێکخراوی نەوتبەرهەمهێنەران (ئۆپیک) لە مانگی ئـازار لە وڵاتی جەزائیر.[٨٥] **سـەددام دەیزانی عێراق نـاتوانێ لە یەخەی قەیرانی کوردی بکاتەوە ئەگەر هاتوو پشـتگیری ئێران بۆ کورد بەلایەکدا نەخا. دوا بڕیاریش پێدانی نرخی ئەروەند ڕود و "خواردنەوەی پێکێک لە ژەهر بوو."**

---

83 Baghdad 47 to the U.S. Department of State, “King Hussein’s Invitation to Iraqi Leaders,” January 17, 1975 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1975), p. 1.

84 Ankara 904 to the U.S. Department of State, “Iran-Iraq Talks,” January 31, 1975 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1975), p. 1.

85 Baghdad 59 to the U.S. Department of State, “Iranian-Iraq Negotiations,” January 22, 1975 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1975), p. 1.

هەردوو وڵات، وڵاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل گومانێکیان پەیداکردبوو لەوەی شای ئێران لەنەخشەی دایە لەگەڵ عێراق ڕێکبکەوێ و کوردیش وەک کارتێکی سەودا بەکاربهێنێ.[86] هەرچۆنێک بێ شتاقیان، نە تەلئەبیب و نە وڵاتە یەکگرتووەکان لەو پێگەیەدا نەبوون بەبێ ڕەزامەندی ئێران پشتیوانی کوردان بکەن. **ئەوان دەیانزانی بە پشتتێکردنی شا لە بارزانی، ئەوا دەستبەجێ ئۆپەراسیۆنەکەیان کۆتایی پێدێ.[87] لەو نێوەشدا، شا دوا دەرفەتی دایە کوردان. لە بەرایی مانگی شوباتدا، پێشمەرگە دژەهێرشێکی کردە سەر سوپای عێراق، بەڵکو لە سەنگەرەکانی هەڵبقەنێ و دەری بکا، کەچی هەرزوو هەڵمەتەکە شکستی هێنا.[88] کورد لەبەر تەکتیکەکانی خۆپارێزی و بەرگریکرن، ئەو لێهاتوویە و توانایەیان لە تەکتیکی هێرشبردن و پەلاماردان نەبوو. شکستهێنانیان لەوەی بتوانن پاڵ بە سوپای عێراقەوە بنێن و پاشەکشەی پێبکەن، قەناعەتی بە شا هێنا لەگەڵ بەغدا چارەسەری سنووری کێشەلەسەر بکا.**

**لەو هەلومەرجەدا، کیسنجەر لە ١٩ی شوباتی ١٩٧٥ لە زیورخی سویسرا چاوی بە شا کەوت. شا بە نائومێدی لە نەتوانایی کورد بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئامێری سەربازی بەعس نەخشەی خۆی بە کیسنجەر**

---

[86] لە ١٦ی ینایری ١٩٧٥دا، یگال ئالون جێگری سەرۆکوەزیری ئیسرائیل و وەزیری کاروباری دەرەوە داوای تەلئەبیبی دووبارەکردەوە بۆ پێویست خێرا بەهانەوەچوونی پێشمەرگەی کورد تا بتوانێ هێرشەکەی سوپای عێراق ڕابگرێ. ئەو کیسنجەری لەوە ئاگادارکردەوە کە عێراقییەکان بۆ یەکەمین جار توانیویانە سەنگەرەکانی خۆیان لە چیاکان بپارێز و قایمی بکەن، هەروەها ئالون ئاماژەی ئەوەشی بۆ کرد، کە شا پێدەچێ "یاری خۆی بکا" و هۆشداری دایە کیسنجەر لەوەی "دەستبەردابوونی کورد تاوانە." بڕوانە:
See Memcon. January 16. 1975. 01477, NSA; and White House. Memorandum of Conversation, January 16, 1975 (DNSA/KT01477), pp.10–11.

[87] Baghdad 52 to U.S. Department of State, "Iraqi-Iranian Conflict," January 18, 1975 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1975), pp. 1–2.

[88] Tabriz 8 to U.S. Department of State, "Iraqi Kurdish War: Temporarily Quiet," February 2, 1975 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1975), pp. 1–5.

**گوت، بەوەی بە تەمایە لە جەزائیر سەددام حوسێن ببینێ و لەگەڵی لەسەر پشـــتکردنە کورد ڕێک بکەوێ و لە بەرانبەریشـــدا ســـازشـــێک لە ڕێڕەوە ئـــاوییەکەی ئەروەنـــد ڕودا وەربگرێ. ئەو پێیوابوو کە کورد 'ئـــازایەتی نەماوە'؛ هەربۆیە کورد بە نوشستی بارزانی لەگەڵ حکومەتی یەکگرتوویی نیشتمانی دەکەون و دەبنە مەترسی بۆ سەر ئاسایشی نیشتمانیی ئێران،** ئەمەش بە دروســـتکردنی "دەوڵەتێکی کوردی ئۆتۆنۆم دەبێ، کە دەکەوێتە بن هەژموونی حکوومەتێکی ناوەندی کۆمۆنیســـتی عێراقی." هەروەها شـــا لەبـــارەی ئەگەری بەنێودەوڵەتبوونی نـــاکۆکییەکە و دەســـتوەردانی ئەنجوومەنی ئاســـایشـــی نەتەوە یەکگرتوەکانیش نیگەران بوو.[89] لەگەڵ ئەوەشـــدا کیســـنجەر داوای لە شـــا کرد دەســـتبەرداری کوردان نەبێ، بە بەڵگەوبەندی ئەوەی؛ "هەر دڵنیاکردنەوەیەکی ســـەددام حوســـێن لەبارەی حکوومەتی ناوچەی کوردی... ئەوا بێ ئەرزشـە." ئەو ئەوەشی خستەسەر، هەر ڕێککەوتنێک لەگەڵ سەرکردە بەعسییە بێ متمانەکان ئەوا "بیرۆکەیەکی خراپە بەتـایبەتیش ئەو بیرۆکەیەی کە ئەو بڕوای بە دڵنیـاکردنەوەکـانی [عێراقی] کردووە، کە هیچ کۆمۆنیســـتێک ناخرێتە گەڕ [لە بەرپرســـیارێتی کوردســـتـانی ئۆتۆنۆمـدا]".بە ئـاگـاداربوون لە ڕێڕەوە ئـاوییە نوێیەکەی دوورگەی خەرج بۆ هەنـاردەکردنی نەوت و پشـــتنەبەســـتن بەڕێڕەوە ئاوییەکەی ئەروەند ڕود بۆ ناردنەدەرەوەی نەوت، ئیدی کیســـنجەر هێڵی بەژێر دەســـتکەوتی ســـتراتیژی هاوکاریی ســـی ئای ئەی-ســـاواک لە کوردســـتانی عێراق لەدژی ســـازشـــی عێراق لەبارەی ســـنوورەوە هێنا. کیسنجەر هەر هۆشدارییەکانی شای بەبیر خۆی هێنایەوە بەوەی گوتبووی کە هەرەسهێنانی کورد دەکرێ سەرتاپای ناوچەکە بشڵەقێنێ و پێیراگەیاند کە هەر ڕێککەوتنێـک لەگەڵ بەغـدا ئەوا بەهێزکردنی ڕژێمی لایەنگری مۆســـکۆیە لە هەرێمەکەدا و یان کۆمەککردنی کۆمۆنیســـتەکانی عێراقە تا

[89] White House, Memorandum, Scowcroft to President Ford, February 19, 1975 (GFL, NSC, Middle East and South Asian Affairs Staff Files, December 2008 Opening, Box 9), pp. 1–2.

دەسەڵاتیان بچەسپێنن. ئەو ئەوەشی بۆ زیاد کرد، هەر ڕێککەوتنێک لەگەڵ بەغدا دەکرێ وا لە سەرانی سۆڤیەت بکا "سەرچڵییەک" بکەن؛ ئاخر ئەوان وەهای دەبینن کە پاشەکشەی ئێران وەک لێکەوتەیەکی پەرەسەندنی لاوازی ڕۆژئاوا دەبینن." لەگەڵ ئەوەشدا، شا دەیزانی کورد بەبێ پشتگیری زیاتر ناتوانن خۆیان بگرن و ئەگەر هاتو ئێرانیش کۆمەکی خۆی زێدەتر کرد ئەوا سەردەکێشی بۆ شەڕێکی سەرتاسەری لەگەڵ بەغدا. هەرچۆنێک بێ لە کۆتایی گفتوگۆکەدا، شا بە نابەدڵی کیسنجەری دڵنیاکردەوە کە بەم زووانە کۆتایی بە پاڵپشتکردنی کوردان ناهێنێ.[٩٠]

سەرەڕای گۆڕانی شا لەناخەوە، هێشتا کیسنجەر دوودڵ بوو لەوەی بەبێ شا پەرە بە پەیوەندییەکانی ئەمریکی-کوردی بدا.[٩١] پێشتر و لە ٢٢ی ینایری ١٩٧٥دا داوایەکی بارزانی بۆ چەکی ڕۆکێتی ساگەر Saggerی دژە تانک ڕەتکردبووەوە.[٩٢] لە نیگەرانی ئەوەی کاتی کوردی لە مەیدانبازیی جیۆپۆلیتیکی لەگەڵ مۆسکۆدا لەدەست بدا، ئیدی کیسنجەر تەلئەبیبیشی هۆشیار کردەوە لەوەی شا "لەوانەیە ئەگەر هات و لە کۆبوونەوەی ئۆپیکدا

[90] Kissinger to Barzani, February 20, 1975, NSA, KSWWOF, Box 19, GRFL.

[٩١] **کیسنجەر لە ٢٠ی شوباتدا وەڵامی نامەی مانگی ینایری بارزانی دایەوە. ئەو وەهای نووسی: "من دەمەوێ تۆ بە سەرسامی ئێمە بە خۆتان و بە گەلەکەتان بۆ هەوڵ و تەقەلا جەربەزەکەتان بزانی. ئەو سەختییانەی ڕووبەڕوویان بوینەوە گەورە و زەبەلاحن. پێزانینی زۆرم بۆ خوێندنەوەی هەڵسەنگاندنی تۆ لەبارەی ڕەوشی سەربازی و سیاسییەوە هەیە. تۆ دڵنیابە لەوەی پەیامەکەت لەسەر ئاستی باڵا لە حکومەتی وڵاتە یەککگرتوەکان کەوتووەتە بەر سەرنجی جدی، چونکە شتەکە لای ئێمە بە بایەخە." هەروەها ئەو پێشنیازی کردبوو کە سەرکردەی کورد بە نهێنی نوێنەرێکی بنێرێ لەجیاتی ئەوەی بەخۆی سەری وڵاتە یەککگرتووەکان بدا و ئەوەشی بۆ خستبووەسەر "من لەو بڕوایەدام کە نهێنیبوون شتێکی هەرە گرنگە بۆ بەردەوام بوون لەسەر توانستی ئەوەی کردوومانە؛** ئاخر هەر لەبەر ئەم هۆکارەوەیە -لەگەڵ نیگەرانبوون لەبارەی سەلامەتی خۆت- کە داوای لە پێشنیازکردنی دیداری ڕاستەوخۆی من لەگەڵ تۆ دا." بڕوانە:
White House, Kissinger to Barzani, February 20, 1975 (GFL/ KSF/Box20/ Kurds-2/20/75–2/12/76), p. 1.

[92] Letter, Barzani to Kissinger, January 22, 1975 (GFL/KSF/Box20/Kurds-2/20/75–2/12/76), pp. 1–13.

دانوســـــتان لەگەڵ عێراقییەکاندا بکا 'ئەمەش بە گۆڕینەوەی بەو ڤیتۆیەی ئاخۆ کێ لەجێگەی دادەنێن ئەگەر بارزانی هاتەدەر.'[93] بارزانیش بەهەمان گیانی دنەدەرانە لە نەخشەی شا بۆ دەستتشوشتن لە کورد ئاگادار نەبوو. لە ڕووبەڕووبوونەوەی بۆمبابارانی بەردەوامی فڕۆکە و تۆپخانەی عێراقی بارزانی گوتی؛ 'شـــــتەکە بۆتە مەحاڵ... لەژێر ئەم بارودۆخە هەنووکەییەدا بجەنگێ. بۆ وەرگرتنی چەکی پێشـــــکەوتوو هانای بردە بەر ئێران و لە ئـــاخروئۆخری شـــــوبـاتی ١٩٧٥دا داوای جـاڕدانی ســـــەربەخۆییەکەی دووبارەکردەوە. کەچی داوای بارزانی بۆ بینینی شـــــا ڕەتکرایەوە. ئەحمەد چەلەبیش ڕەوشی ئەو ڕۆژانەی وەها گێڕایەوە:

***من لە ١٩٧٥دا چوومە لای بارزانی تا لەو بارەیەوە ئاگاداری بکەمەوە. ئەو نەیویســـــت لەوێ لە مـــاڵ، لەو کۆشـــــکەی ئێرانییەکـان بۆ حەوانەوەی دابوویانێ، قسە بکا. هەرچەندە ئاووهەواش ساردوسڕ بوو، ئەو منی بردە دەر، لە باخچەکە ڕاوێچکەمان لێدا و منیش شتەکەم پێگوت. ئەویش گوتی: 'ئێســـــتا دەزانم ئەو بیژمۆتانە بۆچی لێنەگەڕاون شـــــا ببینم'. ئەو گوتی بۆ ڕۆژی دووەم شـا پشـووی خلیسـکانەی سـەر بەفر هاتەوە تاران، هەر ٢٤ سەعاتی پێچوو ئینجا بەرەو جەزایر فڕی و ڕێککەوتننامەکەی واژۆ کرد.'[94]***

لە ٥ی ئازاری ١٩٧٥دا **ئەشـــــرەف مەروان**، ڕاوێژکاری ســـــادات و زاوای جەمال عەبدولناســـــر، لەپاش ئەوەی ڕاســـــتەوخۆ لە بەغدا گەڕابووەوە پەیامێکیشی لە سەددامەوە پێبوو چاوی بە شا کەوت. ئەو بە شای ڕاگەیاند کەوا '**ئەگەر هات و ئێران فشاری سەربازییانەی لەسەر عێراق لادا کەوای لێکردووە بەرەو باوەشـــی ســـۆڤیەت هەنگاو بنێ، ئەوا ســـەددام حوســـێن**

[93] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 593.

[94] In interview with Dr. Ahmad Chalabi: How is it possible that Saddam Hussein is still in power in Baghdad? See http:// www.pbs.org /wgbh/pages/ frontline/ shows/saddam/ interviews/ chalabi.html.

**ئامادەیە عێراق لە کەمەرەی سـۆڤیەت بهێنێتەدەر.** ئەشـرەف مەروان ڕوانینێکی وەهای دەربڕی کە تاڕادەیەکی زۆر دڵنیایە لەوەی سـەددام هەروەک بەڵێنی خۆی داوە خۆی لە تەوەرەی سۆڤیەت بکێشێتەوە."[٩٥] **ئیدی سەکۆ بۆ سەودایەکی گەورە دانرا.**

## ڕێککەوتنی ١٩٧٥ی جەزائیر

شـا لە ٣ی ئازاری ١٩٧٥دا بۆ کۆبوونەوەی ئۆپیک، بۆ جەزائیر ڕۆیشـت. کۆبوونەوەکە بە سەرۆکایەتی سەرۆک هەواری بومدیەن بوو، ئەو کەسەی دۆستایەتییەکی باشی لەگەڵ شادا هەبوو. شا لە دوای دوو ڕۆژی چڕوپڕی دانوسـتاندن شـا ڕووبەڕووبەڕوو لەگەڵ سـەددامدا قایلبوو بەوەی پشـتیوانییەکەی خۆی بۆ کورد سـڕ بکا، لەبەرانبەریشـدا بەغدا دانی بە سـەروەری ئێران بەسـەر نیوە بەشـە خۆرهەڵاتییەکەی ئەروەند ڕوددا دانا. **بەیاننامە هاوبەشـە واژۆکراوەکە، مۆری بەدبەختی لەنێوچاوانی کوردان دا و هێڵی تالوگی لە ئەروەند ڕودا جێگیر کرد.**[٩٦] **هەر لە جێگەی خۆشیەوە**

---

[95] Tehran 2237 to the U.S. Department of State, "Iranian/Iraqi Agreement," March 10, 1975 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1975), p. 1.

[٩٦] مەرجەکانی پەیماننامەی جەزائیر پێکهاتبوون لە: **(١) دانانی سـنووری ڕووبارەکە بەگوێرەی هێڵی تالوگ؛ (٢) جیاکردنەوەی سنووری لەسەر بنەمای پرۆتۆکۆلی کوستەنتینەپۆلی ١٩١٣ و کۆنووسی کۆمسیۆنی دیاریکردنی سنووری ساڵی ١٩١٤؛ (٣) کۆنترۆلکردنێکی توندوبەندی کارای سەرسنور بۆ کۆتاییهێنان بە هەموو دزەکردنێک لە هەر دیوێک بێ، ئەمەش واتای کۆتاییهێنان بە پشـتگیری ئێرانی بۆ پێشـمەرگەی کورد و وروژاندنی هەسـتی دژەحکومەت لەنێو گروپە کەمایەتییەکەیان دەگەیاند بەتایبەتیش خەڵکی عەرەب لە خوزستان هەروەک ڕێگەپێدانی لادەرە ئێرانییەکان نەبدرێن تا چالاکییەکانیان لەسەر خاکی عێراقی بکەن؛ (٤)ئەم سێ خاڵە ڕێکخراوەی سەروو توخمگەلێک نین لەیەک جیابکرێنەوە لە چارەسەرییە گشتییەکەدا. لەپاڵ ئەمەشدا، هەردوولا قایلبوون بەوەی پەیوەندی بەردەوامیان بە سـەرۆکی جەزائیر هەواری بومیدینەوە لە کاتی جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتنامەیە هەبێ و وەزیریەکانی کاروباری دەرەوەشیان کۆمسیۆنێک بۆ جێبەجێکردن پێکبهێنن.** بڕوانە: Defense Intelligence Agency Notice, March 7, 1975, FRUS 1969–1976, XXVII, 273; and Baghdad 248 to U.S. Department of State, "Iraqi-Iranian Agreement," March 8, 1975. (NARA/ AAD/ RG59/ CFPF/ET/1975), p. 1.

بریارەکەی شـــا درا. کەســـیش ئاگای لە بریارەکەی ئەو نەبوو. **تەنانەت ئەســـەدوڵلا ئەعلەم و گەورە کاربەدەســـتانی ســـاواکیش لە تاریکیی هێڵرابوونەوە و نەیانـدەزانی.**[97] بـاڵوێزی ئێران لە بەیروت وەهـای بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی خۆی نووسی؛ "بۆ ئێمە شتێکی تەواو لەناکا و سـەرسام بوو، کە چۆن بەو خێراییە ئێران و عێراق گەیشتنە ڕێککەوتن. ئێمە چاوەڕوانی شـــتێکی وەهامان نەدەکرد."[98] شـــا ڕێگەی بە کەس نەدا هەندێ لەبەندەکانی ڕێککەوتننامەکە هەڵبســەنگێنی بە ڕووبەرە کەمە خاکی دەوڵەمەنـد بە نەوتیش کە هی ئێران بوو، درایە عێراق.[99] **تەنـانەت دوای واژۆکردنی ڕێککەوتننـامەکەش هەرگیز نەبردرایە پەرلەمـان تـا پەســـەند بکرێ.** هەروەها هێلمزی باڵوێزی ئەمریکاش "نائاگا" بوو و ڕێککەوتننامەی جەزائیری بۆ "مەتەڵ" بوو.[100] تەنیا ڕێگە بە جمشـید ئاموزگار و نەسـروڵلا ئینتزام، سـەرۆکی کۆمپانیای نەوتی ئێران درابوو یاوەری شـا بن. لەوەش سـەرنجڕاکێشـتر، **هێزی سـەربازی ئێرانی کە لە کوردســـتانی عێراق دەجەنگان، ئاگایان لە بریارەکەی شا نەبوو. ڕێک هەر دوای ڕێککەوتننامەکە، "دوو بەتالیۆن و نیو لە تۆپخانە و چەکی دژەفڕۆکە و ســـەربازی دیکە کە لە عێراق دامەزرێنرابوون بە پەلە و خێرا فەرمـانیـان پێکرا بکشـــێنەوە سـەرسـنوور."[101] بەگوێرەی قسـەی ئەسـەدوڵلا ئەعلەم، "سـەد دانە پارچە تۆپی مەیدانی هەروەک ڕۆکێتی دژەتـانـک و دژەفڕۆکەش، کە هەموویـان ئەفســـەرانی ئێرانی هەڵیاندەســـوڕاند [لە کوردســـتانی عێراق] لە شـــوێنی**

[97] Col. Isa Pejman in an interview with Habib Lajevardi, Paris, March 4, 1983, Tape 1, Harvard University Iranian Oral History.

[98] Beirut 1004 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 14 June 1975.

[99] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 50.

[100] David Korn, "The Last Years of Mullah Mustafa Barzani," 1/2 (1994), Middle East Quarterly, pp. 12–27.

[101] Kimche, David, The Last Option, (New York: Maxwell Macmillan International, 1991) p. 195.

**خۆیان تێکوپێکشــــکێنران، چونکە کاتی تەواو لەبەردەســـتدا نەبوو تا بهێنرێنەوە ناو ئێران.**[١٠٢] دوای گەڕانەوەی شـــا لە ٧ی ئازاردا، بە ئەعلەمی گوت کە ئەو دانوســـتاندنەی لەگەڵ بەغدا و لە ئۆپیک کردی زۆر ســـەخت بوو، بۆیە هەر چەند سەعاتێکی کەم خەوتووە.[١٠٣] بەتەواوی لە گەشتەکەی شەکەت و داهێزرا بوو، لەگەڕانەوەیدا کێشیشی دابەزیبوو. لەگەڵ ئەوەشدا پاشـــای پەهلەوی بەو دەســـتکەوتەی بۆ چارەســـەرکردنی ئەروەند ڕودی کێشـــەلەســـەر، شـــادمان بوو. لە ڕوانگەی شـــاوە، ڕێککەوتننامەی ١٩٣٧ لەبارەی ئەروەند ڕود لەکەیەک بوو بە هەنیەی قەڵەمڕەوەییەکەیەوە. لەپاش ڕێککەوتننامەی جەزائیر، شا بە ئەعلەمی گوت:

***بە شـێوەیەک لە شـێوەکان من لە دوو بڕیاری باوکم بە داخ و پەشـیمانم، ڕێککەوتننامەی سازشـکارانەی ١٩٣٧ و پرسـی ئەروەند ڕود. ڕۆژێک دێت ڕەخنە لە هەردووکیان بگیرێ، هەرچەندە هیچ ئەگەرێک نەمابووەوە [کە ئەو دوو ڕێککەوتننامەیە مۆر نەکرێن]. ســـوپاس بۆ خودا، من بەتەواوی پرســـی نەوت و ئەروەنـــد ڕودم چـــارەســـــەر کرد. هەرچەنـــدە ئێمە [ڕێککەوتننامەی سەعدئابادی ١٩٣٧]مان بۆ ماوەی ١٢ ساڵان ڕەچاونەکرد، منیش دەق نامەوێ بە لایەنێکی ڕێککەوتننامەکە بمێنمەوە.. هەنوکەش دوای ماوەیەکی زۆر، توانیم پەیماننامەی ئەروەند ڕود بدڕێنم.***[١٠٤]

بە پەسەندانی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی بەوەی ڕێککەوتننامەکە سەرکەوتنێکی بەرچاو بووە بۆ ئێران، ئیدی ڕێککەوتننامەی جەزائیر سیاســەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانی لە کوردستانی عێراق پچڕاند. ڕژێمە عەرەبییەکانیش

---

[102] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). p. 347.

[١٠٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٣٤٠.

[١٠٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٣٤١.

شـــادمانیی خۆیان نەشـــاردەوە.[١٠٥] ئیدی هیچ بوارێکی دیکە بۆ بارزانی لە خەملاندنی ستراتیژی شادا نەما. **هەر دوو ڕۆژ پاش ڕاگەیاندنی فەرمیٰ بۆ ڕێککەوتننامەی جەزائیر، شـــا فەرمانی بە ناســـری کرد، بەوەی بارزانی ئاگادار بکاتەوە، کە لە ماوەی دوو هەفتەدا ســـنووردادەخرێ و پشـــتگیری ئێرانیش بۆ کورد ڕادەگیرێ.[١٠٦] بارزانی لە لایەن ژەنەڕاڵ مودەرســـییەوە ئـاگـادار کرایەوە، کە ئەوکـات لە عێراق بوو، پێی گوت کە دوو بژاردەی لەبەردەم دایە: یان لەگەڵ بەغدا پێکدێ یاخود لە ئێران دەبێتە پەنابەر، لەو حاڵەتەدا پەناگەیەکی ئارامی بۆ مەیســـەر دەبێ، ئەگەر قایل بێ بەوەی چەکەکـانیـان ڕادەســـتی ســـوپـای ئێرانی بکەنەوە.**[١٠٧] لەنێو جەرگەی پاشـــەکشـــەی کەســـاســـانەی پێشـــمەگەدا بۆ ئێران بەرلەوەی ســـنوورەکە دابخرێ،[١٠٨] بارزانی بەرەو تاران ڕۆیشـــت بەڵکو قســـە لەگەڵ شـــادا بکا. بەگوێرەی ئەســـەدوللا ئەعلەم بێ، پاشـــای پەهلەوی "هەراســـان بوو لەوەی ڕووبەڕوو ببینێ."[١٠٩] **ئەو لە ١١ی ئازاردا بە نـابەدڵی بـارزانی و مەحمود عوسمانی بینی.**[١١٠] ئەو نیگەرانی خۆی لەبارەی جەنگ لەگەڵ عێراق پێگوتن و ئاماژەشـــی بەوەدا، کەوا هیچ بژاردەیەکی بۆ نەمابووە تەنیا واژۆکردنی ڕێککەوتننامەکە نەبێ لەگەڵ سەددامدا. ئەو ئەوەشی بۆ زیادکرد کە شتەکە

---

[١٠٥] عەبدولحەلیم خەدام، وەزیری کاروباری دەرەوەی ســوریا بە کیسـنجەری گوت: "چارەسـەرکردنی ئەو کێشەیە زۆر ڕەزامەندی ئێمەی لەسەر بوو.: بڕوانە:
Memcon, March 9, 1975, 01522, DNSA.

[106] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 29.

[107] Helms to Scowcroft, March 8, 1975, (FRUS 1969–1976, XXVII, 275).

[108] CIA weekly summary 0013/75, March 28, 1975, CREST.

[109] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 57.

[110] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). p. 346.

"کاتییە" و سـەددامیش مەرجەکانی ڕێککەوتننامەکە جێبەجێ ناکا. لەوەش پتر، شـا مافی پەنابەری بە تەواوی کۆمەکی داراییەوە خسـتە بەردەم بارزانی و بەڵێنی پێدا سـنوور لەسـەر پێشـمەرگە بە کراوەیی بهێڵێتەوە. کاتێکیش مەحمود عوسمان هەوڵیدا لەبارەی پرسەکەوە قسە لەگەڵ شادا بکا، شـا قسـەکەی پێبڕی و گوتی: "***من بڕیارەکەمت پێڕادەگەیەنم. هیچ شـتێک بۆ تاوتوێکردن نەماوەتەوە.***"[111]ئەوەی ڕاسـتیش بێ، بارزانی "بە سەنگینی ڕەفتاری" لەگەڵ فەرمانەکانی شادا کرد.[112] بارزانی بە دەهرییبوون لە بڕیارەکەی شاوە،[113] تکای لە کیسنجەر کرد بەڵکو یارمەتی کورد بدەن. بارزانی لە پەیامەکەیدا ئاماژەی بۆ کرد، کە "تێکشـکانی گەلە بێ بەرگرییەکەمان بە شێوازێکی بێ پێشینە وەک ئەوەی ئێران سنووری خۆی دابخا و یارمەتی تەواوی خۆی لەسـەر ئێمە ڕابگرێ، ئەمە لەکاتێکدا عێراقییەکان گەورەترین هێرشیان تا ئێستا سەرپێخستووە و تا ئێستاش درێژەی هەیە. جووڵانەوە و گەلەکەمان بە شـێوازێکی باوەڕپێنەکراو تێکدەشـکێنرێ لەکاتێکدا هەمووولایەک لە بەرانبەریدا بێدەنگن." ئەو لە کیسـنجەر پاڕایەوە بەڵکو پشـتی کورد بگرێ "یارمەتی [کورد] لەو سـاتەوەختە خەمبار و تراژیدییە مێژوویەدا بدا."[114] هەرچەندە خودی کیسنجەر "بەهۆی بڕیارەکەی ئێرانییەکان ...هەژا بوو... چونکە ئێمەش ... لە دڕندایەتییەکەیدا بەشـدار بووین."[115] ئەو لەناوجەرگەی گەشـتە جرت و

[111] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٣٢٦-٣٢٧.

[112] Beirut 3252 to the U.S. Department of State, “Kurdish/Iranian Relations,” March 15, 1975 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1975), p. 1.

[113] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). pp. 594–596.

[114] Tehran 1188 to U.S. Department of State, March 10, 1975, NSA, KSWWOF, Box 19, GRFL; and Helms to Kissinger via Scowcroft, March 10, 1975 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–2.

[115] Memcon, March 9, 1975, NSA, Kissinger Reports on USSR, China and Middle East Discussions, Box 3, GRFL.

فرتیە دیپلۆماســییەکەی لە هەرێمەکەدا لە ڕێککەوتننامەکە ئاگادار کرایەوە. شــا لە ٨ی ئازاری ١٩٧٥د، پەیامێکی بۆ کیســنجەر نارد و تێیدا پاشــخانی بڕیارەکەی بۆ باسـکردبوو.[١١٦] شـا لە پەیامەکەیدا مشـتومڕی لەسـەر ئەوە کردبوو کە سەددام بەڵێنی پێداوە؛

***بارزانی و گەلەکەی یەک مەفتەیان لەبەردەمدایە تا بڕیار بدەن ئاخۆ لە عێراق دەمێننەوە یاخود بەبێ خوێنڕشتن دەکشێنەوە ئێران، لەوێ پارێزراو دەبن و بە ژیانێکی شایستانە دەژین. ئەوان تا کۆتایی مانگەکە مۆڵەتیان بۆ کشانەوەیان داناوە... بەڵێنی دووەمیش ئەوەیە کە هێزی ئاسایشی هەردوو وڵاتەکە بەیەکەوە کاربکەن، یەکدی لە کوردان لەوانەی باشــن و لەوانەی خراپیشن (کۆمۆنیستی سوورن) ئاگاداربکەنەوە. هیوادام ئەم شتە ڕێگر بێ لە دروستبوونی جڤاکێکی کوردی کۆمۆنیستی لەسەر خاکی بارزانییدا.[١١٧]***

هەر بەڕاسـتیش، شــا بە زمانێکی زیرەکانەی جەنگی ســارد ڕەوایەتی دایە بڕیارەکەی کاتێ نووســی: "هەســت دەکەم من دەرفەتەکەم قۆســتووەتەوە، ئـاخر ئەگەر وەهـا نەبا ئەوا بە پێچەوانەوە دۆزی کورد بە شـــێوەیەکی ڕێژەیی لە ئایندەیەکی نزیکدا بێهیوا بووبوو و هەروەها ئەوسـا منیش بەوە تۆمەتبـار دەکرام کە دەرفەتی ئەوەم لەبـاربردووە بەوەی عێراق لە نێو تەوەری سۆڤیەتەوە دەربهێنرێ."[١١٨]

کیســـنجەر بە پێچەوانەی هەردووکیان، واتە بە پێچەوانەی هێلمز و لاوری کە هەمان ڕوانیان دەرهەق بە ناکۆکییەکانی ئێران –عێراق هەبوو[١١٩]، هیچ

---

[116] Tehran 2237 to the U.S. Department of State, "Iranian/Iraqi Agreement," March 10, 1975 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1975), p. 1.

[١١٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١١٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١١٩] هەردووکیـان وەهـایـان بیردەکردەوە کە ڕێککەوتنـامەی جەزائیر ئەگەرێکی ســـەقـامگیرییە بۆ هەرێمەکە.

Tehran 2254 to the U.S. Department of State, "Iraqi-Iranian Agreement," March 10, 1975 (GFL, Presidential Country Files for Middle East and South

هۆکارێکی لەبەردەستدا نەبوو تا پەسنی ڕێککەوتننامەکە بدا. گێژخواردوو بە بڕیارەکەی شا و فشاری کۆنگرێس و ڕای گشتیی ئەمریکییەکان، ئەو وەها باسی ڕەوشەکەی کرد: "هیچ شتێک نەمابووە تا من قسەیەکی تێدا بکەم."[120] کیسنجەر لە برووسکەی بۆ شا وەهای نووسیبوو:

***هەرچی سەبارەت بە پرسی کوردەوەیە، شتێکی وەهام نییە بیخەمەسەر لەوە زیاتر کە پێشتر دووبەدوو لە دوا کۆبوونەوەکەی ئەم دووایانەدا پێم گوتووی. ئاشکرا و ڕوونە ئەم پرسە بۆ بڕیاری خاوەنشکۆ دەگەڕێتەوە، کە بە باشترین شێوە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتەکەی بکا. سیاسەتی ئێمە وەک هەمیشە دەمێنێتەوە، ئەویش پشتگیریکردنی ئێرانە وەک دۆستێکی نزیک و دڵسۆز بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان. هەڵبەتە بە مەیلی تەواوە بەدوای بەرەوپێشووەچوونی پەیوەندییەکانی عێراقی-ئێرانی و سیاسەتی عێراقی بەگشتی لە ناوچەکەی تۆ و بە تایبەتیش لە بەرانبەر یەکێتیی سۆڤیەتدا دەگەڕێم.***[121]

شا وەڵامی برووسکەکەی نەدایەوە.[122] کیسنجەر دەیزانی چارەنووسی شۆڕشگێڕانی کوردی عێراق مۆری لێدرا. ئەو لەگەڵ بەڵگەوبەندی بەڕێوبەری سی ئای ئەی، لەگەڵ کۆلبی هاوڕا بوو، بەوەی " لەبەرئەوە سیاسەتی ئەمریکا ئەوەبوو کۆمەکە لە ڕێی ئێرانەوە بێ... بۆیە ئێستا هەر کۆمەکێکی ڕاستەوخۆ بۆ کورد کە بەرگرییەکە شکستی هێناوە، ئەوا وەک کۆمەکی پێشتر کەمتر مایەی بەرگری لێکردنە. [من گومانم هەیە] کە شا –

---

Asia, Box 14, Iran-State Department Telegrams: SECSTATE—EXDIS [1]), p. 1.

[120] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 595.

[121] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٥٩٤-٥٩٥.

[122] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). p. 346.

لە دوای کۆتاییهێنان بە کۆمەککردنی بارزانی- بیەوێ وەک کەناڵێک کار بۆ پارەدانی کۆمەکی ئەمریکی بکا."[123] کۆلبیش لەسەر هەق بوو. شا هەر کەمێک دوای گەڕانەوەی لە جەزائیر بە هێلمزی ڕاگەیاند: "**بڕینی کۆمەکی ئێرانی لەسەر یاخیبوونە کوردییەکەی بارزانی ڕاگرتنی تەواوی کۆمەکی ئەمریکییەکانیش دەگرێتەوە.**"[124] کیسنجەر لەپاش هەفتەیەکدا، پەیامێکی بۆ بارزانی نارد، تێیدا هاتبوو: "**ئێمە پێزانینمان بۆ نیگەرانییە قووڵەکەت هەیە... ئێمە تێدەگەین کە بڕیارە سەختەکان ئەوانەی گەلی کورد ئێستا ڕووبەڕووی بووەتەوە، بووتە مایەی ژانوناسۆرێکی قووڵ بۆیان. ئێمە سەرسامییەکی زۆرمان بۆ ئازایەتی و شکۆ ئەوان هەیە، کە ئەم گەلە ڕووبەڕووی زۆر کوێرەوەری بووەتەوە و نزا و درودی ئێمە لەگەڵ ئەوانە. ئێمە لەگەڵ دۆستە ئێرانییەکانمان قسەدەکەین و و دواتریش لەگەڵ ژەنەڕاڵ لە پەیوەندیدا دەبین.**"[125] ئەوەش بۆ کوردی عێراق کۆتایی قۆناغ بوو.

کیسنجەر تەنیا داوای ئەوەی لە هێلمز کرد کە بەرژەوەنییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بپارێزێ و فەرمانی پێکرد:

***بە دوای ڕێگایەکی شایستەدا بۆ کێشەی هەردوولامان بگەڕێ، هەم بۆ کێشەی ئێرانییەکان، هەم هی حکومەتی ئەمەریکا کە لەناو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هەر شوێنێکی دیکە، ئەگەر هاتوو کوشتارگە ڕوویدا و بارزانیش ئەوەی خستە ڕوو کە پشتی تێکراوە. دەکرێ***

---

[123] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 595.

[124] David Korn, "The Last Years of Mullah Mustafa Barzani," 1/2 (1994), Middle East Quarterly, pp. 12–27.

[125] White House, Situation Room to Kissinger via Borg/Adams/Rodman, March 19, 1975 (GFL, Documents from the National Security Advisor: Trip Briefing Books and Cables for Henry Kissinger, December 2008 Opening, Box 6, 2/10-18/75 Middle East and Europe—2/5-22/75 London and Middle East), p. 1.

***کوێرەوەرییەکەی کوردان نیگەرانییەکی قووڵی مرۆیی بورووژێنێ. لەسەرێکی دیکەشەوە ئەگەر هاتوو لەگەڵ ئێران بە ئامانجی دژبەیەک کاربکەین، دەکرێ دۆخێکی نەکردە بخوڵقێ.*** [١٢٦]

هێلمز هەر پێشتر ڕاسپاردەیەکی دابووە کیسنجەر تا "پەیامێکی جۆرێک لە دڵنەوایی بۆ بارزانی بنێرێ، دەنا لەوانەیە بە شێوەیەک لە شێوەکان تووشی هەندێ بڵاوکراوەی هەراسان بین، کە نەتوانین خۆمانی لێ بەدوور بگرین،" ئاخر بە ڕوونی ئێرانییەکان دەست بەخوێنن و ئێمەش بە پلەیەکی کەمتر لەوان."[١٢٧] (شا)ش لەگەڵ هێلمز و کالاهان هاوڕابوو، ئەوان خەمی ئەویان بوو "بارزانی دڵتەنگ و ڕەنجاو" نەوەک هاوکارییە ژێربەژێرییەکەی وڵاتە یەکگرتووەکان-ئێران لە کوردستان ئاشکرا بکا. هەروەک کۆلبی پێشنیازی بۆ کیسنجەر کردبوو، باشترین ڕێگە بۆ لادانی کورد لە "سەرکێشییە نەخوازراوەکە" ئەوەیە، پارەکەی دوا مانگەکەش بدرێتەوە بارزانی.[١٢٨] کیسنجەریش ڕاسپاردەکەی ئەوی سەلماند "بە لەبەرچاوگرتنی ئەو تراژیدیایەی بەسەر کورددا دێ کردەیەکی فریاگوزاری سۆزبزوێن

[126] Kissinger to Helms via Scowcroft, March 15, 1975 (GFL, Documents from the National Security Advisor: Trip Briefing Books and Cables for Henry Kissinger, December 2008 Opening, Box 6, 2/10-18/75 Middle East and Europe—2/5-22/75 London and Middle East), pp. 1–2.

[127] Helms to Kissinger via Scowcroft, March 10, 1975 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–2; Scowcroft to Kissinger, Washington, March 10, 1975, 1930Z, FRUS, 1969–1976-Iran; Iraq, 1973–1976, Vol XXVII.

[128] CIA Memorandum for Scowcroft, March 13, 1975, NSA, KSWWOF, Box 19, GRFL; and Helms to Kissinger via Scowcroft, March 10, 1975 (CIA/FOIA/Helms), pp. 1–2.

بخەنەکار.[١٢٩] ئینجا (شـا) فەرمانی بە سـاواک کرد، بڕی کۆمەکە مانگانەی ئازاریش بدرێتە بارزانی.[١٣٠]

لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ کام لەمانە چارەنووسی جەنگی کوردییان نەگۆڕی. بە دڵشـکاوی بەهۆی بڕیارەکەی شـا و نامەکەی کیسـنجەر، ئەوەبوو ڕابەری کوردی هێدمەگرتی لە ١٨ی ئازاری ١٩٧٥دا گەڕایەوە بارەگای خۆی لە حاجی ئۆمەران. ئەو بە پێشـمەرگەکانی خۆی گوت: "ڕەوشـەکە دەسـتی لێشوشتراوە، بەڵام ئەگەر هەریەکێک لە جێگەی ئەو دەست دەداتەوە چەک و بجەنگێ ئەوا پشتیوانی تەواوی مەعنەوی ئەو کەسە دەکا." ئەوەبوو هەر زوو زۆرینەی پێشمەرگە گەیشتنە ئەو ئەنجامە کە بەبێ سنوورێکی کراوە و پشـتیوانی ئێران، بەردەوامبوون لەسـەر شـەڕ بێهوودەیە.[١٣١] ڕێک هەر دوای ئەوەی بارزانی لەگەڵ پێشـمەرگە وماڵبەتاکانیان لە ٢٧-٢٨ی ئازار بۆ ئێران چوون، سوپای عێراقیش دوا هێرشی خۆی کرد، ئەمە و لەکاتێکدا هێشـتا ماڵباتی پێشـمەرگەکان لەسـەر سـنوور بوون، چاوەڕێ بوون بپەڕنەوە دیوی ئێران. شا لە بەراییدا پێیوابوو کەوا ڕێککەوتننامەی جەزائیر بە شـێوەیەکی کاتی شـاڵاوی سـەربازیانەی بەغدا لە دژی کوردان دەوستێنێ. کەچی سـەددام فەرمانی بە هێرشـێکی سـەرتاسـەری بۆ سـەر کورد کرد. ئەو پەلاماردانەی عێراقی "شـای نەخۆش خسـت." [١٣٢] هەر بەڕاستیش شا بینی کە سەددام "بە فەرمانی پەلاماردانی بۆ سەر کورد لە هەموو بەرەکانەوە هەر یەکسـەر گیانی ڕێککەوتننامەی جەزائیری پێشـێل

[129] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 596.

[130] TOHAK141 from Helms to Kissinger, March 19, 1975, DDRAC, Box 9, GRFL.

[131] Korn, David. "The Last Years of Mullah Mustafa Barzani," 1/2 (1994). Middle East Quarterly, p. 22.

[132] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). p. 348.

کردووە."[١٣٣] نزیکەی یەک هەفتەی خایاند تا شا توانی قەناعەت بە سەرانی بەعس بهێنێ بەوەی هێرشەکەیان ڕاگرن و لە ١٣ی ئازاردا ئاگربڕ ڕێکبخەن، ئەمەش هەر دوو ڕۆژ بەر لە کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی هەردووک وڵات بوو بۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەکە.[١٣٤] بە کۆتاییهاتنی وادەی ئاگربەستەکە و دەرکردنی لێبوردن بۆ پێشمەرگە لە ١ی نیسانی ١٩٧٥، عێراق بەبێ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ مەترسییەکی جەوهەری ببێتەوە، هەموو سەنگەر و پێگەی کوردانی گرتەوە و لە کۆتاییدا گەیشتە سەر سنووری ئێران و دایخست، ئەو سنوورەی لە ئەیلوولی ١٩٦١ەوە دەستی پێنەگەیشتبوو. لە کۆتاییدا ئاواتی کوردی عێراق کۆتایی پێهات.

**بە پەسەندنامەی شا، زیاتر لە ٢٠٠،٠٠٠ ئاوارەی کورد لەسنوور پەڕینەوە و ئێرانیان بووە تاراوگە و خۆیان گەیانده ئەو هەزاران پەنابەرەی کە پێشتر لە ئۆردوگاکان نیشتەجێ کرابوون.** هەرچەندە بە هەزاران لە کوردانی عێراقی خۆیان گونجاند و لەگەڵ کۆمەڵگەی ئێرانی تێکەڵ بوون، بەتایبەتیش لە ڕێی فێربوونی زمانی فارسی، کەچی پێواژۆی دامەزران لە ئێران بێ کێشە نەبوو. هەروەک ژەنەڕاڵ فەرەحدۆست، جێگری بەڕێوبەری ساواک و بەرپرسی پشکنینی پاشایەتی ئاماژەی پێدا، "سێیەکی بودجە [کە تەرخان بوو بۆ پەنابەری کورد] بەشێوەیەکی [دروست] خەرجکرا؛ **کەچی باقی ئەویدیکە لە لایەن ئەفسەرە ئێرانییەکانەوە دزرا."[١٣٥]** ئەعلەمیش لێدوانی دا بەوەی؛ "کوردی عێراقی داوایان لە کاربەدەستانی ئێرانی کرد بەڵکو سنوورەکە بە کراوەیی بهێڵنەوە. مەلا مستەفاش هەر پەرۆشی دۆستەکان

---

[133] Tehran 2351 to U.S. Department of State, "Iran/Iraq Relations," March 13, 1975 (NARA/AAD/RG59/CFPF/ET/1975), p. 1.

[134] The implication of the Iran-Iraq Agreement—DCI/NIO 1039–75, 1 May 1975.

[135] Fardoust, Hossein and Abdollah Shahbazi, Khaterat-e Arteshbod-e Baznesheshteh Hossein Fardoust [The Memoirs of Retired General Hossein Fardoust] (Tehran, 1990).

و ماڵباتەکەی بوو. هەرچۆنێک بێ شـا تەنیا لەسـەر ئەوە سـوور بوو کە پێشـمەرگەی کوردی لە ئێران دابمەزرێ و جێگیر بکرێ نەوەک خەڵکی مەدەنی، گوایە عێراقییەکان هەرگیز سـزای مەدەنییەکانیان نەدەدا. منیش وەڵامی خاوەنشـکۆم دایەوە، چاوەڕێی ئەوە مەکە کورد بڕوامان پێبکەن. شـا پێشـنیازی کرد بەڵکو خاچی سـووری نێودەوڵەتی کۆمەکی کوردان بکەن.[١٣٦] سەددام لەسـەر داوای شـا ماوەی مۆڵەتی گەڕانەوەی ئاوارەکان لە ئێرانەوە بۆ عێراق تا کۆتایی مانگی نیسـان درێژکردەوە، ئینجا دوای ئەوەش هێشـتا بیسـت ڕۆژی دیکەشـی خسـتەسـەر.[١٣٧] کاتێکیش بەغدا لێبوردنی بۆ سـەرجەم ئاوارەکان دەرکرد، بەدەر لە پێشـمەرگە نزیکەکانی بارزانی، ئەوا بەهاتنی مانگی ئایار زیاتر لە ٧٠،٠٠٠ مەدەنی گەڕانەوە عێراق تا ڕووبەڕووی ئایندەیەکی نادیار ببنەوە.

**ڕێککەوتننامەی جەزائیر چارەنووسـی کوردی عێراقی بەدتر کرد. ئەوان بە زۆرەملێ لە باشـووری عێراق نیشـتەجێ کران.** ڕێککەوتننامەکە سیاسـەتی بەغدای بۆ تواندنەوە خێراتر کرد، ئەو سـیاسـەتەی دواتر دەرهەق بەکورد بە ئەنفال ناسـرا. سـەرانی بەعس بە شـێوەیەکی دڵڕەقانە کوردسـتانی عێراقیان تەعریب کرد، دیمۆگرافیای ناوچەکانیان بە شێوەیەک گۆڕی کە لە بەرژەوەنـدی خەڵکی عەرەبزمـانـدا بێ. **هەروەهـا پشـتێنەیەکی ئاسـایشـپارێزیشـیان بە بەرینی ٣٠ کیلۆمەتر لەسـەر سـنووری ئێران و تورکیا دروسـتکرد. بۆ ئافراندنی ئەو پشـتێنە ئاسـایشـپارێزییە ئەوا بەغدا بەهاتنی سـاڵی ١٩٧٨، ١٤٠٠ گوندی کوردانی خاپوور کرد[١٣٨] و ٦٠٠،٠٠٠**

---

[136] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). p. 359.

[137] The implication of the Iran-Iraq Agreement—DCI/NIO 1039-75, 1 May 1975

[١٣٨] من خۆم خەڵکی گوندی گرتکی دۆڵی ڕوستێی دەڤەری بالەکایەتیم، بە منداڵی و بە چاوی خۆم بینیم چۆن گوندەکەمانیان بە بلدۆزەر خاپوور کرد، ئەو شـوێنەش بلدۆزەری

**خەڵکی ئاســـایی ڕەوانەی ئۆردوگاکان کرد.**[١٣٩] لە کاتێکدا ماڵوحاڵی ئەوانی دایە خێزانە عەرەبەکان. هەردوو گوندی بارزان و ڕواندزیش بە تەواوی وێران کران.[١٤٠] ســـەروبەندی ١٠٠،٠٠٠ پێشـــمەرگەی کورد بە بارزانی و ماڵباتەکەشیەوە لە ئێران مانەوە. ماڵێکی ڕاخراوی جوانیش کە تێچووەکەی لە دەوری ٤٠ ملیۆن ڕیاڵ دەبوو، لە کەرەجی نزیک تاران بۆ بارزانی کردرا.[١٤١] ساواک و بەتایبەتیش سەرهەنگ مەنوچەهر هاشمی، بەرپرسی هۆبەی هەشتەمی ساواک بەرپرس بوو لە کۆنترۆڵکردن و چاودێریکردنی پەنابەرانی کورد. هەرچۆنێک بێ، بە دڵشـــکاوی و نامرادی بارزانی و پێشـــمەرگەکانی هەمان چارەنووســـی باقی کوردەکانیان نەبوو. ئاخر ڕێککەوتنەکە وەک بۆ کوردەکانی دیکە خراپ بوو ئەوەندە بۆ بارزانی خراپ نەبوو.

## ناپاکی یان پێویستی؟

ڕێککەوتننامەی جەزائیر بۆ شـــا ئابلۆقەدانی تەڕوادە بوو. لە داســـتانی ئیلیادەی هۆمیرۆسدا، پاڵەوانەکان ڕووبەڕووی ژیانێکی تراژیدیانە بوونەوە. شـــا نەیتوانی لە چارەنووســـە تراژیدیاکەی کوردان هەڵێ و ڕزگاری بێ. کاتێکیش ئەســـەدوڵلا ئەعلەم پرســـیاری لەبارەی چارەنووســـی "داوا و

نەدەگەیشـــتێ بە تی ئێن تی و دینامیت تەقاندییانەوە و گوندنشـــینانیان بەرەو ئۆردوگا زۆرەملێکانی وەک دیانا، هەریر، مەلاومەر و قوشتەپە گواستنەوە. ئیمە بەر ئۆردوگای دیانا کەوت. هەڵبەتە ئەمەش لە سەرەتاکانی ئەو شالاوەی بەعس بوو بۆ ڕاگواستنی گوندەکان. وەرگێڕ

[139] McDowall, David. A Modern History of the Kurds (London: I.B. Tauris, 2007 ed) pp. 338–9.

[١٤٠] ڕژێم پارەی دەدایە ئەو عەرەبانەی ژنی کوردیان دەهێنا. بڕوانە:
McDowall, David. A Modern History of the Kurds (London: I.B. Tauris, 2007 ed) p. 340.

[141] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 197.

ئۆتۆنۆمی" کوردانی لێکرد، ئەوەبوو شـــا بە خوێنســـاردییەوە بەرســـڤی دایەوە: "هیچ"، ئەوەشـــی بۆ زیادکرد کە "ئەو گەلەی شـــکســـت لە دوای شـــکســـتی تووش هاتووە، زۆر باش دەزانن، کە ئەوان دە ڕۆژیش بەبێ پشـــتیوانی ئێمە خۆیان لە بەرانبەری هێرش و پەلاماری عێراقدا نەدەگرت؛ تۆ بڵێی ئێستا چی بڵێن؟" شـا سـەرکەوتووانە دانپێدانانەکەی سـەددامی بە ئەعلەم ڕاگەیاند، کە لەماوەی ئەو چوار ســـەعات و نیو وتوویژی لەگەڵ کردبوو، بەوەی ئەگەر هـاتبـا و ســـەربـازی ئێرانی و یەکەی تۆپخـانەی ســـوپای ئێرانی نەبایە ئەوا هەر لەســـەرەتاوە بە ئاســـانی دەیتوانی پێشـــمەرگەکانی بارزانی لەناوبەرێ. ســـەرکردەی عێراقی ئەوەی بە شـــا گوتبوو: "شـمشـێرە تیژە هەڵکشـاوەکەت خونچە گوڵی گەنجی عێراقی پەل دا." **هەرچۆنێک بێ ئەعلەم ڕێکەوتننامەکەی وەک ســـەرکەوتنێکی ئێرانی نەبینی.** ئەو بە شـــای گوت؛ "خۆی لەم ســـاڵەی دواییدا ئۆتۆنۆمی درابووە کورد، بەڵام تۆ فەرمـانـت پێکردن پێی قـایـل نەبن و ئەوانیش بەگوێیـان کردی." (شـــــا)ش وەهـا وەڵامی دایەوە، هەردوو لایـان "چ کورد و چ عێراقییەکـان دەیـانزانی کە هەمووی هەر کردەوەیەک بوو، ئینـجـا عێراقییەکانیش نیازیان وابوو دەست بەسـەر کوردسـتاندا بگرنەوە."[١٤٢] بۆ ڕۆژی پاشـتر، ئەعلەم هەواڵی ڕۆژنامەکانی ئەوروپا و هەڵمەتی کوردی لە دژی شا بەوەی **کوردی فرۆشتووە** بە شا ڕاگەیاند. (شا)ش وەڵامی دایەوە، "ئێمە نەماندەتوانی ســـەربازەکانمان لەوێ جێگیر بکەین و تا هەتایە هەر بجەنگین". ئەعلەمیش پێیگوتەوە، "خۆ ئێمە بە کردەوە قەیرانی ئەروەنـد ڕودمان تێپەڕاندبوو. دەبووایە بە ناوی کوردان سـەودای زیاترمان [لەگەڵ عێراقدا] بکردبایە، **چونکە ئەوان زیاتر لە ٤٨ سەعاتدا لە بن بۆمبی قورسی عێراقی و گرتن و ڕاوەدونـانـدا بوونە**، هەرچەنـدە [بەغدا] لێبوردنیشـــی

---

142 Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). pp. 341–2.

ڕاگەیاندبوو." ئینجا شا بێدەنگ بوو.[143] شا بۆ ڕۆژی پاشتر "لەبن بارێکی ناخۆشی دەروونی دابوو، لە گژ هزرانیش ڕاچووبوو." ئەعلەم پێیوابوو؛ "ئەوە بەهۆی پرسی کورد و تاوانبارکردنمان بە ناپاکیی و دەستبەرداربوونمان بوو لێیان."[144]

شا لە لایەن میدیای نێودەوڵەتی لەسەر دەستبەردابوون لە کورد بە قورسی ڕەخنەباران کرا. شا بە تووڕەبوون لە ڕۆژنامەی ئەمریکی بە سەرۆک جیرالد فۆردی گوت:

***من دەبووایە ڕێککەوتننامەیەکی خێرا لەگەل عێراق بکەم. من دەبێ ئەمە بە ڕووی هەموو هەواڵنێرانی ڕۆژنامەکان بڵێم. کە دەبووایە دەستبەرداریان بوومایە. ئەوان [کوردەکان] نە دەجەنگان، ئەوە ئێمە بووین شەڕمان دەکرد. کورد شەڕیان نەکرد. سادات و حوسێن و بومیدیەن گوتیان؛ "دەی دەرفەتێک [بە عێراق] بدە تا لە یەکێتیی سۆڤیەت دەبێتەوە و سیاسەتێکی زیاتر سەربەخۆ پەیڕەو دەکا، لە جەزائیردا، گفتوگۆم کرد تا کێشەی سنوور چارەسەر بکەم و ڕێگەش بۆ عێراق بکەمەوە لە یەکێتیی سۆڤییەت ببێتەوە و زیاتر سەربەخۆ بێ. ئێستاش عێراق ئەو پەیمانەی بۆ بەرگری هاوبەش دژی هێزە ناوخۆیی دەرەکییەکان دەخاتە بەردەم. ئەمەش کوێت لە دەستیان دەپارێزێ. من ٤-٥ ساڵە لەگەل عەرەبستانی سعودیدا هەوڵدەدەم برەو بەو شتە بدەم."[145]***

---

[143] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). pp. 343–4.

[144] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٣٤٤.

[145] Memorandum of Conversation, Ford, the Shah, Kissinger, and Scowcroft, May 15, 1975. Ford Library, National Security Adviser, Memoranda of Conversations, Box 11.

ئەوەی ڕاســـتی بێ شـــا جەنگی کوردی بێ بەرهەم و بێ هوودە دەزانی. تەنانەت کەســـێکی ڕەشـــبینی وەک ئەعلەمیش پێیوابوو کە "هێزی ئێمەیە لەوێ دەجەنگێ کە بە سەختی تێکشکان... تۆ بڵێی ئێمە چۆن بتوانین دەست بەو شـوێنەوە بگرین؟ هەرچۆنێک بێ جیهان نازانێ پرسـەکە چییە و هەر بۆیە بە ناپاکیکردن [لە کورد] تاوانبارمان دەکەن."[١٤٦] هەروەها ئەو ئەوەشی بۆ زیاد کرد؛ "خۆی ئەوە زیاتر لە ساڵێک بوو کە ئەوان [کورد] نەیاندەتوانی بەرگە بگرن. ئەوە تەنیا ئێمە بووین پاراستنمان. مایەی هۆشمەندییش نییە پارە لە جەنگێکی وەها خەرج بکەی، کە کۆچبەرانی (زیاتر لە ٣٠٠،٠٠٠) بەو هەموو خەرجییە گرانەوە لەخۆ بگری. جیهان ڕەخنەمان لێدەگرن، چونکە وردەکارییەکەی نازانن. لێ ئێمە بۆیە بێدەنگین چونکە ئێســـتا ڕوونکردوەمان بۆ نییە."[١٤٧] هەرچۆنێک بێ ئەو بەڵگەوبەندە بە لای میدیاوە هیچ واتای نەبوو.

ڕێککەوتننامەی جەزائیر ستراتیژیە هاوبەشـەکەی ئێران-ئیسرائیلیشـی بۆ بەرزەفتکردنی عێراق هەژاند. ئیدی بۆ ئیسرائیل بەرەی ڕۆژهەڵاتی ناسکتر کرد. هەرچەندە بە ئیســـرائیلییەکان گوترابوو کە ڕێککەوتننامەیەکی لەنێوا ئێران و عێراق نزیکە، لێ ئەوان چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکرد، بەم شـــێوە "دراماتیکی و غەمگینانە" ئۆپەراسیۆنەکەیان لە کوردستانی عێراق کۆتایی پێبێ.[١٤٨] ئەوان پێیان وابوو جەنگی کورد زۆر لەوە درێژتر دەخایەنێ.[١٤٩] لە

[146] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). pp. 346–7.

[147] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). pp. 348–9.

[148] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 55.

[149] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

کاتێکدا کیسـنجەر لە لایەن خودی شـاوە و شـتەکەی پێڕاگەیەنرا، **کەچی وردەکارییەکانی ڕێککەوتننامەکە لە ئیسـڕائیلییەکان شـاردرایەوە**، تا لە ٩ی ئازاری ١٩٧٥دا کاربەدەسـتانی سـاواک بە (ئوری لوبرانی)یان ڕاگەیاند.[150] بە پشـتگوێخسـتنی ئیسـڕائیلییەکان وەک هاوپشـکی پلە دوو، ئەوەبوو شـا سـوکایەتی بە دەوڵەتی جوو کرد تـا برینـداری بکـا.[151] **ڕۆژێـک بەرلە کشانەوەی سەربازانی ئێرانی، کاربەدەستانی ساواک لە کوردستانی عێراق هەواڵی لەپڕ و ناکاوی گەڕانەوەی هێزەکانیان بە ئیسـڕائیلییەکان گوت، پێیان ڕاگەیاندن کە ئەمە کارێکی ڕۆتینی جێگۆڕکێپێکردنی هێزەکانمانە. ئەم بڕیارەی تاران ئەفسـەرەکانی مۆسـادی ڕووبەڕووی مەترسـی پێشـڕەوی سـوپـای عێراقی کردەوە. ئەو ئەفسـەرانەی لە بـاکووری عێراق جێگیرکرابوون، هەروەک ئێلیازەر تسـافیر و دایڤد کیمخی و زوری سـاگی تەنیا هەر دوو سـەعاتیان لەبەردەمدا مابوو تا هەڵبێن و خۆیان بگەیەننە خانێ (پیرانشـار)، شـارە سـەرسـنوورە ئێرانییەکەی باکووری ڕۆژئاوا. ئێلیازەر تسـافیر کە خەریک بوو لەلایەن سـەربازانی عێراقییەوە گەمارۆ بدرێ گێڕایەوە؛ "لە ڕێگـای گەڕانەوەم بۆ تـاران هەر توک و نەفرەتم لە ئێران دەکرد. زۆر بەخراپی بێ هیوا بووبووم."**[152] سـەرەڕای داوای کورد لە ئیسـڕائیل بۆ ئەوەی پشـتیان بگرێ و لە ڕێی فڕۆکەوە کۆمەکیان بە پەرەشـووت لە ئاسـمانەوە بۆ بەربداتەوە،[153] **لێ ئیسـڕائیل بە لۆژیکی دڵڕەقانەی جیۆپۆلیتیک ئاشنا بوو. نەیدەتوانی بەبێ قایلنامەی شا درێژە بە**

---

[150] Kimche, David, The Last Option, (New York: Maxwell Macmillan International, 1991) p. 195.

[151] John A. Conway, "The Kurds and Israel," *Newsweek*, April 7, 1975, 17.

[152] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 56; and Randal, Jonathan. After Such Knowledge, What Forgiveness? My Encounters with Kurdistan (London: Westview Press, 1999). p. 199.

[153] Kimche, David, The Last Option (New York: Maxwell Macmillan International, 1991) pp. 195–196.

**هاوکاریکردنی کوردی عێراق بدا.** هەرچۆنێک بێ بڕیارەکەی شا پشتگیرییە توندوبەندەکەی ئیسرائیلی بۆ کوردی عێراق پچڕاند. **ئیسحاق ڕابینی** سەرۆوەزیری ئیسرائیل بە تاڵاوییەکەوە لە کاردانەوەی ڕێککەوتننامەکە گوتی: "**شا کوردی فرۆشت.**" کیسنجەریش هاوسۆزی خۆی لەگەڵ سەرکردەی جوو دەربڕی بەوەی بڵێ: "من هۆشداریم دایە شا کە وانەکا، کەچی هەرواشی کرد."[154] لەگەڵ ئەوەی ئیسرائیل بەو وەرچەرخانە ستراتیژییەی ئێران زۆر پەست بوو، کەچی ڕاشکاوانە ڕەخنەشی لە شا نەگرت. تەنیا لوبرانی پێناخۆشبوونی ئیسرائیلییەکانی دەربڕی. لەگەڵ ئەوەشدا نارەزایەتییەکەی ئەو بە ترشوتاڵییەوە لەلایەن گەورە کاربەدەستێکی ئێرانی ڕەتکرایەوە، ئیدی ڕوونی کردەوە کە ئەوە لاوازیی ئیسرائیلە "ڕێگە دەدا هەستوسۆز تێکەڵی سیاسەت بکرێ."[155] لە ڕوانگەی ئیسرائیلەوە، بڕیارەکەی شا لە ئازاری ١٩٧٥دا ناپاکی بوو کە پرسی [سەرۆوەزیری بریتانی نیڤیل] چەمبەرلینی بیرهێنایەوە کە بۆ هیتلەر دەستبەرداری چیکۆسلۆڤاکیا بوو"[156]ڕێککەوتننامەی جەزائیر ئازاری وڵاتە یەکگرتووەکان و هینری کیسنجەر، مامۆتکی جیۆپۆلیتیکەکەشی دا. لە ٤ی حوزەیرانی ١٩٧٥دا بە فەرمی کۆتایی بە هاوکارییە ژێربەژێرییەکەی وڵاتە یەکگرتوەکان بۆ کورد لەگەڵ ساواکدا هات.[157]بەبێ خۆتێکەڵکردنی شا، ئەوا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پەیوەست نەدەبوو بە "جەنگێکی وەها سەخت لە ڕووی لۆجستییەوە، وەها دوور و وەها درکپێنەکراو بۆ خەڵکی

---

154 Memcon, March 9, 1975, NSA, Kissinger Reports on USSR, China and Middle East Discussions, Box 3, GRFL.

155 Kimche, The Last Option (New York: Maxwell Macmillan International, 1991) p. 195.

156 Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 57.

157 Colby to Kissinger, June 4, 1975, (FRUS 1969–1976, XXVII, 289).

ئەمریکی."[158] کیســــنجەر لە دوای ســــێ ســــاڵ لە تەرخانکردنی پارە و تەقەمەنی، کارتی کوردی بۆ بەرزەفتکردنی بەغدای لایەنگری مۆســکۆ هەر لەبەر سیاسەتی 'ساردوسڕانەی ڕیالیستی' شادا دۆڕاند.[159] لەپاڵ ئەمەشدا، ڕوانینی کوردان قوڕەکەی خەســـتتر کرد. بارزانی بە نالاندن لەبن باری شــێرپەنجەدا، لە هاوینی ١٩٧٥دا بۆ چارەســەری پزیشــکی ســەری وڵاتە یەکگرتووەکانی دا. لە دانیشتنێکدا ئەو ئەوەی بەبیر کیسنجەر هێنایەوە، کە لە ڕەوشی کوردستان بەرپرسیار بووە، چونکە ناچارکرا بڕیارەکەی ئێران بۆ وەســــتــانــدنی پشــــتگیری پێشــــمەرگەی کورد بپەژرێنێ. لێ تۆمەتبارکردنەکەی بارزانی ڕەتکردەوە و گوتی، "ئەوان چی دەڵێن، چۆن بەبێ ئێرانییەکان کارەکەمان پێدەکرا؟ ئاخۆ چۆن توانیبامان یارمەتیمان دابان ئەگەر ئامرازەکانیشــمان هەبووایە؟"[160] هەر بەڕاســتیش، کیســنجەر هەرگیز سەرکۆنەکردنەی لەبارەی شکستی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان لە کوردستان قبووڵ نەکرد، بەڵکو ئەو لەســەر تراژیدیاکە لۆمەی جوگرافیا و مێژوو و لاوازیی هێزی ئەمریکای کرد.

شــــا بڕیاری وەســــتاندنی پشــــتگیریی ئێرانی بۆ کورد بە تاکە بژاردەی وڵاتەکەی زانی. ســــەرەڕای میدیای وڵاتە یەکگرتووەکان و ڕەخنەی کورد، بڕیارەکەی لە جەزائیر ئاوەزمەندانە بوو. ئەو پێی باشــتر بوو ســیاســەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە باکووری عێراق بە زیندووی بهێڵێتەوە. ئامانجی ســەرەکی ئێران لە پشــتگیریکردنی کورد بۆ بەرزەفتکردنی عێراق بووە لە ڕێی ئەوەی بەغدا ناچار بکا لە کەمەرەی ســۆڤیەتی بکشــێتەوە و ئینجا وا لە ســــەرانی بەعس بکا لە ئەروەند ڕود ســــازشــــی بۆ بکەن. بە شکستە یەک لە دوای یەکەکانیان لە ١٩٧٤ و سەرەتای ١٩٧٥دا، شا لەسەر

---

[158] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). p. 591.

[159] Memcon, February 7, 1975, NSA, Memcons, Box 9, GRFL.

[160] Minutes of the Secretary's Staff Meeting, July 30, 1976, 02000, DNSA.

ئەو ڕایە ساردبوەوە کە پیشمەرگە بتوانێ سوپای عێراقی تیکبشکێنێ. هەر بەڕاستیش، بەڵگە مێژووییەکان ئەوەیان نیشان دا، کە پێشمەرگە بەبێ دەستوەردانی ڕاستەوخۆی ئێران خۆی نەدەگرت و (شا)ش لەوەدا ڕاست بوو کاتێ بە ئەسەدوللا ئەعلەمی گوت؛ "ئەوەی ڕاستی بێ، ئەوە ئێمەین لەوێ دەجەنگین."[161] هەروەک شا سەرنجی دابوو، پێشمەرگەی بارزانی "هیچ پێشکەوتنێکیان لە شەڕەکەدا بەدی نەهێنا. ئەوان هەر ڕایان دەکرد، نەوەک بەقەدەر خێراییەکەی ڤیتنامی باشوور لێ خەریک بوو بگەنە خێراییەکەی ئەوان. ئێمەی ئێرانی دەبووایە بجەنگین. منیش بڕیارم دا، چیدیکە نامەوێ لەگەڵ عێراقدا بکەومە جەنگ لەکاتێکدا ڕۆژهەلاتی نزیک بەرمیلێک باروتە و سۆڤیەتیش پشتگیری عێراق دەکا و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش لەبن ئالۆزی گۆبەندی واتەرگیتدا دەینالاند."[162] لەم هەلومەرجەدا، شا بژاردەیەکی کەمی بۆ مابووەوە، ئەویش ئامادەبوون بوو بۆ جەنگێکی هەرێمی -تەنانەت جەنگێکی نێودەوڵەتی، لەو حاڵەتەی گەر هاتبا و سۆڤیەت پشتی بەغدای گرتبا- لەگەڵ عێراق. کەواتە، کاتێک ڕایەدارانی بەعس نەرمونیانیان لەبارەی ئەروەند ڕوددا نیشان دا، ئیدی شا کاتی خۆی بەفیڕۆ نەدا، بەرەی لەبن پێی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل دەرکێشا و گەیشتە ئامانجە مەودادرێژی بۆ قەڵەمڕەوییەکەی.

**٢- هەرەس: شیعەی لوبنان**

***"کەس ناتوانێ متمانە بەو خەڵکە [ئاخوندی شیعە] بکا." شا وەهای گوت.***[163]

***"وەهام لێ چاوەڕوان مەکە وەک ئاژانێکی ئێرانی بجووڵێمەوە... بەپێچەوانەی ئەوانی دیکەوە، من هیچم بۆ خۆم ناوێ. تاکە شت کە بمەوێ***

---

161 Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). pp. 326–327.

162 Joseph Kraft, "What Restrains the Shah?" Washington Post, April 27, 1975.

163 Beirut 213/191 to Ministry of Foreign Affairs. 18 April 1977.

***پێشخستنی شیعەیە: سەدر وەهای بە ئەفسەرێکی باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروت گوت.[١٦٤]***

**هەڵمەتی دژەسەدر**

هەرچەندە ڕۆژگار لە ناوەڕاستی هەفتاکان نزیک دەکەوتەوە، ئەوەندەش نمایشی سیاسییانەی سەدر لە لوبناندا کزتر دەبوو. مەنسور قەدەری باڵوێز، مێملەکەی ئەو چەندین کەسی لە دەستەبژێری شیعە لە باشووری لوبنان لەدەوری خۆی کۆکردبوونەوە، لەوانە جەعفەر شەرەفەددین و کامل ئەلئەسعەد و سەید حەسەن شیرازی. جەعفەر شەرەفەددین وەهای دانابوو، گوایە سەدر نازناوەکەی ئەوی بۆ خۆی داگیرکردووە. شیرازیش ئاخوندێک بوو لە عێراق لەدایک بووبوو، بەعس ناچاری کردبوو نەجەف جێبهێڵێ و لە لوبنان لە تاراوگەدا بژی، ئەو ئاخوندە لەنێو جڤاکی شیعەدا بەدوای پایە و دەسەڵاتدا دەگەڕا. بە هەبوونی پەیوەندیی "دۆستایەتییەکی زۆر نزیک" لەگەڵ قەدەری باڵوێزدا،[١٦٥] ئەلئەسعەدیش هەر لە سەرەتای شەستەکانەوە بە مەبەستی بەدەستهێنانەوەی پێگە دەستڕۆیشتووەکەی لە لوبنان داڕسایە سەر سەدر.[١٦٦] لەپاڵ ئەمەشدا، قەدەر ڕاپۆرتی دژە سەدری ئامادەکردبوو بۆ تارانی بنێرێ تا وەهای لەقەڵەم بدا، ئەو ئاخوندە دڵسۆزی ئێران نییە. کاتێکیش سەدر گەشتی بۆ وڵاتە شێخنشینەکانی کەنداو کرد، وەها تاوانباری کرد گوایە لە دیدارێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی (الحوادث)ی عەرەبیدا، کەنداوی فارسی بە "کەنداوی عەرەب" ناوهێناوە. لەڕاستیشدا

---

[164] SAVAK Documents, No. 213/94, 28 April 1975.

[165] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[١٦٦] سەدر ئاماژەی بەوە دابوو، ئەو هیچ کێشەیەکی تایبەتی لەگەڵ ئەلئەسعەددا نییە، هەر ئەوە نەبێ ئەو ڕەزامەند نییە لەگەڵ ڕێککەوتن لەگەڵ ڕژێمی ناوەند لە بەیروتدا. بڕوانە:
SAVAK Documents, No. 213/635-52/12/9).

سەدر لێدوانی دا: "پێوستە شیعە پشتگیری عەرەبایەتی کەنداوی فارسی بکەن."[١٦٧] سەدر مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو، کە نیازی تۆخککردنی ناسنامەی شیعە و بەرژەوەندییان بووە لە کەنداوی فارسیدا.[١٦٨] هەرچۆنێک بێ، ڕوونکردنەوەکەی ئەو بەر گوێی کەڕە کەوت. هەروەها قەدەر بۆ ئەوەش تێکۆشا، سەدر بخاتە ئەو چوارچێوەیە کە، "سەرەکیترین پاڵپشتی ئۆپۆزسیۆنەکانی ئێرانە لە هەرێمەکەدا."[١٦٩] لەڕاستیشدا، زۆرینەی شۆڕشگێڕە ئێرانییەکان پەیوەندییەکی گرژیان لەگەڵ سەید موسا سەدردا هەبوو.

## سەدر و ئایەتوڵلا خومەینی و شۆڕشگێڕە ئیسلامییەکان

هەر لە بەرایی حەفتاکانەوە، هێزە ئیسلامییە لایەنگرەکانی خومەینی پەیوەندییان لەگەڵ لق و هۆبەکانی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستیندا ڕاچاندبوو. هەرچەندە شۆڕشگێڕە ناسیونالیستە دیندارەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریی ئێران، هەروەک یەزدی و قوتبزادە و چەمران مەیل و دڵسۆزی خۆیان بۆ ئایەتوڵلا خومەینی دەربڕیبوو، کەچی شاگردە سەرەکییەکانی ئەو لەنێو گەنجە ئیسلامییەکاندا ئەوانەبوون، کە دوای تەواوکردنی خوێندنیان لە ئێران دەردەچوون بەنیازی ئەوەی لە هەندەراندا لە دژی شا بجووڵێنەوە. کاتێکیش ڕژێمی بەعس فشاری خستە سەر مەلاکانی شیعە لە عێراق، چەندین شاگردی خومەینی لە هاوینی ١٩٧٢دا عێراقیان بەرەو بەیروت بەجێهێشت. لە گەورەکان لە نێویاندا سەید عەلی

---

[167] SAVAK Documents, No. 213/16054, 17 February 1975.

[١٦٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[169] SAVAK Documents, No. 213/479, 14 February 1974.

موحتەشـــەمپوور،[١٧٠] شـــێخ محەمەد مونتەزیری،[١٧١] جەلالەدین فارســـی،[١٧٢] ســـــەید محەمەد خەرازی[١٧٣] و شـــێخ ئەحمەد نەفەری[١٧٤] بوون. لەنێویاندا موحتەشەمپوور شوێنکەوتەیەکی نزیک لە خومەینی بوو، ئەو کەسە بوو لە تاراوگەنشینی لە عێراق و پاشان لە فرەنسـاش یاوەری خومەینی بوو. ئەو لەگەڵ هەر یەک لە مونتەزیری، محەمەد خەرازی و شـــێخ ئەحمەد نەفەری

---

[١٧٠] ســەید عەلی موحتەشــەمپوور مەلایەکی شــۆڕشــگێڕ بووە لەدوای شــۆڕش بووە باڵوێزی ئێران لە دیمەشق و وەزیری کاروباری ناوەخۆ. هەروەها ئەو ڕۆڵێکی سەرەکی لە ١٩٨٢ لە دامەزرانــدنی حیزبوڵڵادا گێڕا. ئەو یەکێــک بووە لەو بچمە ســــەرەکیە ئێرانییــانەی لە هەشتاکانەوە بە توندی داکۆکی لە سیاسەتی "ناردنەدەرەوەی شۆڕش" بوو.

[١٧١] شـــێخ عەباس محەمەد مونتەزیری کوڕە گەورەکەی ئایەتوڵڵا حوســـێن مونتەزیری بوو، ئەو لەنێو کوژراوەکاندا بوو لەو شــــەڕە خوێناوییەی ١٩٨١ کە بە بۆمبێکی موجاهیدین لە تاران کوژرا. دوابەدوای شــۆڕشــیش، مونتەزیری و مەهدی هاشــمی کە زاوای مونتەزیری بوو، ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی جەماوەری کۆماری ئیسلامی پێکهێنا، کە ڕۆڵێکی سەرەکی لە ســـیاســـەتی ئێران بۆ ناردنە دەرەوەی شـــۆڕش بینی. هەروەها ئەو لە ١٩٨٠دا ئەندامی یەکەمین مەجلیسیش بوو.

[١٧٢] جەلالەدین فارســی شــۆڕشــگێڕێکی ئیســلامی ئێرانی بەڕەچەڵەک ئەفغانی بوو، بەربژێری حزبی کۆماری ئیســـلامی (کە پێکهاتبوو لە زۆر لە مەلا شــیعە ناودارەکان وەک ئایەتوڵڵا خومەینی، بەهەشـــتی، هـاشـــمی ڕەفســـەنجـانی، بـاهونەر و موفەتیح). هەرچەنــدە بەربژێربوونەکەی ئەو لەوکاتە ڕەتکرایەوە چونکە شـــێخ عەلی تارانی، کە زاوای خومەینی بوو لەگەڵ هاوپەیمانە ســەرەکییەکەی بە ناوی عەبدولحەســەن بەنیســەدردا ڕایانگەیاند کە فارســی ناسـنامەی ئەفغانی هەیە. فارسـیش لەنێو بیچمە لایەنگرەکانی خومەینیدا گرنگترین دژەسەدر و دژەچەمران بوو.

[١٧٣] خەرازی یەکێک بوو لە بیچمە سـەرەکییەکان بۆ دامەزراندنی سـوپای پاسدارانی شـۆڕشی ئیســـــلامی و لە ١٩٨١ تا ١٩٨٥ بووە وەزیری نەوت، لە ١٩٨٥یەش تا ١٩٩٧ وەزیری چەند پۆستی دیکە. هەروەها ئەو لە ١٩٨٠ تا ١٩٨٤دا ئەندامی مەجلیسی ئێرانییەکان بوو هەروەها پارێزگاری خوزسـتان لەکاتی هێرشـی عێراق و هەڵگیرسـانی جەنگی هەشـت ساڵەی ئێران-عێراق. هەروەهـا لە هەڵبژاردنی ٢٠١٣شـــــدا ئەنـدامی ســــەربەخۆ بوو بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆمار.

[١٧٤] ناوی ڕاستەقینەی ئەحمەد نەفەری، سەفوەتوڵڵا بەرزەگار بوو.

دامەزرێنەری مەلا جەنگاوەرەکانی دەرەوەی ئێران (ڕوحیانیون موبارەزەی خارج از اران) بوو، ئەم گرووپە چەکدارە بارەگاکەیان لە سووریا و لوبنان بوو.[175] خەرازی یەکێک لەو شۆڕشگێڕە ئیسلامییانە بوو کە لە لایەن ساواکەوە گیرابوو، ئەو کەسە بوو لە ١٩٧٦ەوە ئێرانی بەجێهێشتبوو.[176] ئەو

[175] ئەندامانی دیکەی گرووپەکە پێکهاتبوون لە: عەلی فەلاحیان (لە ١٩٨٩ تا ١٩٩٧ وەزیری دەزگای هەواڵگریی ئیتلاعات بوو)، عەلی جەنەتی (باڵوێزی ئێران لە کوێت لە ٢٠٠٦ تا ٢٠١٠ و لە ٢٠١٣ەشەوە تا ئێستا وەزیری کلتوورە)، عەباس ئاغا زەمانی یان ئەبو شەریف (فەرمادەی دووەمی سوپای پاسداران لە ١٠٧٩ تا ١٩٨١)، محەمەد بروجەردی (یەکێ لە دامەزرێنەرە سەرەکییەکانی سوپای پاسداران)، عەلی ڕەزا ئەلادپوش (یەکێ لە ئەندامە سەرەکییەکانی بونیادی جیهادی ئێرانی جیهادی سازندگی)، ئەحمەد موەحیدی (لە دوای شۆڕش یەکەمین نوێنەری ئێران لە لوبنان)، عەلی یوسفی (وەزیری دەزگای هەواڵگری ئیتلاعات لە ٢٠٠ تا ٢٠٠٥)، مەهدی بەکری (پاڵەوانی میلیشیای ئێرانی و یەکێک لە فەرماندە ناودارەکانی پاسادارنی شۆڕش)، سەید تەقدوسیان (جێگری یاریدەدەری قانونی سەرۆک حەسەن ڕوحانی لە ٢٠١٤ تا ئێستا)، مەرزیە حەدیدچی (تاهیرە دەباغ) (یەکێ لە دامەزرێنەرانی سوپای پاسداران)، ئەحمەد فازیلی، موحسن شجاحی، سەداقەتنژاد، حەسەن موتەقی، محەمەد فەقیهی، سەید سەلمان (قەهرەمان) سەفافی (یەکێک لە دامەرێنەرانی سوپای پاسداران، لقی ئیسفەهان)، ژەنەڕاڵ ڕەحیم سەفەوی (فەرماندەی سوپای پاسداران لە ١٩٧٧-٢٠٠٧) و ئێستاش بەڕێوبەری ئەکادیمیای لەندەن بۆ خوێندکارە ئێرانییەکان)، حەبیبوللاهی، عەلی سوپاسالاری، سیراجەدین موسەوی (فەرماندەی کۆمیتەی شۆڕشی ئێران لە ١٩٨٥ تا ١٩٩٠ باڵوێزی ئێران لە کوێت لە ١٩٩٧ تا ٢٠٠٥)، محەمەد عەلی هادی نەجەفئابادی (باڵوێزی ئێران لە ئیماراتی عەرەبی و عەرەبستانی سعودی لە هەشتاکان و نەوەدەکان)، حەسەن ئیبراهیمی، مەحمود شەریفیان، محەمەد حوسێن تەرەمی (بەرپرسی هەواڵگریی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی ئێران ، سەداو سیما)، شەریفخانی و ژنەکەی ، زەهرا پەیغامی فرد (یەکێ لە ئەندامە سەرەکییەکانی حزبەکەی سەرۆک ڕوحانی، حزبی نەرمرۆ و گەشەپێدان).

[176] ئەو لەگەڵ ٦٧ گەنجی دیکەی چالاکوانانی لایەنگری موجاهیدین گیرا، هەرچەندە پەیوەندییەکی لاوازیشی لەگەڵ موجاهیدەکان هەبوو. بە گوێرەی قسەی تەقی شەهرام بێ، خەزازی تاکە زیندانی بوو کە نامەی بۆ کاربەدەستان نووسی، تێیدا پەشیمانی و تۆبەی خۆی بەیان کردووە. دوابەدوای ئەوەی بیروڕای موجاهیدین لە مارکسیزم نزیک بووەوە، ئیدی ئەو پەتکی پەیوەندی لەگەڵ موجاهیدین پساند.

بە دنەدانی سەید عەلی ئەندرزگو[١٧٧] هەوڵیدا پەیوەندی لەگەڵ شۆڕشگێڕان لە لوبنان و سوریا و فەڵەستین ببەستێ. جەلالەدین فارسی ئایدیۆلۆگ و تیۆرزانی ئەو گرووپە بوو، کە پەیوەندییەکی مەحکەمی لەگەڵ یاسر عەرەفات و موعەمەر قەزافیدا هەبوو.

ئەو یاخیبووانە شۆڕشگێڕانە لە لوبنان بوونە ڕەخنەگری سەرەکی لە موسا سەدر. بەگوێرەی قسەی یەزدی بێ؛ "ئەوانە گرووپێک بوون کێشەیان لەگەڵ هەموو کەسێکدا هەبوو بە موسا سەدر و حافز ئەسەدیشەوە. ئەوان پەیوەست بوون بە ئەحمەد جبریل و جۆرج حەبەش و لە ڕووی داراییشەوە لە لایەن قەزافی سەرۆکی لیبییەوە پشتیوانی دەکران".[١٧٨] یەزدی ئەوەشی بۆ سەر قسەکانی زیاد کرد؛ "ئەم تاقمە و ئەندامە لاوەکانی داوای شتی زۆریان دەکرد. هەرچۆنێک بێ، سەدر لەگەڵ ئەوانەدا ڕەفتاری لەسەر داواکانیان نەدەکرد. ئەمەش بناوانی گرژییەکە بوو."[١٧٩] ئەم شۆڕشگێڕانە هەر پێشتر سەرکۆنەی سەدریان کردبوو لەسەر دیدارەکەی لەگەڵ شا. هەروەها لەسەر ئەوەش سەرکۆنەیان کردبوو کە سەدر لەبارەی لۆجستییەوە ئاوری لەوان نەدابووە تا کێشە بۆ تاران بنێنەوە. ئایەتوڵڵا عەلی ئەکبەر هاشمی ڕەفسەنجانی، پاشان بووە سەرۆکی کۆماری ئیسلامی ئێران، ئەویش ئاماژەی بە گرژییەکی قووڵ لەنێوان گرووپی پشتیوانانی خومەینی و سەید موسا سەدر کردبوو. خۆی ڕەفسەنجانی لە هەمان پۆلی سەدر بوو کاتێ لە قوم بوو. "سەدر چەند خاڵێکی دیاریکراوی دەرهەق بە [پەهلەوی] ئێران هەبوو. لەسۆنگەی گەشبینییەکی تایبەت لەنێو شیعەی لوبناندا، ئەو پەیوەندی بە ڕژێمی پەهلەوەیەوە هەبوو. لە هەمان

---

[١٧٧] ئەندرزگو ئەندامی سەرەکی جەماعەتی موئتەلیفەی ئیسلامی بووکە لە خومەینییەوە نزیک بوو. محەمەد بوخاری و ئەندەرزگو سەروەزیری پێشوویان بە ناوی عەلی مەنسور کوشت. ئەو بەوە ناسرا کە "لە نێو شۆڕشەکەدا تاکە گەریلایە".

[178] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

[١٧٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

کاتیشدا، پەیوەندییەکی تۆکمەی لەگەڵ شۆڕشگێڕاندا هەبوو. لەوە پتر، ماڵی خومەینی کە لە لایەن حاجی مســـتەفاوە ســـەروکاری دەکرا، لە ســـەدر ڕقئەستوور بوو. هۆکاری سـەرەکی پشـت ئەو گرژییەش جەختکردنەوەی حاجی مســـتەفا بوو لەســـەر دەســـەڵاتە دینییەکەی خومەینی، کە لەلای ســـەدرەوە ڕێزلێگیراو نەبوو. ئاخر ســـەدر نەدەکرا لەبەر ڕۆڵی لە نێو ئەنجوومەنی باڵای ئیســـلامی شـــیعەدا، بە فەرمی بەدوای ئیمام خومەنیدا بکەوێ. لەسەرووی هەمووشیانەوە، نەدەکرا سەدر ڕژێمی ئێران [پەهلەوی] پشـتگوێ بخا. ئەو هەوڵیدا پەیوەندییە کراوەکەی لەگەڵ باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروت بپارێزێ.

***هەڵبەتە ئەوە شێوە خەباتێک بوو لە دژی شا؛ هەرچەندە بۆ ستراتیژییەکەی ئیمەش زەحمەت بوو، ئاخر لەســـەر بنەمـای ڕەتکردنەوەیەکی ڕوون و ئاشکرای ڕژێم بوو... هەندێ لە شۆڕشگێڕان هەروەک محەمەد مونتەزیری دژی ســـەدر بوون و ئەویـان بەوە شـــەرمەزارکرد گوایە نەریتخواز (کۆنسێرڤاتیف)ە. ئەوان وەهایان دانابوو سەدر بە ڕوونی دژایەتی شا بکا. منیش هەوڵم دا هەڵوێســـتی ئەوان [دەرهەق بە ســـەدر] نەرم بکەمەوە. کاتێکیش چوومە نەجەف، قســـەم لەگەڵ ئیمامدا کرد و کێشـــەکەم خســـتە بەردەمی.***" [180]

یەزدیش هاوشـێوەی ڕەفسـەنجانی جەختی لەسـەر هەڵوێسـتی دوو تیغی (دوو سەرەی) سەدر لە لوبناندا کردەوە، کە توخمە لایەنگرەکانی خومەینی نەیانتوانی لێی تێبگەن. یەزدی مشـــتومڕی لەســـەر ئەوە بوو: "ســـەدر پێگەیەکی دینی هەبوو، بەڵام جەماوەری ســـەرەکی خومەینی تەنیا خەڵکی شـیعەی ئێران بوون تەنانەت هی لوبنانیش نەبوون." [181] ئایەتوڵڵا حوسـێن

---

[180] Hashemi Rafsanjani, Ali-Akbar, Doran-e Mobarezeh, Daftar-e Nashr-e Maaref, 1376, pp. 278–276.

[181] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

عەلی مونتەزیریش ئاماژەی بە پەیوەندییەکانی سەدر لەگەڵ ڕژێمی ئێران داوە. لێدوانی ئایەتوڵڵا مونتەزیری وەها بوو:

***لەو کاتەی ئەوانەی بەنیازبوون ئۆپەراسیۆنێک لە هەندەران بکەن، ناچارکران لەگەڵ ڕژێمی پەهلەویدا هاوکاری بکەن. جەنابی موسا سەدر لە لوبنان پەیوەندی بە ژێمەوە هەبوو. ئەو هاتە ماڵمان و پێیگوتم دەچێ شا دەبینێ. دوای دیتنەکەش ئەو گوتی لەبارەی حەنەفینەژاد و موجاهیدین قسەی لەگەڵ شا کردووە. هەروەها ئەو لەبارەی منیشەوە قسەی کردبوو، ئاخر لەوکاتەدا واگوماندەکرا من لە لایەن ڕژێمەوە وڵاتبەدەر بکرێم... ئەوەی مەبەستمە بڵێم ئەوەیە، کە سەدر هیچ بژاردەی لەدەستدا نەبوو بەدەر لەوەی لە لایەن هێزێکی هەرێمییەوە [بۆ نموونە شا] پشتی نەگیرێ. لەو کاتەدا حەوزەی قوم دەسەڵاتی نەبوو. خۆ ناکرێ هەمووش هەر بە خراپی لێکبدرێتەوە. ئەوکات هیچ کۆماری ئیسلامی لەگۆڕێدا نەبوو. هەر حکومەتی محەمەدڕەزا هەبوو، هەروەها بە ناویش شیعە هەبوون. کاتێکیش ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم ڕەتیکردەوە پشتی حکومەتی ئێرانی بگرێ، ئەو وەها وەڵامی دایەوە، خۆ تەنیا یەک وڵاتی شیعەنشین هەیە... ئێمە دەبێ لەبەرانبەر حکومەتەکانی دیکەدا پشتی لە زەوی نەدەین.*** [۱۸۲]

چەندین جار سەدر هەوڵیدا ڕەوایەتی بداتە بڕیارەکەی خۆی. ئەو مشتومڕی لەسەر ئەوە دەکرد، کە بڕیارە "بەدەستونوێژەکەی" ئەو بەوەی لە لوبنان تیشکی نەخستووەتە سەر خومەینی، لەبەر ئەوەی پێگەی بەرزی شا لەنێو کۆمەڵگەی شیعەی ئەوێ بووە، بەتایبەتیش لەنێو ئەو مەلایانەی بە ئێرانەوە پەیوەست بوون. ئەو وەها ڕوونیکردەوە:

*مەلا (شا)ویستەکان لە لوبنان بەشێوەیەکی جیاواز لە [بینینی شۆڕشگێڕانی ئایەتوڵڵا خومەینی] لە (شا)یان دەڕوانی. لە سۆنگەی ئەو پڕوپاگەندە چڕەی مەنسور قەدەریش بڵاویکردەوە، شا وەک ڕابەرێکی ڕێزلێگیراوی*

---

[182] Montazeri, Hossein-Ali. Khaterat [Memoirs]. Tehran. 1378. pp. 62–63.

*شیعە وێناکرابوو، کەسێک کە تێدەکۆشێ شیعە لە هەژاری و کوێرەوەری ڕزگار بکا. هاوزەمانیش باڵوێزخانە [ی ئێران لە بەیروت] بەوە تۆمەتبارم دەکا، کە بەربەست لەسەر ڕێی پشتگیریی شا بۆ شیعەکانی لوبناندا دادەنێم.*[183]

هەر بەڕاستیش ئامانجی سەرەکی سەدر لە ڕێی نەهێشتنی هەژاری و نەدارییەوە بوژاندنەوەی ناسنامەی شیعە بوو. بەڵێ ئەو لەوە بە ئاگا بوو بەهۆی هەر بۆرە پشتیوانییەکی لە شۆڕشگێڕە ئێرانییەکان ڕووبەڕووی ڕژێمی تاران دەبووە و دەشبووە تێکوپێکشکاندنی پێگەی شیعە لە لوبنان. لێ ئەو بەڵگەوبەندەی ئەو بەر گوێی کەڕە کەوت.

بە دەربڕینی پرسە و سەرەخۆشی کۆچکردوو ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم لە ئایەتوڵڵا ئەبولقاسم خوئی لەبری ئایەتوڵڵا خومەینی لە ١٨ی تەممووزی ١٩٧٠دا بۆشایی نێوان توخمگەلی شوێنکەوتەی خومەینی و سەدر بەرینتر بوو.[184] بەگوێرەی نەریتی شیعە، دەربڕینی پرسە و سەرەخۆشی بۆ کۆچی دوایی مەرجەعێک لە ئایەتوڵڵایەک واتای ئەوە دەگەیاند، کە داننانە بەو ئایەتوڵڵایە وەک مەرجەع دوای کۆچکردووەکە. دیاربوو سەدریش دانی بە ئایەتوڵڵا خوئی وەک مەرجەع نابێ و خومەینیشی پشتگوێ خست. شۆڕشگێڕە خومەینیپەروەرەکان بەو سوکایەتییە نێودەوڵەتییە سەرزەنشتی سەدریان کرد. موحتەشەمپوور وەهای لێدوان دا: "سەدر دۆستایەتییەکی نزیکی لەگەڵ ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم و ئایەتوڵڵا خوئی هەبوو. بە گوێرەی دەستورنامەی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعەش، ئایەتوڵڵا خوئی ئینجا ئایەتوڵڵا سەید محەمەد باقر سەدر لە لایەن شیعەکانی

---

[183] Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai [Socio-political Diaries] (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) vol. 1, p. 174.

[184] SAVAK Documents, No. 212/1169, 21 July 1970.

لوبنانەوە وەک مەرجەع دانیان پێدانرابا."[185] هەروەها ئەو ئەوەشی بۆ زیاد کرد: "یەکێک لە هۆکارەکان کە سەدر ئەو دۆستایەتییەی لەگەڵ ئەو ئایەتوڵلایانە لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ خومەینیدا هەبێ، ئەوەبوو ئایەتوڵلاکان بە پێشنیازەکەی سەدر بۆ قوربانی (زەبیحە) قایل بوون. هەرچی ئیمام [خومەینی]ش بوو، ئەم پرسەی پێ قبووڵ نەبوو."[186] لەناو جەرگەی تێکۆشانی بۆ باشترکردنی پەیوەندییەکانی شیعە بە مارۆنی و کۆمەڵگە غەیرە موسڵمانەکان، سەدر داوای لە ئایەتوڵلا ئەلحەکیم کرد فەتوای نائەرسەدۆکسانە بۆ قوربانی بدەن. هەروەک ئایەتوڵلا ئەلحەکیم، ئایەتوڵلا خوئیش فەتواکەی پەسەند کرد، بەڵام ئایەتوڵلا خومەینی ڕەتیکردەوە هیچ گۆڕانکارییەک لە ڕێسا دینییەکانەوە بکرێ. بڕیارە بە مقۆمقۆکەی سەدر بۆ نزیکبوونەوە لە ئایەتوڵلا خوئی وایکرد پەیوەندییەکانی لەگەڵ مستەفا خومەینیشی بەرفرەوانتر بکا. مستەفا، بە پێچەوانەی ئەحمەد خومەینی، مەبەستی سەرەکی ئەوە بوو لەجیاتی دەسەڵاتێکی شۆڕشگێڕانەی سیاسی ڕەوایەتییەکی دینی بداتە ئایەتوڵلا خومەینی. مستەفا بە توندی ڕەخنەی لە سەدر گرت و پەیوەندییەکانی لەگەڵ پچڕاند. بە گوێرەی قسەی محتەشەمپوور؛ "مستەفا خومەینی ڕێگەی پەیوەندی سەرەکی نێوان سەدر و خومەینی بوو. دوابەدوای بڕیارەکەی سەدریش، پەیوەندییەکان لەنێوان مستەفا و سەید موسا سەدر شێوا. تەنیا لە بەهاری ١٩٧٨دا و بە نێوەندگیری ئەحمەد، مستەفا خومەینی قایل بوو سەدر ببینێ."[187] بە پێچەوانەشەوە، چەندین دۆستی نزیکی سەدر لەو باوەڕەدابوون کە

---

[185] Interview with Ali-Akbar Mohtashamipour, Tehran, February 2016.

[186] قوربانی (زەبیحە) شێوازی ئیسلامی سەربڕینی ئاژەڵانە کە لە قورئان و سوننەتدا دیاریکراوە.

[187] Interview with Ali-Akbar Mohtashamipour, Tehran, February 2016. Accompanied with his fellow, Seyyed Mohammad Mousavi Bojnordi, Mostafa Khomeini was warmly welcomed by Seyyed Musa Sadr in Beirut. SAVAK Documents, No. 234, 11 March 1978.

سەلماندنە دینییەکەی بۆ ئایەتوڵڵا خوئی بۆ پێگە و ناوی ئەلحەکیم و خوئی لە لوبنان دەگەڕێتەوە. بەگوێرەی گێڕانەوەی سەید باقر خوسرەوشاهیش بێ:

***سەدر دڵسۆزی ئیمام خومەینی بوو. لەگەڵ گەیشتنی سەدر بە لوبنان، زۆرینەی شیعە شوێنکەوتووی ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم بوون. ئیمام [خومەینی]یش ئەو جەماوەرەی نەبوو، بۆیە سەدر نەیدەتوانی ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم پشتگوێ بخا... سەدر فەرمانی دا وێنەی ئایەتوڵڵا ئەلحەکیم بە باڵەخانەی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعەوە هەڵبواسن. کاتێکیش ناوبانگی ئایەتوڵا خوئیش پەرەیسەند، سەدر وێنەی ئەویشی دانا، پاشان هی ئیمام خومەنییش.***[١٨٨]

لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەی شۆڕشگێڕە خومەینیپەروەرەکان هەرگیز ئەو لایەنگرییەی سەدریان بۆ ئایەتوڵڵا خوئی لەبیر نەچووەوە.

بە شێوەیەکی زۆر جەوهەریتریش، ڕەگوڕیشەی ئەم گرژییانە بۆ ڕوانگەی جیاواز دەرهەق بە جەنگاوەرە فەڵەستینییەکانیش دەگەڕایەوە. دوابەدوای ئەیلوولی ڕەشی ١٩٧٠، میلیشیا فەڵەستینییەکان بنکەی سەربازییان لە باشووری لوبناندا دامەزراند، لەوێوە ئۆپەراسیۆنیان لە دژی ئیسرائیل دەکرد. لە تۆڵەشدا، ئیسرائیل شار و گوندەکانی شیعەی لە باشوور کردە ئامانجی تۆپ و موشەکبارانەکانی خۆی. لە ڕەوشێکی وا داماوەنەشدا، سەدر سیاسەتی خۆی لە بەرانبەر ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینیدا گۆڕی. "سەید موسا سەدر لەسەر ڕاستی بوو. فەلەستینییەکان ئیسرائیلیان هاوەنباران کرد، ئیسرائیلیش لە بەرانبەردا گوندەکانی شیعەی دایە بەر بۆمب. یەزدی بە پێداگیریەوە گوتی، "کە بۆچی ئەو سیاسەتی ئەوانی ڕەتکردەوە."[١٨٩] لەگەڵ ئەوەشدا بە سەختی لە لایەن شۆڕشگێڕانی لایەنگری

---

[١٨٨] بڕوانە: .http://www.mashreghnews.ir/fa/news/459203

[189] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

خومەینی بە ئـاخونـدە جەنگـاوەرانی ئێرانیشـــەوە هەڵوێســـتەکەی ئەو ڕەخنەباران کرا. لۆمەکردنی ســـەدر لە جەنگاوەرە فەڵەســـتینییەکان لە هەبوونی ناخۆشـــبەختانەیان لە باشـــووری لوبناندا بووە مایەی ئەوەی موحتەشـــەمپوور "زۆر نیگەران" بێ.[190] ئەو وەها لێدوانی دا؛ "ئەو پیاوە [ســەدر] دژی فەڵەسـتینییەکان بوو. هەر کەمێک دوای پەلاماری ئیسـڕائیل بۆ سـەر لوبنان، ئەو سـەرزەنشـتی فەلەسـتینییەکانی کرد بۆ پەلامار و بۆ کورتهێنی ئـاســـایش لە بـاشـــووردا. ســـەدر وای دەگوت گوایە بەبێ فەڵەستینییەکان، ئەوا شیعە [لەبەر پەلاماری بیانی] نەیاندەڵاند.[191] هەروەها ئەو هەسـتیکرد کە "مەترسـی ئایندەی فەلەسـتینییەکان" بەهۆی ئەوەی ئەو پێیوابوو "دەکرێ مێشکی خەڵکی باشـوور بشـێوێنێ و [دەکرێ] ڕەوشـێکی وەهاش بخوڵقێنێ کە ئیدی فەڵەستینییەکان نەتوانن لە باشـووری لوبنانەوە پەلامـاری ئیســـڕائیل بدەن."[192] بۆ موحتەشـــەمپوور، پشـــتگیرییکردنی "فەڵەسـتین بەردی بناعەی خەباتی شـۆڕشـگێڕە ئێرانییەکانە دژ بە شـا و ئیمپریالیزم و زایۆنیزم."[193] موحتەشـــەمپوور بە هێدمەگرتن لە هەڵوێســـتی ســـەدر دەرهەق بە فەڵەســـتینییەکـان بڕیـاریـدا لوبنـان جێبێڵێ، چونکە "بارودۆخی سیاسی نەخوازراو لە لوبنان بۆ مەیلی خەڵکێکی سیاسی وەک ئەو گونجاو نییە."[194]

لەپـاڵ موحتەشـــەمپووردا، دەرهەق بە دۆزی فەڵەســـتینـدا هەریەک لە جەلالەدین فارسـی و شـێخ ئەحمەد نەفەریش دژی هەڵوێسـتی سـەدر بوون. **لەنێو شـــۆڕشـــگێڕە ئێرانییەکان لە لوبناندا فارســـی ســـەرەکیترین نەیاری**

[190] Mohtashamipour, Ali-Akbar, Khaterat-e Siasi [Political Diaries], pp. 143–150.

[191] Interview with Ali-Akbar Mohtashamipour, Tehran, February 2016.

[192] Mohtashamipour, Ali-Akbar, Khaterat-e Siasi [Political Diaries], pp. 143–150.

[193] Interview with Ali-Akbar Mohtashamipour, Tehran, February 2016.

[194] Mohtashamipour, Ali-Akbar, Khaterat-e Siasi [Political Diaries], pp. 143–150.

**سەدر بوو.**[195]: چەمران بەم شێویە ڕەخنەی لە هەڵوێستی فارسی دەرهەق بەســـەدر گرت. "لەکاتێکدا ئێمە شـــانبەشـــانی فەڵەســـتینییەکان لە دژی ئیمپریالیزم و ئیســـرائیلدا دەجەنگین، کەچی جەلالەدین فارسـی و محەمەد سەلاح سەرزەنشتی ئێمە دەکەن بەوەی دژی گرووپە فەڵەستینییەکانین."[196] هەرچەندە سادق تەباتەبائیش ئەوەی گوت گوایە "فارسی ناسەرکەوتووانە هەوڵی خاپوورکردنی دۆستایەتی عەرەفات و سەدر دەدا."[197] فارسیش لەو بڕوایەدا بوو سەدر دژی کردەی شۆڕشگێڕییە لە لوبنان. فارسی وەهای گوت گوایە؛ "جەنابی ســـەدر لە بوونی ئێمە لە لوبنان نیگەرانە ،[دەکری ئەمەش] پێگەکەی لاواز بکا. کەواتە نەخشـــەی بۆ ئەوە داناوە لە لوبنان دەرمان بکا."[198] ڕاستیەکەش ئەوەبوو، هەرچەندە هەردووکیان چ فارسی و چ نەفەری لە لایەن پۆلیســـی لوبنـانییەوە گیران و گومـانیش دەکرا بنێردرێنەوە ئێران، **کەچی خۆتێهەڵقورتـانی خودی ســـەدر وایکرد ئازاد بکرێن.**[199] نەوەک هەر ســـەدر بەڵکو چەمرانیش بە نـاپـاک لە لایەن فەڵەستینییەکانەوە شەرمەزار کرا، ئەمەش بەتایبەتی دوای گەشتەکەی بوو

---

[195] Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai, Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388, vol. 1, p. 172.

[196] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٩٢.

[197] http://imamsadr-news.com/article/3025

[198] Farsi, Jalalodin, Zavayay-e Tarik [Dark Angles], Farsi, Jalalodin, Zavayay-e Tarik [Dark Angles], Hadis Publisher, Tehran, 1373. p. 53.

[199] Yazdi, Ebrahim, Naqsh-e Imam Musa Sadr dar Lobnan [Imam Musa Sadr's Role in Lebanon], p. 116. in Yad- Nameh Emam Musa Sadr [Imam Musa Sadr's Memoirs], edited by Seyyed Hadi Khosrowshahi, Moaseseh Farhangi- Tahghoghati-e Emam Musa Sadr, Tehran, 1387. p. 416; SAVAK Documents, No. 4440, 14 May 1974; SAVAK Documents, No. 3108, 21 June 1972; SAVAK Documents, No. 1034, 22 June 1972. SAVAK Documents, No. 213/671, 17 March 1974; SAVAK Documents, No. 4047, 5 April 1974; SAVAK Documents, No. 440, 14 May 1974; SAVAK Documents, No. 1034, 22 June 1972.

بۆ پاریس لە ١٠ی ئابی ١٩٧٥.[٢٠٠] فارسی پێی لەسەر هەڵوێستی چەمرانی دژەفەڵەستیندا گرت؛ "چەمران گەشتێکی بۆ پاریس کرد و لەوێ دوانێکی ئاگرینی لە دژی جەنگاوەرانی فەڵەستینی دا، دوانەکەی بە جۆرێک بوو، بڕوام وەهابوو کە فەڵەستینییەکان لەناوی دەبەن."[٢٠١] ئەسغەر جەمالیفەرد کە بە ئەبو حەنیف ناسرا بوو، ئەویش ڕەخنەی لە سەدر گرت. "هەرچەندە نەخشەم وەهابوو بچمە دافور و عومان تا لە دژی سوپای پاشایەتی ئێراندا بجەنگم، کەچی هاتمە باشووری لوبنان، چونکە سەدر قەناعەتی وەها پێهێنام بچمە ئەوێ... من لە هەموو ئۆپەراسیۆنکانی میلیشیای ئەمەلدا لە دژی کەتائیبەکاندا بەشداریم کرد. لەبەر تەل ئەلزەعتەر،[٢٠٢] کە خەتای سەدر بوو، من ئەمەلم بەجێهێشت."[٢٠٣] مایەی تەوسیشە کە مەنسور قەدەری دژە سەدر هەمان ڕوانینی شۆڕشگێڕەکانی لەدژی سەدردا نەبوو. قەدەر مشتومڕی لەسەر ئەوە دەکرد: "هەرگیز شیعەی باشووری لوبنان پشتگیری ئیسرائیلیان نەکردووە. ئەوان بە ئیسرائیل سەرسام نەبوون، بەڵکو ئەوان تەنیا ڕەخنەیان لە جەنگاوەرانی فەڵەستینی ئەوەبوو کە تیختیخەی ئیسرائیلییەکان دەدەن بەڵکو باشووری لوبنان داگیر بکا."[٢٠٤]

**سەدر و چەمران بڕوایان بە پاراستنی هاوسەنگی لەنێوان بەرژەوەندییەکانی شیعە و پشتگیری کردنی فەڵەستینییەکان هەبوو، کەچی**

[200] SAVAK Documents, No. 213/831, 10 August 1975.

[201] http://shakhsiatnegar.com/.جلا-الدين-فارسی

[٢٠٢] شەڕی تەل ئەلزەعتەر لە میانەی شەڕی ناوخۆیی لوبنان و لە ١٢ی ئابی ١٩٧٦دا ڕوویدا. تەل ئەلزەعتەر ئۆردوگایەکی پەنابەرانی فەڵەستینی بوو لەژێر سەرپەرشتی ئاژانسی دالدەدان و کاری نەتەوە یەکگرتووکان بۆ ئاوارە فەڵەستینییەکان لە ڕۆژهەڵاتی نزیکدا (UNRWA) کە نزیکەی ٥٠،٠٠٠ تا ٦٠،٠٠٠ پەنابەری لە باکووری ڕۆژهەڵاتی بەیروت لە خۆدەگرت.

[203] Goftogo ba Asghar Jamalifard, Abou Hanif [A Conversation with Asghar Jamalifard, Abou-Hanif]. http://www.teribon.ir/archives/135456.

[204] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

**شۆڕشگێڕە هەوادارەکانی خومەینی سووربوون لەسەر ئەوەی لوبنان بکەنە بەرەی شەڕ لە دژی ئیسرائیل.**

هەرچەندە سەدر ڕێز و پێزانینی بۆ ئایەتوڵڵا خومەینی دەربڕیبوو، هەروەها پشتگیری خەباتی ئیسلامیشی کردبوو، کەچی توخمگەلی لایەنگرانی خومەینی گومانیان لە بیروڕای ناڕاستگۆیانەی سەدر لەبارەی فەڵەستینییەکان و شا و دەسەڵاتی دینیی خومەینییەوە هەبوو. سەدر پەسنی مەلا ئێرانییەکانی دابوو، بەتایبەتیش هی ئایەتوڵڵا خومەینی کە چۆن لە دژی ستەمکاری لە ئێران خەبات دەکا و ئەوەشی بە ڕوونی گوتبوو، کە ڕابەرانی شیعە "لەنێو خەڵک [ئێرانیدا] کاریگەرن."[٢٠٥] هەرچۆنێک بێ شۆڕشگێڕانی لایەنگری خومەینی هەوڵیاندا ڕابەرەکەیان وا لێبکەن دژی سەدر بوەستێتەوە.[٢٠٦] دوای گەیشتنی ئەو بۆ نەجەف، ئەوە بوو موحتەشەمپوور ڕوانینی سیاسییانەی سەدری لە لوبنان بە خومەینی ڕاگەیاند. "ئێمە لەبارەی ڕوانینی سەدر دەرهەق پرسی فەڵەستینی ڕاپۆرتمان دایە دەست ئیمام خومەینی کە ئەو پشتگیری فەڵەستینییەکان بوو."[٢٠٧] فارسی ڕەخنەی لە لایەنگرانی سەدریش گرت بەتایبەتی چەمران. ئەو وەهای گوت: "ئەم پیاوە [چەمران] لەگەڵ موسا سەدر دەچێتە هەموو کون و قوژبنی ئەم دنیایە. هەردووکیان چوونە مۆسکۆ و لەوێ دەسکە گوڵیان لەسەر مۆنومێنتی لینیندا دانا. هەرچەندە ئەو هەرگیز نەهاتۆتە نەجەف تا ڕێزی خۆی بۆ ئیمام خومەینی دەرببڕێ." ئینجا ئەوەشی بۆ زیادکرد؛ "هەرگیز چەمران ئیمام خومەینی بە سیاسییەکی باش و ڕابەر نەزانیوە. لەجیاتی ئەوە، ئەو سەدری بە سەرکردەیەکی تەواو عەیار و

[205] SAVAK Documents, No. 213/5701, 29 March 1973.

[206] Tabatabai, Mohammad Sadegh, Kahterat-e Siasi Ejtemai [Socio-political Diaries], Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388, vol. 1, p. 173.

[207] Interview with Ali-Akbar Mohtashamipour, Tehran, February 2016.

نموونەیی دەبینێ."[208] تەنانەت لە عێراقیش گیانی دژەسەدری لە برەودا بوو.

*شەوێکیان لە سەرەتای ١٩٧١دا، پێموابێ موحتەشەمپوور، محەمەد تەقی شەریعەتی، سەجادی، سەید حوسێن زیارەتی (حەمید ڕوحانی)[209] و من بووین، لە ماڵی شێخ حەسەن کەربولی کۆبووینەوە. ئەو شەوە زیارەتی بە توندی ڕەخنەی لە ئیمام سەدر و سەید محەمەد باقر سەدری پسمامی گرت و موسا سەدری بە بەکرێگیراوی نهێنی ئیمپریالیزم و زایۆنیزمی زانی، بە شێوەیەک کە کەس بۆی ئاشکرا نەبێ. زیارەتی ئاماژەی بەوە دا، گوایە موسا سەدر شوێنکەوتەی ئایەتوڵڵا خوئییە نەوەک هی ئیمام.... بۆ دوانیوەڕۆی پاشتر، من لە ئیمام نزیک بوومەوە و پێمگوت کە "هەندێ لە خوێندکار و شوێنکەوتەت ڕێزی هەندێ لە مەرجەعەکان ناگرن و ڕێزی سەرکردە شیعەکان دەگرن، نموونەشیان ئیمام سەدر و ئایەتوڵڵا سەدرن." ئەویش بەشێوەیەکی وەها چاوەڕواننەکراو غەمبار بوو، کە هەق بوو ئەو پرسەی لەلا باس نەکەم. پاشان ئیمام شوێنکەوتووەکانی ئاگادارکردنەوە بەوەی سووکایەتی بە سەدر نەکەن.[210]*

---

[208] فارسی لەو بڕوایەدا بوو کەوا "ئەفسانەی چەمران" دەستکردی بزووتنەوەی ئازادیی ئێرانە. "کاتێک [لە سەرەتای ساڵانی جەنگی ئێران-عێراق]، بزووتنەوەی ئازادیی ئێران خەریکی دروستکردنی ئەفسانەی چەمران بوو بەو شێوازەی ئەو لە دژی پەلامار و داگیرکاری بەخۆی کلاشینکۆفیکەوە وەستایەوە، گوایە هەموویان بکوژێ، ئەمەش شتێکی قوڕ بوو، ئێمە بۆیە کاردانەوەمان نەبوو، نەوەک زیان بە بەرگرەی و یەکێتیی نیشتیمانیمان بگەیەنین." http://shakhsiatnegar.com/.

[209] دامەزرێنەر و بەڕێوەبەری مەڵبەندی بەڵگەنامەی شۆڕشی ئیسلامی و بەڕێوەبەری ئێستای دامەزراوەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و ئینسکلۆپیدیای شۆڕشی ئیسلامی.

[210] Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai [Socio-Political Diaries] (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) vol. 1, pp. 108–110.

**لەگەڵ ئەوەشـدا، خومەینی هەرگیز هەڵوێسـتی خۆی لەبارەی ئەم ناکۆکییە ڕوون نەکردەوە.** لەوێدا هەندێ حاڵەت هەبوو کە خومەینی لەگەڵ سـەدر کۆک نەبوو، بەتـایبەتیش لەبـارەی پشـتگیریکردنی جەنگـاوەرە فەڵەسـتینییەکان. سـادق تەباتەبائیش لەو بڕوایەدا بوو "ئیمام [خومەینی] دژی سـەدر نەبووە. تاکە جار کە ڕاستگۆییەتی خۆی لەدەستدا، ئەو جارە بوو کە سـەدر سوور بوو لەسەر پشتگیریکردنی شیعەکانی لوبنان. ئیمام [خومەینی] بڕوای وەها بوو، ئەم سیاسەتە نابێتە پرسی بەیەکگەیاندنی ئەو دوو مەزهەبەی ئیسلام. سەدریش لە کاردانەوەدا پێی لەسەر ئەوە داگرت، **دەبێ سـەرەتا شـیعە پێگەی خۆیان لە لوبنان لە پەراوێزەوە بۆ پێگەیەکی چەق بگۆڕن و بەهێزبکەن.**"[211] لەپاڵ ئەمەشـدا ئایەتوڵلا خومەینی وەهای پێباشـتر بوو لە دەرەوەی ئەو دەمەقاڵێیەدا بمێنێتەوە. هاوهەڵوێسـت لە بەرانبەر عەلی شـەریعەتیشـدا، خومەینی بایی ئەوەندە زیرەک بوو هیچ هەڵوێسـتێکی ڕوون لە پرسـەکە دەرنەبڕێ بۆ ئەوەی شـوێنکەوتووەکانی بەسەر یەکدا دابەش نەکا.

لە ناوەڕاسـتی حەفتاکاندا، جۆشـوخرۆشـی لایەنگیریی فەڵەسـتینییەکان ئەوەندە هەڵکشـاو بوو، هەندێ لە شـۆڕشـگێڕی غەیرەئاخوندیش لە لۆمەکردنی موسـا سـەدردا چوونە پاڵ پشـتیوانانی خومەینی. جبهە میللی سێیەم (بەرەی نیشتمانیی سێیەم) و بیچمی هەرە سەرەکییان، ئەبولحەسەن بەنی سەدریش لەسەر هەڵوێستە تەمومژاوییەکەی موسا سەدر دەرهەق بە فەڵەستینییەکان ڕەخنەی لە سەدر گرت.[212] **شـۆڕشگێرە مارکسی و چەپە ئێرانییەکانیش سـەدریان وەک هەڕەشـەیەک بۆ سـەر ئۆپەراسـیۆنی جەنگاوەرەکانیان لە باشـووری لوبناندا دەبینی.** هەر بەڕاسـتیش، لەوێدا

211 Tabatabai, Mohammad Sadegh, Kahterat-e Siasi Ejtemai, Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388, vol. 1, p. 177..

212 See also Az Nameh-Ha-ye Chamran [From Chamran's letters], http:// imamsadr- news. com/article/1311.

کێبڕکێکارییەکی قووڵ لەنێو گرووپە شـــۆڕشـــگێڕەکاندا هەبوو تا خۆیان وەها نمایش بکەن کە لە بەرانبەر فەڵەســـتینییەکاندا خاوەن هەڵوێســـتێکی ڕاســـت و دروســـت و بێ غەلوغەشـــن. ئیدی لەژێر ئەو بەرەوتەدا بوو کە ڕەتکردنەوەی سەدر بۆ ڕادیکالیزمی فەڵەستینی بە جووڵەیەکی دژەئیسلامی هەژمار کرا. **لە ناوەڕاســـتی حەفتاکان، هەردوو لایان، ســـاواک و زۆرینەی شـــۆڕشـــگێڕە ئێرانییەکان بەدەر لە بزووتنەوەی ئازادیی ئێران ســـەدریان کردە کۆچی قوربانی خۆیان.**

## تەشەنەسەندنی دوژمنایەتی

هەڵگیرسانی شەڕی ئۆکتۆبەری ١٩٧٣ دەرفەتێکی لەبار بوو بۆ سیاسەتی مەنســـور قەدەر تا وا لە تاران بکا زیاتر لەبارەی نیازەکانی ســـەدرەوە بەدگومان بن. لە ناوجەرگەی شـەڕەکەدا، سـەدر داوای لە تاران کرد بەڵکو بەلایەنگیریی عەرەب خۆی لە شەڕەکە هەڵبقورتێنێ. ئەو برووسکەیەکی بۆ ئایەتوڵلا محەمەد هادی میلانی گەورەمەرجەعی شـــیعە لە قوم نارد، بەڵکو قەناعەت بە ڕژێمی شـا بهێنێ پشتی عەرەبە "موسڵمانەکان" بگرێ و چەک و فڕۆکە و شـــارەزای ســـەربازی بۆ عەرەبەکان بنێرێ."[٢١٣] کاتێکیش تاران ڕاســـتەوخۆ پشـتگیریی میسـری و سـورییەکانی نەکرد، ئەوسـا سـەدر بە ڕاشکاوی لە عاشورای ١٩٧٣دا بە سووکی ڕەخنەی لە ڕژێم گرت. لە ٢٨ی ئازاری ١٩٧٣شـــدا، ســـەدر بەداخ بوو بۆ ســـیاســـەتی ئێران لە بەرانبەر شـــەڕەکەدا و لێدوانی دا کە " دەبووایە تاران فرۆشـــتنی نەوتی لەســـەر ئیســـڕائیل وەســـتاندبا."[٢١٤] هەرچۆنێک بێ ڕاپۆرتەکانی مەنســـور قەدەر لە بەیانکردنی دوژمنایەتی ســـەدر بۆ تاران شـوڵی لێهەڵکێشـا بوو. ئەو گوتی گوایە ســـەدر شـــای بە "**خەندەلێوی ئیمپریالیزم**" لەقەڵەم داوە و ڕەخنەی

---

[213] SAVAK Documents, No. h/10277, 27 October 1973.

[214] SAVAK Documents, No. 213/5701, 29 March 1973.

لەوە گرتووە کە شـــــا ڕەتی کردۆتەوە ڕەگەڵ گەمــارۆی عەرەب بۆ نــاردنەدەرەوەی نەوت کردووە بۆ ئەوەی لەســـەر حیســــابی عەرەب دەستکەوتووی ئابووری هەبێ و سیاسییانەش بەسەریاندا سەربکەوێ.[٢١٥] لەگەڵ ئەوەشـــدا، هەندێ لە کاربەدەســـتانی ســـاواک ڕوانینی ئەویان ڕەتکردەوە، ڕاسپاردەیان بۆ شا ئەوە بوو، بەڵکو بە سیاسـەتەکەی خۆی لەنێو جەمارەوەری شـــیعەدا بچێتەوە، بۆ ئەوەی کاریگەریی بەســـەریاندا پەیدابکا، بەتایبەتیش دوای ئەوەی عێراقییەکان لە لوبناندا جێپێی خۆیان کردۆتەوە. لەبەرایییشـدا شـا ئەمەی پەسـەند کرد و تا سـەدر بەرەو ئێران ڕابکێشـی.[٢١٦] لەگەڵ ئەوەشدا هەر زوو ئاشکرا بوو، کە باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروت نیازی نەبووە گوێڕایەڵی سیاسەتەکەی شا بێ.[٢١٧] قەدەر سوور بوو لەسـەر ئەوەی فشـار بخاتە سـەر سـاواک تا هەر بەتەنیا ڕێنماییەکانی شــا پەیڕەو بکەن، ئەمەش "دوای ئەوەی ســەدر دڵســۆزیی خۆی بۆ ئێران سـەلماند و پەیوەندییەکانی لەگەڵ باڵوێزخانەی ئێران باشـتر بوون."[٢١٨] ئەو بە کەمۆیی تێکەڵاوییەکانی ســـەدری وەک کرێگرتەیەکی خۆی هەژمارکرد، ئەمەش وەک پێشمەرجێک بۆ گۆڕانی سیاسەتی ئێران دەرحەق بە شیعەی لوبنان.

هەروەها قەدەر ڕۆژنامە بە هەرمێنەکانی لوبنانیشی لە دژی سەدر هاندا.[٢١٩] لە بەرایی مـانگی شـــوبـاتی ١٩٧٤دا، ئەلحەیـات، ڕۆژنـامەیەکی نـاوداری شـــیعەتەوەر، لەســـەر ئەوەی ســـەدر بەزارەکی دابەزیبووە ســـەر تاران، ڕەخنەی لێگرت.[٢٢٠] ڕۆژنـامەکە گوایە خەم و پەرۆشـــییەی شـــیعەکانی

---

[215] SAVAK Documents, No. 213/531, 30 January 1974.
[216] SAVAK Documents, No. 213/8048, 10 April 1975.
[217] SAVAK Documents, No. pp. 380–1.
[218] SAVAK Documents, No. 213/19088, 7 May 1975.
[219] SAVAK Documents, No. 213/545, 2 February 1974; SAVAK Documents, No. (33–4).
[220] SAVAK Documents, No. 213/549, 4 February 1974.

هێناوەتە زمان و هێڵی بەژێردا کێشاوە، بەوەی ئەگەر هەیە بە هۆی جووڵە ڕادیکالییەکەی سەدر دەکرێ وا لە ئێرانییەکان بکا بە بڕیارەکەیان سەبارەت بە دروستکردنی نەخۆشخانەیەک لە باشووری لوبناندا بچنەوە. لەپاڵ ئەمەشدا، سەدری بە بەربەستی سەرەکی دەزانی بۆ ئەوەی ببێتە لەمپەر و ئیدی کەسانی سەر بە ئۆپۆسیۆنی ئێران، ئەوانەی لەسەر خاکی لوبنانن، ڕادەستی ئێران نەکرێنەوە. قەدەر ڕاپۆرتی بۆ ئێران ناردبوو لەسەر ئەوەی گوایە؛ "سەدر هەڕەشەی لە ناسر ئەلخەلیل، برای خەلیل ئەلخەلیل (باڵوێزی لوبنان لە تاران) کردووە بەوەی ئەگەر هات و ڕژێمی بەیروت شۆڕشگێڕە ئێرانییەکانی ڕادەستی ئێرانییەکان کردنەوە، ئەوا ئەویش کاردانەوەی دەبێ."[٢٢١] قەدەر لە ڕاپۆرتێکی دیکەدا، بە تارانی ڕاگەیاندبوو؛ "لە کاتێکدا هەق وایە ڕژێمی لوبنانی هەموو ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی لە وڵات دەربکا، کە چی لە کۆتاییدا شێخ بەهیچ تەقیەدین دوای ئەوەی چاوی بە سەدر کەوتبوو، ڕەتی کردەوە کارەکە بکا."[٢٢٢] لە کۆتاییشدا قەدەر لە ٤ی شوباتی ١٩٧٤دا ئەو بڕە پارەیەی ئێران بۆ دروستکردنی نەخۆشخانەیەک تەرخانکردبوو ڕاگرت. ئەو ڕایگەیاند کەوا **ئێران کۆمەکە داراییەکە –دەوروبەری ٣٠ ملیۆن دۆلار بوو– نابەخشێتە شیعە تا سەدر سەرۆکیان بێ.**[٢٢٣] گرژییەکانیش لە ١١ی شوباتدا زیاتر تەشەنەیان سەند، ئەوکاتەی هوەیدا بروسکەیەکی بۆ قەدەر نارد تێیدا فەرمانی شا وەهابوو، کە تا سەدر ڕابەری شیعەکان بێ، ئەوا ئێران پشتگیرییان ناکا.[٢٢٤] ئەوەش خاڵی وەرچەرخانی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتیيانەی ئێران بوو لە لوبنان.

[221] SAVAK Documents, No. 213/19, 3 April 1974.

[222] SAVAK Documents, No. 213/420, 20 May 1974.

[223] SAVAK Documents, No. 213/563, 10 February 1974.

[224] SAVAK Documents, No. 22h20/116364.

هەروەها قەدەر پەیوەندییەکانی سەدری بە ڕژێمە ڕادیکالەکانی عەرەب لە هەرێمەکەدا بە هەڕەشەیەک بۆ سەر ئاسایشی نیشتمانیی ئێران لەقەڵەم دا. ئەو ڕاپۆرتی وەها دابوو کە، قەزافی لە ڕووی داراییەوە پشتی سەدر دەگرێ، ئەمەش دوای تێکچوونی پەیوەندییەکانی سەدر لەگەڵ تاران.[225] قەدەر بۆ ئەوەی تاران لە دژی سەدر هان بدا، ئەوەشی گوت گوایە پارەی لە ڕژێمی بەغدا وەرگرتووە.[226] کاتێکیش سەدر لە بەهاری ١٩٧٤دا گەشتێکی بۆ دیمەشق کرد، ساواک پێیوابوو دەکرێ لەوێوە سەری بەغداش بدا تا قسە لەگەڵ سەرانی بەعس بکا و قەناعەتیان پێبهێنێ بەڵکو حەوزەی نەجەف دابخەن.[227] لە سەرووی هەمووشیانەوە، قەدەر گەشتەکەی سەدری بە جووڵەیەکی ترسناک لە دژی ئاسایشی نیشتمانیی ئێران لە قەڵەم دا، مشتومڕی لەسەر ئەوە کرد "ئەو مەلا هەلپەرستە" دەکرێ سەری بەغداش بدا تا پەیوەندییەکانی بەغدا –دیمەشق [لە دژی ئێران] چاک بکاتەوە."[228] لە هەمان کاتیشدا، باڵوێزی لوبنانی، ئەلخەلیل، ئەو کەسەی دۆستایەیەتییەکی باشی لەگەڵ ئەسەدوللا ئەعلەمدا هەبوو، چەندین جار سکاڵای لەسەر سەدر هەبوو.[229] ئەعلەم لە گفتوگۆی لەگەڵ ئەلخەلیلدا، لێدوانی بەوەدا کە بێهوابووە لەوەی "برادەری هەردوولامان [سەید موسا سەدر] بۆ بەدبەختی کەسێکی بێ متمانە دەرچوو. لەهەر وڵاتێک بێ، پارە وەردەگرێ. ئەلخەلیلیش گوتی ئێوەی ئێرانی پێویستە پشتی شیعەکان بگرن. باشە بۆ خەمی سەدر دەخۆن؟ ئەو [ئەلخەلیل] قسەی شایستەی کرد، لێ من دڵنیام شا پەسەندی ناکا."[230] لە دانیشتنێکی دیکەی ئەسەدوللا

[225] SAVAK Documents, No. 213/2642, 11 February 1974.
[226] SAVAK Documents, No. 213/2886, 12 March 1974.
[227] SAVAK Documents, No. 1050-7051, 18 March 1974.
[228] SAVAK Documents, No. 584/m/8, 1 April 1974.
[229] باوکی کازم ئەلخەلیل وەزیری پێشووی ئابووری نیشتمانی بوو.
[230] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). p. 47.

ئەعلەمدا، ئەلخەلیل ئەوەی دووبارە کردەوە "ئەرێ چما شـــیعەی لوبنان باجی سەدر بدەن، ئەو سەرۆکی کۆمەڵگەی شیعە بوو، کەچی وای لە شا کرد دڵخۆش نەبێ. ئیدی ئەو دەچێ هەموو خانەدانانی شـــیعە کۆدەکاتەوە بەڵکو [کۆمەڵگاکە} لە دارمان بپارێزێ و هیواشی بە پاشای خاوەن شکۆوە هەیە. (شـــا)ش پێیڕاگەیاندم ئەو جوان قســـە دەکا و پێمگوت تا لەگەڵ ئەلخەلیل وتوویژ بکەم."[٢٣١]

لەو کاتەی پلانێکی لەبارچوو بۆ لەناوبردنی مەنســـور قەدەر ڕاگەیەنرا، ئەوکات دوژمنایەتی سەدر-قەدەر تەشەنەی سەند. هەر خێرا باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروت ســـەدری بە ســـەرکردایەتیکردنی هەوڵی لەناوبردنەکە تۆمەتبار کرد.[٢٣٢] قەدەر وەهای گوت گوایە؛

*توخمگەلی سەر بە بەختیار نەخشەی لەناوبردنی دوو ئەفسەری ئاسایشی ئێرانیان دارشـــتبوو، یەکیان ژەنەراڵ پاکرەوان و ئەوی دیکەش ئەز بووم. دوابەدوای مەرگی بەختیار، ئەوە ســـەدر بوو پیلانەکەی بەرێوەبرد. من لە لایەن هەریەک لە خونســـاری، جێگری بەرێوبەر لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە و لە لایەن ساواک پێمڕاگەیەنرا. بکوژەکەش لە لایەن باڵوێزخانەی عێراق لە کوێتەوە بەکرێگیرابوو، ئیدی لەوێوە پەیوەندییەکە لەگەڵ بەختیار ڕێکخرابوون، لە کۆتاییشدا لەگەڵ سەدر.*[٢٣٣]

ســـەدریش بە توندی گوتەکانی قەدەری ڕەتکردنەوە، بەڵام خۆ باڵوێزی ئێران هەر بەتەمابوو نەیارەکەی بەرکەنار بخا. ئەوەبوو لە ســـەرەتای نیسانی ١٩٧٤دا، لە حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە بانگهێشتنی

---

[٢٣١] هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٢٧٤..

[232] SAVAK Documents, No. 213/79, 10 April 1974.

[٢٣٣] قەدەر ئەوەشـــی بۆ زیادکرد کە بکوژەکە دوای شـــۆڕشـــی بووە بەرێوبەری ڕێکخراوی بـانگخوازیی ئیســـلامی. Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

سەدر کرا سەری نیویۆرک بدا.[٢٣٤] قەدەریش هەوڵیدا قەناعەت بە جۆرج ماک مورترتری گۆدلی، باڵوێزە نوێیەکەی ئەمریکا لە بەیروت بهێنێ، بەڵکو بانگهێشتنامەکەیان بۆ سەدر بکێشنەوە. ئاخر ئەو سەدری بە ئاخوندێکی دژواری هەلپەرست وێناکردبوو، ئەو کەسەی لەگەڵ ڕژێمە جیاجیاکان و کەسانی دژەشا، پەیوەندی دەبەستێ؛ هەروەک ڕژێمی بەعس لە بەغدا، تەیمور بەختیار، خومەینی، سەید موسا، ئایەتوڵلازادە ئیسفەهانی،[٢٣٥] جەمال عەبدولناسر و تەنانەت کرەملنیش." گۆلدیش بەرێزەوە وەڵامی دایەوە، کە بڕیارەکە [بانگهێشتکردنی سەدر] بەرلەوەی ئەو بێتە بەیروت دراوە.[٢٣٦] هەرچەندە سەدر سەفەرەکەی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان نەکرد، کەچی قەدەر هەر بە پێشەنگی هەڵمەتی دژە سەدر مایەوە.

وێڕای جۆشدانی "ئاخوندە دڵسۆز و شاپەرستەکان" لە تاران و ناوزەدکردنی سەدر بەوەی "بەکرێگیراوی ڕژێمە بیانییەکانە"،[٢٣٧] قەدەر نیازی وەها بوو دەسەڵاتە دینییەکەی سەدریش لە ئێران بنکۆڵ بکا. ئەو گوتی؛

---

234 SAVAK Documents, No. 213/16, 4 April 1974.

٢٣٥ ئایەتوڵلازادە ئیسفەهانی چالاکوانێکی دژە شا بوو کە دۆستایەتییەکی نزیکی لەگەڵ تەیمور بەختیاردا هەبوو. ئەو لە ئێرانەوە ڕووی لە میسر کردبوو تا چاوی بە ناسر بکەوێ، ئینجا بۆ بەغدا تا لە دژی ڕژێمی تاران خەبات بکا. بەگوێرەی ساوک بێ، "ئایەتوڵلازادە ئیسفەهانی پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ خەلیل ئیبراهیم عەبدولحەمیدی سەرۆکی حزب التحریر الاسلامی (حزبی ڕزگاریی ئیسلامی)ەوە هەبوو. هەروەها ئەو بە نهێنییەوە بەشداری کۆبوونەوە هەفتانەییەکانی نەجەف بوو لەگەڵ مستەفا خومەینی، شێخ موسا قومی، محەمەد سادقی و سەید مورتەزا نەخچەوانی محەمەد عەلی مەولەوی عەرەبشاهی، کە لەبارەی کاروباری ناوەخۆی ئێرانەوە قسەیان دەکرد. بڕوانە SAVAK Documents, 16 July 1966 هەروەها ساواک ڕاپۆرتی ئەوەشی دابوو کە ئایەتوڵلازادە ئیسفەهانی، مستەفا خومەینی و محەمەد سادقی نەخشەی بڵاوکردنەوەی گۆڤاری جمهوریەتیان لە عێرقدا دابوو. بڕوانە بەڵگەنامەکانی ساواک ، ٩ی شوباتی ١٩٦٦. وێڕای ئەم پەیوەندییە بەراییانە، کەچی هەرزوو مستەفا خومەینی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئایەتوڵلازادە ئیسفەهانی بەهۆی ڕایەڵی کاری دەرەکی لەگەڵ ڕژێمی بەعس و لەگەڵ بەختیاردا پچڕاند.

236 SAVAK Documents, No. 4290/m/8, 7 May 1974

237 SAVAK Documents, No. reported from 312.

***سـەدر چووە ڤاتیکان تا لەبارەی یەکێتیی دینییەوە قسـە بکا. ئەو لەوێ باسـی ئەوەی کردووە گوایە لەیەکجیابوونەوە لە نێوان شـیعە، سـوننە، کریستیان و جوایەتی یان هەر ئاینێکی دیکەدا نییە؛ هەر بۆیەشە ئێمە دەبێ دژی کفر بجەنگین بە زایۆنیزمیشـەوە. لە کۆتایی دیدارەکشـیدا، ئەو لەبەردەم خاچی پیرۆزدا وەسـتاوە و وێنەی لەگەڵدا گرتووە. وێنەکەش بە شێوەیەکی تایبەت لەنێوان ئاخوندە شیعەکاندا دابەشکرا و لەدژی سەدر بەکارهێنرا.***[٢٣٨]

**هەروەها سـاواکیش پلانێکی بۆ لاوازکردنی پێگەی سـەدر لە لوبنان ئامادەکردبوو. پلانەکە ئەوەبوو بەسەر سەدردا بازبدرێ و لە ڕێی ئاخوندە شـیعە نەیارەکانی سـەدر بە بڕێک پارە یارمەتی هەژارانی شـیعە بدرێ.** بەگوێرەی پلانەکە، بە پشـتگیری مەلاکانی دژەسـەدر، ئەوا دەکرا، ئێران بەبێ پرس و مۆڵەتی سەدر نەخۆشخانەیەک دروست بکا و بەڕێوەشی ببا. وەک هەنگاوی دواتریش، زنجیرەیەک وتاری دژەسـەدر لە ڕۆژنامە و گۆڤارە هەمەڕەنگەکانی لوبناندا بڵاوکرانەوە، جەختیان لەسـەر پەیوەندییەکانی سەدر لەگەڵ ڕژێمەکانی دژەشا لە هەرێمەکەدا کردبووەوە. دوا هەنگاویش قەول وابوو ئەو ئاخوندانەی دژەسـەدر بوون بانگهێشـتی ئێران بکرێن.[٢٣٩] هەرچەندە پلانەکەش بەگەڕ نەخرا، کەچی پشـتیوانانی سـەدر لۆمەی قەدەریان کرد لەسـەر ئەوەی قەدەر لە لوبنان و ئێراندا لەپشت پڕوپاگەندەی دژە سەدرە.[٢٤٠]

سەدر خۆیشی هەوڵیدا قەناعەت بە تاران بهێنێ تا گرژییەکان خاوبکاتەوە. لە دانیشتنێک لەگەڵ کەمیل شەمعونی سەرۆکی پێشوو، کۆنە هاوپەیمانی شـا لە لوبنان، ئەوەی پێگوت کەوا باڵوێزخانەی ئێران لەبەیروت دوژمنی

---

[238] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[239] SAVAK Documents, No. (p. 2111).

[240] SAVAK Documents, No. 213/572, 10 February 1974.

ســـەرەکییەتی و ســـەرکۆنەی مەنســـور قەدەری کرد، کە تیختیخەی کامیل ئەلئەسعەد و جەعفەر شەرەفەددین و سەید حەسەن شیرازی داوە لە دژی بوەستنەوە.[٢٤١] لە سەرەتای ئایاری ١٩٧٤یشدا، سەدر چاوی بە ئەفسەرانی ســاواک لە بەیروت کەوت و بە توندی ئەوەی ڕەتکردەوە گوایە دڵســۆزی ئێران نییە. ئەو بە ئەفسەرەکانی گوت ئەو لێرە [لە لوبنان] وەک "نوێنەرێکی شـــایە لە جیهان" و ئەو " شـــێتە گەر هاتوو زلهێزێکی وەک ئێران لە هەرێمەکەدا پشـــتگوێ بخا." ئەو ئەوەشـــی خســـتەســـەر کە ئەو ناتوانێ بانهگێشـــتنامەی ڕژێمەکانی دژەشـــا لە هەرێمەکەدا ڕەتبکاتەوە، ئاخر ئەو وەک ڕابەرێکی ئاینی پێویســـتە بە دوای ئەم جۆرە چالاکییانەدا بڕوا. "خۆ ئەگەر قەزافی بانهگێشـــتنامەم بۆ بنێرێ، بۆ لیبیاش دەچم، بەڵام ئەگەر لێمبخوازێ سووکایەتی بە شا و بە ئێران بکەم، ئەوا زللەیەکی لە بناگوێی دەدەم."[٢٤٢] سەدر سەرکۆنەی قەدەری کرد کە کێشەی بۆ شیعە ناوەتەوە و تکای بۆ پشـــتگیری دارایی بۆ دروســـتکردنی نەخۆشـــخانە لە ئێران دووبارەکردەوە. مشتومڕی لەسەر ئەوە کرد، کە "لە قۆناغی پاش ناسردا، دەکرێ شـــا ڕابەرایەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین بکا، ئەمەش بە قووڵکردنەوەی نمایشی شکۆمەندانەی خۆی لە لوبنان کە دەبێتە مایەی دەستەوەستانی دوژمنەکانی لە هەرێمەکەدا، بەتایبەتی عێراق." لە کۆتاییدا ئەو بەڵێنی دا، "من بۆ سیاسەتی ئێران هەر شتێک بێ دەیکەم."[٢٤٣] کەچی کەس گوێی بە بەڵگەوبەندەکەی ئەو نەدا.

---

[241] SAVAK Documents, No. 213/2722, 5 March 1974.

[242] SAVAK Documents, No. 221/33631, 9 May 1974.

[٢٤٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## بزووتنەوەی بەشخوراوون و ئەمەل

**سەدر تا سەرەتای حەفتاکان توانی کۆمەڵگەی پەراوێزخراوی شیعە بکاتە یەکێک لەو کۆمەڵگانەی ڕۆڵێکی چارەنوسساز لە سیاسەتی لوبناندا ببینێ.**

بەگوێرەی یەکێ لە ڕاپۆرتەکانی ساواک، سەدر "تاکە سەرکردەی لوبنانی بوو کە هەوڵی باشکردنی ڕەوشی لوبنانی دەدا. بە پێچەوانەی زۆر لە سەرکردە لوبنانییەکان ئەو لاواز نەبوو."[244] ئەو سەرکەوتووانە ڕۆڵی کەسایەتییەکی نیشتمانی لە لوبنان نمایش کرد، لەوەی کەسێکی مەزهەبی بێ. هەروەها ئەو فشاری خستە سەر سەرۆک سلێمان فرەنجیە بۆ ئەوەی چاکسازییەکی کۆمەڵایەتی-ئابووری لە باشووری وڵات بکا بە دروستکردنی بەربەستێکیش لەسەر ڕووباری لیتانی. کاتێکیش پەیوەندی ئەو لەگەڵ سەرۆک فرەنجییە شێوا،[245] بەوە تاوانبار کرا گوایە پەیوەندی ژێربەژێری لەگەڵ تاراندا هەیە. ئەنتۆنی فرەنجیە، کوڕە گەورەکەی سەرۆک سلێمان فرەنجییە، وەهای گوت گوایە سەدر هێزی هەلپەرستانەی لە دژی ئێران کۆکردۆتەوە، لەکاتێکدا هەر خۆیشی بەدوای ئەوەدا وێڵە ئێران پشتیوانی بکا.[246]

لەناوجەرگەی ئەو هەموو فشارانەدا، سەدر و حوسێن ئەلحوسەینی بزووتنەوەی بەشخوراوانیان (حرکة المحرومين) لە ئازاری ١٩٧٤دا بە نیازی فشاری چاکسازیی سیاسییانە لە سیستمی لوبنانیدا دامەزراند و بە پێداگرییەوە داوایان لە بەیروت کرد دژی بێبەشکردن بجەنگێ.[247] ڕێکخراوەکە پێی لەسەر ئاشتی و یەکسانی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بۆ

---

244 SAVAK Documents, No. 213/2218, 18 December 1974.

245 SAVAK Documents, No. 213/2395, 26 January 1974.

246 SAVAK Documents, No. 213/500, 19 January 1974.

247 ئەلحوسەینی ئەوکات وتەبێژی پەرلەمانی لوبنانی، ئینجا لە ١٩٧٨دا سکرتێری گشتی حزبی ئەمەل بوو. حوسەینی ڕۆڵێکی کلیلئاسای لە نێوەندگیری ڕێککەوتنی تائیف گێڕا، کە بووە مایەی کۆتاییهێنان بە شەڕی ناوخۆی لوبنانی (١٩٧٥-١٩٩٠).

هەموو کۆمەڵگە مەزهەبییەکانی لوبنان داگرت، بەمە بزووتنەوەکە پەیامێکی نامەزهەبییانەی هەبوو، سنووری هاوبەشەکانی بڕی و هەموو لوبنانییەکانی یەکخست. موحتەشەمپوور وەهای گوت؛ خۆی ئەوە "بزووتنەوەیەکی لوبنانی بوو نەوەک ئیسلامی".[248] لە سەرەتاوە بزوتنەوەکە پشتیوانی خۆی لە لای سەرکردە مەزهەبییەکانی دیکەوە بۆ لای خۆی ڕاکێشا، لەوانەش سەرۆکی قەشەکانی ڕۆمی کاسۆلیک مونسینور گیجگوار حەداد و باوکە یواکیمی پیرۆز.[249] لە ٥ی ئایاری ١٩٧٤یشدا، زیاتر لە ٨٠،٠٠٠ لە شوێنکەوتووانی سەدر لە صور کۆبوونەوە تا پشتیوانی خۆیان بۆ بزووتنەوەکە دەرببڕن. لە ١٤ی دیسێمبەری ١٩٧٤یش، یواکیمیم موبارەک لێدوانی دا بەوەی سەدر سیمای کەسایەتی عەرەبییانەی لوبنانی بە "بزووتنەوەیەکی دەستڕۆیشتوویی ئیسلامی" پاراست."[250] لە ئایاری ١٩٧٤دا ئەنجوومەنی فەرمی باڵای ئیسلامی کە سوننە تێیدا باڵکێش بوو، پشتیوانی خۆی بۆ شیعە دەربڕی. لە ئەیلوولی ١٩٧٤یشدا کۆمیتەی جێبەجێکاری هاوکاریی ئیسلامی، داوای لە حکوومەتی مارۆنی کرد بێزی داواکانی کۆمەڵگەی موسڵمانی بگرێ بە شیعەشەوە.[251] پێکهێنانی بزووتنەوەی بەشخوراوان (حەرەکەت ئەلمەحرومین/ حرکة المحرومین) هەژموونی زاڵی شیعەی زوعەماشی تێکشکاند. خۆی ئەوەش "یەکەمین هەوڵ و تەقەلای شیعەکان بوو بۆ خۆڕیکخستنەوەیان لە دەرەوەی بازنەی نەریتخوازی زوعەمادا."[252]

[248] Interview with Ali-Akbar Mohtashamipour, Tehran, February 2016.

[249] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

[250] SAVAK Documents, No. 3260, 14 December 1973.

[251] Halawi, Majed. A Lebanon Defied: Musa al-Sadr and the Shia Community (Oxford, 1992) p. 190.

[252] Shanahan, Rodger, The Shi'a of Lebanon: Clans, Parties and Clerics (London and New York, Taurus Academic Studies, January 1, 2005).

قۆنـاغی دوای ئەوەش پێکهێنـانی بـاڵێکی چەکـداری بزووتنەوەی بەشـــخوراوەکان (مەحرومین) بوو بە ناوی فەوجەکانی بەرگری لوبنانی (افواج المقاومة اللبنانية) کە دواتر بە کورتکراوی پیتی ناوە عەرەبییەکەی (امل) واتە هیوا ناسرا. لە ٢٠ی ینایری ١٩٧٥دا، سەدر لە دوانێکی جۆشداندا بەڵێنی بە لایەنگر و شـــوێنکەوتووەکـانی دا، میلیشـــایەک لە دژی ئیسـرائیلییەکان و گرووپە دژەشـیعەکان لە لوبناندا دروسـت بکا. "هەموو کەسێک، نەوەک بەتەنیا هەر حکومەت، لەسەری پێویستە بەرگری لە وڵات، لە نەتەوە و لە مـاڵی خۆی بکا.... و ئەگەر هـاتوو حکومەتیش شـــتەکەی پشتگوێ خست، ئەوا دەبێ نەتەوە خۆی ئەم کارە بکا." پێشتریش میلیشیای شـیعە تازەســـەرهەڵدراو لە ئۆردوگا ســـەربازییەکانی بیقاعدا لە لایەن ڕێکخراوی فەتحی فەلەســـتینییەوە مەشـــق و ڕاهێنـانیـان پێکرابوو.[253] پێکهێنـانی ئەمەل بە ڕێکەوت لە ٦ی تەممووزی ١٩٧٥دا پەردەی لەســـەر هەڵدرایەوە، ئەمەش هەر پێنج ڕۆژ لە دوای تەقینەوەکەی مینێکی دژەتانک لە یەکێ لە ئۆردوگاکانی فەتح لە عەین ئەلبونییەدا بوو، کە شـــارۆچکەیەک بوو لە نزیک بەعلبەک، بەهۆیەوە ٢٤ چوار مەشـقپێدراوی شیعە کوژران و ٤٢شیان بریندار بوون. ڕووداوەکەش دنەی سەدری دا تا پێکهێنانی ئەمەل ڕابگەیەنێ.[254] ئیـدی هەر زوو ئەمەل پڕ جەمـاوەر بوو، بزووتنەوەی بەشـخوراوان (مەحرومین)یشـی وەک ڕێکخراوێکی سـەربازی و سـیاسـی لەخۆگرت. **لەپـاڵ پەیمـانگەی تەکنیکی برج ئەلشـــیمـالی و بزووتنەوەی بەشـخوراوان (مەحرومین)، ئیدی ئەمەل بووە ســەرنجڕاکێشـترین هێمای ســـەرکردایەتی ســـەدر کە یارمەتیدا زیاتر ڕێزی بگیرێ و حکوومەتیش پشکێکی زۆرتر لە سەرچاوەی داهاتەکەی بۆ خەڵکی شیعە تەرخان بکا.**

پێکهێنانی ئەمەل ساواکی تووشی سەرسامی کرد. قەدەر گوتی؛ "بەرلەوەی ئەمەل ڕابگەیەنرێ و نمایشـی ئاشـکرابوونی خۆی بکا، ئێمە مەتەڵەکەیمان

[253] Beirut 213/243, from 213 to 713, SAVAK Documents, 8 July 1975.
[254] Beirut 213/243, from 213 to 713, SAVAK Documents, 8 July 1975.

بۆ هەڵنەهاتبوو."[255] کاربەدەستانی ساواک پێشتر پێشبینی پێکهێنانی میلیشیایەکیان کردبوو تا ببێتە پاڵپشتی شیعە لە دژی نەیارەکانیان.[256] بە گوێرەی ساواک، سەدر و چەمران میلیشیایەکیان بە ناوی جانباز لە باشووری لوبنان بە فەرماندەیی قاسم مەهداوی دامەزراندبوو.[257] لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ساواک نەیتوانی بوو سەروسۆراغی پێکهێنانی ئەمەل بکا. ساواک لەوە ترسا مەبادا پەیوەندی لەگەڵ یاخیبووە ئێرانییەکانەوە هەبێ، هەر بۆیە چاودێری کار و چالاکییەکانی ئەمەلیان لە لوبناندا کرد. ساواک ئەوەی گوت گوایە "زیاتر لە "٦٠٠٠ گەنج" لە بنکەکانی ئەمەل ڕاهێنراون.[258] هەروەها ئەوەش زەق کرابووەوە کە ڕۆڵی گەورەی چەمران لە پێکهێنانی ئەمەلدا هەبووە.[259] "ئەوەی ڕاستی بێ، سەری ڕاستەقینەی بزوتنەوەی بەشخوراوان بە هەموو دەسەڵاتێکەوە چەمرانە، کە جڵەوی هەموو میلیشیا و پرسی دارایی لە دەستدایە. هەرچۆنێک بێ لەبەر ئەوەی ئەو ئێرانییە، بۆیە بە نهێنییەوە چالاکییەکانی خرابوونەوە ژێر چاودێرییەوە.[260] بە گوێرەی ساواک، چەمران بیچمی سەرەکی ئەمەل بوو، کە هەم شوێنکەوتووە شیعەکانی سەدر و هەم ئۆپۆزسیۆنە ئێرانیەکانیشی مەشق دەدان.[261] خۆی ئەوە چەمران بوو ئەمەلی دامەزراند. چەمران تەنیا تیشکی

---

[255] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[256] SAVAK Documents, No. 212/82, 11 April 1970; SAVAK Documents, No. 4796- 4797, 25 November 1974.

[257] SVAK Documents, No. 6552, 11 January 1974.

[258] SAVAK Documents, No Number.

[259] SAVAK Documents, No. 334/1988, 27 July 1973.

[260] SAVAK Documents, No Number, No date.

[261] SAVAK Documents, No. 5152, 4 September 1974; SAVAK Documents, No. 213602, 17 July 1975; SAVAK Documents, No. 213/1648, 19 February 1976; SAVAK Documents, No. 17/033-3/1068; 7 May 1977; SAVAK Documents, No. 4873-4872, 13 July 1974; SAVAK Documents, No.

خستبووە سەر سیاسەتی ناوخۆیی لوبنان و ئەمەل. ئەبو شەریفیش لەگەڵ چەمران بوو.*[262] پێکهێنانی ئەمەل و سەرکردایەتی میلیشیایانەی چەمران وایان لە ساواک کرد ئەمەل وەک بارەگای سەرەکی شۆڕشگێڕە ئێرانیەکان لەقەڵەم بدەن.[263] تەنانەت ڕەخنەگرانی سەدریش ئاماژەیان بە ڕۆڵی بڕیاردەرانەی چەمران لە بوژاندنەوەی شیعەی لوبناندا دا. موحتەشەمپوور لە جیاتی ڕەخنە لە سەدر بگرێ ڕەخنەی لە چەمران گرت بەوەی چاکسازییە سەرەکییەکانی لە باشووری لوبناندا کردوون و گوتی: "چەمران سێ شتی بۆ سەدر و شیعەی لوبنان کرد: ١- **پەیمانگەی تەکنیکی بورج ئەلشیمالی. ٢- بزووتنەوەی بەشخوراون (حركة المحرومين). ٣- ئەمەل.** هەموو ئەو ڕێکخراوانە لە لایەن چەمران خۆیەوە بەڕێوە دەبران".[264]

هەرچۆنێک بێ پێکهێنانی ئەمەل هەردوولای کریستیانی و چەپەکانی وروژاند.[265] پێشتر گرووپێکی چەکداری شیعە بە ناوی لاوانی عەلی (فتيان [ئیمام] علی) ئەوەیان ڕاگەیاند گوایە بە بزووتنەوەی بەشخوراوانی سەدر پەیوەستن. ئەو میلیشیایەی شارێکی کریستیانییان لە باکووری بەیروت خاپوور کردبوو. قەدەر گوتی گوایە: "لە کاتێکدا سەدر بەتوندی پەیوەندی

---

334/1988, 27 July 1974; SAVAK Documents, No. 4990, 3 August 1974; SAVAK Documents, No. 5114, 3 September 1974.

[262] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

عەباس ئاگا زەمان یان ئەبو شەریف فەرماندەی دووەمی سوپای پاسداران بوو بەر لە جەواد مەنسووری، لە ١٩٧٩ەوە تا ١٩٨١. ئەبو شەریف یەکێک بوو لە فەرماندەکانی لایەنگری بەنی سەدر لە نێو سوپای پاسداران. دوابەدوای لێپێچینەوە و بەرکەنارکردنی بەنی سەدر لە ٢١ی حوزەیرانی ١٩٨١دا، ئەویش وەک باڵوێزی ئێران لە ئیسلام ئاباد لە پاکستان داریکرا.

[263] SAVAK Documents, No.213/54013, 6 April 1974.

[264] Interview with Ali-Akbar Mohtashamipour, Tehran, February 2016.

[265] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for IranianHistory.

خۆی لەگەڵ فتیان عەلی ڕەتکردەوە، کەچی ئەمەل وێنە و نمایشی سەدری لەنێو کریستیانەکاندا شێواند."[266] لەپاڵ ئەمەشدا، کریستیانەکان ڕەخنەیان لە ڕۆڵی چارەنووسسازانەی سەدر گرت لە ئاشتکردنەوەی دیمەشق و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی. بە ئاگابوون لە ڕکابەری درێژخایەنی لە لوبناندا، سەدر هەوڵیدا گرژیی نێوان حافز ئەسەد و یاسر عەرەفات خاوبکاتەوە. لە ١٤ی ئایاری ١٩٧٣دا، سەدر سەری دیمەشقی دا بەڵکو قەناعەت بە ئەسەد بهێنێ، گرژییەکەی لەگەڵ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستیندا هەندێ خاوبکاتەوە. بەگوێرەی ئەسەدیش بێ، گەشتەکەی سەدر "لە نێوەندگیری وڵاتانی دیکە باشتر بوو."[267] لە چاوی مارۆنییەکاندا، چالاکییەکانی سەدر گرژییەکانی ناوخۆی تیرتر کرد.

## شەڕی ناوخۆیی لوبنانی ١٩٧٥

لە دەستپێکی ١٩٧٥دا، کەتائیب بەسەرکردایەتی پێری جەمەیل و حزبی لیبرالی نیشتمانی وڵاتپارێز بە سەرۆکایەتی کەمیل شەمعون لۆمەی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی و بزووتنەوەی نیشتمانیی لوبنانی هاوپەیمانیان کرد،[268] بەوەی ئاسایشی نیشتمانیی لوبنانیان خستۆتە مەترسییەوە. هەروەها بانگی ئەوەشیان هەڵدا لەبارەی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینیەوە لە باشوور ڕاپرسییەک بکرێ. ڕەوشەکەش لەوکاتەدا گرژتربوو کاتێک مەعروف سەعدی سکرتێری گشتیی ڕێکخراوی میللی ناسرییەکان و هاوپەیمانی ناسر لە ٦ی ئازاری ١٩٧٥دا لە لایەن سوپای لوبنانییەوە کوژرا. سەدریش لە تۆڵەدا هەر ڕۆژێک دوای ڕووداوەکە جەماوەری خۆی کۆکردەوە. لە پاش کەمتر لە هەفتەیەک

---

[266] Beirut 213/243, from 213 to 713, SAVAK Documents, 8 July 1975.

[267] SAVAK Documents, No. 334/936, 2 June 1973.

[268] بەرەیەکی دەستەبژێری ئایدیۆلۆژی بوو لە ڕادیکاڵ و ئۆپۆزسیۆنی ڕیفۆرمخواز لە دژی مارۆنییەکان پێکهاتبوو.

سەرکردە سوننی و شیعەکان بانگی نەهێشتنی سیستمی مەزهەبییان دا؛ کەچی داواکە دەستبەجێ لە لایەن مارۆنییەکانەوە ڕەتکرایەوە. ئەوە بوو لە ١٣ی نیساندا، گرژی لەنێوان مارۆنییەکان و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی بەوە تەشەنەیسەند، کە دوو کەس لە کەتائیبەکان لە شەڕە تەقەیەکدا لەگەڵ نەناسراواندا کوژران. هەر چەند سەعاتێک پاشتر، کەتائیبەکان پاسێک کە ٣٠ سەرنشینی فەڵەستینی تێدابوون قەتلوعامیان کردن. ئیدی هەر زوو "کوشتارگەی پاسەکە" سەریکێشا بۆ شەڕێکی خوێناوی هەمەلایەنە لەنێوان بزووتنەوەی نیشتمانیی لوبنانی و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی لە لایەک و کەتائیبەکان لە لایەکی دیکەوە. هەرچەندە شیعەکان بوونە خۆراکی تۆپەکانی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی، کەچی لە سەرەتاوە سەدر شیعەکانی لە شەڕەکەدا دوورخستنەوە. بە دەستلەکارکێشانەوەی کابینەی چەکدارییی حکوومەت، سەدریش لە ٢٧ی حوزەیرانی ١٩٧٥دا لە مزگەوتێکی بەیروتدا بۆ بڵاونەبوونەوەی پریشکی شەڕەکە، مانگرتنی خۆی ڕاگەیاند. دوای پێنج ڕۆژ لە بەڕۆژووبوون و دانیشتن لەگەڵ عەرەفات و عەبدولحەلیم خەدامی وەزیری کاروباری دەرەوەی سوریا، ئەوەبوو سەدر لە کۆتاییدا مانگرتنەکەی شکاند، دوای ئەوەی گرووپە لوبنانییەکان قایلبوون حکومەتێکی یەکێتیی نیشتمانی پێکبهێنن و ڕەشید کەرامی سەرۆوەزیرە نوێیەکەی لوبنانیش لەگەڵی دانیشت. بەڕۆژووبوونە سیاسییەکەی سەدر و بەشداریکردنی لە کۆبوونەوەی ئاسایشی لە دانیشتنی عەرمون لە ٢٤ی ئەیلوولی ١٩٧٥دا ئەوەندە کاریگەر بوو تا ساواک دانپێدانا بەوەی سەدر ڕۆڵی سەرەکی لە ڕاوەستاندنی خولی یەکەمی شەڕی ناوخۆیی لوبنانیدا گێڕا.[٢٦٩]

---

[269] Beirut 213/201, SAVAK Documents, 5 May 1975; Beirut 213/196, SAVAK Documents, 5 May 1975; SAVAK Documents, No.251514/245, 16 August 1975.

پێشتریش شا هۆشداری دابووە مارۆنییەکان بەوەی نەکەن گرژییەکان لە لوبنان پەرەپێبدەن و بەرفرەوانی بکەن. شا فەرمانی بە مەنسور قەدەر کردبوو، لە بەرایی هەفتاکانەوە ئەم پەیامە بگەیەنێتە سەرۆک سلێمان فرەنجیە؛ "سەرکردە کریستانەکان تێبگەیەنێ بەوەی قۆناغی دەسەلاتدارییان بەسەر کەمینەکانی دیکەی لوبنانیدا تێپەڕی. پێیان بڵێ کەوا سەرکردایەتی ئێوە بۆ ئەوان چیدی هی ئەوە نییە درێژەی پێبدرێ. کەواتە پێویستە ئێوە لەگەڵ موسڵمانەکان ڕێک بکەون؛ دەنا بەپێچەوانەوە سیاسەتی خۆجێی دەتەقێتەوە."[270] شا لە گەرمەی شەڕەکەدا و لە ڕێی قەدەردا لە ڕاوێژێک بۆ سەرۆک ئێلیاس سەرکیس گوتبووی؛ "موسڵمانەکان لە لوبنان لە دژی ئێوی کریستیان دەچنە پاڵ فەلەستینییەکان، چونکە ئێوە لە سیاسەتەکاندا بەهەندتان هەڵنەگرتبوون." قەدەر چۆن پەیامەکەی گەیاندە سەرۆک، ئاوەهاش گەیاندییە سەرکردەکانی دیکە وەک سەرووەزیر ڕەشید کەرامی و سەرووەزیری پێشوو ساحب سەلام و عەبدوللا ئەیافی. کەچی ڕاوێژەکەی شا بەر گوێی کەڕە کەوت.[271]

بەهاتنی مانگی ئەیلوولی ١٩٧٥، لوبنان بە تەواوی تووشی شەڕێکی ناوخۆیی بووبوو. ئەمەل وێڕای ئەوەی لە بەراییدا بڕیاریدا بوو لە شەڕەکەوە دووربێ، کەچی وردە وردە کاتێ شیعە بە خەستی هاوکاری بزووتنەوەی نیشتمانی و فەتح بوون، ئەمەلیش تێوەگلا. سەرباری دەرکپێکردنی مارۆنییەکان بە باری نائاسایش و قۆرخکردنی دەسەڵات، کەچی سەدر گلەیی ئەوەی لێکردن کە هەرێمە پاشکەوتووەکەی شیعەیان لە باشوور پشتگوێخستووە. مێلیشای ئەمەل لەنێوان ١٥٠٠-٣٠٠٠ چەکدار دەبوو، لە لایەن عەرەفات و جونبلاتەوە پشتیوانیان لێدەکرا. لە دەستپێکی دا، لە ١٩٧٦ بزووتنەوەی نیشتمانیی لوبنانی و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی

---

[270] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for IranianHistory

[271] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

فەڵەستینی شان بەشانی هاوپەیمانەکانی جڵەوی نزیکەی ٨٠٪ی خاکی لوبنانیان کەوتەبەردەست. ئەمەش زەبرێکی جەگبڕ بوو لە مارۆنیەکان درا.

بە تێپەڕینی کات، پەیوەندییەکانی سەدر لەگەڵ هاوپەیمانەکانی شلوێ دەبوو. لە کاتێکدا شیعە بە خەستی لە شەڕی ناوەخۆدا نەگلابوون، کەچی ئەوان قوربانییە سەرەکییەکەی شەڕەکە بوون. لەناوچەرگەی شەڕەکەدا، باشوور بووە مەکۆی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی، هەر بۆیە زۆر شیعە لە شەڕەکە دا زیاتر لە ئەندامانی کۆمەڵگە لوبنانییەکانی دیکەدا لەناوچوون و کوژران. بە کۆتایی هاتنی قۆناغی یەکەمی شەڕەکە، باشوور بە تەواوی کەوتە بن جڵەوی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی. **بۆ خوێ بە بریندا کردن، چەندین جەنگاوەری ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی ڕێزی خەڵکی شیعەیان نەدەگرت، سووکایەتیان پێدەکردن، بە شێوازێکی نامەدەنییانە لەگەڵیان دەجوولانەوە، خەڵکەکەیان لە (فەتحستان) هەراسان دەکرد و لاقەی کچانی شیعەیان دەکرد.**[٢٧٢] وێڕای دەربڕینی هاوسۆزی بەردەوام لە لایەن سەدرەوە بۆ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازیی فەلەستینی، کەچی تا دەهات ئارامی لە بەرانبەر ڕێکخراوی فەتح پەلاماری ناوبەناوی ئیسرائیل بۆ باشووور لە دەست دەدا. لە کۆتاییدا سەدر لۆمەی فەڵەستینییەکانی کرد لەسەر ئەوەی بەهۆی پەلکێشانی پەلامارەکانی ئیسرائیل لە تۆڵەدا بۆ شیعە هەر مایەی کوێرەوەری وماڵوێرانییە لە هەرێمەکەدا. لەسەرووی هەمووشیانەوە، سەدر وردە وردە هاوکاریی هێزە چەکدارەکانی عەرەفاتی لەگەڵ کەمال جونبلاتی سەرکردەی دروزەکان بە مەترسییەک بۆ سەر کۆمەڵگای شیعە دەبینی، ئاخر بزووتنەوەی نیشتمانیی لوبنانی لەگەڵ ئەمەل لەسەر هێنانەڕیزی ئەندامی شیعە لە کێبڕکێدا بوو.

---

[٢٧٢] فەتحستان ئاماژەیە بۆ ئەو بەشەی باشووری لوبنان کە دوابەدوای ئەیلوولی ڕەشی ١٩٧٠ بارگە و بنەی جەنگاوەرانی فەڵەستینی بوو.

هەروەهــا ئەو لەســـــەر ئەوەش ڕەخنەی لە ڕێکخراوی ڕزگــاریخوازی فەڵەستینی گرت، کە دەوڵەتێکی لەنێو دەوڵەتی لوبناندا دامەزراندووە.[٢٧٣]

هەر لەو بەرڕەوتەدا بوو سـەدر هەڵوێسـتی ئەمەلی لە شـەڕەکەدا گۆڕی و بووە لایەنگری مـارۆنییەکـان. ئەمەل بە فەرمی لە ئـایاری ١٩٧٦دا کـاتێک ســوریا هاتە نێو لوبنان تا پشــتی میلیشـیای مارۆنی لە دژی بزووتنەوەی نیشـتمانیی لوبنانی و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەسـتیندا بگرێ، ئەمەلیش دەسـتبەرداری بزووتنەوەی نیشـتمانیی لوبنانی بوو. بە هاتنی سـاڵی ١٩٧٦ بەیەکـدادانی کەم کەم لەنێوان میلیشـــیـاکـانی ڕێکخراوی ڕزگـاریخوازی فەڵەستینی و ئەمەل زیادی کرد تا وای لێهات سەدر فشار بخاتە سەر حافز ئەســـەد، بەڵکو هی ســـوپای ســـوری لە لوبنان بخاتەگەڕ. لەو نێوەشـــدا مـارۆنییەکـان لەســـەر لێواری شـــکســـتدا بوون، بەتـایبەتیش لە پاش کوشــتـارگەی دامور، کە قەنـاعەتی بە فەرەنجییە هێنـا، هـانـا ببـاتە بەر دەستوەردانی سوریا. لە کۆتاییشدا حافز ئەسەد لە ١ی حوزەیرانی ١٩٧٦دا سوپاکەی تاودا تا ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی بهێنێتە ژێر ڕکیفی ســوریاوە. ئەوەبوو هێزەکانی ســووریا، بەیروت و شــارە ســەرەکییەکانی دیکەی لوبنـانی گرت و بەئاســـانی بزووتنەوەی نیشـــتمانیی لوبنـانی و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی بەرکەنار کرد. ئاگربەستەکەش زۆری نەخایاند، چونکە کەتائیبەکان بە پشـــتیوانی ســـوریاوە لە ئابی ١٩٧٦دا توانییان هێڵی بەرگری بەرانبەریان ببڕن و دەســـت بەســـەر ئۆردوگای پەنـابەرانی تەل ئەلزەعتەر لە ڕۆژهەڵاتی لوبنـانـدا بگرن و نزیکەی ٢٠٠٠ فەلەستینی بکوژن. کارەساتی تەلزەعتەر هانی عەرەبەکانی دا دژی مارۆنی

[٢٧٣] ڕێککەوتنی قاهیرەی ٣ی نۆڤێمبەری ١٩٦٩ ڕێگەی بە فەڵەسـتینیەکان دابوو لە باشـووری لوبنـانەوە ئۆپەراســـیۆنەکـانی خۆیـان لە دژی ئیســـرائیلـدا بکەن. ئەوەی ڕاســـتی بێ، ڕێککەوتننامەکە دۆخێک لە ئۆتۆنۆمی لەباشـووری لوبنان دابووە ڕێکخراوە فەڵەسـتینییەکە، بەوەی ڕێگەی دابوون لە دەرەوەی سەروەری لوبنانیدا کاری خۆیان بکەن.

و سوری و سەدر بوەستنەوە. سوورییەکان بەلایەنگیری کریستیانەکان و بەعس، هێز و دەسەلاتی هێماداری سەدریان لە لوبنان لەقاند.

## بەتەنیا مانەوەی سەید

هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ ئەگەر هەموو دەستکەوتەکانی سەدری ڕەش نەکردبنەوە، ئەوا لە ساڵەکانی ڕابردوودا زۆربەیانی کوێرکردنەوە. بۆ کۆمەڵگەی شیعە، شەڕەکە گرژییەکانی لەگەڵ هەریەک لە مارۆنی، دروز، سوننەی لوبنانی و فەڵەستینییەکان تیرترکرد. تاکە دەستکەوتی سەدر شکانەوەبوو بەلای حافز ئەسەد دا. هەر بەڕاستیش، دوای دەستوەردانی سوریا لە شەڕەکە و ڕاگرتنی، دەستڕۆیشتنی سەدر لە سووریا پەرەیسەند.[274] لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بە نۆکەرێکی سوورییەکان لەقەڵەم درا و هەر بۆیە بە درێژایی هاوینی ١٩٧٦ بووە ئامانجی سەرەکی چەندین هەوڵی کوشتن و لەناوبردن.[275] لە هەمان کاتیشدا، مارۆنییە ڕادیکالەکان ڕەخنەیان لە سەدر و ئەمەل گرت، بەوەی لە سەرەتای خولی یەکەمی شەڕی ناوخۆدا بەلای ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینیدا شکاندبوویەوە.[276] نەیارە شیعییە سەرەکییەکانی ئەو بە کامیل ئەلئەسعەدیشەوە سەدریان بە بلاوکەرەوەی چەپایەتی و مارکسیزم لە ڕێی میلیشیاکانی لەنێو شیعەدا تۆمەتبارکرد.[277] مایەی سەرنجڕاکێشانیش بوو، زۆرینەی شۆڕشگێڕە ئێرانییەکان ڕەخنەیان لە هەڵوێستی دژە ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی گرت. لەناو جەرگەی شەڕەکەشدا، فیداییە مارکسییەکان بە توندی سەرزەنشتی سەدریان کرد، ئاخر ئەوان

---

[274] SAVAK Documents, No. 213/425, 10 August 1977.

[275] Theroux, Peter. The Strange Disappearance of Imam Moussa Sadr (London,1987). p. 41.

[276] SAVAK Documents, No. 213/161, 14 June 1977.

[277] SAVAK Documents, No. 213/445, 20 August 1977.

پشتگیری ئەبو عەباسی دژە سوری[٢٧٨]، دەسەڵاتی ئەنجوومەنەکان (سلطات المجالس) و ڕێکخراوی کردەی کۆمۆنیستی. فیداییەکانیش دژی حزبی شیوعی لوبنانی بوون، چونکە پەیوەندی بە حزبی تودەی ئێرانی،[٢٧٩] سۆڤیەت، سوریا و لوبنانەوە هەیە.

سەدر هەستی کرد لە هاوپەیمانێکی بەهێز دابڕاوە، ئەوەبوو دەستی بەرەو ئێران درێژ کرد. لە ناوەڕاستی شەڕەکەدا، داوای لە باڵوێزخانەی ئێران کرد پشتی شیعە بگرن، هەرچەندە ئاگای لە کەسایەتی دوژمنکارانەی مەنسور قەدەریش هەبوو. لە دانیشتنێک لەگەڵ ئەفسەرێکی باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروت،[٢٨٠] سەدر دڵسۆزی خۆی بۆ ئێران دووپات کردەوە و مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو کە "ناچاربووە" خۆی بە بێلایەن لە بەرانبەر سیاسەتی ئێران نیشان بدا، چونکە ناسری و چەپەکان ئێرانیان بە دوژمنی عەرەب وێناکردبوو؛ هەربۆیە ئەو نەیدەتوانی ڕاستەوخۆ پشتی ئێران بگرێ. سەدر ئەوەی گوت کەوا هەرگیز دژی شا نەبووە، هەروەها گفتوگۆشی لەگەڵ بەختیاردا هیچ پەیوەندی بە کردەنیازێکی پیلانگێڕی نەبووە لە دژی ڕژێمی تاران. لەسەر هەمان هێڵدا، ئەوەشی گوت گوایە پەیوەندییەکانی لەگەڵ گەنجی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی لە ئەورووپا ڕەوابووە بەو هۆکارەی ئەو نەیوەستوە "ئەوان بکەونە داوی کۆمۆنیستەکان و ئیدی ئەو لە بەرانبەردا داوای لێکردوون بگەڕێنەوە بۆ لای ئیسلام." هەروەها ئەو ڕوونیشیکردەوە کە ئەو لەمیانەی ئاژاوە و ڕاوەدونانی ١٩٦٣دا، لێدوانی لە دژی شادا داوە "بۆ ئەوەی پێگەی خۆی لەنێو بیچمە دیندارەکانی ئێراندا بپارێزێ." سەدر ئاماژەی بەوەش دا، ئەو کەمە دوانە ڕادیکالییانەی

---

[٢٧٨] ئەبو عەباس لەناو جەرگەی شەڕی ناوخودا لە گرووپەکەی جبریل جیابووەوە.

[٢٧٩] فیداییەکان پەیوەندییەکی گرژییان لەگەڵ حزبی تودە، حزبە سەرەکییە مارکسییەکەی ئێران هەبوو. ئەوان تودەیان بەوە شەرمەزار و سەرزەنشت دەکرد کەوا پەیوەندییەکی ئەفسەر-ئاژانی بە مۆسکووە هەیە.

[280] SAVAK Documents, No. 213/94, 28 April 1975.

لە دژی سیاسەتی ئێران لەبەر فەڵەستین و بەعسی و کۆمۆنیستەکان بووە، ئاخر ئەوان هەر هەموویان بە بەکرێگیراوێکی ئێران خەتاباریيان کردبوو. ئەو ئەوەشی باسکرد، کە خۆتێهەڵقورتانی لە شەڕە خوێناوییەکی ناوخۆ لوبنانی لەوە ڕزگارکرد بکەوێتە دۆخێکی کێفەڕاتبار. سەدر بۆ جاری داهاتوو بەڵێنی شا بە کۆمەکی دارایی بۆ شیعە هێنایە گۆڕێ، کە لە دوا گەشتەکەی ئێراندا بەڵێنی پێدرابوو. ئەو گوتی کەوا دوای هەڵبژاردنەوەی بە سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە، هانای بۆ ئێران بردووەتەوە بەڵکو بۆ کۆمەکی شیعەی لوبنان بکەن. لەوەش سەرنجڕاکێشتر، ئەو داوای لە کاربەدەستە ئێرانییەکە کرد بەڵکو لە سیاسەتی هاوسەنگییە ناسکەکەی ئەو لە لوبنان تێبگا و سەرنجیشی وەها دا، "لێم ڕەچاومەکە وەک ئاژانێکی ئێرانی بجوولێمەوە". لە کۆتاییشدا، ئەو گوتی "دەکرێ سەرکردایەتی شیعە بە ئاراستەی بەرژەوەندییەکانی ئێران و کارئاسانی سیاسەتە هەرێمیەکانی بکا" ئەمەش تا ئەو ڕادەیەی لە توانایدا هەیە و ئینجا داواکەی خۆی لە ئێران بۆ پاڵپشتی شیعە دووبارە کردەوە. "بە پێچەوانەی خەڵکی دیکە، من هیچم بۆ خۆم ناوێ. تاکە شت کە داخوازم پێشخستنی شیعەیە."[281] سەدر لێبڕاوبوو لەسەر زیندووکردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران. کەچی داواکەی بەهەند هەڵنەگیرا. ساواک بارەگای سەرەکی ئەوی لە صور بە لانەیەکی سەرەکی بڵاوکردنەوەی لێدوانی شۆڕشگێڕان و جاڕنامەی دژە شا دانا.[282]

خولی دووەمی شەڕی ناوخۆ لە نیسانی ١٩٧٦ بە دەستلەپشتدانی سادات بۆ گرووپە فەڵەستینییەکان و چەپەکان لە دژی سوپای سوریا هەڵگیرسایەوە. لە کۆتاییدا شەڕەکە لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٦دا وەستا، ئەمەش لەو کاتەدا بوو کە دیمەشق بە پێشنیازێکی کۆمکاری عەرەبی لە کۆبونەوەی لووتکەی لە ڕیاز قایل بوو. سەدریش دوای گەشتەکەی بۆ

---

[281] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[282] SAVAK Documents, No. 213/60, 25 April 1976.

کوەیت و عەرەبستانی سعودیدا، چاوی بە مەنسور قەدەر کەوت و ڕاپۆرتی خۆی لەبارەی گفتوگۆ سەرکەوتووەکانی بۆ ڕاگرتنی شەڕەکە لە لوبنان دا. هەروەها سەدر داوای لە قەدەر کرد بەڵکو دانیشتنێکی لەگەڵ شادا بۆ ڕێک بخا تا قەناعەت بە پاشـــای پەهلەوی بهێنێ، بەڵکو نێوەندگیری لەنێوان ئەسەد و سادات لە عەرەبستانی سعودیدا بکا.[٢٨٣] قەدەریش "پێگەی ناوازەی سەدری لە هەریەک لە لوبنان و سوریا" پشتڕاستکردەوە؛ هەرچەندە ئەو مشتومڕی لەسەر ئەوە کرد کە پەیوەندییەکانی ئەم دواییەی سەدر لەگەڵ باڵوێزخانەی ئێران پەیوەست بوو بە سەرکردەکانی سوریا کە "کاریگەریی جەنابی خاوەنشـــکۆیان لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا " بینیوە.[٢٨٤] قەدەر بە ڕەتکردنەوەی داخوازییەکانی سەدر، دەستپێشخەری پلانێکی نهێنی خۆی خستەگەڕ: گۆڕینی سەدر بە پیاوێکی بەڵێگۆ.

## شیرازی دژی سەدر

مەنسور قەدەر هەر لە سەرەتای حەفتاکانەوە بەدوای ئەوەدا گەڕاوە سەدر لە پێگەی سەرکردایەتیکردنی شیعە بخا. ئەو وەهای گوت گوایە؛

***سەدر پیاوێکی مجێزبەرز بوو، نیازی وابوو خۆی بۆ سەرۆکی لوبنان هەڵبژێرێ! جارێکیان پەیامێکی بۆ ناردم تا بۆ شای بنێرم بەوەی شیعە لە زۆرینەیەکی دیموگرافی لوبنانن دان و پێویستە کاریگەرانەترین لەسەر هەڵبژاردنێکی ئازاد دا. کاتێکیش من پەیامەکەی ئەوم بە ڕاپۆرتێک نارد، شا وەڵامیدایەوە، 'پێدەچێ سەید [موسا سەدر] نەخشەی بۆ ئەوە دانابێ ببێتە سەرۆکی لوبنان.' ئینجا شا ئەوەشی خستەسەر، 'ئەرێ خۆ هیچ گرفتێک***

283 SAVAK Documents, No. 223/998, 12 October 1976.

284 SAVAK Documents, No. 213/595, 29 August 1976.

***نییە ئەگەر ئێرانییەک لەوێ ببێتە سەرۆک! کاتێکیش پەیامەکەی شام بە سەدر ڕاگەیاندەوە، دڵی پێخۆش بوو.*** [٢٨٥]

مایەی تەوسە، هەندێ لە شۆڕشگێڕەکانی سەر بە خومەینیش هەمان ڕوانیان هەبوو. هەر بۆ نموونە، موحتەشەمپوور وەها لێدوانی دا؛ "هەموو خەمی سەید موسا ئەوەیە ببێتە سەرۆک، خۆی ئەوە مستەفا چەمران بوو بە سەرجەم کارەکان ڕادەبوو."[٢٨٦] لە ڕاستیشدا سەدر سەرکردەیەکی کاریزمایی و سەربەخۆ بوو، ئەو کەسە بوو کە "هەر لەبەر خۆی بەو پایە دەسەڵاتەی گەیشتبوو نەوەک بە پشتگیری شا."[٢٨٧] قەدەریش ڕێگەی بە هەڵکەوتنی سەرکردەیەکی بەهێز نەدەدا.

لە ١٠ی نۆڤێمبەری ١٩٧٦دا، داڤید کیمخی جێگری بەڕێوەبەری مۆساد چاوی بە بەڕێوبەری گشتیی ساواک ژەنەڕاڵ ناسری کەوت و پێیگوت: "**من شتێکم بۆ ئێوە پێیە: موسا سەدر تەواو بوو... بۆ ئێوە دەرفەتێکی باشە.**"[٢٨٨] دە ڕۆژ دواتر، ناسری فەرمانی دەرکرد بەدوای جێگرەوەیەک بۆ سەدر بگەڕێن. لە سەرەتاشەوە قەدەر، جەعفەر شەرەفەددینی وەک جێگرەوە دەستنیشان کردبوو.[٢٨٩] ئەگەری بەربژێری دیکە ئایەتوڵڵا محەمەد تەقی قومی بوو، بەگوێرەی ڕای قەدەر، پاشخانەکەی ئەو کەسە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی شیعە-سوننە لە لوبناندا دەهاتەوە.[٢٩٠] تەنانەت ڕاسپاردەی ساواک خۆیشی ئەوەبوو کە هەر جێگرەکەی سەدر، واتە شێخ محەمەد مەهدی شەمسەدین جێگەی بگرێتەوە و بۆ ڕابەرایەتی شیعە

---

285 Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

286 Interview with Ali-Akbar Mohtashamipour, Tehran, February 2016.

287 Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

288 SAVAK Documents, No number, no date.

289 SAVAK Documents, No. 212/17025, 5 April 1971; SAVAK Documents, No. 212/14278, 9 March 1971.

290 SAVAK Documents, No. 213/550, 6 February 1974.

پشـــتگیری دەكەن.[291] لەگەڵ ئەوەشـــدا هیچ كامێک لەوانە وەک ســـەدر كاریزاما نەبوون تا ڕابەرایەتی كۆمەڵگەی شـــیعە بكەن. ئیدی لەبەر ئەو بەرڕەوتەدا ئاخوندێكی میلیشـیایی شـیعە لەسـەر تەختی شـانۆ پەیدا بوو، هەرزووش بووە بەربژێری سـاواک بۆ جێگرتنەوەی سـەدر، ئەویش سـەید حەسەن شیرازی بوو.

سـەید حەسـەن شـیرازی، لە ماڵباتێكی دینداری ئێرانی-عێراقی لەدایكبوو و پەروەردەكرابوو، ئەو بیچمێكی ســـەرەكی شـــیرازییەكان بوو.[292] لەگەڵ ســـەرهەڵدانی عەبدولكەریم قاســـم و حزبی شـــیوعی عیراقی لە كۆتایی پەنجاكاندا، ئەو بە پێكهێنانی ڕێكخراوێكی شـیعە بە ناوی لاوانی حوسـینی (الشباب الحسيني) هەڵمەتێكی دژەكۆمۆنیستی ڕاگەیاند. لە عێراق و لەگەڵ دامەزراندنی یەكەمین ڕژێمی بەعسـیش، عێراقی بەرەو لوبنان بەجێهێشـت، لێ كاتێ عەبدولســـەلام حزبی بەعســـی ڕاماڵی، ئەو هەر زوو گەڕایەوە كەربەلا. **لەو نێوەشـــدا ئایەتوڵلا خومەینی لە ئۆكتۆبەری ١٩٦٥دا شـــاری بورســـای لە توركیا بەجێهێشـــت و ڕووی كردە نەجەف.** هەر زووش شـیرازی پەیوەندییەكی دۆسـتانەی لەگەڵ خومەینیدا و موسـتەفای كوڕە گەورەكەی پەیـداكرد. بە پێچەوانەی ئەو لێبوردنە بەشـــەكییەی عـارف هەیبوو، لێ ڕژێمی بەعسی دووەم دەرحەق بە شیرازییەكان لێبوردە نەبوو. لە ئایاری ١٩٦٩دا دوانێكی جۆشـــدەرانەی شـــیرازی بووە مایەی ئەوەی ئاســـایشـــی عێراقی ماخۆی دواندەر بگرێ و ئەشـــكەنجەشـــی بدا. دوای ئازادكردنیشـی لە زیندانی بەعسـدا، مسـتەفا خومەینی پێشـنیازی بۆ كرد

---

[291] SAVAK Documents, No. 222/1182, 19 October 1977.

[292] باوكی سەید حەسەن شیرازی ئایەتوڵلا سەید مەهدی حوسەینی شیرازی بوو، براكانیشی ئایەتوڵلا سەید محەمەد شیرازی، ئایەتوڵلا سـەید موجتەبا شیرازی و ئایەتوڵلا سـەید سـادق شیرازی بوون. ئەندامەكانی دیكەی شیرازییەكان گەورەئایەتوڵلا میرزا حەسـەن شیرازی سـەركردەی جووڵانەوەی توتنی ئێرانی بوو؛ گەورە ئایەتوڵلا محەمەد تەقی شیرازیش سەركردەی هەرای عێراقی ١٩٢٠ بوو.

عێراق بەجێبێڵێ و ڕووبکاتە ســـوریا و لوبنان.[٢٩٣] شـــیرازی لە ١٩٧٠دا لە کەربەلا باری کرد و چووە لوبنان، لەوێ خەریکی کۆکردنەوەی لایەنگران بوو، چەندین دەزگاشـــی دامەزراندن.[٢٩٤] لە هاوینی ١٩٧٤یشـــدا لوبنانی بەجێهێشـــت و لە دیمەشـــق گیرســـایەوە،[٢٩٥] **لەوێش لە ١٩٧٤دا و لە نزیک دیمەشـــقدا حەوزەی زەینەبەی دامەزراند.[٢٩٦] پەرەســـەندنی دەســـەلاتی شیرازی لە سوریا قەناعەتی بە حافز ئەسەد هێنا، بەڵکو وەک کارتێکی لە دژی هەم عێراق و هەم ســـەدریش بەکاربهێنێ ئەگەر هاتو ناپاکی لێبکا.** ســـەر بە دیمەشـــق بوون دەکرا بۆ شـــیرازی پاڵپشـــتێکی بەهێز بێ لە هەرێمەکەدا. ئیدی لەو بەرڕەوتەدا بوو کە شـیرازی ڕایەڵەی پەیوەندییەکی باشـی لەگەڵ کۆمەڵگەی عەلەوییەکان ڕاچاند و هەر ئەو ڕێڕەوەی گرتەبەر کە ســـەدر پێشـــتر عەلەوییەکانی وەک شـــیعەی دوازدە ئیمامی پەســـەند کردبوو. ئیدی هەر زوو شیرازی بووە پاڵەوانی کۆمەڵگەی عەلەوییەکان لە ســـوریا و لوبنان. شـــیرازی پێشـــتریش، لە ١٧ی دیســـامبەری ١٩٧٢دا بەجەختکردنەوە ئەوەی پشـتڕاسـتکردبووەوە کە بیروباوەڕی عەلەوییەکان لەگەڵ براکانیان لە شـــیعەی دوازدە ئیمامیدا یەکدەگریتەوە، گوتبووی "دوو وشە، عەلەوی و شیعە هەمان واتایان هەیە. ئەمەش واتای ئەوەیە کە شیعە

[293] Tabatabaie, Fatemeh, Eqlim-e Khaterat [Region of Memories] (Emam Khomeini va Enghelab-e Eslami research Institute, Tanzim va Nashr-e Aasar-e Emam Khomeini Organization, 2001) Vol I. p. 298.

[٢٩٤] شـــیرازی لە ١٩٧١دا حەوزەی عیلمی دامەزراند، حەوزەی عیلمی و قوتابخانەی ئیمام مەهدی دامەزراند، عەوزەی عیلمیش ئەو شـــوێنەیە کە مەلای شـــیعەی تێدا ڕادەهێنرێ. ئەوەش یەکەمین حەوزە لە لوبنان لەســـەر دەســـتی غەیرە لوبنانییەک دابمەزرێنرێ. قوتابخانەکەش دوای لەناوبردنی شـــیرزای داخرا. پاشـــان خانەی چاپ و بلاوکردنەوەی ئەلسادق و جەماعەت و عولەما ئەللوبنانییە لە ١٩٧٧ دامەزرا.

[295] SAVAK Documents, No. 4875-4874, 17 August 1974.

[٢٩٦] حەوزەی زەینەبەی لە نزیک مزگەوتی ســـەیدە زەینەبە دامەزراند. ئەمەش یەکەمین گۆڕستانی شیعە بوو لەنێو سوریایەکی زۆرینە سوننە.

عەلەوین و عەلەویش شیعەن.[٢٩٧] **پشتڕاستکرنەوەی مەحکەمانەی سەدر و پاشـان شـیرازیش بەوەی عەلەوی-شـیعە برای یەکن، ڕەوایەتییەکی دینی دایە ڕژێمی ئەسەد لە سوریا.**

لە سـەرەتاوە پێدەچوو پەیوەندییەکانی سـەدر- شـیرازی لەگەڵ یەکدا باش بێ.[٢٩٨] کەچی بە تێپەڕینی ڕۆژ پەیوەندییەکانیان بەرەو هەرەسـهێنان شـۆڕ بووەوە. مجێزبەرزیی شـــیرازی بەوەی ڕۆڵێکی لێبڕاوانەتر لە خۆرهەلاتی شـام وازی بکا، پێ بەپێی ئەوە هەسـتی دژە سـەدری لەنێو سـەرکردەکانی شـیعە تەشـەنەی سـەند، ئەمەش وایکرد گرژی نێوان سـەید موسـا و سـەید حەســەن زیاتر ببێ. هەر زووش شـیرازی پشـتگیریی مارۆنی، سـوننە و زوعەمای شـــیعەی بەدەســـتهێنا.[٢٩٩] ئەو بە نهێنیش لە لایەن ســـەرۆک

[297] The pamphlet Al-Alawiyyun, Shi'at ahl al-Bayt (Beirut: 17 December 1972), preface.

[298] Tabatabaie, Fatemeh, Eqlim-e Khaterat [Region of Memories] Vol I. (Emam Khomeini va Enghelab-e Eslami research Institute, Tanzim va Nashr-e Aasar-e Emam Khomeini Organization, 2011) p. 315.

[٢٩٩] شـیرازی پشـتیوانییەکی چری هەریەک لەمانەی خوارەوەی پەیداکرد: پەتریارکی مارۆنی خوریش پەیداکرد (ئەنتۆنی پیتەر خوریش ٧٥ین پەتریارکی مارۆنی ئەنتونی و تەواوی ڕۆژهەلاتی شـــام و ئوردن و لوبنان بوو لە نێوان ســـاڵەکانی ١٩٧٥ تا ١٩٨٦)، بەشـــیر جمەیلیش یەکێ لە ســـەرکردە سـەرەکییەکانی شـەری ناوخۆ بوو. ئەو فەرماندەی هەرە بالای میلیشـیای هێزی لوبنانی بوو پاشـان بە ســـەرۆک هەڵبژێردرا و لە ١٤ی ئەیلوولی ١٩٨٢شــــدا کوژرا، ئەمین جمەیل (ئەمین جمەیل فەرماندەی حزبی کەتائیبین بوو سەرۆکی لوبنان بوو، لە دوای لەناوبردنی براکەی لە ١٩٨٢-١٩٨٨ سـەرۆک بوو) و کەمیل شـمعون، لە شیعەکانیش کازم ئەلخەلیل، کامیل ئەلئەسـعەد، شـیریل ئەلقەیس و موحسـین سـالم، سـیاسـی شـیعە وج ئەندامی پەرلەمان) و لە سـوننەش شێخ حەسەن خالید بوون. بڕوانە:

Beirut 9830 to Ministry of Foreign Affairs, 25 July 1977; Beirut 213/30 to Tehran, from 213 to 231, 22 January 1978; Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai [Socio-political Diaries] (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) vol. 1, p. 377.

سەرکیس ناعوم بۆ دژایەتیکردنی سەدر پشتیوانی لێدەکرا.[300] مارۆنییەکان پشتی شیرازییان گرت تا سەدر لە ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە وەدەر بنێن، ئاخر "ئەوان لە ڕۆڵی سەدر لە شەڕی ناوەخۆدا تووڕەبوون."[301] ئەمەش بارودۆخێکی گونجاو بوو بۆ ئەوەی چاوتێبڕینی شیرازی لە نێو لوبناندا نمایشێکی شکۆدارانە بەدەست بهێنێ. "شیرازی چاوی بە بەشیر جمەیل کەوت بەڵێنی یەکێتی و یەکپارچەیی خاکی لوبنانی پێدا... ئامانجی ئەو دانیشتنانە بەهێزکردنی شیرازی بوو لە دژی سەدر، ئەو کەسەی لەو دواییانەدا لە لایەن گرووپە مارۆنییە کریستیانە دەستەڕاستەکەیەوە بێزرا بوو."[302] لایەنداریێتی شیرازی لەگەڵ مارۆنی و سوننە و دەستەبژێری شیعە بووە هەڕەشەیەک بۆ سەدر. کاتێکیش نازناوی "ئیمام" لە لایەن حکومەتی لوبنانییەوە[303] درایە شیرازی، ئیدی کەلێنی شیرازە پچڕانی سەدر و شیرازی هی ئەوە نەبوو پڕبکرێتەوە.[304] چەمرانیش ڕەخنەی لە شیرازی گرت بەوەی "دەستەیەک لە سوننەی موسڵمان تووڕەمان دەکەن و سووکایەتی بە شەهیدەکانمان دەکەن. ئەوان بڕوایان بە شەهیدەکانمان نییە ئاخر مەرجەعەکەی ئەوان [شیرازی] ڕێگەی شەڕکردنی نەداوە."[305] لەنێو ئەو کەشوهەوا پڕ لە مقۆمقۆیەی لوبناندا، کۆدەنگییەک لەنێو دەستەبژێری شیعە لەسەر پێویستی ئاڵنگاریکردنی سەدر هەبوو.

---

[300] Beirut to Tehran, SAVAK document, 14 April 1977.

[301] Beirut to Tehran, No. 226, SAVAK document, 14 April 1977; Iran's Ministry of Foreign Affairs to SAVAK, 213–334.

[302] Beirut 213/147, SAVAK documents, 20 April 1977.

[303] خۆی وەها دانرابوو کە نازناوی "ئیمام" بۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعەبێ.

[304] Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai, Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388, vol. 1, p. 377.

[305] Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai, Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388, vol. 1, p. 378.

لە ١٦ی نیسانی ١٩٧٧دا، پەیوەندییەکانی سەدر و شیرازی لەو کاتەدا تێکچوو کاتێک شەڕێکی خوێناوی لە لایەن پشتیوانانی هەردوولا لە مزگەوتی سەیدە زەینەب قەوما.[٣٠٦] ئیدی هەرزوو ڕژێمی سووری چالاکییەکانی شیرازی سنووردار کرد و لە کۆتاییشدا ناچاری کرد سووریا بەرەو لوبنان جێبهێڵێ. تەنانەت ئایەتوڵڵا خومەینیش، کە زۆر جارا خۆی بە دوور دەگرت هەڵوێستێکی ڕوون لەبارەی لەیەکترازان و دابەشبوونی ناوەخۆ لەنێوان ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی و شیعەدا، کەچی ئەمجارەیان سەرزەنشتی تراژیدیای مزگەوتی سەیدە زەینەبی کرد. خومەینی بە پێچەوانەی زۆرینەی لایەنگرانی خۆی،[٣٠٧] کە "پێشتر لەلایەن شێخ نەسروڵڵا خاڵخاڵی، دۆستە نزیکەکی سەدر قەناعەتی پێهێنرابوو،"[٣٠٨] لایەنی سەدری گرت و "لە هاوینی ١٩٧٧دا فتوای حەڕامکردنی پێدانی پشکی ئیمام (سەهم

---

[306] Beirut 146-145 to SAVAK, 17 April 1977.

[٣٠٧] پەیوەندییەکانی خومەینی-سەید حەسەن شیرازی ئەوەندە بەرفرەوان بوو تا جارێکیان ئەردەشیر زاهیدی، وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران گوتی "خومەینی شۆڕشێکی لە قوم بەرپاکردووە، بەڵام خۆ ئەوە شیرازی بووە لە کەربەلاوە پەیامەکەی لێ وەرگرتووە تا بەگوێی دونیایدا بدا" (al-Osbou al-Arabi, 2 July 1979, no 1029, p. 28). هەروەها شیرازی هەوڵیدا قەناعەت بە خومەینی بهێنێ بەڵکو عێراق بەرەو سوریا جێبهێڵێ. هەرچەندە خومەینی پرسی هانابردن وەک پەنابەرێک بۆ دیمەشقی لەحسابیی خۆی دانابوو، لێ لەدواییدا و لە ٦ی ئۆکتۆبەری ١٩٧٨دا نەجەفی بەجێهێشت و ڕووی لە پاریس کرد.

[٣٠٨] ئایەتوڵڵا نەسروڵڵا سدقی حەسەنی کە بە خاڵخاڵی ناسرا بوو، یاریدەرەدێکی نزیکی خومەینی بوو، ئەو کەسەی کۆمەکی دارایی هێزی سەر بەخومەینی دەکرد. ئەو بەچەند مانگێک بەر لە شۆڕشی ئیسلامە لە ٤ی ئازاری ١٩٧٨دا مرد.

الامام)ی[٣٠٩] بۆ شیرازی و زەینەبە دەرکرد.[٣١٠] لە سایەی ئەو بارودۆخەدا، ساواک دۆخی ناکۆکبوونی ئەو دوو ڕابەرە شیعەی وەها قۆستەوە کە بەهۆیەوە پێگەی سەدر لە لوبنان و سووریادا بنکۆڵ بکا.[٣١١] ساواک لە سەرەتاوە ڕوانینێکی باشی لەبارەی شیرازییەوە نەبوو. بۆ ساواک، شیرازی "پیاوێکی سەرچڵی بێمتمانە بوو، کەسێک بوو پشتی ناپاکییەکەی خومەینی گرتبوو. ئەو کەسێک بوو دەستە و قاتمێکی سەرچڵی لە سووریا لە مزگەوتی سەیدە زەینەب لەخۆکۆکردبووەوە. شیرازی تۆمارێکی خراپی هەیە و پشتیوانیکردنیشی بە زیانی بەرژەوەندییەکانی ئێران تەواو دەبێ."[٣١٢] هەرچۆنێک بێ وەرچەرخانی تیژی سیاسەتی دەرەکی نادەوڵەتیانەی ئێران لە لوبنان پرسی گۆڕین و جێگرتنەوەی سەدری خێراتر کرد. هەرچەندە لەو کاتەدا پێگەی سەدر قایم بوو کریستیانەکانیش پشتیان دەگرت. کەچی قەدەر پێگەی سەدری لە دوای ڕۆژگاری شەڕی ناوخۆ وەها وێناکرد؛ "ئێستا هەموو هێز و بەرەکان ئەو بە ناپاک و بووکەڵەی بێگانان دەبینن."[٣١٣] وێرای کورتهێنی لە متمانەدا، کەچی باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروت سەرگەرمی ڕۆنانی پەیوەندییەکی دۆستانەبوو لەگەڵ شیرازی بۆ ئەوەی سەدر لە لوبناندا ڕابماڵێ. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش، مەنسور قەدەر نەخشەیەکی ئامادە کرد بەوەی پشتگیری دامەزراندنی "ڕێکخراوێکی گەنجان بکا فێریان بکا و پێیانبگەیەنێ

[٣٠٩] بەگوێرەی فەرموودەکان، پشکەکان هی خودا و پێغەمبەر و ذی القربی (خزمە نزیکەکانی پێغەمبەر) هی ڕابەری کۆمەڵگەی ئیسلامی (پێغەمبەر یان ئیمام)ن. ئەم پشکانە پێیاندەگوترا پشکی ئیمام (سهم الامام). مەرجەعی شیعەش لە جیاتی ئیمام ئەو پشکانەی لە دیارنەمانی ئیمامی مەهدی وەردەگرت و بەو شێوەش خەرجیان دەکرد کە پێشتر ئیمام خەرجی دەکرد، هەر وەک چۆن لەحەدیسدا باسی کراوە. بڕوانە: http://en.wikishia.net/view/Khums

[310] SAVAK 497, Syria to Tehran, 17 September 1977.

[311] SAVAK Documents, No. 213/191, 9 January 1977.

[312] Beirut 213/147, SAVAK documents, 20 April 1977.

[313] Beirut 213/191 to Iran's Ministry of Foreign Affairs. 18 April 1977.

بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی شـــیعە نەکەوێتە بـاوەشـــی کۆمۆنیزمەوە."[314] بۆ قەناعەتپێهێنانی کاربەدەستانی ئێرانی، پلانەکە لە قاڵبی بەشێک لە خواستی داواکراوی هێزی کریســـتیانی لە لوبنان داڕێژرابوو. بەگوێرەی قســـەی مەنسـور قەدەر، "ئەوان لە ئێران پاڕاونەتەوە بۆ ئەوەی پشـتی ڕێکخراوەکە بگرن، ئاخر سەرکردەی شیعە [هەنوکەییەکە] [سەدر] بەهۆی لەخشتەبردن و گەندەڵی و چەپگەرایی، پێگەی خۆی لەدەســـتداوە."[315] مەنســـور قەدەر دوای دانوســـتان لەگەڵ ســـەرکردە گەنجەکانی شـــیعە وەک عیزەدین و موحســـن ســـالم، فارســـی ئەوەی خســـتنەســـەر ســـەدر لە ســـەرۆکایەتی ئەنجوومەنی باڵای ئیســـلامی شـیعە لابدەن و شـیرازی جێگەی بگرێتەوە. قەدەر وەک هەنگاوێکی داهاتوو پێشـــنیازی کرد کە بەشـــیر جمەیل و موحسین سالم قەناعەت بە ڤاتیکان و پاتریارک خوریشی نوێنەری ڤاتیکان لە بەیروت بهێنن تا لادانی ســـەدر پەســـەند بکەن. ئەو باڵوێزە ماکیاڤیللیە ئەوەشی خستنە بەردەم، کە شیرازی ڕەگەزنامەی لوبنانی پێبدرێ بەوەی گوایە شـــیعەیەکی نیشـــتەجێی شـــارێکی کریســـتیاننشـــینە لە هەرێمی کیســـرەوان."[316] شـــیرازی ڕەگەزنامەی لوبنانی دەســـتکەوت. هەر زووش کردەوەکە لە لایەن پاتریارک ئەنتۆنی پیتەر خوریش و ســەرۆک ســەرکیس ناعومەوە پەســـەند کرا. بۆ هەنگاوی داهاتوو قەدەر چاوی بە شـــیرازی کەوت تا لەبارەی "ئەرکەکانی ئایندەوە" دانوســتانی لەگەڵدا بکا. شـیرازیش لە بەرانبەردا دڵســـۆزیی خۆی بۆ ئێران دەربڕی و ڕایگەیـانـد "ئەو لە ڕابردوودا نۆکەری شـــا بووە و تا مردنیش پێیەوە شـــانازە." هەروەها ئەوەشـــی بۆ زیادکرد کە "بەچەشـنی ســەدر بێمتمانە و بەدنمەک نابێ."[317] ئێدی لیســتێک لە "شـیعە گەنجە خوێندەوارەکان دەرچووەکان بەبێ ئەوەی سەرکردەی گەندەڵ و سۆشیالیست-دیماگۆگی [نموونەی سەدر]ی تێدابێ،

---

[314] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[315] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[316] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[317] Beirut 213/191 to Iran's Ministry of Foreign Affairs. 18 April 1977.

بە سەرپەرشتی موحسین سالم ڕاگەیەنرا کە لیستەکە بە دەستلەپشتدانی قەدەر، بە شـــێوەیەکی بەربلاو لە ڕۆژنامە لوبنانیەکانیش بلاوکرایەوە."[٢١٨] کردەوەکە وەها بڕیاربوو "پڕوپاگەندەیەکی چڕوپڕی لە بەرژەوەندی سـەید حەسـەن شـیرازیی لە [دۆلی] بیقاع و بەعلبەگی بۆ جاربدرێ تا دەسـەلاتی نێو ئەنجوومەنی بـالای ئیســـلامی شـــیعە ڕێکبخرێتەوە و ســـەدریش ســـەرۆکایەتییەکەی لەدەســت بدا. قەدەر لە ڕاپۆرتێکدا دڵنیای کردبووە کە، "سەرکردە سیاسی و دینییە دژە سەدرییەکان پێدەچێ پشتیوانی پلانەکەی بکەن. دوای ئەوەی شـــیرازیش بە ســـەرۆکی نوێی ئەنجوومەنی بـالای ئیسلامی شیعە دیاریدەکرێ، ئیدی هاوپەیمانێکی نادیاری شیعە-کریستیان دێتەئـاراوە... بۆ ئەوەی ڕێگە لە چەپـایەتی لەنێو شـــیعەدا بگرێ."[٢١٩] بۆ یەکەمین جـار کـاربەدەســـتە ئێرانییەکـان هێڵیـان بە ژێر هەڕەشـــەی کۆمۆنیســـتیدا هێنا بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بە کاروچالاکییەکانیان بدەن. لە کۆتاییشـــدا ڕاپۆرتەکە خرایە بەردەم شـــا. هەرچۆنێک بێ شـــای پەهلەوی پەســـەندی نەکرد و گوتی؛ "لە واقیعدا کەس نـاتوانێ متمـانە بەو خەڵکە [ئاخوندە شـیعەکان] بکا."[٢٢٠] ناسـری بە کردەوە قایل بوو بەڵام میانڕەوانە گوتی؛ "بە ڕوانینی من، هیچ کام لەو کەسـانە [شـیرازی و سـەدر] جێگەی متمانە نین و ئێمە نە ئێســتا و نە دوارۆژیشـــدا دەتوانین بڕوایان پێبکەین. تۆماری [ســیاســییانەی] شـیرازی لە هی ســەدر باشــتر نییە؛ هەرچەندە دەکرێ شـــتێکی مەزن بێ کە ئەوان کێبڕکێی یەک بکەن و یەکدی لاواز بکەن."[٢٢١] خۆی ڕێکخراوەکەی پاڵپشت بە قەدەر، ڕێکخراوی ئیسلامی شیعە دامەزرابوو؛ کەچی کەســـایەتی کاریزمایی ســـەدر هی ئەوە نەبوو جارێ دەستی لێ بدرێ. تا مانگی ئایاری ١٩٧٧ کردەوەکەی قەدەر شـکسـتی هێنا

---

[٢١٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٢١٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٢٢٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٢٢١] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

و شیرازی و قەدەر نەیانتوانی بەرەیەکی کاریگەر لە دژی سەدر ڕاستەڕێ بکەن.[322]

لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا شیرازی پەیوەندییەکانی لەگەڵ هێزەکانی دژەسەدر لە لوبنان بە تایبەتیش لەگەڵ مارۆنییەکان بە پارێزراوی هێشتەوە.[323] هێشتاش باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروت لەگەڵ ئەودا گەمەی لەدژی سەدردا دەکرد. شیرازی لە دانیشتنێکدا لەگەڵ قەدەردا ئەوەی گوت؛ "هەردوولایان، کریستیانەکان و دەستەبژێری سیاسی و دینی شیعە لە لوبنان زۆر بە پشتیوانی سەدر بۆ گرووپە چەپگەرا و فەڵەستینییەکان لە شەڕی ناوخۆ، بە سووربوونی دەستی سەدر بە خوێنی شیعەی بێ تاوان و بە دروستکردنی ئەمەل ناقایلن". ئەو بە قەدەری ڕاگەیاند کە بەربژێرکردنی ئەو بە پاڵپشتی ئەو دەستەبژێرەیە بۆ ئەوەی ببێتە "ڕابەری دینیی شیعە لە لوبنان"، هەروەک چۆن "سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە"ش وەربگرێ." لە کۆتایی دانیشتنەکەدا، "شیرازی ڕێزی قووڵی خۆی بۆ شا دەربڕی" و گوتی، "خزمەتکردنی شا، خزمەتکردنی ڕابەرەکەی جیهانی شیعە شتێکی پێویستە و شانازیشە بۆ هەموو شیعەیەک."[324] شیرازی لە دانیشتنێکی دیکەیدا لەگەڵ قەدەر ئەوی پشتڕاستکردبووە کە "سەد لیرەی لوبنانی بۆ هەڵمەتی دژەسەدر تەرخان کردووە." دیسان دڵسۆزی خۆی بۆ شا دووپاتکردبووە، جەختی لەوە کردبووەوە کە "ئەو لە ڕابردوو و ئێستاشدا خزمەتکاری شابووە و ڕوانینی ئەو [دەرهەق بە شا] لە هی باوک و برایەکانی جیاوازە." خۆیشی بەوە پەسن دابوو "کاتێک لە زیندانی بەعسیاندا سووکایەتی پێکرا و ئەشکەنجە درا و ڕیشیان تاشی، ڕەتیکردبووەوە هیچ قسەیەک لە ڕادیۆی بەغدا لە دژی ئێران و شادا بکا."

---

[322] Beirut 213/30, SAVAK Documents, 1 May 1977.

[323] Beirut 213/33 to Tehran, SAVAK Documents, from 713 to 213, 31 January 1978.

[324] Beirut 9830 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 25 July 1977.

شیرازی بەتوندی گرژیی ڕابردووی لەگەڵ تاران ڕەتکردبووەوە و گوتبووی؛ "ئەو کاتەی ماڵە باوانی جێهێشت کە خومەینیان بۆ ماڵیان بانگهێشت کردبوو، ئیدی لەوکاتەوە نەگەڕاوەتەوە [ئەمە بۆ دەربڕینی نارەزایەتیەکەی بوو]. هیوای خواست ئەو لەبەر چالاکی باوک و براکانی خەتای لێنەگیرێ و پەیوەندیشی بە خومەینییەوە نەماوە." لە کۆتاییشدا لە سەر ڕێگە تایبەتییەکەی خۆی مکوڕ بوو بەوەی "ئەو شای وەک ڕابەری جیهانی شیعە بینیوە و هەرگیزیش لەو ڕێبازە لاینەداوە."[٣٢٥] قەدەر بەو ملکەچبوونەی شیرازی کەیفخۆش بوو، هەوڵیشی دا قەناعەت بە ساواک و تاران بهێنێ تا پشتی شیرازی بگرن. "هەرچەندە حەسەن شیرازی بەقەد سەدر دواندەر و زیرەک نەبوو"[٣٢٦]، کەچی ئەو بەهرەمەند، پیاوێکی گەنجی چالاک، گەر هاتباو ئێران[٣٢٧] و کریستیانەکان و بیچمە دژەسەدرییەکان پشتیان بگرتبا، ئەوا دەیتوانی [ سیاسەت و مەیلی] ئێران بۆ خۆی ڕاکێشێ.[٣٢٨] قەدەریش سوور بوو لەسەر ئەوەی "دەکرێ وەها بینا بکەین کە شیرازی ئەو توانستەی هەیە ببێتە جێگرەوەی سەدر... ئەو بۆ پشتگیریکردن هاتووەتە باڵوێزخانەی ئێرانی لە بەیروت."[٣٢٩] قەدەر، شیرازی بە "دۆستی باڵوێزخانەی ئێران" لەقەڵەم دا[٣٣٠] و زمانی جەنگی شەڕی ساردیشی بۆ قەناعەتپێهێنانی تاران بەکارهێنا، بەوەی پاشخانێکی دژە کۆمۆنیستانەی هەیە، ئەو وەهای دەگوت گوایە "پلانی شیرازی بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوێک بۆ ئالنگاربوونی سەدرە. ئەو چاوی بە چەندین

---

325 Beirut 471 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 10 September 1977.

326 Beirut 213/33 to Tehran, SAVAK documents, from 713 to 213, 31 January 1978.

327 SAVAK documents, 223/1479, 10 December 1977

328 Beirut 213/33 to Tehran, SAVAK documents, from 713 to 213, 31 January 1978.

329 ran's Ministry of Foreign Affairs 3334-8 to Setad Bozorg Arteshtaran, edare etelaat va zed-e etelaat, from 213 to 713.

330 25 February 1978. SAVAK Documents, No.213/869, 7 March 1978.

ســـەرکردەی لوبنانی کەوتووە. هەروەها شـــیرازی ئەوەی گوتووە، کە ئەو دژی کۆمۆنیزم دەجەنگێ و هەنوکەش مەیلی بۆ ئێران و شا هەیە."[331]

شـــــیرازیش لە بەرانبەردا زانیاری لەبارەی پەیوەندییەکانی ســـــەدر بە شـۆڕشـگێڕە ئێرانییەکان دایە مەنسـور قەدەر. ئەو بە قەدەری ڕاگەیاند کە "**چەندین گەنجی ئێرانی پەیوەندییان بە ســـــەدرەوە کردووە، ئەو گەنجانەی پێشـــتر لەلایەن مەلا لادەرەکان لەبن ناوی موجتەهید ڕەوانەی دیمەشـــق کراون، لەوێشـەوە سـەید ئەحمەد واحیدی ڕەوانەی لای چەمرانی کردوون تا لە بنکەکانی ئەمل و لەژێر سەرپەرشتی ئەفسەرەکانی ڕێکخراوی فەتحی فەڵەستینییەوە مەشقیان پێبکرێ."[332] لە ڕاپۆرتێکی دیکەدا، شیرازی ئەوەی بە قەدەر ڕاگەیاندبوو، کە گرووپێک لە گەنجانی ئێرانی پەیوەســـــت بە فیداییەکان لەســـەر دەســـتی گرووپی جۆرج حەبەش لە بنکەکانی ئەمەلەوە ڕاهێنانیان پێکراوە.**[333] ســەرباری ئەم هاوکارییانەش، کەچی قەدەر نەیتوانی کارێکی وەها بکا شیرازی جێگەی سەدر بگرێتەوە. هەر بەڕاستیش نمایشی شـــکۆدارانەی ســـــەدر لەنێو کۆمەڵگەی شـــیعە و لوبنان و هەرێمەکەدا بەربەســـــتێکی گەورەبوو لەبەردەم نەخشـــــەی قەدەر. لە ســـــەرووی هەمووشـــــیانەوە، گۆڕانی دڵی ســـــیاســـەتی ئێران دەرهەق بە لوبنان و پاشـەکشـەی لە ڕۆڵی کاریگەرانە لە لوبنان بوو. ئیدی لەو بەرڕەوتەدا بوو، کە نە قەدەر و نە شـــــیرازی نەیانتوانی جێ بە ســـــەدر شـــــلۆق بکەن و دەرییەڕێنن. تەنانەت دوای نەمانی سـۆراغی سـەدریش، شیرازی نەیتوانی جێگەی ئەو پڕبکاتەوە.. "لەپاش ســـۆراغنەمانی ســـــەدر و وێڕای گرژیی لەگەڵیدا، شـــــیرازی چالاکیەکانی چڕکردنەوە. لە ڕێی بەشـــــداریکردنی لە ئاهەنگ و بۆنە جیاوازەکاندا دەرفەتێکی لەباری بۆ جێگرتنەوەی ســـــەدر

---

[331] Beirut 213/30 to Tehran, SAVAK Documents, from 213 to 231, 22 January 1978.

[332] SAVAK Documents, No. 213/869, 25 February 1978.

[333] SAVAK Documents, No. 213/869, 7 March 1978.

خولقاند. ئەو لێدوانی وەهای دا کە جیهانی شیعە سەرکردەی هەرە مەزن و بێوێنەی لەدەست داون.[٣٣٤]

ئەوەبوو لە ١ی ئایاری ١٩٨٠دا و تەنیا ساڵێک لەپاش سۆراغنەمانی سەدر، لە لایەن بەکرێگیراوێکی عێراقییەوە لە بەیروت تەقە لە شیرازی کرا و کوژرا.[٣٣٥] دیاربوو لوبنان بۆ ئاخوندە شیعە ئێرانییەکان شوێنێکی نەفرەتلێکراو بوو.

## دوابڕیار

قەدەر تا سەرەتای ساڵی ١٩٧٧ بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە توانی سەدر وەک هەڕەشەیەک بۆ سەر ئاسایشی نیشتمانیی ئێران وێنا بکا. هەرچەندە شەڕی ناوخۆیی لوبنان وێنە و نمایشی ئەوی لەنێو فەلەستینییەکان لاواز کردبوو، کەچی ساواک هێشتا سەرزەنشتی سەدری بەوە دەکرد، گوایە پەیوەندی بە ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینییەوە هەیە.[٣٣٦] بە هەرەسهێنانی نەخشەی قەدەر بۆ گۆڕینی سەدر بە شیرازی، ئیدی ساواک و قەدەر گەیشتە ئەو ئەنجامە سەدر بە کەسێکی دژە شیعە وێنا بکەن. ئامانجی سەرەکیش لایەنە دینییەکەی ئێران، بەتایبەتیش مەرجەعی شیعە بوو. بە هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆیی لوبنان، چەندین مەلای ئێرانی کۆمەکی دارایی لە لایەن ئایەتوڵلا شەریعەتمەدارییەوە بۆ شیعەی لوبنان برد. لە ٥ی ئازاری ١٩٧٦دا، ئەوان چوونە لوبنان تا قوربانییەکانی شیعە و داواکانیان هەڵبسەنگێنن.[٣٣٧] کەچی بە مکوڕبوونی قەدەر و ساواک و

---

[334] Seyyed Ahmad Vahedi 213/7 to SAVAK, 16 September 1978.

[٣٣٥] پێدەچوو سەددام حوسێن بڕیاری لەناوبردنی شیرازی دابێ. بڕوانە:
Khalid Abdul-Ghaffar's, Saddam's personal aide, interview with Islamic Revolution Newspaper.

[336] SAVAK Documents, No. 849, 25 August 1977.

[٣٣٧] لەنێو شاندەکەدا هەریەک لە شێخ موجتەبا عەراقی، شێخ ڕەزا گولسورخی و سەید یونس ئەراقی هەبوون.

وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران فشار خرایە سەر شەریعەتمەداری تا شاندەکەی بگەڕێنێتەوە.[338] هەر کەمێک دوای ئەوە، کاتێک گرووپێک لە ماڵە شـــیعەکانی لوبنان گەیشـــتنە ئێران بۆ ئەوەی پارە بۆ شـــیعەی لوبنان کۆبکەنەوە، ئەوەبوو قەدەر لەبارەی "دووڕوویی"ی ســـەدر هۆشـــداری دایە خەلعەتبەریی وەزیری کاروباری دەرەوە و هانیدا تا ڕێ لە چالاکییەکانیان بگرێ.[339]

بۆ مایەی سەرسامی، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران بە ئاراستەیەکی دیکەدا ڕۆیشـــت و فەرمانی بە هەموو باڵوێزخانەکانی دا "تا ســـیاســـەتێکی وەها بگرنە بەر، بەڵکو ســـەدر بۆ لای خۆیان ڕاکێشـــن، بەتایبەتیش دوای ئەوەی بە ســـەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای ئیســـلامی شیعە هەڵبژێردرایەوە."[340] پێشتر شاپوور بەهرامی، باڵوێزی ئێران لە قاهیرە پشتی سەدری گرتبوو. سەدر لە گەشتەکەی بۆ قاهیرە بەهرامی لە دڵسۆزیی خۆی بۆ ئێران و بۆ شـــا دڵنیاکردبووەوە، ئەوەش بە نووســـینی کۆمێنتێکی لە نامەیەکدا بەوەی پێگە دینییەکەی ئەو ڕێگە نادا پێشـــنیازەکەی قەدەر {ببێتە ئاژانێکی ئەو} پەســـەند بکا. بەهرامی نامەکەی ڕەوانەی تاران کردبوو، ئینجا هەر کەمێک دوای ئەوە، نەورۆز ڕازمارای ســـەرۆکی ویســـتگەی ســـاواک لە قاهیرە و کوڕی حاجی عەلی ڕازمارا ڕاپۆرتی خۆی دابوو، بەوەی دڵسۆزیی ســـەدر بۆ شـــا دەبێتە گەورەترین یارمەتی بۆ ئێران ئەگەر هاتوو ڕێگە بەســـەدر بدرێ بەبێ ســـنوور بجووڵێتەوە.[341] ئاخر هەر لەبەرابییەوە ســـیاســـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لەلایەن ســـاواکەوە هەڵدەســـووڕا، هەر بۆیە وەزارەتی کاروباری دەرەوە ڕەتیکردەوە سەدر وەک هەڕەشەیەک لەسەر ئاسایشی نیشتمانی لەقەڵەم بدا. نەراقیش وەها دوا:

---

[338] SAVAK Documents, No. 213/19707, 2 March 1976.

[339] SAVAK Documents, No. 99, 10 September 1976.

[340] SAVAK Documents, No. 2288/m/8, 14 May 1975.

[341] Samii, Abbas William, The Shah's Lebanon Policy: The Role of SAVAK. (January 1997). Middle Eastern Studies, 33 (1): 83.

***باڵوێزەکانی دیکەی ئێران بە شــــاپوور بەهرامی، فەرەیدون مواســــاغی، عەبـاس نـائیـدی و ئەحمەد عەلی بەهرامی داواکەی ســــەدەریـان پشــتراســتکردەوە [کە مەنســور قەدەری باڵوێز ڕۆڵێکی کلیلئاســایانەی لە گۆڕانی ســیاســەتی ئێران دەرهەق بە شــیعە بینیوە]. شــاپور بەهرامی نامەیەکی بۆ شــا ئامادەکردبوو... هەرچەندە شــا هەرگیز شــیکاری و پێشــنیازی باڵوێزەکانی دیکەی بەهەند هەڵنەدەگرت. بە پێچەوانەوە ئەو بەتەواوی لەبن کـاریگەری قەدەردا بوو. ئەردەشــیر زاهیـدی، وەزیری پێشــووی کـاروبـاری دەرەوەش 'کەســــایەتی بەدڕەفتـاری'ی قەدەری پشتڕاستکردەوە.***[٣٤٢]

**بەگوێرەی ڕاپۆرتێکی دیکە؛**

*شــیرازی ئەوەی گوت گوایە هێشــتا ســەدر کۆمەکی دارایی لە مەلا و بازرگانە ئێرانییەکان وەردەگرێ. بۆ بەدبەختیش، باڵوێزی ئێران لە دیمەشق [محەمەد پوورسەرتیپ] پشتی سەدر دەگرێ ... ئەو ئەمەشی خستەسەر گوایە ڕێرەوی ســەرەکی کۆمەکی دارایی ســەدر بە دیمەشــقدا دەڕوا، ئەوەشی گوت گوایە سەرجەم ئەو کێشانەی ڕووبەڕووی دەبنەوە لە لایەن باڵوێزی ئێران لە دیمەشق پشتیوانی لێدەکرێ. ئەوەشــی ســەربارکرد، کە هێشتا ژێربەژێر پەیوەندییان بەیەکەوە ماوە.*[٣٤٣]

هەر بەڕاستیش، ساواک و وەزارەتی کاروباری دەرەوە لەبارەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لوبنان ئاڵنگاری یەک بووبوونەوە.

بە هەڵکشــــانی ڕادەی ناکۆکی لەنێوان ســــاواک و وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا، شــــا خۆی لە بەرانبەر ئەو ئەرکەدا بینییەوە خۆیتێهەڵبقورتێنێ.

---

[342] Fars News Agency, Interview with Ehsan Naraghi, http:// www. farsnews. com/ newstext.php?nn=8711240772.

[343] Beirut 471 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 10 September 1977.

ئاخر ئەو ڕاپۆرتی لەیەکجیاوازی لەلایەن وەزارەتی کاروباری دەرەوە، مەنسور قەدەر، فەرەحدۆست و سەدر پێدەگەیشت، بۆیە شا نەیتوانی ستراتیژییەکی ڕوون لەگەڵ شیعەی لوبناندا پەیڕەو بکا. لە کۆتاییدا بە ڕێگەپێدانی شاوە، پەرویز سەباتی پیاوە هەرە دەسەڵاتدارەکەی ساواک و سەرۆکی هۆبەی سێیەم، "کۆمسیۆنێکی لەبارەی موسا سەدر" پێکهێنا بۆ ئەوەی دوا بڕیارەی لەبارەی سەدرەوە بدا، ئاخر بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی سەدر، ئەوا قەدەر پێویستی بە پشتیوانی تەواوی ساواک هەبوو، دەنا نەیدەتوانی لە دژی سەدر بجەنگێ".[344] کۆمسیۆنەکەش لە توخمگەلی هەریەک لە ساواک و وەزارەتی کاروباری دەرەوە بە مەنوچەهر زەلی [باڵوێزی پێشوو لە لوبنان]. عەباس خەلعەتبەریی وەزیری پێشووی کاروباری دەرەوە، حامید ناسری [یەکەمین سەرۆکی وێستگەی ساواک لە بەیروت] و پەرویز سەباتی، بۆ ئەوەی دوابڕیار لەبارەی سەدرەوە بدەن. بەو مشتومڕەی کەوا پرسەکە پەیوەندی بە ئاسایشیی نەتەوەییەوە هەیە لەبری ئەوەی سیاسەتی دەرەکی، ئەوەبوو ناسری، کە ڕوانینەکەی لەبارەی لوبنانەوە لە لایەن شاوە بەهەند هەڵدەگیرا، بۆیە پرسەکە ڕووبەڕووی سەباتی کرایەوە. لەو وەرچەرخانە مێژووییەدا کۆمسیۆنەکە بڕیاریدا دەبێ سەدر کار لەگەڵ قەدەردا بکا. بڕیارەکەش وەک پەسەندکردنی ئامانجە درێژخایەنەکەی قەدەر بوو بەوەی سەدر وەک ئاژانێکی ئەو لە لوبنان بجووڵێ، ئەمەش کۆتایی قۆناغی پەیوەندییەکانی ئێران بوو بە شیعەی لوبنان.

---

[344] SAVAK Documents, 334/2205, 7 November 1977.

**سەدری ڕادیکال**

**عەلی شـەریعەتی ڕۆشـنبیرە ئێرانییە هەرە دەسـتڕۆیشـتووەکە و بیرمەندی شۆڕشی ئیسلامی لە حوزەیرانی ١٩٧٧دا، لە لەندەن مرد.[٣٤٥] لەسەر داوای ڕاستەوخۆی موسا سەدر، حافز ئەسەد ڕێگەی دا شۆڕشگێڕە ئێرانییەکان لە مەزارگەی سەیدە زەینەب بەخاک بسپێردرێن.** سەدر لە ٢٦ی حوزەیرانی ١٩٧٧دا لە پێشـەنگی ڕێوڕەسـمی بەخاکسـپاردنی عەلی شـەریعەتی بوو. ڕێوڕەسـمی بەخاکسـپاردنی شـەریعەتی بووە کۆبوونەوەیەکی سـیاسـی شـۆڕشـگێڕە ئێرانییەکان.[٣٤٦] هەرچەندە ڕێوڕەسـمەکە بە ئاشـتییانە بەبێ دوانی ئاگرین لە دژی تاران بەڕێوەچوو، کەچی لە لایەن تارانەوە ڕەخنە لە ڕۆڵی کلیل ئاسـایانەی سـەدر بۆ ڕێکخسـتنی ڕێوڕەسـمەکە گیرا.[٣٤٧] کاربەدەسـتانی سـاواک دیسـان پلانی لادانی سـەدر و جێگرتنەوەی بە شیرازییان هێنایەوە گۆڕێ.

*سەید حەسەن شیرازی، ئەو کەسەی بۆ چەندین ساڵ بوو مزگەوتی سەیدە زەینەبی هەڵدەسووڕاند، بەهۆی پەیوەندی بەهێزی سەدر-ئەسەد ناچارکرا سـوریا بەجێبێڵێ. مەزارگەی مزگەوتی سـەیدە زەینەب ئێسـتا بووەتە مەڵبەندی چەندین باند [ی دژەئێرانی] بەتایبەتیش [محەمەد] مونتەزری و تاقمەکەی. شتێکی گەورەش دەبێ ئەگەر هاتوو بە شێوەیەک لە شێوەکان*

---

[٣٤٥] هەر بەڕاسـتیش عەلی شـەریعەتی فرانز فانونی ئێرانی بوو، کە ڕادیکالانە شـیعەگەریتی ڕاڤەکرد.

[٣٤٦] سـەید موسـا سـەدر، ئیبراهیم یەزدی، مستەفا چەمران، سـەید مەحمود دوعائی، سـادق قوتبزادە، سـادق تەباتەبائی، محەمەد موفەتیح (نوێنەری ڕێکخراوی فەتح) و ئیحسـان شەریعەتی (کوڕەکەی عەلی شەریعەتی) لە ڕێوڕەسمەکەدا بەشداربوون.
SAVAK Documents, No. 12h20/ 22817, 8 July 1977.

[٣٤٧] مایەی سـەرنجڕاکێشـان بوو، هەندێ لە شـۆڕشـگێڕانی خومەینیپەروەر وەک ئیشـراقی ڕەخنەیان لە ڕۆڵی سەدر هەبوو. بڕوانە:
Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai, Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388, vol. 1, p. 141.

*هێز بدرێتەوە بەر شیرازی و بە رێگەیەک لە رێگەکان بگەرێتەوە مزگەوتی سەیدە زەینەب و شوێنەکە لە چالاکی مونتەزری پاکبکرێتەوە.*[٣٤٨]

هەرچۆنێک بێ نەکرا پلانی جێگرتنەوەکە ببووژێنرێتەوە.

چلەی شـــەریعەتی لە قوتابخانەی عاملی رێکخرا بۆ کۆبوونەوەیەکی دژە شـــا وەرچەرخـا. وێرای بەیەکـدادانی تـازەش لەنێوان رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەســتینی و ئەمەل، کەچی یاســر عەرەفات بەشــداری رێورەسمی چلەکەی کرد و راشکاوانە بانگەوازی "**فەتح ئەمەلە و ئەمەلیش فەتحە، هەڵدا؛ خۆ ئەگەر ئەمەل پشــتی فەتح نەگرێ ئەوا شــتێک نامێنێ بە ناوی فەتح.**"[٣٤٩] لەپاڵ ئەمەشــدا هەریەک لە ســادق قوتبزادە و مســتەفا چەمران پەسـنی دەسـتکەوتەکانی عەلی شـەریعەتیان دا و پەلاریشـیان لە تاران گرت. لەکاتێکدا ســەدر نەرمڕەوانە رەخنەی لە تاران گرت، کەچی مەنسور قەدەر دەمودەست راپۆرتێکی ئامادەکرد، تێیدا نووسیبووی گوایە ســەدر پێشــەنگی "دوانی ئاگریناوییە لەدژی خاونشــکۆ" لە رێورەســمی چلەکەدا دا.[٣٥٠] بە پێچەوانەشـەوە سـەدر هەوڵیدا گرژییەکان خاوبکاتەوە. لە ١٨ی ئابی ١٩٧٧دا نامەیەکی بۆ پوورسـەرتیپی باڵوێز نارد،[٣٥١] تێیدا هاتبوو؛ "لەو کاتەی مەنســور قەدەر [وەک باڵوێزیی ئێران] لە لوبنان دانراوە، ئەو هەر مـایەی نـانەوەی کێشــە بووە، لە دژی من کرێگرتە و مـارۆنی بەکارهێناون. راپۆرتی لەبارەی من دەســتکاری کردوون و شــێواندوونی

[348] SAVAK Documents, No Number.

[349] Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai [Social Diaries] (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) vol. 1, p. 112.

[350] Beirut 213/447, SAVAK Documents, 20 August 1977.

[٣٥١] مەنســور قەدەر پەیوەندییەکی باشــی لەگەڵ پوورســەرتیپدا نەبوو. قەدەر وەهای گوت گوایە: "لە کاتێکدا باڵوێزی ئێران پوورسەرتیپ بوو، کەچی ئەوە من بووم سەروکارم لەگەڵ پرسی ئاسایش و پەیوەندی کەسی و تایبەت لەگەڵ ئەسەد و دیمەشقدا هەبوو." بڕوانە: Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

چونکە کێشـــەی کەســـەکی لەگەڵ منـدا هەیە. کەواتە من هیچ بژاردەم لەبەردەستدا نییە تەنیا دابەزین نەبێ بۆ سەری، بەتەنیا بۆ سەر ئەو و هیچ کەســی دیکە نا. خۆیشـــی ئەوە دەزانی کە لەوە زیاتر بەرگەی ئەو دۆخە ناگرم." بەم جۆرە ســەدر بە تاڵییەکەوە سـکاڵا لەدەسـت قەدەرەوە دەکا.[٣٥٢] لەگەڵ ئەوەشـــدا داوا جـدییەکەی ســـەدر بەر گوێی کەرە کەوت. بە پێچەوانەوە، کاتێک ڕاپۆرتەکەی قەدەر گەیشـــتە تاران، **ئیدی شـــا لە ٢٧ی ئابی ١٩٧٧دا فەرمانی بە لێســـتاندنەوەی ڕەگەزنامەی ئێرانی لە ســـەدر دەرکرد.**[٣٥٣] ئەمەش دوا بزمـار بوو لە دارەبازی ســـیاســـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لوبناندا درا.

قەدەر بە متمانەی کوێرانە بە بڕیارەکەی ساواک قەناعەتی بە ناسـری کرد تا لە ڕۆژنامەکانی ئێرانی داببەزنە ســـەر ســـەدر. ئیدی ئەوان ڕاپۆرتی دژەســـەدر، بەڵگەنامە و وتاری دژەســـەدریان بڵاوکردەوە، هێڵیان بەژێر "خاڵە لاوازەکانی" ئەودا داهێنا، وەک دەستوەردانی ڕاستەوخۆی کاتی خۆی تەیمور بەختیار بە ناردنی ســـەدر بۆ لوبنان لە جیاتی عەبدولحوســـێن شـــەرەفەددین، هەڵوێســـتی مارکســییانەی ئەو، پەیوەندییەکانی لەگەڵ هێزە ئیسلامی-مارکسییەکانی وەک شوێنکەوتوانی عەلی شـەریعەتی، لایەنگیریی چەپەکان لە لوبنان، مشـتومڕکردن لەسـەر بەشـداریکردنی شـیعە لە شـەڕە خوێناویەکەی ناوخۆی لوبنان، بەدڕەفتاری لەگەڵ ئەو کۆمەکە داراییەی لە ئێرانەوە پێیدەگەیشـت و تەرخانکردنی پارەکە بۆ دروسـتکردنی میلیشـیای ئەمەلی کۆمۆنیســـتی بە ســـەرکردایەتی مســـتەفا چەمران و دامەزراندنی مەکۆیەک لە پاریس بەسەرپەرشتی قوتبزادە، کێشانی تلیاک، هاوکاریکردنی

[352] SAVAK Documents, No. 213/16427, 28 September 1977.

[353] SAVAK Documents, No. 8/3610-320-2, 28 August 1977. لێســـتاندنەوەی ڕەگەزنامە و هەڵپەســـاردنی پاســـپۆرت ڕێگەیەکی باوی ســـاواک بوو بۆ جووڵانەوە لەگەڵ نەیارە ئێرانییەکانیـان. بۆ زیـاتر تـاوتوێکردن بڕوانە: the interview with Hassan Alavikia by H. Ladjevardi for the Harvard Iranian Oral History Project (1 March 1983, Paris).

چەپە ڕادیکاڵە فەڵەســـتینییەکان کە بەدوای مارۆنییەکاندا دەگەڕان و لە کۆتاییشـــدا بەڕەوانی بەعەرەبیش نەدەدوا.[354] کاتێکیش مەلا دیندارەکان داوای نێوەندگیرییان کرد، تاران هیچ نەرمییەکی نەنواند. شـــا لە وەڵامی شێخ تالیبی ئوردنیشدا ئەوەی گوت کە "سیاسـەتەکانی سـەدر لە لوبناندا بوونە مایەی بەکوشــتدان و بریندارکردنی زۆر لە شــیعەکان."[355] لە ٢٧ی ئەیلوولی ١٩٧٧دا، شێخ عەبدولئەمیر وەبلان، جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە نامەیەکی بۆ شـا نارد و تێیدا داوای لێکردبوو: "باقی خەڵکە کەســـاس و داماوەکەی شـــیعە لە باشـــووری لوبنان لە دەســـت بۆمبابارانی ئیســـڕائیلی بپارێزە."[356] هەرچۆنێک بێ شـــا بەرسـقی دایەوە؛ "ئێســـتا ڕێچکەی شـیعە لە دژی ســـیاســـەتی ئێراندایە."[357] ئەمەش دوایین بڕیاری شا بوو.

ســـەدر کە لەناخەوە ڕەنجا بوو، بۆ بڕیارەکەی شـا سـەرکۆنەی مەنســـور قەدەری کرد. لە دیـدارێکیـدا لەگەڵ (الحوادث)دا هەموو گرژییەکی لەگەڵ ڕژێمی ئێراندا ڕەتکردەوە، لە بەرانبەردا ســـەرکۆنەی ســـاواک و قەدەری کرد، کە ڕایەڵەیەکی پەیوەندییان بۆ دژایەتی ئەو لە هەردوو لایەنی شـــیعە و غەیرە شـیعەدا دروسـت کردووە. سـەدر ئەوەی خسـتەبەرباس کە ئەم ڕایەڵەیە کێشـــەی بۆ ئەو ناوەتەوە بۆ ئەوەی پێگە و کاریگەری ئەو لەنێو شـــیعە و لوبنانییەکاندا لاواز بکەن.[358] مایەی ســـەرنجدان بوو، قەدەر ڕاپۆرتێکی جیاوازی بۆ تاران ناردبوو. ئەو وەهای گوتبوو گوایە سـەدر لە دیدارەکەیدا وەهـای باســـکردبوو کە "باڵوێزی ئێران لەلایەن هەندێ لە سیاسییە لوبنانییەکانەوە پشتیوانی لێکراوە، هەوڵیداوە سیاسییانە شیعە بە تاران ببەســـتێتەوە، کە من خۆم پێی قایل نەبووم ئاخر لەبەر بەرژەوەندی نیشـــتمانی و دینی دژی ئەو کارە بووم... شـــیعە موســـڵمانن و هەر

354 SAVAK Documents, No. 213/466, 10 September 1977.
355 SAVAK Documents, No. 5318, p. 6.
356 SAVAK Documents, No. 1168, 28 September 1977.
357 SAVAK Documents, No. 8/320-2/4750-8/320, 10 October 1977.
358 SAVAK Documents, No. 473, 1 September 1977.

پەیوەندییەکیش لەگەڵ دەوڵەتێکی ناعەرەب [وەک ئێران] ئەوا هەڵەیە و دژواریشە."[359] قەدەر هێشتا هەر سەرسەختانە بوو لە وێناکردنی سەدر بەوەی دوژمنی شایە لە لوبنان و سوریا و ئوردندا.

لەو نێوەدا قەدەر هەوڵیدا سەدر و مەلا ئێرانییەکان بکاتە گژی یەکدی. پێشتریش مەرجەعی شیعە کۆمەکی دارایی سەدریان کردبوو. بەگوێرەی ساواک، ئایەتوڵلا میرزا ئەحمەد ئاشتیانی بڕی 1.7 ملیۆن لیرەی لوبنانی بەخشیبووە سەدر. هەروەها ساواک ڕاپۆرتی دابوو، وێڕای پێگە لاوازەکەی ئێستای سەدر لە لوبنان، کەچی ئایەتوڵلاکانی لوبنان بڕی ٢٧١ ملیۆن لیرەیان دابووە سەدر.[360] شا فەرمانی دابووە ساواک بەدوای ئەو کەسانەدا بگەڕێ کە پشتی سەدریان گرتبوو. پەروێز ساباتی لیستێکی لە ئایەتوڵلا لایەنگرەکانی سەدر ئامادەکردبوو.[361] نەخشەکەی قەدەر بنکۆلکردنی ئەو پەیوەندییانەبوون لە ڕێی ئەوەی سەدر بە سیاسییەکی دیماگۆکی وێنا بکا. ساباتی ئەوەشی بۆ ڕاپۆرتەکە زیاد کرد کە "ئێمە دەبێ لە نێو مەلا ئێرانییەکاندا سەدر وەک هۆکاری سەرەکی پاشەکشەی شیعە لە لوبنان دابنێین."[362] بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارەش، قەدەر پێشنیازی بۆ ساواک کرد بەوەی بانگهێشتی جەعفەر شەرەفەددین و هاوپەیمانەکانی بکرێن بۆ ئێران تا "دووڕوویی سەدر نیشان بدەن" و بۆ ئێرانییەکانی بسەلمێنن کە چۆن سەدر پارەوپولی ئێرانییەکانی بە دابینکردنی چەکوچۆڵ بۆ ئەمەل بەفیڕۆ

---

[359] SAVAK Documents, No. (p. 307), 5 November 1977.

[360] SAVAK Documents, No. (46).

[361] لەنێویاندا ئایەتوڵلا محەمەد باقر ئاشتیانی، ئایەتوڵلا سەید ڕەزا شیرازی، ئایەتوڵلا عەبدولکەریم موسەوی ئەردەبیلی، ئایەتوڵلا سەید مورتەزا ئەسغەری، ئایەتوڵلا شێخ یەحیا نوری، ئایەتوڵلا سەید ڕەزا سەدر (براگەورەی سەید موسا)، ئایەتوڵلا سەید عەبدول غەفار سەجادی و ئایەتوڵلا سەید مورتەزا موستەجابی.

[362] SAVAK Documents, No. 134/3283, 9 January 1977.

داوه.[٣٦٣] جمشـــید ئاموزگاری ســـەروەزیریش لەگەڵ پلانەکە هاوڕا بوو.[٣٦٤] دوای ئەوەی شەرەفەددین و یاوەرانی گەیشتنە تاران، گوتیان گوایە سەدر ئەو کۆمەکە داراییەی لە مەلا ئێرانییەکانی کۆکردۆتەوە بۆ ئامانجی شایستە بەکاری نەهێناوە.[٣٦٥] هەرچەندە کرۆکی پاڵنەری قەدەر-ســـاباتی ئەوەبوو ســەدر وەک ڕابەرێکی گەندەڵ وێنا بکەن، ئەو کەســەی گوایە ئەو پارەیەی لە ئێران دابینکراوە و لە لایەن گەورەئـاخونـدە ئێرانییەکـان کۆکراوەتەوە دزیویەتی، کەچی شـا پشـتگیری داوای کۆمەک و دارایی شــەرەفەددینی نەکرد.[٣٦٦] دووەمین گرووپی مەلا شـیعەکان بە سـەردەسـتەیی شـێخ عەلی فەقیهی بوو کە ســـەردانی ئێرانی کرد. ئەوانیش هەوڵیـانـدا ئـایەتوڵلا شـــەریعەتمەداری، [محەمەد ڕەزا] گولپایەگانی و خونســـاری لە ســـەدر دەهری بکەن. ئینجا تاران فەرمانی بۆ کۆمەڵەی شـێر و خورشـیدی سـوور کرد یارمەتی بریندارانی خەڵکی باشـووری لوبنان بدەن بەوەی لە ڕێی ئەو مەلایانەی دژە سـەدر کۆمەکی داراییان پێبکەن.[٣٦٧] پاشـان، شـێخ حوسـێن دابوق، ئەو مەلایەی دژی ســـەدر بوو،[٣٦٨] ڕەخنەی توندی لە ڕابەرایەتی سەدر گرت، بەوەش تاوانباری کرد گوایە بڕی ٦٠ ملیۆن لیرەی لوبنانی کە لە لایەن مەرجەعی شیعە بەخشراوەتە ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە، کەچی ئەو بەفیڕۆی داوە.[٣٦٩] ئەو ســـەدری بە "دیماگۆگ" ناوزەد کرد و

---

[363] SAVAK Documents, No. 1182, 30 September 1977.

[364] SAVAK Documents, No. m1-/600-1-20, 6 October 1977.

[٣٦٥] لەنێو ئەوانەدا شێخ یوسف ئەسعەد عەبدولسەتار (موفتی بەعلبەگ)، ئەحمەد شەوقیەدین (دادوەری بن ئەلجەبەل)، شـێخ یوسـف ئەسـعەد عەبدولسـەتار و محەمەد عەلی سـەید عەبدولشەهاب بوون. SAVAK Documents, No. 1274, 17 October 1977.

[366] SAVAK Documents, No. 213/16592, 26 November 1977.

[367] SAVAK Documents, No. 5250-3/5114, 12 December 1977.

[٣٦٨] ئەو پەیوەندی بە سـەید حەسـەن شـیرازی، جەعفەر شـەرەفەددین و کامل ئەلئەسـعەدەوە هەبوو و لە لایەن باڵوێزخانەی ئێران لە بەیروتەوە کۆمەک دەکرا،
SAVAK, 213/16665, 17 January 1978.

[369] Beirut 213/605, SAVAK Documents 16 January 1978.

ئەمەلیشی بە "تاقمێکی جەردە" لە لوبنان وێناکرد.[٣٧٠] سیاسەتی دژەسەدری مەنسور قەدەر لەسەر ئەوەش سوور بوو، کە چەند کتێبێک لە دژی سەدر لە ئێران چاپ و بڵاوبکاتەوە. ســـــاواک وەڵامی وتـاریکی ڕۆژنـامەی ڕســتاخیزی دایەوە کە لەبارەی ســەدرەوە بوو.[٣٧١] لە ســەرەتای ١٩٧٨دا، کتێبێک و نامیلکەیەک کە بەفارسی نووسـرابوو، بە شـێوەیەکی بەرفرەوان لەنێوان ئەو ئێرانیانەی لە بەیروت دەژیان بڵاوکرایەوە. لەو نووســـینانەدا ســــەدر وەک بەکرێگیراویکی "بیانی" و "هـاوکارێکی کریســـتیانییەکان" وێنـاکرابوو.[٣٧٢] بەو گوێرەی قســـەی ئیبراهیم یەزدی بێ، هەردوو نووســـینەکە، چ کتێبەکە و چ نامیلکەکە لە لایەن جەلالەدین فارســـییەوە نوســـرابوون.[٣٧٣] "دوژمنایەتی فارســـی بۆ ســـەدر ئەوەندە قووڵ بوو تا لە هەڵمەتی مەنســـور قەدەریش لەدژی ســـەدردا هاوکار بوو.[٣٧٤] ئیدی پارەی قەدەر و قەڵەمی فـارســـــی دژی ســــەدر یەکیـان گرتەوە."[٣٧٥] کتێبەکە و نامیلکەکە خرانە بەردەمی پاشـای پەهلەوی. ئەویش فەرمانی وەها دەرکرد؛ "دەبێ کتێبەکە و نـامیلکەکە لێرەش [لە ئێران] بڵاوبکرێنەوە."[٣٧٦] ئەمەش زەبرێک بوو لە وێنە و نمایشی سەدر درا.

هێشــــتـا لەوە بەدتریش بەڕێوە بوو. ئەوەبوو لە ١٤ی ئـازاری ١٩٧٨دا، ئیســـڕائیل هەڵمەتی لیتانی ســـەرێخســـت، بێجگە لە صـــور باقی بەشـــی خوارووی ڕوباری لیتانی گرت. لەگەڵ ئەوەشـــدا هێشـــتا ســـوپای بەرگری

---

[370] SAVAK Documents, No. 592, 5 December 1977.

[٣٧١] لە بنەڕەتدا وتارەکە لە گۆڤارێکی هەفتانەی فەرەنســـییدا بەناوی Le Nouvel Observateur بڵاوکرابووەوە، بڕوانە: SAVAK Documents, No. 213/895, 11 March 1978.

[372] SAVAK Documents, No. 8/270-2/316, 18 April 1978.

[373] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

[٣٧٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[375] Ministry of Foreign Affairs DB/5254 to SAVAK, 13 November 1977; SAVAK Documents, No. DB/5254, 13 December 1977.

[٣٧٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئیسـرائیلی نەیتوانی گردەبڕانە ڕێکخراوی ڕزگـاریخوازی فەڵەسـتینی تێکبشـکێنێ، ئاخر بەرەو باکوور کشـا و خۆی لە هەڵشـاخان بە ئیسـڕائیل بەدوورگرت. قوربانی سـەرەکی پەلاماردانەکەش مەدەنییە شیعەکان بوون. ئینجا دوای هەفتەیەک سـوپای بەرگری ئیسـڕائیلی قایلبوو لە باشـوور بکشـێتەوە. لەگەڵ ئەوەشـدا ئیسـڕائیل ناوچە داگیرکراوەکەی ڕادەسـتی هاوپەیمانە نوێیەکەی خۆی کرد کە ئەویش سـوپای باشـووری لوبنان بوو بە فەرماندەیی سەرگورد سەعد حەداد بوو. باقی وڵاتەکەش هێزی یونیفیل (UNIFIL)نەتەوە یەکگرتووەکـان لە لوبنـان بە شـێوەیەکی کـاتی خۆی لێدامەزراند. بەشـێک لەو هێزەی یونیفیلە لە سـەربازی ئێرانی پێکهاتبوو. لەکاتێکدا ئێران لەسـەر داوای سـەدر سـەربازی خۆی ڕەوانەی لوبنان نەکرد، کەچی سـەدر پێشـوازی لەو هەنگاوەش کرد. ئەو بە لایەنگرەکانی گوت، "لە کۆتاییدا ئامانجە مەودا دوورەکەم هاتەدی."[٣٧٧] کەچی کار لەکار ترازابوو.

[377] SAVAK Documents, No. 8/270-2/316, 18 April 1978.

# bibliography

## *Archival Collections*

### *Iran*

Markaz-e Amouzesh va Pajooheshhay-e Beynolmelali-e Vezarat-e Omour-e
Kharejeh [Center of International Research and Education of the Ministry of
Foreign Affairs]
Markaz-e Asnad- Enghelab-e Eslami [Islamic Revolution Document Center]
*Published Government Documents*
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Aval, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr According to SAVAK
Documents, Vol I, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Dovom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr According to SAVAK
Documents, Vol II, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Sevom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr According to SAVAK
Documents, Vol III, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Hezb-e Democrat-e Kurdestan-e Araq be Ravayet-e SAVAK [Iraqi Kurdistan
Democratic Party According to SAVAK]
Ravabet-e Iran va Araq be Ravayat-e SAVAK [Iran-Iraq Relations According to
SAVAK]
*United States of America*
US National Archives and Records Administration (NARAI), College Park,
Maryland
Central Intelligence Agency Records Search Tool (Crest)

General Records of the Department of State, Record Group 59 (RG59)
Central Foreign Policy Files (CFP), 1973–76, Access to Archival Databases
(AAD). Available at: http://aad.archives.gov/aad/
Records Relating to Iran, 1965–1975, LOT 77D400
Richard M. Nixon Presidential Library (RMNL), Yorba Linda, California.
Available at: https://www.nixonlibrary.gov/
Gerald R. Ford Presidential Library (GRFL), Ann Arbor, Michigan.
Available at:
https://www.fordlibrarymuseum.gov/collections-digital.aspx

Published Government Documents
United States Congress, House Select Committee on Intelligence, CIA: The Pike
Report. With an Introduction by Philip Agee, (Nottingham, England:
Spokesman Books, 1977).
Congressional Record
Foreign Relations of the United States (FRUS) (Washington, DC: US Government
Printing Office)
1969–1976
I: Foundations of Foreign Policy, 1969–1972 (2003)
XI: South Asia Crisis, 1971 (2005)
XXIV: Middle East Region and Arabian Peninsula, 1969–1972
XXVII: Iran; Iraq, 1973–1976 (2012)
XXXVIII: Foundations of Foreign Policy, 1973–1976 (2012)
E-3: Documents on Global Issues, 1973–1976 (2000)
E-4: Documents on Iran and Iraq, 1969–1972 (2006)
Public Papers of the Presidents: Gerald R. Ford, 1976–77, Book III. Washington,
DC: US Government Printing Office, 1979.
Online Document Collections
National Security Archive, George Washington University (NSA-GWU),
Washington, DC
Digital National Security Archive (DNSA). Available: http://nsarchive.

chadwyck.com/
Electronic Briefing Book (EBB) 265. Available at: http://www2.gwu.edu/~nsarchiv/NSAEBB265/
Henry Kissinger Telephone Transcript (State-Kissinger), U.S. Department of State
Electronic Reading Room. Available at:
http://foia.state.gov/Search/
Collections.aspx
Israel State Archives, On-Line Collection: Prime Minister Golda Meir and the
Shah of Iran in 1972. Available at:
http://www.archive.gov.il/ArchiveGov/
pirsumyginzach/TeudaBareshet/GoldShah/
Special Collection: A Life in Intelligence—The Richard Helms Collections (CIAHelms), US Central Intelligence Agency Electronic Reading Room. Available at:
http://www.foia.cia.gov/collection/life-intelligence-richard-helms-collection

Author's Interviews
Ali Akbar Mohtashampour
Ebrahim Yazdi

Published Interviews
Foundation for Iranian Studies Oral History Collection (FISOHC)
Colonel Hassan Alavikia
General Mansur Qadar Harold Saunders
Harvard Iranian Oral History Project (HIOHP)
Colonel Isa Pejman
BooksAgwani, M.S., *The Lebanese Crisis: 1958: A Documentary Study* (Bombay: Asia
pub. House, 1965).
Alam, Assadollah, *Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi*
*Alikhani* [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973
(Bethesda, MD: Iranbook, 1995).
Alam, Assadollah, *Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi*
*Alikhani* [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974

(Bethesda, MD: Iranbook, 2000).
Alam, Assadollah, *The Shah and I: The Confidential Diary of Iran's Royal Court,1968–1977* (New York: I. B. Tauris, 1991).
Al-Samarrai, Wafiq, *Hottam al-Bawabat al-Sharqi [The Destruction of the Eastern Gate]*. translated in Farsi. (Markaz Asnad va Tahghighat-e Defa-e Moghaddas).
Fardoust, Hossein, *Khaterat-e Arteshbod-e Baznesheshteh Hossein Fardoust: Zohour va Soqout- e Saltanat-e Pahlavi [The Memoirs of Retired General Hossein Fardoust: The Rise and Fall of Pahlavi Dynasty]* (Moasese-e Etelaat va Pajouhesh-ha-ye Siasi, 1990).
Farsi, Jalalodin, *Zavayay-e Tarik [Dark Angles]* Hadis Publisher, Tehran, 1373).
Halawi, Majed, *A Lebanon Defied: Musa al- Sadr and the Shia Community* (Oxford, 1992).
Hashemi Rafsanjani, Ali-Akbar, Doran-e Mobarezeh, Daftar-e Nashr-e Maaref, 1376.
Kimche, David, *The Last Option* (New York: Maxwell Macmillan International,1991).
Kissinger, Henry, *Years of Renewal* (New York: Simon & Schuster, 1999).
Khosrowshahi, Seyyed Hadi, *Yad-Nameh Emam Musa Sadr [Imam Musa Sadr's Memoirs]* (Moaseseh Farhangi-Tahghoghati-e Emam Musa Sadr, Tehran, 1387).
Korn, David, The Last Years of Mullah Mustafa Barzani. (1994). *Middle East Quarterly*, 1/2: 22.
McDowall, David, *A Modern History of the Kurds* (London: I.B. Tauris, 2007 ed).

دیاربوو سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بە ڕاگرتنی پشـتیوانی خۆی بۆ کورد و شـیعەی لوبنان گەیشـتە خاڵی کۆتایی. لەگەڵ ئەوەشـدا ئێرانی پەهلەوی ناسـەرکەوتووانە هەوڵیدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەردوو لای کـاراکتەرە نـادەوڵەتییەکـانی کورد و شـیعە بژیێنێتەوە. شـا بە قەناعەتپێهێنانی لە لایەن سـاواک و ئیسـڕائیلییەکانەوە نەخشـەی وابوو هەڵسـانەوەی عێراق لە دوای قۆنـاغی ١٩٧٥دا لە ڕێی سـەرلەنوێ کۆمەککردنی کوردەوە بەرزەفـت بکـا. لە هەمـان کـاتیشـدا هەوڵیـدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ سـەدردا بژیێنێتەوە. کەچی شـەپۆلەکانی شـۆڕشـی ئیسلامی هەردوو پلانەکەی لەباربرد.

### ١- هەڵسانەوە: کوردی عێراق

***مەلا مسـتەفا بارزانی بە میدیای ئەمریکایی گوت: "تۆ بڵێی نەتەوەی کورد تاوانێکی وەهای کردبێ، پێویست بکا هەموو دەوڵەتان دژی بوەستنەوە؟"***

### سەرچیخچوونێکی ستراتیژی یان پێویستییەکی ستراتیژی؟

بۆ محەمەد ڕەزا شا ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە ١٩٧٥ لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا سـەرکەوتن بوو. ڕێککەوتنەکە بۆ شـا گەواهییەک بوو لەسـەر سـیاسـەتی ئاوەزمەندانەی ئەو. لە ١٥ی ئازاری ١٩٧٥دا وەزیری کاروبـاری ئێرانی و عێراقی لە تـاران دانیشـتن تـا لەبـارەی دوا مەرجەکـانی ڕێککەوتننـامەکە گفتوگۆ بکەن. پاشـان، هوەیداش سـەردانی بەغدای کرد و لە بەرانبەریشـدا سەددام لە تاران چاوی بە شـا کەوت. لە کۆتاییدا، ئەم سـەردانانە سـەریان کێشـا بۆ واژۆکردنی پەیمـاننـامەی بەغدا لە ١٣ی حوزەیرانی ١٩٧٥ کە بنەمای هێڵی تالوگی سـەلماند و نیوە بەشـەکەی ڕۆژهەڵاتی یەکاوەکە (ئەردوەند ڕودی) دایە ئێران.

لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژهەڵاتی ناوین لە دامەزراوەیەکی بەکۆمەڵی ئاشتیپارێزی کەم بوو تا ڕەوایەتی باڵکیشبوونی ئێرانی بسەلمێنێ. بۆ ئەم کارەش، شا لە

سەرەتاوە سیستمی ئاسایشی بەکۆمەڵی کەنداوی فارسی دامەزراند، بەڵکو بیرۆکەی سەرکردایەتی هەرێمی خۆی بەرجەستە بکا. ئەو دەیزانی بەقەد ئەوەندەی "هەژموونی سۆڤیەت بەسەر عێراقدا کەم بکاتەوە و ئەوەندەش دەکەوێتە ژێر ئەو فشارەی تا وا بۆ بەغدا و عەرەبەکانی دیکە نمایش بکا، کە ئێران داردەستێکی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نییە لە هەرێمەکەدا... هەربۆیە پێداگرتن لەسەر ئەوەی کە هەقە ئاسایشی کەنداوی فارسی بەرپرسیارێتی وڵاتەکانی سەر کەنداوەکە بێ، ئەوا دەکرێ بۆ بەرجەستەکردنی زلهێزیی خۆی بەسەر هەرێمەکەدا باشترین ستراتیژی بێ.[1] تەنانەت سەددام حوسێنیش لە دیدارە ڕۆژنامەوانییەکانی خۆیدا ئاماژەی بۆ ئەگەری ڕێکخستنی ئاسایشی بەکۆمەڵی لە کەنداوی فارسیدا دا. بە گوێرەی قسەی سەددام، ڕێککەوتننامەی جەزائیر بووە مایەی هاوکارییەکی نوێی ئاسایشپارێزی بۆ کەنداوی فارسی.[2] ئیدی لەو بارودۆخەدا، نە بەیەکهەڵشاخانی ئێران-عێراق و نە عەرەب-ئێرانی ڕووینەدایەوە. پێشتریش لە کۆبوونەوەی لووتکە لە ڕیبات لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٤دا، سەددام بە شازادە فەهدی عەرەبستانی سعودی گوتبوو، "نیگەرانی سەرەکیی عێراق لەسەر پاراستنی ناسنامەی عەرەبایەتی کەنداوی فارسی بووە و ئامادەشە بۆ هاوکاری لەگەڵ هەر ڕژێمێکی عەرەبی بۆ دیارکردنی سنووری چوارچێوەی قانونیانەی ڕۆڵی ئێران، نەوەک بۆ ئەوەی ببێتە بەربەست بە ڕووی هەڕەشەی ئێران، چونکە ئێران هێزێکی ڕەوایە لە کەنداوی فارسیدا.[3] دامەزراندنی سیستمێکی بەکۆمەڵی ئاسایشپارێز دەکرا لەسەر بنەمایی کشانەوەی هێزی دەریایی هەریەک لە ڕوس و لە ئەمریکییەکان لە کەنداوی فارسیدا بنیاتبنرێ، لە بەرانبەریشدا تەنیا هێزی دەریایی ئێرانی لەوێ بمێنێتەوە، بەوەی تاکە هێزی دەریاییە لە

---

[1] The implication of the Iran-Iraq Agreement—DCI/NIO 1039–75, 1 May 1975.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[3] Beirut 1014 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 14 June 1975.

کەنداوی فارســـیدا. دەقی ئەو بەیاننامەی دوابەدوای ســـەردانی هویەدا بۆ بەغدا لە درەنگانێکی ئازاری ١٩٧٥دا دەرچوو، تێیدا هاتبوو "پێویســـتە کەنداوی فارســـی لە هەموو دەســـتورەدانێکی بیانی بەدوور بێ."[٤] لە ڕاستیشدا ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نیگەران بوو لەوەی "شا ڕاشکاوانە دژی ڕۆڵی هێزی دەریایی ئەمریکا لە کەنداو[ی فارســـی] بوەســـتێتەوە، ئەوەش بەهۆی هاوکارییەکی زیاتری پرســـی ئاســـایشـــپارێز یان کەمکردنەوەی دەســـترۆیشـــتن و کاریگەری ســـۆڤیەت لەســـەر عێراقدا."[٥] کۆنفرانسی ئاسایشی کەنداوی فارسی ١٩٧٨ لە مەسقەت سەرەکیترین نمایشـــی قۆناغی پاش ١٩٧٥ی ڕێکخســـتنەوەی هێز بوو لە هەرێمەکەدا.[٦] ســـعوودییەکانیش لەوە ترســـان نەوەک عێراق، بگەنە حاڵەتێک "بتوانن سەرنجی خۆیان زیاتر بخەنە سەر کەنداوی فارسی، ئاخر سەرکردەکانی عێراق پێشـــتر ســـعوودییەکانیان بە "نەیاری هاوکاریی عەرەبی" دادەنا."[٧] هەروەک شا بە دروستی پێشبینی کردبوو، ڕکابەری لەنێو عەرەب لەسەر جێگرتنەوەی پێگەی دووەم لە بابەتەکانی هەرێمەکەدا پەیدا بوو. پێدەچوو شـــا لە کۆتاییدا گەیشـــتبێتە چاوتێبڕینە دوورمەوداکەی لە کوێخایەتیکردن بەسەر هەرێمەکەدا.

لەگەڵ ئەوەشـــدا بەدگومانی لەبارەی لێکەوتەکانی ڕێککەوتننامەی جەزائیر ســـەریان هەڵدا. کاربەدەســـتە ئەمریکییەکان گومانیان لە "ئاشـــتەواییەکی درێژخایەن" هەبوو.[٨] ئەوان عێراق و ئێرانیان وەک "دوو ڕکابەری سروشتی لە کەنداوی فارسیدا" بینی، کە " پڕ دانیشتوانترین دەوڵەت" و "دەوڵەمەند بە سەرچاوەی دەرامەتی سروشتی"ن لەگەڵ "سوپایەکی زەبەلاحی پڕ چەک".

---

[٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[6] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 57.

[7] The implication of the Iran-Iraq Agreement—DCI/NIO 1039–75, 1 May 1975.

[٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

لەوەش جەوهەریتر، "هەردووکیان "شـا و سـەددام حوسـێن ڕوانینی زۆی جیاواز لەیەکدیان لەبارەی چۆنیەتی گەشـەسـەندنی سـیاسـیانە هەبوو، هەردووکیشـیان چاویان لە ڕابەرایەتی هەرێمەکە و زاڵبوون بەسـەریدا بڕیبوو."[9] ئەوان ڕێککەوتننـامەی جەزائیریـان بە هەنگـاوێکی هەڵەی سـتراتیژی شـا بینی. بەگوێرەی قسـەی کاربەدەسـتە ئەمریکییەکان بێ، (شا)ش "لەبارەی نمایشی چۆنیەتی کاریگەری پەیڕەوکردنی ڕێککەوتنامەکە ئـاڵوگۆڕانە بوو، ئـاخر کەمە دەسـتەبەرییەک هەبوو بەوەی عێراقیش بە ڕێزەوە دوای ئەوەی بەسـەر کێشـەی کورددا زاڵ دەبێ، هەموو بەڵێنەکانی جێبەجێ بکـا."[10] ئەوان لەو بڕوایەدا بوون ئەگەر هـاتوو عێراق لە جێبەجێکردنی ڕێککەوتنـامەکەش پاشـەکشـە بکا، ئەوا ئێران نـاتوانێ ڕاپەڕینی کوردان لە نێو عێراقدا دنە بدا و وای لێبکا کاریگەر بێ. هەروەها ئەوان مشـتومڕیان لەسـەر ئەوەش کرد، ڕێککەوتنامەکە وای لە سـنووری ڕۆژئاواییەکەی ئێران کرد لە جاران زیاتر ناسـک و مایەی شـڵۆقی بێ. ئەوان گەیشـتنە ئەو بەرەنجامە بە لاچوونی هەڕەشـەی کورد، ئیدی بەغدا پێگەی وڵاتەکانی کەنداوی فارسـیش بشـێوێنێ. هەرچەندە سـەرکردە میانڕەوەکانی عەرەب، نەخاسـمە ئەنوەر سـادات مشـتومڕی لەسـەر ئەوە بوو، کە ڕێککەوتنامەکە بۆ عێراقێکی نەرمڕەو سـەردەکێشـێ، شـێخنشـینە نەریتخوازەکانی کەنداویش لەبارەی توانسـتی عێراق بۆ پشـتگیری کردەی شـێوان و تێکدان و بەڕادیکـالکردنی عەرەب نیگەران بوون. بەڕوانینی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکاش، مشـتومڕ لەسـەر ئەوە بوو، "سـەرکردایەتیی بەعسـی عێراق لە ڕوانگە و ڕامـانی خۆیدا هەر بە شۆڕشگێڕی دەمێنێتەوە و هەوڵی پابەندبوونی خۆیشی بۆ ئەوە دەدا ڕژێمە نەریتخواز و نەرمڕەوەکـان لە نیمچە دوورگە [ی عەرەبی] و کەنـداو [ی

---

[9] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[10] The implication of the Iran-Iraq Agreement—DCI/NIO 1039–75, 1 May 1975

فـارســـیـدا] وەربگەڕێنێ." لە ڕوانگەی وڵاتە یەکگرتووەکـانـدا، بەغـدا "سیاسەتێکی دوو ئاستی باناندووەتەوە." لەسەرێکەوە بەشێوەیەکی کارایانە لەسـەر ئاسـتێکی دیپلۆماتانە لەگەڵ دروا‌سـێکانیدا دەجووڵێتەوە، لە کاتێکدا لە دەسـتوەردان لەکاروباری ناوخۆیان هەر بەردەوامە."[11] ڕێککەوتننامەکە دەرفەتێکی وەهـای دابووە بەغـدا "ڕەگوڕیشـەی نهێنی خۆی بە بەرفرەوانکردنی شـانە بەعسـییەکانی خۆی لە وڵاتە بچکۆلەکانی کەنداو [ی فارسـی] ڕۆبنێ و پشـتگیری لادەر و هەڵگەڕاوە خۆجێییەکانیشـی بکا."[12] ئەوان مشتومڕیان لەسەر ئەوە بوو، سەددام بە ئاڵای عروبە و بەبێ ترس لە ڕاپەڕینی کوردان دەچێتە سـەر سـەکۆی شـانۆی جیهانی عەرەبییەوە. هەروەک چۆن بەگوێی هەندێ لە سـەرکردە عەرەبییە نەریتخوازەکانیاندا دابوو، بەتایبەتیش هی سـولتاننشـینی عومانی و شـیعەی عێراق، کە دەستبەرداربوونی ئێران لە کورد گومانی ئەوەش لەبارەی توانستی شا بۆ پاراسـتنی ئاسـایشـی هەرێمەکە لە دەسـت جووڵانەوە شـۆڕشـگێڕییەکان دەروژێنێ.[13] ئەوان پێیان وابوو، تەنانەت سـولتان قابوسـی عومانی هاوپەیمانی شـاش لەبارەی خۆگریی و بەردەوامی پشـتگیریی شـا بۆ مەسـقەت لەدژی یاخیبووانی زەفار (ظفار)، کە عێراق پشـتیان دەگرێ، نیگەران بووە. هەرچەندە شـا سـوپای ئێرانی لە عومان نەکێشـابووەوە تا بەتەواوی یـاخیبووانی زەفـار سـەرکوت دەکرێن، لێ ئەمریکییەکان لەوە دڵنیابوون بەو زووانە پراگماتییەتی شـا لەنێو خودی هاوپەیمانەکانی ئێران بە خۆپەرستی لە قەڵەم دەدرێ و شەقڵی خۆی وەردەگرێ.

لە واقیعیشـدا شـا لە ڕێککەوتننامەی جەزائیردا ستراتیژێکی سـەرکەوتووی بەدەسـتهێنابوو. سـازشـی عێراق لەسـەر ئەروەند ڕود لە ناوچەی کەنداوی

---

[11] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[12] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[13] Bonnin, Richard, Arrows of the Night: Ahmed Chalabi and the Selling of the Iraq War (Anchor; Reprint edition, November 13, 2012) p. 58.

فارسیدا گەورەترین نمایشی زاڵدەستی ئێرانییەکان بوو. ئەو بەغدای ناچار کرد لە ئەروەند ڕوددا لەبەری دابنوێنێ و واشی لە ڕژێمی بەعس کرد دان بە باڵکێشی ئێران لە هەرێمەکەدا بنێ. بە فشارخستنەسەر عێراق تا ڕێککەوتننامەکە مۆر بکا، ئەو پەلکێشی ڕژێمی بەعسیشی لە کەنداوی فارسیدا کۆتوبەند کرد و پشتگیریشی لەسەر حزبە جواداخوازییە ئێرانییەکان بڕی، هەروەک چۆن هەمان شتیشی لە عەمان لەگەڵ یاخیبووە مارکسییەکانی زەفار کرد.

سەربارى سەرکەوتنی ستراتیژی ئێران، کەچی عێراقیش هەندێ سەرکەوتنی ستراتیژی بەدەستهێنا. هەر دوابەدوای ڕێککەوتننامەکە، سەرچاوە دەرامەتەکانی عێراق ڕژانە نێو کەناڵی پەرەسەندنی ئابووری و چەک و جبەخانەی سوپا، وای لێکرد وڵاتەکە قەوارەی سوپاکەی بەرفرەوان بکا، بەشێوەیەک خەرجی هێزی چەکداری لەنێوان ساڵانی ١٩٧٥ تا ١٩٨٠ دووهێندە کردەوە. هەروەها ئەو توانایەشی دایە سەددام تا پێگەی خۆی لە بەغدا قاییم و مەحکەم بکا. وێرای سازشکردن بۆ شا لە ئەروەند ڕود و زیانگەیاندن بە شکۆی و شانازیی نیشتمانیی عێراق، کەچی وای لێکرد کێشەی کورد لە کۆڵ خۆی بکاتەوە و مەترسی جەنگ هەڵگیرساندنیش لەگەڵ ئێران کەم بکاتەوە. پاشان سەددام دەستپێشخەری هەڵمەتی دژەشیوعی کرد و ئینجا دەسەڵاتەکانی ئەحمەد حەسەن بەکریشی سنووردار کرد.[١٤]

هەر شا بەخۆیشی دەیزانی ڕێککەوتننامەی جەزائیر بۆ عێراق بەدەستهێنانی کاتە. هەروەک ئەو بەڕاستیش پێشبینی کردبوو، عێراق هەر بە هەڕەشە بۆ

---

[١٤] سنووردارکردنی دەسەڵاتی ئەحمەد حەسەن بەکر بە شێوەیەکی تایبەتی دوای ڕاپەڕینی شیعەی عێراق لە ١٩٧٧ لە باشوور دەستپێکرد، ئەو کاتەی جڵەوی وەزارەتی بەرگری لەدەست دا و عەدنان خەیروڵڵا تلفاحی کوڕەخەزووری کرایە وەزیر. هەرچەندە بەکر هەر بە سەرۆک، بە سەرکردەی بەعس و بە سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش مایەوە، لێ ئەو دەسەڵاتێکی کەمی بەسەر عێراقەوە هەبوو.

ســـــەر ئێران مایەوە. ئەو لەوە نیگەران بوو، بەغدا بە پشـــتیوانی تەواوی دەوڵەتانی عەرەب لەناوچەکە و بە پشتیوانی مۆسکۆوە پەلاماری ئێران بدا. بە گوێرەی وەزارەتی کـاروبـاری دەرەوەی ئێران بێ، "رادە و قەوارەی چەک و تفـاقی جەنگی عێراقی بە بەراورد لەگەڵ ژمـارەی دانیشـــتوان و خاکەکەی زۆر زۆریش لە هی ئێران زیاترە."[١٥] شـا هەر بە خۆیشـی شـاهید بوو لەســـەر ئەو ئاســـتە بەرز و ڕوولەزیادبوونەی فرۆشـــی موشـــەکی سکودی ڕوسـی بۆ بەغدا، کە وای لێدەکرد توانسـتە هێرشـکردنەکەی بەرز دەکردەوە. شـــا لە دیدارێکی لەگەڵ نیوزویک Newsweek لە ١٩٧٧دا، ترسـی ئێرانی لە بەرانبەر عێراقدا ئاشـکرا کرد: "ئێمە ناکۆکییەکانمان لەگەڵ عێراق چارەســـەر کرد، بەڵام ڕۆنانی چەک و جبەخانەی ســـەربازییان بەردەوامە. منیش مەراقمە بزانم ئـاخۆ چەنـد نووســـەر و پەیـامنێر و کۆنگرێســـمان لەوە تێدەگەن عێراق چەند زیاتر فڕۆکە، تانک و تفەنگ و تەنانەت ڕۆکێتی زەوی-بۆ زەوی سکود SCUD ی لە ئێمە زیاتر هەیە."[١٦] شا لەوەدا ڕاست بوو کە سەددام بە ئاستەم ڕێککەوتننامەکەی بە چارەسەر دەزانی، بەڵکو بە ئـاگربەســـتی دەزانی، چـاوەڕێی هەلێکی دەکرد دژی بوەســـتێتەوە. ئیدی پـاش پێنج ســـاڵ لە مۆرکردنی ڕێککەوتننـامەکە، دەرفەتەکەی بۆ هات.

ســـەرباری هەموو دەســـتکەوتە ســـتراتیژییەکانی ئێران، لی ڕێککەوتننامەی جەزائیر سـیاســـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانی لە کوردسـتانی عێراق تێکشـکاند و وڵاتەکەی لە کارتی فشـاری کوردی بەســـەر عێراقەوە بێبەش کرد. وێنەی ئێرانیشـی لەبەردەم کوردا شـێواند. ئەوان نەدەکرا باوەڕ بەوە بهێنن بەوەی شـا وەک "پادشـایەکی ئاریایی" و "پشـتیوانی کورد"، ئاوا لە

[15] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 55.

[16] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 55.

خەباتیان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی دەستبەرداریان بێ، هەندێ لە پێشمەرگە سەرسەختەکان هیوایان وەهابوو ئێران دڵی خۆی بگۆڕێ و دەست بە پشتیوانی سەربازیی خۆی بۆیان بکاتەوە. کاتێکیش تۆز و غوبار لەسەر گۆڕەپانی شەڕ لە کوردستانی عێراق ڕەوایەوە، ئەوکات ڕاستییە ڕەق و زبرەکە بەدەرکەوت. لەپاڵ ئەمەشدا ئەوەی زیاتر کوردەکانی ورووژاند، ئەو شێوازە ڕەفتارکردنەی شا بوو لەگەڵیان لەدوای مۆرکردنی ڕێککەوتننامەکە. لەگەرمەی فشاری ئێران بۆ سەریان، بەوەی خۆیان ڕادەستی بەغدا بکەنەوە یان بەرەو ئێران هەڵبێن، ئەوەبوو لە پڕێکەوە کورد لە لایەن سەددامەوە هێرشیان کرایەسەر. پێدەچوو عێراقییەکان سنووری ئێرانیان بڕیبێ و هێرشەکەیان لە مەهرانەوە، شارێک لە ڕۆژئاوای ئێرانەوە کردبێتە سەریان. عیسا پژمانیش ئەوەی گوت، گوایە شا ڕێگەی نەدابوو سوپای عێراق خاکی ئێران بۆ سەرکوتکردنی پێشمەرگە پارتیزانەکان بەکاربهێنێ؛ کەچی ئەوە ناسری [بەڕێوبەری ساواک] بوو شای لە دەستدرێژییەکەی عێراقییەکان بۆ سەر خاکی ئێرانی ئاگادار نەکردبووەوە.[١٧] هەرچۆنێک بێ بارزانی و پێشمەگە لەسەر ئەمە لۆمەی شایان کرد. ئەو وەهای گوت کە "عیسا پژمان ئێمەی بە شا فرۆشت و شاش ئێمەی بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا فرۆشت."[١٨] کورد ئەوەی بۆ قووت نەدرا، چۆن شا هاوکاریی لەگەڵ سەرکردەیەکی عەرەب کردووە، کە بەدرێژایی ژیانی هەر ڕقی لە ئێران بووەتەوە و هەڵوێستی کوردانیش وەک ڕۆژی ڕوون دیاربووە.

هەروەها ڕێککەوتننامەی جەزائیر ئەوەشی هێنایە پێشەوە، ئەو شتەی شا لە ١٩٤٦ەوە نیگەرانی بوو: پرسی کورد بوو لە ئێران. دوابەدوای ڕێککەوتننامەکە، پەنابەرانی کوردی عێراق بوونە سەرچاوەی سەرەکی بۆ

---

[17] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011), p. 201.

[18] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011), p. 191.

ناسەقامگیری لە ڕۆژئاوای ئێراندا. هەرچەندە سوپای ئێرانی پێشمەرگەی چەککردبوو، هەروەها لە پەنابەرە مەدەنییەکانیشی دابڕاندبوون، کەچی بەغدا دەیزانی پەنابەرانی کورد دەبنە مایەی هەڕەشەیەکی گەورەتر لەسەر ئاسایشی نیشتمانیی ئێران لەوەی لەسەر عێراق. لەپاڵ ئەمەشدا زۆرینەی کوردی ئێران خۆیان بێزیان لەوە بووە، کە تاران دەستبەرداری پشتیگیریی کوردی عێراق بووتەوە. هەر کەمێک دوای ڕێککەوتننامەی جەزائیر، ڕاگەیاندننامەی دژەشا بە نهێنیی لەنێو زۆرینەی شارە کوردنشینەکان بەتایبەتیش لە مهاباد بڵاوبوونەوە.[19] هەر شا بەخۆی بەرانبەر کاردانەوەی کوردی ئێران لەبارەی ڕێککەوتننامەکە هەستیار بوو. "دیارە کورد وەهای چاوەڕێ کردووە، کە ئێمە لەبەر ئەوان دەستبەرداری بەرژەوەندییەکانی خۆمان بین."[20] لەو نێوەشدا، گەنجانی کورد لەناوچە شارنشینەکاندا چوونە پاڵ حزبە کوردییە ڕادیکاڵ و چەپ و جوداخوازەکان. حزبی تودەی مارکسیش کاریگەریی خۆی لەنێو کوردی ئێراندا ژیاندەوە. گەشەکردنی پێکهێنانی ئەو گرووپانە، هەڕەشەی جیاخوازی بۆ سەر ئاسایشی یەکێتیی نیشتمانی زیندوو کردەوە. نوشستی پاشایەتی پەهلەوی زەمینەیەکی لەباری بۆ کورد ئافراند تا ئاڵنگاری شۆڕشگێڕیتی ئێران ببێتەوە.

### دواهەوڵ لە دوایین ڕۆژدا

ڕێککەوتننامەی جەزائیر بۆ نزیکەی یەک چارەگە سەدە کوردی عێراقی دابەشکرد. هەرچەندە هەر لە ١٩٦٤ەوە گرژیی توندی نێوخۆ لەنێوان هۆبە و لقە کوردییەکاندا هەبوو، لێ ڕێککەوتننامەکە جیاوازی و مەودای گرژییەکانی قووڵتر و بەرینتر کرد. ڕێککەوتننامەکە زیانی بە نمایشنامەی شکۆی بارزانی و دەسەڵاتەکەی گەیاند و کوردی بەبێ فەرماندەیەکی

[19] SAVAK Document, No number, No Date.

[20] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 191

شـــۆڕشـــگێڕی کارا بەجێهێشـــت. کارێکیش بارزانی کردی، ئەوەبوو بە تاڵییەکەوە مەرجەکانی ڕێککەوتننامەکەی پەسەند کرد و بە خۆی کوڕەکانی هەر یەک لە ئیدریس و مەسعود ڕوویان لە ئێران کرد، تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەدیش[٢١] ئەو بڕیارەیان ڕەتکردەوە و درێژەدانیان بەشەڕ و بەرگرییان لێ هەڵبژارد.[٢٢] ئەوان ڕەخنەیان لە لاوازیی ســـەرکردایەتی بارزانی گرت و ســـەرکۆنەی ئەوەیان کرد، کە متمانەیەکی ســـادە و دڵســـافانەی بە شـــا هەبووە. کاتێکیش عێراق دوا هێرشـــی خۆی کرد، باقی دەســـتەبژێری پارتی دیموکراتی کوردســـتان باکووری عێراقیان بەرەو ســـوریا بەجێهێشـــت تا لەوێ بگەنەوە تاڵەبانی، کە ئەو پێشـــتر ڕووی کردبووە بەیروت، ئەو لەوێ هەر لە هەفتاکانەوە پێگەی نوێنەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردســـتانی هەبوو. بە دەســـتلەپشـــتدانی حافز ئەســـەد، کە ڕژێمە بەعســـییەکەی ئەو بەدگومان بوو لە سەرکردایەتیکردنی سەددام بەسەر گەلی عەرەب لەدوای قۆناغی جەمال عەبدولناســـر، ئەوە بوو تاڵەبانی و هاوڕێکانی لە ١ی حوزەیرانی ١٩٧٥دا یەکێتیی نیشـــتمانیی کوردســـتانیان دامەزراند. پێشـــمەرگەی یەکێتیی نیشـــتمانیی کوردســـتان بە درەنگانێکی ١٩٧٥ەوە پەلاماری پێگەکانی عێراقیان دا و تا تەواوی ســـاڵی ١٩٧٦یش درێژەی هەبوو. وێڕای پشتیوانییە مامناوەندییەکەی سوریا، پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان تەنیا لە ناوچە هەرە بەرزەکانی چیاکانی باشووری کوردســـتان توانیان بجووڵێن و زەبری خۆیان بوەشـــێنن.[٢٣] کاتێکیش بەیەکدادان لە نێوان ســـوپای عێراق و یەکێتیی نیشـــتمانیی کوردســـتان

---

[٢١] دیارە لێرەدا نووســـەر لەبارەی تێهەڵچوونەوەی ڕەوتی خەباتی شـۆڕشـگێڕانەی ئیبراهیم ئەحمەد سەرچێخ چووە، چونکە لە هیچ لە بەڵگەنامەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا لە دوای دامەزراندنییەوە، ناوی ئیبراهیم ئەحمەد وەک دامەزرێنەر یان وەک ئەندامێکی کارای ڕێکخراوەکە نەهاتووە. وەرگێڕ

[٢٢] بیچمە سەرەکییەکانی دیکەش ئیبراهیم ئەحمەد، عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری بوون.

[٢٣] بنکە ســـەرەکییەکانی یاخیبوونە شـۆشـڕگێڕییەکە لە نێوان نۆکان، لە کوردســـتانی ئێران و قەندیل لە باشووری کوردستانی عێراق بوو.

پەرەیسەند، سەددام بانگهێشتی هەردووکیان، هی ئیبراهیم ئەحمەد و تاڵەبانی کرد تا قەیرانەکانیان چارەسەربکەن. هەرچۆنێک بێ، داوای ئۆتۆنۆمی ئەوان دەردەست لەلایەن بەغداوە ڕەتکرایەوە. وێڕای سەرکەوتنی بەرایی، لێ لەبەر بۆردومانی چڕ و خەستی هێزی هەوایی عێراقی و لەبەر هەڵکشانی گرژیی لەگەڵ بارزانیدا، ئیدی زەبر و کردەوەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش لاواز بوون. لە ١ی ئابی ١٩٧٦دا ئەو شەڕ و دەمەقاڵێیەی دووروبەردرێژەی نێوان هەردوو گرووپەکە بەتوندی هەڵگیرسایەوە، ئەوەش لەوکاتەدا بوو کە پێشمەرگەکانی بارزانی بۆسەیەکیان بۆ چەندین پێشمەرگەی یەکێتی دانابووەوە و لەناویان بردن.[٢٤] تاڵەبانیش بەڵێنی تۆڵەکردنەوەی دا و لە زستانی ١٩٧٧دا هەندێ بەیەکهەڵشاخان لەنێوانیان ڕوویدا. هەرچۆنێک بێ، شەڕی سەرتاپایی لە ناوچەی برادۆست و لە نیسانی ١٩٧٨دا تەقییەوە، ئەوکاتەی هاوپەیمانەکانی تاڵەبانی، هەریەکە لە عەلی عەسکەری و خالید سەعید بە دەستی پێشمەرگەکانی بارزانییەوە کوژران. هەروەها سەرکردەکانی دیکەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان وەک باباشێخی ئێزیدیش بە دەستی پێشمەرگەی بارزانییەوە کوژرا،[٢٥] کە بەو دواییانە لەلایەن میتی تورکی و ئیستخباراتی عێراقییەوە کۆمەک دەکران. لەو نێوەشدا هێشتا هەڵوێستی ساواک سەرلێشێواو بوو.

دوابەدوای پەیماننامەی بەغدا، لە بەراییەوە شا هەڵوێستێکی دژەشۆڕشگێڕی لە بەرانبەر کوردی عێراقدا وەرگرت. ساواکیش دەستی لە

[24] McDowall, David. A Modern History of the Kurds (London: I.B. Tauris, 2007 ed) p. 344.

[٢٥] دیارە مەبەست کارەساتی هەکارییە. کاتی خۆی چەندین جار حاجی محەمەدی شلانی کۆچکردوو بۆی گێرامەوە، کە هێزێکی چوارسەد کەسی لە دۆڵی ڕۆستەوە بە گەروەزینێ، لە دامێنی حەساری ڕوستێدا بۆ دیوی برادۆست پەڕینەوە، دیاربوو ئەو عەلی عەسکەری دەناسی، بۆیە کاتێک لەبەردەبووک وکانگانەوە پێیان نابووە دیوی دۆڵی ڕوستێ، بانگی ئەویان کردبوو، تا ببێتە چاوساغیان. وەرگێڕ.

سـەرکوتکردنی یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتانەوە هەبوو، کە ڕابەرەکەی تاڵەبانی ئەوەی گوت؛ "هەر هەموویان؛ عێراق و ئێران و پارتی دیموکراتی کوردستان، دوژمنی ئێمەن."[٢٦] ئەوەی ڕاستی بێ، ڕێککەوتننامەی جەزائیر، خاوبوونەوەی گرژی و کرانەوەی نێوان ئێران و عێراق بوو، هەروەها بە شـێوەیەکی کـاتییش نەیـارییە درێژخـایەنەکەشـیـان هێور بووەوە. پەیوەندییەکانی تاران-بەغدا لە ١٩٧٨دا باشـتر بوون، بە شـێوەیەک ئاژانەکانی ساواک لە عێراق پلانێکی مۆسکۆییان لە دژی ڕژێمی بەعس بە دەزگای ئیسـتخباراتی عێراقییەوە گوت. ئیدی دەسـتبەجێ سـەددام دەیان ئەفسەری لە سوپا تیرباران کردن. وەک هێمایەکیش بۆ ئاشتبوونەوەیەکی تەواو، ئەوەبوو ئایەتوڵڵا خومەینی لە عێراقەوە بۆ پاریس دەرکرد[٢٧]، ئەو بڕیارەی شۆڕشی ئیسلامی خێراتر کرد.

بە تێپەڕبوونی کـاتیش، سـتراتیژیی ئێران گۆڕا. بە زیندووبوونەوەی ڕکابەریتی هەڕەشـەی عێراق، شـا لەوە نیگەران بوو، کە ئەمریکا وەها سـەیری شـەڕی داهاتووی ئێران- عێراق بکا، وەک قەیرانێکی ناوخۆیی و تاران بە تاکباڵی لە بەرانبەر بەغدای پشتبەستوو بە سۆڤیەت بهێڵێتەوە. بە هاتنی سـاڵی ١٩٧٨، کاربەدەسـتانی سـاواک داوایان لە شـا کرد سـتراتیژییەکەی لە هەمبەر کوردی عێراقدا بگۆڕێ. هەر بەڕاسـتیش، داواکاری سـاواک داننان بوو بە بەڵگەوبەندی ئیسـرائیلییەکان، بەوەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر بارێکی گرانی لەکۆڵ بەغدا کردەوە. پێشـتریش دەزگای مۆسـاد هەسـتی بە گومانەکانی شـا لەبارەی خۆپڕچەککردنی عێراقەوە کردبوو. ئیدی بە پێداگیری هەردوولایان، ساواک و مۆساد، شا ڕێگەی دا سیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە کوردسـتانی عێراق بژیێنێتەوە. وردە وردە هاوکاریی نێوان ئیسـرائیل و ئێران و بارزانی لە ١٩٧٨دا ژیاندرایەوە. هەروەها سـاواک ژێربەژێر گفتوگۆی لەگەڵ یەکێتیی

[26] Talabani to PUK HQ (Damascus), Nawkan, 20 June I978

[27] Farrokh, Kaveh. Iran at War: 1500–1988 (Oxford: Osprey Publishing) p. 46.

نیشتمانیی کوردستانیشدا کرد. ساواک هەوڵی ئەوەشی دا، هەردووڵای پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە دژی بەغدا یەک بخا، تاڵەبانیش تەنیا بەو مەرجە بە خستنەڕووەکەی ساواک قایل بوو، کە ساواک واز لە پارتی دیموکراتی کوردستان بهێنی.[28] هەرچۆنێک بێ ساواک حاڵەتی بێلایەنی لە پرسەکەدا لێگرت و لە ڕکابەریی خۆبەخۆیی کوردان دوورکەوتەوە. هەر بە تەنیا چوار ئاژانی ساواک، کە عیسا پژمان یەکێکیان بوو، بەو ئۆپەراسیۆنە پەیوەست بوون بەڵکو ڕێڕەوێکی کوردی بکەنەوە.

***کاتێک شا لێی پرسیم چۆن پەیوەندییمان بە کوردان زیندوو بکەینەوە، منیش ئەوەم خستە بەردەست، جەخت لەسەر پڕوپاگەندەیەکی درێژمەودا بکاتەوە بۆ ئەوەی هۆش و دڵییان بۆ ئێران ڕابکێشێتەوە. هەروەها مشتومڕم لەسەر ئەوەش کرد، کە نابێ پلانەکە لە لایەن ساواکەوە جێبەجێ بکرێ، ئاخر لە دوای ڕێککەوتننامەکەوە، کورد ڕقیان لە ساواک هەڵگرتووە... (شا)ش لێی پرسیم پلانێکی پڕ وردەکار ئامادەبکەم و بیخەمە بەردەستی پاکرەوان. منیش وەهام کرد، کەچی پلانەکە هەرگیز جێبەجێ نەکرا.[29]***

بە گوێرەی قسەی ئیسرائیلییەکان بێ، هەرچەندە ئێران سەیری پرۆژەکەیان کرد، بەڵام وەڵامێکی گردەبڕانەیان نەدایەوە.[30] شا نیگەرانی خۆپیشاندانی شارە گەورەکان بوو. لەو نێوەشدا دەرکەوت بارزانی نەخۆشی شێرپەنجەی سییەکانی هەیە، ئەوەبوو بۆ چارەسەر چووە وڵاتە

---

[28] McDowall, David. A Modern History of the Kurds (London: I.B. Tauris, 2007 ed) p. 345.

[29] Qaneifard, Erfan, Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman] (Elm Publication, Tehran, 2011) p. 202.

[30] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 77.

**یەککگرتووەکانی ئەمریکا. مەلا مستەفا بارزانی لە ١ی ئازاری ١٩٧٩دا کۆچی دوایی کرد و لە شنۆ، لە باکوری ڕۆژئاوای ئێران بە خاک نێژرا.[٣١]**

**٢- هەڵسانەوە: شیعەی لوبنان**

*ریچارد پارکەر، باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت راپۆرتی وەها دابوو: **"ئەو بیرۆکەیەی کە ئیمام موسا چووەتە حەشارگە تا لەوێوە بگەڕێتەوە، لای ئێمەش پەیدابوو."[٣٢]***

**شەپۆلی شۆڕشی ئیسلامی**

ڕەوش لە کۆتایی ١٩٧٧ بۆ شیعەی لوبنان شووم بوو. سوریا جەرگەی وڵاتی شیعانی گرت، کە دۆڵی بیقاع بوو، لەکاتێکدا ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینیش لە باشووردا لەگەڵ ئیسرائیلیەکان دەجەنگا. هەرچەندە ئیسرائیل ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی و بزووتنەوەی نیشتمانیی لوبنانی ناچارکرد لە باشووری لوبنان بکشێنەوە، لێ زۆر لە مەدەنییەکانی شیعە بە شێوەیەکی دڕندانە بە تۆپ و گوللەی ئیسرائیلی یان بە بۆمبی فرۆکەکانی ئیسرائیلی کوژران. وێڕای میلیشیای ئەمەل، کەچی سەدر یەکێ نەبوو لە سەردارانی شەڕ. هەر بۆیە، ئەو تکای لە سەرکردە عەرەبییەکانی جەزائیر، عەرەبستانی سعودی و ئوردن و سوریا کرد بەڵکو پشتی شیعە بگرن. هەرچۆنێک بێ شەڕی ناوخۆ پێشتر ناووڕومەتی سەدری هەژاندبوو. بە گوێرەی قسەی مەنسور قەدەریش بێ، "شازادە تورکی"[٣٣]،

---

**[٣١] کەریم سنجابی، سەرۆکی بەرەی نیشتمانی و یەکەمین وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران لە دوای شۆڕشی ئیسلامی قەناعەتی بە خومەینی هێنابوو ڕێگە بدا بارزانی لە ئێران بەخاک بسپێرن.**

[32] Beirut 05430_d to the U.S. State Department, 19 September 1978, Wikileaks.

[٣٣] تورکی کوڕی عەبدولعەزیز کە بە "دووەم"یش ناسرا بوو (چونکە دووەمین کوری پاشا عەبدولعەزیز بوو، ناویشی لێنابوو تورکی) جێگری وەزیری بەرگری بوو لە تەمموزی

جێگری وەزیری بەرگری ڕەخنەی لە هەموو سەرکردەکانی لوبنانی گرت بە سەید موسا سەدریشەوە. ئەو وەهای گوت "ئەم پیاوە [سەدر] ڕوخسارێکی لەخشتەبەرانەی هەیە، ئەو جوان و دروست قسەدەکا، کەچی پێچەوانەکەی دەکا. ئەو هەر لەسەر پەتکێک نییە، هەر ڕۆژە و ڕەگەڵ تاقم و باندێکی نوێ دەکەوێ."[٣٤] لە سەرووی هەموو شتێکیشەوە، تا دەهات لەنێو گرووپە سەرەکییە لوبنانییەکان و لەنێو ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینیشەوە هەستوسۆزی دژەسەدری پتر دەبوو. تەنانەت شۆڕشگێڕە ئێرانییەکانی لایەنگری خومەینی و موجاهیدین و فیدایییەکانیش لە گەرمەی شەڕی ناوخۆدا دەیانبێزراند. ئیدی سەدر تەنیا بوو.

لەنێو جەرگەی ئەو ڕۆژە ڕەش و تاریکانەدا، پێشهاتێکی پێشبینینەکراو کە لە ٢٠٠٠ کیلۆمەتر لە دووری ئەو ڕوویدا، چارەنووسی شیعەی لوبنانی گۆڕی: ئەویش شۆڕشی ئیسلامی بوو لە ١٩٧٩. سەرۆک جیمی کارتەر لە ٣١ی دیسێمبەری ١٩٧٧دا لە کۆشکی نەوشیروان کاتێ پێکی بە خۆشی شا هەڵدەدا گوتی: "**ئێران لە سایەی سەرکردایەتییەکی مەزنی شاوە، دوورگەیەکی سەقامگیرییە لەنێو ناوچەیەکی هەرە ئاژاوە و پشێوی جیهاندا.**" کەچی سەقامگیریی ئێران درێژەی نەکێشا. هەر دوای چەند هەفتەیەک لە سەردانەکەی کارتەر، لێشاوی خۆپیشاندان لە شارە دیندارەکەی قوم و پاشان تاران و شارەکانی دیکەشدا تەقیەوە. پەرەسەندنی شەپۆلی خۆپیشاندان، سیاسەتی توندوڕەقی شا دەرهەق بە شیعەی لوبنان و ڕۆڵی کلیلئاسای دۆستەکانی لە سەرکردایەتیکردنی

---

١٩٦٩ تا ١٩٧٨. ئەو لەبەر ژنهێنانێکی بە مقۆمقۆ، ناچار واز لە بەرپرسیارێتییەکەی بهێنێ. ئینجا پسمامی ئەو، تورکی کوڕی فەیسەل ئال سعود، کە ئەویش بە تورکی فەیسەل ناسرابوو، بەرپرسی مەڵبەندی شا فەیسەل بوو بۆ خوێندن و توێژینەوەی ئیسلامی. ئەو بەڕێوبەرێکی گشتی باڵادەستی ئەلموخابەرات ئەلعامە، واتە دەزگای هەواڵگریی سعودی بوو لە ١٩٧٧ەوە تا ١ی ئەیلوولی ٢٠٠١، واتە دە ڕۆژ بەرلە پەلامارەکەی سەر ١١ی ئەیلول، ئەوکاتە ئەویش بە شێوەیەکی سەیر و مقۆمقۆهەڵگر وازی لە پۆستەکەی خۆی هێنا.

[34] Iran's Ministry of Foreign Affairs, No Number, No Date.

شۆڕش، هەموو ئەمانە قەناعەتیان بە سەدر هێنا، سیاسەتێکی ڕادیکالانەتر لە بەرانبەر ئێراندا بگرێتەبەر.[٣٥] سەدر لە دیدارێکی لە ٤ی ئازاری ١٩٧٨دا ئاماژەی بەوەدا، گوایە شا پشتگیری سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە لە هەرێمەکەدا، موسڵمانەکانی دژی فەڵەستینییەکان هانداوە.[٣٦] سیاسەتی لایەنگرانەی بۆ شۆڕش لەگەڵ هەوڵوتەقەللای بۆ ئەوەی بەدگومانی ڕژێمە عەرەبییە نەریتخوازەکان لە سەرهەڵدانی شۆڕشی ئیسلامیی شیعە لە عێراق بڕەوێنێتەوە. ئەو بە شازادە عەبدوڵڵای گوت؛ "خەریکە لە ئێران شۆڕشێک بە ڕابەرایەتی ئایەتوڵڵا خومەینی هەڵبگیرسێ. شۆڕشەکەش نە شیعەییە نە ئێرانییە، بەڵکو شۆڕشێکی تەواو ئیسلامییە. من دەمەوێ تۆ نەکەویە نێو داوی ئەمریکا و بەڵکو لەبری ئەوە پەیوەندییەکی باشت لەگەڵ شۆڕشەکەدا هەبێ."[٣٧] سەدر لە ٢٣ی ئابی ١٩٧٨دا وتارێکی دژەشای بە ناوی "بانگی پێغەمبەر" لە ڕۆژنامەی لیمۆندی فەڕەنسیدا بڵاوکردەوە، تێیدا بەڵگەوبەندی لەسەر ئەوە هێنابووەوە کە، "شۆڕشی ئێرانی لەگەڵ هەموو جووڵانەوەکانی دیکەی جیهان جیاوازە." ئەو ئاماژەی بەوەدابوو، ئەم جووڵانەوەیە نە بە چەپ و نە بە ڕاستگەرایییەوە پەیوەستە، ئەوەشی بۆ خستبووە سەر کە "شۆڕشگێڕانی ئێرانی نوێنەرایەتی چینێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو ناکەن... دنەدەری ئەم جووڵانەوەیە بیروباوەڕە... کە بانگی پێغەمبەر بیردەخاتەوە."[٣٨] **پاش کەمتر لە هەفتەیەک ڕووە و لیبیا بەرەو چارەنووسی تەلیسماوی ڕۆیشت.**

---

[٣٥] دۆستەکانی سەدر بە مەهدی بازرگان، یەدوڵڵا شەهابی، ئیبراهیم یەزدی، ئایەتوڵڵا سەید محەمەد حوسێنی بەهەشتی و سادق قوتبزادە توخمی سەرەکی بوون کە ڕۆڵێکی باڵایان لە سەرکردایەتیکردنی شۆڕشی ئیسلامییدا گێڕا.

[36] SAVAK Documents, No Number, No Date.

[٣٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[38] Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai [Social Diaries] (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) vol. 1, p. 174.

## گەشتێکی تەلیسماوی

**سەید موسا سەدر لە ٢٥ی ئابی ١٩٧٨دا لەسەر بانگهێشتننامەی قەزافی بە خۆی و دوو ئەندامی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە، شێخ محەمەد یەعقوب و عەباس بەدرەدینی ڕۆژنامەنووس چوونە لیبیا.** هەرچەندە لە خشتەی گەشتەکەی وەها بڕیاربوو بە گەشتی فڕینی ئەلئیتالیا لە تەرابلوسەوە بفڕێ و بگەڕێتەوە، کەچی هەرگیز نەگەیشتە ڕۆما. وێڕای ڕاستی دژبەیەک، "ئیمام [سەدر] و دوو یاوەرەکەی بە گەشتی ژمارە ٨٨١ت ئەلئیتالیا لە ٣١ی ئابدا تەرابلوسی لیبیایان بەرەو ڕۆما بەجێهێشت. کەچی ئیتالییەکان ئەوەیان گوت، ئەو کەسانەی بە ناوی سێ کەسایەتی شیعە گەشتەکەیان کردووە ئەوانە نەبوون کە سەدر و یاوەرەکانی بن."[٣٩] تەنانەت مەنسور قەدەری دژە سەدریش دانییپێدانا؛ "سەدر هەرگیز پێی نەناوەتە سەر خاکی ڕۆما. یەکێکی دیکە بە پاسپۆرتی سەدر چووەتە ڕۆما."[٤٠] ڕیچارد پارکەر، باڵوێزی ئەمریکا لە بەیروت بە هەڵەوە ئەوەی گوت؛ "خۆ ئەگەر بەتەواویش سۆراغی نەمێنێ، ئەوا خەڵکێکی زۆر کەم بۆی پەرۆش و ماتەمبار دەبن،" ئاخر "ئیمام تەنانەت بە پێوەرەکانی لوبنانیش گەندەڵێکی ناقۆڵا بوو."[٤١] ئیدی هەر زوو پشتیوانانی سەدر و ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە فشاریان خستە سەر سەرۆوەزیری لوبنان، سەلیم ئەحمەد ئەلحوس. لە ١٤ی ئەیلوول و لەپاش کۆبوونەوەیەکی لەناکاو، ئەوەبوو ئەلحوس بە ڕۆژنامەوانانی ڕاگەیاند؛ "ئەو زانیارییانەی تا ئێستا بەدەستگەیشتوون، نەرێنین"؛ هەروەها ئەوەشی بۆ زیادکرد

---

[39] Tripoli 01335_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 24 September 1978.

[40] Interview of General Mansour Qadar with Gholam-Reza Afkhami in the Oral History of Iran Program, Foundation for Iranian Studies, Bethesda, MD, US, 1986.

[41] Beirut 05339_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 13 September 1978.

نێردەیەک کە عومەر موســـکی، بەڕێوبەری گشـــتیی نووســـینگەی سەروەزیریشی تێدایە دەنێردرێتە لیبیا و وڵاتەکانی دیکە بۆ سۆراخپرسینی ســـەدر."[42] لێ هەر زوو دەنگۆ بڵاوبوونەوە. لەســـەرەتادا هەندێ وای بۆ چووبوون ســەدر دەگەڕێتەوە. بە گوێرەی قســەی کاربەدەســتە لیبییەکانی تەرابلســـیش بێ، "ئیمام لە ٢ی ئەیلوولدا لیبیای بەجێهێشـــتووە تا دوو هەفتەی ئارام لە پاریس بەســـەر ببا."[43] لە گەرمەی مانگرتنی 'لایەنگرانی ســـەدردا'، وەزارەتی کاروباری ناوەخۆی ئیتالیا داوای لە دەســـەڵاتدارانی مـالّتـا کردبوو بەدوای ئەوەدا بگەڕێن ئـاخۆ ئیمـام لەوێوە بەرەو ڕۆمـا فڕیوە."[44] ئەوەش گوترابوو گوایە ســـەدر "ســـاغ و زیندووە یان لە ماڵتایە یـاخود لە نزیـک دەریـاچەی کۆمۆیە. ئەو لە لایەن ئـاژانەکـانی قەزافی دەســتبەســەرە و خەریکن دەرســی دەدەنێ."[45] کەچی پشـتیوانانی ســەدر مشـــتومڕیـان لەســـەر ئەوە بوو، جـانتـا و کەلوپەلەکەی لە یەکێـک لە میوانخـانەکـانی تەرابلس دۆزراوەتەوە و بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەک بۆ گەشتکردنی بۆ ئیتالیا هەبێ.

دەســـتبەجێش گومان لە عەقید معەمەر قەزافی کرا. ئاخر پەیوەندی ئەو لەگەڵ سەدردا تەمومژاوی بوو. دوای هەڵگیرسانی شەڕی ناوەخۆ، قەزافی لە ئـایـاری ١٩٧٥دا هەڵمەتێکی لە دژی ســـەدر ڕاگەیـانـد. لە ڕوانگەی قەزافییەوە، جووڵانەوەی بەشـــخوراوان (حرکەت مەحرومین)ی ئەو پێگەی چەپەکانی لەنێو شـــیعەی لە باشـــووری لوبناندا لاوازکردبوو.[46] هەرچەندە

---

[42] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[43] Tripoli 01265_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 13 September 1978.

[44] Beirut 05640_d d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 27 September 1978.

[45] Beirut 05714_d d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 30 September 1978.

[46] Beirut 213/303, SAVAK Documents, 2 June 1975.

سەدر دوای پێکهێنانی ئەمەل لە ئەیلوولی ١٩٧٥دا سەردانی لیبیای کرد و ساواکیش وەهای گوت گوایە قەزافی بەڵێنی پێداوە پشتگیری سیاسەتەکانی ئەو لە لوبناندا بکا.[٤٧] کاتێکیش سەدر لایەنی سوپای سوریا و مارۆنییەکانی گرت بۆ پشتشکاندنی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی، دیسان پەیوەندی لەگەڵ لیبیا تێکچووەوە. لەڕاستیشدا، سەدر ڕەتیکردەوە داواکانی قەزافی جێبەجێ بکا. دەگوترا برە پارەیەکیش قەزافی بەخشیبوویە سەدر کەچی بزر بووە. قەدەر گوتی گوایە:

*قەزافی نزیکەی ١٢ ملیۆن دۆلاری بەخشیبووە سەدر تا هێزی ئەمەل و جەنگاوەرە فەڵەستینییەکان لەژێر ناوی ئەمەل ڕێکبخاتەوە. لە سەرەتاوە ئەمەل و فەڵەستینییەکان دوو سێ کردەی تیرۆرستانەیان سەرکەوتووانە کردبوون. لێ هەر کەمێک دوای ئەوە، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو سەدر ڕەتیکردەوە بەگوێرەی پلانەکە بەڕێوە بچێ... کاتێکیش قسەکە گەیشتەوە بەر گوێی قەزافی، داوای گەڕاندنەوەی برە پارەکەی لێکردەوە، بەڵام سەدر دەستوەردانی لیبییەکانی لە سیاسەتی ناوەخۆی لوبناندا ڕەتکردەوە. قەزافیش لەو کاتەوە بەدوای کاتێکی لەباردا دەگەڕا تا سزای بدا.*[٤٨]

ساواکیش لەسەر بنەمای سەرچاوە هەواڵی سورییەوە ڕاپۆرتێکی ئامادەکردبوو، تێیدا مشتومڕی لەسەر ئەوە کردبوو:

*عەقید قەزافی بە سیاسەتی سەدر لە باشووری لوبنان و پێگەی بەهێزی ئەو لە نێو گرووپە فەڵەستینییەکان خۆشحاڵ نەبوو. هەروەها قەزافی سەدری بە کەسێکی ئسوڵی، دیندار و پشتبەستوو بە باڵی ڕاستڕەو [ی لایەنە لوبنانیەکان] دانابوو. هەروەها سەدریش ئەو پارەیەی قەزافی بەخشیبووی لە جیاتی ئەوەی لە ئامانجە سیاسییەکانی قەزافی خەرجی*

---

[47] Beirut 213/1022, SAVAK Documents, 30 August 1975.

[48] Interview of General Mansour Qadar with Gholam-Reza Afkhami in the Oral History of Iran Program, Foundation for Iranian Studies, Bethesda, MD, US, 1986.

*بکا، دابوویە شـیعەکان. هەر بۆیە قەزافی نیازی وەهابوو بیگرێ و سـزای بدا.*[٤٩]

ڕەفعەت ئەسـەد، برای حافز ئەسـەد و سـەرۆکی دەزگای ئاسـایشـی سوریاش، بە سەرتیپ عەلی مورتەزای باڵوێزی ئێران لە سوریا و جێگری بەڕێوبەری پێشووی ساواکی گوتبوو؛[٥٠] قەزافی نەخشەی کوشتنی سەدری هەبووە.

لە ڕاستیشدا قەزافی چاوەڕێی ئەوەی دەکرد سەدر بە تەواوی گوێڕایەڵی ئەو بێ. هەروەک یەزدیش لێدوانی دا؛ "سـەدر پەیوەندییەکی دۆسـتانەی لەگەڵ سـەرکردە عەرەبەکـانی هەرێمەکەدا هەبوو، **بەڵام ئەو هەرگیز نەیدەپەژراند ببێتە ئـاژانێکی ئەوان.** لەگەڵ ئەوەشـدا قەزافی وای ڕەچاوکردبوو سەدر ببێتە پیاوە بەڵێگۆی ئەو."[٥١] هەرچۆنێک بێ هەڵوێستی دژەشیعەی قەزافی دەکرێ پاڵنەرێک بێ بۆ کوشتنی سەدر. کۆلۆنێل جۆلود Colonel Joloud، دووەمین پیاوی بەهێز لە تەڕابلس، گوتی گوایە کاتێ ئەو لە ئیماراتی عەرەبی بووە، هەموو شـیعەکان سـیخوڕ بوونە.[52] بە گوێرەی ساواکیش بێ، "قەزافی لە شیعە ڕەشبین بوو".[٥٣] **لەپاڵ ئەمەشدا، دیارنەمانی سـەدر دەکرێ بۆ ڕەخنەی سـەدر لە قەزافی بگەێتەوە، کە گوتبووی دیکتاتۆرەکەی لیبیا لەبارەی ئیسـلامەوە کاڵفامە.** بە گوێرەی کابرای لیبی عەبدولڕەحمان شـەلقەمیش، ئەوا **هەواری بومدیەن قەناعەتی بە سـەدر هێنابوو کە بچێتە تەڕابلس.** لەو کاتەشـدا قەزافی ڕوانینێکی سەیری لەبارەی قورئان و ئیسلام ڕاگەیاندبوو. هەر بە گەیشتنی سەدر بۆ تەڕابلس، ڕابەری شـیعە ڕەخنەی لە قەزافی گرت و پێیگوت، "تۆ هیچ

[49] SAVAK Documents, No 618/213, 1 November 1978.

[٥٠] ناوی ڕاستەقینەی مورتەزاد عەلی ناخیری ئیسفەهانی بوو.

[51] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

[52] Al-Havadeth, No. 144, 13 October 78.

[53] SAVAK Documents, No 618/213, 1 November 1978.

لەبارەی ئیســلامەوە نازانی. تۆ ســووکایەتی بە ئیســلام و پێغەمبەرەکەی دەکەی." ئەو هەڵوێستەی سەدریش قەزافی زۆر تووڕە کردبوو.[٥٤] هەروەها چەمرانیش ئاماژەی بەو دەمەتەقێیەی نێوان ســەدر و قەزافی لەبارەی ئیســلامەوە دا. چەمران گوتی؛ ســەدر بە قەزافی گوتبوو کە "ئەگەر شــەریعەتی ئیســلامی پێشــێل بکەی، ئەوا بەگوێرەی دین بێ، ژنەکەت لێ حەرامە، چونکە لەسەر بنەمای شەریعەت لێت مارەکراوە. کارەسات دەبێ ئەگەر هاتوو شەریعەتی پیرۆزی ئیســلامی ببەزێنی."[٥٥] بەگوێرەی قســەی قەدەریش بێ، دوای ئەوەی سەدر لە دامەزراوەیەکی دینی وتاری دا، ئینجا قەزافی بینی. قەزافی لە دانیشتنەکەدا سووکایەتی پێکرد و ئینجا فەرمانی بە کوشتنی سەدر و دوو یاوەرەکەی دا. **لە مۆڵگەیەک لە دووری ٣٠ کیلۆمەتر لە باشــووری ڕۆژئاوای تەرابلســەوە کوژران.** دیپلۆماتێکی لیبی ئەو زانیارییانەی دابووە باڵوێزی لوبنان لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان."[٥٦] ڕەتکردنەوەی ســەدر بۆ ئەوەی بکەوێتە داوی پەیوەندی ئەفســەر-ئاژان لەگەڵ قەزافی دژەشــیعە، ئەو کەســەی کۆمەکی دارایی پێشــکەش ســەدر کردبوو، هەروەهــا ســەدریش ڕەخنەی لە زانیــاری قەزافی لەبــارەی ئیسلامەوە لێگرتبوو، هەموو ئەمانە ڕێخۆشکەربوون بۆ بێسەروشوێنبوون یان مەرگی.

کاربەدەســتە ئەمریکییەکانیش گومانیان لە قســەکانی قەزافی هەبوو. بە گوێرەی نووسینگەکانی بەیروت و تاران، نزار فەرەحاتی بەرپرسی لوبنانی "لەپڕ لە ١٩ی ئەیلوولدا تەرابلسی بەجێهێشت... ئێمە گومانمان پەیداکردووە لەوەی ئەو پتر لە هەر کەســێکی خۆجێی دەیزانی... دەکرێ باڵوێزخانەی

---

[54] Shalgham, Abdel Rahman, Sabz va Siah [Green and Black], translated by Ali Mousavi Khalkhali (Ozam Publisher, Tehran, 1392).

[55] See http://www.mashreghnews.ir/fa/news/459203.

[56] Interview of General Mansour Qadar with Gholam-Reza Afkhami in the Oral History of Iran Program, Foundation for Iranian Studies, Bethesda, MD, US, 1986.

بەیروت بۆی دەربکەوێ، کە فەرەحات زانیاری زێدەباری لە دوای خۆی لەبارەی پرســە ئەفســووناویەکی ونبوونی ئیمام بەجێهێشــتبێ."[57] هەروەها ئەوان لە وەزیری کاروباری دەروەی لوبنان لە (بوترس)یش نزیکبونەوە. "بوترس گوتی ئەو بانگی فەرەحاتی کرد تا گوێی لێبێ ئاخۆ چی لەلایە. ئەو دەبووایە بگەڕابایەوە تەرابلس. وەک ئەو و ئەوانی دیکە باســـیان کردبوو، دیاربوو وەک لیبییەکان گوتبوویان، ئیمام نەچوبووە ڕۆما. ئەو نەیدەزانی ئاخۆ قەزافی چی لەبن سەردا هەیە."[58] هەروەها پارکەر ئەو ڕاپۆرتەشی دا:

*عەبدوللەتیف زێن، ئەندام پەرلەمانی شــیعە دواتر پێی ڕاگەیاندنم، شــیعە بڕوایان وایە لیبییەکان درۆ بکەن. سەرکردەکان بە پێشوازی و ڕێوڕەسمی شکۆدارەوە... لەوێ قەزافی پێشوازی لێکردن و هەندێ دڵنیاشی کردنەوە، بەڵام هێشتا بەس نەبوو. معەمەر قەزافی پێیگوتبوون لە میوانە فەرمییەکەی، لە ئیمام موسـا زۆر پەسـتە، ئاخر ئەو ڕۆیشـت بەبێ ئەوەی جارێکی دیکە بیبینێتەوە، چونکە ئەو بە ڤیســـتیڤـالی ١ی ئەیلوول ســــەرقـاڵ بوو. ڕاســـتییەکانیش ئەوەیان دەرخســـت کە ئەم دەربڕینەی لایەنی لیبی پڕ لە کون و کەلەبەرە.* ***هەر بۆ نموونە، شــوێنەواری ئیمـام و یاورەکانی لە میوانخـانەیی تەرابلس بەجێمـابوون. ئەوان بە خۆشـــی خۆیـان ئەوێیـان جێنەهێشــتبوو.*** *میوانخانەکەش لەســەر قســەی خۆی بوو، گوایە ئەوان تا ڕۆژی ڕۆیشتنیان سێ ڕۆژان لەوێ مابوونەوە. بە تۆپزی تەلەفۆن بە ئیمام دەکرا، خۆ ئەگەر ئازاد بووایە ئەوا پێشـــتر تەلەفۆنی دەکرد. ئەو یان دیل بووە یان کوژراوە، کارەکەش لە لیبیا کراوە. زێن گوتی یەک لە هۆیەکان پشــتڕاســتکراوەتەوە ئەویش ئەو تێبینییەی قەزافی بووە بەوەی گوایە ئەو نیازی وەها بووە لە پڕۆژەکانی باشـــووری لوبناندا یارمەتی ئیمام موســـا*

---

[57] Tripoli 01335_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 24 September 1978.

[58] Beirut 05614_d o the U.S. Department of State, WikiLeaks, 26 September 1978.

*بدا، بەڵام هەرگیز یەک سەنتیشی نەداوەتێ. ئەوەش گوتراوە گوایە لەبەرئەوەی قەزافی دەستی لە ئیمام سەدر شوشتووە، چونکە ١٥٠ ملیۆن دۆلاری شوێنبزرکردووە کە لیبیەکان پێیان بەخشیوە. بە هەموو لێکدانەوەیەکی ئاوەزمەندانە ئەم قسەیە دوور بوو لە ڕاستی.*[٥٩]

گرووپە فەلەستینییەکانیش لە گومانلێکراوەکان بوون. دەستبەجێ ئەو گوتە بڵاوبوویەوە، کە سەدر بەدەستی لیبییەکان کوژراوە، ئەمەش لەسەر ئەو گرژییانەی لەگەڵ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینییەوە هەیبووە. ئەندام پەرلەمانەکەی شیعە، عەبدوللەتیف زێن گومانی لە فەڵەستینییەکان هەبو، ئەم کارەیان بەسەر سەدر هێنابی.[٦٠] تەنانەت یاسر عەرەفاتی سەرکردەی فەڵەستینییەکانیش ڕەخنەی لە ناڕەزایەتی سەدر لە بەرانبەر بنکەکانی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەڵەستینی لە باشووری لوبنان گرت. هەر ڕێکورەوان دوای دیارنەمانی سەدر، چەپەکانی لوبنان و فەڵەستینییەکان هەڵمەتێکی دژەسەدریان دەستپێکرد. هەروەک چەمرانیش لە نامەیەکیدا بۆ یەزدی نووسیبووی؛ "ئەوا ڕۆژانە دەنگۆیان بڵاودەکردەوە. لەسەر دیواری س(ص)ور نووسیبوویان، "سەدر پارەی برد و هەڵات."[٦١] دەنگۆی لەوەش بەهێزتر پەیوەندی بە ڕۆڵی جۆرج حەبەش لە کوشتنی سەدردا هەبوو. حەبەش دارِسابووە سەدر، ئاخر ئەو دژی نەخشەی چەککردنی جەنگاوەرە فەڵەستینییەکان بوو لە باشووری لوبنان، کە بەهۆیەوە دەبووە مایەی تێکدانی ڕەوشی ئابووری-کۆمەڵایەتی شیعە.[٦٢] موحتەشەمیپووریش بڕوای وەها بوو، کە "گرووپە فەڵەستینییەکان ڕۆڵیان

---

[59] Beirut 05614_d o the U.S. Department of State, WikiLeaks, 26 September 1978.

[٦٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[61] Yazdi, Ebrahim, Shast Sal Sabouri va Shakouri [60 Years of Patience and Gracefulness] (Tehran, Fall 1390, Nashr-e Majazi) Vol III, pp. 624–25.

[62] SAVAK Documents, No. 289, 32 July 1978.

لە دیارنەمانی سەدردا نەبووە،"[63] کەچی یەزدی بە مەحکەمی ئەوەی سەلماند، ئەوان ڕۆڵی دژواریان لە کوشتنی سەدردا هەبووە. "**نوێنەرێکی لیبی هاتە ماڵم و پێیگوتم ئەحمەد جبریل سەدری لە لیبیا کوشت. ئەو گوتی گوایە دوو تەرم لە ماڵەکەی جبریل شاردرانەتەوە کە هی سەدر و یەعقوبن."[64] پێدەچێ قەزافی لەسەر داوای فەڵەستینییەکان سەدری کوشتبێ.**

ئەوەی مایەی سەرنج بوو، **هەندێ دەنگۆ باسی ڕۆڵی سووریایان لە بێسەروشوێنبوونی سەدر دەکرد. بەپێی ئەوە بێ، گوایە حافز ئەسەد بە هەڵکشانی ڕۆڵی سەدر دڵگەرم نەبووە،** هەرچەندە لە دوای شەڕی ناوەخۆدا دەسەڵاتەکەی سنووردار بووبوو، لێ ئەو بە گشتی لە لوبنان و لەنێو شیعەش بەتایبەتی وەک بەربەستێک بۆ ئەسەد دەبینرا. مەنسور قەدەریش وەهای گوت، گوایە سووریا ڕۆڵی یەکلاکەرەوانەی لە بێسەروشوێنبوونی سەدردا هەبووە.

*"لە بەرایی ١٩٧٨دا، ڕەفعەت ئەسەد داوای لێکردم بچمە دیمەشق. لە دانیشتنێک لەگەڵ ئەو و لەگەڵ سەرۆک ئەسەددا جەختیان لەسەر دوژمنایەتی سوریا بۆ عێراق و نەخشەکەیان بۆ ڕوخاندنی ڕژێم لە بەغدا کردەوە. ئەوان گوتیان: 'ئێمە دەزانین ئێوەی ئێرانی ئاژان و ڕایەڵەی خۆتان لە کەربەلا و نەجەفدا هەیە. هەروەها ئێمە ئەوەش دەزانین هێشتا هەر پشتگیریی کوردی عێراق دەکەن. ئێمەش بۆ پشتیوانی کوردان دەدەینە پاڵ ئێوە. هەرچەندە سوریا هیچ سنوورێکی لەگەڵ ئەو هەرێمەی ژێر دەستی یاخیبووان لە باکووری عێراقدا نییە. بەم جۆرە دەمانەوێ ئێوە ڕێگەمان پێبدەن کە باری چەک و تەقەمەنی لە خورەمشەهردا دابەزێنین، ئینجا لەوێوە بیگەیەنینە دەستی کوردی عێراق [یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی تاڵەبانی]. بە چڕکردنەوەی پشتیوانی بۆ ئەوان دەکرێ دەستوپێی سوپای*

---

[63] Interview with Ali-Akbar Mohtashamipour, Tehran, February 2016.

[64] Interview with Ebrahim Yazdi, Tehran, April 4, 2016.

عێراقی لە کوردستان ببەسترێتەوە، ئینجا دەتوانین بە پشتیوانی ئاژانەکانی ئێوە لە نەجەف و کەربەلا ڕێبەرایەتی کودەتایەک بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی بەغدا بکەین. لە بەرانبەریشدا کارێکی وەها دەکەین لە بەرژەوەندی ئێوەدا بێ. منیش باری خاوکردنەوە ئاساییبوونەوەی نێوانی ئێران و عێراقم بەگوێرەی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە ١٩٧٥ بەبیر هێنانەوە. لێ ئەوان هەر سووربوون لەسەر هاوکاریکردنی لەگەڵ ئێران و بەڵێنی داخستنی حەوزەی زەینەبە و گرتنی ئاخوندەکانی [دژەشاشیان] دا. ئەوەی لەوەش پتر مایەی سەرنج بوو، **ئەوان بە ڕوونی ئەوەیان گوت گوایە کە 'بە هاتنی هاوینی ١٩٧٨ چیدی موسا سەدر لەسەر گۆڕەپانی سیاسی لوبناندا نامێنێ'**. منیش بە هێدمەگرتن بەو قسەی ئەوانە پرسیم؛ 'مەبەستتان لە پرسی سەدر چییە؟' ئەوانیش لە وەڵامدا گوتیان؛ **'شا خۆی دەزانێ'**. بە حوکمی پرسە پێوست و سەرنجڕاکێشەکە نەگەڕامەوە بەیروت بەڵکو بە گەشتەفڕینی بریتانی بەرەو تاران فڕیم. کاتێکیش چاوم بە شا کەوت و وردەکاری دانیشتنەکەم بۆ ڕوونکردەوە، ئەو بە توندی خستنەڕووەکەی سوورییەکانی ڕەتکردەوە و گوتی، **'ئێمە پێشتر کێشەی هەڵگەڕانەوەی کوردی و سنوورمان لەگەڵ عێراقدا چارەسەرکردووە.'** لێ کاتێ من پرسی سەدرم هێنایە پێشەوە، ئەو دەستبەجێ قسەی پێبڕیم و گوتی؛ **'بەڵێ، ئەوان [سوورییەکان] دەیانەوێ سەید موسا سەدر بکوژن.'** دوای ساتێک لە بێدەنگی، شا پێیگوتم؛ **'دەی پێیان بڵێ کاتێ ئەوان باری چەکیان لە خورەمشەهر دادەبەزێنن ئێمە چاوپۆشی لێدەکەین. ئێمە خۆ تێهەڵناقورتێنین.'** ڕێک و ڕەوان بەرلەوەی شا کۆشکەکە جێبێڵێ، ئەمەشی خستەسەر، '[پلانەکەی سوورییەکان] بەو سەیدە گەوجەش بڵێ.' وێڕای ئەو هەموو سەرئێشەیەی سەید [بۆ ئێرانی] دروستکردبوو، شا هەر پیاوێکی بەهەستوسۆز بوو، نەیدەویست کەس ئازاری پێبگا. دوای گەڕانەوەم بۆ دیمەشق، وەڵامی شام بۆ ڕەفعەت ئەسەت گەڕاندەوە. **لە میانەی خۆپیشاندانەکانیش خێرا باری چەکوچۆڵەکە گەیشتە خورەمشەهر، کەچی بەشێوەیەکی سەرسامانە ئەو چەک و تفاقەی سوورییەکان ناردبوویان،**

***لەلایەن کاربەدەستانی ئێرانییەوە دەستی بەسەرداگیرا.*** *سەرکردە سورییەکان بە توندی کاردانەوەیان نواند. منیش پێمگوتن هەر دەبێ هەڵەتێگەیشتنێک هەبێ ، ئاخر شا پێشتر فەرمانی خۆی دابوو. لەو نێوەشدا، سەدر نەخشەی بۆ چوونە لیبیا کێشا بوو. ڕێک و ڕەوان بەر لە گەشتەکەی داوام لە جەعفەر، کە بزنسمانێکی عێراقی بوو، زۆر پەیوەندی بە سەدرەوە هەبوو، بەڵکو دانیشتنێکم لەگەڵ سەدر بۆ ڕێک بخا. نەخشەم ئەوەبوو سەدر لە پلانی سورییەکان ئاگادار بکەمەوە، بەلام لە سەروبەندی شۆڕشی ئیسلامیدا، ئەو ڕەتیکردەوە بمبینێ. لەکاتێکدا من سووربووم لەسەر ئەوەی جەعفەر قەناعەت بە سەدر بهێنێ تا بمبینێ، لێ جەعفەر وەلامی دامەوە؛ 'سەید ناتوانێ جارێ تۆ ببینێ، چونکە لوبنانی بەرەو دیمەشق بەجێهێشتووە و ئینجا لەوێشەوە بەیانی بۆ تەرابلس دەفرێ.' [65] کاتێ قەدەر گوتی گوایە "ئەوە پلانی دیمەشق بوو تا سەدر بکوژن، بەلام بەهۆی کاریگەری سەدر لەسەر عەلەوییەکانی سوریا، لێگەڕان لیبییەکان سەدر بکوژن." [66] هەروەها ئەو ئەوەشی گوت؛ "ئەسەد گرژیی نێوان سەدر و قەزافی وەها بەکارهێنا، کە بە ناپاک لەقەڵەمی بدا بەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکییەکاندا هەیە.* ***ئەسەد پاڵی بە سەدرەوە نا تا بچێتە تەرابلس، بەڵکو لەوێ خۆی لەگەڵ قەزافی ئاشت بکاتەوە، بەلام ڕاستییەکەی بۆ ئەوەبوو تا لەوێ قەزافی بیکوژێ."*** [67]

قەدەر ئەوەی گوت گوایە سەرانی سوریا بۆیە نەخشەی کوشتنی سەدریان دارشتبوو، تا شا بەوە پاداشتیان بداتەوە ڕێگەیان بدا پشتی کورد بگرن. لە پاش (٣٠) سی ساڵ، دوای هەرە خوێناوییەکەی ڕژێمی قەزافی، ئەوەبوو قەزافی خوێنڕێژ بەشێوەیەکی تەمومژاوی ئەوەی گوت، گوایە حافز ئەسەد

[65] Interview of General Mansour Qadar with Gholam-Reza Afkhami in the Oral History of Iran Program, Foundation for Iranian Studies, Bethesda, MD, US, 1986.

[66] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[67] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ڕۆڵێکی کلیلئاسـای لە بێسـەروشـوێنکردنی سـەدردا گێڕاوە.[٦٨] لەمەش سـەرنجڕاکێشـتر، مەنسـور قەدەر ئەوەی گوت گوایە، شـا پێیگوتووە سـەدر لە پیلانەکە ئاگاداربکاتەوە. تۆ بڵێی ئەمە لەبەر هەسـتوسـۆزی شـاوە بێ یاخود ئەو پلانی خۆی لەبارەی سەدرەوە هەبووە؟

## ڕێککەوتنی نهێنی شا-سەدر؛

وردە وردە لە لایەن کۆمەڵگەی شیعەوە لۆمەی شـا کرا، لەوەی سـەدر بێ سـەروسـۆراغ ڕۆیشـتووە. چەندین دەنگۆش هەبوون گوایە ئیسـرائیل یان سـی ئای ئەی سـەدریان ڕفاندووە و ئینجا ڕادەسـتی تارانیان کردۆتەوە.[٦٩] هەر بەڕاسـتیش، بێسـەروشـوێنبوونی سـەدر بەوە لەقەڵەم درا گوایە "پیلانێکی ئیسـرائیلییە بۆ لەیەکترازاندنی ڕیزی موسـڵمانانی لوبنان".[٧٠] هەروەها سـی ئای ئەیش بە ڕفاندنی سـەدر تۆمەتبار کرا. پارکەر ڕاپۆرتی خۆی بەم شـێوە دا؛ "تا دێ ئەو گۆبەندە ئەفسـوناوی و تەومژاویتر دەبێ. تا ئەمڕۆش لۆمەی ئێمە نەکراوە، بەڵام ئەمە درێژە ناکێشـێ. زۆر ناخایەنێ گوێمان لە چیرۆکێکی وەها دەبێ، کە دەزگایەکی هەواڵگریی وەک سـی ئای ئەی دەتوانێ ئەم کارە بەڕێکوپێکی بکا... لە ٢٥ی ئەیلوولدا، موفتی شیعە لە بەعلبەگ بە هەواڵنێرانی گوتبوو کە "بێسەروشوێنبوونی ئیمام بە هاوکاریی سـی ئـای ئەیەوە ڕێکخراوە."[٧١] بە گوێرەی قسـەی باڵوێزی ئەمریکا پارکەریش بێ، "زۆر لە موسـڵمانان ئەوانەی قسـەمان لەگەڵ کردوون،

[68] http://www.parsine.com/fa/news/267142.

[69] SAVAK Documents, No. 211/287, 21 July 1978.

[70] Beirut 05476_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 20 September 1978.

[71] Beirut 05614_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 26 September 1978.

بڕوایان وەهایە کە هێشـــتا لە لیبیایە، یان لە لایەن ئێران، ســـی ئای ئەی یاخود کەسێکی دیکەوە ڕفێندرابێ.[72]

ســـەرکۆنەکردنی ئیســـڕائیل و ئەمریکـا و لە کۆتـاییشـــدا ئێران بۆ بێسەروشوێنبوونی سەدر لە کۆتایی حەفتاکان ڕێک لەگەڵ تەشەنەسەندی هەستونەستی دژەشا دەهاتەوە. مەنسـور قەدەر ئەوەی خوارەوەی گوت: "کاتێک سۆراغی سەدر نەما، شیعەی لوبنان پەلاماری باڵوێزخانەی ئێرانیان لە بەیروت دا، ئاخر ئەوان پێیانوابوو دوژمنی سەرەکی سەدر باڵوێزخانەی ئێرانە. لێ کوڕەکەی سەدر خەڵکەکەی هێورکردەوە و داوای لێکردن لەبری باڵوێزخانەی ئێران بچن لەبەردەم باڵوێزخانەی لیبیا گردببنەوە."[73] کەتائیبی مارۆنییەکانیش گوتیان گوایە ســەدر چووەتە نەجەف تا ئایەتوڵڵا خومەینی ببینێ، تا لەوێ هاوکارییان لە دژی شـا چڕتربکەنەوە.[74] بەگوێرەی قســەی باڵوێز پارکەریش بێ، پێشـتر تاران ســەرزەنشـتی ســەدری کردبوو بەوەی گوایە ســـەدر ئەو پارەیەی بۆ لوبنان چووە، بۆ ئەوەی شـــیعەکانی لوبنان ســـوودی لێببینن، کەچی ســـەدر دەســـتی تێوەرداوە و بزری کردووە.[75] ڕۆژنامەی بەهەڕمێنی چەپخوازی لوبنانیش ئەلســەفیریش وەهای نووســی، گوایە شـا لە پشتی بێسەروشوێنبوونی سەدرەوەیە، سووورربووە لەسـەر ئەوەی گوایە سەدر لە لایەن دەزگای ئاسایشی ئێرانییەوە ڕفێنراوە، چونکە پشتگیری ئایەتوڵڵا خومەینی و شۆڕشگێڕە ئێرانییەکانی کردووە.[76] لەگەڵ

---

[72] Beirut 05430_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 19 September 1978.

[73] Interview of General Mansour Qadar with Gholam-Reza Afkhami in the Oral History of Iran Program, Foundation for Iranian Studies, Bethesda, MD, US, 1986.

[74] SAVAK Documents, No. 5921, 14 July 1978.

[75] Beirut 05339_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 13 September 1978

[76] Beirut 05339_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 13 September 1978;

تێپەڕینی کاتیش، ئەو ڕامانەی گوایە ئێران لەپشـــتی شـــوێنبزرکردنەوەکە بووە، لەبەیندا نەما. هەروەک (زین)ی نوێنەری شـــیعەش لێدوانی دا؛ "خۆ ئەگەر ســـــەدر چووبایە ئێران یان عێراق، وەک هەندێک وەهای بۆ دەچن، ئەوا تا ئێستا پەیدابووبووەوە."[٧٧]

ئەوەی ڕاســـتی بێ، هەردوولایان، چ شـــای ئێران و چ ســـی ئای ئەی بە بێســـەروشـــوێنبوونی ســـەدر هێدمەگرتی بوون. ســـەرباری گرژیی توند و لەنێوان ســـەدر و تاراندا، لی شـــەپۆلی نەپچڕاوەی خۆپیشـــاندانەکان وای لە تاران کرد بەســـــیاســـــەتی خۆی دەرهەق بە عولەمای شـــیعەدا بچێتەوە. هەرچەندە شا لە کودەتاکەی ١٩٥٣ەوە مەیدانی سیاسی لەسەر هەردوولای مارکسی و ناسیونالیستەکان توند کردبوو، کەچی خۆپیشـاندانی سەرەکی لای ئاخوندە شیعەکانەوە سەریهەڵدا. کاتێکیش خۆپیشـاندانەکان شـارەکانی دیکە، بەدەر لە تاران بڵاوبوونەوە، ئیدی نزیکبوونەوە لە عولەمای نەرمڕەو بە ســـــەدریشـــــەوە بووبووە مایەی ئەوەی بایەخی زیاتریان پێبدرێ. بە پێچەوانەی ڕاپۆرتەکانی مەنســـــور قەدەر، ســـــاواک وەهـای دانـابوو کە نزیکبوونەوەی وردە وردەی سـەدر لە خومەینی و لایەنگرانی بۆ پێویسـتی کۆمەکی دارایی بووە.[٧٨] لەڕاســتیدا، ســاواک ئاگای لە گرژیی نێوان کەســـە لایەنگرەکانی خومەینی و ســـــەدر هەبوو. ســـــەربارەی ناکۆکییان لەبارەی کێشـــــەی فەڵەســـــتینییەکـان، ئیـدی مەرجەعیەتی ئـایەتوڵڵا خومەینی، سەروسەودای لەگەڵ شا، ڕوانینی سەدر بۆ ویلایەتی فەقیهـیش لە پرسە پڕ لە مقۆمقۆکان بوون. دیاربوو سەدر بڕوای بە ڕێبازی ویلایەتی فەقیهی خومەینی نەبوو. بە گوێرەی قسەی موحتەشەمپوور بێ، سەدر پشتیگیری هزری شۆڕشی ئیسلامی کردبوو، چونکە "دەکرا ڕژێمێکی دیموکراسی لە

---

Tripoli 01290_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 15 September 1978.

[77] Beirut 05614_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 26 September 1978.

[78] SAVAK Documents, No. 334, 12 November 1977.

ئێران یارمەتی ئەوە بدا دیکتاتۆرەکانی دیکە ڕامالّی؛ لەوەی ویلایەتی فەقیهـ بچەسـپێنی... **سـەدر هەرگیز بە ویلایەتی فەقیهـــــ ڕازی نەبوو، ئاخر ئەو هەرگیز پەســـەندبوون و نـاپەســـەندبوونی خۆی بۆ ڕێبـازی ئیمـام دەرنەبڕی.**"[٧٩] بە زیاتر تەشـــەنەســـەندنی قەیران لە ئێران، ئەوەبوو تاران فەرمانی بە مەنسـور قەدەر کرد دەسـتبەرداری سـیاسـەتی دوژمنایەتی بێ لەگەڵ سـەدر. کاربەدەسـتانی سـاواک پێشـنیازیان کرد وەها باشـترە بە ناردنی قورئانێک بۆ سەدر لێی نزیک ببنەوە. دەستبەجێش ئەم پێشنیازە لە لایەن قەدەرەوە ڕەتکرایەوە.[٨٠] هەرچۆنێک بێ قەدەر ئەو پیاوە دەسـەڵاتدار و بەهێزە نەمابووەوە کە ڕێگر بێ لە وەرچەرخانی سیاسەتی ئێران ڕووەو سـەدر. لە ڕاپۆرتێکی سـەرسـامانەدا کە هەر سـێ هەفتە بەر لە بێسوروشوێنبوونە تەلیسماوییەکەی سەدردا نووسرابوو، لە کۆتاییدا قەدەر گۆڕا بوو –ئەوەی ڕاستی بێ ناچارکرا بوو بگۆڕێ- بۆ تارانی نووسیبوو، "باشتر وایە کار لەگەڵ سەدردا بکرێ لەوەی دژایەتی بکرێ."[٨١]

لە ئێرانیش گێڕانەوەیەک هەبوو، دڵگۆڕانی لەپڕی ئێران دەرهەق بە سـەدر بۆ "ڕێککەوتنێکی تاران لەگەڵ ئەو دەگەڕایەوە." جەعفەر شـەریف ئیمامی، سەروەزیری ئێران لە دانیشتنێکی لە ٢ی ئۆکتۆبەری ١٩٧٨دا لەگەڵ ویلیام سـەلڤیان، دوایین باڵوێزی ئەمریکا لە تاران و ئەنتۆنی پارسـنس، باڵوێزی ئینگلیسـتان لە تاران ئەوەی گوت گوایە؛ "حکومەتەکەی ئەو بە ماوەیەکی

---

[79] هەروەها موحتەشەمپوور ئەوەشی گوت کە "ئامۆزای سەید موسا، واتە سەید ئایەتوڵلا محەمەد باقر سـەدریش لەگەڵ ئیمام [لەبارەی ویلایەتی فەقیهـــ] کۆک نەبوو. تاکە شتێک کە محەمەد باقر سەدر کردبێتی، ئەوەبوو حزبی دەعوەی ئیسلامی بەرفرەوانکرد بەوەی سیاسەتی بە ئیسلامبوون لە بنکەوە بگیرێتەبەر. ئیدی تەنیا دوای شـۆڕشـی ئیسـلامی بوو کە ئەو بەپێداگیرییەوە داوای لە لایەنگرەکانی ئەوەبوو دابڕسـێنە ڕژێمی بەعس لە بەغدا و ڕایگەیاند "توانەوە لە خومەینی دا وەک توانەوە لە ئیسلامدا وایە." Interview with Ali-Akbar Mohtashamipour, Tehran, February 2016. Hizb al- Dawa was established by Mohammed Sadiq Al-Qamousee in 1957.

[80] SAVAK Documents, No. 213/13264, 3 August 1978.

[81] SAVAK Documents, No. 213/13227, 20 July 1978.

کەم بەرلەوەی ئیمام سەدر لە لیبیا بێسەروشوێن بێ، پەیوەندی لەگەڵدا هەبووە." ئەو گوتیشی گوایە موسا سەدر ئامادە بووە پەیوەندی لەگەڵ ئایەتوڵڵا خومەینی بپچڕێنێ و پشتیوانی خۆی بۆ شا ڕابگەیەنێ. لە خاڵێکی ئاماژەپێکردنیشدا ئەو دەستەواژەیەی "ئێمە دامان بەزاند"ی بەکارهێنا. سەلیڤانیش ئەوەی بۆ زیادکرد، "ئەگەر ئەو ئیمامە مەکرۆیە هەر بەڕاستی لەگەڵ حکومەتی ئێران ڕێککەوتبێ، کەچی لە هەمان کاتدا وەهای ڕەفتار دەنواند کە کەناڵێکی پارەی لیبییەکانە بۆ خومەینی دەڕوا، کەواتە ئەم ڕاستییە توخمێک بووە بووەتە مایەی ئەوەی بێسەروشوێن بکرێ. من وەهای دەبینم کە عەقید قەزافی ئەوەی پێ هەرس نەبووە، سەدر ڕۆڵی ئاژانێکی دووسەرە ببینێ."[82] بەگوێرەی ئەو گێڕانەوە بێ، تەقەلای سەدر ئەوەبوو هێزوگوڕی ئایەتوڵڵا خومەینی بە لاڕێدا ببا"[83] سەید حوسێن نەسر، دۆستە نزیکەکەی سەدریش، پلانەکەی سەدری پشتڕاستکردۆتەوە. "جارێکیان گوێم لێبوو کە سەدر پلانێکی وەهای هەبوو بچێتە تاران تا ڕادیکالییەتەکە [ی شۆڕشگێران] بوەستێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو بێسەروشوێن بوو. نەسر وەهای بەرەنجامەکە خوێندەوە، هەر لەبەر ئەوە بووە قەزافی سەدری کوشت.[84] وێڕای ئەو ڕاستییەی کە پاسپۆرتەکەی لێسەنرابووەوە، کەچی سەدر لای چەندین کەسایەتی دینییەوە بینراوە، لەوانە هەر مانگێک بەر لە بێسەروشوێن بوونی لە ئێران لە لایەن سەید جەعفەر شاهی کە توێژەرێکی سەرەکی ئەدەبیاتی ئێرانی و مێژووی ئیسلام بووە، بینراوە. هەروەها ئەگەری ئەوەش هەبووە سەدر بە توندییەوە یاری لەگەڵ ساواک و شا کردبێ. جا ئەگەر سەروسەودا هەبووبێ یان نا، ئەوا ئەم گێڕانەوەیە ئەوە بەدەردەخا،

---

[82] Tehran 09565_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 3 October 1978.

[83] See "The Shah of Iran, the Islamic Revolution and the Mystery of the Missing Imam," The New York Times, January 15, 2016.

[84] Interview with Seyyed Hossein Nasr, Baltimor, 24 February 2017.

کە شا گەشبین بووە لەوەی کارایانە بەرەی شۆڕشگێڕان بشکێنێ، ئەوەیش بە زیندووکردنەوەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لوبناندا.

**بێسەروشوێنبوونی سەدر و شۆڕشگێڕە ئێرانییەکان**

دیاربوو گرژی درێژخایەنی سەدر لەگەڵ چەندین گرووپی شۆڕشگێڕی ئێرانی ژیانی خۆی خستبووە مەترسییەوە. ئەوەی جێگەی سەرنجیش بوو، زۆر لەو شۆڕشگێڕە دژەسەدرییانە لە لایەن قەزافییەوە کۆمەک دەکران. مەهدی فیرۆزیانی برازای سەدر و زاواکەشی بوو، پشتیوانانی قەزافییان تاوانبار کرد بەتایبەتی جەلالەدین فارسی کە ڕۆڵی کلیلئاسای لە بێسەروشوینکردنی سەدردا هەبووە. "هێشتاش هەندێ لە شۆڕشگێڕە هاوپەیمانەکانی قەزافی زانیاری دژوارییان لەبارەی بێسەروشوێنبوونی ئیمام سەدرەوە لەلایە."[٨٥] ئەو بڕوای وەها بوو کە ئەوەی بەسەر سەدردا هات، پەیوەندی بە پلانی لیبییەکانەوە هەبوو ئەوەی جێدەستیان لەنێو شۆڕشگێڕەکانی ئێرانیدا کاریگەر بێ.

*معەمەر قەزافی هەوڵیدا لەنێو پێگەی پلە باڵاکاندا [لەنێو شۆڕشگێڕاندا] شۆڕشەکە بەلای خۆیدا بشکێنێتەوە. هەرچۆنێک بێ ئەو نەیتوانی دزەبکاتە نێو ئەنجوومەنی شۆڕش. هاوپەیمانەکانی ئەو لە نەوەی دووەمی شۆڕشەکە بوون نەوەک لە بیچمە میللییەکان، هەروەک موتتەهەری و بەهەشتی. هەربۆیە قەزافی پشتی جەلالەدین فارسی بۆ پۆستی سەرۆکایەتی گرت، بەڵام دواتر لە ڕێی ئەنجوومەنی شۆڕشەوە لادرا و پیلانەکەی قەزافیش لەباربرا.*[٨٦]

بە گوێرەی قسەی فەیروزیان بێ، "لیبیا لەنێو سوپای پاسدارانی شۆڕش، لە بەربژێرانی سەرۆکایەتی و لە نێو مەرجەعییەتدا بەدوای هاوپەیماندا

[85] Interview with Mehdi Firouzan, Imam Musa Sadr's son-in-law, See http://fararu.com/ fa/news/88120.

[٨٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دەگەڕا.[٨٧] هەروەها ئەو ئەوەشـــی گوت؛ "فارســـی یەکێک لە هاوپەیمانە نزیکەکانی قەزافی بوو. ئەو بە دۆســـتایەتییەکەی شـــاناز بوو."[٨٨] هەروەک ســـادق تەباتەبائیش باســـیکرد، "لە وەڵامی چارەنووســـی ســـەدردا، خودی عەبدولســـەلام جەللود گوتبووی؛ "بڕۆن لە جەلالەدین فارســـی بپرســـن."[٨٩][٩٠] پێدەچوو بیســـەروشـــوێنبوونی ســـەدر لەگەڵ ســـەرهەڵدانی ململانێی هێز و دەسەڵات لەنێو شۆڕشگێڕە ئێرانییەکاندا تێکچڕژاو بووبێ.

لە پاڵ پیلانەکەی لیبیا، شۆڕشگێڕە لایەنگرەکانی سەدر مشتومڕیان لەسەر ئەوە بوو، لەبەر ڕۆڵی ســەدر خۆی لە شــۆڕشــی ئیســلامیدا ڕفێندراوە یان کوژراوە. چەمران وەها هاتەگۆ:

*هەرچی لەبارەی جەنابی خومەینی و شـۆڕشـی ئێرانەوەیە، پێویسـتە ئەوە بڵێم کە عەرەب، چەپەکان و فەڵەستینییەکانیش لە شۆڕشی ئێران دەترسان و ئەوەشــمان بیســت کە ئەوان ســووکایەتییان بە خومەینی و شــۆڕشــی ئێرانەوە دەکرد. هەنــدێــک بڕوای وەهــابوو کە جەزائیر، ســـــوریـــا و فەلەســـتینییەکـان لەگەڵ لیبیا لە دژی ســــەدر یەکیـان گرتووە... ئەوان هەموویان لە شــۆڕشــی ئێران دەترســان. ئەوان هەموویان دەیانزانی کە سـەدر هاندەری کارای شـیعەیە لە دەوڵەتە عەرەبییەکان و بە سـەرکەوتنی خومەینیش، سەرکەوتنی شیعە نزیک بوو. هەر بۆیە پێیان باشتربوو سەدر نەمێنێ و ڕێگربن لەوەی شۆڕشی ئێران بپەڕێتەوە نێو وڵاتە عەرەبییەکان. کەواتە پێیان بکرابایە سەدریان ڕادەمالی.*[٩٠]

ڕۆژنامەی ئەلئسبوع ئەلعەرەبیش مشتومڕەکەی وەها بوو؛

---

[87] http://imamsadr-news.com/article/1228.

[88] http://imamsadr-news.com/article/1228.

[89] Interview with Imam Musa Sadr's nephew, Sadegh Tabatabaie, See http://www. mashreghnews.ir/fa/news/65884.

[90] Yazdi, Ebrahim, Shast Sal Sabouri va Shakouri [60 Years of Patience and Gracefulness] (Tehran, Fall 2011, Nashr-e Majazi) Vol III, pp. 624–25.

*لەنێو ئەو هۆکارانەی بوونە مایەی بێســـەروشـــوێنبوونی ســـەدر، پێگە پێشـــبینیکراوەکەی بوو لەو شـــۆڕش[ی ئێران] دوای ســـەرکەوتنی... پەیوەندییەکانی ئیمام سەدر [لەگەڵ شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران] زۆر بەهێز و قووڵ و تەڕدەســـتـانە بوو. هەر بۆیە ئەو بووبووە ڕێنوێن بۆ سەرکردەکانی شۆڕشەکە، ئاخر یەکێکی وەک دکتۆر سادق تەباتەبائی کە برازای بوو، بووە یەکەمین جێگری سەروەزیر... بە سەرکەوتنی شۆڕشیش، پێگە و پایەی ســـەدر زیاتر بزوێنەر و کاریگەرتر دەبوو، چونکە دەبووە کەناڵی ســـەرەکی لەگەڵ نەتەوە و دەوڵەتەکانی عەرەبی. هەروەها دەکرا ببێتە نێوەنـدگیر لەنێوان لیبراڵە ئیســـلامییەکـان و بزووتنەوەی ئیمـام خومەینی. ئەم ڕۆڵەش ئەو توانستەی پێدەدا وەک ڕابەرێک (ڕۆڵێک لە لایەن سەدرەوە دەبینرا) تا هاوکاریی لەنێوان هێزەکاندا بچەسپێنی و ڕێگریش بێ لە پەیدابوونی قەیران.*[٩١]

لەپاڵ ئەمەشـدا، ئەگەری ڕۆڵی کلیلئاســای لە پێکهێنانی شـۆڕشـگێڕانەی ئێراندا، پێدەچوو چارەنووســـی ســـەدر لەگەڵ ســـەرکەوتنی ئایەتوڵڵا خومەینیدا ئاڵۆزوبڵۆز بێ. مەهدی فەیروزیان وەهای گوت؛

***بەر لە شۆڕشی ئیسلامی، ئیمام خومەینی پیاوێکی بەتەمەن بوو. لەوێدا لە ١٩٧٧-١٩٧٨ چەنـدین وتـووێژ لەبـارەی جێگـرتنەوەی ئیمـام لەنێو شۆڕشگێڕەکاندا هەبوو، مەراقبوون بزانن ئاخۆ چۆن بزووتنەوەی ئیسلامی لە دوای ئیمام درێژەی دەبێ. هەندێ لە شـــۆڕشـــگێڕان پشـــتی ئایەتوڵڵا مونتەزرییان دەگرت، گروپێکی دیکە بڕوایان بە ئایەتوڵڵا بەهەشتی هەبوو، گرووپی سێیەمیشیان پاڵپشتی ئیمام سەدر بوون. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کام لەو بەربژێرانە ئاگایان لەو باسوخواسانە نەبوو.***[٩٢]

---

[91] Al-Osboa al-Arabi, 19 August 1978.

[92] http://imamsadr-news.com/article/1100; http://fararu.com/fa/news/88120

**سادق تەباتەبائیش ئاماژەی بە گرووپی چوارەم دا، بەوەی پاڵپشتی ئەوەن ئایەتوڵڵا سـەید محەمەد باقر سـەدر لە دوای ئایەتوڵڵا خومەینییەوە رابەرایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی بکا.** ئەو باسی ئەوەشی کردووە، پرسی جێگرتنەوەی ئایەتوڵڵا خومەینی لەنێوان وتوویژی بەهەشتی-سەدریشدا هاتبووە پێشـەوە. "ئیمام موسا سەدر رێزی ئایەتوڵڵا سەید محەمەد باقر سەدری لابوو، ئەو لە گفتوگۆکەی لەگەڵ ئایەتوڵڵا سەید محەمەد حوسێن بەهەشـتیدا، ناوی ئامۆزاکەی وەک باشـترین جێگرەوەی خومەینی هێنابوو."[٩٣]

تەنانەت بەر لە پێکهێنانی کۆماری ئیسـلامیش، گرژی لەنێوان گرووپەکاندا تەقیەوە. ئەوەی راستی بێ، سەدر لە لایەن گرووپی لایەنگرانی مونتەزیری، ئەوانەی قەزافی پشتی دەگرتن، چەندین پرس وروژا. هەندێ لە توخمەکانی مونتەزیری، وەک محەمەد مونتەزیری، جەلالەدین فارسـی، ئەبو حەنیف، ئەبو شـەریف[٩٤] و ئەحمەد موەحیدی،[٩٥] مشـتومڕیان لەسـەر ئەوە بوو، کە سـی ئای ئەی لەپشـت بێسـەروشـوێنبوونی سـەدرەوە بووە.[٩٦] محەمەد مونتەزیری لە چـاوپێکەوتنێکی لەگەڵ رۆژنـامەی ئەلنەهـاردا، بەتونـدی تێوەگلانی لیبییەکانی لە بێسـەروشـوێنبوونی سـەدر رەتکردەوە، ئەو نۆکەرانی زایۆنیست و ئەمریکای بە رفاندنی سەدر بۆ ئیتالیا تاوانبار دەکا و ئەوەشـی گوت گوایە، "خۆ ئەگەر لیبییەکان نیازی کوشـتنی سـەدریان هەبووایە، ئەوا ئەو کارەیان لە بەیروت، لە سور(صـور) یان لە سەیدا یان لە هەر بسـتەخاکێکی دوور لە لیبیاوە دەکرد... لیبییەکان هۆشـمەندن و

---

[93] Tabatabai, Mohammad Sadeq, Kahterat-e Siasi Ejtemai [Social Diaries] (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) vol. 1, p. 174.

[٩٤] عەباس ئاغا زەمانی کە بە ئەبو شـەریفیش ناسـرابوو، یەکێک بوو لە فەرماندە یەکەمەکانی سوپای پاسدارانی شۆڕش.

[٩٥] لە دوای شۆڕش یەکەمین نوێنەری ئێران بوو لە لوبنان.

[96] Interview with Mehdi Firouzan, Imam Musa Sadr's son-in-law, See: http://fararu. com/fa/news/88120.

شتێکی ئاوەزمەندانەش نییە کە شتێکیان لە ئیمام موسا سەدر کردبێ".[97] ئەبو حەنیفیش ئەوەی گوت گوایە 'جەنابی موسا سەدر لیبیای بەرەو ڕۆما جێهێشتووە تا ژنەکەی ببینێ کە لە نەخۆشخانەیەک لە پاریس بوو. ئیدی سیخوڕەکانی مۆساد ئەویان لە هوتێلەکەی خۆی [لە ڕۆما] ڕفاندووە و بۆ زیندان لە ئیسرائیلیان بردووە. سەید موسا سەدر دوای ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر لە لایەن ئیسرائیلییەکانەوە شەهید کراوە."[98] ئایەتوڵڵا حوسێن مونتەزیریش کە جێگری خومەینی بوو، دوای کوڕە توندڕۆکەی لە لایەنگرانی قەزافییەوە گوتی؛ گوایە "لەبەر ئەم بەرڕەوتەدا ئەو ورووژاندنی پرسی سەدر [و تاوانبارکردنی لیبیا] لەبەرژەوەندی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەشکێتەوە!"[99]

بەڵێ، هەر بەڕاستیش شۆڕشگێڕە لایەنگرەکانی سەدر، کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەناو حکومەتی کاتی شۆڕشدا جێگەیان گرتبوو، بە پشتیوانی ئایەتوڵڵا مونتەزیری بۆ قەزافی بە دیداری خومەینی لەگەڵ عەقید مستەفا جەللودی لیبی هێدمەگرتی بوون. هەر وەک چەمران هێنایە گۆ؛

*من نازانم بۆچی ڕابەری شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران [بۆ نموونە ئایەتوڵڵا خومەینی] دەستی لەناو دەستی تاوانباران نا. ئەرێ ئێمە لەبەر خودا نەبوو کە شۆڕشمان کرد؟ ئاخر چۆن بمانەوێ شۆڕشەکە بە تاوانباران پیس بکەین؟ ئەوەبوو قەزافی بێ ئابڕوویانە ڕابەری شیعەکانی لوبنانی ڕفاند... لە کاتێکدا ئایەتوڵڵا [خومەینی] چەندین جار ڕەتیکردبووە چاوی بە قەزافی بکەوێ، ئەدی ئێستا چی ڕوویداوە کە جەللود دەچێتە ئێران؟ ئەرێ تۆ بڵێی*

---

97 http:// tarikhirani.ir/ Modules/files/Phtml/ files.PrintVersion. Html.php?Lang =fa&Typ eId=3&filesId=137.

٩٨ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٩٩ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

*لەوێ هیچ گۆڕانێک لە سیاسەتی ئێراندا ڕوویدابێ؟ یاخود ڕفاندن و کوشتن تاوان نین؟*[100]

سادق تەباتەبائیش گوتی؛ "لە مانگە بەراییەکانی دوای شۆڕش، ئەوانەی پەیوەندی سیاسی و هەستوسۆزیان بە قەزافییەوە هەبوو، تەنیا لە "پشتگیرییە بێمەرجەکەیان" بۆ شۆڕش سوودمەند بوون و ڕاشکاوانەش گوتبوویان کە بەرژەوەندییەکانی نیشتمانی [ئێران] و شۆڕشگێڕی نابێ بکرێتە قوربانی چارەنووسی تەلیسماوی بیچمێکی دیاریکراو."[101] تەباتەبایی ئاماژەی بە هەوڵوتەقەلای ئایەتوڵڵا مونتەزیری بۆ تەگەرەخستنە بەر لێکۆڵینەوە لە سۆراغی سەدر دا، ئەو وەهای لێدوان دا؛

*مەرجەعی ڕێزلێگیراو [ئایەتوڵڵا مونتەزیری] لە ژێر کاریگەریی کاربەدەستێکی لیبی، کە لە ماڵی ئەو بووە هاتە تاران و بە نیوەی شەوێ چاوی بە ئیمام خومەینی کەوت. ئەو نیگەرانی خۆی لە خەرجی و زیانی گەڕان [بەدوای سۆراغی سەدر] بۆ شۆڕشە تازە ساواکەی ئیسلامی و هۆی گرژییەکانی نێوان ئێران و لیبیاش دەربڕی گوایە هەر ئەمریکا سوودمەند دەبێ.*[102]

ئایەتوڵڵا مونتەزیریش لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا، وەها ئاماژەی پێکردووە؛

*ئێمە لەو بڕوایەدابووین کە پێویستمان بە پشتگیری بۆ شۆڕش هەیە. بە پێچەوانەی عەرەبستانی سعودی و ڕژێمەکانی دیکەی هەرێمەکە، قەزافی پشتیوانی خۆی بۆ سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی دەربڕی. من لەو بڕاویەدابووم دەبێ لەسەر گەڕان و سۆراغی سەدر بەردەوام بین، دەبووایە بە شێوازیکی دۆستانە [چارەنووسی سەدرمان] لە قەزافی*

---

[100] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[101] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[102] http:// tarikhirani.ir/ Modules/files/ Phtml/ files. PrintVersion. Html.php? Lang= fa&Ty peld= 3&filesld=137.

*پرســــیبووایە، نەوەک لە میدیاوە، لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا بمانکردبایە هەراوهوریا... لەو کاتەدا من دژی ئەوە بووم دوژمن بۆ خۆمان دروســـت بکەین.*[١٠٣] هەمووی بەسـەریەکەوە، جێگرتنەوەی ئایەتوڵڵا خومەینی ڕۆڵێکی سەرەکی لە بڕیاردان لە چارەنووسی سەدردا هەبوو.[١٠٤]

## لێکۆڵینەوەی شۆرشگێڕانە

بە سـۆراغنەمانی تەلیسـماوی سـەدر، مەلا و سـەرکردە شـۆڕشـگێڕەکانی ئێران بەدوای لێکۆڵینەوە و سـۆراغپرسـیندا گەڕان. ئایەتوڵڵا خومەینی لە تاراوگەنشینی خۆیدا نامەی بۆ هەریەک لە یاسر عەرەفات و حافز ئەسەد نووسی،[١٠٥] تا داوا لە تەرابلس بکەن بەڵکو پەردە لەسەر تەلیسمی ١٨ی ئۆکتۆبەری ١٩٧٨ هەڵبداتەوە.[١٠٦] ئایەتوڵڵا بەخۆی هەرگیز متمانەی بە دیکتاتوری لیبیا نەبوو. هەروەک عەلی جەنەتی، کە بووە وەزیری کەلتور و ڕێنمایی، گێڕایەوە؛ "ئێمە ئەوەمان خستە بەردەستی ئیمام [خومەینی]، دوای کۆتاییهاتنی ماوەی تاراوگەی لە پاریس ڕووبکاتە لیبیا. پێمان وابوو قایل دەبێ، بەڵام پەسـەندی نەکرد. ئەو بە ئێمەی گوت قەزافی هی ئەوە نییە

---

103 Montazeri, Hossein-Ali, Khaterat [Memoirs]. Tehran, 1378. pp. 197–8

١٠٤ هەروەها گوتەی پڕ لە مقۆمقۆش سـەبارەت بە ڕۆڵی تەمومژاوی بەهەشـتی لە کوشـتنی سـەدردا هەبووە. بە گوێرەی کتێبی The Good Spy، بیۆگرافیای ڕۆبەرت ئامس، بەرپرسـی ویسـتگەی سی ئای ئەی لە بەیروت ئەوکات، ئەوە بەهەشتی بوو قەناعەتی بە قەزافی هێنابوو تا سەدر بکوژێ. بڕوانە:

Bird, Kai, The Good Spy: The Life and Death of Robert Ames (2015) pp. 541–544.

105 Khomeini, Seyed Ruhollah, Sahifeh Emam (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini) Vol. III. p. 456; Khomeini, Seyed Ruhollah, Sahifeh Emam (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini) Vol. III. p. 479; Khomeini, Seyed Ruhollah, Sahifeh Emam (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini) Vol. IV. p. 45.

106 Khomeini, Seyed Ruhollah, Sahifeh Emam (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini) Vol. III. p. 347.

متمانەی پێبکرێ."[107] خومەینی لە دانیشتنێک لەگەڵ جەللوددا، فشاری ئەوەی خستەسەر هەر دوای ئەوەی دەگەڕێتەوە لیبیا بەدوای سۆراغی سەدردا بگەڕێ.[108] ئەو بە جەللودی گوت کە، "تراژیدیای جەنابی سەدر دەکرێ پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو نەتەوە و دەوڵەتەکە تێکبدا.[109] فەیروزانیش گوتی؛ "ئیمام بۆ قبوولکردنی قەزافی لەژێر فشارێکی قورسدا بوو. گەر ئەو داوای لە جەللود نەکردبا تا ئیمام سەدر بگەڕێننەوە، ئەوا هاوپەیمانەکانی لیبیا [لە ئێران] پلەو پایەی زۆر بالایان وەردەگرت."[110] "ئەو بە بێسەروشوێنبوونی زۆر پەست بوو، ئاخر بە شێوەیەکی گشتی بە نیشانەی بێڕێزی بۆ کۆمەڵگە دانا."[111] شیعەی لوبنان داوایان لە خومەینی کرد، بەڵکو پشتی هەوڵرتەقەلاکانی سۆراغپرسینی سەدر بگرێ. خومەینی لە دانیشتنێک لەگەڵ محەمەد مەهدی شەمسەدین، جێگری سەرۆک و پاشان سەرۆکی ئەنجوومەنی بالای ئیسلامی شیعە، هەروەک لەگەڵماڵباتی سەدر و ئەندامانی ئەمەلیشدا جەختی لەوە کردەوە، کە "سەدر ئەو پیاوە بووە من بەخێوم کردووە" و "ئەو یەکێکە لە منداڵە بەڕێزەکانم."[112]

---

[107] Jannati, Ali, Khaterat [Diaries] (Tehran, Markaz-e Asnad-e Enghelab-e Eslami) p. 43

[108] Khomeini, Seyed Ruhollah, Sahifeh Emam (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini) Vol. VI. p. 357.

[109] Ibid. Vol. VII. p. 118

[110] Interview with Mehdi Firouzan, Imam Musa Sadr's son-in-law, See: http://fararu. com/fa/news/88120.

[111] From Tehran, 1978BEIRUT05614_d, 26 September 1978.

[112] Khomeini, Seyed Ruhollah, Sahifeh Emam (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini) Vol. III. p. 456; Khomeini, Seyed Ruhollah, Sahifeh Emam (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini) Vol. XIII. p. 166; Khomeini, Seyed Ruhollah, Sahifeh Emam (Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini) Vol. XV. p. 5.

لەپاڵ ئایەتوڵڵا، عولەما دیینییەکانی دیکەش، لە نێویاندا ئایەتوڵڵا مەرعەشی نەجەفی، ئایەتوڵڵا تەباتەبائی قومی، ئایەتوڵڵا گوڵپایەگانی، ئایەتوڵڵا عەبدوڵڵا شیرازی، ئایەتوڵڵا شەریعەتمەداری و ئایەتوڵڵا تاڵەقانی بەدوای سۆراغی سەدردا گەڕاون. دەستەیەک پێکهاتبوو لە شێخ عەبدولقاسم ڕوحانی، حاجی سەید فازل میلانی و شێخ عەبدولحەسەن ئەسەدی بە نوێنەرایەتی ئایەتوڵڵا سەید عەبدوڵڵا شیرازی نێردرانە ئوردن و سوریا تا لەگەڵ سەرانی ئوردنی و سوری گفتوگۆ بکەن. "وەها ڕاگەیەنرا کە ئەو سێ مەلایە لە ٢٦ی ئەیلوولدا بەرەو دیمەشق فڕین تا چاویان بە سەرۆک حافز ئەسەد بکەوێ و داوای یارمەتی لێبکەن. هەروەها نەخشەیان وەهابوو سەردانی عەمانیش بکەن بەڵکو داوا لە شا حوسێنیش بکەن. وتەبێژی شیعەی ئێرانی گوتی هێشتا هیچ حکومەتێک بە شێوەیەکی ئەرێنی وەڵامی داوای باڵای ئێمەی بۆ یارمەتیدانی دۆزینەوەی سەدر نەداوەتەوە."[١١٣] لە شاری قومەوە، ئایەتوڵڵا محەمەد کازم شەریعەتمەداریش برووسکەیەکی بۆ قەزافی لێدا: "خەڵک لە هەموو وڵاتان دەزانن کە ئیمام سەدر بانگهێشتی وڵاتەکەی تۆ کرابوو پاشان بزر بوو... کەواتە هەموو موسڵمانان داوا لە حکومەتی لیبی دەکەن، ئەو بە لایەنی بەرپرسیاری بێسەروشوێنبوونەکەی دەزانن بۆ زانیاری لەبارەی لەشساغی خۆشگوزەرانی ئیمام."[١١٤] سەرکردەیەکی شیعە لە ئەوروپا، کە سەید مەهدی ڕوحانی بوو داوای لە جیسکاردیستانی سەرۆکی فەرەنسا کرد "بەڵکو فەرمانی لێکۆڵینەوە لە بێسەروشوێنبوونی سەدر دەربکا."[١١٥] ئاژانسی بڵاوکردنەوەی پارسی حکومەتی ئێرانیش بڵاویکردەوە؛ سەفیەدین نەبەوی، وتەبێژی حزبی

---

[113] Tehran 09307_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 26 September 1978.

[١١٤] کورتەیەک لە دەستپێشخەرییەکان و تێکۆشانی پەیوەست بە بێسەروشوێنبوونی ئیمام سەدر لە لایەن ئەنجوومەنی باڵای شیعە بڵاوکرایەوە.

[115] Tehran 09526_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 2 October 1978

ئازادیخوازانی ئیســـلامی ئەوەی گوت؛ لەوانەیە ســـەدر لە ژیاندا مابێ.[١١٦] نەبەوی ئەوەی گوت گوایە؛ "بەگوێرەی هەردوو ئەو کردەوەیەی لە لایەن حزبی ئازادیخوازانی ئیســـلامی و ئەو برووســـکانەی لە لایەن ســـەرۆک کارتەر و عەبدولســـەلام جەللودی ســـەروەزیری لیبیا وەرگیراون، وا دەردەکەوێ ئیمام سەدر لەژێر جڵەوی دەزگای ئاسایشی لیبیا دابێ." ئەو ئەوەشـــی خســـتەســـەر، کە ســـەدر لە نهۆمی خوارەوەی باڵەخانەیەک لە تەرابلس لەژێر چاودێرییەکی چڕ و توندا دەژی."[١١٧]

**دوایین هیوای شا**

لەپاڵ شـۆڕشـگێڕەکان، چەندین بیچمی دیکەی ناشـۆڕشـگێڕیش لەبارەی چارەنووسـی سـەدرەوە نیگەران بوون. لەسـەرووی هەموویان موحسـین پزشـــهپوور، ســـەرکردەی پارتی پان ئێرانی و ئەندامی پەرلەمان بوو. هەرچەنـدە پزشـــپوور بیچمێکی دینی نەبوو، لێ ڕاشـــکاوانە داوایەکی سیاسییانەی لە ٢٤ی ئەیلوولی ١٩٧٨ لە کابینەی شـەریف ئیمامی کرد، کە هەنگاوێک بۆ دۆزینەوەی سەدر بگرنەبەر. ئەو بۆ دۆزینەوەی چارەنووسی سەدر جەختی لە ئەرکی ڕووی دینی و وڵاتپارێزی کردبووەوە:

*لەوەتەی ئێران جاڕنـامەی نەتەوە یەکگرتوەکـانی مۆرکردوە، هەقە دژی هەموو کردەوەیەکی دژەمرۆیی بێ. لەوەش گرنگتر، لەبەرئەوەی ئێران تاکە وڵاتی شـیعەیە و شـیعەی موسـڵمانیش ڕێبازێکی دینی ڕەوا و قانونییە لەم وڵاتەدا، ئیدی ئێران بەرپرسیاریەتێکی قانونی و ڕەوشتی لەسەرە تا لەسەر بەرژەوەندییەکانی شـیعە بێتەدەنگ ئەوسـا لەهەر گۆشـە و کەنارێکی ئەم دونیایە بێ. وێڕای ئەمەش، ئیمام موسا سەدر سەرکردەی شیعەی لوبنان لە ئێران لەدایک بووە، لەســـەر حکومەتی ئێران پێویســـتە بە هاوکاری و*

---

[١١٦] حزبی ئازادیخوازانی ئیســلامی گرووپێکی تازەدامەزراو بوو لەســەر بنەمای شــەریعەتی ئیسلامی. نەبەوییش خۆی بە پزیشکی مەرجەعیە دانابوو.

[117] SAVAK Documents, No number, No Date

*پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتە هەرێمی و کۆمەڵە نێودەوڵەتییەکان ئەم کێشــەیە چارەسەر بکا.*[118]

لە تارانیش کۆمەڵەی دژەشــا بۆ بەرگری لە ئازادی و مافەکانی مرۆڤ بە هاوکاریی بەرەی نیشــتمانی داوایان لە کۆمەڵەی هاوکاریی نێودەوڵەتی بۆ مافەکانی مرۆڤ کرد کۆمیتەک بۆ بەدواداچوونی ســەرنگومبوونی ســەدر پێکبهێنێ.[119] کەچی هیچ کام لەو هەوڵ و تەقەلایانە بەردار نەبوون.

ئەوەی مایەی ســەرنجە، هیچ کامێک لەوانەی بەدوای ســەروســۆراغی سەدردا دەگەڕان نە پشتیوانەکانی بوون نە شۆڕشگێڕەکان، بەڵکو محەمەد ڕەزا شا پەهلەوی خۆی بوو. کاتێکیش هەواڵی بێسەروشوێنبوونی سەدر گەیشتە ئێران، دەستبەجێ شا فەرمانی بە ساواک و وەزارەتی کاروباری دەرەوە کرد بەدوای سەروسۆراغی سەدردا بڕۆن. هەر یازدە ڕۆژ لەدوای بێســەروشــوێنبوونەکەدا، ســاواک ڕاپۆرتی خۆی وەها دا؛ "ســەید موســا سەدری سەرکردەی شیعەکانی لوبنان لەو کاتەی سەردانی لیبیای کردووە لە لایەن کەسانیکی نەناسراوەوە ڕفێنراوە."[120] بەڵگەنامەیەکی دیکەی نهێنیی ســاواک، لە ئیســڕائیلەوە بۆ هۆبەی دووەمی ســاواک نێردرابوو، تێیدا ئەگەری ڕامان و پێشبینییەکانی ڕۆژنامە لوبنانییەکانی ڕەنگ دابووەوە. ئەو باســەی هێنابووە پێشــەوە "وێڕای گەشــتەکەی بۆ لیبیا و وەرگرتنی کۆمەکێکی دارایی پێویســت، دەکرێ ئیمام بە نهێنی ڕەوانەی عێراق کرابێ تا لەوێوە شــۆڕش لە ئێران جۆش بدا."[121] دوای دوو ڕۆژ، باســری نیا، بەرپرسی ساواک لە قوم، برووسکەیەکی بۆ هۆبەی سێیەم لێدا، تێیدا ئەو پەیوەندییەی نێوان ســەید ڕەزا ســەدر و ئایەتوڵڵا شــەریعەتمەداری

---

[118] Tehran 09307_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 26 September 1978.

[119] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[120] SAVAK Documents, No Number, No Date.

[121] SAVAK Document, No Number, 23 September 1978.

بەیانکردبوو. لە بروســــکەکەدا ئەوی ڕەتکردبووە کە ئێران، ئیســــڕائیل و لوبنانییە کریســــتیانییەکان دەســــتیان لە بێســــەروشــــوێنبوونی ســــەدردا هەبووبێ، لە کاتێکدا ئەوەشــــی پشــــتڕاســــتکردبووەوە کە ســــەدر لە لیبیا نەچووەتەدەر، ئەوەشــــی بۆ زیادکردبوو کە "پێدەچێ ئیمام هەر لە لیبیا ڕفێندرابێ، چونکە گرووپێکی تیرۆرســــتی ناتوانێ ئەو برفێنێ." هەروەها لە برووســــکەکەدا ئەوە هاتبوو؛ ســــەید ڕەزا ســــەدر داوای لە کاربەدەســــتە ئێرانییەکان کردبوو، لەبارەی چارەنووسی سەیری سەدر کە پەیوەندی بە دەزگا ئاسـایشـییە بیانییەکانیشـەوە بکەن تەنانەت هی ڕوسـیش. هەروەها سـەید ڕەزا ئەوەشـی گوتبوو، کە خومەینی برووسـکەیەکی "سـاردوسـڕی" لەبارەی پرسی سەدر بۆ عەرەفات لێدابوو، لە کاتێکدا عەرەفات بە "گەرمی" وەلامی دابووەوە و ســـەدری بە "برای خۆی" لەقەڵەمدا بوو." برووســـکەکە بەو ئەنجامە گەیشــــتبوو، کە ڕزگارکردنی ســــەدر [لە زیندانەکەی لیبیا] باندۆرێکی گەورەی لەســــەر پەیوەندییەکانی ئێران بە شــــیعەوە دەبێ."[١٢٢] پاشـان، سـاواک چاودێری خسـتە سـەر سـەرکردە و ڕابەر و بیچمە دینییە خۆجێیەکان، هەروەها ئێرانی و لوبنانییەکانیش، نەخاســـمە هاتوچۆکانی خومەینی. هاوزەمانیش تاران بە شـــێوەیەکی ناراســـتەوخۆ خومەینی و پشتیوانانی ئەوی بە بێسەروشوێنبوونی سەدر تۆمەتبار کرد.

لەپاڵ سـاواک، فەرەیدون موەسـەقی، باڵوێزی پێشـووی ئێران لە ئوردن، لە لایەن شاوە لە کۆتایی ئەیلوولی ١٩٧٨دا نێردرایە ئوردن. ئەو لەوێ خەم و پەرۆشـی شـای لەبارەی چارەنووسـی سـەدر بە شـا حوسـێن ڕاگەیاند. لە ٢٩ی ئەیلوولی ١٩٧٨یشـــــدا باڵوێزخانەی ئێران لە عەمان بەیاننامەیەکی دەرکرد تێیدا؛ "نیگەرانی تەشـــەنەســـەندووی ئێرانی لەبارەی چارەنووســـی سەدر دەربڕی. ئێران لەوەدا لەسەر هەقە کە خۆی لە پرسەکە هەڵقورتێنێ، ئاخر ســـەدر لە ئێران لەدایکبووبوو، هەروەها ڕابەری یەک ملیۆن شـــیعەی

[122] SAVAK Document, 1634/21 H, 17 October 1978.

لوبنانیش بوو."[123] ئینجا شا حوسێنیش نامەیەکی تایبەتی بۆ قەزافی نارد. شا حوسێن لە نامەکەیدا سەدری بە "ئەستێرەیەکی درەوشاوەی جیهانی ئیسلام" لەقەڵەمدابوو، تەرابلوسی لە "ڕەهەندی مەزهەبی" پرسی گرتن یان کوشتنی سەدری شیعە بەدەستی سەرکردەیەکی سوننی ئاگادار کردبووەوە. پاشای هاشمی بە لەیەکگرێدانی تەلیسمی سەدر لەگەڵ ڕەوشی فەڵەستینییەکان ئەوەی گوتبوو کە پرسەکە کارێکی وەها دەکا بۆ فەڵەستینییەکان و هەموو لوبنانییەکان "کاتێکی هەستیار و سەخت" بێ.[124] کاتێکیش قەزافی بەگەشتێک گەیشتە عەمان، شا حوسێن دیسان داوای لێکرد لەم پرسەدا هاوکار بێ. هەروەها ئەو ئەوەشی خستەسەر کە "شا لەبارەی ڕەوشی سەدر نیگەران بووە."[125] قەزافیش لە وەڵامدا، ڕێزی خۆی بۆ ئێران دەبڕی بەوەی "یەکێکە لە وڵاتە ئیسلامییە گەورەکان لە ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامییدا"، لەکاتێکدا بە توندی حاشایی لەوەکرد سەدر لەدوای بێسەروشوێنبوونی لە لیبیا مابێ.[126] ئینجا موەسەقی بەرەو سوریا ڕۆیشت پەیامی تایبەتی شای بۆ حافز ئەسەدیش برد. ئەویش باسی ئەوەی کرد کە "لیبیا، سوریا و وڵاتێکی سێیەم هەوڵیان داوە ئیمام موسا سەدر بدۆزنەوە، منیش دڵخۆشم بەوەی بڵێم بەو زووانە حەشارگەی سەدر دەدۆزرێتەوە."[127] دیاربوو ئازاد نەبوو لەوەی ناوی وڵاتە سێیەمەکە بهێنێ.[128] دوای گفتوگۆکردن لەگەڵ حافز ئەسەد، موەسەقی لێدوانی دا، کەوا سەدر لە لیبیا

---

[123] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[124] Ajami, Fuad, The Vanished Imam: Musa al-Sadr and the Shia of Lebanon (Cornell University Press, 1986) p. 187.

[125] SAVAK Documents, No. 213/13369, 2 October 1978.

[126] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[127] Etelaat newspaper, Interview with Fereydoun Movasaqi, 3 October 1978.

[128] Beirut 09739_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 5 October 1978.

نەماوە؛ ئەو گوتەیەی هەر زوو لە لایەن ســـاواک و وەزارەتی کاروباری دەرەوە ڕەتکرایەوە.

موەسەقی ئەوەی گوت گوایە؛

*ئەسـەد پێیگوتم؛ وێڕای هەندێ بەدحاڵیبوون لەنێوان شـا و ئیمام سـەدردا، هەڵوێستی ئەو هەمیشە لە بەرانبەر شـا و ئێراندا ئەرێنی بووە. ئەسـەد لەو باوەڕەدابوو کە خۆتێهەڵقورتاندنی هەندێ سیاسـی [وەک مەنسور قەدەر] ، هەروەها لێوەرگرتنەوەی ڕەگەزنامەی ئێرانی، وای کرد گرژیی نێوان سەدر و شا بەرفرەوانتر بێ. ئەسەد ئەوەشی خستەسەر، سەدر وەها تەماشای ئێرانی کردووە، کە پەناگە و داڵدەدەری شـــیعەیە. لە کۆتاییدا، ژەنەڕاڵ ئەســـەد بەڵێنی دا، دوای گەڕانەوەی ســـەدر بۆ کەمکردنەوەی گرژییەکان، هەوڵەکانی چڕتر بکاتەوە.*[١٢٩]

هەرچۆنێک بێ، شتەکە تراویلکە بوو.

شـا نوێنەرێکی تایبەتی بۆ بەدواداچوونی چارەنووسـی سـەدردا نارد، عەلی نەقی کانی، ســـکرتێری گشـــتیی پێشـــووی حزبی خەڵک [مەردوم] کە دۆستێکی نزیکی ئەعلەم و برادەری منداڵی سەدریش بوو،[١٣٠] بانگی دەربار کرا. کانی گوتی؛ "شا بە کتوپڕی بانگی کردم."

***ئەو وەها ڕێزی دەگرتم هی باوەڕکردن نەبوو. لەســۆنگەی پەیوەندییەکانم بە ئاخوندە شـــیعەکان و وڵاتە عەرەبییەکان، شـــا داوای لێکردم وەک نوێنەرێکی تایبەتی ئەو بچمە عەرەبستانی سعودی، ئوردن و میسر و داوا لەو دەســەڵاتدارانە بکەم "ســەدر بدۆزنەوە و بە ســەلامەت بیگەڕێننەوە"***

---

[129] Etelaat newspaper, 3 October 1978.

[١٣٠] کانی لەبەر ڕەتکردنەوەی ساسـەتی ناوەخۆیی شـا تازە لە سـیاسـەت وازی هێنابوو. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
Ayandeh newspaper, 2011. Ayande, a reformist website, interviewed with Dr. Kani.

*لوبنان. منیش چوومە عەرەبستانی سعودی و ئوردن. بۆ بەدبەختیش، هیچ کام لە پاشـــاکانی ئەو دوو وڵاتە یارمەتیان نەدام. هەرچەندە ســـەرۆک سادات زانیارییەکی هێدمەگرتووانەی دامێ.*

کانی ئەوەی گوت گوایە سـادات پێیگوتووە؛ "**سـەید موسـا سـەدر لە لایەن قەزافییەوە لە سـێدارە دراوە و تەرمەکەشـی فڕێدراوەتە دەریای سـپی ناوەڕاسـت.**" کاتێکیش کانی هەواڵی چارەنووسـی سـەدری بە شـا ڕاگەیاندووە، پاشـای پەهلەوی "**زۆر پەسـت بوو، زۆر. ئەو بۆ ماوەی دە خولەک لەسەر کورسییەکەی دانیشت.**"[131]

---

131 بڕوانە: 'The Shah of Iran, the Islamic Revolution and the Mystery of the Missing Imam,' The New York Times, January 15, 2016.

## کۆتایی

**بێسەروشوێنبوونی سەدر بۆ شیعەکانی لوبنان و ئەوانی دیکە نسکۆیەک بوو بۆ خۆی.** لەوێدا چەندین بیچمی دەستڕۆیشتوو هەبوون تا دوای سەدر ڕابەرایەتی شیعە بکەن، لەوانە ئایەتوڵڵا محەمەد مەهدی شەمسەدین. سەید محەمەد حوسێن فەزلوڵڵا، سولەیمان یەحفوفی و سەید حەسەن شیرازی. هەرچۆنێک بێ شەمسەدین کە جێگری سەدر بوو لە ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە و ئاخوندێکی میانڕەو بوو، بەبێ ئەوەی پەیوەندییەکی زۆریشی بە لایەنگرانی خومەینییەوە هەبێ،[١٣٢] بووە سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی شیعە، **بەڵام نە ئەو و نە ئەوانی دیکەش شوێنی سەدریان پڕنەکردەوە.** حوسێن قوتلی، نوێنەری تایبەتی موفتی سوننە گوتی؛ بێسەروشوێنبوونی سەدر "ئەڵقەیەک بوو لە زنجیرەی پیلانگێڕییەکان کە مەبەست لێی ئەوەبوو لوبنان و هەرێمەکە بخەنە باوەشی تیرۆرێکی تەلیسماوی".[١٣٣] سولەیمان یەحفوفی، موفتییە شیعەکەی لایەنگری بەعس لە بەعلبەگ لێدوانێکی وەهای دا، گوایە شیعە گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامە کە ئامانجی پشت بێسەروشوێنکردنی سەدر "پیلانێک بووە بۆ ئەوەی چارەسەرییەکی خۆبەدەستەوەدان لە مەیدانی عەرەبییدا بگیرێتەبەر و بە گشتیش سەرنجی لوبنانییەکان ئینجا بەتایبەتی هی عەرەب لەسەر ئەوەی لە کامپ دێڤید ڕوودا، لاڕێ بکرێ".[١٣٤] هەروەک بەهەق نەسر لێکیدابووە، "بێسەروشوێنبوونی سەدر ڕووداوێکی زۆر گرنگ یەکلاکەرەوە بەلێکەوتەی زۆر قەبەی خۆی لەسەر هەردوو لا، چ لەسەر شۆڕشی ئێرانی و چ لەسەر سیاسەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناویندا".[١٣٥]

---

[132] Beirut 05476_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 20 September 1978.

[133] 1Beirut 05476_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 20 September 1978

[١٣٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[135] Interview with Seyyed Hossein Nasr, Baltimor, 24 February 2017.

**چارەنووسی تەلیسماوی سەدر ناوبانگەکەی زیاتر کرد، وای لێکرد ببێتە ئیمامە نادیارەکەی شیعە.** پارکەری باڵوێز ئەو ڕامانەی هێنایە پێشەوە، مشتومڕی لەسەر ئەوە کرد کە "ئەو هزرەی گوایە ئیمام موسا بەرەو حەشارگەکەی ڕۆیشت تا جارێکی دیکە دەرکەوێتەوە، بە مێشکی ئێمەشدا هات. هەر بەڕاستیش، ئەوە ڕامانێکی سەرەتایی بوو، واتە کردەی بێسەروشوێنبوونەکەی هەڵسووڕاند. ڕای خۆجێی لەسەر بابەتەکە بەسەر خۆیدا دابەش بووبوو."[136] بەهەمان شێوەش، ویلیەم ئیگلتن، باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تەرابلس تێبینی ئەوەی دا: "**هەرچەندە هیچ بەڵگەیەک نییە تا شتی دیکەی لێ هەڵبهێنجێنرێ، لێ تۆ بڵێی ئەگەری ئەوە هەبێ بەگوێرەی نەریتی شیعە ئیمام موسا سەدر "شاردرداببێتەوە"، ئینجا ئەگەر وەهابێ، کەواتە پێویستە چاوەڕێی هاتنەوەشی بکەین؟**"[137] لە ئاخروئۆخری هەفتاکاندا بێسەروشوێنبوونی سەدر ئەو بڕوایەی شیعانی لەبارەی "**خۆشاردنەوەی ئیمام**" زیندوو کردەوە.

لەوەش سەرنجڕاکێشتر، بێسەروشوێنبوونی سەدر بووە مایەی وەرچەرخانێکی ڕیشەیی، بەڵام درەنگوەخت لە سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لوبنان. لە ٨ی ئۆکتۆبەری ١٩٧٨دا، مەنسوور قەدەری باڵوێزی ئێران لە لوبنان نەما و شەرەف جێگەی گرتەوە، پەیوەندییەکانی ئەو باڵوێزە نوێیەش لەگەڵ شیعەی لوبنان و عەرەب زۆر لە هی قەدەر باشتر بوو. **پێدەچوو شا سەرکۆنەی قەدەری کردبێ لە تێکدانی پەیوەندییەکانی ئێران بە شیعەی لوبنان.** دوای ئەوەی قەدەر گەڕایەوە تاران، بانگی دەرباری شا کرا. لە وەڵامی پرسیارەکانی شا لەبارەی چارەنووسی سەدردا، قەدەر وەها باسی کرد؛ "هەروەک جەنابی

136 Beirut 05430_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 19 September 1978.

137 Tripoli 01290_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 15 September 1978.

خاوەنشــکۆ بە باشــی بۆی دەرکەوتووە، ســەدر لە ســێدارە دراوە. ئەوەی ڕاســتی بێ، پرســی ســەدر کۆتایی هات."[138] ئینجا مەنســور قەدەر تارانی بەرەو لەندەن جێهێشــت. ئەوەی جێگەی ســەرنج بوو، هێشــتا کاربەدەســتە پەهلەوییەکان بە دۆزینەوەی ســـەدر گەشـــبین بوون. لە بەرایی مانگی ئۆکتۆبەردا، ئەحمەد بەنی ئەحمەد، ئەندام پەرلەمانی پێشـــووی ئێران گوتی گوایە؛ "لە ڕۆماوە زانیویەتی کە ســـەدر ســـەلامەتە و لە لیبیایە. بەگوێرەی قسەی بەنی ئەحمەد بێ، کوڕە گەورەکەی سەدر، سەدرەدین سەدر شوێنی مانەوەی ســەدری پشــتڕاســت کردۆتەوە."[139] لە ســەرەتای نۆڤێمبەریشــەوە، ســاواک ڕاپۆرتی دابوو کە پێدەچێ دوای قەناعەتپێهێنانی ئەلیاس ســەرکیز و ئەســـەد و عەرەفات بە قەزافی، ئیدی بەو زووانە ئازاد بکرێ. ڕاپۆرتەکە ئەوەشــی تێدا هاتبوو گوایە، "ســـەدر دەچێتە ماڵتا، ئینجا بە ڕێوڕەســـمێکی شـــکۆدارەوە دەگەڕێتەوە بەیروت. هەرچەندە دەبێ تێبینی ئەوە بکرێ کە قەزافی هی ئەوە نییە بڕوای پێبکرێ."[140] پاکڕەوان، ســـەرۆکی پێشـــووی ســـاواکیش ڕوانینێکی ئەرێیانەی لەبارەی ڕاپۆرتەکەوە هەبوو، ئاخر "١- بەگوێرەی ســـەرچاوەی هەواڵەکانی ئەو بێ، دەکرێ باوەڕ بە ناوەڕۆکی هەواڵەکە بکەین. ٢- بەلەبەرچاوگرتنی زانیارییەکانی پێشـــوومان، ئەوا ئەم زانیارییە دەکرێ مایەی قبووڵکردن بێ و سەدریش هەر لە زیندانی قەزافیدا بێ."[141] هەندێ لە کاربەدەســـتانی ئێرانی هێشـــتا هەر لەو باوەڕەدا بوون ســـەدر ماوە، هێشـــتا هەر لەبن جڵەوی قەزافی دایە. ئەوکاتەش تەرابلس پێشــنیازی کرد نوێنەرێک لەبارەی پرســی ســـەدر بنێرێتە ئێران، ئیدی تا

---

[138] Interview of General Mansour Qadar with Gholam-Reza Afkhami in the Oral History of Iran Program, Foundation for Iranian Studies, Bethesda, MD, US, 1986.

[139] Tehran 09474_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 1 October 1978.

[140] SAVAK Documents, No. 213/642, 5 November 1978.

[141] Tehran 09526_d to the U.S. Department of State, WikiLeaks, 2 October 1978.

ئەوکات شەپۆلی بێهوودەی شۆڕشی ئیسلامی ڕژێمی پاشایەتی پەهلەوی هەژاند. ساواک بۆ گەڕان بەدوای پەرجووی سەرهەڵدانەوەی سەدر، دوایین ڕاپۆرتی خۆی دا، تێیدا هاتبوو گوایە "هێشتا سەید موسا سەدر لە ژیاندا ماوە."[١٤٢]

---

[142] SAVAK Documents, No. 224/958, 23 December 1978.

# bibLiogRaphy

## *Archival Collections*

### *Iran*

Markaz-e Amouzesh va Pajooheshhay-e Beynolmelali-e Vezarat-e Omour-e
Kharejeh [Center of International Research and Education of the Ministry of
Foreign Affairs]
Markaz-e Asnad-Enghelab-e Eslami [Islamic Revolution Document Center]
Sazman-e asnad va Ketabkhane Melli-e Jomouhori Eslami [National Library and
Archives of Islamic Republic of Iran]

*Published Government Documents*

Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Aval, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol I, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Dovom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol II, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Sevom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol III, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Hezb-e Democrat-e Kurdestan-e Araq be Ravayet-e SAVAK [Iraqi Kurdistan
Democratic Party according to SAVAK]
Ravabet-e Iran va Araq be Ravayat-e SAVAK [Iran-Iraq Relations According to
SAVAK]

*United States of America*
US National Archives and Records Administration (NARAI), College Park,
Maryland
Central Intelligence Agency Records Search Tool (Crest)
General Records of the Department of State, Record Group 59 (RG59)
Central Foreign Policy Files (CFP), 1973–76, Access to Archival Databases
(AAD). Available at: http://aad.archives.gov/aad/
Gerald R. Ford Presidential Library (GRFL), Ann Arbor, Michigan. Available at:
https://www.fordlibrarymuseum.gov/collections-digital.aspx

*Published Government Documents*
United States Congress, House Select Committee on Intelligence, *CIA: The Pike*
*Report*. With an Introduction by Philip Agee, (Nottingham, England:
Spokesman Books, 1977).

*Congressional Record*
Foreign Relations of the United States (FRUS) (Washington, DC: US Government
Printing Office)
1969–1976
I: Foundations of Foreign Policy, 1969–1972 (2003)
XI: South Asia Crisis, 1971 (2005)
XXIV: Middle East Region and Arabian Peninsula, 1969–1972
XXVII: Iran; Iraq, 1973–1976 (2012)
XXXVIII: Foundations of Foreign Policy, 1973–1976 (2012)
E-3: Documents on Global Issues, 1973–1976 (2000)
Public Papers of the Presidents: Gerald R. Ford, 1976–77, Book III. Washington,
DC: US Government Printing Office, 1979.

*Online Document Collections*
National Security Archive, George Washington University (NSA-GWU),
Washington, DC
Digital National Security Archive (DNSA). Available: http://nsarchive.
chadwyck.com/
Electronic Briefing Book (EBB) 265. Available at: http://www2.gwu.edu/~nsarchiv/NSAEBB265/
Henry Kissinger Telephone Transcript (State-Kissinger), U.S. Department of State
Electronic Reading Room, available at: http://foia.state.gov/Search/
Collections.aspx
Central Intelligence Agency Electronic Reading Room. Available at: http://www.
foia.cia.gov/collection/life-intelligence-richard-helms-collection

***Author's Interviews***

Seyyed Ali Akbar Mohtashampour
Seyyed Hossein Nasr
Ebrahim Yazdi

***Published Interviews***

Foundation for Iranian Studies Oral History Collection (FISOHC)
General
Mansur Qadar
General Mansur Qadar
Harvard Iranian Oral History Project (HIOHP) Colonel Isa Pejman
Colonel Isa Pejman

Books

***Ajami, Fuad,*** *The Vanished Imam: Musa al-Sadr and the Shia of Lebanon* ***(Cornell University Press, 1986).***

***Bird, Kai,*** *The Good Spy: The Life and Death of Robert Ames* ***(Broadway Books, May 26, 2015).***
***Bonnin, Richard,*** *Arrows of the Night: Ahmed Chalabi and the Selling of the Iraq War* ***(Anchor; Reprint edition, November 13, 2012).***
***Farrokh, Kaveh,*** *Iran at War: 1500–1988* ***(Oxford: Osprey Publishing).***
***Jannati, Ali,*** *Khaterat [Diaries]* ***(Tehran, Markaz-e Asnad-e Enghelab-e Eslami, March 2015).***
***Khomeini, Seyed Ruhollah,*** *Sahifeh Emam* ***(Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini) Vol. III. IV, VI, VII, XIII, XV.***
***McDowall, David,*** *A Modern History of the Kurds* ***(London: I.B. Tauris, 2007 ed).***
***Parsi, Trita,*** *Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the U.S.* ***(Yale University Press, 2007).***
***Qaneifard,*** *Tondbad-e Havades: Goftogooi ba Isa Pejman [Hurricane of Events: A Dialogue with Isa Pejman]* ***(Elm Publication, Tehran, 2011).***
***Shalgham, Abdel Rahman,*** *Sabz va Siah [Green and Black],* ***translated by Ali Mousavi Khalkhali (Ozam Publisher, Tehran, 1392).***
***Tabatabai, Mohammad Sadeq,*** *Kahterat-e Siasi Ejtemai [Social Diaries]* ***(Moassese Tanzim Nashr Asar Emam Khomeini, 1388) vol. 1.***
***Yazdi, Ebrahim,*** *Shast Sal Sabouri va Shakouri [60 Years of Patience and Gracefulness]* ***(Tehran, Fall 1390, Nashr-e Majazi) Vol III.***

ســــیاســــەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لەبن قەڵەمڕەویتی شـــــادا، لێکەوتەی زۆر قەبەی بەســـەر کردەنیازی هێز و دەســـەڵات لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا هەبوو. شـا پەیوەندییە ستراتیژییەکانی ئێرانی لەگەڵ کوردی عێراق و شـیعەی لوبنان لەســـەر بنەمای ئەوە داڕشـتبوو، کە گەف و هەڕەشـە جیۆپۆلیتیکی و جیۆکەلتوری لەســـەر ئاســـایشـــی یەکانگیریی خاکی ئێران بەرزەفت بکا و ڕایبگرێ. لە هەمان کاتیشدا دامەزراوەی سیاسیی ڕەگئاژۆ دەســـتی لە ڕێڕەو و چارەنووســـی ئەو پەیوەندییانەدا هەبوو. هەروەها سیاسەتی دەرەکی ناودەوڵەتییانەی ئێران لە ماوەی نێوان ١٩٥٨تا ١٩٧٩دا پتەوی و بەردەوامیی هێزی جیوگرافی و مێژوویی لە ڕەوتی داهـاتووی جیۆپۆلیتیکی ڕۆژهەڵاتی ناوین و هاوسەنگی هێزی هەرێمی نیشان دا.

***شا خەم و پەرۆشییەکەی خۆی بەم شێوە بە ئەعلەم گوت: "هەر بە ڕاستی ئێمە لەو کاتەی مەقاشـی مۆسـکۆ لە ڕێی بەغدا و کابولەوە دەوری ئێمەی گرتووە، کەوتووینەتە دۆخێکی پڕ لە کێشەوبێشەوە."*** [1]

**شـا ئیسـماعیلی یەکەم (١٥٠١-١٥٢٤) لە سـەرەتای سـەدەی شـانزەمەوە ئیمراتۆرییەتی سەفەوی (١٥٠١-١٧٣٦) دامەزراند، ئیدی بۆ یەکەم جار بوو لە دوای داگیرکردنی ئێران لە لایەن عەرەبە موســـڵمـانەکـانەوە ئێران یەکبخاتەوە. لەوەش جەوهەریتر، بۆ ناسـنامەی ئێرانیبوون جەختی لەسـەر بنەمای شیعەی دوازدە ئیمامی کردەوە.** ئەم بڕیارە چارەنووسسازییەی بۆ بەشـــیعەکردنی بانی ئێران، وایکرد ئێران بۆ ســـەردەمی نوێ بگێڕێتەوە و ئامادەی بکا. ئەم هەڵسـانەوەیەی دەســەڵاتی شـیعە لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا لێکەوتەی زۆر قەبەی بەســـەر کۆمەڵگە شـــیعەکانی دیکەی هەرێمەکەدا هەبوو، بەتایبەتیش بەسەر تورکی شیعە لە ئاسیای بچووکدا. **شا ئیسماعیل بۆ شـیعەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین، هەم شـایان بوو هەم مورشـیدی تەواو.**

---

[1] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 259.

شیعەی تورک لەدوای چەوساندوەییان لەسەر دەستی عوسمانییەکان، پێشوازی گەرمیان لە سەرکەوتنە یەک لەدوای یەکەکانی شای سەفەوی کرد. شیعەکانی ئەناتۆلیا بە سەرۆکایەتی شاهکولو (نۆکەری شا)[1] لە بەهاری ١٥١٠ یاخیبوونێکی بەربڵاویان بەرپاکرد. شا ئیسماعیلیش ئاگای لە هێزی پشتیوانەکانی خۆی هەبوو؛ کەچی ئەو لەوکاتەدا لەگەڵ خانە ئۆزبەکە سوننییەکان لە خوراسان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێراندا خەریکی شەڕوشۆڕ بوو. لەوەش پتر ئەو نەیدەویست لە یەک کاتدا ئێران بە دوو هێزی سوننەی ئۆزبەک و عوسمانی دەورە بدرێ. هەر بۆیە خۆی لەوە بەدوورگرت لە ڕێی لایەنگرتنی شیعە هەڵگەڕاوەکان ختووکەی سوڵتانی عوسمانی بایەزیدی دووەم (١٤٨١-١٥١٢) بدا و بیوروژێنێ. دوای هەندێ بەیەکدادانی پچڕپچڕ، ئەوەبوو شاهکولو بڕیاریدا لە ڕووباری فورات بپەڕێتەوە -سنووری ئەوکاتی نێوان عوسمانی و سەفەوی- تا خۆی بگەیەنێتە ڕیزی ڕابەرە ڕووحییەکەی کە شا ئیسماعیل بوو. کەچی شاهکولو و ٣٠٠٠ شوێنکەوتووەکەی لە شەڕێکی یەکلاکەرەوە لە ٢ی تەموزی ١٥١١ سەریان تێداچوو و کوژران. لەگەڵ ئەوەی شاهکولو لەنێو شیعەی عەلەوی لە ئەناتۆلیا و تورکیای نوێ وەک بیچمێکی پیرۆز سەیر دەکرا، کەچی سوڵتانەکانی عوسمانی دڵڕەقانە شیعە تورکەکانیان چەوساندنەوە.[2] هەر لەو ماوەیەشدا شا ئیسماعیل بەسەر ئۆزبەکەکاندا زاڵ بوو، لە شەڕی مارڤ (٢ی کانوونی یەکەمی ١٥١٠)دا محەمەد شەیبانی خانی سەرکردەکەشیانی کوشت. هەرچۆنێک بێ سوڵتانێکی دیکەی عوسمانی بە ناوی سەلیمی یەکەم لە ماوەی کەمتر لە سێ ساڵ لە دوای دامرکاندنەوەی هەرای شاهکولو پەلاماری ئێرانی دا. **ئەوەبوو سوڵتان**

---

[1] ناوی ڕاستەقینەی شاهکولو کارەبایکولو بوو. ئەو لە دوای (بابا خەلیفە حەسەن)ی باوکی بووە سەرکردەی شیعەکانی ئەناتۆلیا، ئەو بابا حەسەنەش دۆستایەتییەکی نزیکی لەگەڵ شێخ حەیدەری باوکی شا ئیسماعیل هەبوو.

[2] **سوڵتان سەلیمی یەکەم لە ئەناتۆلیادا زیاتر لە ٤٠،٠٠٠ شیعەی کوشت** بڕوانە:
Bitlisi, Idris, Hasht Behesht [Eight Paradises].

**سـەلیم لە شـەڕی چاڵدێران لە ٢٣ی ئابی ١٥١٤دا شـا ئیسـماعیلی بەزاند و تەورێزی پایتەختی ئەوکاتی ئێرانیشـــی داگیرکرد.** داگیرکردنەکە کاتی بوو، بەڵام شارەکە بە شێوەیەکی دڕندانە لە لایەن هێزی یەنیچەری عوسمانییەوە خاپوور کرا. هەر بەڕاسـتیش لە کۆتاییدا، کورتهێنی شـا ئیسـماعیل لە توانا و نیازی بۆ پشتگیریکردنی بزووتنەوەی قەوارەی نادەوڵەتی شیعەی تورک سـەریکێشـا بۆ بەزینی سـوپای ئێرانی و لەدەسـتچوونی هەمیشـەیی کوردستانی ڕۆژئاوا – کوردستانی تورکیای ئێستا و سوریا.

لەپاش زیاتر لە چوار سەدە، شۆڕشی ئیسلامی لە ١٩٧٩دا کە بەڕابەرایەتی ئـایەتوڵڵا ڕوحوڵڵا خومەینی بوو، ڕژێمی پەهلەوی ڕوخـانـد و کۆمـاری ئیسـلامی لە ئێران دامەزراند. ئەمەش بۆ هەرێمەکە خاڵی وەرچەرخان بوو، دنەی کۆمەڵگە شـیعەکانی دیکەشـی دا، بەتایبەتیش شـیعەی عێراق تا ببنە ئاڵنگارێک بۆ ڕژێمی ئاوتۆکراتی سـوننە. بە ڕابەرایەتی ئایەتوڵڵا سـەید محەمەد باقر سـەدر، بەرەبەرە شـیعەکانی عێراق چالاکی دژەبەعسـییان ڕێکخسـت. هەرچەندە لە ڕووی وتار و قسـەی بریقەدارەوە پشـتیوانی شـیعەی عێراقیان کرد، لێ کۆمارە تازە دامەزراوەکەی ئیسـلامی لە ئێران لەبەر ململانێی ناوخۆ لەسـەر دەسـەڵات و شـەڕی ناوەخۆ لە کوردسـتانی ئێران و سارای تورکمان لە باکووری خۆرهەڵات نەیتوانی پشتیوانی شیعەی عێراق بکا. سەدریش بە شێوەیەکی زۆر دڵڕەقانە لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە لە سێدارە درا و لادان و یاخیبوونی شیعەکانیش سەرکوتکرا. لەدوای ئەمە بە کەمتر لە سـاڵێک، سـەددام حوسـێن هێرشـی کردە سـەر ئێران و لە ١٩٨١دا بۆ ماوەیەکی کاتی خورەمشـەهریشـی گرت. جارێکی دیکە لە بەر کورتهێنی توانـا و نیـازی ئێران لە پشـتگیریی بزووتنەوەی قەوارە نادەوڵەتییەکەی شـیعەی عێراقدا و لە ڕێی شـەڕێکی خوێناویدا، هەرچەندە بۆ ماوەیەکی کاتیش بووبێ، کەچی کۆتاییەکەی شکست و بەزین بوو.

لە ماوەی نێوان پێکهێنانی شـیعەگەرایەتی سـەفەوی و کۆماری ئیسـلامی شـیعەدا، ئەوە محەمەد ڕەزا شـا پەهلەوی بوو کاریگەرانە سـیاسـەتی

دەرەکی نێودەوڵەتییانەی لە باشـــووری لوبنان و بەتایبەتیش لە باکووری عێراق دارشت و سەرکەوتووانەش هەرەشەی عێراقی-بە پاڵپشتی میسری و ڕووسەکان- ڕاگرت. لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی مێژوویی لەبارەی پەیوەندییە ســـتراتیژییەکانی ئێرانی پەهلەوی بە کوردی عێراق و شـــیعەی لوبنان مەحکەمی و بەردەوامی ســـیاســـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانی نیشانداوە.

ســیاســەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لەبن حوکمڕانی شــادا بەشــێک بووە لە ســتراتیژێکی بەربەرینتری بەرزەفتکردن. **مەبەســتی ســیاســەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بۆ ئەوە دارێژرابوو کە ڕکابەرە مێملەکانی پەل نەهاوێن، ئەم هەرەشــانەش خۆیان لە هەرەشــەکانی ســوور، عەرەب، کورد، ڕەش و فەڵەســـتینییەکان دەبینییەوە. پشـــتگیری ئێران بۆ کوردی عێراق ڕێگەی لەوە گرت عێراق پەلاماری خوزستان بدا و سنووریشــی بۆ چاوتێبڕینی لە کەنداوی فارســیدا وەســتاند. شــا کارایانە "پرســی کوردی" وەک فشــارێک بۆ ســەر "ســەقامگیری خۆجێی عێراق و یەکێتیی عەرەب"[1] بەکارهێنا تا عێراق بە "لاوازی، دابەشـــکراوی و خۆجیاکردنەوە لە ناســـر بهێڵێتەوە"،[2] هەروەها دەستوپێی "دوو سێیەکی سوپای عێراق ببەستێتەوە و ئەو بەڕەیەش لەبن پێی بەعس دەربهێنێ، بەوەی بتوانێ کاری تێکدەرانە و کوشــتن دەرحەق ئێرانییەکان بکا."[3] هەروەها پشــتگیری ئێران بۆ کوردی عێراق بۆ ئەوەش بوو، کە جیاخوازیی کوردی ڕابگرێ.** کاتێکیش پشــتیوانی بۆ کوردی عێراق برەوی پەیداکرد، ناســـیونالیزمی کوردی پاشـــەکشـــەی

[1] London 1305 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 2 August 1963.

[2] Baghdad A-424 to U.S. Department of State, enclosure: "Kurds - Iraq," no date (NARA/ RG59/CFPF/1964–66/Box2339/POL 13-3–Ethnic Minorities), p. 2.

[3] White House, Memorandum, Kissinger to the President, "Progress Report on the Kurdish Support Operations," October 5, 1972 (FRUS/1969–76/E-4/doc.325), pp. 1–103.

خۆی نیشـــــان دا و لە بەرانبەریشـــــدا پاڵ بە بارزانییەوە نرا تا بیرۆکەی لایەنگرتنی کوردی ئێران لە دژی تاران بەلاوە بنێ، ئاخر ئەو، واتە بارزانی نەیدەویست پشتگیری ستراتیژی ئێران لەدەست بدا.[١] **بارزانی لە ڕەوشی جەنگی کوردیدا، هۆشـــــداری دایە هەردوولای کوردی ئێران و کوردی ســـــوریـــا کە هیچ هەنگـــاوێـــک لە دژی ڕژێمی نـــاوەنـــدەوە نەنێن**[٢] **و پێشـــمەرگەکانیشـــی ســـنوورەکەیان لەگەڵ ئێراندا بە ئاســـاییشـــپارێزییەوە ڕاگرت**[٣] و پارتی دیموکراتی کوردســـــتانیش پڕوپاگەندەی خۆی لە دژی یەکێتیی نیشـــــتمانیی ئێراندا ڕاگرت.[٤] لە کۆتاییدا ئەم وەرچەرخانە بووە مایەی دەرکردنی ســـــەرکردە کوردەکانی حیزبی دیموکراتی کوردســـــتانی ئێران بە ئەحمەد تۆفیقیشەوە.[٥] هەروەها شا لەوەدا بەپارێز بوو کە کوردی ئێران لە خۆی نەشـــــێوێنێ. شـــــا لە کۆبوونەوەیەک لەگەڵ ئارمین مایەر Armin Meyerی بـــاڵوێزی وڵاتە یەککگرتووەکـــانـــدا پەردەی لەســـــەر ســـتراتیژییەکەی هەڵدایەوە بەوەی بەدەســـتتێکەڵکردن لەگەڵ عێراق لە دژی بارزانی دوژمنایەتی کوردی ئێران لەخۆی نەورووژێنێ.[٦] ئیدی لەبەر ئەو بەرژەوتەدا بوو، کاربەدەســـتانی ئەمریکا مشـــتومڕیان لەســـەر ئەوە بوو، **ئێران بۆیە پشتگیری هەڵگەڕانەوە (شۆڕشی) کوردی دەکا تا ڕووی کردەی دوژمنایەتیان لەخۆی دووربخاتەوە.**"[٧] بە هەمان شـێوەش، پشـتگیری ئێران بۆ شیعەی لوبنان بە ئامانجگرتنی سەرهەڵدانی ناسریزم بوو لە ڕۆژهەڵاتی کەناراوی دەریای ســپیی ناوەڕاســتدا. ســەید حوســێن ناســر ســتراتیژی

---

[1] SAVAK Documents, 2/490, 8 June 1964.

[2] SAVAK Documents, 2/453, 12 January 1964.

[3] SAVAK Documents, h/5/3102, 20 September 1965.

[4] SAVAK Documents, 13/2933, 25 June 1963.

[5] SAVAK Documents, 42/89.

[6] Tehran A-1044 to State, "Iran-Iraq Relations," January 20, 1966 (FRUS/1964–68/ XXI/doc.179).

[7] White House, Memorandum, Saunders to Bundy, April 2, 1963 (JKF/NSF/RKF/ Box426/Iraq-1961-63-White House Memoranda, p. 1.

لەخۆگرتنی ئێرانی لە لوبنان وەها پشتڕاستکردەوە: "شا پشتی سەدری لە دژی ناسیونالیزمە عەرەبەکان و سوننەکاندا گرت."[1] **لەکاتێکدا هەرگیز شا کۆمەکی سەربازییانەی بۆ شیعەی لوبنان نەنارد، کەچی ئەوان وەک قەڵایەکی پتەو لە بەرانبەر پان عەرەبایەتی وەستانەوە، ئەمەش لە ڕێی هەڵوەشاندنەوەی نەخشەی ناسرییەکان بوو بۆ چوونە ڕیزی کۆماری عەرەبی یەککگرتوو یان هەر قەوارەیەکی گەورەتری عەرەبدا.**

خۆی لە بنەڕەتدا سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بۆ بەیەکەوەلکانی هەرێمایەتی دانەڕێژرابوو. مایەی سەرنجڕاکێشان بوو نەیارە هەرێمییەکانی ئێران هەروەک وەزارەتی کاروباری دەرەوەی وڵاتە یەککگرتووەکان هێڵیان بە ژێر نیازی شادا هێنابوو، بەوەی بەتەمایە کوردستانی عێراق بە ئێرانەوە بلکێنێ. ئەوەبوو شازڵ تاقەی وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق هۆشداری دا بەوەی؛ **"ئەگەر شا یان هەرکەسێکی دیکە بیرۆکەیەکی لەبارەی بەنگلادیشێکی نوێ لە عێراقدا هەبێ ، ئەوا سەرچیخ چووە."**[2] هەروەها وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا ڕاپۆرتی دا بەوەی؛ "**بارزانی لە چەند بۆنەیەکدا هەوڵیداوە لە شا نزیک ببێتەوە، بەڵکو لە دژی عێراق پشتی بگرێ. لە بەرانبەریشدا بەڵێنی چەوری دا بەوەی کوردستانی عێراق بۆ ئێران بگەڕێنێتەوە و پێوەی بلکێنێ.**"[3] هەر وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا لە ڕاپۆرتێکی دیکەدا، ئەو دەستوەردانەی ئێرانی لە کوردستانی عێراقدا بە "بەراوردکارییەک لەگەڵ دەستهەبوونی هیندستان لەگەڵ یاخیبووانی بەنگلادش لە ڕۆژهەڵاتی

---

[1] Baghdad 564 to the U.S. Department of State, August 29, 1974, NSA, PCFMESA, Box 14, GRFL

[2] Baghdad 564 to the U.S. Department of State, August 29, 1974, NSA, PCFMESA, Box 14, GRFL.

[3] Tehran 136 to the U.S. Department of State, August 2, 1962 (NARA/RG59/R2/787.00/8–162), pp. 1–2.

پاکســـتان بەر لە جەنگی ١٨٧١دا چوواند."[١] **بە پێچەوانەی ئەو داوایانەش، هەرگیز شـا پشـتی سـیاسـەتی پێوەلکاندنی خاکی هەرێمیی نەگرتبوو. ئامانجی سـەرەکی ئەو ئەوەبوو عێراق لەجێگەی خۆی بەرزەفت بکا و رایبگرێ. ئەو بەرەبەرە پرسـی کورد و پرسـی ئەروەند ڕودی بەیەکەوە بەستەوە.** بەگوێرەی قسەی مەنسور قەدەر بێ، ئەوە پاکرەوانی بەرێوبەری دەزگای ساواک بوو، یەکەمین جار پێشنیازی بۆ شا کرد، بەڵکو کورد بەکاربهێنێ تا سەرانی عێراق لەبارەی ئەروەند ڕودەوە سازشی بۆ بکەن.[٢] لە ناوەڕاستی شەستەکاندا وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران مشتومڕی لەسەر ئەوەبوو؛ "سێ پرس بوونەتە مایەی وروژاندن و تەشەنەسەندنی گرژی لەنێوان ئێران و عێراقدا: ئەروەند ڕود، جەنگی کورد و کەمینەی ئێرانی لە عێراق... ئێرانیش ناتوانێ دەرهەق بە کورد بێ باک بێ... هەرچۆنێک بێ، ئێران ئەو سێ پرسەی بە شێوەیەک تێکەڵ یەک کردوون، کە هیچ کامێکیان ناتوانرێ دووبەدوو لەگەڵ عێراقدا چارەسەر بکرێ."[٣] **ئیدی هەر لە بەرەبەرەی کۆتایی شەستەکانەوە، شا ئاشکرایکرد کە ئەو لەبەرانبەر سازش لە ئەروەند ڕوددا ئامادەیە دەستبەرداری کورد ببێ.**[٤]

سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران نمایشی خواست و ئارەزووی ئێرانی کرد بەوەی ئەمری واقیعی هەرێمایەتییەکەی قبووڵە. وێرای پشتگیری بۆ کوردی عێراق، **ئێران خۆی لەوە بەدوور گرت پشتی پارچەپارچەکردنی عێراق و دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی**

---

[1] Intelligence note prepared in the Bureau of Intelligence and Research, November 18, 1974, FRUS 1969–1976, XXVII, 267, Tab B.

[2] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

[3] Cologne to Iran's Ministry of Foreign Affairs. No number, no date.

[4] Tehran A-607 to the U.S. Department of State, "The Iran-Iraq Crisis of December/ January: An Analysis," March 5, 1966 (NARA/RG59/CFPF/ 1964–66/ Box2339/ POL 13-3–Ethnic Minorities), p. 3.

**بگرێ.** شا فشاری خستە سەر کوردی عێراق بەوەی "پابەند بن بەو هێڵەی کە خۆیان بە بەشێک لە عێراق بزانن."[1] شا لە دیدارێکیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی ئەلسیاسەی کوێتیدا، بە ڕوونی ئەوەی دەربڕی؛ "**ئێمە سەربەخۆیی کوردستان [ی عێراق] پەسەند ناکەین.**"[2] لە قیەنناشدا ئەو بەڵگەوبەندەکەی خۆی دووبارەکردەوە، کە "ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان دەبێ لەژێر سەروەری عێراقدا ڕێگەی پێبدرێ."[3] شا هەر بە خۆی دژی پارچەپارچەبوونی دەوڵەتە هەرێمییەکان بوو، ئاخر پارچەپارچەبوونی بە زەمینەیەکی لەبار دەزانی بۆ دزەکردنی ڕوسی. "ڕۆژگاری داگیرکردنی خاکی وڵاتان بەسەرچوو، چیدیکەش مایەی پەسەند کردن نییە،" **ئەو ڕەتیکردەوە لە هەرێمەکەدا دەوڵەتیک بڕووخێ.**[4] **هەر لەبەر ئەوەش بوو، ئەو دژی پارچەپارچەبوونی پاکستان بوو، هەروەک چۆن دژی داگیرکردنی ئیسرائیل بۆ نیمچەدوورگەی سینا و بەرزاییەکانی جۆلانیش بوو.** "نابێ دان بە خاک داگیرکردنێک لە ڕێگەی هێزی سەربازییەوە بنرێ،" ئەمە لێدوانی شا بو لەدیدارێکیدا لەگەڵ ڕۆژنامەیەکی یوگسلافی لە ١٩٦٧دا.[5]

سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران سەرەکیترین ئامراز بوو بۆ ڕەواتیەتیدان بە ڕۆڵی هەرێمیانە و سەقامگیرییەکەی. بەڵی شا بە باشی دەیزانی، کە ڕۆڵی دەوڵەت لە کێبرکێی هێزدایە، کە دراوسێکانی لە ڕێی دانانان بە بەرژەوەندییە دەوڵەتییەکانەوە ڕەوایەتی پێدەبەخشن.[6] هەرچەندە

---

1 Helms to Kissinger, May 21, 1974, CIA-Helms.

2 Iran's Ministry of Foreign Affairs, No number, no date.

٣ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

4 Iran's Ministry of Foreign Affairs, February 1971.

5 Borba (Yugoslavia), November 1967.

6 Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 291. For more discussion, see Doran, Charles. The Politics of Assimilation: Hegemony and Its Aftermath (Baltimore: Johns Hopkins University Press, 1971).

کۆبوونەوەی لووتکەی سەعدئاباد لە ١٩٧٢دا دەستبەری ڕۆڵی ئێران بوو بەوەی پێیدەگوترا "پۆلیسی کەنداوی فارسی،" کەچی هەر ڕێککەوتننامەی جەزائیری ١٩٧٥ بوو کە ڕەوایەتی ئەوەی پێدا. بەدانانی بەو ڕاستییەی کە لە کۆتاییدا هەر پشتگیری کوردی عێراق بوو بەغدای هێنایە سەر ئەوەی ڕێککەوتننامەکە بپەژرێنێ، کەچی سیاسەتی دەرەکی نێودەوڵەتییانەی ئێران ڕۆڵێکی چارەنووسسازانەی لە دەستەبەرکردنی ڕۆڵی کوێخایەتی ئێران لە هەرێمەکەدا پێبەخشی. لەسەرووی هەمووشیانەوە، شا وەهایدانابوو ئەو سیاسەتە داردەستێکە بۆ ڕاگرتنی سەقامگیری لە ئێران و ڕۆژهەڵاتی ناویندا. هەروەک ئەو لێدوانی دا؛ ئێران "تاکە دەوڵەت بوو بتوانێ ئاشتی و سەقامگیری لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا بپارێزێ."[1] ئێران لە سۆنگەی سنووردارکردنی هەڕەشەی پان عەرەبیزمی ئەو ڕژێمانەی مۆسکۆ پاڵپشتی دەکردن، سەقامگیری خۆی ڕاگرت، ئەمەش لە ڕێی پشتیگیریکردنی کوردی عێراق و هەروەها بە شێوەیەک لە شێوەکانیش لە ڕێی کۆمەککردنی شیعەی لوبنان. خۆی ئەو "سەقامگیرییە تایبەتیەی" ئێران بوو، بریتی بوو لە پێکهاتەیەک لە هێز و ڕۆڵی ئێران کە قەناعەتی بە کۆشکی سپی هێنا ئێران بە هاوپەیمانی سەرەکی لە هەرێمەکەدا بزانێ.

خۆی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران خۆنمایشێکی *هەوڵوتەقەلای ئێران بوو بۆ خۆکردنەوە لە سیاسەتەکانی زلهێزەکان*. ئاخر شا هەر لە کودەتاکەی ١٩٥٣وە، بەدوای ئەوەدا دەگەڕا خۆی بەسەربەخۆ لە هێزی دەرەکی نیشان بدا. لە ناوەڕاستی هەفتاکانیشدا ئەو پەرەسەندنە سەربازی و ئابوورییە، ئێرانی لە دەوڵەتێکی تازەپێشکەوتوو گەیاندە هێزی سەرەکی لە هەرێمەکەدا. کاتێکیش داهاتی پترۆدۆلاری ئێران زیادی کرد، ئیدی بڕوابەخۆبوونی شاش پەرەیسەند، ئەوەبوو لە بەرانبەردا سروشتی پەیوەندی ئێرانی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئاژان-سالار بۆ هاوبەشێکی

---

[1] Pahlavi, Mohammad Rezai, Answer to History (New York: Stein and Day, 1980) p. 142.

هەرێمی لە جەنگی ساردا گۆڕی. ئەو لە شەستەکانەوە پەیڕەوی سیاسەتی خاوکردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ مۆسکۆدا گرتبەر و پاشان هەرچەندە بە شێوەیەکی ژێربەژێریش بێ لە جەنگی یوم کیپور (شەڕی ئۆکتۆبەر)ی ١٩٧٣دا پشتی میسر و سوریای گرت.[1]

لەوەش جەوهەریتر، ئەو بە سیاسەتەی دەرەکی نادەوڵەتییانەی خۆی لە کوردستانی عێراق داڕسایە ستراتیژی ئەمریکا لە عێراق، ئەم حاڵەتەش لە ئەیلوولی ١٩٦١ەوە درێژەی کێشا تا ئایاری ١٩٧٢، تا ئەو کاتەی لە کۆتاییدا وڵاتە یەکگرتووەکانیش ڕاکێشرایە نێو جەنگی کوردی. ئیدی لەو ماوەیەدا هیچ سازشێک لەنێوان ئێران و ئەمریکادا لەبارەی خەملاندنی ئەو هەڕەشە هەرێمییەوە نەبوو کە لە عێراقەوە دەهات. لە کاتێکدا ئیدارەی هەردوو سەرۆکی ئەمریکی، کەنەدی و جۆنسن هەوڵیاندا پەیوەندییەکانیان لەگەڵ حکومەتەکانی عێراق، لەگەڵ هەردوو برا عارفییەکان لە شەستەکاندا

---

[1] **لە ڕاستیدا ئێران بەشێوەیەکی سەرسامانە هەرچەندە ناڕاستەوخۆش بێ پشتی قاهیرە و دیمەشقی گرت. لە کاتێکدا ئێران نەچووە ڕیزی عەرەبەکان بۆ گەمارۆی نەوت لە دژی ئیسرائیل، کەچی شا لە ڕۆژی یەکەمی جەنگەکەوە لەسەر داوای تایبەتی ئەنوەر ساداتەوە کەشتییەکی گەورەی پڕ لە نەوتی خاوی ڕادەستکردن. هەروەها ئێران کۆمەکی داودەرمانی دایە عەرەبەکان و فڕۆکەوان و فڕۆکەی بۆ عەرەبستانی سعودی ناردن تا یارمەتیان بدەن کێشەی لۆجستی خۆیان پێ چارەسەربکەن. فڕۆکەی ئێرانییەکان بەتالیۆنێکی سوپای عەرەبستانی سعودیان گەیاندە لای سورییەکان لە بەرزاییەکانی جۆلان. لەوێشەوە سەربازی برینداری سوری بۆ چارەسەرکردن هێنایە تاران. هەروەها ئێران 'لێنەگەڕا خۆبەخشە جوولەکانی ئوسترالی لە ڕێگەی تارانەوە بگەنە ئیسرائیل.' لەسەرووی هەمووشیانەوە تاران یارمەتی جەنگەکەی دا.** بڕوانە: Beirut 3432 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 6 January 1975 پێشتریش دیاربوو ئێران لە ڕێی باڵوێزخانەی ئەمریکاوە هۆشداری دابووە ئیسرائیل، تا خۆی لە سیاسەتی خۆجێی ئوردن هەڵنەقورتێنێ. بە ئامادەیی تەواوی هێزی هەوایی ئێرانەوە، ئەوەبوو گۆلدا مایری سەرۆوەزیری ئیسرائیل هێرشەکەی مۆشی دایان کشاندەوە بەوەی لە ڕوباری ئوردن بپەڕێتەوە و بەڵێنیشی دا دەست نەخاتە نێو کاروباری ئوردنەوە. بڕوانە: Istanbul 790 to Iran's Ministry of Foreign Affairs, 11 July 1971.

زیندووبکەنەوە و پەرەی پێبدەن، **کەچی شا لە لای خۆیەوە بەجۆشوخرۆشەوە پشتی کوردی عێراقی گرت تا هەڕەشەی عەرەب بەرزەفت بکا.** لەوەش پتر، خۆی ئەوەش هەر ئێران بوو کە جڵەوی پەیوەندیە ستراتیژییەکانی لەگەڵ هێزی دەرەکی لەدەست بوو، توانیشی هاوکاریی سێکوچکەیی بە هی خۆیەوە لەگەڵ سی ئای ئەی و مۆساد لە کوردستانی عێراقدا ڕێک بخا. هەروەک ئەعلەم گوتی؛ "من بە جەنابی خاوەنشکۆم گوت کە ئەمریکی و بریتانییەکان بەجیا لەوێ [لە کوردستانی عێراق] کاردەکەن. ئەرێ وەها باشتر نییە وایان لێبکەین بەیەکەوە کاربکەین؟ (شا) وەڵامی دامەوە: "وەها باشترە ئەوان بە جیا کاربکەن."[1] لە کۆتاییشدا بڕیارە تاکلایەنەکەی ئێران بۆ مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر بەبێ ئاگادارکردنەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل نمایشی سەربەخۆیی بڕیاردانی شا بوو. "**کاتێک دەرفەتەکەی بۆ هات، یەکسەر قۆستیەوە،** ئیشەکەی تەواوکرد و گەڕایەوە، ئینجا فەرمانی کرد و ڕێگەیدا بەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل بەوە بزانن کە یارییەکە کۆتایی هات."[2]

**شا، *زمانی* جەنگی ساردی بەکارهێنا تا ڕەوایەتی بە سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بدا. زمانی جەنگی ساردیش بۆ قەبەکردنی نەخشەی هەڕەشەئامێزی سۆڤیەت لە هەرێمەکە داڕێژرابوو،** بەوەی وەها نیشانبدا، کە ڕژێمی عێراق هاوپشکی کرملینە و پرسە هەستیارە هەرێمییەکانیان وەها لەیەک گرێداوە کە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا، واتە بۆ سەر ئاسایشی کانە نەوتەکانی کەنداوی فارسی و بۆ سەر ئیسرائیل هەروەک

---

[1] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 348.

[2] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 348.

بۆ سەر یەکێتیی خاکی وڵاتە هاوپەیمانەکانی ئەمریکا لە هەرێمەکەدا پرسی سەرەکین. ڕەگوڕیشەی بەکارهێنانی ئەو زمانە بە شێوەیەکی لێهاتووانە لە لایەن شاوە بۆ ئەو ڕاستییە دەگەڕایەوە، کە ڕوانینی ئەمریکا بۆ ناکۆکییە هەرێمییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین بە چاویلکەیەکی جەنگی سارد دەڕوانی. ئیدی لەم گۆشە شیکارییەدا، کێبڕکێی هەرێمی لەگەڵ کرملین تەواوی گۆی زەوی داگرت، بە شێوەیەک دەقاودەق هیچ بوار بۆ ناکۆکییە خۆجێییە هەرێمییەکان نەمابووەوە. ئیدی لەبەر ئەم بەرژەوتەدا بوو شا بێ ماندووبوون ئەو زمانەی بەکارهێنا و ململانێی کوردی و وەک ئاماژەیەکی دیاری جەنگی سارد وێناکرد، نەوەک کێبڕکێ هەرێمییەکە لەنێوان تاران و بەغدا یان بە شەڕی نێوان بەغدا و پارتی دیموکراتی کوردستانی دابنێ. لە کۆبوونەوەی سەعدئاباد **لە ئاياری ١٩٧٢دا، شا سەرکەوتووانە داڕێژەرانی زمانی جەنگی ساردی گۆڕی، لە جەنگێکی کوردی، کە بەئاستەم لە چیا دوورەدەستەکانی زاگرۆسدا تێبینی دەکرا بۆ جەنگێک لەنێوان بەرەی سۆڤیەت و ڕۆژئاوادا، ئەوەبوو لە کۆتاییشدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ڕاکێشایە نێو جەنگی کوردی.**

ئێرانی پەهلەوی کورتهێن بوو لەوەی *وتار یان بیرۆکەیەکی دەقاودەقی* پڕ لە وردەکاری بۆ سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی خۆی هەبێ. لەژێر جڵەوی حوکمڕانی شادا، **بەشێکی پڕوپاگەندەی فەرمی تیشکی خستبووە سەر "ئاریاییبوون" یان پان ئێرانیزم"ی تەمومژاوی، نمایشەکەش بۆ زیندووکردنەوەی مجێزبەرزیی ئیمپراتۆریەتی ئێرانی بوو.** دوابەدوای کودەتاکەی عیراقیش لە ١٩٥٨دا، ئیدی دڵ و مێشکی هەڵمەتەکەی ئێران دەرهەق بە کورد ئەوە بە قسەی شا بوو؛ "ئەوان لە داب و نەریت و زمان و مێژوویانەوە پاکترین ئێرانی و پاکترین ئارياییین."[1] کاتێکیش لێیان پرسی ئاخۆ هیچ "پرسی کوردی" لە ئێراندا هەیە، هەر خێرا وەڵامی دایەوە، "بە

[1] Memcon, April 13, 1962, FRUS 1961–1963, XVII, 247; Tehran 1044 to State, January 20, 1966, FRUS 1964–1968, XXI, 179.

ڕەهاییەوە نەخێر. لەوانەیە لە وڵاتی دیکە هەبێ، بەڵام لە ئێراندا نییە. کورد هەروەک ئێمە "ئارییایی تەواون".[1] کوردی عێراقیش تێکۆشا لە ڕێی پێداگرتن لەســـەر وتـاری ئـارییـایبوون پەیوەندییەکـانیـان لەگەڵ ئێراندا پتەوبکەن. بارزانی لەناوجەرگەی شـــەڕ لەگەڵ بەغدادا ســـوپاس و پێزانینی خۆی بۆ حزبی پـان ئێرانی لایەنگری کوردی کە لە لایەن موحســـین پشـــکپوور ڕێبەرایەتی دەکرا دەربڕی. حزبی ناوبراویش پشـتی بزووتنەوەی کوردی گرتبوو. ئەو وەهای گوت:

***جیاوازییە ڕووکەشـییەکان لەنێوان لقوپۆپی ڕەگەزێک [ئێرانییەکان] ناتوانێ پەیوەندییە لەیەکدانەبڕاوەکەیان لابەرێ... ئێوە [پارتی پان ئێرانی] بە هەق کوردســـتان وەک میراتگری ڕاســـتەقینەی ئیمراتۆریەتی میدی داناوە... هەر بەڕاستیش، کاتێک هەموو لقەکانی ڕەگەزەکە بەیەکەوەبوون، ئەوا جیهانمان، نەخاســـمە [جیهانی] ئارییایمان لە پەرەســـەندندا بوو، جوامێرەکانیشـــمان ئەوانەبوون، کە نموونەی داگیرکاری و وێرانکارییان تێکشـــکاند، ئەوەی لە ڕۆژئاواوە دەهاتن. جەنگانی ئێرانییەکان بۆ ماوەی حەوت ســـەد ســـاڵ نیشـــانەی ئـازایەتی و ســـەرکەوتن و ڕێگەیـان نەدا بروای کۆیلایەتی ڕۆمانییەکان پێ بنێتە ســـەر خاکی ئاســـیای ئارییامان لە ڕۆژهەڵات. هەر بۆیە، ئێمە شـانازیین [بە مێژووەکەمان] و بەیەکەوە هەروەک جاری جاران بۆ ڕزگارکردنی ڕەگەز و وڵاتی بابوباپیرانمان و هەروەها بۆ تێکشـــکاندنی پیلانگێری شۆڤێنیستەکان یەکدەگرینەوە*** [2].

ئەمەش دەق لەگەڵ بیرۆکە تەمومژاوییەکەی شا بۆ "ئارییابوون" دەهاتەوە.

لەسـەر هەمان هێڵ، بەڵام کەمتر سـەرنجڕاکێش، ئەوەبوو شـا هەوڵیدا خۆی وەک ڕاسـپێرداوی چاودێر بەسـەر جڤاتە شـیعییەکاندا نیشـان بدا. هەر بە

---

[1] Iran's Ministry of Foreign Affairs, No Number.

[2] بارزانی ئەم نامەیەی بۆ پێنجەمین کۆبوونەوەی سالانەی پارتی پان ئێرانی نووسی.
Khak-oKhoon. No. 246. 9 July 1967; Hakemiyyat-e Mellat (Nation's Sovereignty), No. 96–97.

ڕاســـــتیش، چەندین توخمی نێو ســـــاواک و وەزارەتی کاروباری دەرەوە وەهـایـان دانـابوو، کە کۆمەڵگە شـــیعییەکان لە هەرێمەکەدا هـاوپەیمـانی "سروشتی" ئێرانن. لە دوای کودەتاکەی عێراق لە ١٩٥٨دا، ئامانجی ساواک شـــیعەی عێراق بوو، بەڵکو پیلانێک لە دژی بەغدا ڕێکبخەن؛ بەم جۆرە پەیوەندییەکانیان لەگەڵیان لە ماوەی شـــەســـتەکان و حەفتاکاندا توندوتۆڵ کرد. مەهدی پیراســـتەی باڵوێزی ئێران لە بەغدا، لەبەردەم عەبدولســـەلام عـارفدا لێدوانێکی بێباکانەی وەهـای دا، کە ئێران وەک وڵاتێکی زۆرینەی شـــیعە لە هەرێمەکەدا دەکرێ یـارمەتی هەموو شـــیعەی دونیـا بـدا و پێویســتیشــە ئەم ســیاســەتە لەســەر ئاســتی جیهان بپارێزن. ئەو دوانەی مەهدی پیراستە عارفی وەها توورە کرد، لەجێگەی خۆی هەڵسا و بۆنەکەی بەجێهێشــت.[1] لە لوبنانیش نەخشــە ســەوزەکەی ســاواک بە پلەی یەکەم بۆ پتەوترکردنی پەیوەنـدییەکـانی تـاران بە شـــیعەی لوبنـانەوە داڕێژرابوو. تەنانەت لەپاش پەیدابوونی گرژیی لەنێوان تاران و ســەدریشــدا، کەچی شــا خۆی لەوە بەدوورگرت ڕاســـتەوخۆ دوژمنـایەتی لە بەرانبەر ســـەدردا دەرببڕێ. سەید حوسێن ناسریش بە هێزەوە پشتیوانی شای بۆ کۆمەڵگەی شیعە لە هەرێمەکە، بەتایبەتیش بۆ شیعەی لوبنان پشتڕاستکردەوە:

*شــا ڕوانگەیەکی دیارکراوی بۆ شــیعەی موســڵمان هەبوو. لەپاش هەموو شــتێک، خۆ وڵاتەکەی شــا شــیعە بوو. لەچەند بۆنەیەکدا لەوانە لە ســەلامی مەبەســت [پەیوەســت بە یەکەمین ســروش بۆ محەمەدی پێغەمبەر] ، لەوێ کاتێ ئاخوندە شیعەکانی هەرێمەکە بانگهێشتکرابوونە دەرباری شــا، ئیدی ئەوان ڕێز و پێزانینی خۆیان بۆ شــا دەربڕی. شــاش پشــتگیری ســەرجەم کۆمەڵگە شیعەکانی لە هەرێمەکەدا کرد، بە شیعەی پاکستان، هیندستان و کشــمیریشــەوە. ســـەرباری نیازی شـــا، کەچی پشـــتگیریی شـــیعەکانی ئەفغانستانی نەکرد، ئەمەش بۆ پەیوەندییە باشــەکەی لەگەڵ محەمەد زاهیر پاشـای ئەفغانسـتانی دەگەڕایەوە. شـا بە شـێوەیەکی دەقاودەق پشـتگیری*

---

[1] SAVAK Documents, 215/36967-m/6/8609, 22 February 1965.

*شـــیعەکانی لوبنانی کرد. هەر بەڕاســـتیش، شـــیعەی لوبنان کۆمەڵگەیەکی شـــیعەی هەرە گرنگ بوون کە لەلایەن ئێرانەوە پشـــتگیری دەکران. ئەم پشـــتیوانییە و کۆمەکەش بە زۆر شـــێواز دابین کرا، بەتایبەتیش لە ڕێی دامەزراوەی پەهلەوی (دیدار لەگەڵ سـەید حوسـێن ناسـر ، بالتیمۆر، ٢٤ی شوباتی ٢٠١٧).*

مەنسور قەدەریش لەناوجەرگەی شەڕی ناوخۆی لوبناندا گێڕایەوە،

*بەشـیر جمەیل، کە دۆسـتایەتییەکی باشـی لەگەڵ شـادا هەبوو، سـێ جاران هاتە تاران و تکای لە شـا کرد، بەڵکو لە ڕووی سـەربازییەوە کۆمەکی بکا. هەرچەندە ئەویش بەڵێنی کۆمەکەی دا، لێ لەدوا ســـاتدا ڕای خۆی گۆڕی. کاتێکیش من پرسـیاری هۆیەکەم لێکرد، بەم شـێوەیە وەڵامی دامەوە؛ "***خۆ ئەگەر یەک پارچە چەک لەمانە بگاتە دەستی کریستیانەکانی لوبنانی، ئەدی ئەوە ناگوترێ کەوا تاکە پاشـایەکی شـیعە لەجیهاندا هەیە و ئەویش پارەی داوەتە کریســـتیانەکان تا شـیعەی پێبکوژێ؟*** *منیش لە وەڵامدا پێم گوتەوە؛ "جەنابی خاوەنشکۆ، چیدی جیاوازی نێوان شـیعە و کرسـتیان گرنگ نییە. ئەوەی زۆر گرنگە ئایدیۆلۆژیایە. خۆ ئەگەر هێزی کریســـتیانی لەســـەر دەسـتی شـیعە و فەلەسـتینییەکان بشـکێن و ببەزن، ئەوا ئێران لە لوبنان ڕووبەڕووی دوژمنێک دەبێتەوە." بەلام شـــا بە توندی بەرپەچی دامەوە و گوتی؛ "***ناکرێ ئێمە بەم جۆرە لەگەڵ شـیعە بجووڵێینەوە.*** *" ئینجا شـا داوای دارایی ئەلجمەیلی ڕەتکردەوە. هۆکارێکی شـــاراوە لەپشـــت هەڵوێســـتەکەی شاوە هەبوو. پێموایە ئەو کەوتبووە بن کاریگەری هەندێ لە یاریدەدەرانی.*[1]

لە واقیعدا "هۆکاری شـــاراوە"ی شـــا ئاماژەیە بۆ ڕوانینی ئەو لەبەرانبەر کۆمەڵگە شیعەکان و پێگەی ناوەندی ئێران بەوەی "تەورەی شیعە"یە.

---

[1] بەشـــیر ئەلجمەیل ئەندامێکی گەورەی حزبی کەتائیب بوو پاشـــان فەرماندەی هەرە باڵا میلیشیای هێزی لوبنانی لە دووەمین شەڕی ناوەخۆی لوبنانی لە ١٩٧٥-١٩٩٠.

Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History.

**دەکرێ بیرۆکەکانی "ئارییایی" و "تەوەری شـــیعە" بووبنە بنکەی هزریی سـیاسـەتی دەرەکیی نـادەوڵەتییـانەی ئێران.** هەرچەنـدە هەردوو گێڕانەوەکانیش تەمومژاویین و بە لەیەکپچراویش ماونەتەوە. لەکاتێکدا شـا ئاگای لە گەف و هەڕەشەی ئایدیۆلۆژیانەی کۆمۆنیزم و پان عەرەبیزم -بە پلەیەکی کەمتریش جیـاخوازی کوردان و ئیسـلامیزم- هەبوو، لێ ئەو نەیتوانی ئایدیۆلۆژیەکی وردەکاتر بۆ ڕەوایەتی پێدان و فرەوانخوازی خۆی و جێگیرکردنی دەسەلاتەکەی هەروەک سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی دابڕێژێ. هەر بە ڕاسـتیش ڕوانینە واقیعبینییەکەی لە بـایەخی هێزی هزرییانەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران کەم کردبووەوە.

سیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بە شێوەیەکی سـەرەکی لە لایەن *دامودەزگا ئاسـایشـییەکان* هەڵدەسـووڕا. خۆی ئەوە سـاواک بوو نەوەک وەزارەتی کاروباری دەرەوە کە سـتراتیژی پەیوەندییەکانی لەگەڵ کوردی عێراق و شـیعەی لوبناندا بەڕێوەدەبرد. توخمەکانی سـاواک، بەتایبەتیش سـەرهەنگ عیسـا پژمان ڕۆڵێکی چارەنووسـسـازانەی لە قەناعەتپێهێنانی شـادا گێڕا، بۆ ئەوەی لە دژی بەغدا پشتی کوردان بگرێ. هەروەها ساواک ڕۆڵێکی کوشـندەشـی لە پەیداکردنی پەیوەندییەکان و لە کۆتاییهێنان بە پەیوەندییە توندوتۆڵەکان بە شـیعەی لوبنانەوە هەبوو. مەنسـور قەدەری باڵوێز کە زیاتر بە ساواکەوە پەیوەست بوو لەوەی بە وەزارەتی کاروباری دەرەوە. بەگوێرەی قسەی ئیحسان نەراقی بێ؛

*مەنسور قەدەر بە جادووبازییەکەی خۆی توانیبووی هەم سەرنج و ئاگاهی شـا و هەم هی کاربەدەسـتە گەورەکانی دیکەی ئێرانی بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. من لەو بڕوایەدام لە دوای ١٩٦٤دا، شا هەموو پرسێکی تایبەت بە ئاخوندە شـیعەکان بۆ سـاواک وازلێهێنابوو. لەپاڵ ئەمەشـدا، هەموو بابەتێکی دیکەی پەیوەسـت بە میسـر، سـوریا، عێراق، ئوردن و لوبنان لە لایەن ساواکەوە هەڵدەسووڕا. هەموو ڕاپۆرتەکانی پەیوەست بەو وڵاتانە*

*ئەوانەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە ئامادەی دەکردن، دەبوایە بە بن چاودێری قەدەر و ساواکدا تێبپەڕیبان.*[1]

سەدریش ساواکی بە ئاستەنگی سەرەکی سەر ڕێگەی باشبوونی پەیوەندییەکانی ئێرانی لەگەڵ دەوڵەتە عەرەبییەکان دانا.[2] ڕۆڵی بڕیاردەرانەی ساواک لە بنیاتنان و هەڵسووڕاندنی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران، سروشتی پێکهاتەی دەوڵەتی ئێرانی پشتڕاست کردەوە. مایەی سەرنجدانە کە کاربەدەستانی ئەمریکی هەرگیز ڕۆڵی ساواک و دەزگاکانی دیکەیان لە پێواژۆی بڕیاردارشتنی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بەهەند هەڵنەگرتبوو. لەپاڵ کورتهێنانیان لەبارەی زانیاری شایستەوە، ئەوان هەر یەک ڕووی دەوڵەتەکەیان دەبینی، ئەویش لە ماوەی جەنگی ساردا لە شادا خۆی نمایش کردبوو. دوائەنجامیش بەوە شکایەوە، نەیانتوانی پێشبینی شەپۆلە شۆڕشگێڕییەکان لە ئێراندا بکەن.

بە پێچەوانەی ڕای باویش، سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران لە لایەن ڕوانینی خۆبەگەورەزانینی شاوە بۆ پێگەی ئێران وەک هێزێکی زاڵ لە هەرێمەکە و هێزێکی گەورەش لەسەر شانۆی جیهانییدا دانەڕێژرابوو. لە واقیعیشدا ئەو خۆبەگەورەزانینەی شا لەگەڵ کۆتایی هاتنی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێراندا سەریهەڵدا. لە ماوەی نێوان ١٩٧٤ و ١٩٧٦دا، شا ڕەوتی سیاسەتی دەرەکی نادەوڵەتیانەی ئێرانی گۆڕی، پشتیوانی لەسەر بارزانی بڕی و سەدریشی بە دوژمنێک دانا. ئیدی لەو بەرڕەوتەدا بوو کە نەخۆشی خۆبەزلزانینەکەی شا گەیشتە ئاستێکی

---

[1] دیدارێک لەگەڵ ئەو پیاوەی کە لە دوا شەش مانگەکانی دەسەڵاتدا لەگەڵ شادا بوو، ئیحسان نەراقی.

Khabaronline. 3 February 2011. See: ttps:/ /www. khabaronline.ir/ detail/ 127757/ culture/History

[2] SAVAK Documents, No. 213/5701, 29 March 1973.

خوێڕیانه، کاتێک سەرنج و ئاگاهی خۆی خستە سەر ناوچەکانی ئەودیوی کەنداوی فارسی. ئەو لەسەر ئەوە مکوڕبوو کە ئێران پێویستە بۆ ئەوەی ڕێگای دەریایی بۆ ئۆقیانووسی هیندی بەکراوی بمێنێتەوە. لەپێناوی ئەم کارەشدا، نەخشەی بۆ ئەوە دانا بنگەیەکی سەربازی لە ماوریشیوس دابنێ و ئینجا لە قەیرانەکانی شاخی ئەفریقی تێوەگلا بەوەی پشتی سۆماڵ لە دژی ئەسیوپیا بگرێ، کە ئەوکات سۆڤیەتی پشتی دەگرت. "سیاسەتی من ڕاستەوڕاست و ڕاستگۆیانەیە، من هیچ ئەجێندایەکی شاراوەم نییە. من زۆر بە کراویی دەڵێم؛ حەزم لێیە ئێران ڕۆڵی لە ئۆقیانووسی هیندیدا هەبێ. من لاریم لە هەبوونی ئەمریکا لەوێ نییە؛ ئەوەی ڕاستی بێ من کارایانە بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی ئێوە دەکەم." ئەمە قسەی شابوو لە ٢٤ی ئازاری ١٩٧٦دا بە نیلسن ڕۆکفێللەری جێگری سەرۆکی ئەمریکای گوت.[١] کاتێکیش وڵاتە یەکگرتووەکان تێچوونی کەشتییەکی جەنگییان زیادکرد کە قەولبوو ئێران بیکڕێ، ئیدی شا فەرمانی بە ئەعلەم کرد تا ئەمەی خوارەوە بە باڵوێزی ئەمریکا بڵێ:

*ئێمە ئەو کەشتییە جەنگییە ناکڕین. [بە ئەمریکییەکان بڵێ] لەم بارودۆخەدا بۆشایی [هێز] لە ئۆقیانووسی هیندیدا سەرهەڵدەدا و ئێوەش بە خۆتان و دوورگەی دیاکۆ گارسیا دەمێننەوە. بەبێ سەرهەڵدانی ئێران لەوێدا هیچ هێزێکی دەریایی نییە بەدەر لە هێزی هیندییەکان، هەروەها بەبێ هێزی دەریایی ڕوس لە ئۆقیانووسی هیندی. ئەرێ ئێوە متمانەتان بە هێزی هیندی هەیە. پاکستانیش هێزی نییە تا کەشتییە جەنگییەکە بکڕێ. بە سنووورداربوونی هێزی دەریایی ئێمە، ئەوا ناتوانین لە کەنداوی فارسییەوە دەربچین. هەربۆیە ئێوە لەوێ بە تەنیا لە بەرانبەر ڕووسەکاندا دەمێننەوە.*[٢]

[1] Alam, Asadollah, The Shah and I, ed. Alinaghi Alikhani (New York: St. Martin's, 1991), p. 152.

[2] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 328.

هەرچەندە هێزە ڕۆژئاواییەکان ئەوەیان بیرخستەوە کە هێزی پێویستیان بۆ ئاسایشپارێزی ئۆقیانووسی هیندی هەیە، کەچی شا ئەو خاڵانەی ئەوانەی لەبەرچاو نەگرت. هەر بەڕاستیش، کۆتایهاتنی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران هاوزەمان بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی نەخۆشیی خۆبەزلزانینی شا.

لەوەش جەوهەریتر، شا لەوکاتەی دەستبەرداری بیرۆکەی هاوسەنگی هێز بوو لە هەرێمەکە بۆ ئەوەی ڕابەرایەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین بکا، لەوکاتەدا بوو کە سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانی کۆتاییپێهێنا. هەرچەندە دەیزانی کەوتنی بەرگریی کوردی وا لە بەغدا دەکا دەستی کراوە بێ و شەڕێکی مەودا درێژی لەکۆڵ بێتەوە و ئینجا هێزی سەربازی خۆی لە کەنداوی فارسی پەرەپێبدا و هەڕەشەش لە خوزستان بکا، کەچی ئەو هەر دەستی لە پشتیوانی کورد هەڵگرت. بیرۆکەی سەرەکی شا دەستبەربوون بوو لە هاوسەنگی کلاسیکیانەی هێزی هەرێمی لەبری ئەوەدا "دەستگرتن بوو بە دانپێدانانی عەرەبی بە ڕابەرایەتی ئێران لە هەرێمەکەدا."[1] چەند توخمێک لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بەتایبەتیش خودی (عەباس ئارام)ی وەزیر هەروەک هوەیدای سەرۆوەزیر پێشنیازیان بۆ شا کردبوو، بەڵکو لە عەرەب نزیک ببێتەوە تا ڕابەرایەتی هەرێمەکە بکا.[2] لەپاش ئەوەی پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ ئەنوەر سادات دروستکرد، دوا هەنگاوی شا ئەوە بوو، **وا لە عەرەب بکا ڕۆڵی سەرداریتی ئێران بەسەر هەرێمەکەدا قبووڵ بکەن، تەنیا عێراق لەو ناوە مابووەوە، ئینجا ڕووی لە عێراقیش کرد -کە تاکە میملی ئێران بوو بۆ کوێخایەتی بەسەر هەرێمەکەدا- دیاربوو عێراقیش ئاسان بوو.** لەبۆدانەواندنی عێراق لەسەر ئەروەند ڕود وەها لای

---

[1] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States (Yale University Press, 2007) p. 80.

[2] Interview with Major General Mansour Qadar, Oral History, Foundations for Iranian History

دەوڵەتانی هەرێمەکە لێکدرایەوە کە داننانە بە زلهێزیی ئێران. بەگوێرەی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران، ڕێککەوتننامەی جەزائیر ڕێخۆشکەر بوو بۆ "یەکێتیی ئیسلامی-عەرەبی".[1] بەڕوانینی شا، ڕێککەوتننامەکە بووە مایەی ئەوەی وێنەی ئێران وەک نەیارێکی سەرسەخت لای عەرەب بڕەوێنێتەوە. شا لە دیدارێکی لەگەڵ محەمەد حەسنێن هەیکەل لە نیسانی ١٩٧٤دا بیرۆکەی خۆی لەبارەی ڕابەرایەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست باسکردبوو، ئاماژەی بەوە دا؛ "ئێمە لەسەر بنەماکان دەڕۆین، دوژمنی دوژمنم دۆستمە، پەیوەندییەکانیشیمان لەگەڵ ئیسرائیل خەریک بوو بەرەوپێشەوە دەڕۆیشت، بەڵام ئێستا ڕەوشەکە گۆڕاوە... هەندێ جار بیر لە هاوسەنگی نوێ لە ناوچەکە دەکەمەوە... لەوانەیە ئەوەش لە شەقڵێکی ئیسلامیدا بەرجەستە بێ."[2] وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش ڕاپۆرتی خۆی وەها نووسیبوو کە:

***ئێران ڕێککەوتنی خۆی لەگەڵ عێراق وەک هەولوتەقەلایەک بۆ نزیکبوونەوە لە دەوڵەتە عەرەبییەکان دەبینێ. شا کە چاوی لە کوێخایەتی هەرێمەکەیە، حەز ناکا بە نەیاری عەرەب و پشتیوانی ئیسرائیل لەقەڵەم بدرێ. لەوەش پتر، پێیوایە هاوسەنگی هێز گۆڕاوە و بەلای عەرەبەکاندا شکاوەتەوە. هەروەها ئەو ڕەچاوی ئەوە دەکا بەڵکو سیاسەتی ئەمریکاش لەبارەی ئیسرائیلەوە گۆڕانی بەسەردا بێ. شا نایەوێ لەو ڕەوشەدا کورتی بێنێ.[3]***

هەر بەڕاستیش، بناوانی وەستانی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بۆ نەخشەی شا دەگەڕایەوە، بەوەی خستنەڕووی ڕابەرایەتی ئێران بۆ هەرێمەکە مسۆگەر بکا.

---

[1] Beirut 4264 to Ministry of Foreign Affairs, 9 March 1975.

[2] Alpher, Joseph. "Israel and the Iraq-Iran War," in The Iraq-Iran War: Impact and Implications, Efraim Karsh (New York: St. Martin's, 1989), p. 157.

[3] The implication of the Iran-Iraq Agreement—DCI/NIO 1039-75, 1 May 1975.

سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بۆیە جێبەجێکرا تا *تەنیایی ستراتیژییانەی* ئێران لە هەرێمەکەدا قەرەبوو بکاتەوە. لە سەرەتاوە دارشتنی ئەو چەمکە بۆ موحیەدین میسباحی، ستراتیژزانی ناوداری ئێرانی دەگەڕایەوە، کە ئاماژەی بە تەنیایی ستراتیژیی ئێران وەک ڕاستییەک دابوو بەوەی "**ئێران ستراتیژییانە بە دارشتن و ستانداردەوە تەنیایە و بێبەشە لە هاوپەیمانی واتادار و یەکێتییەکەی هێزی گەورە.**"[1] میسباحی بە لێهاتوویەوە بەدوای پەیوەستی سەختی کۆماری ئیسلامی لەنێو سیستمی نێودەوڵەتیدا گەڕاوە، ئەمەش بە تیشک خستنەسەر چەمکی تەنیایی ستراژییەوە. هەرچۆنێک بێ، تەنیایی ستراتیژی خەسڵەتێکی تایبەتی شۆرشگێڕێتی ئێران نەبوو. بە پێچەوانەی ئەو تێرامانە باو و بەربڵاوەی کە (شـا)یان بە بووکەڵەی ئەمریکا دەزانی، کەچی شـا هەرگیز هەسـتی نەدەکرد بەوەی ئەمریکا پاڵپشتێکی مسۆگەرە بۆ ئێران و قەڵەمڕەوێتییەکەی لە حاڵەتی هێرش و داگیرکردنی سۆڤیەت یان هاوپەیمانەکانی مۆسکۆوە. ئەو بە تەواوی لەوە تێگەیشتبوو، لە دۆخێکی وەها، کە سۆڤیەت ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەستدرێژکەر بووایە بۆ سەر ئێران، ئەوا هیچ وڵاتێکی دیکە بەدەر لە ئێران خۆی بۆ یەکێتیی نیشتمانییانەی ئێران دەستەبەر و گرەنتی نەدەبوو.[2] هەروەک باڵوێزەکەی ئەمریکا لە کۆتایی چلەکان بە شـای لاوی گوتبوو، "**ئەمریکا هەرگیز بۆ خاتری ئێران و بۆ ڕزگارکردنی ئێران، لەگەڵ سۆڤیەت بەشەڕ نایەت.**"[3] تەنانەت ڕێککەوتنی بەرگریی دووبەدووش لەگەڵ ئەمریکا لە ٥ی ئازاری ١٩٥٩دا ئەو نیگەرانییەی شـای نەڕەواندبووەوە. هەروەها نە پەیمانی بەغدا لە ١٩٥٥ نە میراتگرەکەی خۆی، واتە پەیمانی

---

[1] Mesbahi, Mohiaddin, "Free and Confined: Iran and the International System," Iranian Review of Foreign Affairs, Vol. II, No. 5, Spring 2011, pp. 9–34.

[2] Sobhani, Sohrab, The Pragmatic Entente: Israeli-Iranian Relations, 1948–1988 (New York: Praeger, 1989), p. 128.

[3] Parsi, Trita, Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the United States, Yale University Press, 2007, p. 25.

سەنتۆ لە ١٩٥٩ ئەو تەنیاییە ستراتیژییەی ئێرانی قەرەبوو نەکردەوە. شا وردە وردە لە بڕوابوون بەوەی سەنتۆ قەڵایەکی بەرگریی لەدژی هەڕەشەکانی سوور و عەرەب بۆ سەر ئێران بێهیوا دەبوو. جەنگی پاکستان-هیندستان لە ١٩٧١دا و شکستی ئەندامەکانی لە یارمەتیدانی ئیسلامئاباد دوا مێخ بوو لە دارەبازی پەیمانی سەنتۆوە درا. ئاسایبوونەوەی پەیوەندییەکانی سۆڤیەت-ئەمریکاش هیندەی دیکە نیگەرانی شای لەبارەی تەنیایی ستراتیژیی ئێران قووڵتر کردەوە. لە هەمان کات و بە قەناعەتهێنان بە شەڕی ڤێتنام، ئیدی ستراتیژزانەکانی ئەمریکا گومانیان پەیداکرد لەوەی ئەمریکا بتوانێ بەدوای "پابەندییەکانی لەو ناوچانەی کە بەرژەوەندی کەمەرەیی/لاوەکی تێدایە، بچێ.[1] بەم پێیە، ئەو سەختانگانەی لە دەرەوەی ناوچەکانی ناتۆ NATO ـەوە پەیدادەبوون، کەمتر "ئەو هێزە سیاسییانەیان هەبوو وەک پرسێکی سیاسی بۆ چارەسەرکردن لەنێوان واشنتن و مۆسکۆدا دەربکەون."[2] بە قەومانی گۆبەندە شەرمەزارییەکەی واتەرگێت و کورتهێنی وڵاتە یەکگرتووەکان لە خواست و توانستەوە بۆ پشتگیری ئێران، لە حاڵەتێک گەر بهاتابا لە لایەن سۆڤیەت و هاوپەیمانەکانییەوە هێرشی کرابایە سەر، ئیدی دەبووایە سوپای ئێران وەک "تێلدڕی بەربەست" بە بێ پاڵپشتییەکی مسۆگەرییانەی ڕۆژئاواییەوە بجەنگابان. ئەم پەرەسەندنانەی تەنیایی ستراتیژی شایان دڵنیاکردەوە لەوەی بەدوای بەرژدەوەندییە نیشتمانییەکانیدا بڕوا. شا ڕوانینی خۆی لەبارەی تەنیایی ستراتیژی لە سەردانەکەی خۆی بۆ مۆسکۆ لە نۆڤێمبەری ١٩٧٤دا ڕوونکردەوە. شا کاردانەوەی خۆی بۆ ڕوسەکان وەها باسکرد:

---

[1] Freedman, Lawrence, The Evolution of Nuclear Strategy, Palgrave Macmillan, Third Edition, 2003. p. 344.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

*"ئەوان لێیانپرســـییم ئاخۆ بۆچی و لە دژی کام وڵات بەم زۆرییە چەک و جبەخانەم کڕیوە و داکردوە[1]... ئەوان ئەوەشیان بۆ زیادکرد کە بەدگومانیی زۆریان [لە ســیاســەتی چەک و جبەخانەی من] هەیە. منیش وەها وەڵامم دانەوە، من باکم بەوە نییە ئاخۆ ئێوە بەدگومانن یان نا. ئێوە ئەو مافەتان نییە لێم بپرســن، بۆچی وڵاتەکەی خۆم بەهێز دەکەم. هیچ کەسـێک مافی دەســتوەردانی لە کاروباری وڵاتێکی دیکەدا نییە. ئەوە تەنیا هەر خۆمم کە باش دەیزانم وڵاتەکەم چەند پێویستی بە هێز و بە چەک و جبەخانە هەیە. من نــامەوێ هۆکــارەکــانم بە ئێوە بڵێم، بەڵام من دەمەوێ یەک لە ئەزموونەکــانی خۆم لەگەڵ ئێوەدا بەش بکەم. ئەویش ئەوەیە؛ ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و هاوپەیمانیی قسەی قۆڕ و بێ کاریگەرییە... من نامەوێ لە لایەن وڵاتێکی دیکەوە ببەزێنرێم، هەروەها ئەگەر من ئەوەندە بەهێز نەبم تا دەستدرێژیکەر ببەزێنم، ئەوا [ئێران] بە سەلامەتی بەجێ ناهێڵم."*[2]

---

[1] داکردن: هەڵگرتن، ئەمبارکردن، خەزنکردن. وەرگێڕ.

[2] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). pp. 249–50. کورتهێنی ئێران لەبارەی هاوپەیمانێکی ســروشــتی لەلایەن چەندین کاربەدەســتی پەهلەوەیە هەســتپێکراوە. مەنسور قەدەری باڵوێز وەها دانی پێدا ناوە:

"بۆ بەدبەختی، دەبێ ئەوە پشــتڕاســتبکەمەوە کەوا هەرگیز ئەمریکا بە چاوێکی باش ســەیری ئێرانی نەکردووە، تەنــانەت لەوپەڕی هەرمێنی پەیوەنــدیش لەگەڵ تــاراندا... جــارێکیــان ئەفســەرێکی ئامریکایی لە تاران پێیگوتم، 'لەو ساتەوەختەی جێگرەوەیەک بۆ شا بدۆزینەوە، ئەوا ڕژێمەکە دەگۆڕین.' بەریتانییەکانیش لەوە تەلیســـماویتر بوون. هەڵوێســـتی ڕژێمە عەرەبییەکانیش ڕوون نەبوو. گرووپێکیان بە ڕابەرایەتی جەمال عەبدولناسر، بەعس [ڕژێمی عێراق] یــان قەزافی بە تەواوی دژی ئێران بوون. گرووپی دووەمی عەرەبــانیش وەک عەرەبســتانی ســعودی دیاربوو دژی ئێمە نەبوو، بەڵام ئیرەیی بە ئێمە دەبرد و هەســتێکی قیناوی لە بەرانبەرماندا هەبوو. من بۆ چەندین ساڵ لە ئوردن بووم. هەرچەندە شا حوسێن ڕێزی ئێرانی لە لابوو، لێ شازادە حەسەنی جێگرەوە لەژێرەوە ڕێزی ئێرانییەکانی نەدەگرت. بەگشــتی ڕژێمە عەرەبییەکان لەگەڵ ئێمە باش نەبوون. عەرەب لە ماکەوە لەگەڵ ئێمە باش نین، مێژووش ئەو ڕاستییەی سەلماندووە." دیدا لەگەڵ لیوا مەنسور قەدەر،

**ئیدی لەبەر ئەو بەرڕەوتەدا بوو شـا سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی وەک قەرەبووکردنەوەی تەنیـایی سـتراتیژی و کورتهێنی وڵاتەکە لە هاوپەیمانێکی ستراتیژییەوە ڕۆنا.**

هەرچەندە لە جومگە مێژووییەکاندا هەرگیز شـا متمانەی بە پشـتگیریی ئەمریکییەکان نەکردبوو، لێ ئەو بەرانبەر پشتگیریی هێماداریانەی ئەمریکا بۆ سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران هەسـتیار بوو. ئەمەش بە شێوەیەکی سەرەکی لەبەر تەنیایی ئێرانەوە بووە. لە ڕاستیدا پێداگرتنی شا لە ڕاکێشـانی وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ نێو جەنگی کوردی بۆ ئەوە بوو، کە کەمتر لەسـەر بنەمای پێویسـتی سـەربازی-سـیاسـی ڕۆنرابوو لەوەی داوایەک بوو بۆ پشـتگیریی سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی خۆی.[1] لەکاتێکدا کاربەدەستە ئەمریکییەکان بەوەیان دەزانی کە ئێران و ئیسـڕائیل بە تەواوی تواناوە لە پشـتی کوردانن،[2] کەچی ئەوان کۆمەکە داراییەکەی ئەمریکایان تەنیا بە "ئاوڕدانەوەیەکی هێمادای هاوسـۆزی" دەزانی، ئاخر هەر بەتەنیـا شـا دەیتوانی بەپیر داواکـانی کوردەوە بچی."[3] هەروەهـا کاربەدەسـتە ئەمریکییەکان هاوکاریی سـی ئای ئەی- سـاواکیان بە "هۆکارێکی سـایکۆلۆژی گرنگ دەزانی بەوەی کورد وەها بزانن ئەمریکای مەزن پاڵپشتیانە."[4] پێویستی هەستیار و هێمادارانەی شا بۆ پشتیوانی وڵاتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا لە میـانەی تەنگژە خۆجێی و دەرەکییەکـان دووهێنـدەیـان لێهـات، بەتـایبەتیش تکـای ئەو بۆ پشـتیوانی ئەمریکـا لە

---

History Oral History, Foundations for Iranian

[1] Helms to Kissinger, August 25, 1973, CIA-Helms.

[2] NSC, Memorandum, Saunders to Kissinger, "Supporting the Kurdish Rebellion," March 27, 1972 (FRUS/1964–68/XXI/doc.301), p. 1; Saunders to Haig, March 27, 1972, FRUS 1969–1976, E-4, 301.

[3] Scowcraft to Helms, March 26, 1974, FRUS 1969–1976, XXVII, 244.

[4] Memorandum from Kissinger for the President's File, undated, EBB 265, NSA-GWU.

ناوچەرگەی هەرمێنی خۆماڵیکردنی نەوت لە پەنجاکان و لە سەرووبەندی شۆڕشی ئیسلامیش لە ۱۹۷۹دا. لە کۆتاییشدا کاتێ هەستی کرد کە ئەمریکا پشتی ناگرێ، ئەوەبوو بۆ هەمیشە وڵاتەکەی خۆی بەجێهێشت.

**تەنیایی ستراتیژیی ئێران لە *عەقلیەتی گەمارۆدراوی* شادا بەرجەستە بووبوو. ئێران لە چاوی شادا، کێشەیەکی ئاسایشی تیژ و کوشندەی هەبوو. ئەو بە یەک یان دوو زلهێز دەورەدرابوو، بە سۆڤیەت و هاوپەیمانەکانی لە عێراق و ئەفغانستان، هەروەک چۆن بە ڕژێمە پان عەرەبییەکان و شێخنشینە عەرەبییەکان، ئیدی ئێران لەدیدی شاوە لە هاوپەیمانی 'سروشتی' کەم بوو، هەستی بە نائاسایشیی دەکرد.** شا دەردەدڵی لای ئەعلەم ئەوە بوو: "هەر بەڕاستی دوای ئەوەی دوولا مەقاشی مۆسکۆ لە کابول و بەغدا وە گەمارۆیان داوین، ئێمە لە ڕەوشێکی پڕ لە کێشەدابین."[1] هەر بۆیە لە دوای کودەتای ۱۹۵۳دا بڕیاریدا پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان ببەستێ. لەگەڵ ئەوەشدا، کەموکورتی متمانەی شا بە ئەمریکییەکان ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە هاوپەیمانی ستراتیژی لەگەڵ ئەمریکا هەروەک پەیمانی بەرگرییەکەی نە درێژخایەنە و نە پتەو. ئەو سیاسەتی خۆبەدوورگرتنەی ئەمریکا لە بەرانبەر پان عەرەبیزمدا لە شەستەکان، شای هێنایە سەر ئەو بڕوایە کە خۆی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی خۆی بۆ پاراستنی یەکێتیی خاکی نیشتمانیی ئێران بپارێزێ. بە کورتی، شا پەیوەندی ستراتیژی خۆی لەگەڵ کوردی عێراق دارشت، بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش کەمتریش لەگەڵ پەیوەندییەکانی لەگەڵ شیعەی لوبنان گرێدا بۆ ئەوەی قەرەبووی تەنیایی ستراتیژی ئێران بکاتەوە. سەرەڕای ئەو پەی پێبردنە، شا بڕیارێکی لە دژی لۆژیکی تەنیایی ستراتیژی ئێران دا، بەوەی پشتیوانی لەسەر کاراکتەرە نادەوڵەتییەکان

---

[1] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 259.

ببڕێ. هەروەک موحیەدین میســـــباحی لێهاتووانە ئاماژەی پێدا، لۆژیکی تەنیایی ســــتراتیژیی نیشــــانەی بەو ڕاســــتییە داوە کە "**ئەو دەوڵەتەی سنوورەکانی قەڵای بەرگرین، پێویستە پشت بە هێزی ناوەخۆیی ببەستێ.**"[1] بە وتەیەکی دیکە، تەنیـایی ســــتراتیژیی ئێران بنەمـا جەوهەری و سەربەخۆکانی پاراستنی ئاسایشی نیشتمانیی ئێران نیشان دەدەن. کەچی دوا بڕیـاری شـــا وڵاتەکەی لە توانســــتی ئەو بەرگرییە دابڕانـد و لە بەرانبەریشـــدا، لە میانەی ســـەختانگە ناوەخۆیی و دەرەکییەکانیدا ئێرانی لاواز کرد. هەر بە هەمان شـــێوە، دوا بڕیاری شـــا وای لە ئاســـایشـــی نیشـــتمـانیی ئێران کرد زیـاتر پشـــت بە دۆســـتـایەتی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ببەســـتێ. ئەم ڕوانینە دەرکییە بۆ ئاســـایشـــیی نیشـــتمـانیی ئێران بە تیژی دژی لۆژیکی تەنیـایی ســــتراتیژیی ئێران وەستایەوە.

ئەم تەنیاییە ســـتراتیژییە کە دنەدەرێکی ســـەرەکی ســـیاســـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بوو، بەرهەمێکی *جوگرافیای* دیاریکراوی ئێرانە. شـــا بە باشـی لە نزیکییەتی جوگرافیای ئێران [لە سـەرچاوی هەڕەشـەوە] بەڵەد بوو. ئەو دەیزانی، نزیکی ئێران لە ســـۆڤیەت و لە دەوڵەتە ڕادیکـاڵە عەرەبییەکان، هەڕەشەکانی دژی ئێران چڕتر کردۆتەوە، ئاخر "هەڕەشەکان لە مەودا کورتەکاندا ئاســـانتر دەجووڵێن لەوەی لە مەودا درێژەکاندا."[2] لە کاتێکدا نزیکییە فیزیکییەکەی ئێران لە سۆڤیەتەوە، هەڕەشـەیەکی هەبوو بۆ ســەر وڵاتەکە، کەچی شـا هەوڵیدا ئەو کورتهێنییە جوگرافییە بە پشـتگیریی ئەمریکاوە داپۆشـێ. ئەو بە ڕوونی مشـتومڕی لەســەر ئەوە بوو، "ئێمە ناچارکراوین بە دەوڵەتێکی لایەنگری خۆرئاوا دابنرێین، چونکە ئێمە هەرگیز

[1] Interview with Mohiaddin Mesbahi, 21 March 2018.

[2] Buzan, Barry and Ole Waver. Regions and Powers: The Structure of International Security, Cambridge University Press, 4 Dec 2003. p. 4.

ناتوانین بڕوا بە سۆڤیەت بکەین."[1] لە بۆنەیەکی دیکەدا ئەو وەهای بە ئەمریکییەکان گوت؛ "هۆکاری هەبوونی ئێران بۆ ئەمریکییەکان ئەوەیە کە لە دژی ڕوسیا بجەنگی."[2] شا لە فرۆشتنەوەی ئەو چوارچێوە جیۆپۆلیتیکییەی جەنگی سارد بە ئەمریکییەکان سەرکەوتوو بوو. هەروەک دواتر کیسنجەر وەهای نووسی؛ "پابەندییەکانمان بۆ بەرگریکردن لە ئێران هی ئەوە نەبوو هەر کاتێ نارەحەت بووباین بکشێینەوە، چونکە ئەوە کردەیەک بوو بۆ بەرژەوەندییە جیۆپۆلیتیکەمان."[3]

لەپاڵ ئەمەشدا، ئێران لەبن باری ***ناسکیی*** جوگرافیەکەشیدا نالاند. ئاخر ئێران کەوتووەتە ناوجەرگەی هەرێمێک لەنێوان نیل بۆ ئۆکسوس(جەیحون)، ڕۆژهەڵاتی ناوینی گەورەتر یان ئەوەی پێدەگوترا ئۆیکوۆموس oikoumene[4]، ئێران خۆیشی بە قەڵای ڕۆژهەڵاتی نزیک دەبینێ. هەروەک ڕۆبەرت کاپلانیش مشتومڕی لەسەر کرد، "هەروەک ڕۆژهەڵاتی ناوین بۆ ئارفۆ-ئۆراسیا چوارگۆشە(چوارلا)یە واتە دوورگەی جیهانە، ئەوا ئێرانیش بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین جومگەی گەردوونییەتی. ئیدی پێویستە کەمەرەکەی ماکیندز بگوازرێتەوە، لەبری خاکی بەیار و قاقڕی ناوجەرگەی ئاسیا

---

[1] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995). p. 328.

[2] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. I: 1347–1348/1968–1969 (Bethesda, MD: Iranbook, 1993). p. 193.

[3] Kissinger, Henry. Years of Renewal (New York: Simon & Schuster, 1999). pp. 594–596.

[4] ئۆیکوۆموس oikoumene بە گریکی واتە جیهانی ئاوەدان، ئەو جیهانەی خەڵک لێی ژیاوە، لە کۆندا بۆ قەڵەمڕەویێتی ئێران و ڕۆمانەکان بەکارهێنراوە-وەرگێڕ.

پێویســـتە بۆ باشـــوور بۆ بانی ئێران بگوازرێتەوە.[1] کورت و پوخت، ئێران جومگەیەکی زۆر ستراتیژییە کە سنووری لەگەڵ حەفت وڵاتدا هەیە. لەگەڵ ئەوەشـــدا جوگرافیا لەبەر کورتهێنی ***ســـنوورێکی ســـروشـــتی بەرگریکار،*** نەفرەتی لە ئێران کردبوو، وەنەبێ وەک وڵاتە یەکگرتووەکان و بریتانیا بێ؛ ئەم خەسڵەتەی ئێران وای لێکردبوو هەر لە کۆنی کۆنەوە ســەرنجی زۆر لە هۆز و نەتەوەکـان بۆ بـانەکـانی ئێران ڕابکێشـــێ و لێی بژین، لە بەرانبەریشـــــدا بەردی بنـاعەی ***نەفرەتی جوگرافیـاکەی*** بوو. ***نەفرەتە جوگرافیاکەی*** سەر ئێران هاوتەریب بوو لەگەڵ خاکە پانوپۆڕو و سنوورە کۆنترۆڵنەکراوەکەی، **ئەمەش وای کردبوو وڵاتەکە ببێتە مایەی چاوتێبڕینی ئاشـــوری، گریک، عەرەبی موســـڵمان، مەغۆل، تەتەر، تورک، ئۆزبەک، پورتوگالی، ڕوس و بریتانییەکان.**

ئەم نەفرەتە جوگرافیایەی ئێران، بووە مایەی ناســـەقامگیرییەکی مێژوویی بەردرێژ بۆ وڵاتەکە. ئەم خەســـڵەتە ڕەگئاژۆیەش وەنەبێ هەر بەتەنیا لە مەیدانی ســـیاســـی-ســـەربازییدا خۆی نمایش کردبێ بەڵکو لە مەیدانی پەرەســەندنی ئابووری و کەلتوریشدا بووە. هەر بەڕاســتیش پاڵوەدانی شـا بە وڵاتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا کەمتر لەســـەر بنەمـای عەقڵیەتی لایەنگرانەی ڕۆژئاوابووە لەوەی نائاســـایشـــی مێژوویی ئێران بووبێ. ڕوانینی ئەو بۆ هـاوچەرخکردن بە شـــێوەیەکی بەرچـاو جیـاواز بوو لە ڕەچەتەی ڕۆژئـاوا بـۆ هەمـان چەمـک. لە چـاوی شـــادا ڕێـگەی هاوچەرخکردنەکە بە پێشـــووەچوونی باری ســـەربازیی تێدەپەڕێ نەوەک بـاری کۆمەڵایەتی -ئـابووری – ،نوێبوونەوە و هـاوچەرخکردنی هێزی ســـەربازی ئەو نمایشـە شـکۆدارە دراوەتە ئێران کە پێویسـتی پێی هەیە.[2]

---

[1] Kaplan, Robert D. "The Revenge of Geography: What the Map Tells Us About Coming Conflicts and the Battle Against Fate," Random House; First Edition, September 11, 2012, p. 158.

[2] "Memorandum of Conversation," 13 Apr. 1962. FRUS 1961–1963 XVII, p. 607.

ئیـدی لەو گۆشـــــەنیگـایەوە، هێزی ســـــەربـازی ئێرانی نەوەک لایەنە ئابوورییەکەی وای لە وڵاتەکە دەکرد ئاســـــایشـــــی پارێزراوتر بێ. وێڕای ســـەرکەوتنێکی بەش بەشـــی لە چاکســـازیی کۆمەڵایەتی-ئابووریيدا، کە بە شۆڕشی سپی ناسرا، شا لەو بڕوایەدا بوو، کە "بۆ سەرکەوتن لە بواری ئابووریيدا، ئەوا ئێران پێویســـتی بە کات و ئاســـایشـــپارێزییەوە هەیە."[1] لە کۆبوونەوەیەک لەگەڵ کاربەدەســـــتان و وەزیرەکانیدا، شـــــا بە توندی کاردانەوەی لە بەرانبەر فەرەح دیابا، شـــابانووی ئەوکاتی ئێرانەوە هەبوو، کاتێک فەرەح دیبا پرســـی پێشـــکەوتنی کەلتور و موزیکی وڵاتەکەی هێنایە پێشـــەوە. شـــا بەم شـــێوەیە وەڵامی ژنەکەی دایەوە: "ئەمە کاری تۆ نییە! لە کـاتێکـدا ئێمە شـــــانـازیمـان بە کەلتوری ئێرانەوە دەکرد، کەچی ئێران داگیرکرابوو [لە لایەن هاوپەیمانانەوە]. باشـــە کامە ئامێرمان لە شـــەڕەکەدا بەکارهێنا؟"[2]

ئەو نائاسـایشـییە مێژووییە دەرەنجامی زۆر قەبەی بەسـەر باری دەروونی و کەلتوری نەتەوەیی لەبـارەی ڕەفتـارنوانـدن لەگەڵ بێگانەکـانەوە هەبوو، ئەمەش بە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕەشبینی و ترس لە بێگانە (بێگانەفۆبیا) و دیمـانەی پیلانگێڕییەوە ڕەنگی دایەوە. شـــــا لە کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ هنری کیســـــنجەردا گوتبووی؛ "ڕۆشـــــنبیرەکان جیهان وێران دەکەن بەبێ ئەوەی بزانن چی جێگەی دەگرێتەوە. ئەوان نەخشـــــەیان نییە. ئەوان لە نێو ڕژێمی کۆمۆنیستیدا دەبێ جادەوبان خاوێن بکەنەوە."[3] لە جەختکردنە سەر کارلێککردنی ســـروشـــتیانەی نێوان ڕۆشـــنبیران و کۆمۆنیســـتەکان، ئەو ئەمەشی خستەسەر کە بڵێ؛ "دەکرێ ڕۆشنبیران ببەنەوە و دەست بەسەر جیهاندا بگرن بێ ئەوەی هی باشـــتر بنیاتبنێن، چونکە کاتێک ئەوان تێکی

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2] http://www.youtube.com/watch?v=KgoiDgArsEU

[3] Memorandum of Conversation, May 15, 1975. (FRUS 1969–1974, XXVII, p. 377).

دەدەن، کۆمۆنیستەکانیش دێن و دەستی بەسەردا دەگرن.[١٠] ئەم ڕوانینە هێڵی بەژێر پەیوەندی نێوان بیانییەکانی دەرەکی/بێباوڕەکان و ئۆپۆزسیۆنی نێوەخۆ/دووڕووەکان لە کەلتورێکی سیاسی زاڵدا و دەروونناسیی سیاسی لەنێو ئێراندا نابوو، هەروەها بە سروشتیشی دانابوو. ئیدی لەو بەرڕەوتە نائاسایشییە مێژوویەدا بوو کە سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران داڕێژرا.

سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران گرێی ***کورتهێنی بەرگری*** درێژخایەنی ئێرانی سەلماندەوە. وەک دەوڵەتێکی ستراتیژی تەنیابال، ئێران کەموکورتی لە ڕووی بەربەستی جوگرافیایی خۆکردییەوە هەبوو. وەک مێژووش نیشانی دا، ئێران نەیدەتوانی لە بەرەی پێشەوە بەرگری لە سنوورەکانی خۆی بکا. **شکستهێنانی ئێران لە هەردوو جەنگی چاڵدێران (١٥١٤) و خوڕەمشەهر (١٩٨٠) ئەوە ناتوانایيە زۆرەی ئێرانی بۆ پاراستنی سنووری وڵاتەکەی سەلماندەوە.** بە دەربڕینێکی دیکە، نەفرەتی جوگرافیای ئێران و تەنیایی ستراتیژیی شای هێنایە سەر ئەو بڕوایە، **دەبێ بۆ پاراستنی یەکێتیی نیشتمانی و سەربەخۆیی وڵاتەکەی لەودیو سنوورەکانەوە لە ڕێی سیاسەتی دەرەکی نادەوڵتییانەیدا سنوورەکانی خۆی بپارێزێ.** ئەمەش واتای ئەوەی دەگەیاند کە ئێران بە چاوپۆشی لەوەی جۆری ڕژێمەکەی یان ئایدیۆلۆژیەکەی هەرچییەک بێ، ئەوا هەر دەبووایە لە دەرەوەی سنووری خۆی نمایشی هێز و دەسەڵاتی خۆی بکردایە. لەگەڵ ئەوەشدا، سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران –کە لەمێژبوو بەدوای ستراتیژی بەرگریی لە دەرەوەی سنوورەکانی خۆیدا دەگەڕا– بۆ ستراتیژی هێرشبەرانەی لە هەرێمەکەدا داڕشتبوو. بە وتەیەکی دیکەوە، هەوڵ و کۆششی تاران –لەژێر جڵەوی شا و کۆماری ئیسلامییدا– بۆ زاڵبوون بەسەر خەوشی جوگرافی وەک **فراوانخوازییەکی ئێرانی یان شیعەیی** داڕێژرابوو. ئیدی ئەمەش لە کورتهێنی بۆ هەر ڕێککەوتننامەیەکی

---

[١] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەکۆمەڵی ئاسایشپارێزی هەرێمی یان هەر دامەزراوەیەکی لەو چەشنەدا چڕ بووبووەوە، ئیدی ئەم گرێیە ئاڵۆزەی ستراتیژی بەرگری ئێرانی بۆ ستراتیژی هێرشبردن وەرگەڕا. کورت و پوخت، ئێران کەوتبووە نێو داوی گرێی ئاڵۆزی بەرگری-هێرشبەری: ئەمە لە کاتێکدا سەرکردە ئێرانییەکان بە (شا)شەوە، ئامانجیان بەرزەفتکردنی هەڕەشە نێودەوڵەتی و هەرێمییەکان و بەرگریکردن بوو لە یەکێتیی خاکی ئێران، ئەمەش هەمووی لە ڕێی ڕۆنانی پەیوەندی ستراتیژی لەگەڵ قەوارە نادەوڵەتییەکانەوە بوو، ئاخر دەوڵەتە هەرێمی و نێودەوڵەتییەکان سیاسەتی دەرەکی نادەوڵەتاییانەی ئێرانیان بە ستراتیژێکی هێرشبەر دانابوو. ئەمەش ڕەوشێکی سەختانگی درێژخایەنی جوگرافیای ئێران بوو.[1]

سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران کرۆکی بونیادی *شارستانێتی* ئێرانی نمایشکرد. سەرهەڵدانی هێزی ئێران لە مەیدانگەلی ئەودیوی خاکی خۆیەوە، تا ڕادەیەک لە ڕێی شارستانییەکەیەوە بوو، ئەمەش وەک بەرهەمێکی جوگرافی و دیرۆک و کەلتورییەوە بوو. هێزگەلی کەلتور و جوگرافیا و مێژوو بەیەکەوە بونیادی بەکۆمەڵی قووڵی دەوڵەتیان لە ڕێی دەوڵەتەوە ڕۆنا کە ئەویش ئێرانە. **وەک 'یەکەمین گەلی مێژوویی' بە دەستەواژەی جۆرج ویلیەم فریدریک هیگل،[2] ئێرانییەکان یەکەمین ئیمپراتۆرییەتیان لە جیهاندا دامەزراند، بەسەر فرە هۆزدا بڵاوبووبووە، هەر لە پەنجاب، کشمیر و پامیر لە ڕۆژهەڵاتەوە تا لیبیا، ئەسیوپیا و بولگاریا لە ڕۆژئاوا پەلوپۆی هاوێشتبوو.** بە پێچەوانەی وڵات و نەتەوەکانی دیکەی هەرێمەکە کە ناسنامەی نیشتمانی ئەوان لەسەر بنەمای هۆز و خێڵ بوو –شێخنشینەکانی عەرەب لەسەر کەنداوی فارسی- یان لەسەر خوێن – وەک تورکیا – یان لەسەر دیین وەک پاکستان، کەچی هی ئێران

[1] Mesbahi, Mohiaddin, 'Free and Confined: Iran and the International System', Iranian Review of Foreign Affairs, Vol. II, No. 5, Spring 2011, pp. 9–34.

[2] Hegel, George Wilhelm Fredrich, The Philosophy of History, New York, 1956.

***شارستانییەت*** بنەمای دەوڵەت بوو. هەر بەڕاستیش، ئێران دەوڵەتێکی نوێ نییە. **ئێرانیش هەروەک چین و هیندستان، شارستانیەتێکی دێرینی هەیە**، بۆ زیاتر بەرچاوڕوونی شتێکی دەستکرد لەبارەی ئێرانەوە نییە. ئێران وەک ڕاکێشەرێکی شارستانێتی،[1] گەلانی دیکەی هەرێمەکەوە بە فرە کەلتوری و زمانەوە بۆ کەمەرەی شارستانێتی خۆی هەر لە دەریای سپی ناوەڕاستەوە تا ڕوباری ئیندوز بۆ خۆی ڕاکێشاوە. بە پێچەوانەی چین و هیندستانیشەوە –کە خاکی ئێستایان بەربەرینترە یان بەلای کەمییەوە کاتی خۆی لە ڕووی مێژووی شارستانییەوە هاوشان بوون- **خاکی ئێستای ئێران زۆر بچووکترە لە خاکی شارستانێتی ئێرانی**. ئێران زۆ لە خاکی خۆی بۆ وڵاتە تازە دامەزراوەکان لە دەست دا. ئەمڕۆ ئەو وڵاتانەی ئەودیو سنووری ئێران هێزێکی شارستانی بەهێز و پتەوی، سەرنجی گەلانی خۆیان بۆ لە هەندێ بەشدا بۆ خاکی دایک بۆ ئێران ڕادەکێشن. لەناوجەرگەی شارستانێتی ئێرانیدا یادەوری هاوبەش و بەهای بەرجەستە و هێمای دیاریکراو هەن. لەو خوێندنەوەیەدا ناسنامەی شارستانیەتی ئێران ڕاستی یادەوەری هاوبەش و بەهای بەرجەستەبوو و هێمای دیاریکراوی دەقاودەق نیشان دەدا کە چەقی بازنەی شارستانییەتی ئێرانن. لەو خوێندنەوەیەدا ناسنامەی نیشتمانیی بنەمای شارستانییەتی ئێرانی لە دەوری دوو هێمای سەرەکی داڕێژراوە کە ***نەورۆز و عاشوران***. نەورۆز، ئاهەنگی ساڵانەی نیشتمانیی ئێرانییەکان و عاشورا، کە یادکردنەوەی شەهیدکردنی ئیمامی سێیەمی شیعە بەو شێوە دراماتیکییەی لەناو جەرگەی شارستانێتی ئێران دایە. بە کورتی شارستانیەتی ئێرانی وەهایە کە دەکرێ بە ئاسانی پەیوەندی هەردوو دیو "شیعەگەری-دینی" و "ئێرانی-ڕەچەڵەک" بە قەوارە نادەوڵەتییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوینی گەورەترەوە گرێبدا.

---

[1] Kaplan, Robert D. "The Revenge of Geography: What the Map Tells Us About Coming Conflicts and the Battle Against Fate," Random House; First Edition, September 11, 2012, p. 158.

سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران و ناسنامەی نیشتمانیی کە لەسەر شارستانێتی ڕۆنراوە نمایشی سنووری ***دڵی*** ئێران دەکا. ڕەوتی مەیدانی هێزی دەرەکی ئێران بۆ ڕۆنانی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەیی لەگەڵ ناوچەکانی هەریەک لە جوگرافیای نەورۆز و عاشووورادا دێتەوە. بە دەربڕینێکی دیکەوە، ئەو کۆمەڵگایانەی لە عاشووورادا شین بۆ ئیمامی حوسێن دەگێڕن یان ئاهەنگ بە هاتنیساڵی نوێی ئێرانی دەگێڕن بریتین لە دڵی ئێران: واتە ناوچەیەکی جیۆکەلتوری کە بەهۆیەوە ئێران دەتوانێ هێزی خۆی تێدا نیشان بدا. ئەوەش بواری جوگرافییەکەیەتی کە ئێران تێدا سیاسەتی دەرەکی نێودەوڵەتییانەی ئێرانی لە ڕێی ئاراستەکردنی هێزی دەرەکییەوە ڕۆنا. کەواتە دڵی ئێران لەگەڵ دوو هیلالە جمکەکە دێتەوە: ***هیلالی عاشوورا و هیلالی نەورۆز***. هیلالی یەکەم لە ئێران بۆ عێراق و لوبنان درێژدەبێتەوە، لە کاتێکدا هیلالی دووەم لە کوردستانی عێراقەوە بۆ ئێران، و ئەفغانستان و تاجیکستان درێژدەبێتەوە. هەر بەڕاستیش، دڵی ئێران لەپاڵ بواری کەلتوری خۆی، لە دەریای سپیی ناوەڕاستەوە تا بانی پامیر درێژدەبێتەوە. ئێران وەک چەقی بازنەی گۆڕانکارییە جیۆپۆلیتیکییە سەرەکییەکانی ڕەهەندە مێژووییەکانی لەنێو ڕۆژهەڵاتی ناوینی گەورەتر، بە هەمان شێوەش دڵی نیشتمانیی ئێران زەمینەیەکە بۆ میزۆپۆتامیا و ڕۆژهەڵاتی شام و ئوردن کە بەهەمان درێژبوونەوەی ناوەندی ئاسیا درێژدەبێتەوە.

دڵی نیشتمانیی ئێران بوارێکی جوگرافیایی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران، نیشانەیەکە بۆ ***جیۆکەلتوری خودی ئێران***. هەروەک موحیەدین میسباحی بە شێوەیەکی قەناعەتپێهێنەرانە تاوتوێ کردبوو کە دەوڵەتێک "جیۆکەلتوری خۆی هەبێ" ئەوا حوکم لەسەر دۆست و دوژمنی لە دەرەوەی خاکی دەوڵەتەکەدا دەدا.[1] دڵی ئێران، ئەو هیلالە جمکەیەی عاشورا و نەورۆز نمایشنامەی شەقڵی مێژوویی "خودی جیۆکەلتور" لەنێو

[1] (Interview with Mohiaddin Mesbahi, 21 March 2018.)

شـــارســـتانێتی ئێراندا. بە پێچەوانەی دەوڵەتەکانی دیکەی وەک چین و هیندستان کە لەسەر بنەمای شارستانییەک پێکهاتوون، ئەوا سنووری هاوچەرخانەی ئێران لەگەڵ شارستانییەت و دڵی وڵاتەکەی نایەتەوە. هەرچەندە ئەم ڕوانینە خاڵی ڕەشی میژووی ئێران بەدەردەخا، ئاخر ئەم خەوشە دنەدەرێکی بەهێز بووە بۆ ڕابەرە ئێرانییەکان بەخودی (شا)شەوە تا لەگەڵ ئەو بەشانەی ئێرانی گەورەتر بۆ ڕاچاندنی تەونی پەیوەندی دەستپێشخەر بن، واتە هەر لە کورد، هەزارە و تاجیک تا عەرەبی شیعە، ئازەری و تورکی عەلەوی. **هەر بۆیەشە لە لایەن عەرەبی سوننە و تورک ئەوانەی لەسەرەوە ناویان هاتووە، بە تابووری پێنجەمی ئێرانی حیسابکراون.** نە شا و نە کۆماری ئیسلامی توانیان سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانە بەدوور لە کرۆکی شارستانییەت و چەمکی دڵی ئێران ڕۆبنێن. بە وتەیەکی دیکە، جیۆکەلتوری ئێران هەر خۆی ئاماژەیە بۆ ناوچەی دەستڕۆیشتووی سروشتی ئێران. ئەم بەسروشتبوونە ڕەگی بە قووڵایی و بەردەوامیتی دڵی نیشتمانی ئێران و سنووری شارستانییەکەی شۆڕبووەتەوە. بۆ شا، کە خۆی وەک "شاهەنشای ئاریان" کەمتر سەرنجڕاکێش بوو وەک ڕاسپێردراو بەسەر شیعەی دوازدە ئیمامی، ئیدی کورد و شیعە درێژەپێدەری قووڵایی شارستانێتی ئێرانین. لە کاتێکدا کورد بەردی بناغەی سیاسەتی دەرەکی نادەوڵتییانەی ئێران بوون لە سەردەمی شادا، کەچی شۆڕشی ئیسلامی زیاتر پشتی بە کۆمەڵگە شیعییەکانی هەرێمەکە بەست لەوەی کۆمەڵگە ئێرانییەکانی وەک کورد و تاجیک و هەزارە. کورت و پوخت کاریگەریی شارستانیتی ئێران و دڵی وڵات لەبارەی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران سەلمێنەر بوو کە جوگرافیا هەر بەتەنیا سنوورێکی فیزیکی نییە، بەڵکو سنووری ناسنامەشە، دەربڕی پەیوەندی کارلێککەرانەییە لەنێوان ناسنامە و شوێندا.

سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بایەخی ***بیرۆکەی ئێرانی مەزنتر*** نمایش دەکا. بیرۆکەی ئێرانی مەزنتر زیاتر لەبارەی کەلتور و شارستانییەتە

نەوەک ڕەگەز و خاک. ئەمەش بەرهەمێکی دێرینی ڕەگئاژۆی دیرۆک و کەلتور و جوگرافیایە کە ئێرانی گەورەتر وەک دیاردەیەکی مێژوویی سروشتی نیشان دەدا. ئەوە خۆی ئیمپراتۆرییەتی ئێرانی بوو لە مێشک و زەیندا."[1] خۆی بیرۆکەی ئێرانی گەورەتر شەقڵێکی سروشت بۆ سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانە و ڕەوتی هێزی دەرەکی بە ئێران دەبەخشی، کەچی شا لە کۆتاییدا دەستبەرداری بیرۆکەکە بوو بەوەی لە ناوەڕاستی حەفتاکان پاڵپشتی لەسەر کورد و لەسەر شیعە وەستاند. بەشێکی لە هۆیەکەشی دەگەڕایەوە ***ڕوانینە ڕیالیستەکەی*** شا بۆ سیاسەتەکانی نێودەوڵەتی. لە چاوی شادا سەرەکیترین هۆکاری یەکگرتووی دەوڵەتی هاوچەرخ بوو نەوەک کاراکتەرە نادەوڵەتییەکان. شا لەپاڵ بێهیوابوونی لە بارزانی و سەدر، لەو بڕوایەدا بوو هیچ بوارێکی مەحکەم و درێژخایەن بۆ مانۆڕی کاراکتەرە نادەوڵەتییەکان لە سیاسەتەکانی جیهاندا نەماوە. ئەم ڕوانگە ڕیالیستییانە و خۆپارێزی ئەو لەو کایەدا لای چەند گرووپی دەستەبژێری ئێرانی دیکەش هەبوو. لە هەرە سەرەکیترینیان سەرۆوەزیری پێشتر، محەمەد عەلی فروغی بوو، کە هۆشداری بەوەی دا "بیرۆکەی هەڵەی کوردستانێکی سەربەخۆ سەرەتا لە لایەن بریتانیاوە داڕێژرا بۆ ئەوەی ئێران و تورکیای پێ لاواز بکەن."[2] **هەرچەندە فروغی لەو بڕوایەدا بوو، کە "کورد لە ڕووی کەلتوری، زمانەوانی و ڕەگەزییەوە ئێرانین"، لێ لەبەر "گەندەڵی" و "بێ هزری"ی کاربەدەستە ئێرانییەکان لە دەوڵەتی کوردی لە عێراق و تورکیادا بێهیوا بوو. "خۆ ئەگەر کاربەدەستە ئێرانییەکان ئاوەزمەند بان و چەوساندنەوەی کوردە [ئێرانییەکانیان] کەم کردبایەوە، ئیدی هیچ دوژمنایەتییەک لە نێوان ئێرانییەکان و کورددا نەدەما.** لەم

---

[1] Axworthy, Michael, A History of Iran: Empire of the Mind (New York: Basic Books, 2008), p. 3.

[2] Foroughi, Mohammad-Ali. Siasat-nameh Zoka-ol-Molk: Maghaleh-ha, Name-ha, va Sokhanrani-haye Sisai-e Mohammad-Ali Foroughi, Edited by Iraj Afshar and Hormoz Homayounpour. 1390. pp. 120–133.

ڕەوشەدا و لە حاڵەتی سەرهەڵدانی سەربەخۆیی لەنێو کوردانی [نا ئێرانی] ، ئەوا کوردی ئێرانیش هەرگیز سەرئێشەی بۆ ئێمە دروست نەدەکرد و ئێمە دیسان [لە کوردستانی سەربەخۆ] سوودمەند دەبووین. بە پێچەوانەشەوە، [کوردستانی سەربەخۆ] دەبێتە هەڕەشەیەکی ئامادە."[1] ئەسەدوڵڵا ئەعلەمیش بە هەمان چەشن دژی پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی بوو، ئاخر ئەو مەراق بوو بزانێ؛ "ئەرێ چ سوودێک لە پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردیدا دەبینین؟"[2] ئەم گرووپە پاریدەدەرەی شا لە پێکهێنانی کوردستانێکی سەربەخۆ لە نزیک ڕۆژئاوای ئێران بەدگومان بوون. بە پێچەوانەی ئەوانیشەوە، گرووپێکی دیکە هەبوون ، مشتومڕیان لەسەر ئەوە بوو کە کورد هەر بەڕاستی لە ڕووی ئێتیک و کەلتورەوە ئێرانی رەسەنن. مەحموود ئەفشار یەزدی، پاریدەدەری ڕەزاشا، مشتومڕی لەسەر ئەوە دەکرد، **پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی ئەو هەڕەشەی زەرد(هی تورک) و هەڕەشەی ڕەشی (عەرەب) لادەبا و سنوورەکانی ڕۆژئاوای ئێران دەپارێزێ.** لە کاتێکدا ئەفشار یەزدی هانی ڕەزاشای دەدا بۆ ئەوەی پشتیوانی شۆڕشی ئارارات (١٩٢٧-١٩٣٠) و ئیحسان نوری پاشا بکا، کەچی فروغی کە ئەوکات باڵوێزی ئێران بوو لە تورکیا، قەناعەتی بە ڕەزا شا هێنا هاوکاری ئەتاتورک بێ لە دژی کوردی تورکیا. **محەمەد ڕەزا کەربەلایی، وەزیری پێشووی کاروباری دەرەوەی ئێران بەهەمان شێوە لەو بڕوایەدا بوو، سەربەخۆیی دەوڵەتێکی کوردی هەر چەندە بچووک و لاوازیش بێ، ئەوا پشتگیریی بەرژەوەندییە نیشتمانییەکانی ئێران دەکا، ئەمەش بەهۆی ئەوەی هاوپەیمانێکی ستراتیژی بۆ ئێران لە هەرێمەکەدا دروست دەبێ.** لە ڕوانگەی ئەوەوە، دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی یەکێتیی خاکی ئێران ناخاتە مەترسییەوە، ئاخر ناسنامەی نیشتمانیی ئێران و

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2] Alam, Assadollah. Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi Alikhani [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974 (Bethesda, MD: Iranbook, 2000). p. 347.

شـــارســـتانییەتە گەورەکەی لەگەڵ دەوڵەتێکی ســـاختەی وەک عێراق یان تەنانەت تورکیاش بەراورد ناکرێ. ئەم هێڵە هزرییە –هاوپەیمانی سروشتی ئێران لەگەڵ کورد، لەبەر ئەوەی ئەوان ئێرانی ڕەســـەنن- لە کۆتاییدا لە لایەن شـــای واقیعبینەوە وازی لێهێنرا. هەرچەندە ســـیاســـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران ڕۆڵێکی کاریگەرانەی لە بەرزەفتکردنی دوژمنەکانی هەبوو، لێ لە دوا قۆنـاغـدا لە ڕوانگەی شـــاوە ئەو هەنگاوە نەبوو بۆ بەرجەستەکردنی بیرۆکەی ئێرانێکی مەزنتر. لە کۆتاییشدا، ئەو ئێرانی وەک دەوڵەتێکی وێســـتڤالیانی[1] بە باشـــتر زانی لەوەی بەدوای بیرۆکە مێژوویە ڕەگئاژۆکەدا بڕوا، لەئەنجامیشدا پشتی لە کوردی عێراق و شیعەی لوبنان کرد.

ســەرباری کورتهێنی بەردەوام و پتەوی پشتگیری قەوارە نادەوڵەتییەکانی وەک کورد، تاجیک و هەزارە، کەچی ئەوەی کۆماری ئیســـلامی بەدوای ســـیاســـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەدا ڕۆیشـــت زۆر کاریگەرانەتر بوو، کە بەشێکی هۆکارەکەی بۆ پرسی هزر و ڕوانین دەگەڕایەوە. هەر بۆیە هینری کیســـنجەر پاڵی بە ســـەرانی وڵاتە یەکگرتووەکانەوە نا تا لەگەڵ هاوتا ئێرانییەکان لەبارەی گەڕانەوەی ڕۆڵی ئێران وەک دەوڵەتێکی ویســـتڤاڵی لەنێو ســـنوورەکانی خۆیدا بکەونە وتوویژ."[2] وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران، محەمەد جەواد زەریفی بە شـــێوەیەکی قەنـاعەتهێنەرانە ئەوەی دەربڕێ: "هینری کیســـنجەر و من چەندین وتوویژمان لە کۆنفرانســـەکاندا لەبارەی ســـیاســـەتەکانی نێودەوڵەتی کردووە. یەکێک لەو ڕوانگە هەرە ناودارەکانی ئێران ئەوەبوو ئاخۆ ئێران کامەی لێهەڵدەبژێرێ؛ دەوڵەت یان بیرۆکەکە. منیش وەڵامم دایەوە، زۆرباشـــە، خۆ وڵاتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکا دەوڵەتێکی ڕیزپەڕە. ئینجا ئەوەم پێگوت؛ دەی بەخێربێی بۆ ئێران،

[1] مەبەست ئەوەیە کە سەروەریی دەوڵەت پیرۆزە و نابێ پێشێل بکرێ، وەرگێڕ

[2] http://www.wsj .com/articles /a-path- out-of-the -middle -east- collapse-445037513.

ئـاخر ئێرانیش دەوڵەتێکی ڕیزپەڕە.[1] ڕەگوڕیشـــەی ڕوانینی زەریفی بۆ ڕیزپەڕببوونی ئێران بۆ ئەو ڕاســتیە مەودادرێژەی شــەقڵی ســیاســەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران دەگەڕێتەوە: *ئێران هەر بەتەنیا دەوڵەتێکی وێستڤالیانی نییە، بەڵکو بیرۆکەیەکی ڕەگئاژۆی دێرین و شـارستانییەتە.* ئا ئەمەیە، بە دەستەواژەی (کوربین): "ساتەوەختی ئێرانە."

سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەتی ئێران لەبن قەڵەمڕەوی ئێران میراتێکی هەمیشــەیی بۆ قۆناغی دوای شــۆڕش بەجێما. هەروەها لەگەڵ شــۆڕشــی ئیســـلامی لە ١٩٧٩دا پەیوەندیی ســـتراتیژییەکانی ئێرانیش لەگەڵ قەوارە نادەوڵەتییەکان لە هەرێمەکەدا بەرفرەوان بوو، ئەو پەیوەندیانە لە سەردەمی قەڵەمڕەوی شـادا ڕەگوڕیشـەیان ڕۆچووبوو. کاتێک شـۆڕشـگێڕان لە ئێران هاتنە ســەر تەختی دەســەڵات، پەیوەندییە ســتراتیژییەکانی ئێران لە گەڵ کوردی عێراقدا هەر تازەبابەت بوو. هەر زوو بارزانییەکان لایەنی کۆمارە نوێیەکەی ئێرانیــان گرت. دوژمنــایەتییە بەردرێژەکەی بەعس بۆ ئێران وایکرد پەیوەندییەکانی ئێران – کوردی عێراق بژێیتەوە. ئێران لە دواییدا یەکێتیی نیشــتمانیی کوردســتانی تاڵەبانیشــی بۆ لای خۆی ڕاکێشــا و لە ناوەڕاســتی جەنگی عێراق-ئێراندا بەرەیەکی کوردی بەهێزی لێ دروســت کردن. لە ئاخروئۆخری هەشتایەکانیشدا[2] پشتگیری ئێران بۆ کوردی عێراق وای لێکردن ببنە خــاوەنی هەرێمێکی ئۆتۆنۆمیــدار لە بــاکووری عێراق، پاشــان لەدوای ٢٠٠٣دا کاتێ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هێرشــی کردە ســەر عێراق، دانی بە حکومەتی هەرێمی کوردســتاندا نا. هەر بە ڕاســتیش درێژبوونەوەی پەیوەنــدییەکــانی تــاران-کوردی بــایی ئەوەنــدە پتەوبوو بەرگەی گۆڕانکارییەرکانی پێشـــهاتی ڕێککەوتننامەی جەزائیری ١٩٧٥ و شۆڕشی ئیسلامی لە ١٩٧٩دا بگرێ.

---

[1] Did Dar Shab [Night-vision], 3 March 2016.

[2] ڕاستییەکەی سەرەتای نەوەدەکانە-وەرگێر.

پەیوەندییەکانی ئێران-لوبنانیش باندۆرێکی زۆری بەسەر سیاسەتی ناوەخۆ و دەرەکی ئێراندا هەبوو. بە پێچەوانەی ڕوانینە باوەکان، پەیوەندییەکانی پەهلەوی لەگەڵ شیعەی لوبناندا ئەوەندە مەحکەم بوو بەوەی بەدەر لە پاشەکشەی ناسرییەکان لە هەرێمەکە و دەستوەردانی وێرانکەرییانەی مەنسوور قەدەر، دەنا دەکرا بڵێین کە شا پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ شیعەی لوبناندا هەبوو، هەرچەندە لەچاو ئەوەی شۆڕشی ئیسلامییەوە کەمتر بەرچاو بوو. لەوەش پتر، هەبوونی شۆڕشگێڕە ئێرانییەکان لە لوبنان زەمینەیەکی لەباری دایە شۆڕشی ئیسلامی تا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ شیعەی لوبناندا بەرفرەوانتر بکا. لەپاڵ سەدریشدا، لەوێدا سێ شۆڕشگێڕی کلیلئاسا هەبوون، کە محەمەد مونتەزیری، سەید عەلی ئەکبەر موحتەشەمپوور و بەشێوەیەکی تایبەتتریش مستەفا چەمران، پابەندییەکانی ئێرانیان بۆ شیعەی لوبنان چەسپاند. عەلی خریس وەها لێدوانی دا؛ "موسا سەدر و مستەفا چەمران بڕبڕەی پشتی شۆڕشی ئێران بوون و ناکرێ بەبێ ناوهێنانی ئەوان باسوخواسی شۆڕشی ئێرانییەکان بکەی."[1] لەوەش هەورازتر، پشتگیری سەدر بۆ سوریای ئەسەد و فەتواکەی لە بەرژەوەی عەلەوییەکاندا، چاندنی تۆوی ستراتیژی سێکوچکەیەکی بەرینتر هاوپەیمانی بوو لەنێوان تاران و سوریا و شیعەی لوبناندا. لەپاش شۆڕشیشدا، ڕژێمی بەعسی سوریا وەک تاکە دەوڵەت-لەپاڵ لیبیادا- پشتی کۆماری ئیسلامی ئێرانی لە دژی عێراقی بەعسی گرت. هەروەها سووریا کارئاسانی بۆ هەبوونی ئێران لە لوبنان کرد و پەیوەندییەکانی لەگەڵ حیزبوڵڵادا بەهێز کرد. لە بەرانبەریشدا، ئێران داوای پشتیوانی ئیخوان موسلیمینی سوننەی سورياییەکانی لە دژی حافز ئەسەدی سێکولار ڕەتکردەوە. هەنووکەش ئەوە ئێرانە لە پشتی ڕژێمەکەی بەشار ئەسەد لە دژی داعش، ئەلنوسرە و میلیشیای هەڵگەڕاوەکان ئەوانەی

---

[1] Shaery-Eisenlohr, Roschanack. Shi'its Lebanon: Transnational Religion and the Making of National Identities (Columbia University Press. Retrieved 2 July 2016).

پشتوپەنایان ئەمریکا، تورکیا، عەرەبستانی سعودی و قەتەرن. لەوەش پتر، کەسایەتی موسا سەدر لێکەوتەی زۆر بەسەر چارەنووسی شیعەی لوبنان و ئەودیوی لوبنـانەوە هەبوو. پەیـامی ئەو بۆ ئیســـلامی هـاوچەرخ و هەوڵوتێکۆشـانی بۆ ژیاندنەوەی ناسنامەی بەکۆمەڵی شیعە لە لایەن ئێران و پاشــان بەوردەکارییەوە لە لایەن کۆمەڵگە شـیعەکانی عێراق و یەمەن و شـێخنشـینەکانی کەنداوی فارســییەوە پەیڕەوی لێکرا. هەروەک حەســەن نەسرولڵای سکرتێری گشتیی حزبولڵا لێدوانی دا؛

*ئیمام سەدر بەرگریی (مقاومة)ی دامەزراند. هەروەها ئەو بە گشتی لە بری لوبنانییەکان و بەتایبەتیش لەبری شیعەی لوبناندا دامەزراوە سەرەکییەکانی دامەزراند... ئەوەی ئیمام سـەدر پێی لەسـەر دادەگرت ئێستا لە حیزبولڵادا هەیە. ئەوا بڕوای بە پشـــتگیری فەڵەســـتین و بەرگریی وەک تاکە ڕێگەی ڕزگارکردنی فەڵەستین و لوبنان [لە دەستی داگیرکاریی ئیسرائیل] هەبوو... من بە چوار بیچمی ســـەرەکییەوە کـارانگـازم: ئیمـام خومەینی، ئـایەتولڵا خامنەیی، ئیمام سەدر و ئایەتولڵا [محەمەد باقر] ئەلسەدر.*[1]

خومەینی و ســـەدر دوو بیچمی کارامە بوون کە بۆ بووژانەوەی شـــیعە دەستپێشخەرییان نواند.

لەسەرووی هەموویانەوە، شۆڕشگێڕە ئێرانییەکان و مەرجەعەکانی شیعە. لەسەر ناکۆکییان لەبارەی سەدرەوە شیرازەیان لەگەڵ یەک پچڕا. لە دوای قۆناغی ١٩٧٩ەو لەســـەر دەســـەڵاتی خۆجێی کێبڕکێیەکی توند بەرپا بوو. لەسـەرێکەوە، شـۆڕشـگێڕانی لایەنگری سـەدر بە مسـتەفا چەمران، سـادق قوتبزادە و ســـــادق تەبـاتەبـائییەوە حکوومەتی کـاتییـان دامەزرانـد کە بەسـەرپەرشتی مەهدی بازرگان بوو. لە سـەرێکی دیکەشـەوە شـۆڕشـگێڕە دژەسـەـدرییەکان بە جەلالەدین فارســـی، عەلی ئەکبەر موحتەشـــەمپوور،

---

[1] گفتوگۆ سەید حەسەن نەسرولڵا لەبارەی ئیمام موسا سەدر

(Interview with Sayyed Hassan Nasrallah about Imam Musa Sadr, Asr-e Iran, See: http://asreiran.mihanblog.com/post/73).

محەمەد مونتەزیری و محەمەد خەرازی لەدەوری پارتی کۆماری ئیسلامی و سوپای پاسدارانی شۆڕش خڕبوونەوە. ئیدی لەو بەرەوتەدا لە تاران پشتگیریکردن یان ڕەخنەگرتن لە سەدر بووبووە هێڵی شێرازەپچڕان هەرچەندە شاراوەش بووبێ. دەستەی لایەنگرانی سەدر ڕەخنەیان لە گۆشەگیریی شۆڕشی ئێران گرت، هەرچی توخمگەلی دژی سەدریش بوو سیاسەتی دەرەکی و ناوەخۆی ئێرانیان ڕادیکالانە لێکرد. هەر بەڕاستیش، بەیەکهەڵشاخانی ئەم گرووپانە تا دەیەکانی دواتریش درێژەی کێشا و شەقڵی ڕەوتێکی شاراوەی سیاسەتی ناوەخۆ و دەرەکی ئێرانی شۆڕشگێڕی بەخۆوە گرت. ئیدی پرسی لایەنگرتن یان ڕەخنەگرتن لە سەدر هەروەک دابەشبوونە ئایدیۆلۆژییەکەی نێو موجاهیدین لە ١٩٧٥دا بۆ دارشتنی ڕەوتی سیاسەتە دەرەکی و ناوخۆییەکانی کۆماری ئیسلامی یەکلاکەرەوە بوو.[١]

---

[١] موجاهیدینی خەلق لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٥دا، لەنێوان ئەندامە مارکسی و ئیسلامییەکانیدا تووشی لەیەکپچڕان هات. لەوکاتەی ئەندامە سەرەکییانی موجاهیدین بە مەسعود ڕەجەوییشەوە زیندانی کران، ئەوا ئەندامە بەراییەکانی دیکەی موجاهیدین کە بریتی بوون لە بەهرام ئارام، توراب هیخشناس، تەقی شەهرام، عەلی ڕەزا سپاسی ئاشتیانی، ڕەحمان واحید، ئەفراختە، فوئاد ڕەحمانی، حەسەن ئەلادپووش و مەحبوبە موتەحیدین ڕێکخراوێکی نوێی مارکسییان پێکهێنا کە دواتر بە ڕێکخراوی خەبات بۆ ڕزگاریی چینی کرێکار یان بەشێوەکی سادە و ئاسان پەیکار ناوی دەرکرد. ئەوان لە جیابونەوە ئایدیۆلۆژییەکەیان لە کتێبێک بە ناوی مانیفیستۆی پرسە ئایدیۆلۆژییەکان ڕاگەیاند، لەوێدا مشتومڕیان لەسەر ئەوە کردبوو کە "دوای دە ساڵ لە هەبوونی خەباتی ژێرزەمینی، چوار ساڵیش لە خەباتی چەکداری و دوو ساڵانیش لە بیرکردنەوەی چڕ و ئایدیۆلۆژییەوە گەیشتبوونە ئەو ئەنجامە کە مارکسیزم نەوەک ئیسلام فەلەسەفەی ڕاستەقینەی شۆڕشگێڕیتییە." زۆریش لە مەلا شۆڕشگێڕەکانی ئێران بە عەلی ئەکبەر هاشمی ڕەفسەنجانیشەوە بە قووڵی هاوئاوازی موجاهیدینە ئیسلامییەکان بوون. ئەوان بەو دابەشبوونەوەی دووبەرەی موجاهیدین بێهیوا بوون. ئەم پێشهاتە کاریگەرییەکی زۆر قەبەی کردەسەر ململانێی دەسەڵات و شەڕی خوێناوی ناوخۆیی لە دوای شۆڕشی ئیسلامی لە ١٩٧٩دا.

هەبوونی سەدر لەنێو سیاسییە ئێرانییەکاندا تا ئێستاشی لەگەڵدابێ بە بەهێزی هەستی پێدەکرێ.[1]

سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بابەتێکی هەستیارە؛ لەگەڵ ئەوەشدا بۆشاییەکی تیۆری بۆ لێکدانەوەی پەیوەندییەکانی ئێران بە قەوارە نادەوڵەتییەکانەوە هەیە. توێژینەوەیەکی مێژووی قووڵی ئەم کتێبە بەردەوامی و مەحکەمی سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران دەسەلمێنێ. سیاسەتی دەرەکی نادەوڵەتیانەی ئێران بەشێکە لە ستراتیژییەکی بەرفرەوانتری بەرزەفتکردن. شا پەیوەندییەکانی لەگەڵ کاراکتەرە نادەوڵەتییەکان بەپلەی یەکەم بۆ ئەوە دانەڕشت کە چاو ببڕێتە فراوانخوازیی خاک، بەڵکو بۆ چەسپاندنی پێگەی ئەمری واقیعی هەرێمایەتی و ڕەوایەتیدان بوو بە ڕۆڵی هەرێمایەتی ئێران و سەقامگیریی ئێران. هەروەها شا سیاسەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێرانی بۆ ئەوە بوو کە وڵاتەکەی لە سیاسەتەکانی زلهێزەکان بکاتەوە. وێڕای کورتهێنێ شا لە وتارێکی بەهێز یان ئایدۆلۆژی، لێ کاریگەرانە زمانی جەنگی ساردی بۆ

---

[1] سەدر دۆستایەتیی پتەوی بنەماڵەیی لەگەڵ سەرکردە سیاسییەکان ئێران و لوبنان و عێراق پاراست. سادق تەباتەبائی برازای سەدر بووە یەکەمین وتەبێژی حکوومەتی شۆڕشگێڕی. ئەحمەد خومەینیش کە کوڕی دووەمی خومەینی بوو فاتیمە سوڵتانی تەباتەبائی، واتە کچە برای سەدری هێنابوو. هەروەها یاسر خومەینی، دووەمین کوڕی ئەحمەد خومەینیش حەورە سەدر، واتە کچی سەید محەمەد سەدری هێنا. سەید محەمەد، واتە کوڕی سەید ڕەزا و کوڕە برای موسا سەدر ئەندامی تازەی ئەنجوومەنی دەستنیشانکردنی بەرژەوەندییەکانی سیستمی حوکم بوون. زوهرا سادقیش کە ژنی محەمەد خاتمی سەرۆکی پێشووی ئێران بوو، کچەپووری سەدر بوو. سەدرەدین سەدریش کە کوڕی موسا سەدر بوو نەوەی خومەینی مارەکردبوو. لە عێراقیش ئامۆزای سەید موسا، واتە ئایەتوڵلا سەید محەمەد باقر سەدر سەرکردەی سیاسی سەرەکی شیعە بوو. ئامۆزا و زاواشی، واتە موقتەدا سەدر، کوڕەکەی ئایەتوڵلا محەمەد محەمەد سادق ئەلسەدر سەرکردەی ڕەوتی سەدرە لە عێراق. دوای بێسەروشوێنبوونە تەلیسماوییەکەی سەدر، بنەماڵەکەی ئەو وەک بنەماڵەیەکی نیمچەپاشای نێو کۆمەڵگەی گەورەی شیعەن.

ڕەوایەتیدان بە سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی وڵاتەکەی بەکارهێنا. لەپاڵ (شـا)شـدا دەزگا ئاسـایشـییەکەی ئێران کە سـاواکە بوو، نەوەک وەزارەتی کاروباری دەرەوە پەیوەندییە سـتراتیژیەکانی لەگەڵ شـیعەی لوبنـانـدا هەڵسـووڕانـد، لەوەش گرنگتر پەیوەنـدیەکـانی لەگەڵ کوردی عێراقیشـدا بەڕێوەبرد. سـیاسـەتی دەرەکیی نادەوڵەتییانەی ئێران بۆ قەرەبووکردنەوەی تەنیـایی سـتراتیژی بەکـارهێنرا کە وەک بەرهەمێکی جوگرافیای هەمیشەیی و مێژووی دێرین بوو. لە سەرووی هەمووشیانەوە، سـیـاسـەتی دەرەکیی نـادەوڵەتییـانەی ئێران ڕەنگـدانەوەی بنەمـا جەوهەرییەکانی شـارسـتیانیەتی دێرینی ئێران و دڵی نیشـتمان بوو. سـیـاسـەتی دەرەکیی نـادەوڵەتییـانەی ئێران ڕەنگـدانەوەی بنەمـا جەوهەرییەکانی شـارسـتیانەتی دێرینی ئێران و دڵی نیشـتمان هەروەها خودی جیۆکەلتوری ئێران بوو. لە سـەرووی سـەرەوەشـیانەوە، پەیوەندی سـتراتیژی لەگەڵ کورد و شـیعەدا ڕوخسـاری سـەرەکی درێژخایەنی "بیرۆکەی ئێرانی گەورەتر" بوو.

# BiBliography

## *Archival Collections*

### *Iran*

Markaz-e Amouzesh va Pajooheshhay-e Beynolmelali-e Vezarat-e Omour-e
Kharejeh [Center of International Research and Education of the Ministry of
Foreign Affairs]
Sazman-e asnad va Ketabkhane Melli-e Jomouhori Eslami [National Library and
Archives of Islamic Republic of Iran]
*Published Government Documents*
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Aval, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol I, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Dovom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol II, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Imam Musa Sadr be Ravayat-e Asnad-e SAVAK, Jeld-e Sevom, Markaz-e Barrasi-e
Asnad-e Tarikhi-e Vezarat-e Etela'at [Musa Sadr according to SAVAK
Documents, Vol III, Center of Survey of the Ministry of Intelligence]
Hezb-e Democrat-e Kurdestan-e Araq be Ravayet-e SAVAK [Iraqi Kurdistan
Democratic Party according to SAVAK]
Ravabet-e Iran va Araq be Ravayat-e SAVAK [Iran-Iraq Relations According to
SAVAK]
*United States of America*
US National Archives and Records Administration (NARAI),

College Park,
Maryland
Central Intelligence Agency Records Search Tool (Crest)

General Records of the Department of State, Record Group 59 (RG59)
Central Foreign Policy Files (CFP), 1967–69
Central Foreign Policy Files (CFP), 1973–76, Access to Archival Databases
(AAD). Available at: http://aad.archives.gov/aad/
Records Relating to Iran, 1965–1975, LOT 77D400
*Congressional Record*
Foreign Relations of the United States (FRUS) (Washington, DC: US Government
Printing Office)
1958–1960
XII: Near East Region; Iraq; Iran; Arabian Peninsula (1992)
1961–1963
XVII: Near East, 1961–1962 (1994)
XVIII: Near East, 1962–1963 (1995)
1964–1968
XXI: Near East Region; Arabian Peninsula (2000)
XXII: Iran (1999)
1969–1976
I: Foundations of Foreign Policy, 1969–1972 (2003)
XXIV: Middle East Region and Arabian Peninsula, 1969–1972
XXVII: Iran; Iraq, 1973–1976 (2012)
E-4: Documents on Iran and Iraq, 1969–1972 (2006)

Online Document Collections
*National Security Archive, George Washington University (NSA-GWU),*
*Washington, DC*
*Digital National Security Archive (DNSA). Available: http://nsarchive.*
*chadwyck.com/*
*Electronic Briefing Book (EBB) 265. Available at: http://www2.gwu.edu/~nsarchiv/NSAEBB265/*
*Henry Kissinger Telephone Transcript (State-Kissinger), U.S. Department of State*
*Electronic Reading Room, available at:*

*http://foia.state.gov/Search/*
*Collections.aspx*
*Special Collection: A Life in Intelligence—The Richard Helms Collections (CIAHelms), US Central Intelligence Agency Electronic Reading Room. Available at:*
http://www.foia.cia.gov/collection/life-intelligence-richard-helms-collection

*Published Interviews*
*Foundation for Iranian Studies Oral History Collection (FISOHC)*
*General*
*Mansur Qadar*
*General Mansur Qadar*

Alam, Assadollah, *Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi*
*Alikhani* [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. II: 1349–1351/1971–1972 (Bethesda, MD: Iranbook, 1995).
Alam, Assadollah, *Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi*
*Alikhani* [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. III: 1352/1973
(Bethesda, MD: Iranbook, 1995).
Alam, Assadollah, *Yad'dashtha-ye Alam: Virayesh va Muqaddamah az Alinaqi*
*Alikhani* [The Alam Diaries: Edited by Alinaqi Alikhani], Vol. IV: 1353/1974
(Bethesda, MD: Iranbook, 2000).
Alam, Asadollah, *The Shah and I*, ed. Alinaghi Alikhani (New York: St. Martin's,
1991).
Alpher, Joseph, "Israel and the Iraq-Iran War," in *The Iraq-Iran War: Impact and*
*Implications*, ed. Efraim Karsh (New York: St. Martin's, 1989).
Axworthy, Michael, *A History of Iran: Empire of the Mind* (New York: Basic Books,
2008).
Bitlisi, Idris, *Hasht Behesht [Eight Paradises].*

Bonnin, Richard, *Arrows of the Night: Ahmed Chalabi and the Selling of the Iraq War* (Anchor; Reprint edition, November 13, 2012).
Buzan, Barry and Ole Waver, *Regions and Powers: The Structure of International Security* (Cambridge University Press, 4 December 2003).
Doran, Charles, *The Politics of Assimilation: Hegemony and Its Aftermath* (Baltimore: Johns Hopkins University Press, 1971)
Foroughi, Mohammad-Ali, *Siasat-nameh Zoka-ol-Molk: Maghaleh-ha, Name-ha, va Sokhanrani-haye Sisai-e Mohammad-Ali Foroughi, Edited by Iraj Afshar and Hormoz Homayounpour. 1390.*
Freedman, Lawrence, *The Evolution of Nuclear Strategy* (Palgrave Macmillan, Third Edition, 2003).
Hegel, George Wilhelm Fredrich, *The Philosophy of History* (New York, 1956).
Kaplan, Robert D., *The Revenge of Geography: What the Map Tells Us About Coming Conflicts and the Battle Against Fate* (Random House; First Edition, September 11, 2012).
Mesbahi, Mohiaddin, Free and Confined: Iran and the International System. (Spring 2011). *Iranian Review of Foreign Affairs*, 5 (2): 9–34.
Pahlavi, Mohammad Reza, *Answer to History* (New York: Stein and Day, 1980).
Parsi, Trita, *Treacherous Alliance: The Secret Dealings of Israel, Iran, and the U.S.* (Yale University Press, 2007).
Shaery-Eisenlohr, Roschanack. *Shi'its Lebanon: Transnational Religion and the Making of National Identities* (Columbia University Press. Retrieved 2 July 2016).
Sobhani, Sohrab, *The Pragmatic Entente: Israeli-Iranian Relations, 1948–1988* (New York: Praeger, 1989).

## تراژیدیای کورد،

**نووسینی: هێنری کیسنجەر**

{یەک دوو رستەی وەرگێر: ئاشبەتاڵ، کارەسات، شکست، نوشست، نسکۆ، هەرەس، ڕووخان، تێکشکان، بەزین... کۆمەڵە وشەیەکن ئەگەر بەتەواویش هاوواتا نەبن ئەوا واتاکانیان لەیەک نێزیکن، هەمووشـــیان بەپێی ماخۆی نووسـەر، ئاخێوەر بۆ وێناکردنی کۆتاییە شـوومەکەی شـۆڕشـی ئەیلول لە ١٩٧٥دا بەکاردێن. بێگومان بۆ ئەمەش هۆکاری نێوەخۆ و دەرەکی هەبوون. ســەبارەت بە هۆکـاری دەرەکی یەکســەر پەنجە بۆ ئەمریکا و ئێران ڕادەکێشـرێ. دەقاودەقتریش زیاتر ناوی شـای ئێران و هێنری کیسـنجەری ڕاوێژکاری ئەوکاتی ئاســایشــی نیشــتمانیی ئەمریکا دێ، تەنانەت ناوی کیسـنجەر لە نیوەی دووهەمی حەفتاکان و سـەرەتای هەشـتاکان ئەوەندە کەوتبووە ســەرزمانان، زۆرینەی تاکی کوردی نەوەک هەر لە باشـــوور بەڵکو لە هەر چوارپارچەدا پێی ئاشنابوون.

ئەوەی لێرەدا کردوومەتە کوردی، دەقی نووسـێنێکی درێژی کیسـنجەرە کە لە کتێبە قەبەکەی خۆی، "ســاڵەکانی نۆژەنبوونەوە" بەدرێژی باســی ئەو مەرگەســاتەی کردووە. کیســنجەر بە پلەی یەکەم هەوڵیداوە خەتابارییەکە لەسەر کەسیی خۆی لابدا و بیخاتە ملی سی ئای ئەی و بەڕێوبەرەکەی، بە پلەی دووەمیش لەکۆڵ ئەمریکای بکاتەوە، هەر شـــای ئێران بە خەتابار بزانێ. هەڵبەت هەوڵیـداوە هەر هیچ نەبێ هەنـدێ خەتـایەکە لەخۆی دووربخاتەوە.

مایەی تێبینییە، لەنێو ئەو سـەرکردە و سـیاسـەتمەدارە ناودارانەی جیهان کەم وایە لە یـاداشـــتەکـانیـانـدا بـاســـی کوردییـان کردبێ، خۆ ئەگەر باســـیشـــیانکردبێ ئەوا ڕاگوزەرانە، یان زۆر بە کورتی ئاماژەیان پێداوە ئەویش ئاماژەیان بە ناوی دەســـتڕۆیشـــتووەکانیان داوە. کەچی هێنری کیســنجەر لەو ڕێســایە دەردەچێ، بەندێک لە بەشـێکی کتێبە قەبەکەی (کە

١١٥١ لاپەڕەیە) و لە ١٩٩٩دا چاپکراوە، بە قەبارەی ٢٠ لاپەڕەی بۆ ئەو پرسە تەرخاندەکا.

نووسەر، شێوازە نووسینێکی سیاسی- دیپلۆماسییانەی- چڕوپڕی بەکاربردووە، وەرگێڕانی ئاسان نەبوو، هیوادارم تێیدا سەرکەوتوو بووبم و بە دروستی ناوەڕۆکەکەم گەیاندبێ وەرگێڕ.}

**بنچینەکانی بەرنامەکە**

خواوەندەکان لە بەهاری ١٩٧٥دا بە ڕووی دۆستەکانی ئەمریکادا پێنەکەنین. لەو کاتەی کە کۆنگرێس بۆ ژێر نیری کۆمۆنیستی دەستبەرداری خەڵکی هیندۆچینی بوو، شای ئێرانیش کوردی عێراقی بێ بەرگریی بۆ ڕژێمی ڕادیکاڵی بەغدا جێهێشت، تەنانەت هێشتا سەددام حوسێن بە فەرمیش سەرۆک نەبوو، بەڵام جڵەوەکەی لەبەردەستدا بوو.

وڵاتە یەکگرتووەکان لە ١٩٧٢ـەوە پشتیگیریی کوردیان کرد، هەرچەندە پەیوەستی ئێمە بە ئەوانەوە لەچاو هەوڵەکانمان بۆ هیندۆچینییەکان هی بەراورد نییە. بەڵام کاتێک هیندۆچینییەکان لە ڕووخان پارێزران- بەلای کەمی لە ماوەی ١٩٧٥دا- بەوەی کە بەرفرەوانکردنی کۆمەکمان بۆ هاوپەیمانەکەمان هەموو هۆکارێکی ڕەچاودەکرد، کەچی ڕزگارکردنی کورد ئەوەی دەخواست، بەرەیەکی نوێ لە شاخە سەختەکانی نزیک سنووری یەکێتیی سۆڤیەت بکرێتەوە. کردنەوەی دەرگەی پابەندبوونێکی وا قەبە و دەرەنجامێکی پێشبینینەکراو دەبوایە شانی بدرێتەبەر لە کاتێکدا هیندۆچینی لەبەریەکهەڵدەوەشا، پەیوەندییەکانی ڕۆژهەڵات - ڕۆژئاوا لاوازدەبوو، دانوستانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین[1] چەقی بەستبوو.

هەموو ئەمانە بۆ ڕاگرتنی "ئۆپەراسیۆنی ژێربەژێر" و لەکاتێکدا کۆنگرێس پەلاماری ئەو جۆرە چالاکییانەی دەدا، ئەوپەڕی تەکاندان بوو.

[1] مەبەست دانوستانی ئیسرائیل و دەوڵەتە عەرەبییەکان بوو – وەگێڕ

لەگەڵ ئەوەشـدا، لە ماوەی چەند مانگێکی کەمدا، چارەنووسـی کورد بووە یەکێکی دیکە لەو قۆناخە خۆئازاردانەی، کە لای نەرجسییەکانی حەفتاکانەوە بەدوای گەشـبینییە لەڕادەبەدەرەکەی سـەرەتای شـەسـتەکانەوە بوون. کۆمیتەکانی کۆنگرێس هێرشیان کردەسەر ئیدارەی نیکسن بەوەی ڕۆڵی لە هەوڵدان بۆ یارمەتی کورد لەپێناو ئۆتۆنۆمیدا هەبووە، هەروەها پەلاماری ئیدارەی فۆردیشیان دا، بەوەی ڕێگری لە شا نەکرد تا دەستبەرداری ئەو هەوڵە هاوبەشەیان نەبێ. ئەوەش بۆ ئەو جۆرە کەسانەی بەرپرسیاربوون لە دەسـتبەرداربوون لە هیندۆچینی، تاکە ڕێگە بوو کە ویژدانی خۆیان پاکبکەنەوە.

تراژێدیای کورد بە شـێوەیەکی بەربەرین بەهۆی مێژوو و جوگرافیاوە قەوما، بەڵام پرسـەکە بەهۆی دابەشـبوونی نیشـتمانییانەی ناوخۆشـی قەبەتربوو. هەنووکە ژمارەی گەلی کورد ٢٥ملیۆن کەسـی تێپەڕاندووە، ئەوان بوونەتە قوربـانی ڕووداوگەلێـک، کە بۆ سـەدەکـانی پێشـوو دەگەڕێتەوە. لەو کاتەی دەوڵەتی نەتەوە لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانییدا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پەیدابووە، ئەوان خۆیان بە دابەشکراوی لە نێوان ئێران، عێراق سـوریا، تورکیا و یەکێتی سـۆڤیەتی پێشـوو بینییەوە. بەڵێنی دەوڵەتێکی سـەربەخۆ بە کورد درا، بەڵام کە دەسـەڵاتدارە ئەورووپاییەکان دوای جەنگی یەکەمی جیهان نەخشـەی سـنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوینیان داڕشـتەوە، خواسـتی کوردیان بۆ چارەی خۆنووسـینی نەتەوەییانە پشـتگوێخسـت. لەو کـاتەوە، خواسـتی بەرزی نەتەوەییـانەی کورد ڕووبەڕووی یەکێتی خـاکی دەوڵەتە خـانەخوێکـان بووەتەوە، کە مەودای زنجیربەندی سـەرلەبەری ئەگەری پەیوەندییان بە وڵاتە یەکگرتووەکان بەو شێوە بوو: هەندێکیان - وەک تورکیا- هاوپەیمان بوو؛ ئەوانی دیکە - وەک عێراق- بەلای نەیارییدا دەیشـکاندەوە؛ ئێرانیش لەکاتی جیاواز جیاوازدا هەردووکیـان بوو؛ لەکـاتێکـدا سـوریـا خۆی بەبێ لایەن وێنـادەکرد. دەوڵەتەکـانی دیکەش - وەک ئیسـرائیـل و ئوردن- لەبەر هۆکـاری

جیۆسیاسی و وەک شێوازێکی لاوازکردنی نەیارەکەیان- بەگشتی (سەیری نەخشەکە بکە) لەکاتێک بۆ کاتێکی دیکە دەستیان لەکاروباری عێراق وەردا.

دەستتێکەڵکردنی ئەمریکاش لەو دۆزەدا، ڕەگی ئایدۆلۆژیا و ستراتیژیانەی خۆی هەبوو. نەریتی ویلسنیانە[1] هانیداین کۆمەک بە ئاراستەی چارەی خۆنووسینی نەتەوەییانە بکەین، بەڵام ئەوەش دەبووە مایەی دووڕیانی سیاسەتی هەمیشەیی ئەمریکا: سنووری پابەندبوونی ئاکارەکی ئەمریکایی لە ناوچەیەکی وا دوورەدەست و سەخت، وەک چیاکانی کورد، کە بە دەوڵەتگەلێک دەورەدرابوون کاریگەرییان بەسەر بەرژەوەندی نیشتیمانیی ئەمریکاوە هەیە. ئایا چۆن ویستگەیەکی لەبار لەنێوان کۆمەکێک بۆ خواستە بەرزەکانی کورد و دەستبەرداربوونیان لە هەرێمێک کە نوێنەرایەتی جومگەی ستراتیژی هەیڤی ڕۆژهەڵاتی ناوینی دەوڵەمەند بە نەوت و کەنداوی فارسدا دەکا، دەدۆزیەوە؟

هۆکارێکی ئاڵۆز بۆ کۆمەکەکانی ئەمریکایی و گەیشتنی بە دەڤەری کوردی، تەنها لە ڕێی خاکی هەندێک لە وڵاتە هاوپەیمانەکانی وڵاتە یەکگرتوەکانەوە بوو- ئێران لەسەردەمی فۆرد، تورکیاش لە سەردەمی کلینتندا. بەڵام ئەو دەوڵەتانەش تەنها لە خاڵێکی دیارکراودا هاوبابەت بوون لەگەڵ ئەمریکا، ئەویش ڕێگربن لەبەردەم کۆمۆنیستەکان یان ڕژێمە ملهوڕەکان، کە کۆنترۆڵی ناوچە کوردییە دەورەدراوەکە بکەن. هیچ کامیان، نە ئێران لە حەفتاکان و نە تورکیاش لە نەوەدەکان سووکە (بۆرە) بەرژەوەندییەکیشیان لە هەڵچوونی مەشخەڵی نەتەوەخوازییانەی کورد نەدەدۆزیەوە، کە لەنێو خودی خۆشیاندا دانیشتوانی کورد هەبوون، هیچ کامێکیان ئامادەنەبوون دەستبەرداری کەمینەکانی خۆیان بۆ تاکە دەوڵەتێکی کوردی ببن. لەهەمان کاتیشدا، هەردوو دەوڵەتەکە چەقی بازنەی ستراتیژی هەمەگیری ئەمریکا بوون.

---

[1] مەبەست سەرەک ویدرۆ ویلسن و چواردە خاڵە ناودارەکەیەتی لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانییدا. وەرگێڕ.

شــتێکی حەتمییانە بوو، دوودڵی ببێتە خەسـڵەت و لە کۆتایی باڵ بەسـەر تەقەللاکانی ئەمریکییەکان لە هەرێمی کوردی عێراقدا بکێشـێ. دەوڵەتە دراوسـێکان وەک تورکیا و ئێران دەیانویسـت پشـتگیری کورد بکەن تا گوشـاری عێراق لەسـەر هەرێمەکانی خۆیان لابدەن. بەڵام ئەوان بە هیچ شـێوەیەک ئـامـادەنەبوون، هێنـانەکـایەی دەوڵەتێکی نەتەوەیی کوردی لەباوەش بگرن. لەسـۆنگەی هەمان ئاماژەشـەوە، نە نیکسـن، نە فۆرد، نە بوش، یان نە ئیدارەی کلینتن پشـتگیری سـەربەخۆیی کوردی عێراقیان نەکرد، چ جای دەوڵەتەکانی دراوسێ. هەموویان بەدوای ئەو تێکهەڵکێشییەی ئۆتۆنۆمی کورد بۆ پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق دەگەڕان، لەوە دەترسان، لەبەریەکهەڵوەشانی عێراق پەنجەدانان بێ بەسەر پەلەپیتکەی دەیان ساڵی پشێوی کە دراوسێکان شەڕیان لەسەر دەستکەوتەکان دەکرد. بەتایبەتیش کە ئێران لەژێر فەرمـانڕەوایی خومەینیـدا چووە نـاولیسـتی دەوڵەتە ئسـوولگەرا نەیارەکان، ئیدی یەکێتیی خاکی عێراق وەک دژەهاوسـەنگییەک بە ڕووی جێتەماعی ئێرانییەکان سەیرکرا.

کارلەیەکردنی ئەو ئامانجە نەگونجاوانە ناکۆکبوون و تەنانەت مەرگەسـاتی کوردانیشـی بەدواوەبوو. ئەوەش ئەوەبوو کە لە ئازاری ١٩٧٥دا قەوما، کـاتێ ئێران و عێراق گەیشـتنە ڕێکەوتنێـک و ئۆتۆنۆمی کوردان کەوتە ژێربالی بەرژەوەندی نیشـتمانییانەی هەردوو دەوڵەتە دراوسـێکان. ئەوەش لە ١٩٩٦دا دوبـارەبووەوە، کـاتی ئۆتۆنۆمی کوردان لەژێر قەڵغـانی ئەمریکییەکـان لە دوای جەنگی کەنـداوی ١٩٩١دا دامەزرابوو، بەڵام بە شـێوەیەکی جەوهەری سـەددام حوسـێن ئۆتۆنۆمییەکەی کزکردەوە، کە پشـتی لایەنێکی کوردی گرت بۆ ئەوەی پشـتی نەیارە کوردەکەی دیکە بشـکێنێ کە پشـتگیری ئەمریکای هەبوو. لە ڕوانگەی منەوە، ئیدارەی فۆرد زەمینەی لەبارتری لە کلینتن هەبوو تا پابەندبوونەکانی خۆی بەرفرەوانتر نەکا – بەڵام لە هەردوو باردا مەودای سنووردار و دۆشـدامانی بایەخمان لە وڵاتە دوورەدەستەکەی کوردان ڕوون و دیارە.

ئیدارەی نیکســـن و فۆرد کۆمەکی دەرەکییان بۆ خواســـتە بەرزەفڕەکانی کورد بۆ ئۆتۆنۆمی وەک بەشـێوەیەکی ئاســایی دەگوترێ، دانەهێنا، بەڵکو ئەوان یەکەمجار ڕاستەوخۆ سـەرچاوە ئەمریکییەکانیان بۆ کردنە پاڵپشت. چونکە ئێمە پشـــتگیری گرووپێکی ئەتنیمان دەکرد، کە دژی حکوومەتێکی قانوونی وەســتابووەوە، لەبەرئەوەش وەڵاتەکانی دیکە، نەخاســـمە ئێران و ئیسـرائیل پێیەوە پەیوەسـتبوون، ئیدی ئۆپەراسـیۆنەکە دەبوایە "ژێربەژێر" بووایە لەو ناوچە خۆڵەمێشـــییەی نێوان هێزی ئاشـــکرای ســـەربازی و دیپلۆماتیدا.

بنەمای دەســتتێکەڵکردنی ڕاسـتەوخۆمان بە کوردەوە بۆ سـاڵی ١٩٧٢، بۆ سـەردانەکەی نیکسـن بۆ لای شـا لە تاران دەگەڕێتەوە، ئەو کۆبوونەوەیەی دوابەدوای دیدارە لوتکەییەکەی لەگەڵ برێجینێڤ لە مۆســـکۆدا هات. ئەو هەفتە ئاهەنگە مێواندارییە هێوربوونەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ کرەملین، پێشنۆرە ستراتیژییەکانی نیکسنی نەگۆڕی. ئەو هەرگیز بۆ بەرقەرارکردنی هێورەییەکە، دەســتبەرداری خواســتەکەی بۆ ئەوپەڕی مانۆڕ لە کێبەرکێی سیاسیانەی جیهانیی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا نەبوو.

یەکێک لە کێبڕکێیەکان لە عێراق، لە دەروازەی شادا خۆیگرتەوە. بۆ پرسـی ئایندەی سـیاســی ئەو دەوڵەتەی لە یەدەگی نەوتدا لە دوای عەرەبســتانی سـعودیدا بە دووەم دەهات، لەو کات بەدواوە بەو سـەرچاوە دەرامەتانەی هەڕەشەی لە هاوسەنگی ڕۆژهەڵاتی ناویندا دەکرد بەتایبەتیش لە کەنداودا. لە ١٩٦٨دا حزبی بەعس بەرنامەیەکی خۆجێی ڕادیکاڵانەی کردە کارنامە و نەیاری ســەربازییانەشــی دژی ڕۆژئاوا ڕاگەیاند و دەســەڵاتیشــی لە بەغدا گرتەدەست. ئیدی مایەی سـەرسـوڕمان نەبوو، عێراقی بندەستی سـەددام حوســـێن زیاتر لە یەکێتیی ســـۆڤیەت نزیکببێتەوە، ئەوەش لەکاتێکدابوو، هەبوونی پانزە هەزار ســـەربازی سـۆڤێتی لە میســـردا ئەو مەترسـییەی دووپاتدەکردەوە، کە تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوین ڕەنگبێ بکەوێتە بن ڕکێفی دەســترۆیشـــتنی ســـتراتیژییەتی ســـۆڤیەتی. ئەوســـا باری هێورکردنەوە

(ئاسـاییکردنەوە) هەرچییەک بووبا، کەمکردنەوەی قەڵەمڕەوێتی سـۆڤیەت، چەقی بازنەی مەبەسـتی سـتراتیژیمان بوو. هەر بەڕاسـتیش، ئێمە هێورکردنەوەی پەیوەندییەکانمان وەک داردەسـتێک بۆ خۆپارێزی لە مەترسییەکانی ستراتیژییەکە دەبینی.

ئەو دەوڵەتانەی لە بەرانبەر ئاراستەی عێراقی نوێدا، کە خۆیان لەبن بارێکی دژواردا دەبینیەوە، ئوردن و ئێران بوون، هەردووکیشـیان سـنوورێکی پانوپۆڕیان لەگەڵ عێراقدا هەبوو، ئیسـرائیلیش هەمیشـە لەوە نیگەران بوو، کە ڕژێمێکی ڕادیکالی عەرەبی بە چەکی سـۆڤێتی تەیاربکرێ. هەرسـێ دەوڵەتەکەش دۆسـتی ئەمریکا بوون. هەرسـێکیشـیان ژێربەژێر کۆمەکی کوردیان دەکرد. ئەوان وەک گەمەی کارتێک سـەودایان لەگەڵ داخوازی ئەم دواییەی ئۆتۆنۆمی کورد لە شاخە سـەخت و ئەستەمەکانی باکووری عێراقـدا دەکرد، بۆ ئەوەی ڕووی نەیـاریی وزە و دەرامەتەکـانی عێراقی لەسـەر سـنوورەکانی خۆیان دووربخەنەوە. هەرچەندە ئێمە بە کردەوە بەشـداری ئەو کۆمەکە ژێربەژێرییەمـان نەکرد، بەڵام ئـاژانسـە هەواڵگرییەکانمان لە ڕێی هاوتاکانیان لە هەر یەک لە وەڵاتە تێوەگلاوەکان، پێیەوە ئاشـنابوون. بێگومان هەموو ئەو دەوڵەتانەش کۆمەکی ئابووری و سەربازییان لە وڵاتە یەکگرتووەکانەوە پێدەگەیشت.

بۆ سـاتێکی ڕاگوزەر، پێدەچوو عێراقییەکـان و کورد کێشـەکـانیـان چارەسـەرکردبێ. لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠دا ڕێککەوتنێک لە نێوان بەغدا و سـەرکردەی کورد مستەفا بارزانی کرا.[١] حکوومەتی بەعس قایلبوو، عێراق بکاتە دەوڵەتێکی فرەئەتنیک، کە لە دوو نەتەوەی سەرەکیی عەرەب و کورد پێکهاتبوو. جێگری سـەرۆک درایە کورد؛ زمانی کوردی کرایە زمانێکی فەرمی و بە ڕێژەی خۆشـیان، کورد لە پەرلەمـانی دامەزراوی نوێـدا بەشداربین.

لە مانگەکانی دواتردا، ڕێککەوتنەکە لەسەر پێناسەکردنی ئۆتۆنۆمی کێشەی تێکەوت، ئەوەش شـتێکی سـروشـتییانە بوو، کاتێ هەوڵدرا کە هێز لەنێوان

گرووپە ئەتنیە ناحەزەکان دابندرێ. ئۆتۆنۆمی بۆ بارزانی واتای ئەوەی دەگەیاند؛ قەڵەمبازێکە هەمیشـــە لە دیفاکتۆی ســـەربەخۆییەوە نزیک بێ، لەکاتێکدا ســـەددام حوسـێن وای هەڵسـوکەوت لەگەڵ ڕێککەوتنەکە دەکرد، وەک هەنگاوێکی تاکتیکیانە بۆ ڕێگەخۆشکردن کە بیرۆکەی بەعس بەسەر سەرتاپای دەوڵەتێکی یەکگرتوودا پەیڕەوببێ.

بە هاتنی پایزی ١٩٧١، جارێکی دیکە پەیوەندییەکانی نێوان کوردەکان و بەغدا گەیشتە سەر خاڵی لەیەکترازان. کورد، سەدام حوسێنیان بە تاوانبار دەزانی، کە هەوڵی کوشـــتنی بـارزانی داوە، تـا دەهـاتیش گومـان لە دەوروبەری ســـەددام قەبەتردەبوو بەو جموجۆڵەی بە ئـاراســـتەی حکوومەتێکی یەکێتی نیشـــتمـانیی دەدا، کە حیزبی شـــیوعی عێراقی لەخۆگرتبوو. ئەمەش کوردەکـانی داپڕانـد، بۆیە چـالاکی گەریلایـانەیـان دەســـتپێکردەوە، کە لە لایەن ئێران و ئیســـرائیلەوە پشـتگیریی دەکران. لە تشـــرینی دووەمی ١٩٧١دا و دووبارەش لە ئازاری ١٩٧٢دا شـــا داوای لە نیکســـن کرد کە هاوکار بێ لە پشـــتیوانیکردنی بارزانیدا. لە ٢٨ی ئازاردا شـای ئوردنیش وەک ناوبژیوانێک ڕاستەوخۆ بۆ بارزانی هاتەسەرخەت و داوای کۆمەکی لە نیکسن کرد. هەرچی ئیسرائیلیش بوو هەرگیز ڕاستەوخۆ داوایەکی پاڵپشـــتی وەهای نەکرد، بەڵام ئێمەی لە نیگەرانییەکانی خۆیان سەبارەت بە ئاراستەی سیاسەتی عێراق و بەرژەوەندیشیان لە هەبوونی ئۆتۆنۆمی لەناوچەی کورداندا، ئاگادارکردەوە.

ئێمە ڕوومان لەو داوا کۆمەکە ڕاستەوخۆیانە وەرگێڕا، چونکە نەماندەویست زیاتر هاتنی چەکی سۆڤێتی و دەستڕۆیشتنیان لەو ناوچەیەدا بوروژێنین. «جوزێف فارلاند Joseph Farland»، باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران، ئەو ئاگادارییەی هەڵســەنگاند بەوەی ئەگەر هەڵمەتی ئۆپەراسیۆنی ژێربەژێری کورد دەســـتپێبکرێ، ئەوا کراوە دەبێ، ئەگەر وەســـتێنراش ئەوا بارێکی ناسک دەبێ لە بەرانبەر "ڕاڤەکردنێکی نەخوازراودا".

سەردانی «ئەلێکسی کۆسیجن Alexei Kosygin» سەرۆوەزیری یەکێتی سۆڤیەت بۆ بەغدا لە نیسانی ١٩٧٢دا کارێکی وایکرد ئێمەش بە سیاسەتی دەستبەستنمان لەناوچەکەدا بچینەوە. لە نۆی نیساندا ئەو پەیمانێکی دۆستایەتی لەگەڵ عێراقدا واژۆکرد، تەنانەت بە چاوپۆشین لە دەستوەردانی ئەمریکییەکان لە کاروباری کوردانیش، پەیماننامەکەی نێوانیان بە ئاستێکی قەبە دابینکردنی چەکی گەورە و قورسی سۆڤێتی بۆ عێراق لەخۆگرتبوو. ئیدی عێراق بەخۆی بووە دارسانێکی جیۆپۆلیتیکیانە و چووە سەر ئەو رێیەی، کە لە بنەمادا ببێتە هاوپەیمانێکی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا. بە پاڵپشتی ئەو چەکە تازەهاتووە، هێزەکانی عێراق کەوتنە هێرشکردن و گەیشتنە پشتەوەی ئەو هێڵە هاوسەنگیانەی کە بە هۆی پشتگیریی ژێربەژێری ئێرانی و ئیسرائیلییەکان دروستببوو. ئیدی بەیەکدادانی سەربازەکانی عێراقی و ئێرانییەکانیشی لەسەر سنوورەکان بەدواداهات.

ئەوەش ئەو ئامادەکارییە بوو، کە نیکسن لە ٣٠-٣١ی ئایاری ١٩٧٢دا سەردانی شای ئێرانی لە تاراندا کرد. هەمووومان لەبن هەست و سۆز و ماندووبوونی جەستەیی کۆبوونەوە لوتکەییەکەی مۆسکۆدا داهێزرابووین. نیکسن سەرەرای بۆردمان و گەمارۆی باکووری ڤێتنامی هاوپەیمانی سۆڤیەتی - سەردانی مۆسکۆی کرد؛ ئەمەش هەردوو هەفتە پێش نەخشەی سەردانەکەی و شەش مانگیش بەرلە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بوو.

ئەو مێوانداریيە بەجۆشەی ئێرانییەکان شەکەتیی گەشت و تیمی رۆژنامەوانانی قەبەترکرد. یەکێک لە لێکەوتەکانی ئەو شەکەتبوونە بادەنۆشی نیکسن بوو لەسەر بەخێرهێنانی سەرخوانە بێئەندازە رازاوەکەی شا بوو. چراکانی کامێرای تەلەفزیۆن بۆ سەرۆک زۆر زەقورزۆپ بوون کە دەستنووسە ئامادەکراوەکەی بخوێنێتەوە، بەتایبەتیش نەیدەویست لەبەردەم تەلەفزیۆندا چاویلکە بکاتە چاوی. بۆیە بڕیاریدا سەرپێیانە قسەبکا، دیاربوو بایی ئەوە توانای بەسەردا دەشکا، بەدەر لەوەی پێدەچوو

لە گوتارێکی لەبلەبانەنە دوور بوو. ئەو چەند جاران لەسەر بابەتەکە سوورڕا، لە دواییدا لەبنی هەمبانەی دا. نیکسن ڕاستەوخۆ تەماشای شای کرد، ڕوانینی سەرەک ئایزنهاوەری بە بیر شاهەنشا هێنایەوە، کە هەموو ئەو سیناتۆرانەی ناسیبوونی ژنیان لەسەرووی چینی خۆیانەوە هێنابوو. ئیدی بەو ڕۆحە نیکسن سەرکەوتووانە گەیشتە ئاکام و پێشنیازی نۆشکردنی بۆ خاوەنشکۆ و شابانووی خۆشەویستی لە تەنیشتیەوە کرد. چەپڵەی ئێرانیەکانیش لە باشترین باردا بەجۆش نەبوو.

لەو کاتەی کە نیکسن و شا بارودۆخی نێودەوڵەتییان تاوتوێ کرد، هەموو خۆشمەجلیسییەک وەستا. نیکسن کە تازە لە بادەگۆڕینەوە بێئەندازەکەی مۆسکۆ گەڕابووەوە، نمایشێکی وایکرد، کە ئەو وەک سەرۆکی ئەمریکا کەمتر وایە بە پەیوەندییەکی تایبەتمەندانە لەگەڵ سەرکردەی کۆمۆنیستی زلهێز لەخشتەببردرێ. لە تێبینی کردنەوەی دانیشتنەکەدا ئەو سووربوونەی دوپاتکردەوە، کە لەگەڵ دۆستەکانی ئەمریکادایە و ڕێگریش دەبێ لەبەردەم سەرەڕۆییەکانی سۆڤیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا. لەگەڵ ئەوەشدا پارێزگاری لەوە دەکەین کە کێشە هەرێمییەکان نەتەنرێنەوە و نەگەنە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی نێودەوڵەتییانە، هەروەها ڕێگەنادەین هاوسەنگی هێزی جیهانی یان هی ڕۆژهەڵاتی ناوین لاسەنگ ببێ. هەر بە ڕاستیش لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا بۆ ئەوە تێدەکۆشین، تای هاوسەنگی بە بەرژەوەندی خۆماندا بشکێنینەوە، بەو نمایشەی کە نە عەرەبە ڕادیکاڵەکان و نە چەکی سۆڤیەتیش ئامانجەکانی عەرەب بەدیبێنی. من هەڵمدایێ بەوەی نابێ "هێوربوونەوەیەکی دەستەبژێر" بپەژرێنین، پێناسەکردنەکەم وەها بوو؛ "چارەسەرکردنی هەندێ پرس لەگەڵ هەندێ نەیار لەپێناو پەراوێزخستنی ئەوانی دیکەدا... ئێمە دەبوایە ئەوە لە سۆڤیەتییەکان بگەیەنین." من ساڵێک دواتر لە ١٩٧٣دا لە بۆنەیەکی سەردانکردنەوەی شا بۆ واشنتن، کرۆکی نەخشەکەمان بەو شێوەیە پوختەکردبووەوە:

**"ئێمە هەوڵدەدەین کشمات لە دەستڕۆیشتنی سۆڤیەت بکەین، کە لە هەر شوێنێک دەربکەوێ و لە هەر سەرچڵیەکیش کە بەدوایدا دەچن شـەکەتیان بکەین. ئێمە دەمانەوێ شـتێکی وا لە مێشـکی مەکتەبی سـیاسـیاندا بچەسـپێنین[٢] چالاکییە ماندووە گرانبەهاکانیان لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا هیچ ئاکامێکیان لێناکەوێتەوە."**

لەبەرئەوە شـا بۆیدەرکەوت نیکسـن گوێگرێکی وەرگرە، ئیدی نیگەرانی خۆی سـەبارەت بەوەی کە "سـۆڤیەتییەکان دەیانەوێ هاوپەیمانییەک لە کورد، بەعسـییەکان و کۆمۆنیسـتەکان پێکبهێنن، بەمە لەجیاتی ئەوەی کێشـەی کورد ببێتە درکێکی بەرپێیان، ئەوا دەبێتە شـتێکی بەنرخ بۆ کۆمۆنیستەکان."

نیکسـن لە ئەنجامی گفتوگۆکەی لەگەڵ شـادا دوو بڕیاری دەرکردن. وەک دژەکردەیەکی سـەروسـەودای کۆسیجن - سـەددام بۆ چەک، ڕەزامەندبوو بەوەی فڕۆکەی نمایشـبەرز بفرۆشـێتە شـا، کە خۆی پێشـتر داوایکردبوو، بەڵام لەبەر دەمەقاڵەی بیرۆکراسـی نێو پنتاگۆن ئاخۆ فڕۆکەی F-15ی پێبدرێ یاخود Navy F-14 سـەودایەکە گیریخواردبوو. نیکسـن ئەم کێشەیەی چارەسەرکرد بەوەی هەردوو چەشنەکەی پەسندکرد و لێبژاردنی نێوانیشی بە تەواوی بۆ شا جێهێشت. (ئەوەش بنگەی ئەو دەنگۆ و واتەواتە بوو گوایە نیکسـن فەرمانی بەسـەر پینتاگۆندا کردووە کە هەرشـتێک شـا ویستی، بیدەنێ. فەرمانەکە تەنها بۆ هەڵبژاردنێک بوو لەنێوان F-15 و F-14 ـەدا.)

لەهەمان کاتدا، نیکسـن بەو ئاکامە گەیشـت، بەبێ پشـتگیریی ئەمریکا ڕاپەرینە لەئـارادابووەکەی کورد دژی حکوومەتی بەغـدا سـەرنـاگرێ. پشـکداریی ئەمریکی لەهەر شـێوەیەکدا بووایە پێویسـت بوو بۆ پاراسـتنی

---

[٢] مەبەسـت مەکتەبی سـیاسـی حزبی کۆمۆنیسـتی یەکێتیی سـۆڤیەت بوو کە دەسـەڵاتداری ڕەهای وڵاتەکە بوو. وەرگێڕ.

ئەو مۆراڵەی کلیلی ناوچەکە بوو بۆ هاوپەیمانەکانی وەک ئێران و ئوردن، کە پاڵنەرەکانیان جیاوازبوون و پشکدارییەکیش بوو بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی هێز لە هەرێمەکەدا.

مەبەســـتمان ئەوە بوو عێراقییەکان بۆ چەســـپاندنی ڕژێمەکەیان زۆریان لەســـەر بکەوێ، بۆ ئەوەی هێزی دانووســـانی کورد زیاتر بێ و بەهۆیەوە بەغدا هانبدرێ لە ڕەفتاری ســـیاســـییانەیدا زیاتر ڕێزی ئاســـایشـــی دراوســـێکانی بگرێ و ئۆتۆنۆمیش بداتە کەمینەی کورد. وەها باوەڕدەکرا کە پشـکدارییەکەی ئەمریکا کلیل بێ: بەو پشـکدارییە دارابیە یەکانگیرییەک لە ئامانجەکانی پرســـەکە دێنێتە دی، بۆ هەریەکەشـــیان بایەخێکی زۆری دەبێ بۆ پەیوەندییەکانی لەگەڵ وەڵاتە یەکگرتووەکاندا، هەروەها بۆ ئەوەش، کە لێیان تابووبکرێ دەســـتبەرداری کوردەکان ببن - ئەو حوکمدانە وەک دەیبینین سەلمێنرا، کە زۆر گەشبینانە بوو.

**مشتومڕی ناوخۆ**

لەوەتەی بابەتەکانی لێکۆڵینەوە هەواڵگریەکانی کۆمیتەکانی چەرچ Church و پـایـک Pike بوون بە بـابەتی تەلەفزیۆن، فیلم و کـاخەزی چـاپکراو و بڵاوکرانەوە، دەزگەی هەواڵگریی وەک توندڕەوی جەنگاوەرێکی شـــەڕی سـارد وێناکرا کە هی ئەوە نەبوو سیاسییانە جڵەوبکرێ و پەرۆشیش بوو بۆئەوەی ســـەرچڵی بە دەرامەدەکانی ئەمریکـاوە بکـا بۆ بەدواداچوونی بەردەوامی خشتە شێتانەییەکەی. خۆ ئەگەر هەرگیز جۆرە سی ئای ئەیەکی وەها هەبووبێ، ئەوا لە سـەردەمی نیکسـن و فۆردا دیار و بەرچاو نەبووە. هەموو ئۆپەراســـیۆنە ســـەرەکییە ژێربەژێرەکان لەو ناوچانەدا – چیلی و کورد و ئانگۆلا - لەلایەن کۆشـــکی ســـپییەوە فەرمانی بۆ دەرکراوە و بە شێوەیەکی سـەرەکیش ئۆپەراسیۆنی ژێربەژێر بوونە، چونکە دیپلۆماتییێکی لەبار و ئاشـکرا بۆ ئەوان لەئارادا نەبووە. ڕاپەڕینی کوردانیش لە شـوێنێک بەرپابوو، کە خاکی دەوڵەتێکی سـەروەری دانپێدانراوی هاوپەیمانی یەکێتی ســـۆڤیەت بوو، ژێربەژێریش لە لایەن کۆمەڵە دەوڵەتێکی هاوپەیمانی وڵاتە

یەکگرتووەکان پشـــــتگیری دەکرا، کە لە ڕووی داراییەوە ئێمە کۆمەکمان دەکردن. لەوێدا ســـەرچڵی تەشـــەنەســـەندن هەبوو، بەڵام هاوکات ئەوەش بەدیدەکرا، کە ســـەددام حســـێن قەڵەمڕەوێتییەکەی بەهێزتر بکا و هەرێمی کوردی عێراقیش بکاتە پێگەیەک بۆ تێکدانی ناوچە کوردییەکانی هەموو وڵاتە دراوسێکان. لەو کاتەی کە ئەو جۆرە تێکدانە گرێدراوبوو بە گەشەی خێرای هێزە چەکدارە عێراقییەکانەوە، کە دەکرا ببێتە چەکێکی بەهێز دژی وەڵاتەکانی کەنداو، ئێران و تەنانەت تورکیاش.

**کاتێ ســەیری ئەوێ دەمێ دەکەی، هەڵســەنگاندنی لایەنی ئەرێنی و نەرێنی بڕیاری پشـــتگیری ڕاپەڕینی کورد پێدەچوو زیاتر هاوســـەنگ بێ لەوەی ئەوکـات کردیـان. ئێمە دەبوایە زیـاتر وریـا بـاین لە بـارەی پـاڵنەرە جیاوازەکانی هاوپەیمانێتی دژەعێراق بەیەکەوە لەگەڵ دەرەنجامەکانی یەکێ لە هـاوکـارەکـان کە لە بەلەمەکەدا بـازی هەڵـدا و خۆی فڕێـدایەدەر. لە سـەرووی هەمووشـیانەوە دەبوایە ئێمە لەوە زیاتر تێگەیشـتباین، کە کورد نیشـانەی هاوکارێکی لەرزۆک بوون، شـتێکی ئاسـتەنگ بوو بەوەی لەگەڵ ســـتراتیژی هەمەلایەنە یەکانگیربن. نیازی ڕاگەیەنراوی ســـەرکردەکانیان هەرچییەک بووبێ، ئامانجی بنگەییان گەیشـــتن بەســـەربەخۆیی بوو یان بەلای کەمی ئۆتۆنۆمییەکی تەواوعەیار بوو، هەمیشە دەیانویست پێ لەسەر دەســـتنیشـــانکردنی پێشـــنۆرەییەکانیان بەشـــێوەیەک دابگرن، کە لەبەر ڕۆشـــنـایی پلەبەنـدی پەیوەنـدی هێزە دەرەکییەکـان بۆ هـاوســـەنگی جیۆســـیاســـییانە بێ. ئێمە فێربووین کە ئەوە خۆشـــە لەبارەی پاڵەوانەکان بخوێنینەوە نەوەک هاموشۆیان لەگەڵدا بکەین؛ ئەو چۆنایەتیە نایابەی دنەی ئازایەتییان دەدا، هەروەها تێکەڵەیەکی سەرڕەقیانەشیان بوو.**

تەنانەت هێشـــتاش ســـوودی تێگەیشـــتنی درەنگوەخت ئێمەی بۆ ئەزموونی بژاردەی هۆبســـن[٣] هێشـــتەوە، کە شـــتێکی وای لەو چارەگە ســـەدەیەی

---

[٣] Hobson's choice وەرگرتنی ئەو شـتەی کە پێشـکەشـت دەکرێ یان دەسـتهەڵگرتن لە هەموو شـتێک، ئەمەش ئیدیۆمێکە بە ناوی تۆماس هۆبسـنەوە هاتووە کە ئەسـپی بەکرێ دەدان، وای لە

ڕابردوو نەگۆڕێ، لەوەتەی: شـــکســـــتهێنان لە کردەوەکە دەبووە مایەی ئەوەی هـاوپەیمـانیی بەرقەرارەکەی دژ بە عێراق لەیەک بترازێ، کورد بۆ بەزەیی سـەددام حوسـێن بەجێبهێڵرێ و سـەریش لە کەنداو بشـێوێنرێ؛ لە کاتێکدا پابەندبوونیش بۆ ئێمە هەمان تاســـوحەمامی ژان و ناســـۆری ڕۆچوون بوو لەو دووریانەی، ئەگەر هاتبا و سۆڤیەتییەکان بە شـێوەیەکی جەوهەری دایبنکردنی چەک و تفاقیان لەســـەرووی ئاســـتی هەبوو زیاتر بکردبا. هەڵبژاندن لەنێوان مەترســـییەکی دڵنیا و مەزندەکراودا، ســـەرچڵی دوورەدەست سـەرنجڕاکێشـەرانەترە. لەڕاسـتیدا ئەوەش بۆ بڕیارەکەمان لە ١٩٧٢دا کاریگەر بوو. لە یەکی ئابی ١٩٧٢دا نیکســـن فەرمانی ڕێنماییەکانی بەرنـامەی ژێربەژێری واژۆکرد[٤]. وەڵاتە یەککگرتووەکـانی ئەمریکـا بڕی ٢٥٠.٠٠٠ دۆلاری مانگانەی وەک کۆمەکێکی ڕاســـتەوخۆی ســـاڵی دارایی ١٩٧٣دا تەرخان کرد، ســـەرباری دوو ملیۆن دۆلاری دیکەش بۆ تەقەمەنی، یان پێنج ملیۆن دۆلار ســاڵانە. پشـکدارییەکەی (شـا)ش لەو بڕە زۆر زیاتر بوو. ســـەرجەم کۆمەکەکان بەیەکەوە لەگەڵ هی ئیســـرائیل، بەریتانیا و ئێرانییەکان بۆ کورد گەیشـتە نزیکەی یەک ملیۆن دۆلار مانگانە. بەگوێرەی پێوەرەکانی شەڕی سارد، ئەوەش بڕێکی زۆر نەبوو.

کاتێک ئێمە لە حیکمەتی پشـکداری ئەمریکییەکان ورد دەبووینەوە، سـەرباز و ڕاوێژکارە ســـۆڤیەتییەکان لە تەموزی ١٩٧٢دا لە میســـر دەردەکران. ئەمەش بایەخی عێراقی بۆ ســـتراتیژی ســـۆڤیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا

---

مەعمیلەکـان دەکرد ئەو ئەســـپەی نزیـک دەرگە هەڵبژێرن دەنـا نەدەبووا هیچ هەڵبژێرن- بڕوانە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد- وەرگێر.

[٤] لێرەدا کۆبوونەوەیەکی فەرمی کۆمیتەی چل لە ئارادا نەبوو. لەبەر هۆکاری ئاســـایشـــپارێزی، ڕێنماییەکان ڕادەســـتی بەڕێوەبەرەکان کران: ئەوانیش وەکیل وەزیری کاروباری دەرەوە، جێگری وەزیری بەرگری و ســـەرۆکی دەســـتەی ئەرکانی هاوبەش، ئەمەو وێڕای بەڕێوبەرایەتی ســـی ئای ئەی. هەریەکێش لەمانە بۆیان هەبوو بەرنامەکە ڕەتبکەنەوە، بەڵام نەیانکرد. کۆمیتەکەی پایک زۆری لەســـەر دیـارنەبوونی کۆبوونەوەی فەرمی هەڵچنی بوو، هەرچەنـدە بەدڵنیـاییەوە بە دەرهاوێشتەیەکی جیاوازیش نەدەگەیشت. (نووسەر)

زیــادکرد و تەکــانێکی نوێی دایە مۆســـــکۆ بۆ بەهێزکردنی ڕایەڵەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ڕژێمی بەغدا. لە کۆتایی ئابدا، میکائیل ســـوســـلۆڤ Mikhail Suslov ئەندامی مەکتەبی ســیاســی، دنەی بارزانی دا کە بچێتە نێو حکوومەتە نوێیەکەی سەددام حوسێن. بەگوێرەی بارزانیش، سوسلۆڤ ئاگاداری کردبووەوە کە دوای دەرکردنیان لە میســـــر، یەکێتی ســـــۆڤیەت پەیوەندیەکانی لەگەڵ عێراق بە گرنگ دەزانێ و دەیەوێ پاڵپشـــــتی زیاتری حکوومەتی بەغدا بکا. گرەوەکان بەرچاوانە بەرزبوونەوە.

سەبارەت بە لایەنەکەی ئێمە، شا و مەلیک حوسێن لە کۆشکی شا لەسەر دەریـای قەزوین لە ٣١ی تەموز تـا ٢ی ئـابی ١٩٧٢دا کۆبوونەوە. ئەوان پێشـــــوازیان لە کۆمەکی ئەمریکا کرد و هەوڵیاندا ڕێســـــایەک بۆ هەوڵی هـاوبەش دابنێن. بـارزانیشـــــیـان ئـاگادارکردەوە خۆی لەهەر جموجۆڵێکی درامــاتیکیــانە بە دووربگرێ نەبــادا ببێتە ڕێخۆشـــکردنی هێرشـــێکی ســـەرتاســـەری عێراق، وەک ئەوەی جاڕی دەوڵەتێکی ســـەربەخۆیی کوردی بدا. ئەو ڕژدبوونەیان بۆ بەهێزکردنی توانستی بەرگریکارانەی کوردی بوو بۆ پاراستنی پێوانەیەکی زۆری ئۆتونۆمی.
لەمیانەی ســـــاڵی ١٩٧٣دا شـــــەڕ پەرەیســـــەند، هەروەها داخوازی دارایی کوردانیش پتر بوو. لە ٢٩ی ئازاری ١٩٧٣دا، من پشـــتگیری داوایەکی ســـی ئای ئەیم کرد، کە لە لایەن جیم سیسینجەر Jim Schesinger ـــەوە، کە بەڕێوەبەری ســـــی ئـای ئەی بوو، داوای زیـادکردنی دەرامەتەکـانی کرد، لەپاشـــاندا نیکســـنیش پەســـەندیکرد. یاداشـــتەکەم ئەوەی تاوتوێکردبوو، کە عێراق بنەمـــایـــانە بۆتە بریگرتەیەکی ســـــۆڤیەت لە ڕۆژهەڵاتی نـــاوینـــدا؛ حکوومەتی بەعسیش لەژێر ڕکێفی سەددام حوسێندا بەردەوام بوو لەسەر پارەدان بە ڕێکخراوە تیرۆرســـــتەکانی ناوچە دوورەکانی وەک پاکســـــتان؛ ئەوەش هێزێکە بۆ "بەرەی ڕەتکردنەوە" تا دەســـــتپێشـــــخەریەکانی ئاشـــتی عەرەب - ئیسرائیل پەکبخەن. لەبەر ئەو هەموو هۆیانە، ڕاسپاردەم وابوو، بڕی کۆمەکمان ســـــاڵانە بۆ پتر لە پێنج ملیۆن دۆلار زیادبکرێ. شـــــاش

پابەندبوونە دارایەکەی بە بڕێکی زیاتر خەستەسەر کە نزیک بوو لە ٣٠ ملیۆن دۆلار، سەرباری ئەوەش یارمەتی لۆجستیکی و تۆپخانە، کە لە تۆپی مەودادرێژ پێکهاتبوو، لە ئێرانەوە پشتگیری کوردی پێدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا نیکسنم لەوە ئاگادارکردەوە نەوەک کورد سەرچڵیەکی وەها بکەن، لەودیوی ڕەوشی بەرگری خۆیانەوە بێ:

**دەکرێ ئێمە هەوڵی ئەوە بدەین کە دووربکەوینەوە لە پێدانی پابەندبوونێکی درێژخایەن، بەوەی بە بارزانی بڵێین ئێمە ئەو کۆمەکە زێدەییانەمان بۆ ئەم ساڵەیە و لەسەر بنەمای مانگانەشە، بەڵام هەرچۆنێک بێ دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە ئێمە هاوبۆچوونی (شا)ین سەبارەت بە مانەوەی ئەو ڕەوشە بەرگرییەی ئێستای کورد.**

لە ساڵی یەکەمدا پێدەچوو هەوڵوتەقەللای ئۆپەراسیۆنی ژێربەژێر ئامانجەکانی بپێکێتەدی. لە پێنجی تشرینی یەکەمی ١٩٧٢دا ڕاپۆرتێکی بەڕێوبەری سی ئای ئەی ڕیچارد هێلمسRichard Helms ـم، کە دوایی بووە باڵوێزمان لە ئێران، گەیاندە نیکسن؛ تیایدا پێماندەڵێ؛ کورد دەستوپێی دوو سێیەکی سوپای بەعسیان بەستووە:

**" شتەکان لەگەڵ ڕژێمی بەعس باش ناڕوا... مانەوەی بارزانیش لە پاراستنی سەنگەرەکانی بەردەوامە و بۆئەوەی بازنەی ئابڵوقەی لەسەر دوو لەسەر سێی سوپای عێراق قایمتر بکا و بەعسیش لە بنکەکانی بێبەش بکا، کە لێیەوە تەکانی تێکدان و تیپی لەناوبردنی دژی ئێرانییەکان بەکاردەهێنا."**

کاتێکیش لە ١٩٧٣دا جەنگ لە ڕۆژهەلاتی ناویندا بەرپابوو، کۆمەڵێک سەرئێشەی نوێی بۆ پەیداکردین. خەمی ئەوەمان خوارد ئاخۆ پێویستە ئێمە ئەو بۆنەیە بقۆزینەوە و هانی کورد بدەین بۆ پەلاماردان لەنێو عێراقدا تا سەددام حوسێن برووخێنن. ئێمە سەبارەت بە هەوڵێکی وا پشتمان لە پێشنیازی ئەفسەرە پەیوەندیکارەکانی ئیسرائیل کرد - ئەوەش بڕیارێک بوو، لە ساڵەکانی دواییدا ناکۆکی هەڵگربوو.

ڕەخنەگرتنەکە نموونەیەکی کلاسیکییانەی گەڕانەوە بوو بۆ پاڵەوانێتی. کاتێک جەنگی عەرەب -ئیسرائیل هەڵگیرسا، بەرنامەی ژێربەژێرەکە کەمێک لە ساڵێک پتر بوو هەبوو. کورد هەر بڕێکی کەمیان لە چەکی قورس هەبوو؛ ئەو تۆپخانەیەی تاقمی ئێرانی لەسەری بوون هەرگیز سەرچڵیەکی وایان نەنواند، لەسنوورەکانی خۆیان دووربکەونەوە. کورد توانای هەبوو نیشتمانە شاخاوییەکەی خۆی بپارێزێ، کە تانک و فڕۆکەکانی عێراق بە زەحمەت دەیانتوانی جموجۆڵی تیادابکەن. بەڵام چەکە سووکەکانیان بەرگەی ئەوەی نەدەگرت لە دەشتاییەکانی پشت نیشتمانەکەیان[5] ڕووبەڕووی سوپای عێراقی پڕ چەک و کەرەسەی سەربازی ببنەوە، کە چەکی قورس و بەسەدان تانکی سۆڤێتییان هەبوو. جێگەی گومانیشی تێدا نەبوو هێرشی کورد دوور لە سەنگەرەکانیان دەبووە مایەی تێکشکاندنێکی سەرتاسەری بۆیان.

ئەمەش ڕەوشەکە بوو بەتایبەتی، چونکە بەپێچەوانەی گەڕانەوە بۆ بیروباوەڕی میللی، عێراقییەکان هێزێکی سەرەکیان بۆ پاڵپشتی عەرەب نەنارده جەنگەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوین[6]. هەروەک «هێلمز» ساڵی پێشتر پێیڕاگەیاندین، کورد بەردەوامبوون لە دەستوپێ بەستنەوەی دوو لەسەر سێی سوپای عێراق. بۆیە مایەی سەرسوڕمان نەبوو، لەوبارە گرژەی نێوان دەوڵەتی عێراق لەگەڵ سووریادا – تاکە بەرەی عێراقی بەوو، کە لەبەر باری جیۆگرافیایی دەکرا کاریگەر بێ- کەچی تەنیا یەک لیوای سوپای عێراقی نێردرایە بەرەی شەڕی ئیسرائیل. "شەڕکردن" وشەیەکی ناسکە، بۆ لیوا سەربازییەکەی عێراق پێویست نەبوو ڕیکۆردی خێرایی بشکێنێ تا بگاتە بەرەی جەنگ. دە ڕۆژی پێدەویست تا لیواکە بەشێوەیەکی

---

[5] سەیرە کیسنجەر بەهەڵەدا چووە، بەقسەی ئەو هەر بستێک لە چیاکان دوورکەوتیتەوە، ئەوا بە نیشتمانی کوردان دانانرێ! وەرگێڕ

[6] مەبەستی کیسنجەر شەڕی عەرەب ئیسرائیل، شەڕی ئۆکتۆبەرە (تشرینی یەکەمی ١٩٧٣) وەرگێڕ.

گشـتی بگاتە شـوێنێکی نزیکی بازنەی شـەڕەکە و تەنانەت لەو کاتەش کە گەیشـــت دەبوایە لە هێڵەکانی بەرەی پێشـــەوە بکشـــابایەوە دواوە. تاکە ڕووداویش، کە لێیـان قەومـابێ و زیـانی لێکەوتبێتەوە، ئەو بەهەڵە تەقە لەیەککردنە بوو لەگەڵ لیوایەکی عەرەبستانی سعودی، کە ئەوانیش دە ڕۆژ بوو بەبێ هیچ تەقە و مەترســـی و دژواریەک لە ڕێگەدا بوون. جەنگاوەرە دڕدۆنگەکان لە دوا ڕۆژەکانی جەنگی ڕۆژهەڵاتی ناوین یەخەی یەکدییان گرت. بێئاگایی لە هەبوونی ئەوی دیکە، هەردوو یەکە سەربازیە عەرەبییەکە، هەر وەهایان زانی لە پڕ گەیشتوونەتە سەر هێزەکانی ئیسرائیلی و تەقەیان دامەزراند.

بیرۆکەی هەڵمەتی هێرشێکی گەریلاییانە بەدرەنگانێکی کاتی جەنگەکە هات، کە شەڕی نێوان میسرییەکان و ئیسرائیل لەبەرەکانی پێشەوەدا گەرم ببوو. لە ١٥ی تشـــرینی یەکەمدا و لە ڕۆژی نۆهەمی جەنگەکەدا، لەو ڕۆژەی کە ئیســـرائیل لێبڕاوانە تەکانێکی میســـرییەکانی بۆ ســـینا بەرپەچدایەوە، ئێمە پەیامێکی بە پەلەی بارزانیمان پێگەیشـــت، داوای ڕاوبۆچوونمانی کرد ئاخۆ بەگوێی ئەفســـەرە پەیوەندکارەکانی ئیســـرائیلی بکەن، بۆئەوەی هێرشـبکەنە ســـەر پێدەشـتە تەختەکانی عێراق. ئەوەش جۆرە پێشـنیازێکی بە پەرۆشـی ئەفســـەرە پەیوەندکارە ئیســـرائیلیەکان بوو تا بڕوایەک بۆ نیشـــتمانەکەیان بگەڕێننەوە. هەرگیز جۆرە داوایەکی وەهامان لە تەلئەبیبەوە پێنەگەیشت.

پەیامەکە ئاســـاییانە بە کەناڵەکانی ســـی ئای ئەیدا هات، «ویلیەم کۆلبی William Colby» بەڕێوبەرە نوێیەکەی ســـی ئـای ئەی هیچ کـاتی لەدەسـتنەدا بەوەی دژی بەرفرەوانکردنی شـەڕەکە بێ. کاتێکیش ڕاوێژمان بە شـــا کرد، کە ئەو زۆرینەی تفـاق و ڕاوێژکـارەکـانی بۆ کوردەکـان دابیندەکرد، ئەویش پشـتگیری بۆچوونی «کۆلبی» کرد. ئەو بە پێداگیریەوە گوتی کورد چەکی ئۆپەراســـیۆنێکی پەلاماردەرانەیان نییە، نەخاســـمە لە پێدەشـــتەکاندا. پێشـــنیازی ئیســـرائیلییەکان بە تەواوی "کارتی کوردی" دەخستە بەردەم مەترسی دۆڕاندن.

منیش قایلبووم. سەرباری ئەوەش وام مەزندەکرد کە مایەی ژیری نییە بەوەی کورد لەسەر تاکتیکێکی ئیسرائیلی نمایش بکەن و ئیدی ناوچە کوردییە گەمارۆدراوەکەیان بخەنە بەر ڕق و تووڕەیی دەوڵەتە عەرەبییەکان. بە پەسەندنامەی نیکسنەوە، پەیامێکم لە ١٦ی تشرینی یەکەمدا بەو شێوەیەی خوارەوە بۆ بارزانی نارد:

**ئێمە لەگەڵدا نین - دووبارە، وەهای نابینین کە کردەی پەلاماردانێکی سەربازییانە وەک ئیسرائیلییەکان پێشنیازیان بۆ کردووی، بۆ تۆ باش بێ.**

هەر بڕیارێکی دیکە، تێکشکانی کوردەکان بەبێ هیچ یارمەتییەکی ئیسرائیل دەخاتە بەردەم مەترسییەوە. بارزانی لە هەمان ئەو ڕۆژەی کە ژەنەڕاڵ «ئاریێل شارۆن Ariel Sharon» بە هێزە زرێپۆشەکەی لە کەناڵی سوێس پەڕیەوە، پەیامەکەی منی پێگەیشتبوو. شەش ڕۆژ دواتر جەنگی ڕۆژهەڵاتی ناوین ڕاوەستا.

## کۆتاییەکەی ئۆتۆنۆمی کورد

هەروەک «ئەنوەر سادات» دوابەدوای جەنگی ڕۆژهەڵاتی ناوین لە جاران زۆر ڕاشکاوانەتر بەرەو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هات، بە هەمان پێوانەش بایەخپێدانی یەکێتیی سۆڤیەت بەعێراق تادەهات زێدەتردەبوو. بۆ یەکەم جار بوو مۆسکۆ تۆپخانەی قورس بداتە سەددام حوسێن، بەمە ستراتیژیی عێراقییەکانی لە دژی کورد بە بارێکی ڕادیکاڵانە وەرچەرخاند. تا ساڵی ١٩٧٣ پەلاماردانەکانی سوپای عێراق بەهاوینان بۆ چیاکان دەستپێدەکرد و بە زستانانیش بۆ پێدەشتەکان دەکشانەوە. لە زستانی ١٩٧٣-٧٤دا بۆ یەکەمین جار بوو، سوپای عێراق لەو شوێنەی خۆی مایەوە، کە بەهاوین پەلاماریدا بوو، قایمیشی کردن. ئەوەش ئەوەی دەگەیاند، کە هاوینی دوای ئەوە ئۆپەراسیۆنەکە بەرەو قوڵایی زیاتری ناوچە کوردییەکان دەڕوا؛ ئەوەش ڕوونبوو عێراق بەدوای ئەوەدا دەگەڕا

سەنگەری کوردەکان بە سیاسەتی داهێزراندن بەسەریەکدا برووخێنێ. ئەو ستراتیژیەش زیاتر دەبووە مایەی نیگەرانی، چونکە تۆپە قورسە سۆڤیەتییەکان توانای ئەوەیان دایەبەر سوپای عێراق گەمارۆی خاڵە بەهێز و قایمەکانی کوردان بدا.

لە ١١ی ئازاری ١٩٧٤دا، ڕێک چوارساڵ دوای جاڕنامە بنەڕەتییەکەی ئۆتۆنۆمی، عێراقییەکان نەخشەیەکی نوێیان بۆ بەڕێوەبردنی هەرێمی کوردان ڕاگەیاند. لەو کاتەی بەسەرزارەکی بەردەوام باسی ئۆتۆنۆمی دەکرا، لەڕاستیدا پێشنیازی توندکردنی کۆنترۆڵی سیاسییانەی عێراقی دەکرا. لەوەتەی ڕەتکردنەوەکەی بارزانی بڕاندبووەوە، پێشنیازەکەی بەغدا ماوەیەکی ئاگادارینامەی بۆ داندرابوو. هەرکە چالاکی سەربازییانە دەستیپێکردەوە، هەموو مشتومڕەکانی پێشوویش سەبارەت بە سیاسەتی کوردان لە واشنتن سەریانهەڵدایەوە:

- شا هۆشداری ئەوەی دا ئەگەر کورد بشکێن، ئەوا یەکێ لە تایە هاوسەنگەکانی ناوخۆی عێراق لەبەین دەچێ و ڕادیکالیزم و دەستڕۆیشتنی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا زیاددەبێ، ئەوەش هەڕەشەی سەر کەنداو و ئێران قەبەتردەکا.
- ئیسرائیلیش هەڵسەنگاندنی خۆی بۆ زیاتر کۆمەکردنی کورد هەبوو؛ «گۆلدا مایر» بەتایبەتی ئەو پرسەی لەگەڵ مندا هێنایەپێش، ئەوەش لە چەند بۆنەیەکی ماوەی ئەو هاتن و چوونە زۆرانەم لەکاتی ڕێکەوتنی لەیەکجیاکردنەوەی هێزەکان لە بەرزاییەکانی جۆلان لە ئایاری ١٩٧٤دا بوو.
- بارزانیش بۆ شەڕ ساز و ئامادە بوو. ئەو وەهای لێکدەدایەوە، پچڕانی گفتوگۆکانی لەگەڵ بەغدادا دەرفەتێکە بۆ شلکردنەوەی کۆتوپێوەندەکانی هاوپەیمانەکانی بۆ ئەوەی دەسەلاتی خۆی بە شێوەیەک بچەسپێنی، کە هەر بە ئۆتۆنۆمی وێنا بکرێ بەلام لە جەوهەردا جیاوازییەکی وای لەگەڵ دەوڵەتێکی سەربەخۆدا نەبێ. بارزانی لە ١٦ی ئایاری ١٩٧٤دا، دوو ئەگەری بۆ پێشنیازە ستراتیژیەکەی خۆی خستە بەردەممان: ١٨٠ملیۆن دۆلار بۆ

ئۆتۆنۆمییەکی تەواوپڕ؛ ٣٦٠ ملیۆن دۆلاریش بۆ دامەزراندنی ئەوەی ئەو ناوی لێنابوو پاشخانێکی "گونجاو" بۆ سەربەخۆیی.

بیرکردنەوەیەکی تاکڕەهەندیانە دنەی بارزانی دەدا، بەبێ ئەوەی هیچ کەمە خەباتێکی سەربەخۆخوازانەش گیرابێتەبەر. لەبەرایی‌دا و هەمیشەش ڕەفتاری دژی هێزی دەسەڵاتدار گرتۆتەبەر، ململانێیەکەش بەهۆی باوەڕێکی زێدەڕۆییانە و جۆرێک لەفەرامۆشکردنی لێکدانەوە ئاساییەکەی هاوسەنگی هێزەکان هاندراوە. هەرچەندە زۆر جاران خواستی بەرز توانیویەتی جێگەی دەرامەتە ماددیەکان بگرێتەوە، بەڵام شتێکی سنووردار هەیە، کە هیچ دڵسۆزیەکیش جێگەی ناگرێتەوە. بۆچوونی بارزانی بۆ ئۆتۆنۆمی کورد هەرگیز لە لایەن شاوە (یان تورکیا بۆ ئەو مەبەستە) پشتگیری لێنەدەکرا. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش لە دۆخێکی وەهادا نەبوو خۆی ببێتە پاڵپشتی ئەو داخوازییە. تەنانەت بڕی هەرە کەمی داخوازینامەی بارزانیش لە سەرجەم ئەو بودجەیەی ئۆپەراسیۆنی ژێربەژێر تێیدەپەڕاندبوو، کە وڵاتە یەکگرتووەکان لەئەستۆی خۆی گرتبوو. بەڵام کۆنگرێس لە ١٩٧٤دا سیستماتیکیانە لە ئەوپەڕی تۆپکەی گۆبەندەکەی واتەرگێتدا دادەدادی بوو لە دەست ئامادەکارییەکانی هیندۆچینیدا، بۆیە بە دڵنیاییەوە داخوازی فەندکردنی جەنگێکی پارتیزانیانەی بەربڵاو لە چیاکانی عێراقی نزیک یەکێتیی سۆڤیەت، ڕەت دەکردەوە. سەرکێشییش بوو شا بۆ ئەم شتە هانبدرێ کە وڵاتەکەی سنوورێکی دووورودرێژی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا هەبوو، بۆ دەستوەردان لە کاروباری سەرخاکی هاوپەیمانێکی نزیکی سۆڤیەت هانبدرێ.

داخوازینامەی بارزانی لێشاوی پەیوەندییەکانی «کۆلبی» وروووژاند، کە دژی هەر زیادکردنێکی کۆمەکی ئەمریکییەکان بوو. دوودڵی کۆلبی هەروەک تاسەمەندیی بارزانی ناواقیعیانە بوو. هەموو چاودێرەکان ئەوەیان پەسەند بوو، کە لە چاوی ستراتیژی عێراقێکی نوێدا، ئەو بەرنامەی هەبوو[٧]

---

[٧] مەبەست بەرنامەی کۆمەکە ژێربەژێرەکە بوو. وەرگێڕ.

تەنانەت لەگەڵ باری بەرگرییشدا هاوسەنگ نەبوو. ئەوەی کە لە دەسەڵاتی مندا هەبوو وەک ڕاویژکاری ئاسـایشـی نیشـتیمانیی، گوشـاری من بەو ئاراسـتەیە بوو، کۆمەکی کورد زیادبکرێ و داوام لە «دیک هێلمس Dick Hels» و «برێنت سـکاوکرۆفBrent Scowroft» کرد، پێشـنیازێکی وەها پێشکەش بکەن.

لە سەرەتای نیسانی ١٩٧٤دا هێلمز و سکاوکرۆفت دەرەنجامەکانی خۆیان پێشکەشکرد. ئەوەش نزیکەی دووقاتی ئەوەی هەبوو زیادکرا؛ بەشداریی ئەمریکای ژێربەژێر لە پێنج ملیۆنەوە بۆ هەشـت ملیۆن بەرزکرایەوە. سـەرچاوە ئاشـکراکانیشـمان یەک ملیۆن دۆلاریان بۆ سـوککردنی باری پەنابەران تەرخانکرد. (شـا)ش قایلبوو پشـکی خۆی لە بەرنامەکەدا لە ٣٠ ملیۆن دۆلارەوە بۆ ٧٥ ملیۆن دۆلاری سـاڵانە بەرزبکاتەوە؛ کۆمەکی بەریتانیا و ئیسرائیلیش لەسەر ئاستی باوی خۆیان مایەوە.

بۆ یارمەتیدانی دارشـتنی سـتراتیژییێکی هاوبەش، خۆئەگەر ئامانجی هاوبەشـیش نەبێ، من ڕێنماییم دایە هێلمز، بە هەردووکیان، بە شـا و بە بارزانی ڕابگەیەنێ کە:

> **"وەک ئێمە دەبینین، بەرژەوەندی وەڵاتە یەککگرتووەکان لەوەدایە (ئا) کورد توانای ئەوەیان پێبدرێ پارێزگاری لە بنکە مەعقولەکانی دانوسـتاندن بۆ داننان بە مافەکانیان لە لایەن حکوومەتی بەغداوە بکەن؛ (ب) دەستوپێ بەستنەوەی حکوومەتە هەنوکەییەکەی عێراق، بەڵام (ج) نەوەک دابەشکردنێکی هەمیشەیی عێراق چونکە لە ڕووی ئـابوورییەوە نـاوچەیەکی سـەربەخۆی کورد نـاژێ و وڵاتە یەککگرتووەکـانی ئەمریکـا و ئێرانیش هیچ بەرژەوەندییەکیـان لەداخستنی دەرگەکان بە ڕووی پەیوەندییەکی باش لەگەڵ عێراقێکدا نییە، کە لەبن سەرکردایەتییەکی نەرمڕەودابێ.**

ڕێنمایی هاوشێوەش بۆ کۆلبی نێردرا.

وەها دانرا هەمووان بە مەبەسـتەکان قایلبن، کەچی هێشـتا لە میانەی ساڵی١٩٧٤دا لێکدانەوەکانی گەمەکارە هەمەجۆرەکان لەیەک جودابوو. سی

ئای ئەی ڕاسپێردرا، کە لایەنی ئەمریکایی جێبەجێبکا و بەرنامەیەکی نوێش پەیڕەوبکا؛ شـا مەبەسـتی بەرگریەکی گیرخواردووبوو[8]؛ بارزانیش هەوڵی ئەوەی دەدا بەو سەرچاوانەی لەبەردەستیدا بوو، کە بە ئاستەم دەرەقەتی بەرگریکردنی سەنگەرەکانی پێدەهات، بەدوای سەرکەوتندا بگەڕێ.

کێشـــە لەگەڵ ســـــتراتیژییەکەی کۆلبی ئەوەبوو، کە زیـاتر بەرەو خۆدوورخستنەوە لە هەراسانییەکان بەهۆی کۆمسیۆنەکانی کۆنگرێسـەوە دەڕۆیشـت لەوەی کە ڕەوشـەکە لەسـەر زەمیندا هەبوو؛ کێشـەش لەگەڵ سـتراتیژیەکەی بارزانی ئەوەبوو، دەسـتکەوتەکە تەنها بە جەنگێکی نیزامی نەوەک بە گەریلایی بەدەسـتدەهات، کێشـەش لەگەڵ سـتراتیژیی کۆشـکی سپی و ئێرانییەکان ئەوەبوو، ئۆتۆنۆمی کوردەکان لە خواستی بنبەستێکی هەمیشـەیی نزیک دەبووەوە و سەختانگە بنبەستەکانیش دژی ناحەزییەکی لێبڕاو و ســـەرســـەخت، کە زەحمەت بوو بەو شـــێوازە دانپێدانەنراوەی ئۆپەراسیۆنەکانی ژێربەژێر پشتگیری بکرێ.

بە درێژایی ڕەوتەکە، ڕەفتاری کورد ئەوەی ســـەختکردبوو پێداویســـتییە کردەییەکانیان هەڵبســـەنگێندرێ. هەندێک جار بێهیوا بوون، جارەکانی دیکەش شادمان. هەر بۆ نموونە لە ٢٧ی تەموزی ١٩٧٤دا شا داوانامەیەکی بە پەلەی بارزانی گەیاند، کە هاوپێچبوو بە ئاگادارییەکی خۆی ســـەبارەت بە ئاکامە پڕ مەترســـییەکانی - بۆ ســـەر ئێران و تەواوی کەنداو- بەوەی ئەگەر بێ بەرگریی کورد هەرەسبێنێ.

کەچی هەر چەند هەفتەیەکی کەم دوای ئەوە، لە سەرەتای ئەیلوولدا بارزانی پێشـــنیازی ئۆپەراســـیۆنێکی هێرشـــبەرانەی بۆســـەر کێڵگە نەوتییەکانی کەرکووک کرد. ئێمە لە ١٨ی ئەیلولدا ئەو پێشـنیازەمان ڕەتکردەوە، چونکە نەماندەویست سەختانگە مەترسیدارەکەی نەوت قوڵتربکەینەوە بە دنەدانی زنجیرەیەک توندوتیژی دژی دامودەزگە نەوتییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین.

[8] مەبەست ئەو جۆرە بەرگرییە کە هیچ دەرەتانی دیکەی بۆ بردنەوە و تێکشـکان نەبێ و نەگاتە ڕادەی ئەوەی دۆخەکەی لە بەرگریکردنەوە بۆ پەلاماردان بگۆڕێ. وەرگێڕ.

بەڵام تەکانە ناوبەناوەکانی بارزانی بۆ هێرشکردن بەڵگەوبەندی دژبەرەکانی بۆ داواکردنی کۆمەکی زیاتر بەهێزترکرد، بەوەی بۆیان هەبوو بڵێن کورد دەبێ سەرچاوەی پێشچاویان بۆ بەرگریکردن لە سەنگەرەکانیان لەبەردەستدا بێ؛ ئەگەر ئەوان داوای چەکی زێدەبارتر بکەن بەڵکو بتوانن هێرشێکی سەرەکی ئەنجامبدەن.

بەشێوەیەکی پوخت و ڕووت، هاوینی ١٩٧٤ کاتێکی نموونەیی بوو بۆ پێداچوونەوەی ڕەوشەکە. هەرچەندە لەوێدا دوو ئاستەنگیش هەبوون. تەنها بێگانەکان لە دۆخێکی وادابوون بەبێ کۆتوبەندی کات کاردانەوەیان لەبەرانبەر ڕووداوەکاندا هەبێ. هاوینی ١٩٧٤ بە تەنگژە زگپڕبوو، زۆریان سەرنجی ئێمەیان بەلای خۆیاندا برد: لە ئایاردا گەشتە مەکووکییەکان بۆ سووریا[9] لە حوزەیران گەشتی سەرۆکایەتی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین و یەکێتیی سۆڤیەت؛ لە تەممووزدا سەختانگی قوبرس؛ لە ئابیشدا هەڵوەشاندنەوەی سەرۆکایەتی نیکسن؛ پاشانیش قۆناخی گواستنەوە، قوبرس، ئاساییبونەوەی پەیوەندییەکان، ڕووخانی پرۆژە قانوونی بازرگانی، پەرەسەندنی چەقبەستنی دیپلۆماسی لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا و لە کۆتاییشدا بە تۆپکە گەیشتنی تراژیدیای هیندۆچینی. ئیدی کاتێکی زۆر لەبەردەستدا نەبوو بۆ پێداچوونەوەیەکی سیستماتیکیانە بە مژاری ناوچە دوورەدەستە کوردییەکان.

خۆ ئەگەر تەنانەت سیاسەتداڕێژەران ڕووبەڕووی هیچ داڕسانێکیش نەبووبانەوە، ئەوا گومانم هەبوو لەوەی گەر هاتبا و شتێکی دیکەی باشتریان لەبەردەوامبوون لەسەر بەرنامەکە، بدۆزیبایەوە. ئەگەر هاتبا و ئێمە لە ١٩٧٢دا هەرگیز دەستمان بە بەرنامە ژێربەژێرەکە نەکردبا، ئەوا هەر بە خێرایی کورد تێکدەشکا. خۆتێهەڵقورتاندنی دوو دەیەمان ئەو دەرفەتەی دابوینێ بە شێوازی سەددام حوسێن ئاشنابین ، کە هیچ گومان

---

[9] مەبەست هەوڵی ناوبژی کردنی ئاگربەست و لەیەکجیاکردنەوەی هێزەکان بەهۆی شەڕی عەرەب- ئیسرائیل. وەرگێڕ.

لەوەدا نەبوو کورد چارەنووســـێکی ئاســـانیان نەدەبوو ئەگەر خۆیان بەدەســـتەوە دابـا. لە هـاوینی ١٩٧٤دا ئەو هەڵبژاردنەی ئێمە هیچ پێشـــکەوتنێکی بەخۆوە نەبینی. خۆ ئەگەر ڕاوێژەکەی ســـی ئای ئەیمان پەژراندبا و هیچ ســـەرچاوەیەکی زیادەمان پێنەدابان، بە دڵنیاییەوە کورد دەڕووخان. ئێمە ئەو بژارەیەمان لەبەردەسـتدا نەبوو بە ئاشـکرا پشـتگیری لە جەنگێک بکەین کە لە ڕووی لۆجستییەوە سەخت، دوورەدەست و مایەی لێتێگەیشـــتنیش نەبوو بۆ جەماوەری ئەمریکا. بۆ ســـەرکەوتن بارزانی بە دوای دەسـتوەردانێکی ڕاشـەکاوانەی ئێرانییەکانی بە پشـتیوانی ئەمریکاوە دەکرد. بەڵام کردنەوەی دەرگەی بەرەیەکی دیکەی لەگەڵ ڤێتنامێکی شلۆق، ڕۆژهەڵاتی ناوینێکی ناجێگیر و هێوربوونەوەیەکی بەردەم هەڕەشـــە، ئەوا بێباکانە قومارکردنبوو بە چارەنووسی هاوپەیمانێکی دیکە و بەدڵنیاییشەوە لەلایەن کۆنگرێسەوە ڕەتدەکرایەوە.

کاتێکیش لە ٢٦ی ئابی ١٩٧٤دا پوختەیەکم بۆ ســەرۆکی نوێ ســەبارەت بە ئۆپەراســیۆنی کوردان باســکرد، پێمڕاگەیاند شــا ئەوەی بەهەندهەڵگرتووە هێزی نیزامی بنێرێ (ئەو هەمیشـــە یـارمەتیدەری لەوێ هەبوون، جلی کوردانیان لەبەرکردبوو). بەڵام من لەو بارەیەوە هۆشـــداریم دا، کە ئەم کردەوەیە کۆتاییەکی زۆر کراوە و زۆر مەترســـیدار دەبێ. مەگەر من بە پێچەوانەوە لە لایەن فۆرد ڕێنمایی نەکرابام، مەیلی من ئەوە بوو، بابەتەکە بەلاوەبنرێ. سەرۆکیش بەدوایدا نەچوو.

لە کەوتنە نێوان ئەو تەوژمە یەکتربڕانەدا، من گەیشـــتمە دوو جێگرەوەی کاتی گونجاو. ئێمە بە ئاشکرا و بەردەوام فەندێکیمان بۆ سوککردنی باری پەنابەرە کوردەکان تەرخانکرد. لە ٢٦ی ئابیشـــدا، ســـەرەک فۆردیش ئەو خشـــتەیەی کە ســـیمچا دینتز Simcha Dinitzی باڵوێزی ئیســـرائیل لە واشـــنتن و من لەمـاوەی چەنـدان هەفتە پەرەپێدابوو، پەســـەندکرد. نەخشـــەکەش گواســـتنەوەی ئەو چەک و تفاقە جەنگیەی ســـۆڤێتی بوو کە ئیسرائیل لە جەنگی ١٩٧٣دا کەوتبووە بندەستی، بۆ کورد بنێردرێ. ئێمەش لەجیـاتی چەکە ســـۆڤێتیەکە ئیســـرائیلمـان بە چەکی ئەمریکـایی

قەرەبوودەکردەوە. (ئەوەش بووە ملۆزمە بیرۆکراســـییەکی زۆر لەنێوان ئاژانســـەکاندا و چەندان مانگی پێدەچوو.) لە کۆتاییشـــدا، بڕی 28 ملیۆن دۆلار کەرەســـەی جەنگی گوازرایەوە تا چەکی ســـۆڤێتی لە ئیســـرائیل تەواوبوو، کە بۆ جەنگی ناوچە کوردییەکان دەستیدەدا.

لە پایزی ١٩٧٤دا هێرشـی عێراقییەکان بۆ سـەر کوردەکان گەیشـتە لوتکە، ئێمە تـا دەهـات زیـاتر داوای بە پەلەی کوردەکـانمـان بۆ کۆمەکی زیـاتر پێدەگەیشـت، زۆرجارانیش لە لایەن شـاوە پشـتڕاسـتدەکرایەوە. هەموو ئەو داوایانەش لە لایەن ســی ئای ئەیەوە بەرپەرچ دەدرانەوە. هەر بۆ نموونە لە ٢٢ی تشـرینی یەکەمی ١٩٧٤دا، «کۆلبی» ڕاپۆرتێکی دا ڕێگە کاریگەرەکەی کۆمەک ناردن بۆ بارزانی و بارەگای سـەرەکی خۆی کەوتۆتە بەرهەڕەشە. لەگەڵ ئەوەشـدا ڕاسـپاردەکەی "دژی زیادکردنی ئاسـتی کۆمەکەکان بوو" چونکە نهێنی کردەوەکەی دەخسـتە مەترسـیەوە، وەک ئەوەی نهێنیبوونەکە زۆر لە دۆخە دژوارەکەی کورد گرنگتربێ: "پشتگیرییەکەی ئێمە بۆ بارزانی لە ســاڵە داراییەکانی ١٩٧٣، ١٩٧٤ و ١٩٧٥دا ســەرجەمەکەی نزیکەی ٢٠ ملیۆن دۆلار و ١،٢٥٠ تەن کەرەســـەی جەنگیشـــی لەخۆگرتبوو... ئێرانییەکانیش لە توانایاندا هەبوو هەموو کۆمەکێکی پێویســـت بگەیەننە دەسـتی کورد، ڕاسـپاردەی ئاژانسـەکە[١٠] ئەوە بوو، کۆمەکی زیاتری کورد بۆ ئێرانییەکان بەجێبهێڵدرێ." بەڵام ئەگەر شـــا لەودیو ٧٥ ملیۆن دۆلار کۆمەکی کورد بکا، کە کردبووشی، ئەوا گیرۆدەی هەمان کێشەی ئیسرائیل دەبوو. مەگەر ئێمە چەکی جێگرەوەی بدەینێ، دەنـا هێزە چەکدارەکـانی خۆی لاواز دەکا. بەڵام ئەگەر ئێمە ئەو کارە بکەین، ئەوا خۆمان لە شەڕێکی بێهودە لەگەڵ کۆنگرێسدا دەبینینەوە.

---

[١٠] مەبەست ئاژانسی سی ئەی ئەی ـە. وەرگێر.

## هەرەسهێنانی بەرگریی کورد

ئەوەبوو لەو خاڵەدا، کە ڕەوشەکە لەگەڵ عێراق بەرەوپێشەوە دەچوو بەڵام بە هێواشـــی، بەوەی کە شـــا بەبێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەک دەســـتی لە پرســـەکە شـــوشـــت. ئەو گەواهیدەری ســـەر ئەوە بوو، کە دوو ســـاڵ بەســـەریەکەوە دەســـەڵاتی جێبەجێکار لە وەڵاتە یەکگرتووەکان خۆیان لە پرســـەکە دەکێشـــایەوە. ئەو هەرگیز لاری لە بڕیارە هەمەجۆرەکانی ئێمە سەبارەت بە کۆمەکی کورد نەبوو، لەوانەیە لەبەرئەوەبووبێ، لەوە ترسابێ ئەگەر هەر گومـانێکی دەربـارەی خۆگریی ئێمە دەرببڕیبـایە، ئەوا پەیوەندییەکانی کە لەســـەر بنەمای پاراســـتنی ئاســـایشـــی وەڵاتەکەی بوو، تێکدابا. بەڵام بە دەقاودەقی لەو ســاتەوەختەدا و فەندبڕین لە هیندۆچیندا بە ئەستەم شای هاندەدا، سەرەڕۆییەک بە وڵاتەکەی بکا، بۆ کردنەوەی بەرەی جەنگ لەگەڵ عێراقدا، ئەوەش تاکە ئەگەری بوو مابووەوە یان ســـنوورە بەردرێژەکەی لەگەڵ یەکێتی ســـۆڤیەتدا بەبێ مســـۆگەریەکی پتەو لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکان لەبەرچاونەگرێ، کە ئێمە لەو دۆخەدا نەبووین ئەوەی پێببەخشین.

لەبەرئەوە شـــا بڕیاری دا جلی خۆکشـــانەوە لەبن پاڵتۆی دەوڵەتمەداریدا لەبەربکا. لەو کۆبوونەوەی لەگەڵ مندا کە لە ١٨ی شـوباتی ١٩٧٥ لە زیوریخ کردی، ئەوەش لە کۆتایی "گەڕان و پشـکنینەکان" بە ڕۆژهەڵاتی ناویندا بوو، بەبێ هیچ ئـاگـادارکردنەوەیەکی پێشـــکـات پێیڕاگەیـانـدم، کە بەدوای دانووستاندن لەگەڵ سەدام حوسێندا گەڕاوە. منیش ڕاپۆرتێکم بۆ فۆرد نارد:

**"لە وەڵامی پێشـــنیازێکی گفتوگۆی عێراقییەکاندا، ئەو بەتەمایە لەگەڵ پیاوە بەهێزەکەیدا، لەگەڵ ســـەددام حوســـێندا کۆببێتەوە. شـا گوتی؛ ئۆتۆنۆمییەکی دەوڵەتی کوردی پێ قبوولنـاکرێ، کە بکەوێتە بن ڕکێفی حکوومەتێکی نـاوەنـدی کۆمۆنیســـتی عێراقی. ئەو گومـانی ئەوەی هەیە عێراقییەکان چەند ڕووداوێکی ســەر ســنووری عێراق –**

**ئێران بورووژێنن، ڕەنگبێ سەربکێشی بۆ بەنێودەوڵەتیکردنی پرسی کورد و بگەیەنرێتە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان، کە ئەو کات و بە مەزندەی ئەو هیچی دەرهەق ناکرێ. بە کورتی، پێدەچێ مرخی لەوە خۆشکردبێ لەگەڵ عێراقییەکان لەیەکتێگەیشتنێک سەبارەت بە کوردەکان هەبێ، بەڵام مایەی لێتێگەیشتنە، کە گومانێکی زۆریش لە پێش ئەو ئەگەرەدا هەیە. لەو نێوەشـــدا بە تەمایە لە کۆمەککردنی کوردەکان بەردەوام بێ.***

من هۆشـــدارییە دووبارەبووەکەی خۆیم بەبیر شـــا هێنایەوە، بەوەی هەرەســـهێنانی کورد تەواوی ناوچەکە دەشـــێوێنێ. من لە هەر دڵنیاکردنەوەیەکی ســـەددامم ســـەبارەت بە بەڕێوەبردنی ناوچە کوردییەکە وریاکردەوە، چونکە مایەپووچ دەردەچێ. لەوەتەی ســـۆڤیەتییەکـان خۆکشانەوەی ئێرانییەکان بە نیشانەیەکی لاوازتربوونی ڕۆژئاوا دەبینن، ئەوا سەرچڵیەکانیان لەو بەرەیە دەشێ زیادبکا.
ڕەخنەکانم ســـەلمێنەری ئاکادیمیانە بوون. لەوەتەی نەتوانرا چیدیکە لە ڕێی بەرنامەیەکی ژێربەژێرەوە پشـــتگیریی کورد بکرێ، بەردەوامبوونی ململانێیەکە ئەوەی دەخواست ئێرانییەکان بە پشتیوانی ئەمریکا ڕاشـەکاوانە پشـــتگیری کورد بکەن. مەزندەی پرۆژەیەکی وەهاش دوو هێزی (فیرقە) ســـەربازی ئێرانی و بودجەی ٣٠٠ ملیۆن دۆلاریش بودجەی ســـالانەی دەویست. ئێرانیەکانیش هەرئەوەندەیان پێویست بوو چاوێک بە میدیاکانمان لەســـەر هیندۆچین بخشـــێنن تا بۆیان دەربکەوێ، بەهیچ شـــێوەیەک پشتگیرییەکی خۆجێیی بۆ ئەو سیاسەتە لەگۆڕێدا نەبوو.


Areas with Kurdish Populations
SOVIET UNION
Caspian Sea
Black Sea
Tbilisi
Yerevan
TURKEY
Lake Van
Van
Diyarbakir
Tabriz
Lake Urmia
IRAN
Mosul
Karkuk
SYRIA
Bakhtaran
Baghdad
JORDAN
IRAQ
SAUDI ARABIA
KUWAIT
100 miles
100 kilometers
577

له ٢٢ی شـــوبات، کەمێک دوای دیدارەکەم لەگەڵ شـــادا، به «دینتز»م ڕاگەیاند:

**ئەو دەترســـێ کـاری کـورد تەواو بـووبێ. لەوانەیە ئەگەر له کۆبوونەوەی ئۆپیک OPECدا بەیەک بگەن، دانووســـتـان لەگەڵ عێراقییەکاندا بکا، له ئاڵوگۆڕی ئەوەی ڤیتۆیەکەی لەســـەر هەڵبگرن ئەویش دەســـت له بارزانی هەڵبگرێ. منیش لەو بارەیەوە بە توندی ئاگادارم کردەوە."**

من له ٩ی ئازاردا دوای ڕاگەیاندنی ڕێکەوتننامەی نێوان شـــا و ســـەددام حسێندا، بۆ ئیسحاق ڕابینم ڕوونکردەوە:

**"له زیوریخ ئەو بەشـــێوەیەکی گریماناوی لەو بارەیەوە پێیگوتم. ئەو گوتی، "ئەگەر له جەزائیر {له کۆبوونەوەی ئۆپیکدا} سەددام ببینم...." ئەو بیرۆکەیەکی له کەللەدایە، کە دەبێتە مـایەی ڕێککەوتن. منیش بە توندی پێمگوت، بیرۆکەیەکی بەدە- بەتـایبەتیش ئەو بیرۆکەیەی کە بڕوای بە دڵنیـاکرنەوەکـانی [عێراقییەکـان] کردبوو، کەوا هیچ کۆمۆنستێک له [ناوچە ئۆتۆنۆمییەکەی کوردان] داناندرێ."**

شا ئەوەی باسنەکرد، کەوا بە شتێک خەریکە یان ئەو قایله ناوچە کوردییەکە بکەوێتە بن ڕکێفی ڕەهای عێراقییەکانەوە. وەک دەرەنجامێکیش، هێشـــتا هەر هانی بارزانیم دەدا. له ٢٠ی شـــوباتدا وەڵامی نامەیەکی ئەوم دایەوە، کە پێشنیازی دیدارێکی خۆی لەگەڵ مندا کردبوو:

**"من زۆرخۆشـــحاڵ بووم بە پەیامەکەی ٢٢ی شـــوباتت. من دەمەوێ تۆ ئەوە بزانی، ئێمە ســـەرســـامین بە خۆت و گەلەکەت و کۆشـــشـی مەردانەتان. ئەو ئاســـتەنگانەی ڕووبەڕووت بوونەتەوە زۆر قەبەن. پێزانینێکی زۆرم بۆ خوێندنەوەی خەمڵاندنە ســـەربازیی و بارودۆخە سیاسییانەکەت هەیە. لەوە دڵنیابە، پەیامەکەت بەوپەڕی ئاســـتبەرزی ســـەرنـجـدانەوە له لایەن حـکـوومەتـی وڵاتە یەککـگرتـووەکـان تەماشادەکرێ، چونکە ئێمە بەبایەخەوە پێیەوە پەیوەستین.**

**ئەگەر بتەوێ نوێنەرێکی متمانەدارتان بۆ واشـــنتن بنێرن، بۆ ئەوەی زانیـاری زیـاتر لەبـارەی ڕەوشـــەکە بـدەنە حکوومەتی وڵاتە یەککگرتووەکان، ئێمە شـەڕەفمەند دەبین و پێخۆشـحاڵدەبین پێشـوازی لێبکەین."**

تەنها دوو هەفتە دوای ئەوە، لە ٦ی ئازاردا، خەریکی گەشـــتە مەکوکییەکەی خۆم بووم بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین کە بە بنبەست گەیشتبوو، ئەوسا شا ئێمەی بە ڕاگەیاندنێک سـەرسـامکرد، بەوەی لەگەڵ سـەددام حوسـێندا گەیشـتۆتە ڕێککەوتننامەیەک کە کاریگەرییەکەشـی ئەوە بوو دەسـتبەرداری کورد بوو. شـا سـنوورەکانی خۆی داخسـت و هەموو پشـتگیریەکیشـی لەسـەر کورد وەسـتاند، لە بەرانبەریشـدا عێراقییەکان سـازشـیان لەسـەر ڕووباری شـەتولعەرەب، ئەو ڕێڕەوە ئاوییەی کە سـنووری ئێران - عێراق لەیەک جیادەکاتەوە، کرد.

**لەسـەر ئاسـتی مرۆییدا ڕەفتارەکەی شـا دڵڕەقانە و مایەی بەرگریلێکردن نەبوو. بەڵام بەگوێرەی مەزندەی خوێنسـاردیەوە بۆ ئاسـایشـی ئێران، بڕیارەکەی شـا بەقەد ئازاربەخشییەکەی، مایەی لێتێگەیشتن بوو.** ئاخر تەنیا خۆتێهەڵقورتاندنێکی ڕاشـکاوانە ئێرانییەکان دەیتوانی کورد ڕزگاربکا، بە دڵنیاییشـەوە نرخەکەشـی وەک بارزانی لە ١٩٧٤دا داوایکردبوو لە بڕی ٣٦٠ ملیۆن دۆلاری تێیـدەپەڕانـد. ولاتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا کە تـالاوی دەسـتبەرداربوونی هیندۆچینی قوتدەدا، نەیدەتوانی بەرەیەکی دیکەی لەسـەر خۆی بکاتەوە و هەڵوێسـتی کۆنگرێس و تەنانەت پشـتگیری سیاسـیانەشـی بۆی جێی گومان بوو.

منیش گوێم نەدایە کردەکەی شـا و تەنانەت کەمترین باکم بە شـێوازە گومڕاییەکەی بوو. لە ١٠ی ئازاردا بروسـکەیەکی سـاردوسـڕم نارد، کەمتر لەسـەر پەسـەندکردنی کردەوەکەی وەسـتام و ناڕاسـتەوخۆ (لە بنەوە، بە شاراوەیی) گومانەکانی خۆم سەبارەت بەو بەرژەوەندییەی کە شا پێدەچوو بۆخۆی لەسەر ئەو کارەی هەڵهێنجابێ، دەربڕی:

> **سـەبارەت بە پرسـی کورد، شـتێکی کەم هەیە بۆئەوەی بیکەمە سـەربار، چونکە پێشـتر بەخۆم لەمیانەی چاوپێکەوتنەکانماندا پێمگوتی. ئەوەش شتێکی ئاشکرایە و بۆ خاوەنشکۆیە بڕیار لەسەر بەرژەوەندی دەوڵەتەکەی خۆی بدا. وەک هەمیشە سیاسەتەکەمان لە پشتگیریکردنی ئێران وەک دۆستێکی نزیک و پشتپێبەستووی ولاتە یەککگرتووەکان دەمێنێتەوە. هەڵبەتە بە پەرۆشـیەکی زۆرەوە بەدوای بەرەوپێشوەچوونی پەیوەندییەکانی عێراقی - ئێرانییەکان و بەگشتی**

**سیاسەتی عێراقییەکان لە ناوچەکەی تێدا و بەتایبەتیش یەکێتیی سۆڤیەتیدا دەچم.**

کاتێکیش هەموو شتێک تەواو بوو، پاڵەوانەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی ڕابردوو، بە توندی پەلاماری ئیدارەی فۆرد - منیش بەتایبەتی- یاندا بەوەی "دەستبەرداری" کورد بووین. بەڵام خۆ شا بڕیارەکەی دابوو، ئێمەش نە بەڵگەوبەندێکی شایستە و نە ستراتیژێکیشمان هەبوو تا لە بڕیارەکەی پاشگەزبکەینەوە. چارەسەرییەک کە لەلایەن هەندێ لە ڕەخنەگرەکانمان پێشنیازکرابوو- دەبوایە هەڕەشەی یارمەتیبڕینمان لە شا بکردبایە- ئەوەش واتای نەدەگەیاند. ئایا چۆن دەکرا داوا لە هاوپەیمانی سەرەکییمان بکردبایە، کە ئۆپەراسیۆنی سەربازییانەی خۆی دەستپێکردبایە- ئەوەش تاکە بژارە بوو- لەکاتێکدا کۆنگرێس حاشای لە هاوپەیمانەکان دەکرد، کە چەقۆیان لەسەر مل بوو!

بەڵگەکانی کاتی ڕووخانی شاش، ڕاستودروستی بڕیاری ئێمەیان سەلماند، لەبەر خاتری هاوسەنگی جیهان و ناوچەکە ئێرانێکی دۆست هی ئەوە نەبوو دەستی لێهەڵبگیرێ. شتێکی پووچ و نامەعقولانە دەبوو کە هاوپەیمانێکی سەرەکیی دیکە بە دەستدرێژییەکی سیاسییانە و بۆ سەر شا یان بڕینی یارمەتیەکان لەسەر ئێران لەخۆبکەی. پابەندبوونمان بە بەرگری لە ئێران هی ئەوە نەبوون لێیبکشێینەوە کە ئێمە لێیپەستبووین، بەڵکو دەربڕی خودی بەرژەوەندی جیۆسیاسییمان بوو. ئیدی دەبوایە من بەرگەی گەواهیدانی بەکۆیلەکردنی گەلێکی دۆست بگرم، لەوەش ئاگاداربووم کە هەرچەندە ڕەفتارەکەی شا وەک بیانوو بەکاردەهات، بەڵام سەختانگە ئیفلیجیەکی نێوخۆمان پشکی لەو کێشەیەدا هەبوو.

کاتێ بەرگری کورد تێکشکا، ئیدی شێوازی مانۆڕی واشنتن دەستییێکرد، کە چۆن خەتابارییەکە دابەشبکرێ. «کۆلبی»ـش یەکەمین کەس بوو کە گوێی لێبگیرێ. لە ١٣ی ئازاردا ئەو دەرفەتی داخوازینامەی بە پەلەپرۆزێی بارزانی بۆ کۆمەکی ڕاستەوخۆی ئەمریکا قۆستەوە، تا پێشنیازی خۆجیاکردنەوەی سی ئای ئەی لە تەواوی پرۆژەکە بکا. «کۆلبی» نووسی، لەبەرئەوەی سیاسەتی ئەمریکا لە کەناڵی ئێرانەوە یارمەتییەکانی دەگەیاند، بۆیە کۆمەکی ڕاستەوخۆی ئەمریکا بۆ کورد، کە ئێستا بەرگریکردنەکەیان لەبەریەکترازاوە، کەمتر لە جاران مایەی ئەوەی لەسەری هەڵبدرێتێ. ئەو گومانی هەبوو شا -

کە یارمەتیەکانی خۆی لەسەر بارزانی بڕی - بیەوێ وەک کەناڵێکی باربوو گەیاندنی ئەمریکا بۆ کوردەکان بەردەوام بێ. بۆئەوەی کات بەدەستبێنێ، «کۆلبی» لەسەر ئەوە سووربوو کە داخوازینامەی کورد پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە، ئەوەش دوای گەڕانەوەی من لە گەشتە مەکوکییەکانی ڕۆژهەلاتی ناویندا، تا ئەوکاتیش ئەو لەسەرچاوە هەوالگریەکانی خۆی باش دەزانی کە ئەوکات درەنگ دەبوو، کار لە کار دەترازا. ئیدی لەو نێوەدا «کۆلبی» ڕاسپاردەی وابوو، لەوەتەی کورد وا هەستبزوێن و هەڵەشەن، باربووەکەی سی ئای ئەی - ئەو فریاگوزارییە لەچاو ئەو تراژیدیایەی بەسەر کورد هاتبوو مایەی بەزەیی بوو، ئەوا بڕەی کۆمەکەکەیان بۆ مانگی ئازاریش پێبدرێ - ئەو باروبووە فریاگوزارییە سەرەتاییەی لەچاو تراژیدیای کورددا مایەی بەزەیی بوو.

وەک ڕوویدا، نوێنەرانی «کۆلبی» لەسەر گۆڕەپانەکەدا نەیانتوانی هەڵوێستی بێ باکانە بنوێنن. ئا ئەم خاڵەش، ئەوان بەبێ هیچ هەڵاوێردنێک، دژی هەر کۆمەکێکی زێدەباربوون بۆ کورد- هەر هیچ نەبێ بەلای کەمییەوە ئەوە ڕەفتاری «کۆلبی» بوو لەگەڵ کۆشکی سپیدا.

لێ سەددام حوسێن هێرشێکی سەرتاپای کرد، نوێنەرە خۆجێیەکانی سی ئای ئەی لەپڕێکەوە قەبارەی تراژیدیای دەوربەریان بۆ دەرکەوت. لەوکاتەی من لە گەشتە مەکووکییەکانی ڕۆژهەلاتی ناویندا بووم، ئەوان تکانامەی نائومێدییانەی سەرکردە کوردەکانیان گەیاند و بەدوایدا چەندان تێبینی سەرزەنشتیانەیان هەبوو کاتێک داواکانیان بێ وەڵام مانەوە. هەروەک هیندۆچین، لەخۆدوورخستنەوەی بەرپرسیارێتییەکە، شانەکە لەسەری من شکێنرا[11]، نووسینگەکەی منیش ئەو شوێنە بوو کە کاتی خەتابارییەکەی لێفڕێبدرێ. بۆ ساڵێک، ئەو کۆمەکە زیادەیەی کە بۆ کوردان ڕۆیشت، لە ئەنجامی زاڵبوونی گوشارەکانی من بوو بەسەر نەیاربوونی سی ئای ئەیدا. هۆی ئەوەش کە ئیدی من وەڵامی یارمەتیدەرانەم بۆ ئەو داوا بێهودەییانەی کورد نەبوو، ئەوەبوو کە هیچ شتێک نەمابووەوە کە من بیڵێم،

---

[11] لێرەدا کیسنجەر ئیدیۆمێکی ئینگلیزی بەکارهێناوە، کە لە یاری کارتی گەمەکردندا (کۆنکاندا) هەیە، منیش ئەم ئیدیۆمە کوردییەم پێ هاوشان بوو.

نووســــەرەکانیش ئەوەیان باش دەزانی، بە داخســــتنی ســــنووری ئێران بەسەرماندا، هیچ کۆمەکێکی بە پەلە نەدەکرا بگەیەنرێتە ئەوێ.
ســەختانگی کوردان خەمگینییانە کۆتاییهات، هەروەک دوای بیســت ســاڵ[12] لەبەر هۆی کەمتر نارەوا دووبارەبووەوە: جیۆگرافیایەکی بڤە، دوودڵی مرازە هاندەرەکانی وڵاتە دراوســـێکان و خواســـتی لەگەڵ یەک نەگونجاو لەنێو خودی کۆمەڵگەی کوردیدا. ئەوانەی لە دواییدا ڕێکوڕەوان دەربارەی "تەوس" و "ناپاکیی" قسەیاندەکرد، بەبێدەنگی مانەوە یاخود لەوەش خراپتر سەبارەت بە تراژیــدیــای بەرفراوانتریش کە لە هیـنـدۆچیـنـنـدا ڕوویــدا، هەرگیز جێگرەوەیەکیان نەهێنایە پێشەوە کە لەڕاستیدا لەسەری بڕۆین.
وەک پرســـێکی لێکۆڵینەوە، تراژیدیای کورد کەرەســـەیەکە بۆ دەرەنجامی هەمەجۆر: پێویســـتی ئامانجڕوونی هەر لە ســـەرەتاوە؛ پێویســـتی ناوبەناو پێداچوونەوە بە ئۆپەراســـیۆنەکان و گرنگیشـــە کە یەکانگیریی لەنێوان هاوپەیمانەکاندا هەبێ. لەڕاســتیدا هەموو ئەو شــتە زۆر گرنگانە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دی بەدیدەکران، بەڵام بە پێی پێویســـت وەک داخواز نەبوون. پەیڕەوکردنیشیان لەسەر ڕەوشەکە دەستگیرنەبوو.
لەبەر هۆکاری جۆربەجۆر، ئێمە نەمانتوانی ســـەرچاوەی بردنەوە دابینکەین و تــا ئێســـتــاشـــی لەگەڵدابێ نــامــانەوێ ڕووبەڕووی دەرەنجــامەکــانی دەســتبەرداربوونەکە ببینەوە. لەبەرئەوە ئێمە بۆ تێگیرانێکی ســەربازییانە و داهێزرانێکی بەرەبەرەی نەیارەکەمان تێدەکۆشـــاین. ئەوەی ئێمە نەمانزانی، ئەوەبوو کــاتێ بەرنــامەی کورد جــاڕدرا، ئەو پلە پشـــێویەی نێوەخۆمــان مانەوەی هێزمانی لەبەینبرد. تەنانەت لە گۆشـــەنیگای ئەو دوو دەیەشـــدا، حەزمدەکرد بژارەکانی ئەو ئاراســـتەیەی گرتبومانەبەر تەنانەت کەمتریش بووبان. گەر هاتبا و لە ١٩٧٢دا ئۆپەراســـیۆنی کوردەکانمان لەخۆنەگرتبا و لێگەڕابایین عێراقییەکان ئازادانە هەوڵەکانیان لە کەنداودا چڕکردبایەوە، ئەوا دەرەنجــامی ئــاراســـتەی دیپلۆمــاتی لە ڕۆژهەڵاتی نــاویـندا جیــاوازدەبوو، بەتایبەتیش لەمیانە و لە دوای جەنگی تشــرینی یەکەمی ١٩٧٣ی ڕۆژهەڵاتی نــاوین. بۆ گەلی کورد، قوربــانییە هەمیشـــەییەکەی مێژوو، بێگومــان ئەمە دڵنەواییکردن نییە.

[12] نووسەر کتێبەکەی لە ١٩٩٩دا چاپکردووە. وەرگێڕ.

**سەرچاوە:**

Henry Kissinger,
Years of Renewal, the concluding volume of his memoirs,
First Published in 1999 by Simon and Schuster, USA
First published in Great Britain in 1999 by Weidenfeld and Nicolson

بابەتەکە لە کۆتایی بەشی پێنجەم و لەژێر ژمارەبەندی ١٩م لە لاپەڕە ٥٧٦ تا ٥٩٦ دایە.

# پێڕستی ناوەکان:

## م



## غ



## ف



## ق



## ک

## ھ



## و



## ی



## ن

**چەند دێڕێک لە ژیاننامەی وەرگێڕ**

- لە ١٩٦٨ لە گوندی گرتک، لە دۆڵی ڕوســـتێی دەڤەری باڵەکایەتی لەدایکبووە.
- لە ١٩٨٨دا بە کالۆریۆسی لە قانون لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- لە ١٩٩٧ـەوە تا ٢٠١٢ ئاوارەی ئەوروپا (هۆڵەندا و بریتانیا) بووە.
- لە پاڵ زمانی زگماکیدا؛ زمانەکانی عەرەبی، هۆڵەندی و ئینگلیزیش دەزانێ.
- لە ١٩٨٦ـــەوە هەوڵی نووسینی داوە. تا ئێستا بیست و یەک کتێبی لە زمانەکانی هۆڵەندی و ئینگلیزییەوە وەرگێڕاون. دەیان گوتار و لێکۆڵینەوەی قانونی و سیاسیشی بڵاوکردوونەتەوە.

## چاپکراوەکانی وەرگێڕ

١ - نهێنییەکانی مۆساد، نووسینی گۆردۆن تۆماس، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، سێ جار چاپکراوەتەوە؛ چاپی یەکەم ٢٠٠٨ چاپخانەی هێڤی، هەولێر. چاپی دووهەم دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر ٢٠١٤. چاپی سێیەم ڕۆژهەڵات ٢٠١٦.

٢ - مادلین ئۆلبرایت، سیاسەتی ئەمریکا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، سەنتەری نما ٢٠٠٩، هەولێر.

٣ - داود بنگۆریۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل، نووسینی ڕۆبەرت سەنت یۆهن، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، چاپخانەی هێڤی ٢٠١١، هەولێر. چاپی دووەم ناوەندی ئاوێر ٢٠١٦ هەولێر.

٤ - کوردستان لە نێوان سیڤەر و سنووره دەستکردەکاندا، نووسینی: هیسەر لێهر واگنەر. مێژوو. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە. چاپی یەکەم؛ لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی هەولێر ٢٠١٣. چاپی دووەم، ئاوێر ٢٠١٥.

٥ - وەرزێکی سپیی وشکوبرینگ، ئەندرێ برینک. ڕۆمان. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٣.

٦ - ژیانی من، چۆن ئیسرائیل دامەزرێنرا؟ گۆڵدا مایەر، یاداشت، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر. ٢٠١٤.

٧ - ئینفێرنۆ، دۆزەخ، دان براون، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.

٨ - شــەرەف، ئەلیف شــەفەق، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.

٩ - یــاخیبوون، منــاحیم بێگن، یــادەوەری، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٦.

١٠ - خــانووەکەی مزگەوتێ، قــادر عەبــدوڵلا، ڕۆمــان، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٦.

١١ - کۆدەکەی داڤینشــــی، دان براون، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر ٢٠١٦.

١٢ - خەتی بزمـاری، ڕۆمـان، قـادر عەبـدوڵلا، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، ناوەندی ئەندێشە، سلێمانی ٢٠١٧.

١٣ - کردە هەرەگرنگەکانی مۆسـاد، میخائیل بار زۆهار و نەسـیم میشـال، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، چاپخانەی حەمدی، ٢٠١٨ سلێمانی.

١٤ - لە مەککە، قادر عەبدوڵلا، ڕۆمان، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، چاپخانەی حەمدی، ٢٠١٨ سلێمانی

١٥ - ئەرێ کورد بوونە بەردەبـاز؟! ڕۆبەرت بریـان گیبســــن، مێژوو، لە ئینگلیزییەوە، چاپخانەی کوردستان، سلێمانی ٢٠١٩.

١٦- شەوە سپییەکان، مناحیم بێگن، یادەوەریی، لە ئینگلیزییەوە، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٩.

١٧ - زۆربـای ئێرانی، قـادر عەبدوڵلا، ڕۆمـان، لە هۆڵەندییەوە، چـاپخـانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٢٠.

١٨- ژیـانی من، گۆلـدا مـایەر، یـادەوەری، لە ئینگلیزییەوە، چـاپێکی نوێی چاککراو، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠٢٠.

۱۹- کچانی دووکەڵ و ئاگر، ئاڤا هوما، ڕۆمان، لە ئینگلیزییەوە، ســــلێمانی چاپخانەی کارۆ، ۲۰۲۱.

۲۰ - هێڵێک بەنێو لمدا، جێمس بار، مێژوو، لە ئینگلیزییەوە ۲۰۲۱.

۲۱- پاشا، قادر عەبدوللا، ڕۆمان، لە هۆڵەندییەوە، ئامادەیە بۆ چاپ.